# ئینسکلۆپیدیا
# پارێزگەها دهۆکێ

سەرنڤیسەر و سەرپەرشتێ گشتێ
موسەدەق تۆڤێ

هاریکارێ سەرنڤیسەرێ
خالد سالح

## بەرگێ حەفتێ
## باژێر و گوندێن پارێزگەها دهۆکێ

۲۰۱۷ ز ۲۷۱۷ ک ۱٤۳۹ مش

# ناڤەرۆك

## قەزا شێخان ........................................................ ٤١٩

# زەنگل لێدا:
# دهۆك: گوفتووگۆیا ڕۆخساروو جەوهەر
# -تێبینیێن سەرەتایی-*

براهیم مەهموود

## دەستپێکەک ئەرێنی:

بەروڤاژیا زمانێ کو هەر تم هەوجەداری ژێ وەرگێریت و بۆ وەرگێریت، بەروڤاژیا هەمی تێکسێن" کو بێ ئاوارتە"، پێن گرێداینە ب دەردێ وەرگێر و خوەستەک، و سنجێن وەرگێران ێ دەڤ وی، دەما کو بخوازە داناسین بکە د زمانەکی دن دە، بەروڤاژیا ئاوازێ ب خوە، یا جاران هەوجەیە کو گەلەک گوهداری لێ ببە، و وەستاندنا کو ژێرە ب ناڤ دبە، داکو جهـ بگرە. بەلێ، باژار د سەر سینۆر و خوەزاییێن چ وەرگێر، و لیستکێن وی ب پەیڤان ڕە، و دیاربوونا وان یا بالکێش، ب تشتێن کو ئەشکەرە دکە، و پێن کو بەر ب چاڤ دکە وەکە سیمەکێ، کو دروسترە ژ هەمی تێکسێن وەرگێر ب خوە، دەربارێ پەیڤێن گران بۆ وەرگێرانێ، ئان تەڤلهەڤ، و د دۆماهیێ دە کو زەلالتر و گەشبوونا تەرم و ڕاگهاندنا وێنەیێن زندی ژ هێلائێ ئاوازێ یا کو جارجاران پێ گوهدار وێ ئالۆز بکە، چکۆ هەر پێنج هەستکار جڤیانە د هندور دە، و تاکو ئەڤ هەستکار تێن دەرباسکرن د چالاکیا خوە دە یا بێ ڕاوەستن ب گشتی. یانی ب شەڤ و ڕۆژ، چمکی باژار ب خوە ئەوە پێ وەرگێرانێ وی دکەت پێ کو دەرباسی هندورێ وی دبە ئەڤ تشت دبە بێ زێرەڤان، چکۆ تو زێرەڤان نکارە وەرگێرا پەیڤەکێ قەدەخە بکە، ئەڤ پەیڤ ب خوە، دیمەنەک ڕەنگۆکریە، ئان دەنگەک ڤەگوهەستیە، ئان بێهنەکە ڤەژیایە... هتد، دەربارێ کەسێ کو ئەوان بشۆپینە، لێ بەلێ، ئەو" باژار" ب خوە ژی پێ نێزی خوە ئاگادار دکە، تا دیرەتیەکێ ب ناڤکری، کو دیار دکە ڤێ ناڤەرۆکا خوە:هێمەنی، تەڤلهەڤی، لهەڤهاتن، گەلەمشەیی..هتد، د گەل دیمەنا زندی و یا هوندرین، ئیجا د ئەنجامێ دە ئەو ئە کو باژار دبە ئاوارتە د چ تشتێ کو بالکێش بە، ئەگەر ڕێدان ئان قەدەخە کری بە، ئەو هەمی د ناڤ چاندەیێن وێ پێن جوداهی دە نە، ژ بەر کو ئەو بتری ئەنجاما جڤاندنا یا هەنارتن و داهاتیێن وێ بن، چمکی باژار ب کریاکرنا گەلەک هێزێن تێنە دیتن و نەدیتن، یانی، ئەو بهتری لهەڤدیتنا تشتێ گوندیاتی و شارستانی، ئەو گەشتر و فرەهتر دەولەمەندتر ژ هەمی تشتێ کو پێ ب واتە دبن ژ ناڤێن تاخ ئان کۆلان ئان مەیدانان و جهێن جودا...هتد، چمکێ، ئەو ب یەک جارەکێ،

و دبە، د رێیا دیمەنەکی نیشانکری دە، بێ دەرباس دبە هوندرێ وی ئاگادار دکە، ئەو و بێ لێ دمینە، بێ قاشوولێن خاپینۆک، کو جۆرەیێ باژار بەر چاڤ دکە، یانی ڕەوشا خەلکێ وی ب خوە، و چاوان شەڤ و ڕۆژان خوە دگهینن هەڤ، و چاوان ژیانا خوە دژین، و یا پێویستر کو چاوا ڤێ ژیانێ خوە دابین دکن، و تا مرنا خوە ژی ب شێوەیەکە جودا.

ئیجا مرۆڤێ کو نە باوەر بە هێلائێ مژارا باژار، ل سەر چ گۆتن ئان هەڤۆک دوورێـز بوونە، ئان نڤیستینە تا نها، دکارە بدە خوە، داکو ڕاستیێ ژ نە ڕاستیێ دەرخینە، کو ڤەگەرە چ نڤیساندنەک کو نڤیسکارەکی ئان پەیکەرەکی ئان فەیلەسووفەکی ل پەی خوە هشتیە، کو گرێدانەکێ د ناڤبەرا باژار و شارستانی و پێشکەتنێ دیـار دکـە، ئانکو د دەربرینا وی ب خوە دە پێڤاژۆیەکە هەیە ب مەبەستا داخویانیا دیمەنەکی ژ باژار ڕە، هندک ئان گەلەک بە، چمکی باژار ب خوە پرتووکێن ڤەکرینە، زمانێن کو ب چاڤان تێنە خوەندن، و ئەو ژی ل سەر ئاستا خوە خوەدیێن خوە دلخوەش ئان تەنگاڤ ئان تەنگەژ دکن، ل گۆری خویانیێ وی، کو ئەڤ ب خوە ژی پیاڤا دیتنیێ دەرباس دکە، کو ئەو ئاخافتنگەر و هاندەر ل سەر بێهنکرن و تامکرن و دەستلێدان و گوهداری، و ئەو ژی مەتەرسینا وی یا مەزنە، و د هەمان دەمان دە، نیشانا وی یا جودا یە، و د گەل کو مژار تو تێکلیێ وی ب تێکەها گرێدانێ ب جهـ ڕە تونە یە، ژ هێلائێ نرخەیی ڤە" وەکە میناک: حەزکرنا وەلات"، کو جانەوەر هەنە وارێن خوە دپارێزن، و پێ گرێدایێ نە، جارجاران ژ مرۆڤان پێتر، د پێوەندیەکە ئوورگانیزمی نیشانکری دە. ئەڤ ژی دهێلە تا نها مرۆڤ ببێژە کو حەزکرنا وەلات ب خوە ژ باژار ناڤەقەتە، تەڤی سیم و مالبەندا خوە، و دیتنا لڤیایی و ڕابوویی تێدە چ ب هنەر ئان لاواز ئان جانکێشی[1].

ئیجا تشتێ کو من ناڤنیشان کریە تا نها بەر ب گەلەک هێلائێن نرخی ڤە دچە، و دبە کو ئەو وەکە هەلوەستەکێ بە ژی دەرباری هنەکان، لێ یا گرنگ ئەو ئە کو ئەز تم گرێدانەکێ ب جهـ دکم د ناڤبەرا یەکا ناڤبوویی ژ گەل من ڤە، و یا کو من زێدەتر نێزیکی باژار دکە، کو ئەو وەکە ڤەوارەکە هەستیی و دەروونییە، و تا کو ئەوان دەرباس دکە، چمکی ڤەوارێ ب ناڤ بوویی من وەرگێر دکە، و دبە کو من هۆشدار دکە دەرباری جوورەیێن ژجهـچوویینێ ڤە، دەما کو ئەز ل هەڤهاتنەکێ ژ ژیانەکێ ڕە بخوازم، کو تا من ب خوە ژی دەرباسی دەم و جهی دکە، و یەکا هەری پرسدار بە ئەوە: ڕووێ دو تاق د گەل باژار، بێ ستوون و بێ ئاسۆیی تێ دە یە. باژار ب خوە د ڤرێ دە دیرۆکەک دناسە ب گەلەک ڕەنگ و سەردەم و زمانان، ئەو ئە دەما کو سەرکەفتیە، دژی ڤوتکرنێ یە: پێشەرۆژ و ئامادە و پاشەرۆژ، ئیجا د ڤرێ دە، تو نخوماندن ل سەر بیرەوەریێ تونە یە، چمکی باژار ب خوە پێکریێ ژیربوونێن پێن تەک د کارمەندیێ دە گەلەکی دەرباس دکە، ئەو ژی ب ئامادەبوونەکە بەردەوام، و ب جهکری د هەمی ڤالایی و سیمێن خوەدیان و تا چ تشتێن ب جان پێ ب ناڤ دبن، و دەزگەه و چالاکیێن جودا، ئیجا ئەو ژی ناسنامەیا دەردوورێن خوەیە !

باژار خوەدیێن وان ئن کو ئەو بێ دەنگ ئن، و چ تشتێن ل دۆر باژاران دزیڤرن ل سەر وان، و چاڤدێربوون ژ ڕێجیمێن وان ڕە، و فرەهیا وان ئا جڤاکی.

ئیجا دێ ئەز ئێ مژارا خوە نیشان بکم، و ئەز ل سەر دهۆکێ داخڤم، دهۆك باژار، ئان باژار دهۆك، تەڤی کو جوداهیەک ڕتمی د لێکرنا هەر هەڤۆکێ دە هەیە ب سەرێ خوە یە، و وەکو ئادرێس ل ژوور نیشان ددە، و ل گۆری بالکێشیا هەری نووژەن یا ئیرۆ د باژار دە، کو بەرێ نرخڤان ل سەر ئان لێ ب جهـ دمینە: ئەگەر خوەدی وار بە و پێ دناسە، ئان کاتی، ئان لێ داکەتی، ئەز بەرێ ڤان هەمیان ددمە ڕۆژا سێشەمێ" بیست و هەشتێ بەرفانباری د سالا ٢٠١٤ ان دە، دەرباری دیمەن یێن زندی ژ بارانەکە باریە دەمەک درێژ، کو کۆلان خویاکرن، وەکە زمانێن دەرکەتی ژ دەرڤی دەڤێن خوە، د لاشێ باژار یێ دهاتە ئاڤێتن ل سەر خاکێ، کو ئەو ب وی دیمەنێ خوە بێ هێز بوو هەمبەر" داقورتاندنا بارێ و ڕەوان ژ ئاڤا بارانێ ڤە د کۆلانان دە،

و ب رێکرن و دوورکرنا وی ژ دەرڤە، ئان ل گۆر کو جهەکی هەنکۆفی برێکرنێ ژێ رە هەیە، ئیجا ئەو نەکو هەو د" بەردە مایی"، لێ ئەو ژهەڤکەتەنەکە د تێکلیان دە، د ناڤبەرا رەوش، ئان ئاستەیا باژار دە، کو ئەو هەمبەری هەڤرەکیەکێ بەر ب چاڤ بە، و تشتێ کو هەمبەر راوەست، کو ئەو ژی نە ژ خاڤلتیە، چمکی توجار نابە ئەو ئاخافتنا ل سەر ژخاڤلتیان، کو دڤا باژار هەمبەر ناڤێ خوە بە، و دەما ئەو خوە ب ناڤ دناسە وەکە باژار، د جهـ دە، ئەو سێ دەمێن وی یێن زندی، هەڤدووگرتی نە، و د گوڤتووگۆیەکێ دە نە، وەکە پێدڤیەکێ، ب هەڤ رە. یان وێ کێمانیەک، ئان چەوتبوونەک، ئان قەلسبوونەک هەبە د جهانینا ئۆرگانیێ دە، هێلائێ وەرگرتنا باندۆرێ دە، ئیجا دەما دهۆك دیار دبە د دیمەنا خوەشتنا وی یا زۆردار و بالکێش، و تا بهەواری د جهنان دە ب خوە، کو ئەو ژی د ئاڤزیلا خوە دە یا دۆرپێچکری ب بلنداهیێن چیایی، کو راسەری وی دهات ب تشتێن ژێ دهاتن خوارێ، و ئاگاهدار دکرن ب بارەکی نایێ راهشتن، کو ب کارێ خویی سروشتی گرێدایە، و ل هەمبەر باژار دیار کری کو نکارە ئەنجامێ هەمبێز بکە یا خویایی د لڤاندنا هاتووچوونێ دە، و لهەڤکەتنا مرۆڤان ڤالی والی، و دانووستاندنا ئالۆز د ناڤبەرا هوندر و ژ دەرڤە، وەکە خویاکر کو ئەڤ بوویەرا بارانی، کو ب سائەتان دۆم کری، دەمەک گەلەک درێژ گرت، نە وها تەنێ، لێ بەلێ بێدلیەک مەزن پەیدە کر، ژ یێ بەرپرسیار و لێ ب جهـ و یێ کاتی و لێ داکەتی، کو ئەو ژی ناڤنیشان و داناسین ئن، مرۆڤ ژ لێمکوربوونێ ناکە، و راستی نایێ نخوماندن، راستیا دەرباری دهۆکا هان، ئەڤا ناڤدارەکی دیرۆکی، و ب بەردەوام هەلبەت تا نها، کو خوە ئامادە کریە ژ مەرجێن وسا" ب شێوەکی کارێکەر، داکو کاربە بەردەوام بکە، وەکە ژێ تێتە خوەستن ب رەنگەکی ڤەکری و دیار" گەلۆ وێ چ بوویا ئەگەر بارانێ بدووماندا و ب توندی ڤێ جارێ؟ لێ گازن لێ نابە، چمکی باژار وەکو دستینە دە ژێ، وەکو تێتە ئاسێکرن لبەر خوە ددە، و د دۆماهیێ دە دنرخینە، وەکو دنەرخە، کو دیار دەنگێ خوە بلند دکە، ژ خوەدیێ خوە رە: ها هوون ئەڤن، گۆتن و کارێن وە، ها هوون ب خوە نە، د تەڤیا وە، ئیجا خوە ب ڤێ یەکێ ئاگادار بکن ناخوە!

واتەیا گۆتنێ ئە وئە، کو یەک دکارە ل سەر ڤێ پیڤانێ راستیەکێ ب جهـ بکە: ژ من رە بێژە باژارێ تە چاوا یی، ئەزێ ژ تە رە ببێژم تو کیی !

ئەو ب خوە ئەنجاما وی کاری یە، کو ئەو ژێ رە دەستپێکەکا ب ناڤنیشان کری !

ئیجا ناخوە دکارم ببێژم ژ ڤر و شوون دە، داکو ئەم کارەکی ب بەر بکن، د نێزیکداییـن و داخوییایین دە کو تێنە خوەستن، داکو ئەم ل سەر ئالۆزیا باژار راوەستن، دەرباری میناکا ب ناڤ بوویە ژ ژۆر ڤە، و ژ سناجا خوەزایی و ژێ وردەتر، یا کو ئاڤاکری ژ بەرزەخێ درێژ دبە، کو ژ بەر چاڤ دکەڤە، د ناڤبەرا رۆخساروو جەوهەر: زەنگل لێدا ؟

ئەو ژی کارە و ناڤە، و زەنگل ل هەر جهی دالڤاندیە، و د هوندرێ چ کەسێ کو ب باژار مژوولە، کو رتما وی زمانێ وی یە، کو تم ب دەنگڤەدانە د ئاگاهداریا گرێدایی ب ئامادەیێ و یێ هەبوویی و یێ پێشبین پێکانینا وی دبە، و پێدڤیا کارێ مرۆڤ ژێ ب هێڤی، داکو دەنگڤەدانا لێدانا زەنگل ب شێوەیەکی دن بە، د رۆژێن بێیی رە ل سەر باژار، هەلبەت د" ئاڤزیلیا: هنگاڤتنێ" دە[٢].

## مرۆڤ و باژارێ وی

ئارستۆ، بەریا بیست و سێ سەدسالییان، و بێتر، د دەستپێکا پرتووکا خوە" سیاسەت" دە، وها نڤیسیە ( مرۆڤ ب خوەزایا خوە ئافریدەکی سیڤیلە. د ڤر دە ئەز باوەر ناکم کو ئارستۆ رێ گرتیە د دەستپێکێ دە بێئەنجام، لێ بەلێ د واتەیێ ئەو ئە کو چارەنووسا مرۆڤ جڤاکە و جهواری و جوداییبوونەک تەقەز د باژار دە، نە تەنێ ئەڤە، لێ ئەو دکارە پێشکەفتنێ د جۆرێ خوهدە بکە: کو مرۆڤەکی سیڤیل بە، کو ب گیان و هشێ خوە پەروەردە بە د وارێ گرێدانەکێ جڤاک دە، و باژارێ خوە بدە ناسین ب شێوەیەکە جودا، یانی ببە ئاستەک بلند ژ شارەستانیێ رە، کو

دبە بنیاد ژێ رە.

ئیجا هەر تشتێ كو ل سەر دەستێ وی ببە، د تێكلیێن ب هەڤهووناندی، وێ باژار مسۆگەرەكێ ژ شارەزا وی رە، و چاكیا وی كاری ژ مانە رە بە.

و داكو ئەم بێتر نێزیكی مژارا خوە ببن، دیارە كو باژار جیهانەك ب سەرێ خوە یە، كو بەر ب چاڤ دبە ب پرپوونا نیشانێن خوە، وەكو هاتیە ناسین ژ نوو ڤە و ب گرانی و گرنگی د چارچووڤا سیمیایا نوە دە، و د تێكستێن چاندەیی و ویژەیی نەوەكهەڤ دە، كو باژار ب خوە ژی وەكە تێكستەكی بەرفرەهـ دووربێچ نابە، و ئەڤ تێكست گەلەك دەولەمەندە ب نیشانان دەر چ تشتێ كو خوە لێ دگرە ئان خوە پێ دگرە ئان پێ دناسە، دەستپێك ژ خورستیێ: چەم، نەوال،كەندال، سەركاش، چیا، قوپ، زنار، بنار، دەشت،دەراڤ،گەلی، خاك و خورستیا خوە، ئاسیمان و گوهەرتنێن سەقایێ..هتد، و تا چاندەیا گەلەك رەهەند و وەربێچان، چ د هەست ئان د رۆیگرتنێ دە، تا ئاستا زەهمەتی، و دبە كو نەپێكانینا هەژمارێ: كۆلان ب جۆرێن خوە ڤە بێن نەوەكهەڤ، درێژی و پانایی، و ئادرێسێن خانیان یێن دەرباری هەڤ ژ هەردو هێلان، و نڤیسگەه و بلی وان، و دارێن چاندی، و تشتێن ب خزمەت دبن ب ناڤێن وان، و تایبەتمەندیێن رێڤەبرنا ئاڤرێژێ، و ستوونێن ئلكتریك و تلیفۆنێ، و تابلۆیێن جودا، نەوەكهەڤ ژ رێكلامێ رە كو ڤالی والی دالقاندینە.

بەلێ ! هەر یەك ژ مە گرێدایە ب جهێ كو گەلەك كار و بارە خوە ل ورێ دكە، ب واتەیا هەری فرەه ژ پەیڤێ رە، و شێوازێن ژیانا خوە یا رۆژانە، كو ئالاڤێ جوگرافی نیشان دبە، ب واتەیا ( ڤەخوەندنا جهـ كو ئەو ب خوە وەكە خانییە ژ مرۆڤ رە )، داكو مال" خانی" كۆمبوونەك ل هەڤسوار د ناڤبەرا خورستی و تشتێ كو خورست راگرە ئان راهێژێ

دهۆك



وەکە ئمزەکرنا نشتەجی (و دخویایە کو خورست- وەکە دەربرینا فیدال لابلاش- جهـ ئامادە دکە، و مرۆڤ ئەوی ئۆرگانسم دکە ژ بازاری خوە رە داکو گەش و خوەش ببە..پاشی، دبێژە: بازار د ژینواری خوە یا جوگرافی دە ئافریدەک زندیە وەک چ ئافریدێن ئۆرگان کو هەنە، کو جۆرەیەکێ ژ هەلبژارتنا خورستی دهەلبژێرە...)[٣].

دبە گەریان ل دووڤ تێکەها" هەلبژارتنا خورستی" ب خوە، وەکە شۆپاندنا شێوازێ ژیانێ یە نە د جهەکی نیشانکری دە، و جانکێشیا خەلاسینێ ژ باندۆرێ وی، لێ ئەو دبە کێلیا داناسینێ پێ، تا د وارەکی فرەە دە" ئاخافتن ل سەر مرۆڤێ ئۆرۆپی، وەکە میناک، دانالیەک ئان دیرکرنەکێ ناکە، د سیبەرا وەلاتێن یەکینێ ب خوە دە، ئەو مایینا وی کو ئەو جودایا ویە د ناڤ چاندا وەلاتێ کو لێ ژ دایک بوویە، و دخویایە ب ئامادەبوونا خوە یا نەتەوی و چاندی و دیرۆکی...هتد، و د گیانێ وی ئەو بێریتیا کو نایێ وەسفدان، بێریتیەک دمینە د کوورایا دل دە، تاکو ئەو ئەشکەرە نەکە ژی، ژ جهێ یەکەم، و بازارێ یەکەم، و وەلاتێ کو دناسە ب ناڤەکی جودا و زمانەکی جودا و چاندەیەکی جودا و نیشانەکە نەتەوی جودا....

هەلبژارتنا خورستی، ب رەنگەکی بنیاد تێتە دامەزراندن د بازار دە، کو بازار ب کۆمەکی دیدەڤانێن زندی نە ل سەر یێن ب وان مژوول دبن، و ئەو د پێشبەرکێێ دە ل سەر تایبەندمەندیێن خوە، تا کو دکەڤن هەڤرەکێێ دە ب هەڤ رە، و یێ دکارە بێتر بەردەوام بکە وێ خورتر بە د ئامادەبوونا خوە دە، داکو ئەڤ هلبژارتن خوە ڤەگوهێزە ژ وارێ خورستی و بچە فرەهیا ئان ڤالایا دیرۆکی، و دیارە بێ چقاس دیرۆک گرێدایە ب خورستیێ.

ئەڤ یەکا هان مرۆڤ دگهینە پێکهاتەکێ دو روو: شارستانی و سیڤیلی د هوندرێ یەک بازار دە، ئەو دناسە د ئەنجاما کووربوونا شارەزایێن دیرۆکی یێن درێژ د ئاڤانیێ دە، کو د هوناڤێ خوە دە ئەو ئمزا مرۆڤانتیێ وەردگرە، و چ کەسێ کو پێ پێشکێش دکە وەکە ناڤنیشانەکێ، ئەو ژی دکەڤە قەوارێ گۆتنێ کو ئەو ( د وێنە و چێکرنا خوە دە ژ زەمینێن شارەستانیێ هەری خویایی، ئەڤێن کو رۆخساریێن خاکێ ژ وان چێدبن، ئیجا ئەڤ یەکا هان ژێ ب خوە دیمەنەک ئالوزە ب تێکلیێن بهەڤهووناندی، و بەرهەمێ هەمی پێکهاتنێن ژینوارا جوگرافی، و جوگرافییا ئاڤەدانیێ ئەو شێوێن نەوەکەهەڤ یێن جهێن ئاڤەدانیێ" بازارێن گوند" ڤەدەکۆلە، چ ژ دەر ڤە ژ هوندر ڤە..)[٤].

دێ ئیجا ئەگەر پێدڤیا فرەهیێ د تێکەها بازار بڤێ، ئەوێ د چەسپاندنا ل چ تشتێ کو گرێدایە ب دیرۆکدە بەئێ، و ئەو یەکا کو مرۆڤ د بن رۆناهیێن وی دە دهێلە، ئەو کاتەژمێرا گوهەرتنا وی ژ پانتا جوگرافی یا نیشانکری رە، کو ناڤەکە تای بەت ژێ رە هەیە" ناڤێ بازار"، کو دەرباری وی، د گەل داهاتی و هەنارتن ئێ وی، راستیا ڤی ناڤی جهـ دگرە، و چ رێوی ئان مرۆڤێ بیان و بلی وان دەما کو ل بازار تەماشە دکن ئەو تێتە ناسین ب ڤی، ئان وی بازاری.

و د ڤێ زیڤراندنا جوگرافی- دیرۆکی دە، هەڤرکیەک مەزن و دژوار هەیە: وێ چاوا دانا جوگرافی ببە ژ هێلا چاندەیی، و چاوا چاندەیی ب سیما جوگراڤی خویابە، داکو ئەو لهەڤهاتنەک پەیدە ببە ژ دەم و جهـ رە، کو هەردو ل هەرێمێ ڤەدگەرن و بەر ب دەرڤە دچن، د لیستەیێن تێکلیێن چاندەیی و جڤاکی و سیاسی ئان شارستانی دە، ئەو رەوشا تایبەت ژ جهـ رە ب دیر ناخە.

## دهۆك وەك میناك، دهۆك میناكا دیار

هەر تشتێ کو ب ناڤ بوویە تا نها مە نێزیکی دهۆکێ دکە، کو بۆ وێ ئەڤ مژار ل دارە ! کو شێوا بەربژۆرکرنا ئاڤەدانیە هەیە. و خویانیا ئەو نیشانێن گرنگ سیما حالخوەشیێ پێشکێشدکن، ئان گرێدانا ب دلکەتنا بەرهەمێن بازار، یانی ب پێهاتیا شارستانی یا کو پەنچەموورێن کەسێن دن داپێش دکە.

چ ل بەر چاڤان: ژمارەک گەلەک ژ ئۆتێلێن بەرکەفتی، و خوارنگەهێن بێ هەژمار، کو نیشانا وان

هەیە. ژ مرۆڤێ ب نیشانان مژوول ببە، کو ئەو سیمیا جهن د هوندرێ بازار دە، کو دیارن ب وان تابلویێن ئەلکترونی، ئان رۆنیدایی مەزن، کو دهۆکا گرێدایە ب جیهانا نووژەن بەرچاڤ دکە، و خەریقەتیا زێدە ژ هەژمارا ئوتومبیلان یێن دلڤن ئان هەنە د بازار دە، کو بەر ب ئازتەنگیک مەزن ڤە دچن، د ناڤبەرا پربوونا هەژمارێ و تشتێ نیشان کری و هەسان سەر ئاستا نەقشدانا جهی: کۆلان، و هشیارا چاندەیی پێ رە.

نێرینا دەربارێ زەمینا تەنشتی چ دیار دکە ؟ نەهەبوونا رێڤبرنا ئاڤەرێژێ، کو ئەو ژی ناڤنیشانەک بەلۆڤە ب خەتەرناکا خوە، و دیارە، و د جهـ دە ئەشکەرە دکە ئەو پێدڤیێن رەوشێن وسا یێن تەنگافیێ، کو چ مرۆڤ بە ئان یێ دهۆکی بە، ب واتەیەک جهـ گرتی هەمبەر هەڤرەکییەک بێ هەمپا.

راستە دەما ب ناڤ دبە کو دهۆك نائێ جوداکرن ژ هەولێر ئان سلێمانیێ، کو ئەڤ سێ بازارێن خوبایی ل هەرێما کوردستانێ نە، و د لیستا پەسندانێن بوهری ڤە، لێ هەر بازارەک نیشانەک جودا ژێ رە هەیە، کو ئەو ب خوە یە، کو ئەز ل ڤرێ ئەو کەسێ دنێرە ل دەستپێک و نووچەیا وێ ئەڤێن توبگرافی: ئەندازیاری، کو بالا خوە بدە مالبەندا وێ" دهوك" یا خورستی و چاوا ئاڤا بوویە و برێکرنا وێ ژ دانووستاندنێن جڤاکی و ئابووری و تا چاندەیی و سمبۆلی رە، د ناڤبەرا خەلکێن وێ دە و کەسێن سەردانا وێ دکن، کو ئاسێ مایی د ناڤبەرا دو توخووپێن چیایی دە، کو رێیەک ڤەکری هەیە ژ هێلەکێ، و دەرباسیەک تەنگ هەیە ژ هێلەکی دن ڤە" ئەز ل ڤرێ ئالۆکا ب ناڤ دکم"، لێ یا د بەر رە ژی ئەو جوورەتیا خوبایی د ژینوارێ جوگرافی دە ژ بازار رە ب هناڤا خوە: دەستپێک نەوال ب ناڤ دبە، و ئەو نەوەکهەڤی د نەقشەیێن بازار دە چ بەل چ نزم چ راستۆیی، کو هەر نەقشەک مەرجەک وێیی ژیانی و کارمەندی ل هەمبەر وی هەیە، ل سەر رادەیا هەبوونا پێدڤییان، و د بەر رە ئاسێبوونا زەمینێ و ئالاڤێن ئەندازیاری یێن هەنکووف د ئاڤەدانیێ دە، و ڤەکرنا رێیان... هتد.

مرۆڤێ ل دهۆکێ مەیزەدکە، بێ چاوا وها بەر ب چاڤ بوویە ژ هێلا هلبوونا ئاڤەدانی و چاوانییا رێڤەبەرییا ڤێ یەکا کار پێ بوویی د ناڤ چالاکییا خزمەتکاری، ئان نووژەن دە، لێ بێ کو ژبیر ببە ئەو رەهەندا بازرگانی، کو جهـ و چ تشتێ پێ ناڤ دبە، تا مرۆڤ ب خوە ژی جارجاران، ل گۆری پێکانینێن وێ دکڤن بازارێ سەرمایەداری، و مال ئان خانی ژ ناڤێ داپینکرنا ژیان وردەتر دچە، ل سەر داخوازا سیاسەتا خوەستەکێن هەری دورست ب ناڤ دبە، کو ئەڤ سیاسەت خوبا دگهێ وێ سیاسەتا کو پێک تێ و بەل بوویە ب ناڤەکی کو نرخێن جهی پێ تێنە داقورتاندن ب گەلەک واتەیان، ل گەلەک جهان، وەکە بەیرۆت ئێ ئەڤا ناڤدار، و ب دووراتییا بەرفرەها د ناڤبەرا بازار کێلیا لێمەزەکرنێ د دیرۆک و بنیادێ و بوویەرا ئاڤەدانیێ دە هەلبەت، کو ( داگرکرنا تێگەها تەکنۆقرات ژ ئاڤاکرنێ رە و پێکانینێن بیرۆقراتی یێن" ستەور: پێ کێر"، ئاڤاکرنێ ڤالا دهێلە ژ ناڤەرۆکا وێ...)[٥].

پەیڤێن د نیڤ دە سەر بەیرووتێ یە، پشتی کو وێرانکرنا مەزن یا سالێن خوەکوژێ بە تایبەتی، لێ قەومی، لێ ئەڤ یەک ب هزرا کو بازرگانیێ دکە ب ناڤێ سەمیانەکی بەرهێنانی ژ دەرڤی رێبازا وێیی جڤاکی یا گشتی، کو ئەو ژی پێناڤەکی گەلەکی شماتۆکی و سەرکاشە ب هەڤ رە، کو ئەڤ میناک بەرێ مرۆڤ ددە ئاستا فایدێ و تێکلیێن کو ل سەر ب جهـ دبن ژ هێلا بازارێ هەمبەر ئەڤ بازارێ کو گۆتارێ خوە پێ ب ناڤ کریە، کو مرۆڤ دلەرزە دەرباری سیما بازار و پێڤەچوونا بازار ئێ مەتەرسینا بنیادا وێ، بێیی ببنە وەکە هەڤ چکو بەیرووت بازارەک ب سەرێ خوە یە، و جودا یە ب گەلەک واتەیان، لێ د ماکا ئاڤەدانییا ئیرۆ دە گەلەک سینۆر رادبن، و بازار دگهێن هەڤ د وارێ ئاڤەدانیێ دە، کو ئەم دکارن سەر دهۆکێ راوەستن، بێ چاوا زانستیا ناسکرنێ بەرێ مرۆڤ ددە پرسێ زەمینێ، کو کووربوونەک دڤێ پرسکرێکێ دە هەیە،یا ب مژارا شێوازا ئاڤەدانیێ کو لیستەیەکە مەزن ب خوە دگرە تێتە گرێدان ب ئاڤاکرنا خانیا چ فەرمی چ تایبەت، و جهێن سەیرانێ

و بهنڤەدانێ و هۆلێن جودا کو بەلاڤ دبن د باژار دە، و نڤیسگەهـ و پارکێن نەوەکەهەڤ، و دەرباری کۆلانان و چێکرنا وان یێن کو ژ هێلان دیارن..هتد، ئەڤ هەمی باژار هەمبەر لێپرسینەک مەزن تێنە بەرسڤدان، و د یەک گۆتن دە: گەلۆ وێ چاوا رەگەزێ وێ یێ جهواری ب ناڤ ببە ؟

جوورەیەک ژ داقورتاندنەک زەمینی و بەرفرەهـ پەیدە دبە، ژ پێناڤ ئێن چار هێلان دەرباس دکن، ئەو هێلان کو هاتنە نەقشکرن بۆ ڤێ ئەنجامێ، سەر داخوازێن فایدێ، کو ئەو داماێ رامیاری د تایپەتمەندیێ دە ئان هاوکێشەیا تەڤلهەڤبوونێ ناڤبەرا نشتەجی و نووژەنی گەلەک نەچارە، وەکو ئەز دزانم ئەڤ یەکا هان نەهەوجەداری داخویانیێ یە داکو جودابوون دیار بە، و ئەنجاما وێران ژ پێڤەچوویا نەقشا توبۆگرافی.

ل ڤرێ تێ گۆتن کو هزرا تاوکرنێ ئاڤا دبە د رێیا هێزێن ب کێرهاتی، ل سەر گەلەک ئاستان، داکو ژ رێ دەرنەکە" نەبێ خاپاندن"، د لەهیا شەوقڤەدانا نووژەنیێ یاکو ئەم دشۆپینن د کەنالێن تلفزیۆنێ و وێنەیێن کەتەلۆکێن ئاگاهداریێن رە کو تێنە دامەزراندن، بۆ کشاندنێ، و د پەیرە وەرکرنا بەرخور د دافکێ دە، و کێمبوونا هشیاریا بەرخور ل ڤرێ، چمکی کێشان دهێلە مرۆڤ خوە ژ بیر بکە، و بلڤە وەکە داخوازا هێلا وی ب خوە رە دبە، کو سەرخوەشیەک هەیە چ سەرێ باوەرێکری ئان ڤۆنتەرچی و کریار کو هەردو بەرخورن.

ئیجا ئەم دکارن هنەک ئەزمونێن بەرێ ب ناڤ بکن، کو ب بارانێ تێنە گرێدان، و د دەستپێکێ دە باژارێ قاهیرە، کو گەلەک تشت ئان نووچە ئان بویەر وێ پێشکێشدکن، د پرتووکەکێ دە، کو باژارەک خوەدی ناڤێ خوە بوو، بەریا سەد و پێنجی سالی، لێ نها، چاوا ل بەر چاڤ دکەڤە؟ کو (تاخێن خوەش و دەولەمەند ب دار و شینکایی و بلبلێن خوە د تاخێن مسرا نوو و مەئادی و دقڤی دە، ئەڤ هەمی کەتنە بن کۆمێن چمەنتۆ و جامان د وێنەیێن ئاڤاهیێن وەکە قوتیکانن ئە ب سەر خاکێن ڤیلائێن بەرێ دکەڤن، و رۆناهی و بایێ دنەخمینن، و خازێ هەزارێن ئالاڤێن سپلێتان بەرددن، ژ دێڤلا رێبازەک خورستی ژ بایەکی پاڤژ، و د سەر رە ژی گورگور و بەلاڤبوونا خازا هەزاران ژ ئۆتۆمبیلێن ب سەدەم و بێ سەدەم دچن و تێن...)[٦].

بەلێ، بەرەڤاژیا گەلەک تشتان یێن کو هەوجەدارێن پێشگۆتن و راڤە و هنجەتان د پێکهاتنەک دیرۆکی سینۆرکری، و دەربرین دەرباری هەلوەستەک دە، بەرەڤاژیا ڤان خالکان، باژار نە هەوجەداری نێرینێ سەر وی، ژ کەسێ خوەندە، داکو زانبە چ وی دچەسبینە ژ هێلا خانەدانیێ ڤە ئان دژبەریا چ کەسێ کو درامە ب شێوەیەکی جودا و داخواز بوویی، کو ناسنامێ زەنگین دکە، و چاندەیا پێ ب ناڤ دبە ب هنەرتر دکە.

چ دیارە؟ ریشەک ژ جە، ژ خورستیێ لێ دارە، و تا هەمبەر چیا ژی، د خەلەکا" زیدەگاڤیان: تەجاوزاتان" دە، لێ یا خویایە ئەو تشتێ کو ب جهـ دبە ئان ب کار تێ، سەر مەبەستا ئاڤەدانیێ، ل سەر یەکا کو ب کار دبە د دیمەنا رۆژانە دە، د گەل گەلەک مرۆڤێن کو پەیوەندیدارن ب باژاررە، د رێبازا ڤەگوهاستنێ ژ جیهانا سەردەمی، و ئەو ژی ئەگەر راستیەکێ ب ناڤ بکە تەڤەز وێ ئەو بە، کو دیرتی و دیربین ژ کەسیتیا خوەدیەتی، هەرێمی، و پێدڤیێن ناسنامێ، و وەکو ئەڤ یەکا هان خیانەتەکە جهکرتی ژ هوندر ڤە ژ بیروەریێ رە، بیرەوەریا کو مرۆڤ ناهێلە نە ب باڤ و باپیران تەنێ رە، لێ مرۆڤ دیری چاندەیەک نۆرمال دکە، کو دبە چاندەیەک دن وەکە ڤەیرۆسەکێ کو جارجاران ناهێلە مرۆڤ ب خوە ببینە، ب سەدەما پرسگرێکێن کو دکەڤن سەر هەڤ، کو ئەو ب خوە ژی وەکە ڤەیرۆسا کشاندن ئان ژرێبوونا ئامادەیێ د گەل چ کریارا تاکو سانە ب ژی ژ دەرڤە و بلی وێ.

ڤەیرۆسا ئاڤەدانیێ ئەوە یاکو ئاڤەدانیێ وەکە ئاڤاهی، و تشتێ دەردۆرێ ژ هێلا نیشانێن بلنداهیێ و چارەسەرکرنا وێ یا هەرێمی پێویست.

دەرباری ڤێ مژارێ، هەمی دزانن" ئەز ب ناڤ دکم چ کەسێ خوەدی تێکلی ب باژار و خوەستەکێن وی"، کو دیربینەکە گەلەکی خویا هەیە: درێژی و پانبوون

و کووربوون، دڤێ بێ ڤوتکرن، د ناڤبەرا گۆند و بازار دە، ب واتەیا کو بازار توجار نە هەمبەر ناڤێ خوە یە، بێ پێکانینا نێرینەکێ ژ پێش ڕە، و د پێناڤەک فرەهـ ڕە، کو تێکەلیێن هەری دەولەمەند و جودا، و سەر زەمینەک جودا ژ وێ زەمینا سست، یاکو گوند نوونەر دکە، کو ڤالایی نەما دمینە ئەو ڤالایی، و نە خاک دمینە ئەو خاک، و تا دار ب خوە ژی نە ئەو دار دمینە، تا جانەوەر نە ئەو جانەوەر دمینە ژی، ئەو ئێ کو دیارە ل گوند، ئان ل چۆلێ، و ئەڤ یەکا هان ژی ب دەمێ ڤە گرێدایە ب شێوەکی کوور.

و داکو ئەم دیر نەچن، ئەمێ بلڤن د ناڤدانا دهۆکێ، دهۆك بازار بەر ب چاڤ، و وەکو تێتە دیتن، ب لیستەیێن خوە یێن ناکۆکی، کو ب کورتی دگهێن هەڤ د یەک ناکۆکیێ، یەک نیشانێ، ئەو هەبین نە هەڤ گرتی، و نە دروست ژ بازار ڕە و ب ڕاستی. ئەڤ ژی نە بەرسڤەکە سەر یێ کو هنجەتان پێشکێش دکە، ب ڤەگەریوونا د گەل دیرۆکا نێزیک ڤە، و ئەو کامباخیا کو هاتبوو سەرێ ژینوار و خاک و خورستێ سەر دەستێ ڕژێما بەرێ، و ئەنجامێن ڤێ شۆپاندنێ د پەیڤێ دە، و تشتێ کو سەڤا ئان دەردۆرا بازار ناڤنیشان دکە، ئان دنخومینە سەر چەوتییەکێ کو توجار ناهێلە مرۆڤ خوە کەر بکە ژ هێلا پەربریاریێ نها ب خوە، و چمکی یێ دکەڤە تالووکێ د ئامادەیێ دە هەمیان ب ناڤ دکە، بێ ئاوارتە، دڤێ نێرینا کو بازار گشتی پێشکێش دکە ڤالی والی.

## میناك:

تشتێ کو بالکێش، و پرسان دوورێزی هەڤ دکە، ئەڤ یەکا دخویایە، یەکا کو مرۆڤ دکارە دەست بدێ و ببینە، کو چاوا بزیڤرە، ل چ هێلا بە ژی وێ ل بەر چاڤ بە، ژ هێلان تێلێن کو ب دیوار ڤە ئان ل هەڤ گەریایی، و تێلێن ئەلکتریکێ، کو دکن بگهێن

دهۆك



مرۆڤ، و د کۆلان و سکاکێن تەنگ د ناڤ مالان دە، و ژ هێلا کۆلانێن دەرباری هەڤ کوو داکەتینە بنی، و دهەژیان وان تا ب گڤاندنا بایەکی سڤک بە ژێ، و جارجاران ژ ڤوتکرنا وان ژ نشکێڤە، ژ دیتنا وان سەر خاکێ، و ئەو دیتنا مالێن د رووێ ئان هەمبەر هەڤ دە، کو نەوەک هەڤن ل رادەیا نیشانا ئەنجێری سەر کۆلانێ کو پێناڤا رێباران تەنگ ئان فرەهـ دبە بێ یاسەیەکە ئۆرگانزمی، ئەڤ ژی گەلەک ئالۆزیا دەدرینە و تەڤلهەڤیێ چێدکە، یەک ژێ ژ هێلا نێرینێ ب خوە د خواربوونێ دە، ئەو ل سەر ئاستا نەقشێن جهـ ژ ڤۆرزیکان، ب واتەیا کو چەوتییەک د رێزێ دە یە، کو پێدڤیا راست بە ژ گەلەک هێلان، وەکو مرۆڤ تەماشەدکە ل تابلۆیەکە سوریالی، لێ وێ هەلبەت دیری هۆنەریێ بە، د کێلەکا جهێن شاش دە ژ راوەستگەهێن ئۆتۆمبیلان کو ئەو ژی جهنان دادگرن بێیی تو رێخستن ژ رێباران، کو ئەو ژی ب خوە شاشییان وەرگێر دکن، تەڤەنی نە دیارن د نەدیریا ستووربوونەک نیشانکری ب خاکێ رە راست دبن، هەلبەت مەبەست ل ڤرێ ئەو رێبارن، کو گەهـ ب هەو دکڤن گەهـ نزم دبن تا بنیا ئاستا کۆلانان.

ئەز دبێژم گەرەک ئەم گۆتنێن ب هەڤ رە زەلال بکن تا مرۆڤ کاریە، دەرباری تێکەلیا د ناڤبەرا رۆخسار و جەوهەر دە: کو تشتێ ل بەر چاڤ مرۆڤ دناسینە ب لهەڤخستنەک بەلۆق ل گەل تێکەهـا بازار ب خوە، کو ئەو مرۆڤ ل پاش دخە، ئان ڤەدگەرینە ل سەر وێ رووتیێ ژ پەیوەندییا کو راستی ئەو گرێدایی ب تایەبتمەندییا بازار، و پێدڤییا هەڤراکرنا هەڤگرتنا ناڤبەرا رۆخسار و جەوهەر، کو د گەلەک بازارێن ئۆرۆپی دە ڤ من سەردانا وان کریە، وەکە فرەنسا، و ئەلمانیا، سوێدە، و بەلجیکا و نەمسا یێ...هتد، گەلەک یانە" نادی" یێن رووتان هەنە، و جهێن تایبەت ژ وان نیشان کرینە، و تا دەمسالێن وان هەنە، لێ یاکو دڤا هایێ مرۆڤ ژێ هەبە ئەو تشتێ گرێدایی ب تەناهییا گشتی، و تەندورستییا گشتی، و سەر ئاستا بازار، ئەو یەکا هان دمینە تشتەکی دن، کو گەلەک کێم یەک تێلێن ئەلکتریکێ تێنە دیتن، ئان ئەو نەوەکهەڤیا نەفرەت د ناڤبەرا رێبارەکێ و یێ دن دە، ئان سەر نێزیکتی ئان دیرتییا ئاڤانیێ ژ کۆلانێ، لێ ئەو ئۆرگانیزمەکە دورست هەیە، ل بەر جاڤێن تەنێ ژ هێلا شاریێ، لێ ژ مرۆڤان هەمیان ژێ، و گەلەک کێم تێتە دیتن راوەستاندنا ئۆتۆمبیلەکێ ل جهێ دن دە، و تا ل سەر پرسا گلێشێ "زبالێ"، دەرباری جهەکێ نیشانکری ب ناڤێ "گلێشخانە: (حاویە)"، کو جورە نە، ل گۆر تشتێن دێنە ئاڤێتن و قەوارا وان.

ئەڤ یەکا هان ب کار تێ ل سەر تێکەهـا کۆلانێ و گرێدان وێ ب بازار ڤە، و ئامادەکرنا پێکهاتی ژ فرەهیێ رە هەر دەرێ، چمکی گەروا" شەرتا" مەزن یاکو بازار پێ دژێ، دیار دبە د چاوانیا هزرکرنا مەرجێن دەم و جهـ دە، و ئەو بەرسڤدانا د جهـ دە د گەل هەر تشتی، هەما وەکو ئەم خوە دبینن هەمبەر ئەڤ با ناڤ دبە "پاشخستکریێ خوەندی"، کو بازار ئامادەیە و ژ بەر کو بازارە و وارگەهە ژ هات و چوونەیا بێترین مرۆڤ، و پێکڤە ژی ئەو زندەبوونا نشتەجیان ب خوە، کو پەیڤا" زێدەیی یا خەلکان" ب خوە پێک تێ، هەو د خەلەکەک تەنگ دە، دەما دەربەرینەکێ ل سەر تەنگایا پێناڤا خورستیێ، لێ سەر ئاستا دەرسا ئەنجێری، ئەو یەکا هەسان ئەشکەرە دکە کو بێتە زانین: هەر کو بازار ئامادائەیە ژ فرەهیەکێ بنیادی و ژ دەردۆر، ل گۆری جهـ و چاوانیێ، و هەر نەدیاری ژ رەهەندەکە جهی، دبە بارەک ب سەردە: کێلیا نەدیاریا پێناڤا زەمینی یا ئامادە ژ فرەهیێ د رێیا وێ رە، کو ئێجا دڤا فرەهیەک زەمینی پەیدە ببە د رێیا نەقشیەکە توبۆگرافی: ئەنجێری، ل سەر ناڤەکی پێ گرێدایە: تۆرا رێیان، کو ئەڤ، بێیی لێڤانە، د ئاستا رەهـ و داماران دەنە، یێن پێشوازیا خوینێ دکن ژ لاش و دزیڤرینن کو سافی دچە، و بازا لاشەکە زندیە، و هەر بارەک ژ نشکا ڤە، دخوزە هنەرەک ئان چالکرنەک نەخویایی ئان نووهکری، کو بێ ڤێ یەکێ ب هەسانا وێ بێ ئاخافتن ل سەر مرنا شانان نە ساخکرنا وان ئان بکارانینا چالاکیێن وان، و ئەڤ ژی

تێتە زانین د رێیا پەسندان و هەڤبەرکرنێ د ناڤبەرا کارێن راکرن و ئاڤەدانکرنێ، و د پەیرە، ئەو تشتێن نوهدەرکەتی ل هۆلە، ل گەل چەسپاندنێ ل سەر پێدڤیا ژێهاتیبوونێ ب گوهەرتنان رە.

و دبە کو ئەڤ ڤەگوهەست کو ئەز ب ناڤ بکەم، یاک ئو د گۆتارەکی بەرێ هاتیە وەشاندن، بکەڤە وارێ ئێشاندن و لەرزاندنێ ب هەڤ رە، کو ئەز سەر بازارێ ئەرەبی دیەیڤم، کو نرخ دبە بازارەکی سەردەم (بازارێ ئەرەبی، بێ سەردە ژێ، خوە ب ناڤ ناکە، ب خانەدانیا خوە، ب ناسناما خوە یە سەربەست، د لهەڤکرن ب جهـ رە. ئەو ب خوە بازارەکی خوەپێشانە بتمامی، ب گەلەک واتەیان ...)[٧].

خوەپێشاندان نە زێدی فەدکارێ ب جەوهەر رە بۆ خاترە رۆخسان، و ئەگەر ئەم دروستکرنەکە بێتر بخوازن، دڤێ ب ناڤ ببە کو جەوهەر خدمەتکارێ رۆخسار، و یاکو هەری پێویست کو دڤیا ب ناڤ ببە، ئەو ئە، نەدیاریا گشتی ژ جەوهەر رە د گەلەک جهان دە، د سیبەرا هۆڤتیا رۆخسان، ئو زۆرداریا ئەنجاما پێ ب ناڤ دبە، چمکی ئەو تو نرخی ناسپێرە دیرۆکا هەرێمی، ئان خوەدیاتی، ئان مکوربوونەک ب تایبەتمەندیەکێ، کو قیمەتەکی ددە ناڤێ هەرێمی، ئەو ژێ بەر ب نووبوونەکە بێ زەمین کو رۆخان و کاماخی ب جهـ دکە.

نە ئەڤ تەنێ، لێ بەلێ کو خوەپێشاندن و پێکانینا خوەپێشاندنێ زرارەک مەزن دگهێنە تێگەها فەلسەفی ژ ناڤێ خوەپێشاندنێ ب خوە ژێ، چمکی نرخەکە هونەری بەر ب جاڤە و پێک تێ د دیمەنا خوەپێشاندنێ دە: د گەل شانۆ، د سینەمایێ دە و بلی وان، د رێیا ئامادابوونێ ژ ڤێ چالاکیا کەرنەڤالی، لێ ئەڤ خوەپێشاندانا کو وەکە سەمیانەکی پێک تێ د رێبازا نێزیکدایێتنا ڤی بازاری، مە هەمبەر نەدیارۆیا لهەڤهاتنا" هەرمۆنیا" کو ب ناڤ دبە، د ناڤبەرا کارێهاتیێن خوەپێشاندانێ: ئاڤاهیا کو بلند دبە ل جە، و یەکا کو وی بەر ب چاڤ دخینە ژ دەرڤ ئە، و ئالاڤێن وێ ژ هوندر ڤە، لێ خەتەرناکا کو ل هەمبەر ڤەکەتیە کو نابێ سەر زمان گەلەک جاران، ئان ببیر نابە، ئەو ئە:جوورەتی زەمینا جڤاکی و چاندەیی یاک ئو ل سەر ئاڤا دبە، ئەو ژ هەڤکەتنا د جهـ دە، ناڤبەرا لیستەیەک دانووستاندنێن جڤاکی، و هەولادانا ل سەر رێیا چ تشتێ ب نووژەنیێ ڤە ب کار تێ، و ئەو ئەنجاما دژوار کو بیرەوریەک جڤاکی کو دهەلوەشە، کو دژبەری چ خوەستەکا گرێدایی کەلەپوور ئان بوهریێ ئان چاڤلێکرنان...

گەلۆ ل کورێ مرۆڤ دکارە سیکێ بناسە هەمبەر تشتێ ب ناڤ بوویە؟ و چاوا رێ بەرێ مرۆڤ ددە سیکێ، و شێوەیا رێڤبەریا کاران، و رەنگێن تێکلیان ناڤبەرا گەلکان: کنج، گۆتنێن پێکتێن ل سەر زمانان، ئەو هەلوەستێن کو دەرتێن دەرباری بازار و وێنا بازار..هتد.

بێگۆمان ژهەڤکەتنەک هەیە کو بەل دبە ژ گەلەک هێلان، و یا د نیڤ دە ئەو: نەدیاریا هەستێ ب وێ پێناڤا کو بازار و گوند ژ هەڤ دیر دکەک چمکی نشتەجیێ بازار ئەو ب خوە ب گۆند ڤە نە تەنێ گرێدایە، لێ بەلێ ئەو ب گوندیێ د پرانییا رەفتاریا خوە دە، ئیجا پرسگرێکەک مەزن خوە ب جهـ دکە د هوندر دە، ب تایبەتی کو ئەو جوداهی ب ناڤ نابە، کو مکوربوون تونە یە، دەما کو ئەو هاتووچوون د ناڤبەرا وان دە تو نەوەکهەڤیەک دروست دیار ناکە ل سەر هزرێ، وەکو ئەو هەردو یەکن، وەکۆ تشتێ دکارە ل گوند ببێژە وێ کاربە ل بازار ب خوە ژێ ببێژە، و تمی ل گۆری بەرژەوەندییا گوند و سیستەما گوندایەتیێ، یانی، ل گۆری هزرەک خوە ژ هەڤ بەردایی، کێلیا کو مرۆڤ د بازار دە برامە، و چ ب ناڤێ بازار تێتە گۆتن، ل ئاستەکە گوندی کو دبە سەدەمەک مەزن ژ گەلەک رێباز و تا ئالاڤ ئن خەراب زرارێ دگهینن بازار و تێگەها بازار، و دهۆك بەریا هەر تشتی وەکە چ بازارێ کوردستانێ یە، د گەل گەلەک ناکۆکیێن د زەمینێ دە، و دیمەنێن تێنە دیتن، لێ دمینە خوەدی ستامبەک نیشادایی ب جوگرافیا خوە، و یا دروستر، ب ئەنجێریا خوە، د رێیا داخویانیەکێ کوور هەمبەر دژوارتیێن گرنگ، کو تێنە ب ناڤکرن ژ بنیێ بنی، کو ژ برڤاندنا : رۆخسار وردتر مرۆڤ دبە و هەر دبە.

## دەرباری میناکا دویەم

تشتەکی هێژا هەوجەیی بیرکرنێ یە، کو گرێدایە ب یەکا کو ب ناڤ دبە" خورستیبا دویەم" ل دەڤ پرانیێن ئۆرۆپیان، و ئەم هەمیان ب ناڤ ناکن، داکو ئەم سووجدار نەبن ب تونەرەیێ، و ئەز ل ڤرێ ناڤنیشان دکم و تێکلیا چەندی ب چاوانی ئان بەرەڤاژ، ژ هێلا هشیاریبا بازاری ڤە، ب واتەیا هاتنارێژی ژ بازار، کو بازار دبە جیوارێ یەکەم و داوی ژ هزرێ رە، کو گەلەک هەسانە ئەو چەسپاندنا سەر ناکۆکیا ئاڤایی و خوەدیتی د رامانێ ئۆرۆپی دە، کو ئەو یەکە، ژ زێدەیی سەدسالی، د ناڤبەرا ئەو تشتێ ژماری: ئەو تشتێ کو گەرەک بکهێ ئان ژێ رە پەیدا ببە، داکو خوە ب بازار ب ناڤ بکە، کو ژ زاروێن بازارە، و یەکا چاوانی، کو ئەو ژی دەرتێ ژ هشیاریبا وی یا کوور و فەلسەفی، کو بازار دمینە ژێدەرا وی د هەر تشتی دە، چقاس گوهەرتن د گەل وی چێببە، ئان مەرجێن وی نەوەکەهەڤ بن، و کو ئەم بنێرن د شوون دە، تا چ ئاستێ ل خوە دنێرە، کو خوەستەکا وی دمینە رێیا بەهەورمەندیبا وی ب بازار ڤە، و دلسۆزیبا وی ژێ رە، و ب هەمی چاندەیا وی، و پەسندارییا وی ژ خوە ژی ب ڤێ بەندێ، بێیی کو گەلەک بپرسە بێ کی رێڤەبەرێ دکە، چمکی یاسەیەک هەیە، توجار نابێ دەرباسکرن، ژ چ کەسێ کو لێ دژی ئان وێ سووجلی ببە، و ئەو یاسە نشتەجیان هەمیا رادگرە، و د دۆماهیێ دە ئەوە کو هشیارییا سەر بازار ب هەمی واتەیان ژ زەمینێن هزرێن پێویستن، نە ژ شەلافیەکە کەسایەتی، و نە دبە ژێ، کو ئەڤ ژی بازار دهێلە نەینکەکە دورست کو دیار دکە چ وێنەیێن کو مرۆڤ پێ بەر چاڤ دبە ئان ژانا چ کەسێ لب ئاژار.

یاسایا سیڤیل هەمی نشتەجیێن خوە هەمبەر ئەزیتیا وان" نەفسا وان"، هەما وەکو بازار بەرپرسیارییا وان دکە، و ژیانا وان دنرخینە، هەما وەکو ئەو بریار ددە کو ب رۆلا هەری پێویست رابە ئان ب کار بینە، هەمبەر هەڤرکیێن گرنگ، چکو ئەو ئاڤاهیەکە چاندەیی یە، کو ئەو د ئەنجامێ دە کارەکی ئەنجێریە پێک تێ، کارەکی تێتە ڤەکۆلین ب بەشداریێ کۆمکی، جڤاکی، دەزگەهی، بنیادی، کو دەربرینەکە هەری خوایی ل سەر ئایندێ پاک ئو هەم پێ دلشاد ئان بەهەمەن بن، وەکە نیشانەکە کو دکارن ب هەڤ رە بژین د بازارەکی دە خوەدی زەمینەک خورت د جهەکی هەڤگرتی.

## دەرباری میناکەک سێیم

د رێبازا هەلژمارا خوایی سەر گەلەک تشتان دە، گەلەک زەهمەتی هەیە، کو هەر یەک دلخوەش بە" دلێ وی د جهـ دە بە"، ل سەر سالۆخیا کو هەر تشت وەکە خوە یە" ب خێرە"، چمکی گەلەک هەسانە کو مرۆڤ ببینە د هەلکەفتەکێ دە" بێهنڤەدانەک ژ چەند رۆژان"، کو هەمی هەست دکن د بهابوونێ دە، چکۆ هەر تشت ژ دەرڤە تێتە وەرگرتن" کرین"، تا دەبێ کو داربەستێن مریان ژێ ف کار تینن، و دارکێن دنانان و تا تڤر ب خوە ژی...هتد.

گەلۆ وێ چاوا ببە کێلیا کو بوویەرک ئاوارتە بقەومە و دەمەکە دووم بکە ؟ ئەز دبێژم وێ بازار وێ ڤالا ببە ب تمامی، و مەبەست ئەو ئە، کو دهۆك ل سەر زەمینەکێ ئاڤا بوویە کو ئەو نابە زەمین ژ هێلا ئامادەکرنا پێدڤیانا بازاران، کو ئەو ژی پرسەک، بێگۆمان خەلکێن دهۆکێ ناخوازن دەنگ بکن د گەل سەرێشاندنا وێ، وەکوو دیارە کو ئەو هەست مرۆڤ ب بازار گرێددە تونە ئان پر کێمە، ئان پەیدە ناب وەکو تێتە خوەستن، ژ بەر رەئاکسیوونێن مرۆڤان، و ئالۆزێن وان، کو دوەرگەرینن ئەو یەکا کو تخووبێ ئاڤەدانیێ ب خوە دەرباس دکە، تەڤی کو ئاڤەدانی نە تەنێ سەر ئاڤاهیێ یە و پێدڤیان، ئەو وەکو تب ناڤ دبە : ئاڤان، ژ ئاڤا و ئاڤات، یانی ب ژیانێ گرێدایە، وەکو وارگەهە، و تو نرخ ئان قیمەت ژێ رە نینە، بێیی هەبینا مرۆڤ یا ژ دل، دەما کو هەمی هەوجەداری و پێدڤیێن وی ب جهـ بن، مانە بازار ب خوە تێگەهەک مالەیی فرەهە؟ کو چ گوهەرتن چێببە وێ پێدڤیبا خوەستەکا ئەنجامێ

ب جهـ ببە یان وێ تەنگەزاریەک وێ ب ناڤ ببە، د دیمەنیا دینامیکی دە ژ جهـ و دەم رە، و د ڤر دە قەوار و هەلژمارا نشتەجیان کو ( قەوارا بازار دراوەستە ل سەر هەلژمارا نشتەجیان و پانتا کو خانیێن وان جهگرتنە لێ، و دگەل مەلبەندا بازار، ئەو بریار دبە ل گۆری کار و بارێن کو خەلکێن وی ئان پرانیێن وان پێ رادبن، ئەو ب وان تێن ناسین، کو ئەو وەکە نیشانەکێ ژێ رە.)[٨].

ل ڤرێ چ هەیە؟ ئەو بارگرانیێن کو ل هەمبەر دهۆکێ درابن نایێن ژمارێ، ل گۆری تێکەها قەوار و هەلژمار و پێدڤیان، بەرەڤاژی، نیشانەک مەترسینە هەیە کو بارگرانی بێتر دبە دەما کو مرۆڤ دکەڤە هالخوەشیەکێ زێدە و دبە بەرخورەکی خویابی ل هند کریارێ ڤەکری ڤە، ژ هێلا کنج و خوارن و ڤەخوارن و کرینا ئۆتۆمبیلێن نوو و بها، کو کەسێن ڤێ میناک وها بازارتیێ دبینن، کو هەمبەرێ بازار د بارگران ڤان هەمیان ژ تەرەزۆیێ دکەڤێ، و ل ڤرێ نەما تێتە خویاکرن بێ بەرێ بازار ب کوودە یە .

د ناڤدانا دیمەنا بارانێ دە، کو دبە وەکە زەنگێ کو لێدده، ناڤنیشانەکە ب هەبینا خەتەرناکێ، کو چڤاسە سانەیە کێلیا مرۆڤ بچە تا داوییا هێزا نێرینێ داکو دهۆك لێ مەیزە ببە وەکە نموونە ل گەل خوینایا بازارەکی بێ تەماشەڤان دکێشە ژ دوور ڤە، و وەکو ئەوی خەمگین دکە، چکۆ ئەو مرۆڤەکی زانە دەرباری وێ چاندەیا هەڤبەرکرنێ یا ئاڤەدانیێ د ناڤبەرا بازارێ کو دناسە بێ چاوایە، کو ب خوە دناسە ل سەر تایبەتمەندییا وی یا جڤاکی، و بازارێ پڤدایی، نەجهگرتی، و تا بازارێ کو بهنەکێ دەردخینە ژ بەرماییا ڤە، د رادەیا خانەسلیەکێ، کو هنەک ببیر ئان ب ناڤ دبن ژ شۆپاندنەکێ ئان ڤەشارتیەکێ، نە زێدی تۆڤکا" هەبا" کو ئێشا گران دراوەستینە، و د دیمەنا بارانی دە، گەلەک هونکووفی بناڤکرنێ نە:

وێ چ ببە سەدەما کو باران بەردەوام بە؟ هەمبەر ڤێ یەکێ : گەلۆ چ ئامادەبوونا خوە ژ بوویەرەک وها کریە، تاکو دلسۆز بە ژ نشتەوارێن خوە رە؟ و پرسا پرس و ب هنەرتر: گەلۆ بەرپرسیاران چ دانێ، تاکو ل گۆر ناڤێ خوە بە، ئان د رێیا کو سەر چەسپاندن، وەکۆ ل زۆر ب ناڤ بوویە ؟

هەوجەداریەک هەیە ژ گەلەک کارێن هەڤبەش: ئەنجێری و شێورداری و چاندەیی جودا، د رێیا راخستنا نەقشەیا بازار، و راوەستن سەر زەمینا وێ یا خورستا خاکێ، داکو د بەرپرسیا بسپۆرێن ب جهـ دناسن، ئان نێرینێن ئن کو رەوشەکە هێژا داڤێژن سەر جە، وەکە نیشانەکێ، داکو ببە وێنەیێ خوە ب خوە، نەکو ڤەگوهەستنەکە بێ تەرەزووکرن، ئان کاریکاتێرەکە کرێت بە، گرتی، ژ ئالەیەکی دن، کو ب تشتێن بریقۆنکی چەوت تێنە دیار کرن، ئەڤ رێیا نوو ژێ وێ ب ڤەکۆلانا سریپان" تۆنێلان" بە، و پەیدەکرنا رێکارێن ئاڤەرێ، و ئاڤاکرنا پرێن فرین، و تشتێ کو وێ بێنە گوهەرتن د ئەنجامێ دە، د زمینا بازار ب خوە دە، لێ بەر ب پێشڤەچوونێ دە، کو ئەز گۆمان ناکم د کارانینێ بازار، و ڤیانا پێدەبوونا پێدڤیان، دەرباری هەلوەست و ئاورێن ئەنجێری و ئستاتیکی، داکو بازار ب کوردییەک هنکووفی خوە باخڤە.

زەنگل لێدا !

دبە کو ئەو گۆتنەک رێ ل بەر ڤەکری بە د جەوهەرێ خوە دە، ئەڤ یا نیشان دبە بێ دیتنەک ب سەرێ خوە، کو رۆخسار وەکە ئەختەبووت پێرە پێرە ستوورتر دبە .

گەلۆ مرۆڤێ دهۆکی ل کو دژی ناخوە د گەل بازارێ دهۆکێ دە[٩]؟!

زنگل لێدا !

دهۆك

# قەزا دهۆکێ

موسەدەق تۆفی

بازێرێ دهۆکی کو سەنتەرێ پارێزگەها دهۆکێ یە د هەمان دەمدا سەنتەرێ قەزا دهۆکێ یە، قەزا دهۆکێ ژی یەك ژ حەفت قەزایێن پارێزگەهێ (دهۆك، ئامێدیێ، زاخۆ، سێمێلێ، شێخان، ئاکرێ و بەردەرەش)ە، دهۆك یەك ژ کەڤنترین قەزایێن کوردی یێن لیوا (پاشتر پارێزگەها) مووسلێ و یەك ژ سێ قەزایێن بەراهیێ یە کو ل ۲۷ گولانا ۱۹٦۹ێ پارێزگەها دهۆکێ ژێ پێکهاتی کو ئەو ژی دهۆك، زاخۆ و ئامێدیێ بوون[1].

## سنوور و پێکهاتا قەزا دهۆکێ:

قەزا دهۆکێ ب جهێ خۆیێ جوگرافی دکەڤیتە ژێریێ پارێزگەها دهۆکێ، باکوورێ قەزایێ قەزا ئامێدیێ و هندەك ژ قەزا زاخۆ و باشووری ناحیا فەیدیێ یا سەر ب قەزا سێمێلی و پارێزگەها مووسلێ و رۆژهەلاتی قەزا شێخان و هندەك ژ قەزا ئامێدیێ و رۆژئاڤایی ژی هەردو قەزایێن سێمیلێ و زاخۆنە.

قەزا دهۆکێ هەتا سالا ۱۸٤۲ێ دەڤەرەکا سەر ب میرگەها بەهدینانڤە بوو، د ڤێ سالێدا ژ ئەنجامێ هێرشەکا لەشکەرێ دەولەتا ئوسمانی بۆ سەر میرگەها بەهدینان و روودانا شەرێ ناڤدارێ ل دەڤەرا ئیتوتێ یا نها تاخەکێ سەر ب دهۆکێ ڤە د ناڤبەرا لەشکەرێ ئوسمانی و لەشکەرێ میرگەهێدا، لەشکەرێ میرگەهێ شکەست و بەرەف ژوور بۆ ئامێدیێ ڤەکشیا و ل وێرێ خۆ نەگرت و د ئەنجامدا میرێ بەهدینان میر ئیسماعیل پاشایێ دووێ خۆ و میرگەهـ و لەشکەرێ خۆ رادەستی دەولەتا ئوسمانی کر و داوی ب ژیێ میرگەهێ هات یا نێزیکی شەش سەد سالەکان حوکمداری ل سەرانسەری دەڤەرا بەهدینان کری[2]. ب ڤی رەنگی دهۆك و هەموو دەڤەرێن پێشتر سەر ب میرگەها بەهدینانڤە راستەوخۆ کەتنە ژێر دەستەلاتێ سنجەقا (لیوا) مووسل یا سەر ب ویلایەتا مووسل یا ئوسمانی ڤە، ل سالا ۱۸٥۰ێ بوویە ناحیە[3] و ل سالا (۱۲۹۰مش)/ ۱۸۷۳ێ بوویە قەزایەکا سەر ب سنجەقا مووسلڤە[4]، ب ڤی رەنگی مایە هەتا ل ۲۷ گولانا ۱۹٦۹ێ دهۆك بوویە پارێزگەهـ و قەزا دهۆکێ ژی وەك قەزایەکا سەر ب ڤێ پارێزگەها نووڤە مای[5].

ل ڤێرێ پێدڤییە بێژم چەندین ژێدەران داکوکی ل سەر سالا ۱۸۷۳ێ وەك سالا ب قەزاکرنا دهۆکێ کرییە و من ب خۆ ژی د چەندین نڤیسینێن خۆدا ئاماژە ب ڤێ سالێ کرییە، بەلێ پشتی دووڤچوونێ ئەز نە گەهشتمە ژێدەرەکی یان بەلگەنامەکێ ڤێ چەندێ ب سەلمینیت و ل دووڤ زانیاریێن من یەکەم ژێدەر ئاماژە ب ڤێ سالێ کری پەرتووکا (دهوك بعد الحادی عشر من آذار)ە کو ل سالا ۱۹۷۳ێ هاتییەچاپکرن و وی ژی ب سالا مشەختی

١٢٩٠مش ئاماژە پێکرییە[٦]، یا پتر دەرگەهـ ل بەر من ڤەکری کو ب گومانڤە بەرێ خۆ بدەمە سالا ١٨٧٣ێ وەك سالا ب قەزاکرنا دهۆکی ژێدەرەکێ ترکییە دەربارەی پێکهاتێن کارگێڕییێن دەولەتا ئوسمانی و ل دووڤ وی ژێدەری دهۆك ل سالا ١٨٥٥ێ قەزایەکا سەر ب ویلایەتا وانێ و ل سالا ١٨٦١ێ قەزایەکا سەر ب ویلایەتا مووسلێ بوو[٧].

ژ دامەزراندنا قەزا دهۆکێ و هەتا ب پارێزگەهکرنا دهۆکێ ب چەند سالەکان چەندین گۆهۆرینێن کارگێڕی ل سنوورێ قەزایێ روودانە و سنوورێن وێ یێن کارگێڕی جار زێدەبووینە و جار ژی کێمکرینە. کەڤنترین ژێدەرێن ئاماژە ب پێکهاتا کارگێڕیا قەزا دهۆکێ کرین سالنامێن ئوسمانی نە، ل دووڤ سالناما دەولەتا ئوسمانی سالا ١٩٠١- ١٩٠٢ێ دهۆك قەزایەکا پلە سێ بوو، تنێ یەك ناحییە ب ناڤێ ناحیا مزووری (ئەترووش) هەبوو، ٩٩ گوند سەر دهۆکێ و ١١٦ گوند سەر ب ناحیا مزووری بوون، ئانکو سەرجەمێ گوندێن سەر ب قەزا دهۆکێ ڤە ٢١٥ گوند بوون[٨]. ئەڤ سەروبەرێ کارگێڕی ب ڤی رەنگی مایە هەتا دامەزراندنا دەولەتا عیراقی و ل سالا ١٩٢٢ێ پێکهاتا قەزا دهۆکێ و گوندێن وێ هەر ب ڤی رەنگی بوویە[٩].

ل سالا ١٩٣١ێ د دەمێ سەرەدانا عەلی سەیدو گەورانی بۆ دهۆکێ ل دووڤ گۆتنا قائیمەقامێ دهۆکێ دهۆك ژ سێ ناحیان پێکدهات:

- مەلبەندێ ناحیا دهۆك ب خۆ ١٠٠ گوند بوون.
- ناحیا مزووری مەلبەندێ وێ ئەتریش بوو خوەدی ٢٠٠ گوندان بوو.
- ناحیا دۆسکی مەلبەندێ وێ ل مانگێشێ بوو و ٩٠ گوند هەبوون.

ب ڤی رەنگی سەرجەمێ گوندێن سەر ب دهۆکێ ل سالا ١٩٣١ێ ٢٩٠ گوند بوون[١٠].

دهۆك



هەژیه ل ڤێرێ بێژین ل دووڤ ژێدەرەکی ل سالا ١٩٢٧ێ مانگێش بوویه ناحیه[11] هەروەسان ل دووڤ ژێدەرەکی ل سالا ١٩٣٤ێ قەزا دهۆکێ تنێ دو ناحیه (مەلبەندێ دهۆکێ و ناحیا مانگێش) هەبوون[12]، ل دووڤ ڤی ژێدەری بیت د ناڤبەرا ١٩٣١- ١٩٣٤ێ ناحیا مزووری ئەتریش ژ قەزا دهۆکێ هاتییه جوداکرن، بەلێ د راستیدا ل ٢٤ چریا ئێکێ ١٩٥٦ێ ل دووڤ بریارەکا شاهی (ارادة ملكية) ناحیا مزووری ب سنوورێ وێ یێ وی سەردەمیڤە ژ قەزا دهۆکێ هاتییەڤەقەتاندن و داینە دگەل قەزا شێخان، ئەڤ بریارە د رۆژنامەیا رەسمی (الوقائع العراقية) هژمار ٣٩٤١ رۆژا ١٨ شبات ١٩٥٧ێ بەلاڤکرییه، ئانکو بریار ل سالا ١٩٥٧ێدا کەتییه د وارێ بجهئینانێدا[13]. یا هێشتا مە پشتراستدکەت (دليل تلفونات الالوية العراقية) یێ سالا ١٩٥٦ێیە کو تەلەفونێن ناحیا ئەتریش سەر ب قەزا دهۆکێ ڤەنە[14].

ب ڤی رەنگی قەزا دهۆکێ مایە ب دو ناحیان (ناحیا مەلبەندێ دهۆکێ و ناحیا مانگێش)، بەلێ ل سالا ١٩٥٧ێ د بەیانەکا وەزارەتا ناڤخۆییا عیراقێ دا بریار هاتییەدان مەلبەندێ ناحیا دهۆکێ یا لیوا مووسلێ بێتەڤەگوهاستن بۆ گوندێ سێمێلێ و ناحیەك ب ناڤێ ناحیا سێمێلێ هاتییەناڤکرن، ب ڤی رەنگی ناحیا مەلبەندێ دهۆکێ هاتییه هەلوەشاندن و دو ناحیێن مانگێش و سێمێلێ جهێ خۆ د ناڤ پێکهاتا کارگێرییا قەزا دهۆکێ دا گرتینە[15]. هەتا ب بریارا کۆماری (مرسوم جمهوري) هژمار ٥١٦ ل ٢٩ تەباخا ١٩٦٠ێ زاویتە بوویە ناحیە و بریار د (الوقائع العراقيه) هژمار ٤١١ رۆژا ١٩٦٠/٩/١٨ێ دا بەلاڤکرن[16]، ب ڤی رەنگی ناحیێن سەر ب دهۆکێ ڤە بووینە سێ ناحیە (مانگێش، سێمێل و زاویتە).

سەروبەرێ کارگێرییێ قەزا دهۆکێ ب ڤی رەنگی مایە هەتا ل ٢٧ گولانا ١٩٦٩ێ ب مەرسۆمەکا کۆماری بریارا ب لیواکرنا (پارێزگەهکرنا) دهۆکێ هاتییەدان، ل دووڤ وێ بریارێ ژی قەزا دهۆکێ ژی یەك ژ وان چوار قەزایان (دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ و ئاکرێ) بوویە یێن پارێزگەهـ ژێ پێکدهات، و ل دووڤ هەمان مەرسۆما کۆماری دڤیا ناحیا مزووری (ئەترۆش) ژ قەزا شێخان هاتبا ڤەقەتاندن و دابانە دگەل قەزا دهۆك یا لیوا دهۆکێ، بەلێ د برگا چوارێ یا مەرسۆمێدا هاتییە کو قەزا ئاکرێ و ناحیا مزووری یا سەر ب قەزا شێخانڤە ب رەنگەکێ بەرووەخت دێ مینن دناڤ سنوورێ لیوا مووسلێ دا هەتا ئەگەرێن کارگێرییێن وی سەردەمی ژ ناڤدچن[17]، بەلێ دیارە دەستەلاتێ نەڤیا ئەو ئەگەر ژ ناڤبچن و سەر و بەرێ ئاکرێ و ناحیا مزووری ما گرێدایی پارێزگەها مووسلێ هەتا سەرهلدانا ١٩٩١ێ، بۆ دانا رووپەکێ یاسایی ب ڤی سەروبەری ب مەرسۆمەکا کۆماری ل رۆژا ٨ ئادارا ١٩٧٦ێ بریاردان ناحیا مزووری یا سەر ب قەزا دهۆکێ ڤە (کو ئەو ب خۆ ب کریار نە سەر ب قەزا دهۆکێ ڤە بوو) ژ قەزا ناڤبری بێتەڤەقەتاندن و بدەنە دگەل قەزا شێخان یا سەر ب پارێزگەها مووسلی ڤە (کو ئەو ب خۆ ب کریار سەر ب قەزا شێخانڤە بوو)[18]. بۆ دانا هەمان رووپێ رەسمی بۆ گرێدانا قەزا ئاکرێ دگەل پارێزگەها مووسلی ل ١٥ نیسانا ١٩٨٠ێ بریارا ئەنجامدانا راپرسیەکی ل قەزا ئاکرێ دان و ل رۆژا ١٩٧٩/٧/٢٩ێ راپرسییەکا بەرچاڤ و ل پێشیێ بریار ل سەر ئەنجامێن وێ هاتییەدان هاتەکرن و ل رۆژا ١٨ گولانا ١٩٨٠ێ ب بریارەکێ قەزا ئاکرێ ب رەنگەك یاسایی دانە دگەل پارێزگەها مووسل[19].

پێکهاتا کارگێرییا قەزا دهۆکێ د سنوورێ پارێزگەهێدا وەك خۆ ما، هەتا ل ٢٥ تیرمەها ١٩٧٨ێ ب مەرسۆمەکا کۆماری بریارا پێکئینانا قەزا سێمێلێ هاتییەدان[20]. هوسان ناحیا سێمێلێ ژ سنوورێ کارگێرییێ قەزا دهۆکێ دەرکەت و بوو یەك ژ قەزایێن پارێزگەهێ و قەزا دهۆکێ ما ب سنوورێ خۆیێ کارگێرییێ پێکهاتی ژ ناحیا مانگێش و زاویتە و ئەڤ پێکهاتە هەتا نها ب ڤی رەنگی مایە و ئەگەر گوهۆرینەك ژی تێدا رووداییت د سنوورێ گوندەکی یان کەرتەکیدا بوویە، ل ڤێرێ و هندی پەیوەندی ب بەکەیێن کارگێرییێن سنوورێ قەزا دهۆکێ ڤە هەی دڤێت بێتە گۆتن، حکۆمەتا عیراقێ ل سالا ١٩٨٦ێ ناحیا مانگێش هەلوەشاند و دگەل گوندێن سەر ب وێ

ڤە دانە دگەل ناحیا زاویتە، بەلێ پشتی سەرهلدانێ ل سالا ١٩٩٦ێ ئەڤ بریارە هاتە هەلوەشاندن و ناحیا مانگێشێ سەرژنوو پێكئینانەڤە[٢١] و هەتا نها ژی بەردەوامە.

هندی پەیوەندی ب پێكهاتەیا قەزا دهۆكێ ڤە هەی هەروەك هاتییەدیاركرن نها قەزا دهۆكێ تنێ ژ دو ناحیەیێن زاویتە و مانگێشێ پێكدهێت، ناحیا زاویتە ژی ٧١ گوندێن ئاڤا كو هەردو كۆمەلگەهێن باگێرا و كۆریت گاڤانا (كۆرا) ژی ب خوڤەدگرن و ٢١ گوندێن نە ئاڤاكری و كاڤلە گوندان پێكدهێت، هندی ناحیا مانگێشێ یە ژ ٤٥ گوندێن ئاڤاكری و ٨ گوندێن نەئاڤاكری و بەردای پێكدهێت، هەروەسان رووبەرێ گشتیێ سنوورێ قەزایێ ٣٩٨،٨٩٥ دۆنەمە، سەنتەرێ دهۆكێ ٥٠،٠٢١ هزار دۆنەم و زاویتە ١٦٥،١٢٧ هزار دۆنەمە و مانگێش ١٨٣،٧٤٧ هزار دۆنەمە[٢٢].

ل دووڤ ئامارا تەخمینكریا رێڤەبەریا ئامارا دهۆكێ ل دەسپێكا سالا ٢٠١٦ێ سەرجەمێ خەلكێ قەزا دهۆكێ ٣٩٢٠٥٧ كەس بوون، ژ وانا ٣٧٥١٤٣ كەس ل باژێر و باژێركان دژیان و ١٦٩١٤ كەس ل گوندان دژیان، سەرجەمێ خەلكێ دهۆكێ ژی ٣٥٨٥٢٧كەسە[٢٣].

ژبەركو د ناڤ بادەكا باژێر و گونداندا ب بەرفرەهی ل سەر هەردو ناحیەیێن زاویتە و مانگێشێ هاتییەنڤیسین، ئەڤ ڤەكۆلینا مە تنێ دێ سنوورێ مەلبەندێ دهۆكێ ب خوڤە گریت.

## جوگرافیا دهۆكێ:

سەبارا جهێ جوگرافیێ دهۆكێ دا ئەز دكارم بێژم، باژێرێ دهۆكێ سنوورێ نها دكەڤیتە د ناڤ سنوورێ باژێرڤانیا دهۆكێ دا دەرگەهێ ناڤبەرا دەشت و چیاینە یان ژی پرەكە دەشت و چیان، زۆزان و گەرمیانان ب هەڤرا گرێددەت، لەوما ژی ڤی جهی ژ سەردەمێن هەرە كەڤن تایبەتمەندی و گرنگیا خۆ هەبوویە و هەردەم ژی خەلكەكی چاڤێ وان ل ڤی جهێ ستراتیژی بوویە. د ڤی واریدا جوگرافیناسەك دبێژیت: ئەڤ دەڤەرە ب ڤی جهێ خوڤە دەڤەرەكا ڤەگوهازتنێ یە د ناڤبەرا دو دەڤەرێن چیایی و گر و بانیێن ژ هەڤجودا ژ ئالیێ سرۆشتی و ئابووریڤە[٢٤]، هەر ئەڤ فاكتەرە ژی بوویە باژێر ژ كەڤنە وەرە ببیتە مەیدانەك هەردو ئابووریێن چیا و دەشتێ ب هەڤرا گرێدەت و ببیتە بازارێ پێككگوهارتنا بەرهەمێن چیا دگەل یێن دەشتێ، ب ڤی رەنگی باژێر بوویە خالا پێككەهشتنا وان ئابووریان و بازارێ خەرجكرنا بەرهەمێن وان[٢٥].

هندی پەیوەندی ب جوگرافیا باژێری ب خوڤە هەی، باژێر: دكەڤیتە ناڤبەرا دو زنجیرەیێن چیا، چیایێ بێخێری (چیایێ سپی) ل ژووری ٧٥٠ مەتران ل سەر ئاستێ دەریای بلندە و چیایێ شندۆخا زاوا (چیایێ رەش) ٩٠٠ مەتران ل سەر ئاستێ دەریای بلندە ل ژێری، ڤێ چەندێ روخسارەكێ لاكێشەیی دایە باژێری و دو رووبارێن وەرزی تێدا دبۆرن، رووبارێ دهۆكێ یێ ئاڤا وی ب رێكا سكرێ دهۆكێ دهێتەكونترۆلكرن و رووبارێ هشكەروو، بلندیا رووباری ل سەر ئاستێ دەریای ٥٨٥ مەترە[٢٦]، هەژییە بێژین هەردو رووبار ل ژێریێ رۆژئاڤایێ باژێری دگەهنەهەڤ و بەرەڤ ژێر دچن هەتا ل ژێریێ گوندێ (زینیات) د رژێتە سكری مووسلێ، ئەم دكارین بێژین هەردو رووبار نها هشكە رووبارن بەلێ د شیاندایە ب رێكێن هەڤچەرخ و مفا وەرگرتن ژ ژێدەرێن ئاڤێ یێن نێزیك بێنەڤەتیركرن ب ئاڤێ و روویەكێ جوانتر بدەنە باژێری. جهێ فەلەكیێ باژێری دكەڤیتە ناڤبەرا خیچا درێژ ٤٣ ل رۆژهەلاتی و خیچا ٣٦،٥٢ ل رۆژئاڤایی، ڤی جهی هندەك پەسنێن مفادار داینە باژێری، ژ وان پەسنان سەقایێ باژێری یێ ناڤینە (المعتدل) كو بۆ چەندین مەرەمێن ئابووری و گەشت و گوزاری مفا ژێ دهێتەوەرگرتن[٢٧].

جهێ جوگرافی و فەلەكی و سرۆشت و سەقایێ باژێری پشتەڤانن بۆ بۆچوونا مە كو بێژین دەڤەرا دهوك یا نها ژ مێژ وەرە و بەریا هزاران سالان ئاكنجیگەهەكا مرۆڤایەتیێ بوویە، ئەگەر ژێدەرێن دیرۆكی ئاماژە ب ڤێ چەندێ یان دیرۆكا دهۆكێ وەك جهـ نەكربیت و ناڤێ دهۆكێ ب كێمی د ژێدەراندا هاتبیت، لێ شوینوارێن دهۆكێ و دەوروبەرێن دهۆكێ

چ ئەوێن ڤان سالێن داویێ هاتینەدیتن و ڕێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ ڤەکۆلین و دووڤچوون ل سەر کری، چ ئەوێن بەری دەهان سالان هاتینەدیتن شوینوارناسێن عیراقی و بیانی ڤەکۆلین و دووڤچوون ل سەر کرین وێ راستیێ پەسەند دکەن کو بەلێ ب هزاران سالانە دهۆك ئاکنجیگەها مرۆڤانە، بۆ نموونە:

- ل هنداڤی دهۆکێ شکەفتا ناڤدارا چارستین هەیە دیرۆکنڤیس و شوینوارناس ددەن دیارکرن کو پەرستگەهەکا میترایی و پاشتر زەردەشتی بوویە و هەموو نیشانێن د ڤێ شکەفتێدا دیار دکەن کو ژیانا مرۆڤان ل ڤی جهی کەڤناتییەك دیرۆکی هەیە[28]. پشتی ڤەکۆلینێن ڕێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ ل ڤێ شکەفتێ کرین پێنج پەرستگەهێن ئاگری لێ هاتینەدیتن کو دزڤرنە ناڤبەرا سەدسالیێن حەفتێ و چوارێ پێشی زایینی و د بەردەوامیا ڤەکۆلینێدا ل وی جهی گەهشتینە وێ باوەرێ کو ئەو پەرستگەهـ کەڤنترن ژ سەردەمێ ئایینێ زەردەشتی و ژ پەرستگەهێن ئاگری یێن کەڤنن ل دەڤەرێ و دبیت ژی کەڤنترینێن وان بن[29].
- هەر ل ڤی جهی هنداڤی شکەفتا چارستین کێلیا شەدا هەیە یا دکەڤیتە بەرامبەری کێلیا فیرعەونی دیرۆکا ڤی جهی زۆر کەڤنارە و پەیڤا شەدا د تێکستێن بزماریدا هاتییە و د سەردەمێ سومەریدا (۲۱۰۰- ۲۰۰۰ پ. ز)ێ واتا بلندیێ ددەت، د تێکستێن ئاشووریدا (Şad-da) ناڤە ئانکو ئانو خۆجهێ گۆپیتکا چیایی و ئەڤ پەیڤە گرێدایە ب سەردەمێ دەولەتا میتانی ڤە و ڤی ناڤی پەیوەندییا ب شاهێن میتانی شوتارنا و توشارتا و پەیوەندییا ب ناڤێ باژێرێ میتانی aluŞu-du-hi (....) ڤە هەی، ناڤێ ڤی باژێری د تێکستێن بزماری یێن شاهێ ئاشووری ئەدد/ئادد نیرارێ ئێکێ (۱۳۲۵ پ. ز)دا هاتییە[30].

دهۆك



- گوندێ نەمریکێ کو دکەڤیتە ناحیيا فەیدێ ل ژێریێ دهۆکێ و رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە، ئێکە ژ کەڤنترین شوینوارێن چەرخێ بەردینێ نوو، پشتی کو شاندەکا زانکۆیا پۆلونی هەلکۆلین و ڤەکۆلین لێ کرین دیار بوویە کو دیرۆکا وێ دزڤریتە هەشت هزار سالان پێشی زایینی د بەردەوامیيا هەلکۆلین و ڤەکۆلینێن شوینواری و دیتنەڤا هەستیکێن گیانەوەران ل نێزیکی ڤی جهی دیاربوویە کو بەری پتر ژ چارێکە ملیون سالان ژیان ب بەرفرەهی ل ڤی جهی هەبوویە ئانکو ل دەسپێکا چەرخێ بەردینێ کەڤن[٣١].
- هەروەسان بوونا چەندین گرێن شوینواری ل دەڤەرێن نێزیکی دهۆکێ وەك گرێ باستکێ و کەمونە کو د زڤرنەڤە سەردەمێ دەولەتا میتانیيا کوردی و گرێ مالتایێ و شکەفتا هەلامەتا ل شندوخا ژێریێ دهۆکێ گرۆڤەکێ دی ینێ کەڤناتییا ژیان و ژیارێ یە ل ڤی جهی[٣٢].

هەژییە بێژین ڤێ ئینسکلوپیدیایێ ڤەکۆلینێن تایبەت ل سەر ڤان شوینواران کو بەلگەنە ل سەر کەڤناتییا ژیان و ژیارا مرۆڤایەتیێ ل دهۆکێ و دەوروبەرێن وێ هەمبێزکرینە، لەوما ژی ئەم درێژی ل سەر وان نە ئاخفتینە.

## پەیڤا دهۆك:

هندی پەیوەندی ب ناڤێ دهۆکێ و بنیاتێ ناڤی و ئەڤ ناڤە ژ کیڤە هاتییە دێ بێژین: ب چاڤ بازێر و دەڤەرێن دی یێن دەڤەرێ ژێدەرێن دیرۆکی ب تایبەت یێن عەرەبی و ئیسلامی درەنگتر ئاماژە ب ناڤێ دهۆکێ کرییە، د ڤی واریدا هندی دیرۆکنڤیس گەهشتینێ د ژێدەرێن نڤیسکیدا یەکەمین جار ل سالا ١٤٧٠-١٤٧١ێ ناڤێ دهۆکێ د پەرتووکا (دیاربەکریە)دا هاتییە، ئەڤ پەرتووکە ب زمانێ فارسی ژ ئالیێ (ابوبکر الطهرانی)ڤە هاتییە نڤیسین، دەمێ ئاماژە ب روودانێن سالا ١٤٤٦- ١٤٤٧ێ کری ئاماژە ب ناڤێ دهۆکێ کرییە[٣٣].

بەلێ شوینوارناس د. حەسەن ئەحمەد قاسم دبێژیت: (ناڤێ دهۆکێ د ژێدەرێن بزمارکیدا ب تایبەت د توومارێن (حولیات) شاهێ ئاشووری ئەدد نیراریێ ئێکێ (١٣٠٥- ١٢٧٤پ. ز حوکمداری کرییە) ب ناڤێ بازێرێ (Su-du-hi)یێ میتانی هاتییە[٣٤]، هەمان شوینوارناس د ڤەکۆلینەکا دیتر دا ئاماژە پێکرییە کو ناڤێ ڤی بازێری ئانکو بازێرێ دهۆك یێ کەڤن د سەردەمێ سومەری یا دا (KASKA) بوو ب زمانێ سومەری واتا وێ رێ یە. د ژێدەرێن سریانیدا ئاماژە ب وێ چەندێ هاتییەکرن ئەو جهێ جوگرافییێ دهۆك دکەفتە تێدا دگۆتنێ عەردێ مادای (ارض مادای) و ناڤێ دهۆکێ نوهەدرا ئانکو جهێ جوان یان نوو بوویە[٣٥].

ژ هەردو ژێدەرێن دیرۆکی و شوینواریدا دیار دبیت کو دهۆك هەرچەندە ب کێمتر ژی ئاماژە ب ناڤێ وێ هاتبیتە کرن بازێرکەك یان گوندەك گەلەك کەڤن و دیرۆکییە، لەوما ژی زانینا بنیاتێ پەیڤا (دهۆك)ژی یا ساناهی نینە و دێ بۆچوونێن جودا جودا هەبن، لڤێرێ دێ ئاماژە ب هەموو وان بۆچوونان کەین و ل داویێ ژی دێ بۆچوونا خۆ بەرچاڤکەین:

- ئەنوەر مایی ژ زاردەڤێ (هارتمان) ژ کۆڤارا (العالمین) ڤەدگوهێزیت: ل سەر دەمێ ئیمبراتور (تاسیسوس بیزا سیوس) ناڤێ دهۆکێ (جاهۆك) بوویە[٣٦]. هەمان ژێدەر ژ زاردەڤێ حسێن حوزنی موکریانی ڤەدگوهێزیت: کو ل سەدسالیيا چوارێ زایینی میرەکی ب ناڤێ ئاخ شندو حوکمداری ل دهۆکێ کرییە، ژ هەر بەرهەمەکی یان متایەکێ بازرگانی دو هۆك ئانکو دو مست سەرانە یان خویك ژ کاروانییان وەرگرتییە، ب ڤی رەنگی ئەڤ جهە ب دهۆك هاتییە ناڤکرن، هەر مایی ب خۆ دیاردکەت کو هارتمان د وێ باوەریدایە کو ئاخ شندوی ل سەدسالیيا دووێ زایینی ل (شندوخا) دەستەلاتداری کرییە[٣٧]. بەلێ ئەڤە چ ژ بابەتی ناگۆهەریت چونکو شندوخا (کو ئەڤرۆ تاخەکێ دهۆکێ یە) وی چاخی گوندەکی نێزیکی دهۆکێ بوویە و دهۆك پتر ژ شندوخا نێزیکی گەلێ دهۆکێ بوویە و جهێ وەرگرتنا خویکان بوویە.

- ئەنوەر مایی هەرچەندە پشتەڤانییا بۆ چوونا (هارتمان)ی دكەت، بەلێ دوور نابینیت ئەڤ پەیڤە ژ پەیڤا دیە-Dih یان دە- دێە Deh یا كوردی هاتبیت كو رامانا گوند ددەت و پاشگرێ (ۆك) یێ بچووككرنێ هەلگرتبیت ئانكو گوندێ بچووك[٣٨].
- زانایێ زمانناس توفیق وەهبی ژی پشتەڤانییا ڤێ بۆچوونا ئەنوەر مایی دكەت، بەلێ سەیدایێ ئەمینێ ئوسمان هەروەك جەمال بابان ژێ ڤەدگێریت، ڤێ بۆچوونێ ب راست نزانیت ژ بەركو ل ڤێ دەڤەرێ پەیڤا (دێ) ناهێتەبكارئینان و ل شوونا وێ دبێژن گوند، ئەو ئانكو ئەمینێ ئوسمان دوورنابینیت كو پەیڤا دوە یان دیە ئانكو دیهێن چلی (كو وەك ئالف بۆ گیانەوەری مفای ژێ وەردگرن) نێزیكتر بیت بۆ ڤێ مەرەمێ[٣٩].
- د. فەرسەت مەرعی دبێژیت: ژبەركو دهۆك دكەڤیتە ژێریا دو لوتكێن (كومتێن) چیا یێن هەریەك ژ وان (سەرهۆك) ئانكو سەر تیژ بوویە، ئانكو ناڤێ هەردویان دوسەرهۆك بوویە و تیپێن /و. س. ك/ ژبۆ سڤككرنێ هاتینەراكرن و بووینە دهۆك، هەروەسان د بێژیت ل هندەك گوندێن مەسیحیێن كلدانێن دەڤەرێ د بێژنە دهۆكێ (آتوك)[٤٠].

هندی پەیوەندی ب ڤێ بۆچوونێ ڤە هەی نڤیسكارێ كلدانی ئەبلەحەد افرام دبێژیت: پەیڤا (أتوك) پەیڤەكا عیبریە رامانا (البهو، الشرفة، العمود، المكان العالی المشرف وادی او السهل) ددەت و دەمێ دزڤرینینە جهێ دهۆكێ یێ كەڤن دیاردبیت كو ناڤكرن دگەل جهێ دهۆكێ دگونجیت كو دەسپێكا دامەزراندنا گوندێ (اتوك) یان دهۆك كو ژ بیست مالەكان نە دبۆری ئەو ژی ئەو كلدان و جوهی بووینە یێن ئاشووریان ب دیلی ئینابن و ل دەڤەرێ بەلاڤەك رین[٤١].
- نڤیسكار حەجی جەعفەر دگەل وێ بۆچوونێ یە كو دهۆك ژ پەیڤا (جاهۆك) هاتییە و ئەو ژی پەیڤەكا لێكدراوە ژ جا ئانكو (جە- جی) و پەیڤا ئاهۆك ئانكو (مامز- خەزال- ئاسك) و ب بۆچوونا وی جاهۆك جهێ مامزانە و بوویە دهۆك و ب ڤێ بۆچوونێ دهۆك ئانكو وارێ مامزان[٤٢].
- هەروەسا بۆچوونەكا بەربەلاڤ ل جەم هندەك ژ پیرەمێرێن دەڤەرێ هەیە دبێژیت: پەیڤا دهۆك ژ (دەرۆك- دەرهۆك) هاتییە، ژبەركو دهۆك د هەموو دەماندا دەرۆكێ گەلەك دەڤەرێن دەوروبەرێن خۆ بوویە[٤٣]، دەرۆكێ هێرشێن دەستەلاتدارێن دەشتێ مینا نەینەوا بوویە بۆ سەر دەڤەرێن چیایی، دەرۆكێ ناڤبەرا دەشت و زۆزانان بوویە. ئەڤ بۆچوونە ژی پتر دگەل وێ بۆچوونێ دگونجیت یا د. حەسەن ئەحمەد قاسم بەرچاڤكری كو د زمانێ سومەریدا د گۆتنە دهۆكێ (KASKAL) ئانكو رێ....

ل ڤێرێ پرسیارەك دهێتەپێش: ئەرێ چ جهێن دی ب ناڤێ دهۆك یان ناڤەكێ نێزیكی (دهۆك) ل كوردستانێ و وەلاتێن هەڤسوو نینن و ئەو ناڤ ب چ رامان دهێن...؟ هندی پەیوەندی ب پرسیارێڤە هەی و ل دووڤ زانیاریێن مە گوندەك ل دەڤەرا رێكان ب ناڤێ دهیك هەیە هەروەسان گوندەك دیتر ب هەمان ناڤ ل دەڤەرا بەرواری ژێری (ناحیا چەمانكێ) هەیە، هەروەسان ل باكوورێ كوردستانێ گوندەك ب ناڤێ دهیك هەیە، د هەمان دەمدا ل دەڤەرا بامەرنێ گوندەك ب ناڤێ دیهێ هەیە، چ زانیاری ل دور ناڤێ وان گوندان دەست مەنەكەتن، لێ ئەم دوورنابینین ژ پەیڤا دەهێك خویك یان باجا دهێك هاتبن كو د گەلەك سەردەماندا ژ خەلكەكی دهاتەستاندن، د هەمان دەمدا مە گوندەك ل دەڤەرا رێكان ب ناڤێ بێدە و گوندەك ل دەڤەرا بەرواری ژووری ب ناڤێ بێدوهێ هەیە، كو ل دووڤ گۆتنا خەلكێ وان گوندان ناڤێ گوندێ وان ژ بێ دەهێك هاتییە ئانكو ئەوێن دەهێك نە ددا یان خویكا دەهێكێ ژێ نەدگرت[٤٤]، ب هەڤبەركرنا ڤان ناڤان دوورناهێتەدیتن نێزیكییەك د ناڤبەرا ناڤێ گوندێن دهیك و بێدە و بێدوهێ و دو هۆكا دهۆكێ یان دیە دیهیكا دهۆكێ دا هەبیت

و هەرهەموویان پەیوەندی ب (دەهێك)ا خویك یان سەرانە هەبیت، د هەمان دەمدا هەموو ئەڤ گوندێن ناڤبری دکەڤنە دەرێ گەلی یان و ئەڤە ژی پتر نێزیکی وێ بۆچوونێ یا دبێژیت دهۆك ژ دەرۆك هاتییە یان ئەوا د. حەسەن ئەحمەد قاسم بەرچاڤکری کو د زمانێ سومەریدا د گۆتنە دهۆکێ [KASKAL] ئانکو رێ و جوگرافیا دهۆکێ ژی دیارە دکەڤیتە دەرێ گەلی و سەرێ رێکان.

هندی پەیوەندی ب وەلاتێن جیرانڤە هەی ل باژێرێ (یەزد)ێ وەلاتێ ئیرانێ تاخەك ب ناڤێ (دهۆك سفلی) دهۆکا ژێری هەیە[٤٥]، د پەرتووکا (سفرنامەو خراسان و کرمان) ئاماژە ب ناڤێ گوندەکی ب ناڤێ دهۆك هاتییەکرن دکەڤتە دەڤەرا حەسەن ئاباد وەك ژێدەر ئاماژە پێ دکەت گوندەکی مەزن بوویە دوسەد و پێنجی مال و چوار ئاش لێ هەبوون[٤٦]. هەروەسان د مێژووا کورد و کوردستان یا مەردوخی دا د ناڤ لیستا ناڤێن عەشیرەت و تیرەیێن کوردا ناڤێ عەشیرەتەکێ ب ناڤێ (دهۆك) هاتییە و سەرژمێریا وان ژی وی سەردەمی ب ٣٠٠٠ مال دەسنیشانکرییە، تنێ هند زانیاری ل سەر وێ عەشیرەت یان تیرەیێ داینە کو ل دەوروبەرێن سابلاخێ (مەهابادێ) دژین[٤٧]. د فەرهەنگا (فارسی)دا دەربارەی دهۆك هاتییە: دهۆك گوندەکە ژ گوندێن شەنبە ل شەهرستانا بۆشەهر، رامانا وێ ژی هەروەك د فەرهەنگا دهخودا دا هاتی: (بسیار شکننده و آس کننده)[٤٨] ئانکو تشتەکێ گەلەك بشکێت و گەلەك هویرکەر، ڤێ رامانێ نە ژ دوور و نە ژ نێزیك پەیوەندی دگەل وان رامان و بۆچوونان نینە یێن مە بۆ ناڤێ (دهۆك)ێ بەرچاڤکرین، لێ مکرتییەك هەیە ئەو ژی ئەگەر ژێدەرێن پێدڤی هەبن یان د پاشەرۆژەکێدا بکەڤنە بەردەست و ل رهـ و ریشالێن دیرۆکیێن پەیڤا (دهۆك) بگەرین بگەهینە بنیاتەك هەڤپشك د ناڤبەرا پەیڤا (دهۆك)ا مە و (دهۆك)ێن ئیرانێ و (دهیك)ێن دیتردا.

هندی پەیوەندی ب دیرۆکا دهۆکێ و دەوروبەرێن وێ ڤە هەی دێ بێژین: دیرۆکا دەڤەرا دهۆکێ پشکەکە ژ دیرۆکا دەڤەرا بەهدینان ب تایبەت و سەرانسەرێ کوردستانێ ب گشتی، لێ هەر دەڤەرەکێ ژی تایبەتمەندیێن خۆ هەنە د دیرۆکێدا، ژبەرکو د ڤێ ئینسکلۆپیدیایێدا چەندین ڤەکۆلینێن زانستی ل دور دیرۆکا پارێزگەها دهۆکێ هاتینەبەلاڤکرن ئەم ل ڤێرێ ب کورتی دێ ئاماژە ب چەند سەر قەلەمکەکان ژ دیرۆکا دهۆکێ د سەردەمێن کەڤن و ئیسلامی و نوودا کەین:

- ل دەسپێکا سێ هزار سالیا بەری زایینی دەڤەرا دهۆکێ پشکەك بوویە ژ وەلاتێ سۆپارتو وارگەهێ سۆپاریان.
- د ناڤبەرا ٢٣٧١-٢٢٢٣ پ. ز کەتییە ژێر دەستەلاتێ دەولەتا ئەکەدی.
- ل داویا سێ هزار سالیا پێش زایینی دەڤەرا دهۆکێ کەتییە ژێردەستەلاتێ خۆریان[٤٩].
- هندی پەیوەندی ب دهۆکێ دەوروبەرێن وێ ڤە هەی، ژێدەرێن دیرۆکا کەڤن ئاماژە ب پەیڤا شەدا هاتییەکرن، ئەو پەیڤا کێلیا چیایێ هنداڤی دهۆکێ پێ هاتییەناڤکرن گۆتییە: پەیڤا شەدا د تێکستێن بسماری دا (Şu-du- a) د سەردەمێ سومەری (٢١٠٠-٢٠٠٠ پ.ز)دا ب رامانا بلندیێ دهێت و د تێکستێن ئاشووری دا (Şad- da) خۆجهێ گوپیتکا چیایی و ئەڤ ناڤە پەیوەندی ب ناڤێن شاهێن میتانی ڤە هەیە[٥٠].

هەر د ڤی واریدا پێویستە د ڤێ ڤۆناغێدا ئاماژە ب باژێری شودوخی (گوندێ شندوخا یێ بەر چەند سالان و تاخێ شندوخا یێ نها) بکەین، شودوخی ل سەردەمێ میتانییان (١٦٠٠-١٣٥٠) پ ز ئێك ژ باژێرێن هەرە گرنگێن ڤێ دەولەتێ بوویە ناڤێ وێ د تێکستێن شاهێ ئاشووری ادد نیراریێ ئێکێ ل سالا ١٣٢٥ پ. ز هاتییە ڤی شاهی هێرشەکا لەشکەری برییە سەر ڤی باژێری و ئێخستییە ژێردەستەلاتێ خۆ، هەروەسان شاهێ ئاشووری تجلات بلەسەرێ ئێکێ ل سالا ١١٠٠ پ. ز ێ ئاماژە ب ناڤێ ڤی باژێری کرییە[٥١]. د بەردەوامییا ڤەکۆلینێن شوینوارێن رێڤەبەریا

شوینوارێن دهۆکێ ل ڤی جهی کرین هاتینەکرن و ل رۆژا ١٨/٧/٢٠١٦ێ هاتینەراگەهاندن: چوار گۆرێن شوینواری ل شندوخا هاتینەدیتن کو ئێك ژ وان یێ سەردەمێ میتانی و سێ یێن دیتر یێن سەردەمێ زەردەشتی نە[٥٢].

- ل دەسپێکا دوهزارسالییا پێشی زایینی ئاشووری ل وەلاتێ میزوپوتامیا (وەلاتێ ناڤبەرا دو رووباران) پەیدابووینە و ل دەوروبەرێن ١٩٠٠ پ. ز ێ دەڤەرا دهۆکێ بوویە خەلەکا ناڤبەرا وەلاتێ ئاشووریان و ئاسیا بچووك.
- ژ سەدسالییا چواردێ بەری زایینی ڤە هێدی هێدی ئەڤ دەڤەرە کەتییە ژێر دەستەلاتێ ئاشووریان و شاهێ ئاشووری شیلمینصرێ ئێکێ (١٢٧٤-١٢٤٥ پ ز) د رێکا چیایێن دهۆکێ را هێرش کرییە سەر وەلاتێ ئورارتو ل دەڤەرا وانێ.
- ل دەسپێکا هزار سالییا بەری زایینی ل سەدسالییا نەهێ بەری زایینی تاخێ مالتایێ یێ نها بوویە سەربازگەهەکا ئاشووری و پاشتر بوویە بازێرکەك و د ژێدەرێن ئاشووریدا ب (مالیاتی) هاتییەناڤکرن.
- پشتی هەرفتنا دەولەتا ئاشووری ل سالا ٦١٢ پ. ز ێ دەڤەرا دهۆکێ کەتییە ژێر دەستەلاتێ دەولەتا میدی یا کوردی، پاشتر ل دەوروبەرێن ٥٤٦ پ. ز ێ کەتییە ژێردەستەلاتێ دەولەتا ئەخمەنییا فارسی[٥٣].
- هەر د ڤێ قۆناغێدا و هندی پەیوەندی ب دهۆکێ دەوروبەرێن وێ ڤە هەی پێویستە ئاماژە ب شکەفتا چارستوین و ڤەکۆلینێن شوینوارییێن ل ڤێ شکەفتێ هاتینەکرن بکەین، د. حەسەن قاسم کو سەرپەرشتییا ڤەکۆلینان کرییە و ناما خۆیا دکتورایێ ل سەر (پەرستگەهێن ئاگری ل جهێ چار ستوین ل بەر رۆناهییا ڤەکۆلینێن شوینواری) نڤیسییە گەهشتییە وی ئەنجامی: چەند پەرستگەهێن ئاگری چوار ژ وانا د ڤەکرینە و ژ بەری هاتینە کۆلان ل ڤی جهی هەنە دزڤرنە سەدسالیێن حەفتێ بۆ چوارێ بەری زایینی هەروەسان دو پەرستگەهێن دیتر لێ هەنە ژ وانا پەرستگەها خوداوەند ئاناهیتا دیارە ژ ئالیێ دیرۆکیڤە ئەڤە ژ چوار پەرستگەهێن دیتر کەڤنترە، هەروەسان چەندین جهـ و شوینوارێن دیتر یێن پەیوەندی ب وی سەردەمیڤە هەی وەك دو دوشکێن (سەکوییێن) ئاگری، جهێن خەتیرێن ئاگری، چوار خەلەکێن ژ بەری کۆلای یێن پەرستگەها مەزن کو تایبەت بوون ب ئەنجامدانا دوعایان، دەستنیشانکرنا جهێن هەلگرتنا خۆلییا پیرۆز، کوچکێن ئاگری ل پەرستگەهان، ناوسکێن ژ بەری کۆلای و چەند شوینوارێن دیتر لێ هەنە کو پەیوەندی ب ئایینێ زەردەشتی ڤە هەیە و هەموو ژی داکوکیێ ل سەر وێ چەندێ دکەن کو پەرستگەها چارستوین دزڤریتەڤە سەدسالییا حەفتێ پێشی زایینی هەتا دەوروبەرێن نیڤا ئێکێ ژ هزار سالییا ئێکێ بەری زایینی[٥٤].
- د ناڤبەرا سالێن ٣٣١- ١٤٧ پ. ز ێ و پشتی ئەسکەندەرێ مەقدونی دەست ب داگیرکرنا وەلاتێن رۆژهەلاتی کری دەڤەرا دهۆکێ کەتییە ژێر دەستەلاتێ ئەسکەندەری و دووڤرا سەرکردێن وی و ئەڤ قۆناغە ب چەرخێ (هلنتسی) دهێتەنیاسین و د ناڤبەرا سالێن ٣١٢- ١٤٧ پ. ز ێ دەڤەرێن رۆژهەلات ژ وانا کوردستان ب دەڤەرا دهۆکێ ڤە بووینە پشکا (سلوقس) ئێك ژ سەرکردێ سۆپایێ ئەسکەندەرێ و ئەڤ قۆناغە ب قۆناغا دەولەتا سلوقی دهێتەناڤکرن.
- د ناڤبەرا سالێن ١٤٧ پ. ز – ٢٢٥ ز ێ دەڤەرا دهۆکێ کەتییە ژێر دەستەلاتێ دەولەتا فرتی (ئەشکانی) ئەوا ل سالا ٢٥٠پ. ز ێ ل خوراسانێ هاتییەدامەزراندن، د ڤێ قۆناغێدا کوردستان ل سەر سێ هەرێمێن خودان رەنگەکێ خودموختاری هاتییەلێکڤەکرن، باکوورێ کوردستانێ و دەڤەرا بەهدینان سەر ب هەرێما کوردوئین (Gorduen) ڤە بوو و دەڤەرا دهۆکێ ژی پشکەك بوویە ژ ڤێ هەرێمێ[٥٥].

- ل سالا ١١٥ پ. ز ئیمبراتۆرێ رۆمانی (تراجان) د رێکا سوریێ را هێرشکریە سەر هندەك وەلاتێن رۆژهەلاتێ ناڤینێ نها و پشتی حکۆمەتا ئەرمەنان ژناڤبری بەرەف کەنداڤێ فارسی چوویە و دەست ب سەر وەلاتێ ناڤبەرا دورووباران و ئادیابین و (خضر هاترا) و بابل دا گرتییە، هەروەك محەمەد ئەمین زەکی دبێژیت: ژ کەڤندا دەڤەرێن زاخۆ، دهۆك و ئاکرێ ل رۆژهەلاتێ دجلە ب ئادیابین دهاتنەناڤکرن.
- د ناڤبەرا ٢٢٦- ٦٣٧ ز دەڤەرا دهۆکێ کەتییە ژێر دەستەلاتێ دەولەتا ساسانی[٥٦].
- د ڤێ قۆناغێدا ئانکو تایبەت دەسپێکا سەدسالیا سێێ زایینی ئایینێ مەسیحی ل دەڤەرێ پەیدابوویە و د هەمان دەمدا شەرەنیخا ناڤبەرا دەستەلاتدارێن ساسانیێن ب ئایین زەردەشتی و قەشە و پەرستڤانێن مەسیحی پەیدابوویە و رووداننا چەوساندنا چل سالی (الاضطهاد المسیحی- ٣٣٩- ٣٧٩ ز)یا ناڤدار و کوشتنا قەشە (مار ایپ الاها)یێ نوهەدری ب بەربارانکرنێ ل جهێ ناڤدار ب دەستکرد ناڤدارە کو ل وی جهی دێرەك ب ناڤێ دێرا (مار ایث الاها) هاتییەئاڤاکرن و هەتا نها ژی ئەو دێرە ئاڤایە و ل دەڤەرێ ب دێرا بەرانی دهێتەناسکرن[٥٧].
- بەلێ د هەردو قۆناغێن داوییدا ئانکو د ناڤبەرا ١٤٧ پ. ز- ٦١٧ ز ێ دا ئەڤ دەڤەرە جهێ شەرەنیخا ناڤبەرا دەولەتێن دەڤەرێ و دەولەتا رۆمانی بوویە، هەتا ل سالا ٦٤١ز ێ بەراهیێن سوپایێ دەولەتا ئیسلامی گەهشتینە کوردستانێ و دەڤەرا دهۆکێ ژی بوویە پشکەك ژ وەلاتێن سەر ب دەولەتا ئیسلامی ڤە[٥٨]. هەروەك ژ دیرۆکنڤیس (البلاذری) دهێتە ڤەگوهاستن پشتی کو سەرکردێ لەشکەرێ ئیسلامی (عتبة بن فرقد) ل سالا (٢٠مش/ ٦٤١ز)ێ هێرشا خۆ بەرەف ژووری و رۆژهەلاتێ ژوورێ مووسلێ دایە رێ و دەست ب سەر دەڤەرێن کوردان دا گرتییە ژ وانا (المعلة) مالتایێ و داسیر (داسن) و ...[٥٩] گومان تێدا نینە ئەڤ دو دەڤەرێن ئاماژە پێکری دهۆك ب خۆنە یان دهۆك پشکەك بوویە ژ ڤان دو دەڤەران. هەژییە بێژین ژ سەردەمێ ئاشووریانڤە هەتا سالا (٤٤١مش/١٠٤٩ز)ێ گەلەك جاران ناڤێ مالتایێ وەك (مالیاتی) و پاشتر (معله، معلثایا، مالطا) د ژێدەرێن دیرۆکیدا هاتییە، و پشتی وێ سالێ مالتایێ ئەو گرنگییا خۆ د ژێدەر و روودانانندا نەمایە و دیارە دهۆکێ ژ ڤێ سالێ بەرەف ژوور ئەڤ جهە گرتییە[٦٠].
- پشتی پەیدابوونا دەولەتا ئیسلامی دەڤەرا دهۆکێ ژی وەك تەبایی دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ کەتییە ژێر دەستەلاتێ دەولەتێن ئیسلامی و ب رێکا دەستەلاتداریا مەلبەندی و هندەك جاران ژی ب رێکا میرگەهێن سەر ب دەولەتا مەلبەندیڤە حوکمداری لێ هاتییەکرن، هەتا میرگەهێن کوردی هاتینەدامەزراندن ژ وانا میرگەها (داسنیا ژێری) ئەوا ل سالا ٩١٦ز ێ هاتییەدامەزراندن و دهۆك مەلبەندێ ڤێ میرگەهێ بوو و ناڤکرنا دهۆکێ ب دهۆکا داسنییان ژ ڤێ چەندێ هاتییە، ڤێ میرگەهێ هەتا سالا ١٢٣٦ێ حوکمداری کرییە، پاشتر ل سەر بەرمایێن وێ میرگەها شێخان هاتییەدامەزراندن ئەوا ل داوییا ژیێ خۆدا کەتییە ژێر دەستەلاتێ میرگەها بەهدینان ئەوا ل داوییا سەدسالیا سێزدێ زایینی هاتییەدامەزراندن و هەتا سالا ١٨٤٢ێ دەستەلاتداری ل سەرانسەری دەڤەرا بەهدینان (پارێزگەها دهۆکێ یا نها) کری[٦١].

هەژییە بێژین د ڤی سەردەمیدا و بۆ یەکەمین جار د ژێدەرێن دیرۆکیدا ب تایبەت ژێدەرێن ئیسلامی و عەرەبی ناڤێ دهۆکێ د پەرتووکا (دیاربەکریە) یا ئەبوبەکر ئەلتەهرانی دا هاتییە، ئەڤ پەرتووکە ل سالا ١٤٧٠- ١٤٧١ێ ب زمانێ فارسی هاتییەنڤیسین، دەمێ دەربارەی رووداننێن سالا ١٤٤٦- ١٤٤٧ێ دپەیڤیت ئاماژە ب ناڤێ دهۆکێ دکەت و دنڤیسیت: "... بموصل کهنه نزول فرمود و رستم مراد و علی خوجه حاجی را بدوهزار کس بدهوك و ملیطه روانه

ساخت..." ئانکو (پشتی کو ئوزون حەسن ل مووسلا کەڤن هاتییەخوار بەرێ روستەم مرادی و عەلی خوجە حاجی دگەل دو هزار کەسان بەرەف دهۆکێ و مالتایێ هنارتن)[12].

هەروەك ئەنوەر مایی د بێژیت: ئەز گەهشتیمە وی ئەنجامی کو یەکەمین میرێ بەهدینان یێ دەست ب سەر دهۆکێ دا گرتی میر حەسەن کورێ میر سەیفەدینی بوو ئەو ژی ل سالا ۸۹۱مش/۱٤۸٦ز ێ[13]. دیارە مایی ژی ئەڤ زانیارابیە ژ شەرەفناما میر شەرەفخانێ بەدلیسی وەرگرتییە کو تێدا دبێژیت: پشتی کو میر حەسەن ژ جەم شاهـ ئیسماعیلێ سەفەوی زڤریەڤە: کەلا دهۆکێ ژ دەست عەشیرەتا داسنی ئینادەر و دا دگەل شاهنشینا خۆ[14].

ژ ڤی چەندێ دیاردبیت ناڤێ (دهۆك)ێ ب گۆتنا نهاڤە ژ نیڤا سەدسالیا حەفتێ مشەختی/ پازدێ زایینی د ژێدەراندا بەربەلاڤبوویە و وەك ژ وی دەقی دیاردبیت وەك باژێرکەك هاتییەنیاسین یان سەرەدەری دگەلدا هاتییەکرن، دیارە پشتی ڤێ دیرۆکێ هێدی هێدی ناڤێ (دهۆك)ێ ب سەر ناڤێ (مالتا)یێدا زالبوویە و جهێ وێ گرتییە و ب دەسپێکا سەدساليا دەهێ مشەختی/ شازدێ زایینی ناڤێ دهۆکێ جهێ ناڤێ مالتایێ د ژێدەراندا گرتییە، هەروەکی شەرەفخانێ بەدلیسی دەمێ تنێ ناڤێ کەلا دهۆکێ بنی مالتایێ ئینای کو ل ژێر دەستەلاتێ عەشیرەتا داسنی بوو و ب دهۆکا داسنییان دهاتەنیاسین.

پشتی ڤێ سالێ باژێرکێ دهۆکی راستەوخۆ کەتییە ژێردەستەلاتێ میرێن بەهدینان و ژ وێ سالێ ڤە بریکارەك یان میرزادەیەکێ بەهدینان میراتی ل دهۆکێ و دەوروبەرێن وێ کرییە و ئەڤ سەروبەرە بەردەوام بوویە هەتا شەرێ ناڤدارێ ئێتیتێ ل سالا ۱۸٤۲ێ کو د ڤێ سالێدا لەشکەرێ ئوسمانی ب نیازا ب داوپئینانا میرگەها بەهدینان هێرش ئینا سەر میرگەهێ، لەشکەرێ هەردو ئالیان ل نێزیکی گوندێ ئیتوتێ (تاخێ ئێتیتێ یێ نها) کەتنە د شەرەکێ بێ بەرامبەردا لەشکەرێ ئوسمانیێ ب هێز و پر لەشکەر و چەك ب سەرکردایەتیا محەمەد پاشا ئینجە بەیرەقدار و لەشکەرێ میرگەها بەهدینان یێ لاواز و کێمهژمار و چەك ب سەرکردایەتیا دوا میرێ ئامێدیێ میر ئیسماعیل پاشایێ دووێ، د ئەنجامدا لەشکەرێ بەهدینان شکەست و بەرف ژوور زڤریڤە هەتا پایتەختێ میرگەهێ ئامێدیێ هاتییە دووربێچدان و شیانێن بەرخودانێ ل جەم لەشکەرێ بەهدینان نەمای و ئیسماعیل پاشای خۆ رادەستێ ئوسمانییان کری و دەستەسەرکری ئەو هنارتنە بەغدا و ب ڤێ رووادنێ ژیێ میرگەها بەهدینان ب داویهات و دهۆك ژی وەك هەر باژێرك و گوندەکێ بەهدینان راستەخۆ دگەل سنجەڤا مووسل یا ویلایەتا مووسلێ هاتنەگرێدان[15].

د ناڤبەرا سالێن ۱۸٤۲- ۱۹٦۹ێ دهۆك وەك گوند، ناحیە و پاشتر قەزا سەر ب سنجەڤا (مووسل)ا ویلایەتا (مووسل)ا ئوسمانی و ل سەردەمێ حکۆمەتا عیراقێ یا ل سالا ۱۹۲۱ێ هاتییەراگەهاندن سەر ب لیوا مووسلێ بوویە. ل سالا ۱۸۵۰ێ بوویە ناحیە و ل سالا ۱۸۷۳ێ بوویە قەزا[16]، ل دووڤ دوا زانیاریێن دەست مەکەتین ل سالا ۱۸۵۵ێ قەزایەکا سەر ب ویلایەتا وانێ بوویە و ژ سالا ۱۸٦۱یڤە وەك قەزایەك کەتییە سەر ویلایەتا مووسلێ[17]، و ل سالا ۱۹٦۹ێ بوویە پارێزگەهـ، چیرۆکا ب پارێزگەهکرنا دهۆکێ دیرۆکەك تایبەتە و ل جهەکێ دی یێ ڤێ ئینسکلۆپیدیایێ ب بەرفرەهی دێ ل سەر ئاخڤین[18].

## سەرژمێر و پێکهاتا خەلکێ دهۆکێ

دیارە بۆ زانینا رەوشا ژیار و ژیانا خەلکێ هەر باژێر یان گوندەکی و پێکهاتا وان دێ مرۆڤ پێدڤی ژێدەر و ئامار و داتایان بیت هندی پەیوەندی ب باژێرێ دهۆکێ یێ کەڤن و یێ هەتا بەری چەند سالەکانڤە هەی ئەڤ پێدڤیاتییە ل بەردەست نینن، لەوما ژی هەر ڤەکۆلینەکا د ڤی واریدا بێتەکرن چ گومان تێدا نینە کو دێ یا ب کێماسی و نە تەمام بیت، بەلێ ب هەر حالەکێ بیت و هندی ل بەردەست ئەم دێ ئاماژە ب ڤی بابەتی کەین.

كەڤنترين ژێدەرێ ل بەر دەستێ مە كو ئاماژە ب دهۆكێ كريت گەشتا گەروكێ فرەنسی هنری بنديە (Henry Binder)يە ناڤبری ل سالا ١٨٨٥ێ سەرا دەڤەرا بەهدينان دايە، شەڤا ٧/٦ چريا ئێكێ وێ سالی ل خانا دهۆكێ بۆرانديە، دەربارەی دهۆكێ دبێژيت: دهۆك گوندەكێ نێزيكی ٦٠ مالانە، گرنگييا وێ يا ناڤينە[٦٩]. ئەگەر هەر مالەك ٥- ٧ كەسان بيت، ئەڤ سەرژمێرا دهۆكێ د وێ ساليدا ٣٠٠- ٤٥٠ كەسان يان ژ ٥٠٠ كەسان نەبۆرييە.

هنديكە سالنامێن ويلايەتا مووسلا ئوسمانی نە، كو كەڤنترين ژێدەرن سەر پێكهات و سەروبەرێ كارگێرێ جڤاكيێ قەزايێن دەڤەرێ و د ناڤبەرا سالێن ١٨٩٠/١٨٩١- ١٩١١/١٩١٢ پێنج هژمار ژێ دەركەتينە هەرچەندە ژ كێماسييان د ڤالا نينە و هوورينی تێدانەهاتييەكرن و ل سەر بنياتێ تەخمينێ ئامارێن خۆ بەرچاڤكرينە لێ تاكە ژێدەرن ل داوييا سەدساليا نوزدێ ئاماژە ب رەوشا بازێر و قەزايێن دەڤەرێ كريت، سالناما ١٣١٠مش/١٨٩٢- ١٨٩٣ز دەربارەی دهۆكێ دبێژيت: سەرژمێرا قەزايێ ٦٦١٨خانە (ئانكو خێزانە ل دووڤ گۆتنا وەرگێری) ژ وانا ٤٥٧٠ موسلمان و ١٥٥٨ مەسيحی ٤٢٥ جوهی و ٧٥ ئێزدی نە. بەلێ د سالناما ١٣١٢ێدا دهۆك ب ٣٩٢٩خانە دايەدياركرن و سەرژمێرا وێ ژی ٤٩٢١ موسلمان، ١٧٤٧ كاسوليكی و ٤٩٢ جوهی بەرچاڤكرييە[٧٠].

بەلێ د سالناما پێنجێ يا ويلايەتا مووسلێ دا ئەوا ل سالا ١٣٣٠مش/ ١٩١١- ١٩١٢ز ئانكو نێزيكی بيست سالەكان پشتی سالناما دووێ هاتييەبەلاڤكرن سەرژمێرا قەزا دهۆكێ ب ڤی رەنگی هاتييە: ٥٢٦٣ نێر، ژ وانا ٤٥٩٢ موسلمان و ٤٣٣ كلدانێن كاسوليك و ٢٣٨ جوهی زێدەباری ١٢٠ ژ كلدانێن كاسوليك. ب ڤی رەنگی سێ هژمار د سێ سالاندا ژ سەرهژمێرا قەزا دهۆكێ ل بەر دەستن:

**يەكەمين نەخشەيێ بنياتيێ دهۆكێ سالا ١٩٢٣**



سالا ١٨٩٢- ١٨٩٣ێ ٦٦١٤
سالا ١٨٩٤- ١٨٩٥ێ ٧١٦٢
سالا ١٩١١- ١٩١٢ێ ٥٢٦٣

هەژیە ل ڤێرێ بێژین: هووربینی د ڤان هژماراندا نینە یێن د سالنامەیاندا هاتینەبەلاڤكرن و ئەڤ هژمارە نە ب ئامارەكێ هاتینەدیاركرن بەلكی ب تەخمینێ ئانكو بەرئاقل هاتینەدیاركرن، د هەمان دەمدا ئەڤ هژمارە تنێ یێن نێرانە (زەلامانە) و ژ مێیان (ژنان) ناگرن، دهەمان دەمدا ڤان سەرژمێران ژ عەشیرەتێن كۆچەر نەگرتییە، یا گرنگتر و پەیوەندی ب مژارا مەڤە هەی سەرژمێریا بازێركێ دهۆكێ یە ئەڤ سەرژمێرە یێن سالناما یێن قەزا دهۆكێ نە، هوسان ئەم نكارین ب رێكا ڤان ئاماران تشتەكی جهێ باوەریێ ژ سەرژمێرا بازێرێ دهۆكێ ب خۆ بزانین.

تنێ ژێدەرێ ئاماژە ب سەرژمێریا دهۆكێ كری و بۆ یەكەمین جار وەك ڤەكولینەك د ڤێ ئینسكلۆپیدیاییێدا هاتییە خوار پەرتووكا (توركیای ئاسیایی: جوگرافیای كارگێری) كو د ناڤبەرا ١٨٩٠-١٨٩٥یدا ب زمانێ فرەنسی هاتییەچاپكرن، د ڤی ژێدەریدا هژمارا ئاكنجیێن بازێرێ دهۆكێ ب ١٧٥٠ كەس دەسنیشانكرییە، ژ وانا ٧٥٠ موسلمان، ٥٠٠ مەسیحی و ٥٠٠ۆ جوهی نە[٧١].

ب ڤی رەنگی هەتا ب داویهاتنا شەرێ جیهانیێ یەكەم ژبلی ڤێ ئامارێ چ ئامارەك ل بەردەست نینە راستیيا هژمارا خەلكێ بازێركێ دهۆكێ ب مە بدەتەنیاسین و ئەڤ سەروبەرە هەتا دامەزراندنا حكۆمەتا شاهینی (مەلكی) یا عیراقێ ل تەباخا ١٩٢١یێ بەردەوام بوو.

د یەكەمین ڤەكۆلینا زانستی یا دوور خەلكێ بازێرێ دهۆكێ هاتییەكرن دا هاتییە: ئەم نەشێایین تێرا خۆ زانیاریان ل سەر خەلكێ دهۆكێ پەیدابكەین ژبەركو سەرژمێریێن جهێ باوەریێ ل عیراقێ ژ سالا ١٩٤٧ێڤە دەسپێكرینە[٧٢]. پشتی دووڤچوون و ڤەكولینان ڤەكولەر نەشیایە تشتەكێ تایبەت ب هژمارا خەلكێ دهۆكێ دەستخۆڤە بینیت، لەوما ژی پەنابرییە بەر نەخشەیێ بازێرێ دهۆكێ یێ ل سالا ١٩٢٣ێ ژ ئالیێ فەرمانگەها ئەندازیاریا مووسلێ ڤە هاتییە چێكرن و ل سەر وێ نەخشەیێ هژمارا خانیێن دهۆكێ هژمارتینە كو بووینە ٤٠٠ خانی، ب بەرچاڤوەرگرتنا تێكراییێ (ناڤنجیێ) هژمارا هەر خێزانەكی ل عیراقێ كو شەش كەس بوون و هندەك خانییان پتر ژ خێزانەكی تێدا بوونە هژمارا خەلكێ دهۆكێ د سالێن بیستاندا ٢٤٠٠- ٣٠٠٠ كەسان بوویە. هەمان ڤەكۆلەر ل دووڤ زانیاریێن هەتا ئاستەكی وەك یێن پێشتر دبێژیت دهۆك د سالێن سیهاندا ژ چوار تاخان پێكدهات و ٤٢٠ خێزان بوون و ل دووڤ هەمان تێكراییێ هژمارا خێزانان ل عیراقێ هژمارا خەلكێ بازێری نێزیكی هەمان هژمارێ یە ئانكو ناڤبەرا ٢٤٠٠- ٣٠٠٠كەسان ل سالێن بیستان[٧٣]. هەژیە ل ڤێرێ بێژین ڤەكولەرەكێ دی داكوكی ل سەر وێ چەندێ كرییە كو ل سالا ١٩٢٣ێ هژمارا خەلكێ دهۆكێ ٢٧٠٠ كەس بوون[٧٤].

ل سالا ١٩٤٧ێ یەكەمین سەرژمێریا فەرمی ل عیراقێ هاتییەكرن، ل سالێن ١٩٥٧، ١٩٦٥ و ١٩٧٧ێ سێ سەرژمێریێن دیتر ل عیراقێ هاتینەئەنجامدان، د ناڤبەرا ڤان چوار سەرژمێریاندا گوهرینێن بەرچاڤ كەتینە هژمارا تاخ و خەلكێ دهۆكێ ئەو ژی ب ڤی رەنگی:

| سال | هژمارا تاخان | هژمارا خەلكێ |
|---|---|---|
| ١٩٤٧ | ٤ تاخ | ٥٦٢١ |
| ١٩٥٧ | ٧ تاخ | ٧٦٨٠ |
| ١٩٦٥ | | ٨٦٠٣ [٧٥] |
| ١٩٧٧ | ١٥ تاخ | ٣٦٥١٢ |

ب هەلسەنگاندنەكا ڤان چوار قۆناغان ئەم دكارین بێژین مەزنبوونا دهۆكێ و زێدەبوونا هژمارا خەلكێ وێ د قۆناغێن بەراهیێدا ئانكو د ناڤبەرا سەرژمێرا ١٩٤٧- ١٩٥٧یدا مەزنبوون و زێدەبوونەك نیمچە ئاسایی بوویە، د ناڤبەرا ڤان دو سەرژمێریاندا

تنێ ٢٠٥٩ كەس ژ هژمارا خەلكێ دهۆكێ زێدەبووینە، لێ ل دووڤ تێكراییێ زێدەبوونا خورستییا خەلكێ ل عیراقێ د ناڤبەرا هەردو سەرژمێرێن ١٩٥٧- ١٩٦٥ێدا كو ٢،٣٪ د ڤیا هژمارا خەلكێ دهۆكێ ببا ٦٨٩٧كەس ئانكو تنێ ٧٨٣ كەس زێدەترن ژ زێدەبوونا سرۆشتی ئەڤە ژی ئەو كەسن یێن ب رێكا كۆچكرنێ هاتینە دهۆكێ كو پتریا وان ژ ناحیێن نێزیك و سەر ب دهۆكێ ڤە وەك ناحیا سێمێلێ و دۆسكی هاتینە دهۆكێ[٧٦].

لێ بەروڤاژی دگەل ڤێ چەندێ د ناڤبەرا سەرژمێرێن ١٩٥٧- ١٩٦٥ێدا كو ل دووڤ تێكراییێ سرۆشتیێ زێدەبوونێ خەلكێ عیراقێ د ناڤبەرا ڤان دو سەرژمێریاندا كو ٣،١٪ د ڤیا هژمارا خەلكێ دهۆكێ ل سالا ١٩٦٥ێ گەهشتبا ٩٨٠٤كەسان، بەلێ ل دووڤ تەخمینێن فەرمانگەها سەرژمێریا مەلبەندی یا عیراقێ د سالا ١٩٦٥ێدا هژمارا خەلكی دهۆكێ گەهشتییە ٨٦٠٣كەسان ئانكو ١٢٠١ كەسان ل كێمیێ دایە ل دووڤ تێكراییێ سرۆشتیێ زێدەبوونێ، ژێدەر ئەگەرێ ڤێ كێمبوونێ د زڤرینتەڤە بۆ رووداێن وێ قۆناغێ ل كوردستانێ كو كۆچا بەروڤاژی ژ باژێری بۆ دەرڤەی باژێری ئانكو گوندان روودایە[٧٧]. لێ ئەز دبێژم هەركەسەكێ ئاگاداری رووداێن دەڤەرێ د ڤێ قۆناغێدا بیت ب تایبەت دەسپێكا شۆرشا كوردستانێ ل ئیلوونا ١٩٦١ی باوەریێ ب ڤی ئەگەری نائینیت و ئەز باوەرم بەروڤاژی ڤێ چەندێ كۆچكرن ژ گوندان بەرەف ناڤ باژێرێ دهۆكێ پتر لێ هاتییە و نە هند بەلكی خەلكەكێ كۆچەریا دەشت و زۆزانان ژی دكرن ل باژێری ئاكنجی بووینە، لێ تەخمینا فەرمانگەها سەرژمێریا گشتی ژ بەر چ ئەگەرەكی بیت یا راست نینە و ئەز باوەرم هژمارا خەلكێ دهۆكێ د وێ سالێدا ل زێدەهییا سرۆشتی بۆراندییە نە ل كێمیێ دایە.

د ناڤبەرا سەرژمێریا ١٩٦٥- ١٩٧٧ێدا چەندین گورانكاری ب سەر سەروبەرێ دهۆكێ یێ جڤاكی

وێنەیەكێ كەڤن تاخێ كەندالی ل دهۆكێ



سیاسی ئیداری ئابووریدا هاتینە، د ئەنجامێ ڤان گورانکاریياندا رووبەرێ باژێرێ دهۆکێ ل مەزنیێ دا هژمارا تاخێن وێ زێدەبووونە و هژمارا خەلکێ وی ژی ب رەنگەکێ بەرچاڤ زێدەبوویە و گەهشتییە ٣٦٥١٢كەسان د ١٥ تاخاندا[٧٨]، گومان تێدا نینە گۆهرینا سەروبەرێ دهۆکێ یێ کارگێری ژ قەزایێ بۆ سەنتەرێ پاریزگەهێ ل سالا ١٩٦٩ێ و گورانکارییێن دووڤدا هاتین و بەرفەرارببوونا ئاشتیێ ل دەڤەرێ د ناڤبەرا ١٩٧٠- ١٩٧٤ێ ژ ئەنجامێ پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ و دابەشکرنا عەردی ل سەر خێزانێن شەهیدان و پێشمەرگەی و فەرمانبەران و ئاڤاکرنا وی عەردی د ڤێ قۆناغێدا و روودانێن پشتی دەسپێکرنەڤا شەری ل کوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٤ێ وەك بەردان و ڤالاکرنا ب زۆربیا گوندان و چەندین فاکتەرێن دیتر ئەگەرێ ڤێ زێدەبوونێ بوون د هژمارا خەلکێ دهۆکێ دا.

ل سالا ١٩٨٣ێ ل دووڤ تەخمینا ڤەکۆلەرەکێ تایبەتمەند کری هژمارا خەلکێ دهۆکێ ل داویيا سالا ١٩٨٣ێ گەهشتییە ٨٠٣٤٧ کەسان، ئانکو د ناڤبەرا شەش سالاندا خەلکێ باژێری ب رێژا ٢٢٠٪ ل زێدەهیێ دایە[٧٩]. گومان تێدا نینە هەمان ئەگەرێن مە بۆ زێدەبوونا ناڤبەرا ١٩٦٥- ١٩٧٧ێ ژ ڤێ قۆناغێ ژی دگرن، زێدەباری وان ژی ڤالاکرنا گوندان و ڤەگوهاستنا خەلکێ وان بۆ کۆمەلگەهان کو پشکەك ژ وی خەلکی هاتنە سەنتەرێ دهۆکێ ئەگەرێ هەرەسەرەکیێ زێدەبوونا خەلکێ باژێری بوون، د هەمان دەمدا هژمارەك زێدە ژ خەلکێ پاریزگەها دهۆکێ کو ل پاریزگەهـ و باژێر و دەڤەرێن دی یێن عیراقێ نیشتەجێبوون پشتی مەزنبوونا دهۆکێ و دامەزراندنا هەموو رەنگە سازی و فەرمانگەهێن شارستانی ل دهۆکێ ئەو ژی زڤرینەڤە بۆ سەنتەرێ دهۆکێ، د هەمان دەمدا ب بریارا دەستەلاتی د وی سەردەمیدا نەدبوو کوردێن پاریزگەهێن دەرڤەی سنوورێ ئەوا دگۆتنێ دەڤەرا ئۆتونومی ل وان پاریزگەهان بێنەدامەزراندن و دەستەلاتی ل سەر وان سەپاند ل پاریزگەهێن سەر ب دەڤەرا ئۆتونومی بێنەدامەزراندن لەوما دێ بینین هژمارەك ژ کوردێن پاریزگەهێن دیتر وەك مووسل، کەرکووك، دیالێ و کوت هاتنە دهۆکێ و لێ ئاکنجیبوون و هەتا نها ژی لێ مانە، ب ڤی رەنگی دو رەنگێن کۆچبەریێ بەرەف ناڤ باژێرێ دهۆکێ هاتن، کۆچبەرییەك ژ دەڤەرێن پاریزگەهێ بۆ ناڤ سەنتەرێ دهۆکێ کو ڤەکۆلەرەکی رێژا وان ب ٨٣.٥٪ دەسنیشانکرییە کۆچبەرییەك ژ دەرڤەی پاریزگەهێ بۆ ناڤ سەنتەرێ دهۆکێ کو رێژا وان ژی ب ١٦.٥٪دەسنیشانکرییە، ژ ڤێ رێژا ژ دەرڤەی پاریزگەهێ هاتین ٨٢.٦٪ ژ پاریزگەها نەینەوا (مووسلێ) و رێژا مایی ژ پاریزگەهێن دیتر هاتینە[٨٠].

سەرەرای کاودانێن سەخت و دژوارێن ل نیڤا دووێ ژ سالێن هەشتییان ب سەر باژێرێ دهۆکێ هاتین لێ ژبەرکو تیراتییا ئاکنجیبوونا خەلکێ پاریزگەهێ ل ناڤ مەلبەندێ پاریزگەهێ ئانکو دهۆکێ بوو لەوما دێ بینین بەردەوام دهۆك د مەزنبوونێ و خەلکێ وێ د زێدەبوونێدا بوون، ل دووڤ ئامارا ل سالا ١٩٨٧ێ هاتییەکرن هژمارا خەلکێ باژێری گەهشتییە ١٢٣٢٩٩كەسان[٨١]. ب روودانا سەرهلدانا بهارا ١٩٩١ێ و بەرفەراربوونا رەنگەتەناهییەکێ و نیڤئازادییەکێ ل سەرانسەری پاریزگەهێ و زڤرینەڤا ب هزاران کەسان ژ مشەختیێ ل دەرڤەی وەلاتی و هاتنەپێشا چەندین هۆکارێن دی بۆ مەزنبوونا باژێری ب رەنگەکێ بەرچاڤ هژمارا خەلکێ باژێری ل زێدەهیێ دا، هەرچەندە ئامارێن زانستی د ڤی واریدا نینن و چ سەرژمێری نەهاتینەکرن لێ ل دووڤ ئامارێ پەروەردەیی ل سالا ١٩٩٦ێ هژمارا خەلکێ دهۆکێ و گوندێن کەتینە د ناڤ سنوورێ سەنتەرێ باژێرێ دهۆکێ دا ١٦٩٢٢١ کەس بوو، ئەڤ هژمارە ل دووڤ هەمان ئامارێ ل سالا ٢٠٠٠ێ بوویە ١٩٩٠٤٧ کەس. ل دووڤ ئامارا دەسنیشانکرن و بهژمارکرن (حصر و ترقیم)ا سالا ٢٠٠٤ێ هژمارا خەلکێ باژێری بوویە ٢٣٥٤١٢كەس و ل دووڤ هەمان ئامارێ ئەڤ هژمارە ل سالا ٢٠٠٩ێ بوویە ٢٩٥٧٣٨كەس و ل دووڤ ئامارا دەسنیشانکرن و بهژمارکرنێ و نووکرنێ (تحدیث) ئەڤ هژمارە ل سالا ٢٠١٠ێ بوویە ٢٩٥٧٣٨كەس[٨٢].

یا فەرە ل ڤێرێ و ل دووڤ هەمان ژێدەر بێژین: تێكرایێ زێدەبوونا سرۆشتی د ناڤبەرا سالێن ١٩٨٧- ١٩٩٦ێ ٤.١٪ و د ناڤبەرا ١٩٩٦- ٢٠٠٠ێ ٤.٤٪ و د ناڤبەرا ٢٠٠٠- ٢٠٠٤ێ ٤.٦٪ و د ناڤبەرا ٢٠٠٤- ٢٠٠٩ێ ڤێ رێژەیێ ل كێمیێ دایە و بوویە ٣.٨٪ و د ناڤبەرا ٢٠٠٩- ٢٠١٠ێدا جارەكا دی ل زێدەهیێ دایە و بوویە ٥.٥٪[٨٣].

ئەنجامنەدانا چ ئامارێن رەسمی بووینە ئەگەر هەردەم ئامارێن ب سەروبەر و جهێ باوەریێ یێن دهۆكێ ل بەر دەست نەبن، لەوما ژی ئەم وەك ستافێ ئینسكلوپیدیا پارێزگەهێ نكارین ئامارێن راست و دروستێن باوەرپێكری و ژ ئەنجامێ ئامارەكا سەرانسەری و گشتی هاتبنەدیاركرن بەرچاڤبكەین و ئەو هژمارێن بەری نها مە ئاماژەپێكرین ژ سالا ١٩٥٧ێ بەرەڤ ژوور ئامارێن تەخمینكرینە و ب بەرچاڤوەرگرتنا تێكرایێ زێدەبوونا سرۆشتی هاتینەتەخمینكرن و دبیت هندەك فاكتەر و كاودانێن دی ژی باندۆرا خۆ ل سەر هەبوویە، هەر ب ڤی رەنگی ل دووڤ ئامارا تەخمینكریا رێڤەبەریا ئامارا دهۆكێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ هژمارا خەلكێ سەنتەرێ باژێرێ دهۆكێ ٣٥٨٥٢٧ كەسە و هەموو ژی ب باژێری (حضر) هاتینەدیاركرن ژبەركو گوندێن دەوروبەر كەتینە د سنوورێ نەخشێ بنیاتیێ باژێرێ دهۆكێ و نها چ گوند نەماینە سەر ب باژێرێ دهۆكێ ڤە، هەر ب ڤی رەنگی هژمارا تەخمینكریا ناحیا زاویتە ٢٠٩٢٢ كەسە، ژ وانا ١٢٦٩٠ كەس ل باژێر و باژێركان و ٨٢٣٢ كەس ل گوندان دژین، و هژمارا تەخمینكریا ناحیا مانگێش ١٢٦٠٨كەسە و ژ وانا ٣٩٢٦كەس ل باژێری و ٨٦٨٢كەس ل گوندان دژین، ب ڤی رەنگی هژمارا خەلكێ هەموو قەزا دهۆكێ دبیتە ٣٩٢٠٥٧ كەس[٨٤].

## تاخێن دهۆكێ

هەروەك د بەرپەرێن چوویدا دیاربووی دهۆك ل دەسپێكا سەدسالیا بیستێ باژێرەك بچووك یان گوندەك مەزن بوو، سەنتەرێ قەزایەك پلە سێ بوو، گرنگیيا خۆ د چ وارێن شارستانی، ئابووری، رەوشەنبیریدا نەبوو، لەوما ژی تاخێن دهۆكێ ژی وەك قەبارەیێ باژێركی د بچووك و وەك هژمارا خەلكێ باژێركی د كێم بوون.

ل دووڤ نەخشەیێ ل سالا ١٩٢٣ێ بۆ تاخێن دهۆكێ هاتیەچێكرن ئاماژە ب سێ تاخێن دهۆكێ هاتیە كرن: تاخێ ئیسلام (محلة الاسلام)، تاخێ فەلان (محلة النصارى) و تاخێ سویكێ (محلة السوق). هەمان ژێدەر ئاماژە پێ دكەت كو ل سالێن سیهان ژ سەدسالیا چوویی دهۆكێ تنێ شەش تاخ بوون: محلة السراى، السوق، شیلی، گریباسێ، برایەتی (الاخوة)[٨٥]. محله الاسلام (محلة شیخ محمد)[٨٦].

ل دووڤ توومارێن هەردو خواندنگەهێن سەرەتایێن كچان و كوران یێن دهۆكی د ناڤبەرا سالێن ١٩٢٨- ١٩٣٢ ناڤێن تاخێن دهۆكێ ب ڤی رەنگی بوون: السوق، رووبار، الشیخ، قشلە، مەیدان، كەندال، بیدر، القرج، جلالی، الاسلام، الیهود، النصارى بوون[٨٧].

ل دووڤ ئامارا ١٩٤٧ێ تاخێن دهۆكێ چوار تاخ "الاسلام (شیخ محمد)، شیلێ، النصارى، الیهود و گرى باصێ" بوون، ل دووڤ ئامارا ١٩٥٧ێ حەفت تاخ " محله السوق، محله شیخ محمد، محله السراى، محله الریكان، محله شیلی، محله بن توكە، محله النصارى، محله گرى باصی" بوون[٨٨].

هندی پەیوەندی ب ڤێ قۆناغێ و تاخێن دهۆكێ و ناڤێن وان و جهێن وان د ڤێ قۆناغێدا ئانكو ناڤبەرا ١٩٢٣- ١٩٥٧ڤە هەی هەژییە ئاماژە ب ڤان تێبینییان بكەین:

- ناڤ ب عەرەبی كو زمانێ فەرمیێ كارگێرێ سەپاندی بوویە ل سەر دەڤەرێ هاتینەنڤیسین.
- تێكەلی و پێكەلی د ناڤ تاخاندا هاتییەكرن، تاخێ ئیسلام كو پیكهاتا مەزنترا باژێری بوو، ب چەند ناڤێن دیتر ژی وەك: محلة شیخ محمد كو هەمان تاخێ مەزارییە هاتییەناڤكرن..
- د ژێدەرێن دی یێن ناڤێن تاخێن دهۆكێ یێن سالێن پێنجییان و شێستان ناڤێن ڤان تاخان هاتینە:

تاخێ سەرای، تاخێ حەمامێ، تاخێ مەزاری، تاخێ سویکێ، تاخێ ئیسلام، تاخێ کۆچەرا (خەبات)، تاخێ شێلێ، تاخێ رێکانییان، تاخێ فەلان، تاخێ کورا مەوتیا، تاخێ گرێ باسێ و تاخێ قەرەچا[٨٩]، هەروەسان د توومارێن خواندنگەهاندا ناڤێن خۆجهی ئانکو ناڤێن دەڤەران هاتینە توومارکرن، وەك تاخێ کەندالی، مەیدانێ، قشلێ، دیارە ئەڤ هەموو ناڤە ناڤێن نە رەسمی بوونە بەلکی ناڤێن مللی بوونە و هندەك وەرگێرانا ناڤێن کوردی یە بۆ عەرەبی، هندەك جاران جهەك ب چەند ناڤەکان هاتیبەناڤکرن، بۆ نموونە تاخێ سەرای و قشلێ ناڤێن یەك جهینە، تاخێن مەزاری و حەمامێ و سویکێ هەرسێ ناڤێ تاخێ موسلمانان بوونە کو د توومارێن فەرمیدا ب تاخێ ئیسلام هاتیبەناڤکرن..

د ئەنجامدا ئەم دکارین بێژیت: رێك و پێکی د سەروبەرێ جوگرافیێ تاخاندا نەبوویە، سنوورێ وانێ جوگرافیێ دیارکری نەبوویە و هەر جارێ ب ناڤەکی هاتینەناڤکرن، لێ وەك ڤەکۆلەرەك دیاردکەت: پشتی شەرێ جیهانیێ ئێکێ هەتا داویا سالێن بیستان دهۆك تنێ تاخێ شێلێ و تاخێ شێخ محەمەد (تاخێ ئیسلام) و تاخێ فەلان دگەل دو تاخێن بچووك ب ناڤێ تاخێ سویکێ (محلة السوق) و تاخێ گرێ باسێ[٩٠]. نڤیسەرەکی هەڤدەمێ وان سالان دبێژیت: ل ناڤەراستا سەدساڵیا بیستێ دهۆك ژ چوار تاخان پتر نەبوو: تاخێ شێلێ، تاخێ ئیسلام (محلة الاسلام) هەردو تاخێن مەزاری و سویکێ (السوق)د چوارچووڤێ تاخێ ئیسلامدا بوون، تاخێ فەلان (محلة النصارى) و جوهی ژی دگەل وی تاخی بوون و تاخێ گرێ باسێ و هەموو ئەڤ تاخە دکەتنە ناڤبەرا ئالیێ چەپێ یێ رووبارێ دهۆکێ و ئالیێ راستێ یێ رووبارێ هشکەروو کو هەردو ل کانی خشمانا ژێریێ رۆژئاڤایێ دهۆکێ دگەهنە ئێك[٩١].

وەك دیار دبیت و ڤەکۆلەرەك ژی پشتەڤانیێ ل ڤێ بۆچوونێ دکەت، پێکهاتا تاخێن دهۆکێ ژی وەك هەموو باژێرێن دی ل سەر بنیاتەك ئایینی و عەشائیری

نەخشێ بنیاتێ دهۆکێ ساڵێن هەشتیان



بوویە، پرانییا موسلمانان ل تاخێ شێخ محەمەدی (تاخێ مەزاری یان تاخێ ئیسلام) و مەسیحییان ل تاخێ فەلان (النصاری) و جوهی ل تاخێ فەلان و گرێ باسێ ئاکنجی بوون[٩٢].

ژ سالا ١٩٥٧ێ بەرەف ژوور چەندین کاودانێن نە ئاسایی ب سەر دهۆکێ را هاتینە، هندەك جاران رێك ل بەر وەرار و گەشەپێدانا باژێری گرتییە، لێ سەرەرای ڤێ چەندی بەردەوام باژێری ل وەرارێ و مەزنبوون و بەرفرەهبوونێ دایە، د قۆناغا ناڤبەرا ١٩٥٧- ١٩٦٥ێ کو سەرژمێرییەکا بێ سەروبەر ب تایبەت ل دەڤەرێن دەرڤەی باژێرێن مەزن هاتییەکرن، باژێری بەرفرەهبوونەك کێم ب خوڤە دیتییە، بەلێ د ناڤبەرا ١٩٦٥- ١٩٧٧ێ کو سەرژمێرییەك دیتر هاتییەئەنجامدان، ژ ئەنجامێ زێدەبوونەکا نە ئاسایی هژمارا خەلکێ باژێری، باژێری بەرفرەهبوونەك مەزنتر ب خوڤە دیتییە، تاخێن نوو دروستبوونە و هژمارا تاخان گەهشتیە ١٥ تاخێن فەرمی ب ناڤێن ژێری:

نوشداری (الشفاء)، شێلێ، خەبات، کۆماری، برایەتی (فەلان- نەصارا)، سویکێ، سەرای، شێخ محەمەد، گەلی، کانی مهەمەدکێ، گرێ باسێ، شەهیدان، ئیسکان، دهۆکا نوی، نەورۆز[٩٣]. ب پێداچوونا ڤان ناڤان دیار دبیت هندەك ژ وان هەمان تاخێن کەڤنن، ل زێدەبوونێ دایە، هندەك دەوروبەرێن وان تاخانن و ل زێدبوونێ دایە وەك تاخ هاتینە توومارکرن وەك تاخێ نوشداری کو بەردەوامیا کانی خشمانا یە و بوویە تاخەك نوو و نەورۆز کو بەردەوامیا تاخێ گرێ باسێ و ژ سالێن شێستان بەرەف ژوور وەك تاخەکێ هەڤچەرخێ دهۆکێ هاتییەئاڤاکرن و پرانییا خەلکێ وی ژی مەزنە فەرمانبەر و دەولەمەندێن دهۆکێ بوون، هندەك ژ وان ژی تاخێن نوونە وەك شەهیدان کو پشتی ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ هاتییەئاڤاکرن و ئیسکان و دهۆکا نوو، کو نووترینێ وان تاخان د وی سەردەمیدا دهۆکا نوو بوو.

ژ ڤێ قۆناغێ بەرەف ژوور باژێرێ دهۆکێ پتر

گوهرانکارییێن د نەخشەیی بنیاتیدا هاتینەکرن هەتا سالێن نوتان



بەرفرەهبوویە و تاخێن نوو هاتینە ئاڤاكرن، بەلێ ژبەر چەندین ئەگەران باژێر بەرەف رۆژئاڤای بەرفرەهبوویە و پشتی ئاڤاكرنا تاخێ دهۆكا نوو (جەمعیێ- ئاشتی) باژێر بەرەف گوندێن بەرۆشكێ ئانكو رۆژهەلات و ژێرێ دهۆكێ تاخێن نزاری بەرفرەهبوویە. د ڤێ قۆناغێدا دو تاخێن نوو بەرۆشكێ و كۆمەلگەها بەرۆشكێ هاتینەئاڤاكرن، ئانكو گوندێ بەرۆشكی كەتییە د ناڤ باژێریدا و باژێر ژ گوندێ بەرۆشكێ ژێ دەربازبوویە و بەرەف نزاركێ چوویە و نێزیكی ئیتوتێ بوویە، پشتی ئاڤاكرنا ڤان دو تاخان هژمارا خانیێن باژێری كو ل سالا ١٩٧٧ێ ٣٦٦٨ خانی بوون ل سالا ١٩٨٤ێ بووینە ٩١٤١ خانی[٩٤].

د ڤێ قۆناغێدا ئانكو ژ داوییا سالێن حەفتییان هەتا سەرهلدانا ١٩٩١ێ چەندین فاكتەرێن دی وەك: ڤالاكرن و ڤەگوهاستنا ب زۆریا گوندان، زڤرینەڤا خەلكی پاریزگەهێ و یێن پاریزگەهێن كوردستانێ یێن دەرڤەی سنوورێ ئەوا دگۆتنێ دەڤەرا ئۆتونومی ژ باژێرێن عیراقێ بۆ دهۆكی، زێدەبوونا سازی و دەزگەهـ و فەرمانگەهێن دەولەتێ ل دهۆكێ و چەندین فاكتەرێن دی پێدڤی دكر باژێر زێدەتر بەرفرەهـ ببیت، عەردێ ئاكنجیكرنێ ل سەر خەلكی بێتەبەلاڤكرن، تاخێن نوو بێنەئاڤاكرن، د هەمان دەمدا سازیێن ئەمنی و لەشكەریێن حكۆمەتێ رازینەدبوون پتر باژێر ل بنارێ چیایێ سپیرێزی بەرەف رۆژئاڤایێ باژێری بێتەئەڤاكرن، لەوما بریاردان ل دەڤەرا نزاری ژێریێ باژێری ئەرد بێتە ئیستملاككرن و فەرز كرن و دابەشكرن ل سەر خەلكی، د قۆناغا سالێن هەشتییان دەست ب ئاڤاكرنا تاخێن نزاری (تاخێ رەزا سەری و بنی، تاخێ بنتویكا، تاخێ رۆناهی، تاخێ مەهاباد و سەربەستی) هاتەكرن، د ڤێ قۆناغێدا ئەڤ تاخە كو وی دەمی ب ناڤێن عەرەبی هاتبوونە ناڤكرن ل تاخێن باژێری هاتنەزێدەكرن، ب ڤی رەنگی ل دەسپێكا سالێن نۆتان ئانكو دەسپێكا سەرهلدانا ١٩٩١ێ باژێرێ دهۆكێ ژ ڤان تاخان پێكدهات: تاخی بازار، داسنیان، مەزار(الاسلام)، برایەتی (النصاری)، گرێ باصێ، نوهەدرا (كۆماری)، شێلێ، خەبات، كانی خشمانە،

**كەلا دهۆكێ یا كەڤن سالێن بیستان**



کانی مەهمەدکێ، گەلی، ئاشتی (جەمعیا نوی)، شۆرش (جەمعیا کەڤن)، شەهیدان، نەورۆز، بەرۆشکێ، سەرهلدان، دیاری، سێ گرکا، ئازادی، بن تویکا، رەزا، رۆناهی، سەربەستی، مەهاباد[٩٥].

ب پێداچوونا ڤان ناڤان چەند تێبینییەك بەرچاڤدکەڤن، وەك تاخێن بەرێ هەرسێ تاخێن بەرێ بازار (سویکێ) داسنییان، مەزاری، هەمان تاخێ ئیسلامێ بەرێ نە، د ڤان ١٥ ناڤاندا ئاماژە ب تاخێ نوشداری نەکرییە کو ب تاخێ خەستێ ژی دهێتەناڤکرن وەك مە ئاماژەپێکری بەردەوامییا تاخێ کانی خشمانایە، د هەمان دەمدا ئەڤ ناڤە ل دووڤ نەخشێ بنەرەتییێ بازێرێ دهۆکێ نڤیسینە. ژ سالا ١٩٩٥ێ بەرەڤ ژوور بەردەوام بازێرێ دهۆکێ مەزنتر لێ هاتییە هەتا گوندێن دەوروبەر (مالتا سەری و بنی، نزارکێ، شندوخا، زرکا، گەڤەرکێ) کەتینە د ناڤ سنوورێ بازێریدا و ل دووڤ نووترین نەخشێ بنەرەتیێ بازێرێ دهۆکێ ژ ڤان تاخان پێکهاتییە:

ژ رۆژهەلات بۆ رۆژئاڤا: ئێتیتێ، بێسرێ، نزارکێ، سەرهلدان، پیشەسازی، بەرۆشکێ، بەرۆشکا باشووری، مەهاباد، پیشەسازی، دیاری، رۆناهی، گەلی، کانی مەهمەدکێ، خەبات، سەربەستی، بنتیکا، سێ گرکا، شەهیدان، داسنیا، بازار، برایەتی، نوهەدرا، شێلێ، کانی خشمانە، رەزا، ئازادی، شۆرش، گرێ باسێ، نەورۆز، ئاشتی، مازی، شندوخا، شاخکێ، بۆتان، ماسیکا رۆژهەلات، بەهدینان، میدیا، شندوخا، ماسیکا رۆژئاڤا، زرکا، مالتا سەری (ژووری)، مالتا خارێ (ژێری)، گەڤەرکێ، قەسارا[٩٦].

هندی پەیوەندی ب رووبەرێ بازێرێ دهۆکێ ڤە هەی هەژییە بێژن: هژمارا ئاکنجیێن بازێری و هژمارا تاخان بەردەوام د مەزنبوونێدا بوویە، ب هەمان شێوە رووبەرێ بازێری ژی بەردەوام د مەزنبوون و بەرفرەهبوونێدایە ل دووڤ نەخشێ بنیاتیێ دهۆکێ یێ سالا ١٩٢٠ێ رووبەرێ دهۆکێ ١٦٨٦٤٧.٧٤م٢ بوو، لێ ل دووڤ دوا نەخشێ بنیاتیێ ٢٠١٠ێ رووبەرێ دهۆکێ ١١٥٥٥١٥٤م٢ یە، د ڤان ٩٠ سالاندا ئانکو ئانکو د ناڤبەرا ١٩٢٠- ٢٠١٠یدا ب رەنگێ ژێری بەرفرەهبوون کەتییە رووبارێ بازێری[٩٧]:

| | |
|---|---|
| ١٩٢٠ | ١٦,٨٦٤,٧٧٤م٢ |
| ١٩٦٠ | ٢٤٨,٢٥٦,٩١٢م٢ |
| ١٩٧٠ | ٢٣,٦٩٧,١٥٧م٢ |
| ١٩٨٠ | ٣١٠,٩٤٢,١٨٦م٢ |
| ١٩٩٠ | ١٢٥,٦٨٠,٢٣١م٢ |
| ٢٠٠٠ | ١٨٥,٨٢٦,٩٨٨م٢ |
| ٢٠١٠ | ١١٥,٥٥١,٥٤٢م٢ |

نها دێ ب کورتی ڤان تاخان و چاوانیا دروستبوون و ناڤکرنا وان دەینەنیاسین:

هەروەك د بەرپەرێن چوویدا دیاربووی د نیڤا ئێکێ ژ سەدسالیا بیستێدا دهۆك بازێرەك بچووك بوو و تنێ چوار تاخ ب خۆڤەدگرتن: ئەو ژی تاخێن: شێلێ، تاخێ ئیسلام، تاخێ فەلا (نصارا- سورایێ- برایەتی)، تاخێ جوهییان کو بەردەوامییا تاخێ فەلان بوو و تاخێ رێکانیان و تاخێ گرێ باسێ بوون، پاشتر هەر چەند سالەکان تاخەك نوو ئاڤابوو و ل دووڤ جهێ خۆ هاتەناڤکرن:

## - تاخێ شێلێ:

ئێك ژ تاخێن کەڤنێن دهۆکێ یە هەتا سالێن حەفتییان ژ سەدسالییا چوویی، دوماهییا وی ئاشێ بەفرێ بوو و رۆژهەلاتێ وی قەسرا عەبدوللا سواری و ئاشێ هیرۆی بوو و رۆژئاڤای ژی جادا گشتی بوو یا ژ تاخێ خەستێ ڤە دهێتە ناڤ دهۆك، ب تاخێ شێلێ هاتییەناڤکرن، ژبەرکو جهێ شێلێت برنجی بوو[٩٨].

## - تاخێ ئیسلام:

هەروەك د بەرپەرێن چوویدا ئاماژە پێ هاتییەکرن دهۆك ژی وەك زۆربەی بازێر و بازێرکێن دی یێن دەڤەرێ تاخێن وێ ل سەر بنیاتەك ئایینی هاتبوونە لێکڤەکرن، تاخێ ئیسلام ل دهۆکێ ژ کەڤنترین تاخێن دهۆکێ یە و دکەڤنترین نەخشەیێ بازێرێ دهۆکێ دا کو ل سالا ١٩٢٣ێ هاتییەکێشان ناڤێ ڤی تاخی دگەل تاخێن دی ب عەرەبی (محلة الاسلام، محلة النصاری، محلة

السوق) هاتییە، ئانکو ئەڤ تاخە د وێ سالێدا وەك تاخەکێ مەزنێ بازێری د توومارێن دەولەتێدا هاتییە نڤیسین[99]، هەروەك ژێدەرەك سنوورێن ڤی تاخی ل سالێن شێستان و پێشتر دەسنیشاندکەت: د سەر تاخێ سویکێ (بازاری) را ب رەخ تاخێ مەزاریڤە هەتا دگەهیتە جادا گشتی یا ژ تاخێ خەستا کەڤن دهێت و دچیتە تاخێ کۆچەرا، کۆ سنوورە د ناڤبەرا هەردو تاخێن ئیسلام و شێلێ دا[100]. هەروەك د نەخشێ بنیاتیێ سالا ١٩٢٣یێدا سنوورێن تاخێ ئیسلام د ناڤبەرا جادا خەبات (دختورا) جادا دای شرین (جگارا) و جادا شێلێ و ڕووبارێ دهۆکێ دا بوو، ئانکو تاخێ مەزاری ژی کەتییە د ناڤ ڤی نەخشێ فەرمیێ ڤی تاخیدا[101].

## - تاخێ مەزاری:

دکەڤیتە دەوروبەرێن مەزارێ شێخ محەمەد کورێ شێخ عەبدوللایێ بریفکانی (ل سالا ١٣٠٥مش/١٨٨٧ز مرییە)، شێخ عەبدوللا برازایێ شێخ نورەدینێ بریفکانی یە[102]، دیارە پشتی مرنا شێخی خەلکی قەستا ڤی جهی کرییە و ئەڤ تاخە ئاڤابوویە.

## - تاخێ نەصارا (سورایی- برایەتی):

ئەڤ تاخە ژ تاخێن هەرە کەڤنێن دهۆکێ یە، ئەگەر کەڤنترین تاخ ژی نەبیت، ناڤێ وی د یەکەمین نەخشێ بازێریدا هاتییە ئەوێ ل سالا ١٩٢٣ێ هاتییەکێشان[103]. ئەڤ تاخە کو ژ ئالیێ ئاکنجییێن تاخیڤە کو مەسیحییێن کلدانن ب تاخێ (سورایێ- محلة سورایی یان محلة ختیثا) دهێتە ناڤکرن، کوردێن دهۆکێ د بێژنێ تاخێ (فەلا)، ژ ئالیێ دەزگەهێن فەرمیێن دەولەتێڤە ب زمانێ عەرەبی د گۆتنێ (محلة نصاری)، پشتی پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ د قۆناغا ب کوردیکرنا ناڤێن سازی و خواندنگەهـ و تاخێن بازێریدا ب تاخێ برایەتی هاتییەناڤکرن[104]، ئەڤ تاخە نزمترین تاخێن دهۆکێ یە، دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ڕووبارێ دهۆکێ، بەرەف رۆژهەلاتی درێژدبیت و کێم کێمە ل ژێریێ رۆژهەلاتی جهێ دبێژنێ

وێنەکێ کەڤن یێ دهۆکێ



كەندالی (كو دكەڤیتە هنداڤ رووباری) بلند دبیت، رووبارێ دهۆكێ رۆژئاڤا و ژێریێ تاخی پێكدئینن، تاخێ سویكی و تاخێ شێلێ باكوور و رۆژهەلاتێ تاخی پێكدئینن. ئەڤ تاخە ل دەسپێكێ و هەتا نها ب دێرا كلدانان (كنیسة الانتقال للكلدان) كو ل سالا ١٦٣٥ هاتییە ئاڤاكرن و دو جاران سالێن ١٨٥٠ و ١٩٤٨ێ هاتییەنوژەنكرن و نها ژی وەك دێرا كلدانان رۆلێ خۆ دگێریت، هەروەسان كنشتا جوهییان كو نها نەمایە، خواندنگەها (الطاهرة الاهلیة للكلدان) ل سالا ١٩٣١ێ هاتییەڤەكرن، و سالا ١٩٥٧ێ ئاڤاهیێ وێ هاتییە ئاڤاكرن، ئەڤ خواندنگەهە هەتا سالا ١٩٧٣ێ بەردەوام بوویە و یانەیا نوهەدرا ئەوا ل سالا ١٩٧٥ێ ل ئاڤاهیێ خواندنگەها ناڤبری هاتییەڤەكرن و چەند جهێن دی كو ب جهێن ناڤدارێن دهۆكێ دهێنەنیاسین[١٠٥].

## - تاخێ جوهییان:

ئەڤ تاخە پشكەك بوویە ژ تاخێ فەلان لێ دیارە د چوارچووڤێ ڤی تاخیدا مالێن جوهییان جودا بووینە، ل دووڤ ژێدەرەكی ل سالێن سیهان ٧٠ خێزانێن جوهی ل هەردو تاخێن فەلا و گرێ باسێ هەبوونە[١٠٦] و جوهییان دو كۆمەلگەهـ (مجمع- كنوشتا) هەبوون یەك نێزیكی كەنیسا (الانتقال) ژ لایێ ژووریڤە و یا دیتر ل پشت خواندنگەها (الطاهرە) و پاشتر بوویە پەیمانگەها ئیسلامی، پشتی چوونا جوهییان بۆ ئیسرائیلی كۆمەلگەهێ ئێكێ ژی هێدی هێدی هەرفتییە و د سالێن حەفتییاندا كەتییە ناڤ جادا سەرەكییا بەرەڤ تاخێ شێلێ دچیت و جهێ ڤی كۆمەلگەهی بەرامبەری دەرمانخانا (الشفاء) بوو[١٠٧].

## - تاخێ گرێ باسێ:

ئەڤ تاخە نە ژ تاخێن گەلەك كەڤنێن باژێرییە، ژ بەركو هەتا دەهكێن بەراهیێ ژ سەدسالییا بیستێ باژێرێ دهۆكێ تنێ ل ئالیێ رۆژهەلاتی یێ رووبارێ دهۆكێ بوو، د ناڤبەرا سالێن ١٩٢٤- ١٩٢٧ێ دەستەلاتداریا ئینگلیزی یا حوكمدار هندەك ژ مالێن مەسیحییێن تیاری ئەوێن ژ دەڤەرا هەكاری مشەختبووین ل گرێ باسێ هنداڤ رووبارێ دهۆكێ (جهێ نهایێ باخچێ خانی هەتا دێرا گرێ باسێ یا نها) ئاكنجیكرن. پشتی وان ل سالا ١٩٤٩ێ دێوالی سەعید ئاغایێ دۆسكی قەسرا خۆ یا نها ژی ب قەسرا دێوالی دهێتەنیاسین ئاڤاكر[١٠٨]، ب ئاڤاكرنا قەسرێ پتر بەرێ خەلكی كەتە ئالیێ رۆژئاڤایێ رووبارێ دهۆكێ وهەردو ئالیێن جادا گشتی رۆژ ب رۆژ ئەڤ دەڤەرە پتر دهاتەئاڤاكرن، لێ هەتا سالا ١٩٥٧ هژمارەكا كێما خەلكی لێ ئاكنجیبوون وەك د ئامارێن رەسمیدا دهێتەدیاركرن سالا ١٩٤٧ێ هژمارا خەلكێ تاخێ جوویان و گرێ باسێ پێكڤە ٩٢٤ كەس بوو، بەلێ ل سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گرێ باسێ ب تنێ ٢١٠ێ كەسبوون[١٠٩]، لێ ژ ڤێ سالێ بەرەڤ ژوور خەلك پتر ل ڤێ دەڤەرێ ئاكنجی دبیت، ل دەسپێكا شۆرشا كوردستانێ ل ئەیلوولا ١٩٦١ێ خەلكێ هژمارەكا گوندێن پشتا گەلیێ دهۆكێ وەك پیرۆمەرا، گەرماڤا، باجلۆری، گرێ قەسرۆكا و هندەكێن دی گوندێن خۆ بەرددەن و ل گرێ باسێ و دەوروبەرێن قەسرا دێوالی ئاغای ئاكنجی دبن و هندەك خانییێن دەمكی و بێ سەروبەر بۆ خۆ ل وان جهان ئاڤادكەن كو وەختەكی دگۆتنێ تاخێ پیرومەریا و خواندنگەها پیرومەرا ژی ژ گوندی دهێتەڤەگوهاستن و دئاڤاهیێ خواندنگەها (دهوك الثانیة- پاشتر نەورۆز) دەوامێ دكەت، ژ وێ سالێ بەرەڤ پاش تاخێ گرێ باسێ مەزنتر دبیت بەرەڤ ژوور ئانكو بەرەڤ تاخێ شەهیدان بەرفرەهـ دبیت، پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ پارچێن عەردی ل ژووریێ گرێ باسێ تاخێ شەهیدان یێ نها ل سەر پێشمەرگەی و خێزانێن شەهیدان دهێنەبەلاڤكرن و ب ڤی رەنگی تاخێ شەهیدان ل ژووریێ گرێ باسێ دهێتەئاڤاكرن[١١٠].

هندی پەیوەندی ب ناڤێ گرێ باسێ ڤە هەی دهێتەگۆتن: گرێ باسێ دكەڤیتە دەرێ گەلیێ دهۆكێ و بەردەوام و د هەموو وەرزاندا بایەكێ مەزن و هوین

و ڤێنك ژ گەلی بەرەف دەڤەرا گرێ باسێ دهێت و د ئەنجامدا گر ب ناڤێ گرێ باتێ هاتییەناڤکرن و ب بۆرینا دەمی بوویە گرێ باسێ و ئەم د وێ باوەریدانە ئەڤ بۆچوونە ل سەر ناڤکرنا گرێ باسێ د جهێ خۆدایە و پتر نێزیکی سرۆشتێ گرێ باسێ یە.

بۆچوونەکا دی دبێژیت ل هێرڤەی دەرێ گەلی ل جهێ سەردەمەکێ نەکەڤن ب ئاشێ مەلا جبرائیلی دهاتەناڤکرن قەرەقولەکا (مەخفەرەکا) ترکان هەبوو، دەمێ کاروانی ژ ئەڤرازی دهۆکێ دهاتن کارێ ڤێ قەرەقولێ ئەو بوو ل تڤەنگێن خەلکی بنێریت کا د پاس کرینە ئانکو مولەتا هەلگرتنێ هەیە، ژبەرکو د سەردەمێ دەولەتا ئوسمانیدا دڤیا تڤەنگ د پاس کربانە ئانکو مولەت پێ هەبا، پاس ژ پەیڤا (Pass) یا ئینگلیزی ئانکو (مولەت- سماح)، ب ڤی رەنگی پیچپیچە خەلکی گۆتییە ڤی جهی جهێ پاسێ یان گرێ باصێ و هەتا نها ژی ب وی ناڤی دهێتەنیاسین. هندەك ڤەگێران ژی دبێژن پاص ناڤێ مرۆڤەکی بوویە و ئەڤ جهە ملکێ وی بوویە و ب ناڤێ وی ب گرێ پاصێ هاتییەناڤکرن[111].

## - تاخێ شەهیدان:

ئەڤ تاخە هەتا پێکهاتنا ۱۱ێ ئادارا ۱۹۷۰ێ جهێ چاندنا دەخل و دانی و جهەکێ ڤالا بوو ژ خەلکی و ئاکنجییان، پشتی ڤێ پێکهاتنێ سالا ۱۹۷۲ێ ل ڤی جهی پارچێن عەردی ل سەر پێشمەرگەی و خێزانێن شەهیدان هاتنەلێکڤەکرن و دەست ب ئاڤاکرنا وان هاتەکرن و جادە و سازیێن خزمەتگوزاری لێ هاتنەئاڤاکرن[112]، ب ڤی رەنگی تاخەك نوو ل نەخشێ بنیاتیێ باژێری زێدەبوو و هێدی هێدی بەرەف رۆژهەلات و رۆژئاڤایێ خۆ بەرفرەهبوو هەتا ل رۆژهەلاتی گەهشتییە گەلی و رووبارێ دهۆکێ و ل رۆژئاڤایڤە ژی هەر ل سالێن حەفتیبان تاخێ ئیسکان هاتەئاڤاکرن، پشتی شکەستان شۆرشا کوردستانێ ل ئادارا ۱۹۷۵ێ ب مەرەما نەهێلانا بیرهاتنێن شۆرشێ د هزرا خەلکێ باژێریدا حکۆمەتێ

وێنەکێ کەڤن یێ دهۆکێ



ناڤێ ڤی تاخی گۆهارت و كرە تاخێ سەلاحەدین، بەلێ د هزرا خەلكیدا و ل سەر زارێ وان بەردەوام ب تاخێ شەهیدان دهاتەناڤكرن، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ ل دووڤ پێشنیازا نڤیسەری دەملدەست سەرۆكێ بازێرڤانییا دهۆكێ تاخ ب رەنگەكێ فەرمی ب ناڤێ وی یێ رەسەن ناڤكرەڤە[١١٣].

## - تاخێ ئیسكان:

ئیسكان پەیڤەك عەرەبییە ئانكو جهێ ئاكنجیبوونێ، ل سەردەمێن بەری سەرهلدانێ ل زۆربەی بازێرێن مەزنێن عیراقێ تاخەك ب ڤی ناڤی هەبوو، ئەڤ تاخە ل نیڤا دووێ ژ سالێن هەفتییان ژ سالا ١٩٧٦ێ پێڤە هاتیەئاڤاكرن[١١٤]، و دكەڤتە رۆژئاڤایێ تاخێ شەهیدان و باكوورێ گرێ باسێ و ل ژووری و ژێریێ جادا شەهیدان، ئەڤ تاخە ب خۆ بەردەوامیا بەرفرەهبوونا هەردو تاخێن شەهیدان و گرێ باسێ بوو، ل دووڤ ئامارێن وەزارەتا پلاندانانا عیراقێ ئەڤ تاخە ل سالا ١٩٧٧ێ ٢٧١ ئاڤاهی بوو ژ وانا ٢٤٨ ئاڤاهیێن ئاكنجیبوونێ بوون و ٣٦٥ خێزان تێدا دژیان[١١٥]، پرانییا ئاڤاهیێن ڤی تاخی ئەو خانی بوون یێن حكومەتی هەموو وەك یەك بۆ فەرمانبەران ئاڤاكرین و ل سەر وان دابەشكرین[١١٦]، د دوا نەخشێ بنیاتیێ دهۆكێ دا تاخەك ب ڤی ناڤی نەمایە و بوویە پشكەك ژ هەردو تاخێن شەهیدان و گرێ باسێ.

## - تاخێ نوهەدرا:

ل سالا ١٩٦٠ێ بەرەڤ ژوور ئەڤ تاخە هاتیەئاڤاكرن، دكەڤتە ژێری و رۆژهەلاتێ جادا سەرەكییا دهۆكێ و رۆژئاڤایێ جادا نووهەدرا و ژووریێ جادا ١١ ئەیلوولێ، ل دەسپێكێ ب تاخێ (الجمهورية) هاتیەناڤكرن، ل دووڤ ئامارێن وەزارەتا پلاندانانا عیراقێ ئەڤ تاخە ل سالا ١٩٧٧ێ ٢٦٩ ئاڤاهی بوو ژ وانا ٢٣٩ ئاڤاهیێن ئاكنجیبوونێ بوون[١١٧]، ئاڤاهیێن ڤی تاخی ب رەنگەكێ هەڤچەرخ و رووبەرەكێ بەرفرەهـ

بەشەك ژ گرێ باسێ سالێن شێستان



هاتبوونەئاڤاکرن و د سالێن هەفتیاندا پێشکەتیترین تاخێ دهۆکێ بوو، پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ ئەڤ تاخە ب تاخێ نوهەدرا هاتییەناڤکرن، نها ئەڤ تاخە بوویە دەڤەرەك بازرگانی[١١٨].

## - تاخێ نەورۆز:

ئەڤ تاخە دکەڤیتە د ناڤبەرا تاخێن گرێ باسێ و نوهەدرا و ئاشتی دا، ل رۆژئاڤایێ جادا سەرکییا دهۆکێ و رۆژهەلاتێ جادا چرا، ژ سالا ١٩٦٥ێڤە هەردو تاخێن گرێ باسێ و نوهەدرا بەرفرەهبوونە و بەرەف رۆژئاڤایێ دهۆکێ درێژبوونە و ئەڤ تاخە کو ب نەورۆز هاتییەناڤکرن پێکهاتییە، ل دووڤ ئامارێن وەزارەتا پلاندانانا عیراقێ ئەڤ تاخە ل سالا ١٩٧٧ێ ١٦١ ئاڤاهی بوو ژ وانا ١٤٤ ئاڤاهیێن ئاکنجیبوونێ بوون[١١٩]، هەتا سەرهلدانا ١٩٩١ێ هژمارەك مەزن ژ ئاڤاهیێن فەرمانگەهـ و رێڤەبەریێن حکۆمەتێ بارەگایێن حزبی و ئێکەتی و کۆمەلەیان ل ڤی تاخی بوو دگەل مەزنترین مزگەفتا دهۆکێ یا وی سەردەمی ئانکو مزگەفتا ئازادی، هەروەسان بلندترین ئاڤاهیێ دهۆکێ یێ وی سەردەمی کو ئاڤاهیێ رێڤەبەریا گشتییا چاندنێ بوو و ب حەفت تەبەقی دهاتەناڤکرن ل ڤی تاخی بوو.

## - تاخێ ئاشتی (جەمعیا کەڤن):

ئەڤ تاخە ژ وان تاخانە یێن پشتی ب پارێزگەهبوونا دهۆکێ هاتینەئاڤاکرن، ئاڤاکرنا وی ژی گرێدایی دامەزراندنا کۆمەلا هەڤکارییا ئاکنجیکرنا فەرمانبەرانە ئەوا ل ١٩٧٠/٤/٢٥ێ هاتییەدامەزراندن، ڤێ کۆمەلەیێ ب کرینا ٥٤ دۆنەمێن عەردی دەسپێکر، پاشتر ١٧ دۆنەمێن دی کرین، ل دووڤ مەرجێن کۆمەلەیێ ل سەر فەرمانبەران هاتنەلێکڤەکرن[١٢٠] و سالا ١٩٧٧ێ دەست ب ئاڤاکرنا ڤی تاخی هاتەکرن، د وێ سالێدا ل دووڤ ئامارێن وەزارەتا پلاندانانا عیراقی تنێ ٧٣ ئاڤاهی ل وی تاخی هەبوون ژوانا ٥٥ ئاڤاهیێن

وێنەکێ کەڤن یێ دهۆکێ



ئاکنجیبوونێ بوون و تنێ سێ خێزان تێدا دژیان و هژمارا وان ١٥ کەس بوون[١٢١]، ئانکو تاخ ل دەسپێکا بەراهیێ یا ئاڤاکرنێ بوو، وی دەمی تاخی ژ جادا چرا بەرەف رۆژئاڤا دەسپێدکر و ب سنوورێ باژێرڤانییا دهۆکێ ڤێ وی سەردەمی (تاخێ شاخکێ یێ نها) ب داوی دهات و ژ ئالیێ باکووریڤە دگەهشتە بنارا چیایێ سپی. هەتا سالا ١٩٨٥ێ ٤٠٠ خانی ل ڤی تاخی هاتبوونەئاڤاکرن، پرانییا خەلکێ تاخی فەرمانبەر و بازرگان ئانکو کەسێن د سەروبەرێ ئابووری و جڤاکیێ باشدا بوون[١٢٢]، ئەڤ تاخە دا پتر بەرەف مەزنبوونێ چیت بەلێ ل دەسپێکا سالێن هەشتییانڤە دەستەلاتدارێن حکۆمەتێ ب مهانەیا هندەك ئەگەرێن تەناهی و لەشکەری رێك ل بەر بەرفرەهبوونا ڤی تاخی گرتن و نەهێلان ژ سنوورێ بۆ هاتیەدانان زێدەتر بەرفرەهـ ببیت، ئەڤە ل بەراهیێ ب عەرەبی ب (دهوك الجديدة) دهۆکا نوو و پاشتر ژ ب (الجمعية) هاتەناڤکرن و پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ ب تاخێ ئاشتی هاتیەناڤکرن[١٢٣].

## - تاخێ شۆرش (جەمعیا نوو)

ئەڤ تاخە ل دووڤ نەخشەیێ بنیاتیێ دهۆکێ دکەڤیتە بنارێ (ژێریێ) چیایێ سپی و رۆژهەلات و پشکەك ژ باکوورێ تاخێ ئاشتی و رۆژئاڤایێ تاخێ شەهیدان و باکوورێ تاخێ گرێ باسێ، ئەڤ تاخە ژی د بەردەوامییا دابەشکرنا عەردی ل سەر فەرمانبەران ژ ئالیێ کۆمەلا هەڤکارییا ئاکنجیکرنا فەرمانبەرانڤە ل داوییا سالێن هەفتییان و دەسپێکا هەشتییان هاتییەئاڤاکرن[١٢٤].

## - تاخێ شاخکێ

شاخکێ گوندەکێ بچووکێ دەوروبەرێن دهۆکێ بوو، هەتا سەرهلدانا ١٩٩١ێ وەك گوندەك سەردەری دگەلدا دهاتەکرن، هەروەك د بەرپەرێن چوویدا ئاماژە پێ هاتییەکرن ل دەسپێکا سالێن هەشتییان ژ ئالیێ حکۆمەتێڤە رێ ل بەرفرەهبوونا دهۆکێ بەرەف بنارا چیایێ سپی و ئالیێ رۆژئاڤاڤە هاتەگرتن، لەوما شاخکێ ژی ما وەك گوندەکێ ڤەدەر.

### گوندێ شاخکێ:

د دەمێ خۆدا دکەفتە باکوورێ رۆژئاڤایێ دهۆکێ، نها جهێ گوندی ناڤەندا تاخێ شاخکێ یە دەوروبەرێن خواندنگەها شاخکێ، دهێتەگۆتن ناڤێ گوندی ژ پەیڤا شاخ ئانکو (چیا) هاتیە، چنکو گوند د بنیاتدا ل ناڤ چیای و سەر شکەفتان هاتییە ئاڤاکرن. جهێ گوندی د دەمێ خۆدا مولکێ شەمزین ئاغایێ بابێ عەمەر ئاغای بوو، پشتی وی بۆ سەفەر ئاغای و پشتی وی ژی بۆ فەرحان ئاغای مایە. ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٥٦ێ ژ ئالیێ هەشت مالێن کۆچەرڤە هاتییەئاڤاکرن، پشتی فەرحان ئاغایێ دۆسکی گوند دایە وان، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٤١ کەس بوو[١٢٥].

### سنوورێن گوندی:

رۆژهەلاتی باژێرێ دهۆکێ، رۆژئاڤای گوندێ ماسیکێ، باکووری چیایێ سپی و گوندێ پیرۆمەرا و باشووری، ئاڤارێ گوندێ گەڤەرکێ و شندوخا.

### جهێن ناڤدارێن گوندی:

چەند جهێن ناڤدار ل چیایێ شاخکێ هەنە وەك: گەلیێ غازی، گەلیێ ماك، گەلیێ برکێ، گەلیێ رویلا و گەلی قرکی، کەلاتەك دو ناوسك ل گەلیێ مالا ب ناڤێن (حەسەن و حسێن) هەنە، چەند شکەفت ل سنوورێن گوندی هەنە ب ناڤێن: شکەفتا ئاڤۆ، شکەفتا دنخا و شینۆ و شکەفتا کون. گرەك ل باشوورێ گورستانێ هەیە دبێژنێ: گرێ کەلی چنکو د دەمی خۆدا ژ ئالیێ شەمزین ئاغای کەلایەك ل سەر هاتبووئاڤاکرن و نها ژی شوینوارێن وێ مانە.

### ئاڤ و زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

سێ کانی ل گوندی هەبوون: ل ژوورێ گوندی کانییا برکێ، رۆژهەلاتی کانییا ئیسماعیل ئەفەندی و رۆژئاڤایێ گوندی کانییا بەرواریان، خەلکێ گوندی کەسکاتی و تویتن ل بەر ئاڤا وان دچاندن، ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ و خودان کرنا مەرو مالاتی بوو.

د روودانـێـن دەسپێكا شۆرشا كوردستانێ یا ئەیلوولا ١٩٦١ێ ل ١١ حزیرانا ١٩٦٣ گوندێ شاخكێ ژ ئالیێ لەشكەرێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییەسۆتن، پشتی دەمەكی گوند هاتەڤەئاڤاكرن، بەلێ ل سالا ١٩٦٦ێ جارەكا دی هاتەڤەبەردان و ما ڤالا ژ خەلكی هەتا پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ سەر ژنوو هاتییەڤەئاڤاكرن، د روودانێن شەرێ سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێدا جارەكا دی گوند هاتەڤەخرابكرن و بەردان، پشتی ئادارا ١٩٧٥ێ ب دەمەكی سەرژنوو گوند هاتەڤەئاڤاكرن.

د ناڤبەرا ١٩٧٧- ١٩٨٠ێدا پرۆژێ ئاڤێ و كارەبێ گەهشتینەگوندی و سالا ١٩٧٨ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەئاڤاكرن[١٢٦].

پشتی سەرهلدانێ و د ناڤبەرا ١٩٩٦- ١٩٩٧ێدا ژبەرپێدڤیاتییا خەلكێ باژێری ب پارچێن عەردی بۆ ئاڤاكرنێ دەست ب دابەشكرنا عەردی ل دەوروبەرێن شاخكێ و ئاقارێ گوندی هاتەكرن ئەو بوو د دەمەكێ كورتدا گوندێ شاخكێ كەتە د ناڤ سنوورێ باژێرڤانییا دهۆكێ دا و دگەل دەڤەرا نوو ئاڤاكری تاخەكی نوویێ دهۆكێ ب ئەندازیارییەكا نوو و دیزاینەكا نوویا ئاڤاكرنی ب ناڤێ تاخێ شاخكی هاتەئاڤاكرن[١٢٧]، سنوورێن ڤی تاخی ب ڤی رەنگینە: رۆژهەلات و پشكەكا باكووری تاخێ شۆرش، پشكا مای ژ باكووری چیایێ سپی، رۆژئاڤا تاخێ ماسیكا رۆژهەلات و باشووری جادا قازی محەمەد و هەردو تاخێن بۆتان و بەهدینان.

## - تاخێن ماسیكا رۆژهەلات و رۆژئاڤا

ئەڤ هەردو تاخە تاخێن نوویێن دهۆكێ نە، تاخێن سەردەمێ پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێنە، د بەردەوامییا دابەشكرنا عەردی بۆ ئاكنجیكرنا ل سەر تەخ و جوینێن جوداێن خەلكی د ناڤبەرا سالێن ١٩٩٦- ١٩٩٧ێدا دگەل دابەشكرنا عەردی ل سنوورێ شاخكێ عەرد ل ئاقارێ گوندێ ماسیكێ كو مولكێ مەلاكا بوو و نها ب ماسیكێ ئێك دهێتەنیاسین هاتەدابەشكرن و ل سالا ١٩٩٨ێ ژی ل هەمان ئاقارێ ماسیكێ كو مولكێ چاندنێ بوو و نها ب ماسیكێ دو د هێتەناڤكرن عەرد هاتەدابەشكرن[١٢٨]، پشتی ئاڤاكرنێ هەردو تاخێن ماسیكێ رۆژهەلات و رۆژئاڤا ژێ دروستبوون.

### گوندێ ماسیكێ:

ماسیكێ گوندەكێ نێزیكی باژێرێ دهۆكێ بوو، نێزیكی (٨كم) ژ سەنتەرێ باژێرێ دهۆكێ یێ بەرێ دوور بوو، سنوورێن گوندی ل رۆژهەلاتی گوندێ شاخكێ و رۆژئاڤای گوندێ بیركێ بوون، باكووری چیایێ سپی و باشووری مالتا ئیسلام بوون.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسكی بوون و ژ مالباتێن: ئیبراهیم عەبدوللا ماسیكی، مەلا ئەحمەد مەلا عەلی، مەلا سەیفەدین مستەفا، عوسمان عەبدوللا، عەبدولرەحمان عەبدولرەحمان، عەلی عەبدولرەحمان، نیعمەت عەبدوللا، ئەحمەد صبحی، حسن حجی، محەمەد عومەر، عومەر تەیب، ئیبراهیم حاجی و رەمەزان حەسەن پێكدهات، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ هژمار خەلكێ گوندی ١٠٥ كەس بوو[١٢٩].

ل گوندی چەند جهێن دیار هەبوون وەك: شكەفتا دنخا و شكەفتا رەشاد و گەلیێ چی چی و گەلیێ سحارێ.

### ئاڤ و ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

دو كانی ل گوندی هەبوون، كانییا گوندی: كانییا سەرەكی ل بەر وێ كانیێ بركەك دانا بوو تەژی ئاڤ دكر و ل بەر ئاڤا وێ بیستان دكرن و هەتا نها ئەو كانی یا بەردەوامە. كانییا دیتر كانی درێ بوو. ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنێ (دێم و ئاڤی) و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو. گوندی دو ئاقارێن مەزن هەبوون، ئاقارێ ئاقارێ كێراتێ نها تاخێ ماسیكا ئێك ژێ پێكدهێت، ئاقارێ (نەرمێ) جهێ وێ دگۆتنێ بێدەرا نها ماسیكا دو ژێ پێكدهێت. هەژییە بێژین د

رووداني‌ێن شۆرشێن کوردستانێ دا سێ جاران گوندێ ماسیکێ هاتیەسۆتن و بەردان[١٣٠].

نها گوندێ ماسیکێ کەتییە د ناڤ ڤێ تاخیدا و تاخ ژی ژبەر مەزناتییا وی ب دو تاخان هاتییەهژمارتن ماسیکا رۆژهەلات و ماسیکا رۆژئاڤا، سنوورێن ڤان دو تاخان ب ڤی رەنگینە: باکووری چیایێ سپی، باشووری جادا قازی محەمەد و هەردو تاخێن بۆتان و مالتا سەری، رۆژهەلاتی تاخێ شاخکێ و رۆژئاڤای تاخێ زرکا..

## - تاخێ زرکا

ئەڤ تاخە ژی ژ تاخێن نووییێن دهۆکێ یە، ل نیڤا دووێ ژ دەهکا بەراهیێ ژ سەدسالییا بیست و ئێکێ دەست ب دابەشکرنا عەردی و ئاڤاکرنێ ل ڤی جهی هاتییەکرن.

**گوندێ بیرکێ:**

ل رۆژئاڤایێ گوندێ ماسیکێ گوندەك ب ناڤێ بیرکێ هەبوو، وەك دبێژن پێشتر دگۆتنێ زرکا، هندەك ژی دبێژن دگۆتنە ئاڤارێ بیرکێ زرکا.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ماسیکێ

**رۆژئاڤای:** گوندێ کێڤلا و حەوشکێ بوون،

**باکووری:** چیایێ سپی

**باشووری:** گوندێ مالتا ئیسلام بوون.

گوندەکێ بچویك بوو هەتا سالا ١٩٥٥ێ تنێ چوار مال ل گوندی بوون ئەوژی مالێن: ئەحمەد تەها محەمەد، تەمەر حاجی، حسێن ئیبراهیم نەبی و حسین لەیلو، گوند سەر ب عەشیرەتا دۆسکی بوو، دو کانی ب ناڤێن کانییا زرکا و کانییا ئاڤ هەڤیر ل گوندی هەبوون و خەلکێ ب چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی دەبارا خۆ دکر[١٣١].

بیرکێ ب خۆ گوندەکێ نێزیکی دهۆکێ بوو و نها کەتییە دناڤا ڤی تاخیدا یێ ب تاخێ زرکا هاتییەناڤکرن، ل ١٩٩٥ێ کارگێرییا پارێزگەها دهۆکێ دەست ب ئیفرازا عەردی ل ڤی جهی کر ب مەرەما ئاڤاکرنا کۆمەلگەهەکی بۆ وان خێزانێن مشەخت و هەژار و کێم دەرامەت یێن چووینە د ئاڤاهیێن حکۆمەتێ و گشتیڤە، پشتی ئاڤاکرنێ

دهۆك



ئەڤ خەلكە ل ڤی كۆمەلگەهی نیشتەجێكرن، د بەردەوامییا پرۆسا دابەشكرنا عەردیدا و ئاڤاكرنا وی عەردی گوندێ زركا و كۆمەلگەهێ نوو ئاڤاكری كەتنە د ناڤ جەرگێ تاخیدا و تاخەكێ نوو ژێ پێكهات ب ناڤێ تاخێ زركـا[١٣٢] و سنوورێن ڤی تاخی ب ڤی رەنگینە: باكووری چیایێ سپی و گوندێ كێڤلا، باشووری تاخێ مالتا سەری و تاخێ زانكۆ (تاخێ تەناهی)، رۆژهەلات تاخێ ماسیكێ رۆژئاڤا و رۆژئاڤا حەرەمێ زانكۆیا دهۆكێ.

## - تاخێ مازی

د سالێن نۆتاندا دەست ب ئاڤاكرنا ڤی تاخی هاتیەكرن، تاخ بەردەوامییا تاخێن نەورۆز و ئاشتی یە، دكەڤیتە سەر هەردو ئالیێن جادا سەرەكییا جاران ژ دهۆكێ بۆ زاخۆ و مووسلێ دچوو، ب جادا مالتایێ دهاتەنیاسین و پتریا تاخی دكەڤیتە ئالیێ راستێ یێ رووبارێ دهۆكی، ل دووڤ نەخشێ بنیاتیێ دهۆكێ ژ كوژیێ دیماهییێ یێ تاخێ نوهەدرا ل سەر كنارێ راستێ یێ رووبارێ دهۆكێ دەست پێدكەت هەتا دگەهیتە تاخێ میدیا، سنوورێن تاخی د ناڤبەرا:

ل باكووری هەردو تاخێن نەورۆز و بۆتان، باشوور و رۆژهەلاتی رووبارێ دهۆكێ و پشكەك بچووك ژ تاخێ نوهەدرا و رۆژئاڤایی ب تاخێ میدیا ب داوی دهێت، فرۆشگەها مازی كو یەكەمین پرۆژەیێ ئابووریێ هەڤچەرخ بوو ل دهۆكێ سالێن نۆتان هاتیەئاڤاكرن و سەیرانگەها دریم ستی دكەڤنە ڤی تاخی لەوما ژی ب ناڤێ مازی تاخ هاتیەئاڤاكرن. بەری سەرهلدانێ جهێ فرۆشگەها مازی و دریم ستی لەشكەرگەهێ رژێمێ بوو و دەڤەرێن دیتر ژی باخ و چەمێن ڤیڤی بوون، یەكەمین ویستگەها كارەبا دهۆكێ یا ل سالا هاتیەدانان دكەفتە ڤی جهی و نها ژی هەر ل وی جهییە[١٣٣].

## - تاخێ میدیا

ئەڤ تاخە كو خەلكەكی ب تاخێ ناڤبەرا دو جادەیان ناڤكرییە دكەڤیتە ناڤبەرا هەردو جادەیێن سەركیێن دهۆكی جادا مالتایێ ل ژووری و جادا بارزان (١٠٠مەتری) ل ژێری، هەردو تاخێن بۆتان و بەهدینان دكەڤنە باكوورێ ڤی تاخی و تاخێ مازی ل رۆژهەلاتی و تاخێ مالتا ژێری ل رۆژئاڤایێ تاخی نە و تاخێ شندوخا كو دكەڤیتە ژێریێ جادا بارزان د بیتە باشوورێ ڤی تاخی. ل داویا سالێن نۆتان بەرەف ژوور دەست ب دابەشكرنا عەردی و ئاڤاكرنێ ل ڤی جهی هاتیەكرن[١٣٤].

## - تاخێن مالتایی:

مالتایێ یەك ژ گوندێن هەرەكەڤنێن سنوورێ قەزا دهۆكێ یە، هەتا سالێن نۆتان ژ سەدسالیا چوویی وەك گوندەك سەرەدەری دگەلدا دهاتەكرن ٧كم ژ سەنتەرێ باژێرێ دهۆكێ دووربوو د ژێدەرێن دیرۆكیێن بەردەستدا ناڤێ مالتایێ بەری یێ دهۆكێ هاتییە.

شوینوارناس و ژێدەرێن تایبەت ب شوینواران ئاماژە ب كەڤناتییا مالتایێ كرییە و گۆتینە: بەری بگەهییە دهۆكێ ب ٧كم گوندێ مالتایێ دهێتەدیتن، گرەكێ شوینواری ب رەخڤە هەیە، پارچێن گلێنە- ڤافكێن (فوخاری) یێن سەردەمێ ئاشووریان ل سەر د بەلاڤن، د پەرتووكا (معجم البلدان) یا (یاقوت الحموی) دا ناڤێ ڤی گوندی ب مەعلەسایا (معلثایا) هاتییە، تێدا هاتییەگۆتن: ب ڤۆناغەكێ دكەڤیتە سەر رێكا مووسل – زاخۆ (حەسەنیی)، مزگەفتەكا ل سەر گری لێ هەیە، هزر بۆ هندێ دچیت كو ئەڤە باژێرێ (مالیاتی)یێ ئاشوورییە، كو رامانا دەرگەهـ- دەروازە ددەت، ئاسێگەهـ (حصن)ەكا لەشكەری بوو و سەنگەكا ستراتیژی ل سەردەمێ ئاشووریێ داویێ هەبوو[١٣٥].

هەموو ژێدەرێن پشتی ڤی ژی ب هەمان شێوە ئاماژە ب كەڤناتییا وێ كرییە[١٣٦] د ڤەكۆلینەكا تایبەت ب دیرۆكا كەڤنا دهۆكێ دا هاتییە: ل هزار سالییا ئێكێ بەری زایینی گرنگییا دەڤەرا دهۆكی بۆ ئاشووریان ل زێدەهیێ دا، وان ل سەدسالییا نەهێ بەری زایینی ئاسێگەهەكا لەشكەری ل دەروكێ باژێرێ دهۆكێ یێ نها دامەزراندن و ب (مالیاتی)

ناڤکر ئانکو دەرگەهێ دەڤەرا چیایی ناڤکر[١٣٧].

د سەردەمێن ئیسلامێدا د ژێدەرێن عەرەبیدا و ب زمانێ عەرەبی ناڤێ مالتایی ب چەند ناڤەکێن نێزیکی هەڤ هاتییە وەك: (معلثایا، معلثای، المعلة) و چ گومان د ناڤبەرا ڤەکۆلەراندا نینە کو ئەڤ باژێرکە هەمان گوندێ مالتایە یێ ٧کم ژ سەنتەرێ دهۆکێ (یێ جاران) دوور[١٣٨].

دیارە ئەڤ باژێرکە ژ ئەنجامێ کاودانێن سیاسی و لەشکەری جار مەزنبوویە و جار ژی ل بچویکیێ دایە، لەوما ژی د ژێدەرێن ئیسلامیدا جودا جودا پەسنا ناڤێ وی هاتییە، (الهمذانی) د پەرتووکا (مختصر البلدان)دا ب (کور) ناڤکرییە، (کور) بۆ دەڤەرەکێ دهاتەگۆتن چەند گوندەکان ب خۆڤە دگریت و دڤێت وان گوندان باژێر یان باژێرکەك یان رووبارەك هەبیت وی ناڤی هەلگریت، ژ ڤێ چەندێ دیاردبیت کو مالتایێ د وی سەردەمیدا مەلبەندێ- سەنتەرێ دەڤەرەکێ بوویە چەند گوند و جهـ سەر ب وێ ڤە بوونە. د دەمەکیدا (المقدسی) ب یەك ژ باژێرێن مووسلێ ناڤکرییە، (الادریسی) ب دەڤەرەکا سەر ب جزیرێ ناڤکرییە، (ابن حوقل)ی ژ (رساتیق الموصل) هژمارتییە، (رساتیق) کۆما (رستاق)ە، رستاق ئانکو وارگەهێ چاندنێ یان ئاقار، (یاقوت الحموی) وەك (بلیدة) ئانکو باژێرکەك ئاماژە پێکرییە کو دکەفتە ناڤبەرا مووسل و جزیرێ (جزیرة ابن عمر)[١٣٩]. ژ ڤان هەمووو پەسن و ناڤان دیاردبیت کو مالتایێ ڤۆناغێن جودا جودا ب خۆڤەدیتینە و جار وەك باژێرەك و جار ژی وەك باژێرك و هندەك جاران ژی وەك ئاقار و مەلبەندێ دەڤەرێ بوویە، ئەڤێ ژی پەیوەندی ب دیرۆکا وێ ڤە هەیە.

مالتایێ ژی وەك هەمووو دەڤەرا دهۆکێ یا نها بەری هاتنا ئیسلامێ سەر ب ئیمبراتۆریا رۆمێن بیزەنتی بوویە، ل سالا ٦٣٧ێ کەتییە ژێر دەستەلاتێ دەولەتا ئیسلامێ، د سەردەمێ عەباسییاندا خەلیفێن وان گرنگییەك تایبەت ددا هەرێما جزیرێ کو مالتایێ ژی سەر ب وێ ڤە بوویە و ئەڤ هەرێمە جهەکێ ستراتیژی بوویە و هەڤسنووربوویە دگەل ئیمبراتۆریا بیزەنتی. بەلێ ل سەدسالیا (٣مش/٩ز)ی دەمێ دەستەلاتێ خەلیفەیێ عەباسی لاواز بووی و میرگەهێن سەربەخۆ هاتینەدامەزراندن و بزاڤێن لەشکەری و چەکداری دژی دەستەلاتێ خەلیفەی دروستبووین، ناڤێ مالتایێ ژی پتر کەتە ناڤ ناڤان و پتر هاتەنیاسین، ل سەردەمێ خەلیفەیێ عەباسی (المعتمد ٨٧٠- ٨٩٢)ز ئاماژە ب ناڤێ میرێ کورد عەلی کورێ داود کورێ رهزادێ کوردی هاتییەکرن و (ابن الاثیر) وەك سەرکردەکێ مەزن ل (معلثایا) دایەنیاسین، (المسعودی) گۆتییە وی قەسرێن مەزن ل سەر رووبارێ دیجلەی هەبوون.

د وێ ڤۆناغێدا دەڤەرا مالتایێ بوویە مەیدانا دناڤبەرا سەرکردێن خەوارجان ب خۆ و د ناڤبەرا وان لەشکەرێ خەلیفەیێ دەستەلاتدار و د ئەنجامدا خەلکێ ڤێ دەڤەرێ تووشی چەندین دەردەسەری و نەخۆشی و مالخرابکرنان بووینە هەروەك د رووداێن سالێن (٢٧٦مش/٨٨١ز) و ٢٨٠مش/٨٩٣ز).

ژ رووداێن گرنگێن ل مالتا (معلثایا) ل سەردەمێ خەلیفێ عەباسی (المعتضد)ی رووداین شەر و لێکدانێن ناڤبەرا خەوارجان و لەشکەرێ خەلیفە (المعتضد) بوون د ناڤبەرا (٢٨٢مش/٨٩٥ز)- ٢٨٣مش/٨٩٦ز) سەرا دانا خویك و خەراجێ کو ب کوشتنا سەرکردێ خەوارجان (هارون الشاری) ب داویهاتن ل سالا ٨٩٦ز. پشتی مرنا خەلیفە (المعتضد)ی ل سالا (٢٨٩مش/٩٠١ز) برایێ وی (المکتفی) جهێ وی گرت، وی ژی (عبدالله بن حمدان) ل سالا ٢٩٣مش/٩٠٦ز)ێ کرە والیێ مووسلێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە و دەڤەرا مالتایێ ژ وان دەڤەران بوو، د ڤی سەردەمی دا (ناصر الدولة)یێ حەمدانی والیێ مووسلێ هەردەمێ نەشیابا خۆ ل مووسلێ بگریت و بەرێن وی تەنگ ببانە دهاتە مالتایێ و ل وێرێ ڤەدحەویا هەتا سەروبەر ل مووسلێ د بەرژەوەندیا وی دا ئارام دبوو دزڤریڤە بارەگایێ خۆ ل مووسلێ[١٤٠].

مالتا سەر ب دەستەلاتێ حەمدانییان بوو ل مووسلێ هەتا سالا (٣٦٩مش/٩٧٩ز)ێ د ڤێ سالێدا

(عضد الدولة البويهي) دەست ب سەر هەمو و كەلایێن كوردان‌دا گرت و ب ڤێ چەندێ مالتا ما ل ژێر دەستەلاتێ بووەیهیان نوونەرێن وان كارگێڕیا وێ ب رێڤە دبر، سالا ٣٨٠مش/٩٩٠ز)ێ عوقەیلیان دەستەلاتێ مووسلێ و دەڤەرێن ژێر دەستەلاتێ وێ ژ وانا ژی مالتایێ گرتەدەست، ژ رووداندێن گرنگێن سەردەمێ عوقەیلییان شەرێ ناڤبەرا میرێ عوقەیلی (قرواش) و برایێ وی (ابو كامل بركه بن مقلد)بوو ل سالا (٤٤١مش/١٠٤٠ز)ێ د ڤی شەریدا باژێرێ مالتایێ هاتەوێرانكرن.

پشتی ڤێ رووداندێ ژێدەرێن دیرۆكی د ئاماژەپێكرنێ ب ناڤێ مالتایێ د بێ دەنگن، دبیت ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی ئەو بیت كو كو مالتایێ ژ وێ سالێ و هێرڤە ئەو گرنگییا خوەیا كارگێڕی و سەنگا خۆ ل دەڤەرێ نەمایە، و دژێدەراندا ناڤێ وێ ب (بلید) كو بچووككرنا پەیڤا (بلدة)یە ئانكو باژێركەكێ بچووك و ب بۆرینا سال و دەمان ژ ئەنجامێ رووداندێن سیاسی خەلكێ وێ ژی دەركەتینە[١٤١].

ئەم دوورنابینین ژ ڤێ سالێ بەرەف ژوور سەنگ و گرنگییا مالتایێ بەرەف دهۆكێ چوویە و دهۆكێ جهێ وێ گرتییە ب تایبەت د قۆناغا دامەزراندنا میرگەها بەهدینان ١٢١٦- ١٩٤٢)ێ دا

هەژییە بێژین مالتایێ د ژێدەرێن دیرۆكا مەسیحییاندا ل دەڤەرێ تایبەتمەندییەك هەیە، هەروەك ئەبلەحەد ئەفرام د نڤیسینەكێدا دبێژیت: پشتی بەلاڤبوونا ئایینێ مەسیحی ل دەڤەرێ ل دەسپێكا سەدسالیا دووێ زایینی مالتایێ (معلثايي) جهەكێ گرنگێ مەسیحییان بوویە ل دەڤەرێ و د ناڤبەرا سالێن ٤١٠- ١٢٦٥ز گەهشتییە ئاستێ سەرۆكاتییا ئەسقەفیێ. ژئالیێ پەیوەندی ب كەنیسێ ڤە هەی مار عەبد یەشوع ئەوێ بوویە بەتریكێ كەنیسا رۆژهەلاتی پێشتر مەترانێ سەرۆكاتییا ئوسقوفییا مالتایێ بوو، هەروەسان بەتریك (یوحنا بن نازوك) ١٠١٢- ١٠٢٠ز ێ خەلكێ گوندێ مالتایێ بوو، هەمان ژێدەر ئاماژە ب وێ چەندێ دكەت كو كەنیسا مالتایێ چەند جاران هاتییە نووژەنكرن

پشكەك ژ دهۆكا نوو



و پاشتر دبێژیت: پشتی چەند سەدسالییەكان خەلكێ مالتایێ مانە ل سەر مەزهەبێ نەستووری و ل سالا ١٨٢٤ێ هاتینە سەر مەزهەبێ كاسولیكی و چەندین دەستڤیسێن ئایینی ل كەنیسا مارزیعا یا مالتایێ هاتینە دیتن. د بەردەوامیا ڤەكۆلینا خۆدا ل دور مالتایێ دبێژیت: د ناڤبەرا سالێن ١٨٤٢- ١٨٤٤ێ بادجەری سەرا مالتایێ دایە و ل سالا ١٨٤٩ێ ژی شوینوارناسێ بریتانی لایاردی سەرا ڤی گوندی دایە و ٢٠ خێزان ل گوندی دیتینە. دیارە ژ بەر چەندین ئەگەران چەند جارەكان گوند هاتییەبەردان و دوا جارا خەلكێ گوندی سالا ١٩٠٦- ١٩٠٧ێ گوندێ خۆ بەردا بوو و ژ وێ سالێ ڤە كەنیسا گوندی هاتییەبەردان بەرەڤ خرابوونێ و هەرفتنێ چوویە[١٤٢]. هەتا نها ژی شوینوارێن دێرەكا دیرۆكی ل مالتاژێری مانە كو ل دووڤ بۆچوونا ژێدەرەكی ئەو (دیرا مار عبدا)یە یێ ل دەوروبەرێن سالا ٨١٠ز ێ ژیای[١٤٣].

سەرەرای گرنگیا مالتایێ د دیرۆكا مەسیحییێن دەڤەرێدا و دەركەتنا چەندین قەشە و رەهبانان ژ ڤی باژێری، ئەڤە وێ چەندێ ناگەهینیت كو ئەڤ باژێرە یان باژێركە مەسیحی بوویە و تنێ مەسیحی لێ ژیاینە بەلكی موسلمان ژی لێ هەبوونە هەروەك ئەلمەقدەسی د پەسنا مالتایێ دا دبێت: ئاڤاهیێن وان ژ ئاخێ بوون و مزگەفت ل سەرێ گری بوو، ئەڤە نیشانا وێ چەندێ یە كو هژمارەكا زۆرا موسلمانان لێ هەبوون[١٤٤]، هەروەسان ژێدەرێن ئیسلامی هەردەمێ ئاماژە ب مزگەفتێن وەلاتێ هەكاری كری دگەل مزگەفتا حەسەنیێ (زاخۆ) و مزگەفتا ئامێدیێ ئاماژە ب مزگەفتا مەعلاسایا كرییە و د ناڤا زانایاندا ژی ناڤێ (ابو الحسن علی بن ابی بكر سلیمان) هاتییە كو خەلكێ مەعلەسایا بوویە و ژ بۆ بازرگانیێ و وەرگرتنا زانستان چوویە چەندین وەلاتان ژ وان ژی ئەسكەندەریێ و بەغدا[١٤٥].

ژ ڤان ژێدەران دیاردبیت ژبەر هەر ئەگەرەكی بیت مالتایێ چەندین جاران ئاڤابوویە و هەرفتییەڤە هەتا ل ڤان سەدسالێن داویێ وەك دو گوند مالتا سەری و مالتا ژێری ئاڤابووینەڤە و مالتا سەری موسلمان و مالتا ژێری مەسیحی لێ نیشتەجێبوونە و د بادەكێن فەرمیێن دەولەتێدا ب (مالطا اسلام و مالطا نصاری) هاتینەناڤكرن.

ل دووڤ ڤەگێرانا ئێك ژ خەلكێ گوندی هەتا سالا ١٩٥٠ێ تنێ دومال (مالا شێخ حەسەنی و مالا حەجی مەحموودی) ل گوندی هەبوون، پشتی وێ سالێ پێنج مالێن مەسیحی، سێ مالێن بەرواری و مالەكا كۆچەر ل گوندی نیشتەجێبووینە، پاشتر هێدی هێدی خەلكی قەستا گوندی كرییە[١٤٦]، ل دووڤ سەرژمێرا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ مالتا ئیسلام ١٠٩ كەس و مالتا ژێری ١٣٠ كەس بوو[١٤٧].

پشتی شكەستنا شۆرشا كوردستانێ ل سالا ١٩٧٥ێ حكۆمەتا عیراقێ دەستدا راكرن و وێرانكرنا گوندێن سەر سنووری و ڤەگوهاستنا خەلكێ وان كر، گەلەك ژ وی خەلكی قەستا مالتایێ كرن، (سامی كورێ مەحموود ئەلنائب) خودانێ گوندی دەستووری دا وان كەسان بۆ خۆ خانییان ل گوندی ئاڤاكەن[١٤٨]، ب ڤێ چەندێ گوندی پتر ل مەزنبوونێ دا.

هەتا سالێن هەفتییان ژ سەدسالیا چوویی هەردەمێ ئاماژە ب ناڤێ مالتایێ هاتبا كرن وەك گوندەكێ دەوروبەرێن دهۆكێ ئاماژە پێ دهاتەكرن و د هاتەدیاركرن كو حەفت كیلومەتران ژ دهۆكێ دوورە، لێ ب مەزنبوونا باژێرێ دهۆكێ ژ سالێن حەفتییانڤە هێدی هێدی وەك تاخەكێ دهۆكێ سەرەدەری دگەل مالتایێ هاتەكرن ب تایبت پشتی ئاڤاكرنا كارگەها داگرتنا بەرهەمێن فێقی ل سالا ١٩٧٧ێ و كارگەها رستن و تەڤنكاریێ كو هەردو د ئاقارێ مالتایێ دا هاتنەئاڤاكرن و چەندین سازی و ئاڤاهیێن پەیوەندی ب وان دو كارگەیان دگەلدا هاتنەئاڤاكرن و هەر د وان سالاندا ژی پشكەك ژ پرۆژێ ئاڤا دهۆكێ ل مالتایێ هاتەئاڤاكرن، هەژییە بێژین هەر ژ سالا ١٩٧٠یڤە دەست ب دامەزراندن و ئاڤاكرنا هندەك پرۆژێن خزمەتگوزاری ل مالتایێ هاتییەكرن وەك: ڤەكرنا فەرمانگەها بەرهەمێن گیانەوەری ل سالا ١٩٧٠ێ، ڤەكرنا یەكەمین خواندنگەها رەسمی ل

سالا ١٩٧١ێ و ئاڤاکرنا مزگەفتێ ل سالا ١٩٧١ێ، دامەزراندنا نەمامگەها (شتلگەها) مالتایێ ل سالا ١٩٧٢ێ، گەهاندنا کارەبێ بۆ گوندی سالا ١٩٧٣ێ و دامەزراندنا یەکەم پرۆژێ ئاڤێ ل مالتایێ سالا ١٩٧٧ێ[١٤٩]، و ب گەهشتنا خزمەتگوزارییێن ئاڤێ و کارەبێ پتر خەلکەکی ژ جهێن دیترڤە قەستا مالتایێ کر ب تایبەت د قۆناغا ڤالاکرن و خرابکرنا گوندان ژ نیڤا دووێ ژ سالێن حەفتییان بەرەڤ ژوور، د ئەنجامدا مالتا سەری و ژێری گەهشتنە ئێك بوونە باژێرکەکێ ب رەخ دهۆکێ. پشتی کو ل سالێن نۆتان ب بەرفرەهی دەست ب دابەشکرنا عەردی ل سەر خەلکی ل دهۆکێ هاتییەکرن، ڤێ دابەشکرنێ ژ ئاقارێن مالتایێ ژی گرت، ل سالا ١٩٩٧- ١٩٩٨ێ ل کەرتێ مالتا ئیسلام و سالا ١٩٩٩ێ ل کەرتێ مالتا نصاری عەرد هاتەدابەشکرن[١٥٠] و دەست ب ئاڤاکرنێ هاتەکرن هەتا مالتا کەڤن سەری و ژێری د ناڤدا بەرزەبووینە و دو تاخێن مەزنێن دهۆکێ ژێ پێکهاتین.

سنوورێن وان ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** تاخێ ماسیکێ

**باشوور:** جادا بارزان (١٠٠مەتری)، باشووری جادێ تاخێ گەڤەرکێ

**رۆژهەلات:** تاخێ بەهدینان و تاخێ میدیا

**رۆژئاڤا:** سنوورێ زانکۆیا دهوکێ

هەژییە بێژین بەری گوند ببیتە باژێر و سیمایێ باژێری خۆ ب سەردا بگریت هەرچوار لایێن گوندی چەمێن فێقی و کەسکاتی بوون و هەموو ئەو جهە نها هاتینەئاڤاکرن و هەر د وێ قۆناغێدا چوار کانی ل گوندی هەبوون ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنێ و پێدڤیێن چاندنێ و خودانکرنا گیانەوەران بوون، ئەو ژی کانیێن:

١- کانیکا رەبەنی: دکەڤتە بن گرێ قەیسەری.

٢- کانیکا شیڤ کەرانێ: دکەڤیتە د نهالێدا نێزیکی خواندنگەها مالتایێ.

٣- کانیکا شێلێ: نێزیك پیشەسازیا مالتایێ.

٤- چل کانیکا: د ناڤ چەمێن مستەفا ناڤشکی (د ناڤبەرا مالتا و گوندێ گەڤەرکێ)[١٥١].

## - تاخێ گەڤەرکێ:

گەڤەرکێ گوندەکێ کەڤنە ل دەڤەرێ، د دەمێ خۆدا سەر ب ناحیا فەیدێ بوو، دکەڤیتە داوییا بنارا چیایێ رەش (زاوا)، کێم زانیاری دەربارەی ڤی گوندی ل بەر دەستن، دیارە بەری تێکەلی باژێری ببیت و ببیتە تاخەك ژ باژێری گوندەك بچووك بوویە، ل دووڤ سەر ژمێریا سالا ١٩٥٧ێ گوند سەر ب ناحیا سێمێلێ ڤە بوو و هژمارا خەلکی گوندی تنێ ٨١ کەس بوون[١٥٢]، پشتی کو باژێرێ دهۆکێ مەزن بووی گەهشتییە ئاقارێ گوندێ گەڤەرکێ ژ سالا ٢٠٠٠ێ دەست ب دابەشکرنا عەردی ل ئاقارێ گوندی و دەوروبەرێن گوندی هاتەکرن، چ ئەو عەرد ب رێکا سازیێن فەرمی هاتبیتەدابەشکرن چ ژی ژ ئالیێ خەلکێ گوندیڤە هاتبیتە فروتن، ب هەر رەنگەکی بیت گوند مەزن بوو و خزمەتگوزارییێن پێویست گەهشتنە گوندی و خەلکەك ژ دەڤەر و پێکهاتێن جودا هاتنەگوندی و خانی ئاڤاکرن هەتا بوویە تاخەك ژ تاخێن دهۆکێ[١٥٣] و نها سنوورێن تاخی د ناڤ تاخێن باژێری ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** تاخێ مالتا ژێری

**باشوور:** رووبارێ دهۆکێ و چەمێن رووباری

**رۆژهەلات:** تاخێ شندوخا

**رۆژئاڤا:** دەڤەرا ئالوکا

## - تاخێ قەسارا:

ئەو ژی مینا گەڤەرکێ گوندەکێ دەوروبەرێن دهۆکێ بوو و سەر ب سەنتەرێ ناحیا سێمێلێ بوو و پاشتر کەتییە سەر ب ناحیا فەیدێ ڤە، دکەڤتە دەسپێکا چیایێ رەش، ژ سالا ٢٠٠٠ێ بەرەڤ ژوور دەست ب فرۆشتنا عەردی ل دەوروبەرێن گوندی و ئاقارێ گوندی هاتییەکرن و د ئەنجامدا، خەلکەکێ زۆر ژ دەڤەر و پێکهاتێن جودا ل سنوورێ ئاقارێ گوندی خانی ئاڤاکرن و دگەل گەهشتنا خزمەتگوزارییێن

پێدڤی گوند مەزن بوو و دگەل تاخێن دهۆکێ نێزیکی هەڤبوو و ل دووڤ دوا نەخشێ بنیاتیێ ل سالا ٢٠١٤ێ بۆ باژێرێ دهۆکێ هاتییەکێشان بوویە یەك ژ تاخێن دهۆکێ و سنوورێن وی ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** رووبارێ دهۆکێ

**باشوور:** دەڤەرێن سەر ب ناحیا فەیدیێ ڤە

**رۆژهەلات:** چیایێ رەش

**رۆژئاڤا:** دەڤەرێن سەر ب ناحیا فەیدیێ ڤە

## - تاخێ شندوخا:

هەتا بەری چەند سالەکێن کێم گوندەکێ بچووکێ دەوروبەرێن دهۆکێ بوو، ل دووڤ راپۆرتەکا پشکێنەرەکی ل سالا ١٩٥٦ێ هژمار خەلکێ گوندی دۆرێن ١٠٠کەسان بوو و ٥کم ژ سەنتەرێ دهۆکێ دوور بوو، ل دووڤ سەرژمێریا خەلکێ عیراقێ یا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١١٠کەس بوو[١٥٤].

ئەڤ گوندێ بچووکێ بەری چەند سالان ناڤەك دیرۆکییە و ب کووراتیا دیرۆکا دەڤەرێدا چوویە، کەڤنترین ژێدەرێن ناڤێ دهۆکێ ئینای ناڤێ شندوخا دگەلدا ئینایە، دیرۆکنڤیس ئەنوەر مایی ژ دیرۆکنڤیس حسین حوزنی موکریانی ڤەدگوهێزیت: ل نیڤا سەدسالیا چوارێ زایینی میرەکی ب ناڤێ (ئاخ شندو) ل دهۆکێ حوکمداری دکر دەمێ کاروانی دهاتنە دهۆکێ یان تێرا دەرباز دبوون دو مست ژ متایێ وان وەك خویك وەردگرت، مایی د بەردەوامیا گۆتنا خۆدا دبێژیت: هندەك رەوشەنبیرێن هەڤچەرخ (مەرەم پێن داوییا سالێن پێنجییان) ڤێ چەندێ پشتراستدکەن، لێ هەروەك مایی دبێژیت: زانا هارتمان بۆ وێ چەندێ چوویە کو (ئاخ شندو) د سەدسالیا دووێ زایینی میرێ شندوخا بوویە[١٥٥].

ئاماژەکرنا مە ب ڤان گۆتنا وێ چەندێ دیاردکەت کو شندوخا ناڤەك کەڤنە و جهێ خۆ د دیرۆکێدا گرتییە، لێ ب مخابنیڤە ژێدەرێن دیرۆکی زۆر ب کێمیڤە ئاماژە ب ڤی ناڤی کرییە، لێ ژ سالا ٢٠١٠ێڤە (شندوخا) ب دروستی جهێ خۆ د ژێدەراندا گرتەڤە، ئەو ژی د دەمێ کارکرنێ د پرۆژێ تلفریکێ دا بەرامبەری گوندێ شندوخا و باکوورێ جادا بارزان

دهۆك



ژ نشکەکێڤە ستوونەك دەرکەت، دەملدەست رێڤەبەرێ شوینوارێن دهۆکێ (د. حەسەن ئەحمەد قاسم) لێ هاتەئاگادارکرن وی ژی ل ٢٠١٠/٥/١٢ێ سەرەدانا جهی کر، پشتی لێکەریانێ و هەلسەنگاندنا جهی بریارا راوەستاندنا کارێ تلفریکێ هاتەدان و تیمەکێ رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ هاتەپێکئینان و د دو وەرزاندا ل سالێن ٢٠١١و ٢٠١٢دا دەست ب کارێ ڤەکولینێ ل وی جهی کر و چەندین شوینوارێن دیرۆکی وەك: تێکست، پەیکەر، کێر و بەرستە، موور، ستڤانك، گوزك، گوور و شوینوارێن دیتر ل وی جهی دیتن و د ئەنجامدا دیار بوو جهێ شندوخا د چەندین قوناغێن دیرۆکیدا بۆرییە، ب ڤی شێوەیێ خوارێ:

- چەرخێ دەولەتێن باژێرا ٣٣٠٠- ٢٩٠٠ پ ز
- چەرخێ میتانی ١٦٠٠- ١٣٥٠پ ز، د ڤی چەرخیدا شندوخا ئێك ژ باژێرێن هەرەگرنگێن دەولەتا میتانی بوویە. ناڤێ ڤی باژێری د تێکستێن شاهێ ئاشووری ئادد نیراریێ ئێکێ ل سالا ١٣٢٥ پ ز ب ناڤێ شودوخی هاتییە و تێدا هاتییە شاهی هەوەکا لەشکەری برییە سەر ڤی باژێری و ئێخستییە ژێر دەستێ خوّ. شوینوارێن د ڤان دو وەرزێن ڤەکولینێدا هاتینەدیتن راستییا ڤێ بۆچوونێ د سەلمینن.
- چەرخێ ئاشووریی ناڤەراست ١٣٥٠- ٩١١ پ ز: د ڤی چەرخیدا دو هەوێن لەشکەری ئێك ژ وان هەوا شاه ئەدد نیراریێ ئێکێ یا سالا ١٣٢٥ پ ز بوو یا مە ئاماژە پێکری. هەژی گوّتنێ یە ژ سالا ١١٠٠ پ ز ڤە ژ ئەنجامێ هەوەکا لەشکەری دەڤەرا بادینان کو هەتا هنگی سەر ب دەولەتا میتانی بوو کەتییە ژێر دەستەلاتێ دەولەتا ئاشووری کو شندوخا ژی پشکەك بوو ژ ڤێ دەڤەرێ.
- چەرخێ هلنستی ٣٣١- ١٣٨ پ ز: د ڤێ ڤەکولینا د ڤان دو وەرزانـــدا هاتییەکرن شوینوارێن ڤی سەردەمی ل جهێ شندوخا هاتینەدیتن(١٥٦). هەژییە ل ڤێرێ ئاماژە ب ئەنجامێن دوا پشکنینێن شوینواری بکەین یێن رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ کرین و ل روّژا ٢٠١٦/٧/١٨ هاتینەراگەهاندن، ئەو ژی دیتنا چوار گوّرێن شوینواری بوون ل شندوخا کو ئێك ژ وان یێ سەردەمێ میتانی و هەرسێ یێن دیتر یێن سەردەمێ زەردەشتییان بوون[١٥٧].

ژ ڤێ چەندێ دیار دبیت کو شندوخا ب کەڤناتییا دیروّکێ یا کەڤنە، بەلێ مەرج نینە ل جهێ نهایێ گوندی بیت، بەلێ د ژێدەرێن دیروّکیدا ب تایبەت د ژێدەرێن سەردەمێ ئیسلامێدا ناڤێ ڤی جهی نەهاتییە و ئەم دوورنابینین ژ دەسپێکا سەردەمێ دەستەلاتداریا ئاشووریان ل دەڤەرێ باژێرك یان گوندێ مالتایێ و پاشتر ژی ب تایبەت ژ سالا ١٤٤٠ بەرەڤ ژوور دهۆکێ گرنگییا شندوخا وەرگرتییە و جهێ وێ گرتینە.

لەوما ژی ل دووڤ ژێدەرێن بەردەستێ مە د سەدسالێن پاشییێدا ناڤێ شندوخا ناهێتە دیتن، د راپوّرتەکا پشکێنەرێ رێڤەبەریا زانیاریا (پەروەردا) مووسلێ دا هاتییە کو ل مەها نیسانا ١٩٥٦ێ هاتییە نڤیسین هژمارا خەلکێ شندوخا تنێ ١٠٠کەس بوون و نە خواندنگەها حکوّمەتێ لێ هەبوویە و نە ژی یا ئایینی[١٥٨]، هەروەسان دهێتەزانین ل سالا ١٩٥٧ێ شندوخا گوندەکێ بچویکێ دەوروبەرێن دهۆکێ بوویە و ژ ئالیێ کارگێریڤە سەر ب ناحیا سێمێلێ ڤە بوویە و سەرژمێریا وی د وێ سالێدا ١١٠ کەس بوون[١٥٩].

## - تاخێن رەزا بنی و سەری:

ئەڤ تاخە دکەڤیتە ژێریێ جادا بارزان (جادا ١٠٠مەتری) ل رەخێ نزاری یێ دهۆکێ، سنوورێن تاخی ب ڤی رەنگی نە:

**باکوور:** رووبارێ دهۆکێ

**باشوور:** جادا بارزان و تاخێن شندوخا، ئازادی، سێگرکا

**روّژهەلات:** جادا یاریگەها دهۆکێ

**روّژئاڤا:** رووبارێ دهۆکێ

پرانییا جهێن ڤی تاخی د دەمێ خوّدا رەزێن تری بوون لەوما ژی د دەمێ ناڤکرنا تاخێن باژێری ب ناڤێن

كوردی ب تاخێ رەزا هاتییەناڤكرن، هەر ژ سالا ١٩٨٠یڤە دەست ب (تەملیك و ئیفرازا) عەردی ل ڤی تاخی هاتییەكرن و ل سالا ١٩٨١ێ دەست ب دابەشكرنا عەردی ل سەر وەلاتیان و ئاڤاكرنا وی عەردی ل ڤی تاخی هاتییەكرن و د وی سەردەمیدا ل دەزگەهێن فەرمیێن دەولەتێ ب (حی العسكری) هاتییەناڤكرن، دەسپێكا دابەشكرنا پارچێن عەردی ل ڤی تاخی و ئاڤاكرنا ل پشكا ژێریا تاخی ناڤبەرا جادا شەهیدێن ٦ێ شباتی و چەمێن رووبارێ دهۆكێ بوو و ئەڤ پرۆسەیا بەردەوام بوو هەتا سالێن داویێ كو هەمی تاخ لێ هاتییەئاڤاكرن[١٦٠].

## - تاخێ ئازادی:

ئەڤ تاخە ئێك ژ تاخێن نوویێن دهۆكێ یە، سنوورێن تاخی ب ڤی رەنگینە:

**باكوور:** جادا بارزان، (تاخێ رەزا)

**باشوور:** چیایێ شندوخا

**رۆژهەلات:** تاخێ سێ گركا

**رۆژئاڤا:** تاخێ شندوخا

دەسپێكا ئاڤاكرنا ڤی تاخێ ل سالا ١٩٩٤ێ بوو دەمێ ٥٠٠ پارچێن عەردی ل رۆژهەلاتێ شندوخا ل سەر خێزانێن شەهیدان هاتینەبەلاڤكرن و د هەمان دەمدا ژێ دەست ب ئاڤاكرنا وان هاتەكرن و د وی دەمیدا ب تاخێ شەهیدان یێ شندوخا دهاتەنیاسین[١٦١]، پاشتر دابەشكرنا پارچێن عەردی و ئاڤاكرنا هندەك فەرمانگەهـ و سازیێن خزمەتگوزاری یا بەردەوام بوو ل ڤی جهی هەتا دگەل تاخێ رەزا یێ سەری (تاخێ دكەفتە ناڤبەرا جادا بارزان و چیایێ شندوخا ب تاخێ رەزا یێ سەری دهاتەنیاسین) گەهشتینە ئێك و هەردو نها د نەخشێن بازێرڤانییێ دا ب تاخێ ئازادی هاتینەناڤكرن.

## - تاخێ سێ گركا:

ل دووڤ نەخشێ بازێرڤانیێ سنوورێن وی ب ڤی رەنگینە:

**باكوور:** جادا بارزان (تاخێ رەزا)

**باشوور:** باشووری چیایێ شندوخا

**رۆژهەلات:** تاخێ بن تویكا

**رۆژئاڤا:** تاخێ ئازادی

ئەڤ تاخە ژی ژ تاخێن نزارێ چیایێ شندوخا یە، ب ڤی ناڤی هاتییەناڤكرن ژبەركو جهێ وی د بنیاتدا سێ كومتێن ب رەخێكڤە یێن كنارێ چیایێ شندوخا بوون ل راستا جهێ نها یێ پەرتووكخانا بەدرخانییان[١٦٢]، ل ناڤەراستا سالێن هەشتییان ژ سەدسالیا چوویی دەست ب دابەشكرنا پارچێن عەردی و ئاڤاكرنا وان ل ڤی تاخی هاتییەكرن[١٦٣].

## - تاخێ بن تویكا:

ئەڤ تاخە ژی ژ تاخێن نزارێ چیایێ شندوخا یە، سنوورێن تاخی ب ڤی رەنگینە:

**باكوور:** جادا بارزان

**باشوور:** چیایێ شندوخا

**رۆژهەلات:** تاخێ رۆناهی

**رۆژئاڤا:** تاخێ سێ گركا

د هەمان قوناغا تاخێ سێ گركا دا دەست ب دابەشكرنا پارچێن عەردی و ئاڤاكرنا وان ئانكو ل ناڤەراستا سالێن هەشتییان[١٦٤]، تاخ پشتی سەرهلدانێ و د قوناغا ناڤكرنا تاخان ب ناڤێن كوردی ب بن تویكا هاتییەناڤكرن ژبەركو جهێ وی گەلەك دارێن تویان لێ هەبوون، هەژییەبێتەگۆتن جهێ ناڤدار ب بن تویكا ل دهۆكێ بەری سالێن هەشتییان دكەفتە سەر رووبارێ هشكەرووی ل رۆژهەلاتێ پرا نەخوشخانا ئازادی ب ٢٠٠ مەترەكان و پرەكا پەیادەیان د دەمێ خۆدا ل وی جهی هەبوو، ژ بەر زۆریا دارێن تویان ب بن تویكان هاتبوو ناڤكرن، ئەڤ جهە جهەكێ سەیرانێن دهۆكی یان و سەرشوویا زاڤایان بوو[١٦٥].

## - تاخێ رۆناهی:

ئەڤ تاخە ژی ژ تاخێن نزارێ چیایێ شندوخا یە، سنوورێن وی ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** جادا بارزان (تاخێ دیاری)

**باشوور:** چیایێ شندوخا

**رۆژهەلات:** تاخێ پێشانگەهان

**رۆژئاڤا:** تاخێ بن تویکا

ل ناڤەراستا سالێن هەشتیان دەست ب دابەشکرنا پارچێن عەردی و ئاڤاکرنا وان ل ڤی تاخی هاتییەکرن[١٦٦]، د وی سەردەمیدا ب (حی العلماء) هاتبووناڤکرن، د پرۆسا ناڤکرنا تاخان ب ناڤێن کوردی ب تاخێ رۆناهی هاتییەناڤکرن.

## - تاخێ سەربەستی:

ئەڤ تاخە پتر تاخەکێ خزمەتگوزارییە و گەلەك سازیێن خزمەتگوزاری دکەڤنە د سنوورێن ڤی تاخیدا ب تایبەت سازیێن خزمەتگوزاریێن ساخلەمیێ وەك نەخوشخانائازادی،سەرۆکاتیا ساخلەمیاپارێزگەها دهۆکی و چەندین نەخوشخانەیێن تایبەتمەند، د بەرامبەردا تاخ و کولانێن ئاکنجیبوونا وەلاتیان ل ڤی تاخی کێمن و تنێ چەند کولانەکێن ئاکنجیبوونێ لێ هەنە کو دکەڤنە رۆژهەلاتێ نەخوشخانا ئازادی و ل رۆژهەلاتێ وان کولانان ژی چەند سازییەکێن دی یێن خزمەتگوزاری وەك رێڤەبەریا ئەوقافێ و پەیمانگەها پێشنڤێژ و گۆتارخوینا و نەخوشخانا سۆتنێ هەنە، د قۆناغێن جودا جودادا دەست ب ئاڤاکرنا ڤی تاخی هاتییەکرن و نها ل هندەك پارچێن ڤالا ژ تاخی ئاڤاکرن بەردەوامە، سنوورێن ڤی تاخی ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** رووبارێ هشکە روو

**باشوور:** جادا بارزان

**رۆژهەلات:** تاخێ دیاری

**رۆژئاڤا:** جادا سولاڤ

## - تاخێ دیاری:

ئەڤ تاخە دکەڤیتە ناڤبەرا رووبارێ هشکەروو و جادا بارزان سنوورێن وی ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** رووبار هشکەروو (تاخێ بەرۆشکا ژێری)

دهۆك



**باشوور:** جادا بارزان (تاخێ رۆناهی)

**رۆژهەلات:** تاخێ مەهاباد

**رۆژئاڤا:** تاخێ سەربەستی

د ناڤەراستا سالێن هەشتیياندا دەست ب دابەشكرنا عەردی و ئاڤاكرنێ ل ڤی تاخی هاتییەكرن[١٦٧]، د سەردەمێ حكۆمەتێدا سالێن بەری سەرهلدانێ ب (حی الشرطة) هاتبووناڤكرن، د پروسا ناڤكرنا تاخان ب ناڤێن كوردی ئەڤ تاخە ب تاخێ دیاری هاتییەناڤكرن.

## - تاخێ مەهاباد:

سنوورێن ڤی تاخی ب ڤی رەنگینە:

**باكوور:** رووبارێ هشكەروو (تاخێ سەرهلدان)

**باشوور:** جادا بارزان

**رۆژهەلات:** تاخێ سەرهلدان

**رۆژئاڤا:** تاخێ دیاری

سالا ١٩٨٩ێ دەست ب دابەشكرنا پارچێن عەردی ل ڤی تاخی هاتییەكرن و ژ وێ سالێ ڤە د قۆناغێن جودا جودادا دەست ب ئاڤاكرنا خانییان و گەهاندنا خزمەتگوزارییان ل ڤی تاخی هاتیەكرن[١٦٨]. ئەڤ تاخە ژی د قۆناغا ناڤكرنا تاخان ب ناڤێن كوردی ب تاخێ مەهاباد هاتییەناڤكرن.

## - تاخێ پێشانگەهان:

ئەڤ تاخە پتر تاخەكێ بازرگانی یە و پێشانگەهێن كرین و فرۆشتنا ترومبێلان، ویستگەها ٢٩ میگاواتییا كارەبێ، دو ئاشێن بەفرێ، چەند عمبارێن بازرگانی و چەند خزمەتگوزارێن دی یێن بازرگانی ب خۆڤە دگریت. ل ناڤەراستا سالێن نۆتان بەرەڤ ژووری دەست ب چێكرنا ڤی تاخی هاتییەكرن، سنوورێن تاخی ب ڤی رەنگینە:

**باكوور:** جادا بارزان

**باشوور:** چیایێ زاوا

**رۆژهەلات:** تاخێ نزاركێ

**رۆژئاڤا:** تاخێ رۆناهی.

## - تاخێ نزاركێ:

ئەڤ تاخە د بنیاتدا گوندێ نزاركێ یە، نزاركێ ئێك ژ گوندێن كەڤنێن دەورو بەرێن دهۆكێ یە، سەر ب ناحیا سێمێلێ ڤە بوو، پشتی دامەزراندنا ناحیا زاویتە ل سالا ١٩٥٩ێ كەتیە سەر ب ڤێ ناحیێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكوور:** چیایێ بەرۆژی- چیایێ سپیرێز

**باشوور:** چیایێ زاوا

**رۆژهەلات:** گوندێ ئێتیتێ

**رۆژئاڤا:** گوندێ بەرۆشكێ (یێ كەڤن)

ژبەركو نزاركێ نێزیكی باژێرێ دهۆكێ بوویە د هەر بۆیەر و شەرەكێ ل دەڤەرێ رووداییت نزاركی د ناڤ جەرگێ رووداناندا بوویە، لەوما دێ بینین د ناڤبەرا سالێن ١٩٦١ێ دەسپێكا شۆرشا كوردستانێ هەتا ١١ ئادارا ١٩٧٠ی گوندێ نزاركێ سێ جاران هاتییەسۆتن و خرابكرن و سەر ژ نوو ئاڤاكرن، داویجار ل سالا ١٩٧١ێ ژ ئالیێ رێڤەبەریا ئاڤاكرنا باكووری (اعمار الشمال) هاتییەڤەئاڤاكرن، هەژییە بێژین هەتا وێ سالێ جهێ گوندی ل بنارا چیای بوو[١٦٩].

### پێكهاتا گوندی:

هەژییە بێژین د سەرژمێریا گشتیيا عیراقێ یا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٢٧ كەس بوون[١٧٠]، ل دەسپێكا سالێن حەفتیيان دەمێ سەرژنوو هاتییەڤەئاڤاكرن خەلكێ گوندی نێزیكی چل مالان بوون، هەمی ژ عەشیرەتا دۆسكی بوون، ژ ڤان مالباتان پێكدهات: بنەمالا حەسەن سەلیم ئاڤدار ب حسویێ سەلیمی ژ دۆسكی یێن كاتولی، بنەمالا یونسێ سالحی دۆسكیێ كنیانشییە، بنەمالا ئەحمەد باپیری دۆسكی یێ خیارتەیینە (خیارتە تاخەكێ گوندێ چێیی یە)

### زێدەرێن ئاڤێ:

گوندەكێ كێم ئاڤ بوو، ب هیڤیيا بارانانڤە

بوو، هندەك كانیێن وەرزی هەبوون، لەوما ژی پتریا خەلكێ گوندی كۆچەراتی دكر و مژوولی خودانكرنا پەز و مالا تی بوون، هندەكان ژی دەخل و دان و رەزێن دێم دكرن، پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ پرۆژێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتیەچێكرن كو بیرەكا ئاڤێ بوو.

جهێن ناڤدارێن گوندی: ملێ بویرێ، كۆرا جەها (گركێ چالا)، ملا قەسرۆكێ، گەلیێ تخویب، گەلیێ دوینك، گەلیێ مالا، گەلیێ سێلا.

شوینوارێن گوندی: گورستانا گوندی، ملا قەسرۆكا شوینوارێن كەڤنە گوندی لێ هەبوون، گورستانەكا دی ل داویبا پرا ئێتیتێ هەبوو كەلەك قەبرێن كەڤن لێ هەبوون.

پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیەڤەكرن و سالا ١٩٧٢-١٩٧٣ كارەب گەهشتیە گوندی[١٧١].

د بەردەوامیا بەرفرەهبوونا بازێرێ دهۆكێ، ژ سالا ١٩٨٠یڤە دەست ب بەلاڤكرنا پارچێن عەردی ل دەوروبەرێن گوندێ بەرۆشكێ یێ كەڤن هاتیەكرن و هەتا گەهشتیە ئاڤارێ نزاركێ و هەر د سالا ١٩٨٠یدا نزاركێ كەتیە د ناڤ سنوورێ بازێرڤانیا دهۆكێ دا و ژ وێ سالێ بەرەڤ ژوور و پاشتر ژی پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ بەردەوام پارچێن عەردی ل ئاڤارێ نزاركێ و دەوروبەرێن وێ هاتینەبەلاڤكرن هەتا گوند بوویە پشكەك ژ بازێری[١٧٢] و نها یەك ژ تاخێن دهۆكێ یە و سنوورێن تاخێ نزاركێ ب ڤی رەنگینە:

**باكوور:** جادا سەرەكی دهۆك – هەولێر (تاخێ ئێتیتێ، ئۆڤەرپاسا ئێتیتێ، تاخێ پیشەسازی (بێ كەڤن)

**باشوور:** چیایێ زاوا (چیایێ رەش)

**رۆژهەلات:** ئاڤارێ هێتیتێ

**رۆژئاڤا:** رۆژهەلات تاخێ پێشانگەهان

## - تاخێ ئێتیتێ:

ئەڤ تاخە د بنیاتدا گوندێ دێرینێ ئێتیتێ یە، دكەڤتە رۆژهەلاتێ دهۆكێ، ل دووڤ سەرژمێرا سالا ١٩٥٧ێ ٧٧٨ كەس ل گوندی دژیان[١٧٣]، بەری ڤێ

ئامارا فەرمی پشكێنەرێ زانیاریا (پەروەردا) مووسلێ سەرەدەنا خواندنگەها سەرەتاییا دهۆكێ كرییە و د راپۆرتا خۆدا ئاماژە دایە گوندێن دەوروبەرێن دهۆكێ، دەربارەی ئێتیتێ گۆتییە: ئیتویتێ (٨٠٠) كەس لێ دژین، ٩ كم ژ دهۆكێ دوورە خواندنگەها فەرمی لێ هەیە[١٧٤]، ب بەراوردكرنا ڤان دو هژمارێن خەلكێ ئێتیتێ دگەل گوندێن دی یێن قەزا دهۆكێ یا وێ سەردەمی كو ژ سێ ناحیێن زاویتە، مانگێش و سێمێلێ پێكدهات، ئێتیتێ ل داویبا سالێن پێنجییان ژ سەدسالیبا چوویی ب هژمارا خەلكێ خۆ مەزنترین گوندێ ناحیا زاویتە بوویە و دووەمین گوندێ قەزا دهۆكێ بوویە پشتی گوندێ دێرگژنێكێ ناحیا مانگێش (دۆسكی) كو هژمارا خەلكێ وی ل دووڤ ئامارا ١٩٥٧ێ ٩٣٥كەس بوو[١٧٥].

دەربارەی ناڤێ ئێتیتێ كو ب هێتیت ژی دهێتەزاركرن، ناڤێ خۆ ژ ناڤێ مللەتەكێ هندوئەورۆپی دبێژنێ هێتیتی Hittites وەرگرتییە، ئەڤ مللەتە دەوروبەرێ ٢٠٠٠ سالان بەری زایینی ژ ژوورێ دەریایێ رەش هاتییە و ل بانیبا ئەنادۆلێ ئاكنجی بوویە و دەولەتا خۆ ل ڤی جهی دامەزراندییە و هێدی هێدی سنوورێن خۆ بەرفرەهكرینە هەتا رۆژئاڤایێ ئاسیا بچووك و وەلاتێ شامێ و ژوورێ هەردو رووبارێن دیجلە و فرات ڤەگرتی و ٨٠٠سالان دەستەلاتداری كرییە و ١٢٠٠ ب. ز دەستەلاتداریبا وان داویهاتییە، دەڤەرا بەهدینان ژی پشكەك بوویە ژ دەستەلاتداریبا وان، پشتی شكەستنا ڤێ دەستەلاتدارییێ و بەلاڤەبوونا وەلاتیێن وێ گوندێن ب ناڤێ هێتویت ل دەڤەرا بەهدینان و جهێن دی وەك بیرهاتنا مللەتێ خۆیێ كەڤنار ئاڤاكرینە[١٧٦].

د سەردەمێ نوودا كەڤنترین ژێدەرێ ناڤێ هێتیت تێدا هاتی پەرتووكا (الظروف)ە، ژ نڤیسینا محەمەد ئەمینێ كورێ مەلا محەمەد ئەمینێ كورێ مەلا محەمەدێ هێتیتی یە، ل سالا ١٢١١مش/١٧٩٧ز[١٧٧].

پشتی ڤێ سالێ د چەندین ژێدەراندا ناڤێ ئێتیتێ-هێتیتێ وەك گوندەك خۆدی خواندنگەهەك ئایینی و ڤوتابی و جهێ ڤەمانا شێخان و زانا و شاعران و

جهێ روودانا دوا شەرێ ناڤبەرا میرگەها بەهدینان و دەولەتا ئوسمانی ل سالا ١٢٥٧مش/١٨٤١ز هاتییە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکوور:** چیایێ مام سین، سەرقەسرێ و چیایێ بەرکێمکی

**باشوور:** چیایێ رەش

**رۆژهەلات:** گەلی کورتکی و سەرێ گەلیێ ئەڤریکێ

**رۆژئاڤا:** رووبارێ بێسرێ و رەزێن ناڤبەرا هێتیت و نزارکێ

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی کوردێن موسلمان بوون ژ عەشیرەتا مزووری و تنێ دو مالێن مەسیحیان دگەلدا دژیان، ل سالا ١٩٦٣ێ گوند ژ ئالیێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتبوو سوتن و وی دەمی نێزیکی (٣٠٠) مالان ل گوندی دژیان.

**شوینوارێن گوندی:**

چەندین شوینوار ل ئێتیتێ هەبوون، ژ وانا: رەزکێ حامدی ل پشتا گوندی، کاڤلکێ مێردینکێ ل چیایێ مام سینی، سەرقەسرێ ل ژووریێ گوندی، ناوسکێ ل ژووریێ چیایێ بەرەکێمکی، ناڤ کاڤلا رۆژئاڤایێ گوندی، شکەفتا کانیێ هزر بۆ هندێ دچیت ئەڤ شکەفتە پەرستگەهەکا میترایی بیت، گرێ رۆژئاڤایێ گوندی، هەردوبێن داوی د ناڤ لیستا شوینوارێن رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ هاتینەتوومارکرن و چەندین شوینوارێن دیتر[١٧٨].

ل سالا ١٩٥١ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن

هەژییە بێژین پشتی ناحیا زاویتە ل سالا ١٩٦٠ێ هاتییەدامەزراندن ژ ئالیێ کارگێرێڤە ئێتیتێ سەر ب ڤێ ناحیێ ڤەبوو و پێشتر ژی سەر ب ناحیا سەنتەرێ دهۆکێ ڤە بوو[١٧٩] و د ڤان سالێن داوییدا کەتییە د سنوورێ بازێرڤانییا دهۆکێ دا و بوویە تاخەک ژ تاخێن دهۆکێ. ل نەخشێ بنیاتیێ بازێری سنوورێن تاخێ

دهۆك



ئێتویتێ ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** چیایێ مام ستین

**باشوور:** جادا سەرەکییا دهـۆك- هەولێر تاخێ (نزارکێ)

**رۆژهەلات:** گوندێ بێتاسێ

**رۆژئاڤا:** رووبارێ هشکە روو

## - تاخێ بەرۆشکێ:

بەرۆشکێ کو ب بەرۆشکا کاتولیيان ژی دهێتەناڤکرن گوندەکێ بچویکێ رۆژهەلاتێ دهۆکێ بوو، ل دووڤ سەرژمێرییا گشتییا عیراقێ یا سالا ۱۹۵۷ێ هژمارا ئاکنجیێن گوندی ۱۳۱ کەس بوو[۱۸۰]. لێ ژ ئەنجامێ نێزیکییا وی ژ بازێرێ دهۆکێ و مینا ویستگەهەکا بێنڤەدانێ بوو د ناڤبەرا دهۆکێ و چەندین گوند و دەڤەراندا گرنگییەکا تایبەت هەبوو.

### جوگرافییا گوندی:

د دوا قۆناغا ژیێ گوندی دا سنوورێ گوندی ژ باکوورێ رۆژئاڤا هەتا باشوورێ رۆژئاڤا بازێرێ دهۆکێ، باکوورێ رۆژهەلات هەتا باشووری گوندێ نزارکێ بوو. ل دەسپێکا سەدساليیا نوزدێ دو بنەمالە (ئالانە و مەلەکان) ل گوندی ژیاینە، جهێ گوندی هەتا سالا ۱۹۵۲ێ ل بنارا چیایێ سپی ل هنداڤ گرێ ئاخەسپیکێ بوو. پشتی سالا ۱۹۵۲ێ ژ ئەنجامێ کێم ئاڤیێ و ب مەرەما خۆ نێزیککرنێ ژ داموەدزگەهێن پێدڤی ب تایبەت خواندنگەهان خەلکێ گوندی ژ بنارا چیایی هاتنەخوارێ و ل نێزیکی رووبارێ هشکەروو ئاکنجی بوون و ئەڤ رووبارە د ژێریێ گوندی را دەرباز دبوو. بەلێ گەلەك نە ڤەکێشا شۆرشا کوردستانێ یا سالا ۱۹٦۱ێ ب سەرداهات و د روودانێن شۆرشێدا گوند ژ ئالیێ فرۆکەیێن حکۆمەتێڤە د هێتەبومبابارانکرن و ب یەکجاری وێران دبیت و خەلکێ گوندی هندەك دچنە ناڤ دهۆکێ و هندەك ژی ل گوندێن دەوروبەر ئاکنجی دبن، پشتی پێکهاتنا ۱۱ ئادارا ۱۹۷۰ێ گوند ل هەمان جهێ نوو ژ ئالیێ وەزارەتا (ئاڤەدانکرنا باکووریڤە) دهێتەڤەئاڤاکرن و بێی کو خواندنگەهـ و مزگەفت بۆ بێنەئاڤاکرن[۱۸۱].

### سەروبەرێ گوندی:

د قۆناغا بەری ۱۹۵۲ێدا گوند ل بنارا چیایێ سپی و جهەکێ ڤەدەر ژ دەستەلاتی بوو، چ ل سەردەمێ دەستەلاتێ ئوسمانی یان یێ مەلکیێ عیراقی مژوولی رێنجبەرییا خۆ بوون، پشتی گوند هاتیە جهێ نوو ژی خەلکێ گوندی مژوولی خودانکرنا پەز و مالاتی و چاندنا دەخل و دانی بوون، بەلێ ئاریشا مەزنا گوندی کێمیا ئاڤێ بوو، وەك دهێتەڤەگێران ل سالێن سیهان موختارێ گوندی محەمەدێ حەفصێ خۆ گەهاندیە رۆژهەلاتناسێ ئەمریکی کامبرلاند و ب رێکا وەرگێرێ وی ئیسماعیل ئەفەندی یێ خەلکێ گوندێ بابلو ژێ خواستیە ئاڤا ڤەخوارنێ بگەهینتە گوندی، کامبرلاند دگەل وەرگێرێ خۆ هاتینەگوندی و سووزدایە ئاڤێ بۆ وان ژ کانییا بەقبەڤیێ ژ کانی مەهەمەدکێ بگەهینتە گوندی وەك شەریفێ موختار کو نەڤیێ محەمەدێ حەفصێ بە دبێژیت: یەکەم جار وان ئاڤا ب سۆلینا کێشایە گوندی سەر دەستێ کامبرلاندی دیتیە. هەتا سالێن حەفتیيان خواندنگەهـ ل گوندی نەهاتیيەڤەکرن بچویکێن گوندی ب خواندنێ دچوونە گوندێ ئێتیتێ[۱۸۲].

ل سالێن حەفتیيان ب تایبەت د قۆناغا ڤەگوهاستنا گونداندا هندەك ژ خەلکێ گوندێن (ئۆرە، سەرزێری، دەشتانێ، گەربەراسکێ و بروژێری) قەستا ڤی گوندی دکەن و لێ ئاکنجی دبن. بەرۆشکێ د سالێن حەفتییاندا ب تایبەت قۆناغا پێکهاتنا ۱۱ێ ئادارێ جهی سەیران و گێرانا ئاهەنگ و بیرهاتنێن دهۆکێ بوو.

ل سالا ۱۹۷۸ێ ب بریارەکا سەرۆککۆمارێ عیراقێ وەك سزایەك بۆ خەلکێ بەرۆشکێ و پشکدارییا وان د شۆرشا کوردستانێدا (۲۰۰دونەمێن عەردێ تاپۆ) ژ کەرتێن ۷۹ بەرۆشکا باشوور و ۸٤ بەرۆشکی بێی قەربووکرن ژ خەلکێ دهێتەستاندن، ل ۱۹۸۰/۷/۱۳ێ جارەکا دی ب بریارا ژمارە ۱۱۰۲یا (مجلس قیادة

الثورة)یا عیراقێ (٣٠٣ دۆنەمێن دی ژ عەردێ تاپۆ) ژ بەرۆشکییان دهێتەستاندن و بیێ قەربووکرن[١٨٣].

ب مەزنبوونا باژێرێ دهۆکێ باژێر بەرەف سنوورێ ئاقارێ بەرۆشکێ چوویە، ژ سالا ١٩٨٠ێڤە دەست ب دابەشکرنا پارچێن عەردیێن (١٥٠مەتری) ل دەوروبەرێن بەرۆشکێ هەتا ئاقارێ نزارکێ هاتییەکرن و د هەمان دەمدا دەست ب ئاڤاکرنا وان پارچان هاتییەکرن و هەر ل سالا ١٩٨٠ێ نزارکێ و بەرۆشکێ کەتینە د سنوورێ باژێرڤانییا دهۆکێ دا [١٨٤]. دابەشکرنا عەردی ل دەڤەر و جهێن ناڤبەرا دهۆکێ و بەرۆشکێ بەردەوام بوویە زێدەباری ئاڤاکرنا زێدەگاڤی ب تایبەت ل سالێن پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ کو هژمارەکا زۆرا خەلکی ژ ناچاری و ئەنجامێ لاوازیا سەروبەرێ وانێ ئابووری ل گرکێن چیایێ سپی کەرتێ ٩٥ ژ گوندی دەست ب ئاڤاکرنا خانیێن بێ سەروبەر کر و هەتا نوکە ژی د وان خانییانڤە دژین[١٨٥].

## تاخێ سەرهلدان:

هەژیە بێژین ل داویا سالێن حەفتییان ل بەرۆشکا ژێری کۆمەلگەهێ بەرۆشکێ کو ب (جەمعییا بەرۆشکێ) دهاتەناڤاکرن ب مەرەما دابەشکرنێ ل سەر خەلکێ وان گوندان یێن هاتینە راکرن و خرابکرن هاتەئاڤاکرن، بەلێ ژ بەرکو ل باژێری ئاریشا ئاکنجیبوونێ و نەبوونا خانییان هەبوو و ل دەسپێکا سالا ١٩٨٠ێ ل سەر تەخێن جودایێن خەلکی هاتەلێکڤەکرن[١٨٦]، دڤەکۆلینەکا زانستیدا کو ل دەسپێکا سالێن هەشتییان ل دور باژێرێ دهۆکێ هاتییەنڤیسین دەربارەی ڤی تاخی (جەمعییا بەرۆشکێ هاتییە: دکەڤیتە دوورترین ئالییێن رۆژهەلاتی ژ باژێری هژمارا خانییێن وی نها (دەمێ بەرهەڤکرنا ڤەکۆلینێ) دگەهیتە ١٥٥٠ خانییان، ٣٥٠ ژ وان ژ ئالیێ پارێزگەهێڤە هاتینەئاڤاکرن و ١٢٠٠ایێن دی وەك پارچێن عەردی ل سەر خودانێن داهاتێ دیارکری هاتینەلێکڤەکرن و وان ب خۆ ئاڤاکرینە بەلێ ل دووڤ دیزاینێن هەڤکرتی و پێشتر ئامادەکری ژ ئالیێ باژێرڤانییا باژێریڤە رووبەرێن وان وەکهەڤ ٢٠٠م٢ نە، خانیێن وی کۆمەلگەهی شێوازەکێ رۆژهەلاتی و هەڤگرتینە و جادێن رێك و پێك و راست دناڤبەرا واندا

دهۆك



هەنە[١٨٧]. د هەمان دەمدا د بەردەوامیا ئاڤاکرنێدا ل رۆژهەلاتێ بەرۆشکێ د ناڤبەرا جادا سەرهلدان (جادا دهۆك- بێسرێ) و بنارا چیایێ سپی دا، بەرۆشکێ بەرەف رۆژهەلاتیڤە پتر هاتەئاڤاکرن و ئەڤ ئاڤاکرنە ل سالێن پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ ژی بەردەوام بوو چ ب رێکا دابەشکرنێ و چ ژی ئاڤاکرنا زێدەگاڤی هەتا سنوورێ ئامازەپێکری هەموو هاتییەئاڤاکرن و هەردو تاخ کۆمەلگەهێ بەرۆشکێ یێ ل ژێریا جادێ و یێ د سەر جادێ دا ب تاخێ سەرهلدان هاتنە ناڤکرن و نها سنوورێن تاخی ل دووڤ نەخشێ بازێرڤانیێ ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** چیایێ سپی

**باشوور:** تاخێ پیشەسازی هشکەروو

**رۆژهەلات:** جادا سەرهلدان (جادا دهۆك- بێسری)

**رۆژئاڤا:** تاخێ بەرۆشکێ

## تاخێ پیشەسازی:

ئەڤ تاخە ژ ناڤێ وی دیارە کو نە تاخەکێ ئاکنجیبوونێ یە، ژ داوییا سالێن حەفتیان رۆژ ل دووڤ رۆژێ جهێن پیشەسازی و هندەك کارێن بازرگانی لێ کۆمبووینە و پێدڤیێن بازێری د قەتاندن، نها تاخێ پیشەسازی ل دەرڤەی دهۆکێ دەڤەرا دبێژنێ شێخجێ هاتییەئاڤاکرن و ئەڤ تاخێ پیشەسازی یێ دهێتەڤالاکرن، تاخێ سەرهلدان ژ باکوور و رۆژئاڤاڤە و پشکەکا رۆژهەلاتی و جادا بارزان ل باشووری و پشکەکا رۆژهەلاتی سنوورێن تاخی پێکدئینن.

## تاخێ گەلی:

ژ تاخێن دهۆکێ یە ژ سالا ١٩٦٧ێ بەرەف ژوور دەست ب ئاڤاکرنا وی هاتییەکرن[١٨٨]، ل بەراهیێ دەست ب ئاڤاکرنا رۆژهەلاتێ جادا گەلیێ دهۆکێ و نێزیکی بانزینخانا گەلی (یاکەڤن) هاتەکرن، پاشتر ئاڤاکرنێ ب مۆلەت و زێدەگاڤی ب تایبەت د قوناغا پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ بەرەف رۆژهەلات و باکوورێ تاخی ئانکو بنارا چیایێ خۆ ڤەکێشا هەتا هەردو دەڤەرێن هنداڤ تاخێ گەلی یێن ب ناڤێن گرکێڤریشك و گژەبەرا ڤەگرتین و ئەڤ ئاڤاکرنە

دهۆك



ب رەنگەکێ بێ سەروبەر و زێدەگاڤی بەردەوام بوو هەتا گەهشتییە دەڤەرا جاران ب کانی مەهمەدکێ دهاتەناڤکرن و نها سنوورێن تاخی ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** چیایێ سپی

**باشوور:** جادا گڕەبەرا

**رۆژهەلات:** کانی مەهمەدکێ

**رۆژئاڤا:** جادا گەلی و رووبارێ دهۆکێ

## تاخێ کانی مەهمەدکێ:

کانی مەهمەدکێ بەری ببیتە تاخەکێ دهۆکێ ب کانی یا خۆ (کانی مەهمەدکێ) ل دهۆکێ یا ناڤدار بوو، کانی دکەتە ژێریا گڕەبەرا نێزیکی رێکا بەرۆشکێ یا کەڤن، ئەڤە ئەو کانی بوو یا ل سالێن سیهان مزگینەرێ ئەمریکی کەمبەرلاندی ئاڤ ژێ کێشایە هندەك جهێن دهۆکی، بۆریەك ژێ کێشایە مزگەفتا مەزنا دهۆکێ و ئێکا دی کێشایە تانکییەکێ مەزن ل نێزیکی مالا خۆ و چەند حەنەفیەك پێڤەکرین و خەلکێ مفا ژێ وەردگرت[189].

د هەمان قۆناغا تاخێ گەلی دا ژ سالێن حەفتییان بەرەڤ ژوور دەست ب ئاڤاکرنا ڤی تاخی هاتییەکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ۱۹۷۷ێ ٦٢١ ئاڤاهی ل ڤی تاخی هەبوون ۵۹۷ ژ وانا یێن ئاکنجیبوونێ بوون و ٦۷۱ خێزان تێدا دژیان و دبوونە ۳۸٤۲کەس[190]، ژ سالا ۱۹۸۱یڤە ل جهێ ناڤدار ب ناعۆری کو دکەڤیتە ژێریا ڤی تاخی دەست ب دابەشکرنا پارچێن عەردی هاتییەکرن و ئەو پارچە هاتینەئاڤاکرن و تاخ بەرەڤ رۆژهەلاتیڤە بەرفرەهبوویە[191]، ئەڤ تاخە بەردەوام د مەزنبوونێدا بوویە هەتا سالێن پشتی سەرهلدانێ د ڤێ قۆناغێدا ژی ب هەمان شێوازێ زێدەگاڤی هاتییەئاڤاکرن و نها یەك ژ تاخێن مەزنێن دهۆکێ یە و سنوورێن وی ب ڤی رەنگینە:

**باکوور:** چیایێ سپی

**باشوور:** تاخێ خەبات

**رۆژهەلات:** تاخێ بەرۆشکێ

**رۆژئاڤا:** تاخێ گەلی

## تاخێ خەبات:

ئەڤ تاخە پتر د ناڤ خەلکیدا ب تاخێ کۆچەران دهێتەنیاسین و جاران دگۆتنێ (بنتویکا) د سالێن پێنجییان و شێستان ژ سەدسالیا چوویی دکەتە رۆژهەلاتێ جادا گشتییا نها دچیتە نەخوشخانا ئازادی و هەتا رۆژئاڤایێ بانزینخانا نێزیکی ناڤنجییا مەمێ ئالان ڤەدگرت[192]. د سەرژمێریا سالا ۱۹۵۷ بۆ یەکەم جار ناڤێ ڤی تاخی ب ناڤێ تاخێ (بن تویکا) وەك تاخەکێ دهۆکێ هاتییە و هژمارا خەلکێ وی تنێ ٢١٤ کەس بوون[193]، ژ ڤێ چەندێ دیاردبیت دەسپێکا ئاڤابوونا ڤی جهی ل سالێن پێنجییان بوویە و جهێ وی ناڤدار بوویە ب بن تویکا بەردەوامیا هەمان جهێ بنتویکا بوویە یێ مە ئاماژە پێکری لێ ئەڤە دکەڤتە ئالیێ راستێ یێ رووبارێ هشکەروو بۆ ناڤ بازێریڤە، ب مەزنبوونا تاخی و ئاکنجیبوونا خەلکەکێ پتر ل تاخی کو پتریا وان ژ عەشیرەتا کۆچەران بوویە تاخ ب تاخێ کۆچەرا هاتییەناڤکرن و ل دووڤ ئامارا ۱۹۷۷ێ یەك ژ تاخێن پرمرۆڤێن دهۆکێ بوویە و ٦۳٦٢ کەس ل وی تاخی دژیان و ۵۳۰ ئاڤاهی ل وی تاخی هەبوون ٤۷۱ ژ وان ئاڤاهیێن ئاکنجیبوونێ ئانکو مالێن خەلکی بوونە[194]، هەر د وێ قۆناغێدا ب تایبەت پشتی پێکهاتنا ئادارا ۱۹۷۰ێ ب تاخێ خەبات هاتییەناڤکرن.

ئەڤ تاخە بەردەوام د بەرفرەهبوون و مەزنبوونێدا بوو هەتا هەموو ڤالاهیێن وی پڕبووینەڤە و دگەل تاخێن دورێن خۆ گەهشتینە ئێك، هەژییە بێژین تاخێ زۆزان کو پێشتر د ناڤبەرا ڤی تاخی و تاخێ کانی مەهمەدکێ دا بوو ل دووڤ نەخشێ بنەرەتیێ بازێرێ دهۆکی کەتییە د ناڤ ڤی تاخیدا و نها سنوورێن تاخی ب ڤی رەنگینە:

**باکووری:** تاخێ کانی مەهمەدکێ

**باشووری:** رووبارێ هشکەروو

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ هشکەروو

**رۆژئاڤای:** تاخێ شێلێ

ل داویێ هەژییە بێژین گوندێ بێسرێ ژی کو د ناڤ گوندێن ناحیا زاویتەدا مە ئاماژە پێکریە نها کەتییە د ناڤ سنوورێ بازێرڤانییا دهۆکێ و ب تاخەکێ بازێری د هێتەنیاسین.




نەخشەیێ بنیاتیێ بازێرێ دهۆكێ هەتا سالا ٢٠٣٢ێ

# ناحیا مانگێشێ (مانگێشکێ)

خالد نووری دۆسکی

بەری سەر ناحیا مانگێشێ باخڤین، فەرە چەندەکێ ل سەر عەشیرەتا دۆسکیان ب راوستین، ژبەرکو ناحیا مانگێشێ پشکەکە ژ وێ عەشیرەتێ. ناڤێ ڤێ عەشیرەتێ د سالنامێن ئۆسمانییا دا ل سالا (١٨٩٤ز)ێ هاتییە، هژمارا وان (٥٠٠) مالبات بوون، ئەو پشکەکن ژ دۆسکی ژووریا ئەوێ ل دەڤەرا (گەڤەرێ) د خۆجهـ[١]. کو ل وێرێ هژمارا وان نێزیکی (٢٠٠٠) مالباتانە، وانا ناڤێن بابکێن خۆ وەکی (چیایی و ئەرتیسی و کاتۆلی) پێن هەلگرتین، د چاندنێ و خودانکرنا کەوالی و چێکرنا رەزوێ دا شۆل دکەن، عەشیرەتا ژ هەمییان مەزنترە ل بەهدینان، ب مێرخاسی و باشیێ دناڤدارن، ژبەرکو یێ ل ئەردەکێ پیت و بەرەکەت، زێدەباری کو بارانەکا باش ژی ل وێ دەڤەرێ دباریت، هەمی د ژیانەکا خۆش دانە، ژ گوندێن وان یێن ناڤدار (بەرۆشکێ و کورێمە و مانگێش و گەرماڤا و پیرۆمەرا و کەمەکا)[٢].

مانگێش گوندەکە ل سەر بەرمایکێن کەڤن هاتییە ئاڤاکرن، ژیان هەتا ئەڤرۆ یا لێ بەردەوامە، ریلێن بەرفرەهە لێ هەبوون، بەلێ ب بوورینا وەختی ژناڤچووینە، هەر زویکا مەسیحییەت لێ بەلاڤ بوو، کەنیسە و دێر لێ هاتنە ئاڤاکرن، ژوان (کەنیسا مار تۆمای) و (کەنیسا دێراگژنیکێ) و (دێرکێ). خەلکێ وێ پتر فەللێن نەستۆرینە، سەر ب ئەبرەشییا ئامێدیێ ڤە بوو، ل چەرخێن پاشتر خەلکێ وێ بوونە کاسۆلیکی. سولتان (حسێنێ وەلی) حەفت قرویش و چارێکەك وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل ئامێدیێ ل سەر وان سەپاند بوون. فەللێن مانگێشێ گەلەك نڤیسین پتری جهێن دی هەبوون، وانا کەنیسەك هەبوو، سێ پەرستڤان (کاهن)ان ب رێڤە دبر، سالا (١٨٤٢)ێ ل دووڤ گۆتنێن بادجەری، هژمارا پەرستڤانان (کاهنان) (١٥) کەس بوون. ل دووڤ سەرژمێرییەکێ کو ل دەسپێکا چەرخێ بیستێ هاتییە کرن[٣]، هژمارا وان (١١٠٠) کەس بوون، کو دو جارا هندی فەللێن ئەرەدنا بوو[٤].

ناحیا دۆسکی یان ناحیا مانگێش ئێکە ژ دو ناحیێن سەر ب قەزا ناڤەندا دهۆکێ ڤە، ل سەر نەخشێ کوردستانێ دکەڤیتە سەر هێلا (٢,٤٣) پلە رۆژهەلاتی و کڤانێ فرەهیا (٥,٣٦) پلە ل باکووری، دکەڤیتە باکوورێ پارێزگەها دهۆکێ ب دووراتییا نێزیکی (٣٠کم)، ب دو جادەیێن ڤێرکری ب ناڤەندا پارێزگەهێ ڤە یا گرێدایە، یا ئێکێ ل سالێن پێنجیان یا هاتییە ڤێرکرن ل لایێ رۆژهەلاتی، یا دووێ ل سالێن حەفتیان هاتییە ڤێرکرن ل لایێ رۆژئاڤایێ باژێرکی، ناحیا زاویتە دکەڤیتە باشوورێ وێ، ل باکووری رووباری خابوور دبیتە ناڤبر دگەل ناحیا باتویفا یا سەر ب قەزا زاخۆ ڤە، هەردو ناحیێن رزگاری و باتێل دکەڤنە

رۆژئاڤای، رۆژهەلاتی و باکوورێ رۆژهەلاتی مانگێش یا هەڤسنووره دگەل ناحیێن سەرسنك و بامەرنێ یێن سەر ب قەزا ئامێدیی ڤە ل دووڤ ئێك، بەروبیاڤێ مانگێش (٤٥٤كم٢) ل سالا (١٩٢٧)ێ بوویە سەنتەرێ ناحیێ، هەرچەندە هندەك ژێدەر ئاڤرێێ دكەنە هندێ كو ل سالا (١٩٢٠)ێ بوویە سەنتەرێ ناحیێ، سالا (١٩٨٦)ێ پشتی چەندین گوندێن دەڤەرێ و سەنتەرێ ناحیێ ژلایێ پێشمەرگەی ڤە هاتینە رزگاركرن، حكۆمەتا عیراقێ بریار دا ناحیە مانگێشێ بهەلوەشینیت و بكەڤیتە سەر ناحیا زاویتە، پشتی ١٠ سالان، دیارتر ل سالا (١٩٩٦)ێ جارەكا دی ب بریارەكا حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ناحیە بۆ مانگێشێ هاتە زڤراندن. نها ٥٣ گوند سەر ب ناحیا مانگێش ڤەنە، ژوانا (٤١) گوند دئاڤانە و (١٢) نە دئاڤاكری نە. (عەلی سەیدوێ گەورانی) ل رۆژا (١٩٣١/٨/٥)ێ یێ گەهشتییە دهۆكێ، وەختێ بەحسێ ناحیا دۆسكییا دكەت، دبێژیت: ناڤەندا وێ ناحیا مانگێشێ یە، (٩٠) گوند سەر ب ڤێ ناحیێ ڤەنە[٥].

پتریا خەلكێ ناحیێ ب نەتەوە كوردێن موسلمانن سەر ب عەشیرەتا دۆسكییا، ژبلی سەنتەرێ مانگێش (مەسیحیێن كلدانن)، و گوندێ گوندكۆسە (مەسیحیێن ئاشووری)نە. د سەرژمێریا نە فەرمی دا، ل سالا (٢٠١٤)ێ سەرانسەرێ ناحیا مانگێش نێزیكی (٩٠٠٠) كەسانە و سەنتەرێ ناحیێ نێزیكی (٣٠٠٠) كەسان بوون، ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینیا رێڤەبەریا ئامارا دهۆكێ سەرجەمێ خەلكێ ناحیا مانگێشێ (١٢٦٠٨) كەسن، ژ وانا (٣٩٢٦) كەس باژێری نشینن و (٨٦٨٢) كەس ل گوندان دژین[٦].

وەكی ئاماژە پێ هاتییەكرن سەنتەرێ ناحیێ ئانكو مانگێش ب خۆ د بنیاتدا گوندەكێ مەسیحیان بوو، بەلێ ژبەركو پتریا خەلكێ ناحیێ مووسلمان بوون، هێدی هێدی موسلمان ژی ل سەنتەری ئاكنجی بوونە، پشتی هەوا ڤەگوهاستن و خرابكرنا گوندان ل

مانگێشێ



سالا (١٩٧٥)ێ دەسپێکری هژمارەکا زۆرا موسلمانێن سنوورێ ناحیێ ل سەنتەرێ مانگێشێ ئاکنجیبوون، سالا (١٩٧٥)ێ بۆ جارا ئێکێ مزگەفتەك ژلایێ (جەعفەر ئاغا بێسفکی) ڤە هاتیە ئاڤاکرن.

## ناڤێ مانگێشێ:

ل دۆر ناڤێ مانگێش سێ بۆچوون هەنە:

**یا ئێکێ،** دبیت ناڤێ وێ ژ هەردو پەیڤێن (بیت مکوشی) یێن کلدانی ئانکو (بیت المجوس) هاتبیتە وەرگرتن، ب بوورینا دەمی و نفشێن ل دووڤ ئێك بوویە مانگێش و تشتێ ڤێ چەندێ گروڤە دکەت، هەبوونا هندەك تیتالێن مەجوسییا کو دبیت خەلکێ مانگێش یێ کەڤن مەجوسی بن.

**یا دووێ،** دبیت ئەڤ ناڤە ژ پەیڤێن (منگیشیە) یان (منگاش) یێن کلدانی ئانکو ئەوێ بالا کریێ (الذی لمسە) هاتبیتە وەرگرتن، وەك کنایەت بۆ (مارتوما) ئێك ژ حەوارێن مەسیحی ئەوێ بالاکریە مەسیحی، ل مانگێش دێر و کەنیسە ب ناڤێ مارتومای هەنە، ل چیایێ بەرامبەر مانگێش هەر ب ناڤێ مارتومای ناوسکەکا کۆلای هەیە.

**یا سێێ،** دبیت ناڤێ وێ ژ هەردو پەیڤێن (بیت مخنشی) ئانکو (جهێ کۆمبوونێ) هاتبیت.

## مانگێش د هندەك ویستگەهێن دیرۆکی دا:

بەری بوونا مەسیحی مرۆڤ ل ناڤەندا مانگێش ژیاینە ب گروڤێ هندێ دەمێ ل سالا (١٩٢٩)ێ دێرا مارگورگیس ل سەر کاڤلێ پەرستگەهەکا کەڤنار ئاڤاکری، دیوارێن ب کلسێ هونی دەرکەتن و ب وان دیواران ڤە شوینا خوینێ و دویکێلا ئاگردانکا دیاربوو، ئەڤ خوین ودویکێلا ب دیوارا وەسا دیاردکەن ئەڤ پەرستگەهە یا زەرادەشتییان بوو، ئەو خوین یا قوربانێن وانە بۆ مرێن خۆ ددان دەمێ دسوتن،

**خواندنگەها دێرگژنیك یا سەرەتایی یەك ژ خواندگەهێن سنوورێ ناحیا مانگێش**



ژبلی شوینوارێن پەرستگەهێ هژمارەکا شوینوارێن دی یێن کەڤن ل رەخۆدۆرێن مانگێشێ هەنە، وەکی شوینوارێن ژ هەمیا کەڤنتر یێ گوندێ (قوختا)یە، پاشی گوندێ (قەلاچێ)، هژمارەکا گوندێن دی مینا بنن، شیخۆرکی، قەسل، بیث عیناتا، مرکا داقلچ، زندەباری هژمارەکا شوینوارێن دی وەك گەلیێ (دماثا) ل باشوورێ مانگێشێ، دیسا ل سەرێ چیایێ بەرامبەر سێ بەرێن چێکری هەنە، هەروەسا ناوسکێن دکەڤری دا کۆلای هەنە.

مانگێش دچەندین قۆناغێن دیرۆکی دا بووریە، کەڤتیە بن دەسەلاتا گەلەك حوکمداریا وەك: زەرادەشتیا و ئاشووری و کلدانی و ساسانی و هەتا دگەهیتە موسلمانا. پشتی ٦٠٠ سالێن دەستەلاتداریا میرگەها بەهدینان ل دەڤەرێ، مانگێش ژی وەك سەرانسەری دەڤەرێ ژ سالا (١٨٤٢)یڤە کەتیە ژێر دەسەلاتا راستەوخۆیا ئۆسمانییان، هینگێ گوندێ (کەریلێ) سەنتەرێ ناحیا دۆسکی بوو، مانگێش وی دەمی گوندەك بوو سەر ب ناحیا داودیێ ل قەزا ئامێدیێ، پشتی هاتنا ئنگلیزی بۆ دەڤەرێ ل سالا (١٩١٨)ێ، دو سالان وەك هەموو دەڤەرا بەهدینان ل ژێرەستەلاتێ راستەوخۆ یێ ئەفسەرێن بەریتانی بوو، و پشتی دامەزراندنا حکۆمەتا مەلەکییا عیراقێ ل سالا (١٩٢١)ێ مانگێش ژی وەك پارچەك ژ قەزا دهۆکێ سەر ب لیوا مووسلێ ڤە بوو.

چەند جهێن شوینواری ل سنوورێ ناحیێ هەنە، کو ٣٦ ژێ ل ڕێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ د توومارکرینە، وەك پەیکەرێ (ملا مەرگێ) ل گوندێ دەرگەلا شێخا ل نێزیك گوندێ زیناڤا و گەلناسکێ، ل سالا (١٩٥٢)ێ هاتیە ئاشکەرا کرن. شینوارێن گوندێن (گرێ پتێ) و دیراگژنیك و بێسفکی و دیرکێ و بابۆخکێ و گەلناسکێ و زرهەوا، دەستنڤیسێن کەڤن ل دیرا مانگێش کو ژیێ وان بۆ سالا (١٥٧٤)ێ زایینی دزڤریت. ژبەرکو دەڤەرا مانگێش شەرگەها شۆرشێن کوردی بوو ل دژێ رژێمێن عیراقی، خەلکێ ڤێ دەڤەرێ قوربانیێن مەزن داینە، نەخاسمە د هەوێن ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ دا کو ژبلی خرابکرنا گوندان، حکۆمەتێ خەلکی دەڤەری جینوسایدکرن و کەفتە بەر هێرشێن چەکێ کیمیاوی ل پتر ژ گوندەکی دا، هەتا نها ب دروستاهی ئەڤ گوندە نە هاتینە ئاڤاکرن و خەلکەکێ کێم لێ دژیت.

ل دۆر خواندن و فێرکرنێ یەکەمین خواندنگەها سەرەتاییا کوڕان ل سالا (١٩٢٧)ێ ل مانگێش هاتییەڤەکرن، سالا (١٩٥٨)ێ خواندنگەهەکا تایبەت بۆ کچان هاتبوو ڤەکرن، ل سالا (١٩٦٨-١٩٦٩)ێ خواندنگەها دواناڤنجی ل مانگیش هاتییە دامەزراندن، ل سالا (١٩٨٥)ێ باغچێ زاروکان هاتییە دامەزراندن، ل سالا (٢٠٠٧)ێ خواندنگەها سپنە یا بنەرەت ل مانگێش هاتییە دامەزراندن.

## مانگێش ل سەردەمێ شۆڕشێن کوردی:

هەرچەندە مانگێش ل سەردەمێ بزاڤا رزگاریخوازا کوردی گرنگییا خۆ هەبوویە و دەڤەرەکا ستراتیژی بوویە نەخاسمە ژ بۆ بزاڤ و لڤینێن پێشمەرگەی، ژبەرکو حوکمەتا عیراقێ هێزێن مەزن ل مانگێش و رەخۆدۆرێن وی کۆمڤە دکرن، پێشمەرگەی هەر ل مانگێشێ بخۆ و گوندێن رەخۆدۆرا و رێکا مانگێش-باگێرا گورزێن کوژەك د داوەشاندنێ، شکەستنا ژ هەمیا مەزنتر ئەوبوو دەمی ل بهارا سالا (١٩٨٦)ێ پێشمەرگە شیاین سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ هەتا دگەهیتە گوندێ رەشێورێ ل نێزیك کۆمەلگەها کورێت گاڤانا کونترۆل بکەن، پشتی شکەستنا حکۆمەتا عیراقی یا وی دەمی مەزنترین هێرشێن چەتە و لەشکەرێ عیراقێ بۆ سەر گوندێن دەڤەرا دۆسکییا دەستپێکرن، بەردەوامی دا هیرشێن خۆ هەتا ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ و هەمی گوندێن دەڤەرا دۆسکییا وەکی هەمی دەڤەرێن کوردستانێ کەڤتنە بەر هێرشێ، و گوندێن وان هاتنە تالانکرن و سۆتن و خرابکرن، و خەلکێ دەڤەرێ یێ شیای دەربەدەری ترکیا بوو، یێن دیتر کەڤتنە دەستێن رژێمێ و رەوانەی کۆمەلگەهێن ب زۆری چێکری ل بەحرکێ

و جهێن دیتر کرن، هەتا نها گەلەگ ژ زەلامان دبێ سەروشوینن، و گەلەك ژێ هەر ل سەر گوندێن وان هاتنە گولەبارانکرن مینا کۆمکوژیا گوندێ کوریمێ کو نێزیکی (٣٠) زەلامان گوللە بارانکرین، پشتی سەرهلدانێ هەستیکێن گۆرێن وان ئینانەدەر و ل گۆرستانا گوندێ کوریمێ هاتنە ڤەشارتن. هەروەسا گوندێ ئێکمالا خابووری پتری (٧٠) زەلام بێ سەروشوینکرن، نە ب تنێ موسلمانێن دەڤەرێ بوونە قوربانیێن ئەنفالا بەلکو گەلەك ژ پیر و جان و ژن و زارۆیێن گوندێ (گوندکۆسە) یێ مەسیحیان ژی کەفتنە بەر هەوێن ئەنفالان و هەتا نها دبێ سەروشینن.

## مانگێش ل پشتی سەرهلدانێ:

پشتی سالا (١٩٩١)ێ و دانانا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ پویتە ب مانگێشێ هاتیە دان، تشتێ ژهەمییان بەرچاڤتر زڤراندنا ناحیا مانگێشێ بوو ل سالا (١٩٩٦)ێ، و کارکرن بۆ ئاڤاکرنا وان جهێ و دەڤەرێن هاتینە ویرانکرن، و چەندین خزمەت پێشکێشکرینە، هەر ژ نویژەنکرن و ئاڤاکرنا ئاڤاهیێن حکۆمەتی و جهێن ئایینی و سەخبیرکرن و گەهاندنا رێکا و ئاڤ و کارەبا و خزمەتێن دیتر بۆ مانگێشێ و گوندێن سەر ب ناحیێ ڤە، زێدەباری ئاڤاکرنا هژمارەکا مەزنا خانییان بۆ مەسیحییان ل سەنتەرێ ناحیێ، نەخاسمە پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ، هەر وەسان حکۆمەتێ چەندبن فەرمانگەهێن نوی ل ناحیێ ڤەکرینە، و یا ئاشکەرا کو چ پێشڤەچوونا سیستەمی کارگیری ل مانگێش بەری سەرهلدانێ نەبوو.

## رێل و گژوگیا:

داروبارێ خۆرستی ل مانگێش گەلەکێ هەی، نەمازە ل چیایێ بەرامبەر (چیایێ مانگێش) کو ژ زنجیرا چیایێ گارەی یە ئەوێ دکەڤیتە باشووری مانگێشێ ل پشت رووباری، وەکی دار بەرِوی و دار

کولانەکا مانگێشکێ ل سالا ١٩٧٧



مازی و کەزوان و گهیشك و هەلهەلۆك و گەلەك جوینین دیتر وەك هەڤرست و کاژا. هەروەسا گژوگیا ژی گەلەك جوینێن هەین کو ل وەرزێ بهارێ شیندبن، وەکی شافر و فریزێ دێم و هەتا هاڤینان دمینن، دیسان ل بەر لێڤێن رووباران، ل مێرگ و چیمەن و ئاڤزەها هندەك رەنگێن گیایێن لەڤەنی هەنە مینا قور و قەرەم و گیا حێسیلك و دەمبیسك، کو ل بەرێ خەلکی مفا بۆ سەربانێن خانییان و سەرکەپر و زنجا ژێ ددیت.

## زێدەرێن ئاڤێ و چاندن:

چەندین کانی و رووبارەك یێ ل باشوورێ مانگێشێ هەین، ل هاڤینان هشك دبیت و ل لایێ دیێ رووباری هەمی رەزێن تری و دارێن باهیڤا نە، ئەو سالێن گەلەك بەفر و باران دبارن کانی و رووبار د پەقن و زێدەدبن بۆ چاندنا داروباری و دەخل و دانا و چاندنا زەرزەواتی و هەمی بەرهەمێن چاندنێ مفا ژێ دئێتە وەرگرتن، ژبەرکو چاندن کارێ سەرەکییێ هەمی خەلکێ دەڤەری بوو، هەر چەندە نها یا کێم بووی، ژ چاندنێن دێم و ئاڤی ئەوێن ل مانگێشێ هەین، مینا چاندنێن زڤستانێ وەك گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و گژنیژا، و ژ چاندنێن هاڤینی و زەرزەواتێن مینا باجان سۆرك و باجان رەشك و سیرا و پیڤازا کو مانگێش ب سیر و پیڤازا یا ناڤدارە، زێدەباری هەبوونا چەندین رەنگێن فێقی مینا تری و سێڤ و هنار و خۆخ.....هتد.

ئەڤە و زێدەباری خودانکرنا تەرش و کەوالی، مینا پەزێ سپی و پەزێ رەش و دگەل هەبوونا چێل و مریشك و عەلۆك و مێشێن هنگڤینی... هتد کو ل مانگێشێ دهێنە ب خودانکرن.

## پێکهاتەیا مانگێشێ یا رەسەن:

گوندێ مانگێشێ کو نها سەنتەرێ ناحیێ یە و هەمی مەسیحی یێن کلدانن، ب زمانی سریانی دئاخڤن، ژ چەندین بنەمالا پێکدهێت، وەکی هەمی

مانگێش



گوندان، تێكهەلیێن جڤاكی دناڤبەرا وان دخوورتن و هندەك ژێ بنەمالێن مەزنن وهندەك ژی دبچویك، (د. عەبدولا مرقس) بنەمالێن مانگێشێ ب ڤی رەنگی رێز دكەتن، كو ژ (٤٠) بنەمالا پێكدهێت:

(ئال ئوسی- ئال بلقا- ئال بفرو- ئال بوزا- ئال تبو- ئال تشیكو- ئال جركو- ئال جنتو- ئال جنو- ئال چونا- ئال حوگا- ئال حەكیم- ئال خەنجەرو- ئال خراكە- ئال داود- ئال رابی- ئال رشمی- ئال سارم- ئال سكو- ئال سموقا- ئال شابی- ئال شكرو- ئال شلێ- ئال صارا- ئال صەنا- ئال قاشا- ئال قلو- ئال گلگلا- ئال كنوزا- ئال كێجێ- ئال مرا- ئال مرخو- ئال مقدو- ئال مرخو- ئال منو- ئال موگا- ئال نازی- ئال هوتن- ئال توما- ئال شابو)[٧]، هندەك ژڤان هەر دكەڤن دا ل مانگێش بووینە و هندەك ژی ژ گوندێن دەڤەرێ نەمازە گوندێن مەسیحییان هاتینە مانگێش، هەروەسا پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ هژمارەكا مەزن یا مەسیحییێن مانگێشێ ئەوێن ل باشوور و ناڤەراستا عیراقێ دژیان قەستا مانگێشێ كرن و لێ جهواربووینە.

گوندێن ئاڤاكری ل ناحیا مانگێش ل دووڤ ئەلفابێتێ كو ژ (٤١) گوندا پێكدهێت:

مانگێش- ئەردا- ئەلكیشك- ئەلندكێ- ئۆزمانا- ئێكمالا خابوور- باجلێ- باڤا- بانەسۆرا- بروحەجەرا- بەرۆشكا سەعدوینی- بەرۆشكا ژێری- بەندا- بێسفكا ژێری- بێشینكێ- تلاكرو- چرانێ- چەمترێ- حۆجاڤا- دویلیا- دێراگژنیك- راسلعەین- زرهەوا- زڤنگێ- زیناڤا- زێوكا عەبو- زێوكا كەندالا- سەرئافكێ- شاوریك- كەریلێ- كەمەكا- كورێمێ- كۆڤلی- گرێ پتێ- گەربەراسكێ- گوند كۆسە- گوندك نەبی- مەجلمەخت- ملهمبانێ- ناڤدارا- ناڤشكێ.

گوندێن نەئاڤاكری ل ناحیا مانگێشێ كو (١١) گوندن ب ڤی رەنگی:

ئاشانك- ئالەكینا- بابۆخكێ ژووری- بابۆخكێ ژێری- بالەكا- بۆترشێ- بێسفكی ژووری- دەرگەلا شێخا- دێركێ- زۆراڤا ژووری- زۆرئاڤا ژێری- گەلناسكێ.

كولانەكا مانگێشكێ



## گوندێن خرابە ل ناحیا مانگێش:

چەندین گوندێن خرابە ل سنوورێ ناحیا مانگێش هەنە، دێ هندەكا ژ وان ل ڤێرە دیاركەین و هندەكێن دیتر ژی دێ دناڤ نڤیسینێ دا دیار بن دا بزانین هەر خرابە گوندەك دكەڤیتە سنوورێ كیش گوندی دا، ژبەر هندەك ژوانا هەر ماینە خرابە گوند و وەك كەرت د بەلگەنامە و نەخشەیێن فەرمی دا هاتینە دیاركرن، ئانكو دگەل ئاڤاریێ چ گوندان نینن:

پێزیك- ناڤئاشكا- چەمێ كارێ- شەمرەخ- صادیێ- پیركەڤر- ناڤەشانێ- زێدكا- دوخوركێ- شكەفتە رەش- بادەرەشكێ- پیرمەندا- تەعلسا[٨].

# گوندێن ناحیا مانگێشكێ

## گوندێ ئەردا:

ئەردا ب دووراتییا (١٨كم) دكەڤیتە ئالیێ باكوورێ رۆژئاڤایێ مەلبەندێ ناحیا مانگێشێ، بەلێ چ پێزانین ل دۆر ناڤێ گوندی ب دەست مە نەكەتن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن باڤا و بالەكا.

**باشووری:** گوندێ زێوكا عەبوی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن ملەمبانێ و راسولعێنێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئێكمالا خابووری.

### پێكهاتا گوندی:

ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسكییانە، چەند بنەمالەك ل گوندی هەنە، ژوان: بنەمالێن تەحلێ، بنەمالا عەلێ ئەڤە دو بنەمالێن سەرپشكن، هەروەسا بنەمالا غازی دكەڤندا ژ گوندێ ناڤشكێ (دۆسكییا) هاتینە، بنەمالا كەلەشی ژ گوندێ ملەمبانا خراب هاتینە، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٧٤ كەس بوو[٩]. ژیانا خەلكێ گوندی پتری ل سەر مۆچانە و هەروەسا چاندنێ ژی.

### ئاڤار و جهێن گوندی:

زیركا، خلوا دەحوی شكەفتەكە ل بەرامبەر گوندی ل رەخێ باشوورێ گوندی، خانیێ خابووری، گەرمەنجەلێ، بانیێ زەڤینە، شیفكا مەمیا، گەڕ عەتمانێ، گرێ عەمانی، هەروەسا بیرۆرا و گەلی بزنكی یێ د ناڤبەرا گوندێن ئەردا و ناڤشكێ دا، گركێ بێلایێ ئانكو قەسرێ.

### كانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی رووبارێ گەلیێ ئەردا (گەلی بزنكی)یە كو دچیتە سەر رووبارێ خابووری ل نێزیكی گوندێ بالەكا و چەم و بیستانان ل بەر دچینن، هەروەسا هندەك كانی ژی هەنە بەلێ ئاڤا وان گەلەك كێم بوویە، وەك كانییا گویزێ، كانییا بەستێ، كانییا دارا بەلەك (دارەكا مازی ل سەر كانیێ بوو، مازیێن وی د بەلەك بون)، كانی ڤزڤزك یا دكەڤری دا .

ل گوندی چەند بەرهەمێن چاندنێ ژوان: گەنم، جەهـ نۆك، پیڤاز، دهێنە چاندن و بەرهەمێ داروباری فێقی ژی یێ لێ هەی بەلی ژبەركو خەلكەكێ كێم ل سەر گوندی یە بەرهەمێ چاندنێ ژی كێم بوویە و دەست ژێ بەردایە.

ژ كەوالێن ل ڤی گوندی دهێنە ب خودانكرن: پەز، بزن، مریشك، كێرویشكا كەهی، هەروەسا ل سنوورێ گوندێ ئەردا چەند كەوالێن كیڤی ژی هەنە، وەكی ریڤی، كێرویشكا كیڤی، گورگ، وەردەكێن كیڤی، بەراز، سڤۆرە. ل گوندی كۆمەكا تەیرو تەوالان هەنە، ژوان: تەیرێ شاهین، كولكولی، سڤیانك، رومێلە، كەو، سیسك، پۆر، قرەرەش، تڤیرك، بۆم، بلبل.

ل دەستپێكا سالێن حەفتیان خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن. سالا (١٩٨٨)ێ گوند هاتییە خرابكرن، پشتی سالا (١٩٩١)ێ هاتە ئاڤاكرن ڤە، بەری خراب ببیت نێزیكی ٣٠ مالان بوون و نها ب تنێ ٥ مال ل سەر گوندی دژین.

كۆمەكا شوینوار و كاڤلە گوند دناڤ سنوورێن ڤی گوندی دا هەنە، ژ وان: بێدەركا مستەفای ل رۆژئاڤایێ گوندی، زیركا، باسكێ خرابێ سیڤوی كاڤلە گوندن

دناڤ ئاقارێ ئەردا دا، هەروەسا گرێ بەرامبەر گوندی کاڤلێ دێرەکێ لێ هەیە، ددەمەکی دا هەستیێن مرۆڤان ل ڤی گری دەرکەفتی نە، هندەك ژ گوندیا دیتیە کو (حاجی رەشك) چووینە دناڤ گری دا و دەرکەتیە، دبیت کو دبن ڤی گری ڤە شوینوارێن ئاڤاهیان هەبن[١٠].

## گوندێ ئەلکیشك:

ئەلکیشکێ دکەڤیتە جهەکێ بلند ل رۆژهەلاتێ مانگێش ب دووراتیا (١٠کم) ل بنارا چیایێ ئەلکیشکێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ زێوکا کەندالا.

**باشووری،** چیایە کو دکەڤیتە دناڤبەرا گوندی ئەلکیشکێ و گوندێ سیارەتویکا دا.

**رۆژهەلاتی،** هەڤسنوورە دگەل گوندێن کورەمارك و گەربەراسکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مەجلمەختێ.

## پێکهاتا گوندی:

ژ بنەمالێن گوندێ ئەلکیشکێ: بنەمالا بداخ و بنەمالا ئیبراهیمێ سەعیدی د دەستپێکا سالێن سیهان ژ گوندێ مەجلمەختێ هاتینە کو نها ژی دبێژنە ڤان هەردووان بنەمالا مەجلمەختیا. بنەمالا بادینی، بنەمالا ئەحمەدێ ئەیبی، بنەمالا محێ مستێ کو ئەڤ بنەمالە د کەڤندا ژ گوندێ هەدینەیێ بەرواری بالا هاتینە، ل دووڤ هندەك سەرهاتیا هەتا کو (کۆمکوژیا مەسیحیان یا سێمێلێ) ل سالا (١٩٣٣)ێ مەسیحی ل ئەلکیشکێ مابوون، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١١٥ کەس بوون[١١]. نها خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسکییانە.

## ئاڤار و جهێن گوندی:

مێرگا ستەورێ، بانیا ئەلکیشکێ، مناسبێ مەیدانێ ئەڤە ل رۆژهەلاتێ گوندینە، زەڤیێن چاندنێ نە و هەروەسا نزارێن وان هەمی رەزن، سەردەشتێ، مناسبێ پاسیارکا ل رۆژئاڤایێ گوندی، هەروەسا چەندین جهێن دیار ل چیایێ پشتا گوندی هەنە ژ وانا گەلیێ بیبێ، گەلیێ کنێرێ، گەلیێ قەسرا، گەلیێ فرەهـ، گەلیێ گارانێ، بەڕوی سمتی ل ڤی چیایی چەندین داروبار هەنە ژ وانا بەڕوی و مازی و گهیشك و کوروسك گەلەکێن دی.

## ژێدەرێن ئاڤی:

ژێدەرێن ئاڤی هەمی هشکبووینە تنێ بیرێن سەر ئەرد هەنە، کو بۆ چاندنێ دهێنە بکارئینان، ژ کانیێن بەرێ کو هەبن کانی چنارێ، کانی شێلانێ، کانیا گوندی، ژ بلی بیرەکا بن ئەرد بۆ ڤەخوارنێ هەیە.

ژ بەرهەمێن هەین و دهێنە چاندن ل گوندی گەنم، جەهـ نۆك، گژنیژ، گوندۆر، گولبەرۆژ، باجان سۆرك، باجان رەشك و چەندین زەرزەواتێن دیتر، هەروەسا داروبارێ فێقی و دگەل هەبوونا رەز و باهیڤ و سماقێ.

گوندێ ئەلکیشکێ د روودانێن شۆڕشا کوردستانێ دا هەڤرویشی کاڤلکرن وسۆتنێ بوویە، نەخاسمە ل دەستپێکا شۆڕشا ئەیلۆلێ هاتیە خرابکرن و سۆتن، و چەند کەس شەهید و بریندار بووینە، پاشان گوند هاتە ئاڤاکرن، سالا (١٩٧٤)ێ ژبەر هێرشێن فرۆکەیێن رژێمێ گوند هەتا کو (١٩٧٥)ێ هاتیە بەردان و جارەکا دی ل سالا (١٩٨٦)ێ فرۆکەیان گوند بومبەباران کرینە، سالا (١٩٨٨)ێ گوند هاتە خرابکرن و خەلکێ گوندی دەربەدەری ترکیا بووینە، سالا ١٩٩٢ی گوند هاتە ئاڤاکرن ڤە. سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ لێ هاتیە ڤەکرن کو بەری هینگی بۆ خواندنێ دچوونە گوندێ مەجلمەختێ. بەری گوند خراب ببیت نێزیکی ٤٠ مال بوو و نها نێزیکی ٢٥ مالان ل گوندی نە.

چەندین شوینوار ل ئاقارێ گوندی هەنە دبێژنێ گرێ قەسرێ کو هندەك شوینوارێن قەسرەکێ نە ب

كسلی ل سەرێ گرەكێ هاتییە ئاڤاكرن و هەروەسا هندەك شوینوارێن كاڤلە گوندان لێ هەنە ژ وانا مێرگا ستەورێ، كاڤلێت سەینێ، قەبركی[12].

## گوندێ ئەلندكێ:

گوندێ ئەلندكێ دكەڤیتە دووراتییا (٢٠كم) ژمەلبەندێ ناحیا مانگێش، ناڤێ ئەلندكێ یێ ژ پەیڤا ئەلند هاتی ئانكو تاری گەورگێ بەری سپێدێ دگەل زەلالبوونێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ زێوكا عەبوی.

**باشووری:** گوندێ گەلناسكێ.

**رۆژهەلاتی:** هەڤسنوورە دگەل گوندێن بروحەجەرا و ناڤدارا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ چرانێ.

### پێكهاتا گوندی:

چەند بنەمالەك ل گوندێ ئەلندكێ هەنە، ژوان: بنەمالێن مراد، بنەمالا حەجی، بنەمالا رەشید، بنەمالا ئەحمەد، بنەمالا محەمەد، كو هەر پێنج كورێن حەجی ئیسڤی بوون، ئەڤ بنەمالە دكەڤندا ژ ناڤ (شویكەیا) ل دەڤەرا گەڤەرێ ل باكووری كوردستانێ هاتینە، هەروەسا بنەمالا خەبازا، بنەمالا دەلالێ ژ دەڤەرا بۆتان ژ باكوورێ كوردستانێ هاتینە، هەمی خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسكییانە.

### ژ ئاڤار وجهێن بەرنیاس ل ئەلندكێ:

بەرۆژ، بانییا میرا، كەندالا ل باشوورێ گوندی، بانییا فرنگا ل رۆژئاڤایی، بانییا گهیشكێ، بانییا هنارێ .

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی ب تنێ رووبارێ رووگەرمی هەیە و هندەك

گرێ پتێ ئەو گرێ گوند پێ هاتیە ئاڤكرن



چەم وبیستان ل بەر دهێنە شینکرن. ژ بەرهەمێن چاندنێ ل گوندی داروباری فێقی یە وەك سێڤ، خوخ، مشمش، حلیك، هنار، هژیر .

ئەلندکێ بەری سالێن شێستان گوندەك مەزن بوویە ب چاڤ گوندێن دی یێن دەڤەرێ ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٥٥ کەس بوو[١٣]، بەلێ پشتی کو ل سالا (١٩٨٦)ێ هاتیبە سۆتن و خرابکرن، ب یەکجاری هاتیبەبەردان و نها ب تنێ دو مال ل گوندی هەنە و تەرش و کەوالی ب خوداندکەن.

گیاندارێن کیڤی ل سنوورێ گوندی هەنە، وەکی بەراز، گورگ، حەفتیار، رویڤی، کێرویشك، سڤۆرە، سیخۆر و چەند رەنگێن تەیر و تەوالان وەکی کەو، پۆر، سێسك، ئەلهو، بوم، شاق، تڤیرك، رومێلە .

بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٨)ێ لێ هاتیبەڤەکرن، سالا (٢٠١٣- ٢٠١٤)ێ خواندنگەها وێ ژبەر کێمبوونا خویندکاران هاتەگرتن و نها بۆ خواندنێ دچنە گوندێ شاوریکێ، بەری گوند خراب ببیت نێزیکی ٣٠ مالان بوون و نها ب تنێ دو مال یێ ل گوندی دژین .

ژ شوینوار و کاڤلا دناڤ گوندی دا: گر سیری، مەیدان بادینی دو خرابە گوندن ل سنوورێ ئەلندکێ کو گۆرستانێن وان ژی هەنە[١٤].

## گوندێ ئۆزمانا:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (١٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ سەر رێکا دناڤبەرا مانگێش- زاخۆ، ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن کو ئەفسەرەکێ لەشکەرێ دەولەتا ئۆسمانی ل ڤی جهی ب ناڤێ ئوسمان چاوش ئاکنجی بوویە، ژبەر هندی ئەڤ ناڤە مایە ل سەر گوندی و هاتیبە گوهۆرین هەتا بوویە ئۆزمان- ئۆزمانا، دیارە ئەڤ جهە قەرەقۆلەکا ترکا بوو، بەلێ ل سالوەختەکی ئێشا (تاعونێ) لێدایە، هەتا نها ژی گۆرێن وان جەندرمێن ترکا ل ئۆزمانا د بەرچاڤن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری**، یێ هەڤسنوورە دگەل گوندێن گوندکۆسە و ئێکمالێ.

**باشووری**، گوندێ چرانێ.

**رۆژهەلاتی**، گوندێ ناڤشکێ.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ سەرئاڤکێ.

### بنەمالێن گوندی:

بنەمالا دێوالی، بنەمالا حسەینی، بنەمالا حەسەنی، بنەمالا عەبدولحەلیمی، بنەمالا سەعدی کو هەمی خۆجهێن کەڤنێن گوندی نە، خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسکییانە .

### ئاقارێن گوندی:

ناڤەشانی هەمی چەم و بیستانێن ئاڤی نە، ئەڤ ئاقارە یێ گوندێن ئۆزمانا و ناڤشکێ و سەرئاڤکێ یە، بیرکێ، بانیبا چیچوی بانیەکا بەرفرەهەیە هەمی زەڤیێن چاندنی نە ل بنێ گوندی، بانیبا میسێ، نزارکێ، مشارا درێژ و مشارا کەرا کو هەمی زەڤی نە، گهورا زەڤی نە ژ ئۆزمانا هەتا دگەهیتە گوندێ ناڤشکێ، کۆزێ جهێ چەروانێ پەزی یە دهێتە پاوانکر.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێ ئاڤا گوندی (رووبارێ ناڤەشانێ)یە کو سەرەکانییا وێ ژ گوندێ سەرئاڤکێ دهێت، کانییا نزارکێ، کانییا محەمەد سالحی، کانییا سپینداری ل ناڤ گوندی، کانییا پارسی ل بنێ گوندی، کانییا خەتیبی، کانییا سیلکێ، کانی قەپوکێ، نها ئاڤا وان گەلەك یا کێم بووی و چ مفا ژێ ناهێتە وەرگرتن .

بەرهەمێن چاندنی ل گوندی گەنم، نۆك، جەهـ باجان سۆرك، گوندۆر، گولبەرۆژ دهێنە چاندن و داروبارێ فێقی وەك خوخ، سێڤ، هنار، مشمش، تری، گویز، باهیڤ ژی هەنە.

ل گوندی چەندین کەوال دهێنە خودانکرن مینا پەز، بزن، مریشك، عەلۆك، مێشێن هنگڤینی، هەروەسا ل ئاقارێ گوندی ژی گیاندارێن کیڤی هەنە وەك بەراز، گورك، ریڤی، کێرویشك، سڤۆرە، کیژك، تویری، ژ بلی تەیر و تەوالان مینا کەو، پۆر، تڤیرك،

سیسك، كۆتر، ئەلهو .

چەند كاڤلە گوند ل ئاڤارێ گوندی هەنە، ئەو ژی ناڤەشانێ، نزاركێ، بیركی.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٨٤ كەس بوو[١٥]، گوند جارەكێ ل هەوا ئەنفالان هاتیە سۆتن و خرابكرن و پشتی سالا (١٩٩٢)ێ هاتیەئاڤاكرن ڤە، بەری گوند خراب ببیت نێزیكی ٧٠ مالان بوون، نها نێزیكی ٢٥ مال ل گوندی هەنە. ل دەستپێكا سالێن شێستان خواندنگەهـ لێ هاتیە ڤەكرن و مزگەفت هەر ژ كەڤن هەبوویە[١٦].

## گوندێ ئێكمالا خابووری:

گوندێ ئێكمالا خابووری ب دووراتیا (١٦كم) دكەڤیتە باكوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا مانگێش، ل دۆر ناڤێ ئێكمالە هاتیە زانین كو بەری نێزیكی ٢٠٠ سالان ئێك مال ب تنێ ل سەر گوندی بوویە ل جهەكی دبێژنێ (كانی سلو) ل رۆژهەلاتێ گوندی و هوسا ناڤێ گوندی بوویە ئێكمالە. و ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسكیان.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ بالەكا.

**باشووری:** گوندێ ناڤشكێ.

**رۆژهەلاتی:** گوند یێ هەڤسنووره دگەل گوندێ ئەردا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گوند كۆسە.

### پێكهاتا گوندی:

بنەمالا فارسی ژ ناڤشكێ هاتینە، بنەمالا ئەحمەدی، بنەمالا صەیدا ژ ناڤ كۆچەرا هاتینە، بنەمالا شەموی، بنەمالا قادوی ژ ناڤ نێروەیا هاتینە.

ژیانا خەلكێ گوندی نها هەمی ل سەر مۆچا و كارێ چاندنێ یە.

### ئاڤار وجهێن بەرنیاس ل گوندی:

هندەك نهال هەنە وەك نهالا مەخەلۆك، نهالا دەهۆلا، نهالا كانی صدقیكێ، بان قاسم زەڤی نە، رەزێ پیرێ، دەحلێ زێدی، گۆهورا گول زەرێ، چالا عەمەر ئاغا، سەر تلخ ل سنوورێ گوند كۆسەی، كورسیێ حەمكێ، نزاركێ، چەمێ مانگێ ل بەر رووبارێ خابووری، هندەك ژ چەم وبیستانێن ئێكمالەیا یێ ل سەر رووبارێ خابووری هەین .

بەرهەمێن چاندنێ ل گوندی پتر بیستان وچەمێن ئاڤی نە، داروبارێ فێقیێ وەكی خۆخ، سێڤ، حلیك، مشمش، هنار، هژیر یێن دناڤ دا هەی، هەروەسا رەزێن تری هەنە، زێدەباری چاندنا گەنم، جەهـ نۆك وەك دەرامەتێ دێم .

### زێدەرێن ئاڤێ:

زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی بۆ چاندنێ مفا ژ رووبارێ خابووری دهێتە وەرگرتن، هەروەسا چەندین كانی ژی ل سنوورێ گوندی ژی هەنە، لێ ژبەركو كێم بووینە مفا ژێ ناهێتە وەرگرتن، وەكی كانی گارس كو گارس ل بەر دچاند، كانی سلو، كانیا گوندی، كانی تەمەر، كانی حەسێ .

گوند چەند جاران هەتا سالا (١٩٨٨)ێ هەڤرویشی هێرشێن عیراقێ بوویە و ل هەوێن ئەنفالان، پتری ٧٠ كەسان كو هەمی زەلام بوون بووینە قوربانی و هاتینە بێ سەروشوین كرن، سالا (١٩٩٢)ێ گوند جارەكادی هاتەئاڤاكرن ڤە، بەری گوند خراب بیت نێزیكی ٨٠ مالان بوو و نها ٣٠ مال یێن ل گوندی. ل داوییا سالێن حەفتیان خواندنگەهـ ل گوندی هاتیە ڤەكرن[١٧].

## گوندێ باجلێ:

گوندێ باجلی: ب دووراتیا (٢٠كم) دكەڤیتە ئالیێ باكوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا مانگێش، سەر لێڤا رووبارێ خابووری، ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن د دەمەكی دا ئەڤ جهە بازێر بوویە و كەسەك هەبو

ب ناڤێ (فەتاح پاشا) باج ژ خەلکی وەرگرتی یە و هوسا ناڤ مایە (باج لێ) ئانکو جهێ وەرگرتنا باجێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** رووبارێ خابووری.

**باشووری:** گوندێ سەرئاڤکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندی هەڤسنووره دگەل گوندێ گوندکۆسە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ چەمترێ.

**پێکهاتا گوندی:**

چەند بنەمالەك ل ڤی گوندی هەنە، ژوان: بنەمالا شێخا (شێخ غیاث) کو شێخ د بنەکۆکا خۆدا ژ گوندێ بریفکا هاتینە، بنەمالا سلو بەندا، بنەمالا حەسەنی دکەڤن دا ژ ناڤ کۆچەرا هاتینە، بنەمالا مامزدینیا ل ناڤەراستا سالێن چلان ژ ناڤ سندیا هاتینە.

ژیانا گوندیا نها ل سەر کارێ چاندنێ و کارمەندیا حکۆمەتێ یە، و وەك عەشیرەت مالێن شێخا دۆسکی نە، یێن دیتر ژی کۆچەر و سندی .

سالا (٣٧٣مـــش/٩٨٢ز)ێ شەرەکێ دیرۆکی دناڤبەرا (میر بادێ دۆستەکی) و دەولەتا بووەیهیا بەغدایێ ل ڤی گوندی چێببوو، کو بەری هنگی بادی سەمامولدەولەیێ بووەیهی شکاندبوو، دا کو تۆلا وێ شکەستنێ ڤەکەت، میر سەمامولدەولەی سوپایەکی چەند هزار لەشکەری بەرهەڤکر، سەرکێشیا وی لەشکەری (ابو القاسم سعد الحاجب) دکر، ژ بەغدا هنارتە مووسلێ دا ژ وێرێ بچنە شەرێ لەشکەرێ میربادێ دۆستەکێ میرێ دەولەتا دۆستەکی ل کوردستانێ. هەردو لەشکەرێن بووەیهی و دۆستەکی کو هژمارا وانا نێزیکی (٢٠,٠٠٠) بیست هزار کەسا بوون، ل (باجلێ) ل رۆژهەلاتا زاخۆ گەهشتنە ئێکودو[١٨].

میرباد و لەشکەری وی یێ دۆستەکی ب دووڤ را بەزین هەتا کو گەهشتینە ناڤ باژێرێ مووسلێ، چەند هەیڤەکا میرباد و لەشکەرێ خۆ ل مووسلێ و رەخۆدۆرا جهوار بوون. خویك ژ خەلکێ مووسلێ و رەخۆدۆران وەرگرتن، (سعد الحاجب) و لەشکەرێ وی مووسلێ ژی بەردا و چوونە تکریتێ[١٩].

**جهـ و ناڤارێن دیار ل گوندی:**

زیارەتێ کیڤیکێ، چالا فەلەی ل رۆژهەلاتێ گوندی، کەرەمێوێ، کانی قەرامکێ، کۆن سیخورکێ ل باشووری، وارێ عەرەبا، ئاقدێ، گەرا بەکری ل رۆژئاڤای، زڤرکێ، گەرا تینێ، گەرا تەحتوکا، ل باکووری ل سەر رووبارێ خابووری .ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی یێ سەرەکی رووبارێ خابووری یە کو هەمی چەم و بیستان ل بەر دهێنە چاندن و ئاڤدان، سکرێ باجلێ ل سەر خابووری یە، هندەك کانی ژی هەنە وەك کانییا ژنکا، کانی بەناڤێ .

ل گوندی چاندن دهێنە کرن، مینا: گەنم، جەهـ گوندۆر، باجان سۆرك، زەبەش دهێنە چاندن، هەروەسا داروبارێ فێقی وەك سێڤ، خۆخ، هنار، حلیك، ترێ تایفی هەیە، دگەل هەبوونا دارێن باهیڤ و دارێن سپینداران .

ل گوندی گیانەوەرێن پەز، بزن، مریشك، عەلۆك، قاز، وەردەك دهێنە ب خودانکرن. زێدەباری هەبوونا کەوالێن کیڤی وەك بەراز، گورگ، ریڤی، تویری، کێرویشك، سیخور، سڤۆرە. هەروەسا هندەك رەنگێن تەیروتەوالا ژی هەنە وەك کەو، پۆر، سیسك، بوم، تڤیرك، قرەرەش، قشقل، مریشکێن ئاڤی، شاق، زەروێلە، سڤیانك .

هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ٨٢کەس بوو[٢٠]، ل دەستپێکا سالێن هەشتیان خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، مزگەفت چ جاران نەبوویە، نها یا دهێتە ئاڤاکرن، ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند دهەوێن ئەنفالان دا هاتییە خرابکرن و جارەکا دی پشتی سەرهلدانێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە، بەری گوند خراب بیت نێزیکی ٣٠ مالان بوو، نها ١٥ مال یێ ل گوندی.

### ژ جهێن ناڤدار ل ڤی گوندی:

دارا ئاڤدێ، کاڤلێ سلوی نیشانێن دو کاڤلە گوندانن، هەروەسا دو گۆرستان لێ هەنە و گۆرەگ یێ بتنێ یە یێ ڤەدەرە بۆ مێژوویەکا کەڤن دزڤرن[21].

## گوندێ باڤا:

گوندێ باڤا: دکەڤیتە دووراتییا (٣٠کـم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش ل باکوورێ رۆژئاڤایی سەر لێڤا رووبارێ خابووری، ل دۆر ناڤێ گوندی یێ ژ (با و ئاڤ) هاتی، هوسا بوویە باڤا، ژبەرکو بایەکێ بهێز لێ دهێت و رووبارێ خابووری دبەردا دبووریت.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووباری خابووری.

**باشووری:** گوندێ بالەکا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ راسلعەینێ و ئەردا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گوند کۆسە.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ ئێك بنەمال پێکدهێت، دبێژنێ بنەمالا (سەید ئیزدین) کو دبنیات دا ژ گوندێ (بانکا) یێ دەڤەرا دۆسکییا ژ سەرێ چیایێ مەتینی هاتینە بالەکا، پاشی ل داوییا سالێن پێنجیان هاتینە باڤا و گوند ئاڤاکرینە، گوند ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسکییانە .

### ژ جهێن دیار ل گوندی:

گرێ باڤا، چەمێ عەمەری، شـەورا، کەراڤا ژێری، چەمی شیخویی، کەراڤا ژۆری، کەرفرین ل سەر رووبارێ خابووری، دارا پیرۆیی، هەڤشێ تاهرێ ترکویی، بەنۆکا شەیتانی، کورهنارکا، جورنێ مەزن، جورنێ بچویك، چالا حوسەینی، لەفتێ، نهالا ژنکێ، هەڤشێ کەپەنی، نهالا شکەفتی، شکەفتا پیرەمیری، دەحلی بەرازی، گرکێ فەلەیی، کورەتویی، سیلاڤا هرچێ، گرێ ب ڤاچ، مێرگا ب شافر .

### زێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی پتر ل سەر رووبارێ خابووری یە و چەم وبیستانان ل بەر دچینن، بەرهەمێن چاندنێ ل گوندی دمشەنە و دەرامەتی ئاڤی و یێ دێم ژی لێ هەیە مینا داروبارێ فێقی و دارێن سپینداران، هەروەسا گەنم و نۆك و باجان سۆرك و گوندۆر و گولبەرۆژ دهێنە چاندن .

### شوینوارێن بەرچاڤ ل گوندی:

کاڤلێن سەرێ گرێ باڤا، کاڤلێن کەڤنە گوندێ زویرکا، گۆرستانا دارا پیرویی .

گوند د سەردەمێ شۆرشا کوردی دا چەندین جاران کەتییە بەر هێرشێن حکۆمەتێن عیراقێ یێن وی سەردەمی هەتاکو ل هەوێن ئەنفالان گوند هاتییە خرابکرن و خەلکێ گوندی هاتینە ئەنفالکرن و یێن مایی ژی هەمی مشەختبوونە ترکیا، سالا (١٩٩٢)ێ جارەکا دی زڤرینە سەر گوندی ڤە و نها چەند مالەك ل سەر گوندی نە. لێ ل داوییا سالێن حەفتییان خواندنگەهـ هاتە ڤەکرن، بەلێ نها ژبەر کێمییا زارۆکان دچنە گوندی راسلعەینێ، هەروەسا بەرێ خواندنگەهێ مامۆستایی ئایینی هەبوو و وانە دگۆتنە زارۆیان[22].

## گوندێ بانەصورا (بانەسۆرا):

گوندێ بانەسۆرا: دکەڤیتە دووراتییا (١٢کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێکێ دبێژن بانییەکا بلندە و یاسۆرە، یا دووێ دبێژیت ل دەمی میری کۆرە (میری سۆران) هاتییە شەری دگەل میرگەها بەهدینان، ل ڤی جهی ما بوو، کوین و رەشمالێن خۆ ل ڤێرێ ڤەدابوون، ناڤێ وێ ژ هندێ هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن زێوکا عەبوی و دویلیا.

**باشووری:** گوندێن ئاڵەکینا وبابۆخکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ حۆجاڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شاوریکێ.

### پێكهاتا گوندی:

بنەمالا شابازی، بنەمالا جندی، بنەمالا شەهوانی، بنەمالا كوردێ، بنەمالا حەلیمایێ، بنەمالا تاهر مستوی، هەمی ژ كەڤن وەرە خۆجهێن گوندی نە. د دەمێ نهادا ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر مووچە و كارێ چاندنێ یە، هەمی خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسكی نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٤٩ كەس بوو[٢٣]، بەری گوند خراب بیت نێزیكی ٣٠ مالان بوو ونها ژی هەر ٣٠ مال ل گوندی نە.

### ژ جهێن دیار ل بانەسۆرا:

گرێ هەڤرانا ل رۆژئاڤایێ بانەسۆرایە و رەخێ دی گوندێ حۆجاڤایە، گركێ خەزینێ، نهالا زێرا، نهالا جنیكا، هەڤشینێ مریشكێ، باسكێ كیسك و قەلینا ل باكوورێ گوندی، بانەكەتی كو ئاقارەكێ هەڤپشكە یێ گوندێن دولیا و بانەسۆرا و حۆجاڤا .

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی: بیرەكا بن ئەرد بۆ ڤەخوارنێ هەیە، دیسا بیرێن بن ئەرد یێن كەسایەتی بۆ چاندنێ ژی هەنە، هندەك كانی ل گوندی هەنە بەلێ گەلەك كێم بووینە و چ مفا ژێ ناهێتە دیتن، وەك كانی كەلوتكێ، بیرا گوندی، سەریبرێ، كانی فستیكێ، كانی سولین .

سەردەمێ دەمی شۆرشا ئەیلوولێ سالا (١٩٦٣)ێ جارەكێ گوند هاتییەسۆتن، پاشی ل ئەنفالان هاتە خرابكرن و ژناڤبرن و جارەكا دی ل سالا (١٩٩٢)ێ هاتە ئاڤاكرن.

سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، مزگەفت دكەڤن دا هەبوویە[٢٤].

## گوندێ بروحەجەرا:

گوندێ بروحەجەرا دكەڤیتە دووراتییا (١٧كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش ژ ئالیێ باشوورێ رۆژئاڤای

گرێ هەڤرانا



ڤە، ل سەرێ گرەكێ بلند. ناڤێ بروحەجەرا ژ ناڤێ برو هەجەرا (ئیبراهیم هەجەر) هاتییە، كەسەك بوو خودانێ وان رەزێن پشتا گوندی بوویە و پاشان ناڤ هاتییە گوهۆرین و بوویە بروحەجەرا.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ ناڤدارا.

**باشووری:** گوندێ بۆترشێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شاوریكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئەلندكێ.

**پێكهاتا گوندی:**

دو بنەمال ل گوندی هەنە، بنەمالا عەمەری و بنەمالا سەعدی هەردو براێن ئێكبوون، ل سالا (١٩٤٢)ێ ژ گوندێ گەلناسكێ هاتینە، ئەڤ گوندە یێ ژ خەلكێ گوندێ شاوریكێ كڕی و ئاڤاكری، ژیانا گوندیا ل سەر چاندنێ یە، خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسكی نە.

ژ جهێن بەرنیاس ل گوندی: چەموكا، جنیكا جندوی ل باشوورێ گوندی نە و هەمی رەز و چەمن، ئاڤیكا پیركێ بیستانن، نهالا ڤاقیژ ل رۆژهەلاتا گوندی، گوندەكێ ئاڤی یە و ئاڤارێ وان پتری چەم و بیستانن و رەزن.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی رووبارە دبێژنێ رووبارێ رووگەرمی ژ گەلیێ گەرمی دهێتن و پاشان رووبارێ سادیێ دهێتە سەر و ل دوكەرا ناڤدارا دبنەئێك، ئەڤ رووبارە دچیت تا دگەهیتە سەر رووبارێ خابووری، هەروەسا كانی ژی هەنە وەك كانیا گوندی، كانیا نهالكا ئیزدیا، هەمی داروبارێ ڤیقی ل بەر ڤێ ئاڤێ دهێتە چاندن، هەروەسا بیرەكا ژێر ئەرد بۆ ڤەخوارنێ هەیە.

ل گوندی گیانەوەرێن پەز، مریشك، عەلۆك، قازا ب خودان دكەن، هەروەسا چەندین گیانەوەرێن كیڤی ژی ل ئاڤارێ گوندی هەنە وەك بەراز، ریڤی، گورگ، كێرویشك، سڤۆرە.

خواندنگەهـ چ جاران ل گوندی نەبوویە و هەتا نها خویندكار بۆ خواندنێ دچنە گوندێ شاوریكێ.

گوند ل سالا (١٩٦٩)ێ ژلایێ حوكمەتا عیراقێ ڤە هاتە سۆتن و خەلك ما ل كۆلكا، ل سالا (١٩٨٦)ێ جارەكا دی هاتە سۆتن و پشتی ئاڤاكرین جارەكادی ل سالا (١٩٨٧)ێ تانكێن دوژمنی تۆپ دهاڤێتنە گوندی و زیان گەهاندینێ هەتا كو ل هەوێن ئەنفالان جارەكا دی گوند هاتییە سۆتن و خرابكرن، سالا (١٩٩٢)ێ جارەكا دی هاتییە ئاڤاكرن ڤە، ل سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ٣٢ كەس ل گوندی دژیان[٢٥]، گوند بەری خراب ببیت ٦ مال بوون، نها ٩ مال یێ ل گوندی.

شوینوارێن ئاشێن ئاڤی ل گوندی هەنە، ل سالێن (١٩٧٠، ١٩٨٧)ێ ئاشەك هاتییە نویژەنكرن و دایە كاری دگۆتێ ئاشی (عەلی خلیل)[٢٦].

## گوندێ بەرۆشكا سەعدینی:

(بەرۆشكا سەعدینی) گوندەكێ ناڤدارە، گەلەكێ مەزنە، جهـ و ئاڤارەكێ بەرفرەهـ ژی هەیە، گوند ب دووراتییا (١٠كم) دكەڤیتە رۆژئاڤایێ مەلبەندێ ناحیا مانگێشێ، هەڤ توخیبە دگەل سەنتەرێ ناحیێ. ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن یا بەر رۆژە لەوا هاتییە ناڤكرن ب بەرۆشك و سەعدوون ئاغا خەلكێ گوندی بوویە و لەوا ب ناڤێ وی سەعدوون ئاغا هاتییە ناڤكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** رووبارێن خابوور و سپنە.

**باشووری:** گوندێن كورێمێ و گوندێ دولیا.

**رۆژهەلاتی:** سەنتەرێ ناحیا مانگێش.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن ملهمبانێ و راسلعەینێ.

**پێكهاتا گوندی:**

ژ بنەمالا ئاغای، بنەمالا سەلیم، بنەمالا ئەحمەد، بنەمالا خالد، بنەمالا ئوتا، بنەمالا هەلالی، بنەمالا پێ شیخی، بەرۆژیری، بنەمالا شەموی و بنەمالا

شێخا پێكدهێت، هەمی خۆجهێن كەڤنێن ڤی گوندی بووینە، ژیانا گوندییا ل سەر كارێ چاندنێ و كاسبكاریی و كارمەندیا حكۆمەتێ یە، ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسكییا نە، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٠٦٤كەس بوو، ب ڤی رەنگی مەزنترین گوندێ دوسكییان بوو[٢٧].

## جهێن دیار ل گوندی:

گرگێ مەندێ، شیڤ توخیبێ زەڤی نە ل رۆژهەلاتی، گهورا ئێكمالێ، بانیا گێرێ، بەناڤیكی، گهورا خزینێ، گهورا تەیبی، هەڤش كیركێ، گهورا تینێ، گهورا بیركێ، گهورا شەمێ ل باشووری گوندی، شیڤا رەزا، شیڤ بیكی، بان مازیكی، بان شكەفتێ، سیلاڤا ئاف تەزی، ل بەرخابووری هەمی چەمن وەك چەمی زیارەتا، چەمی مەدلسێ، هەروەسا ل باشوورێ گوندی هەمی زیرن دبێژنێ زیرێن بەرۆشكێ. ئاقارێن گوندێ بەرۆشكا سەعدوونی و بەرۆشكا ژێری دكەڤنە گەل ئێك و د دەمەكی دا هەردو ئێك گوند بوون.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی رووبارێ خابووری یە ل باكوورێ گوندی، ل سەر خابووری دو جوو یێن ئاڤێ هەنە، جۆیا چەمێ ئاڤیا و جۆیا چەمێ مەدلسێ و چەمێن فێقی و بیستان پێ دهێنە ئاڤدان، هەروەسا چەند كانی ژی هەنە وەك كانیا بەناڤیكێ، كانیا ئێكمالێ، كانیا دارا مەوكێ، كانیا شیڤ توخیبی، كانیا سلو كوری، كانیا گەرا گویزێ، كانیا شیڤا رەزا، كانیا خلنگێ، كانیا گهورا هەرچەندە نها هندەك ژ وانا كێم بووینە بەلی هندەك بیستان وچاندن ل بەر هندەكێن دی هەنە .

د شۆرشا كوردستانێ دا گوند چەند جاران هاتییە خرابكرن، سالا (١٩٦٣)ێ ب دەستێ حكۆمەتا عیراقێ یا وی سەردەمی هاتییەخرابكرن، سالا (١٩٨٦)ێ خرابیوویە و ل سالا (١٩٨٨)ێ ل ئەنفالان هاتییە كاڤلكرن و جارەكا دیتر پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ گوند هاتییە ئاڤاكرن ڤە، نها نێزیكی ٢٠٠ مالا ئاكنجیێن گوندی نە كو بەری خراب بیت

گوندێ بەرۆشكا سەعدوونی



نێزیکی ٥٠٠ مالان بوون.

ل ناڤەراستا سالێن پێنجیان دا خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن، سالا (١٩٩٥)ێ بنگەهێ ساخلەمیێ هاتییە ڤەکرن، مزگەفتا وێ یا کەڤن بوو، ل دەمەکی خواندنگەها ئایینی بوو .ئەو خواندنگەهە (عەبدولا ئەفەندی) ئاڤاکربوو، شێخ (محەمەدێ بەرۆشکی) ژ مامۆستایێن ناڤدارێن ڤێ خواندنگەهێ بوو، ژ شاگرد و سەیدایێن ژێهاتی بوو، ل سالا (١٣٢٤مش/ ١٩٠٥ز)ێ وەغەرکرییە. وی دەهەمەنێ چەند دەستنڤیسا کرییە، دیسان برایێ وی شێخ ئەحمەدێ بەرۆشکی (ئەوێ ل سالا ١٩٠٥ ێ وەغەرکری) و شێخ (عەبدولا بەرۆشکی) ئەوێ ل سالا (١٩١٩ز)ێ وەغەرکری، وانە ل ڤێ خواندنگەهێ دگۆتن[٢٨].

کاڤلە گوندێن رەخـۆدۆرا: ئیکمالێ، دنگێ ل بەرخابووری، گرکێ مەندێ ل رۆژهەلاتی[٢٩].

## گوندێ بەرۆشکا ژێری:

گوندێ بەرۆشکا ژێری دکەڤیتە دووراتییا (٢٠كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش، ناڤێ گوندی بەرۆشك ژ (بەر بەرۆژ) ئانکو بەری وی ل رۆژێ هاتییە، نها گوند ل سەر رووبارێ خابووری هاتییە ئاڤاکرن نێزیکی (٥كم) ل باکوورێ گوندێ کەڤن ل سەر پرا گوندی دوکەرێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن تەحلاڤا و دوکەرێ.

**باشووری:** گوندێ بەرۆشکا سەعدوونی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کورێمێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ راسلعەینێ.

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا جبو، بنەمالا تەمەر، بنەمالا پیرو، ئەڤە هەمی خۆجهێن کەڤنێن گوندی نە، ژیانا گوندییا بارا پتر ل سەر خودانکرنا کەوالی و کارێ چاندنێ یە، گوند ژ عەشیرەتا دۆسکییانە.

### جهێن بەرنیاس ل گوندی:

زراڤکێ، کورا ئیبراهیم پیرا، هژیرا عەزی، کورا فرەهـ ل رۆژهەلاتی، دەحلکێ گورگا، بانییا سەدری، کورا ب تەحلی، گرێ حاجی باهیڤکی جهی نها یێ گوندی، شکەفتا کوردستاریا، باسکێ کاریتەی، بانییا شێخ کەری، بانییا حەمەجانی، بانییا ب گهیشك، چالا پلنگی، گەلیێ بەروی کۆن، کورا حەفتێ، تەحتە ستیرێ، ئاڤارێن گوندێ بەرۆشکا سەعدوونی و بەرۆشکا ژێری دکەڤنە گەل ئێك.

### زێدەرێن ئاڤێ:

رووبارێ خابووری یە کو چەمێن داروباری و بیستانان و سپینداران ل بەر دچینن، هەروەسا ل گوندی گەنم و جەهـ دهێتە چاندن و زێدەباری هەبوونا رەز و باهیڤ و سماقێ.

گوندێ بەرۆشکا ژێری ل دەستپێکا سالێن پێنجیان هاتییەخرابکرن و بەردان، پتریا وان چوونە گوندێ بەرۆشکا سەعدوونی و پاشان ل سالا (١٩٨٣)ێ هاتییەڤە ئاڤاکرن، هەتاکو ل ئەنفالان هاتییە خرابکرن، سالا (١٩٩٣)ێ جارەکا دی هاتەڤە ئاڤاکرن، نها چوار مال یێ ل گوندی دژین، بەری خرابیوونا گوندی ژی هەر سێ مال بوون. نها چ خزمەتگوزاری ل گوندی نینن.

### شوینوارێن گوندی:

نها بەرۆشکا ژێری یا کەڤن مایە کاڤلە گوند، دارا میری کاڤلە گوندە ل رۆژئاڤایێ گوندێ کەڤن، هەروەسا کەڤرەکێ هەی دبێژنێ کەڤرێ ئەصحابا وەك شوینوارەکی یە ل گوندی[٣٠].

## گوندێ بەندا:

گوندێ بەندا: ب دووراتییا نێزیکی (٨كم) دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیێ، دکەڤیتە سەر رێکا مانگێش- بامەرنێ، بەندا بخو ژ سێ گوندا پێك هاتییە (پیرمەندا د ناڤبەرا گوندێن بەندا و کورێمێ و تەعلسا ل باکوورێ گوندی ل سەر سپنەی و گوندێ

ژووری ل سەرێ گوندی) كو نها دبێژنێ بەندا، رامانا بەندا ئانكو جهەكێ گرتی ژبەركو بەندا د چالەكێ دایە و دەروبەرێن وێ ملبوون و جهەكێ گرتییە لەوا دگۆتێ بەندا، بۆچوونەكا دی ئەوە كو ل ڤێرێ بەندێن سترانا دهاڤێتنە بەر ئێكودو، و بوویە بەندا.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** رووبارێ سپنەیە كو د كەڤیتە د ناڤبەرا گوندی و گوندێن غلبیشی و هەمزانێ.

**باشووری:** گوندێن زێوكا كەندالا و مەجلمەختێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زڤنكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن كورێمێ و كۆڤلی نە.

### پێكهاتا گوندی:

ژ بەر كو گوند د كەتە سەر رێكا سەرەكییا دەشت و زۆزانان لەوما گەلەك خەلك لێ ئاكنجی بووینە و بووینە خەلكێ گوندی، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ژمارا گوندی ٤٣٠ كەس بوون و نها ٦٠٠ سەرك خێزانن و ٣٠٠٨ كەسن، پێكهاتینە ژ ڤان بنەمالان:

بنەمالا شێخا ئەڤە د كەڤندا ژ دەڤەرا شەرنەخێ هاتینە، بنەمالا رەحێ، بنەمالا عەبدی ئەڤ هەردو بنەمالە د كەڤندا ژ گوندێ (پێ پەرخا) ژ ناڤ رێكانییا هاتینە و ژ گوندێ تەعلسا كەڤن هاتینە بەندا، بنەمالا زەبیحا ژ بنیات كورێمەیی نە، بنەمالا مەلەمینا ژ بنیات زێدكن، بنەمالا گەورا، خۆ جهێن كەڤنێن گوندی نە، بنەمالا ریتا ئەو ژی ژ بنەمالێن كەڤنێن گوندی نە، بنەمالا پیرمەندیا ئەڤە ژ گوندێ پێرمەندا هاتینە كو كاڤلە گوندەكە دكەڤیتە دناڤ ئاقارێ بەندا یێ نها، مالا هیرێ ئەڤە ژ گوندێ مێرسیدا ژ ناڤ مزویریا هاتینە، هەر وەسان چەندین مالێن دی هەنە وەكی سلێمانی (مهەمەدانە)، شەمبی (دبێژن ژ تەلەعفەر هاتینە)، مەلا محەمەدی (ژ بامەرنێ هاتینە)، مامیسی (ژ مێرسیدا)، سادقی (شەرەفانە)، عەبدولرەحیمی (ژ ئامێدیێ)، سلو سندی (ژ گوندێ تەوكێ- سندی)، سلێمانێ رێزباری (ژ گوندێ بابگۆریا)، مستەف عەبدولا (ژ گوندێ ئۆزمانا)، عەلیكێ بچویك (ژ گوندێ نێشە- هەكاری).

ژ گوندێن سەر ب عەشیرەتا دۆسكی یە.

ئاقارێ ڤی گوندی د كەڤیتە كەرتێ ١٥ رووبەرێ گشتی ٧٦١٧ دۆنەمن، ژ وانان ٥٥٩٧ دۆنەم عەردی كەڤری یە و ٢٠٢٠ دۆنەم ب كێر چاندنێ دهێت.

ئاقارێ گوندی ب گشتی شیڤ و نهال و نزارن و یێ باشە بۆ خودانكرنا پەزی و چێكرنا رەزان و هەمی دەرامەتێ دێم، ل ئاقارێ گوندی گەلەك رەز وسماق و چەندین بیستان و چەم هەنە، ژ ئاقارێن دیارێن بەندا كاژا وەیسی، بانیكێ، پیرمەندا، سەر ئەڤرازی رەزێن تری نە، كادزا هەمی چەمن، شیڤا گوندی هەمی بیستان و دار و بارە دكەڤیتە د بن گوندی دا، دارا پاشای هەمی رەزن، سیلاڤا مەندو سیلاڤەكا ئاڤێ یە، بیستانان ل بەر دكەن، مەرانكێ، بانێ، جۆما گولا زەرێ، ناڤ پەحنێ هەمی زەڤی نە بۆ چاندنێ بكاردئینن، نزاری ل باشوورێ گوندی یە، هندەك رەز لێ هەنە ژ بلی داروباری بەروی ومازی یە .

### ژێدەرێن ئاڤی:

ل گوندی كانی و بیرێن سەر ئەردن بۆ چاندنێ مفا ژێ دهێتە دیتن، ژوانا ژی كانییا كویر، كانییا چەما، كانییا بەرگوندی، ئاڤا گوندێ ژووری، كانیكا شڤانا، كانییا بەر گەورا، كادزا، سیلاڤا مەندوی، بیرا بن ئەرد هەیە بۆ ئاڤا ڤەخوارنی، ل ڤان سالێن داویێ گەلەك كانی هشك بووینە لەوما چەند بیر هاتینە كۆلان و چەند سكرێن بچویك بۆ چاندنێ هاتینە چێكرن.

گوندێ بەندا ژ بەر هەبوونا بارەگایێن پێشمەرگەی ل وێرێ چەند جاران د رووداتێن شۆرشا كوردستانێ دا هاتییە بەردان و خرابكرن، جارا ئێكێ ل (١٩٦١/١١/١٧)ێ دەمێ بارزانی هاتییە گوندی ب فرۆكەیان هاتییە بومبابارنكرن، سالا (١٩٦٣)ێ گوند هاتبوو بەردان، سالا (١٩٦٤)ێ چەتان خانی هەمی خرابكرن و سۆتن، سالێن (١٩٧٤، ١٩٨٧)ێ دیسان گوند هاتبوو بەردان، سالا (١٩٨٨)ێ گوند كەتییە بەر هەوا ئەنفالان و ب ئێكجاری هاتییە خرابكرن و گەلەك ژ خەلكێ

وێ بێ سەروشوینکرن، ل سالا (١٩٩٢)ێ ڤە ل سەر جادا سەرەکی یا مانگێش- بامەرنێ هاتییە ئاڤاکرن، بەلێ گوندێ کەڤن د چالەکا کویر دا بوو ل باشووری گوندێ نها.

بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل سالا (١٩٥٨)ێ د خانیێ بەردەستکێ خواندنگەهێ ڤە (تاهر ئەحمەد) ڤە هاتبوو ڤەکرن، پاشی ل سالا (١٩٥٩)ێ نایف حەسەن ژ خەلکێ گوندی خواندنگەهەك ئاڤاکر و چوونە تێڤە ڤە و ل سالا (١٩٧٤)ێ د خانیێ جەهوەر سەعیدی ڤە هەتا سالا (١٩٧٩)ێ کو حوکمەتێ ئێك ئاڤاکر. هەروەسا دکەڤن دا مزگەفت ژی ل بەندا هەبوو. دیسان خواندنگەهەکا ئایینی یا بەرکەڤتی ل ڤی گوندی بوو، مەلا ئەحمەدێ بەندی (ئەوێ ل سالا ١٩٢٥ێ وەغەرکری) وانە لێ دگۆتن، مەلا ئەحمەد ل ئەترویشێ هوی خواندن و زانینێ ببوو، پاشی بەر ب گوندێ سپینداری (بەرواری ژێریا) ڤە هات، ژ وێرێ ژی هاتە گوندێ بەندا و وانە دگۆتن، هەتا ل وێرێ وەغەر کری. پشتی وی شێخ مەزهەرێ مایی بۆ مەلایێ گوندی هەتا سالا (١٩٢٧)ێ پشتی کاودانێ دەڤەرا بەرواریا ژ بەر هاتنا ئینگلیزی نەخۆشبووی. دیسان ژ مامۆستایێن ڤێ خواندنگەهێ (محەمەد ئەحمەد محەمەد) ئەوێ ل سالا (١٩٨٢)ێ وەغەرکری، کو ل سالا (١٨٩٠)ێ ژدایك ببوو، پاشی بۆ خواندنێ چوو بوو تەکیا بامەرنێ یا نەقشبەندی[31].

سێ خرابە گوند ل ئاڤارێ بەندا هەنە دبێژنێ (پیرمەنەدا و پیرئاڤدەل و تەعلسا)[32].

## گوندێ بیسفکا ژێری:

گوندێ بێسفکا ژێری: دکەڤیتە دووراتییا (٢٦کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش ل رەخێ باشووری، ل دۆر ناڤێ بێسفکی وەسا هاتییە زانین کو رامانا وێ (بارسڤکاتی) بیت، ژبەرکو رێکا کاروانییا و کۆچەراتی بوویە و جهەکێ هوین و تەزی یە و بایەکێ خۆش لێ دهێت، و رێکا لەشکەرێ دەولەتا ئۆسمانی بوویە ل جهەکی دبێژنێ (سەرێ دەری) ل سەرێ چیایێ پشتا بێسفکی، گوند ل بنێ چیایی هاتبوو ئاڤاکرن بەلێ نها نێزیکی (٦کم) ل خوارتر ئاڤاکریە ژبەرکو جهەکێ بەرفرەهترە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** ناحیا مانگێشێ، و چیا دبیتە ناڤبر بۆ هەردووان.

**باشووری:** گوندێن کەمەکا و مەمانی ودەرگەلێ، و چیایێ چاپانکی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دێرکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێراگژنیکێ.

### پێکهاتەیا گوندی:

بنەمالا مستەفایی کو دکەڤن دا ژ ناڤ عەشیرەتا موکریان یا رۆژهەلاتێ کوردستانێ هاتینە، دبیت ل چەرخێ ١٧ هاتبن، بنەمالا مەلا ژ گوندێ کێستە ل ناڤ بەرواری بالا هاتینە، بنەمالا حەجی، بنەمالا میرزای، بنەمالا کەلەش ل ماریونس ل باکووری کوردستانی هاتینە. ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر کارێ چاندنێ و کارمەندیا حکۆمەتێ یە، هەمی خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسکی نە، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٩٢ کەس بوو[33].

### جهێن دیار و بەرنیاس ل گوندی:

ل باکوورێ گوندی چیایە دکەڤیتە دناڤبەرا بێسفکی و مانگێش دا، گرێ غەلێ شوینوارێن چەپەرەکێ شەری نە، گرکێ خزینی، گرکێ مامدەل، گرێ حاجۆ گولا، دەشتا شەمرەخ، دارکا مازی، رووباری.

### زێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی بیرا بن ئەرد بۆ ڤەخوارنێ هەیە، دیسان چەندین بیرێن کەسی بۆ چاندنێ هەنە، کانی ئەحمەد ل باشوورێ گوندی ل گەلیێ شێخی و چەندین کانیێن دی هەبوون، بەلێ هشکبووینە.

گوندێ بێسفکی ل سەردەمێ شۆرشێ چەندین جاران ل سالێن (١٩٦٥- ١٩٨٦- ١٩٨٨)ێ هاتییە

سۆتن و خرابکرن، و هەر جارا هاتییە سۆتن و تالانکرن، جارەکادی یا هاتییە ئاڤاکرن، هەتاکو ل سالا (١٩٩٣)ێ گوند هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

سالا (١٩٥٤)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، دکەڤن دا مزگەفت لێ هەبوو، ژ بەر و کسلێ هاتبوو ئاڤاکرن، بەری گوند خراب بیت نێزکی ١٠٠ مالان بوون، نها پتری ٦٠ مالان ل گوندی نە .

چەند شوینوار ل سنوورێ گوندی هەنە وەك: کەلا بیروڤێ ل باشوورێ گوندی هیشتا شوینوارێن وێ ماینە، سێ ناوسك لێ هەنە، گەلی کویری ل باشوورێ رۆژهەلاتێ گوندی کەل و ناوسك لێ هەنە، دو ناوسك و شکەفتەك ل باشوورێ رۆژئاڤایی هەنە.

هندەك خرابە گوند ل سنوورێ گوندی هەنە وەك: بیروڤێ، کانی ئەحمەد، کاڤلێت شۆخێ، گرکێ خەزنێ، بارزانێ دناڤبەرا بیسفکی و گوندێ دێرکێ دایە[٣٤].

## گوندێ بێشینکێ:

گوندێ بێشینکێ: دکەڤیتە دووراتییا (٢٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، چ تشتێ دروست ل دۆر ناڤێ گوندی نینن، بەلێ دبێژن ناڤێ وێ ژهندێ هاتییە کو گەلەك شینکاتی لێ هەبوویە، دکەڤیتە دناڤبەرا دو رووبارا دا.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ کەربلێ.

**باشووری:** چیایە و پشتا چیایی گوندێن بۆتیا و باکۆزێ نە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کەمەکا.

**رۆژئاڤایی:** گوندی بابۆخکێ یە .

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا سلێمان جەهوەری، بنەمالا میرخانی، بنەمالا سەعید ئاغا، بنەمالا ئەحمەد نەعمانی ئەڤ بنەمالێن ناڤبری هەمی ژ گوندێ گەرماڤا ل ناڤ عەشیرەتا دۆسکییا هاتینە، مالێت بۆتا ژ (جزیرا بۆتان) هاتینە، مالێت مەلا. ژیانا گوندیا ل سەر مۆچەیا وکارێ چاندنێ یە، ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسکی یە، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٤٨ کەس بوو[٣٥].

### جهێن دیار ل گوندی:

حوتا بەرازا، دەرێ سێریج، زوومێ ل باشوورێ گوندی ل نك رووبارێ سەرەکانیێ، ئەڤە زۆمێت (سەعید ئاغایی) بوون، هەتا دەمەکێ نێزیك مابوون، بابرێ، زیارەتوکا، شیڤ شالوکێ، دوشاخێ، پیاکا جامی ل چیایێ بەرامبەر .

### زێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی: بیرەکا ژێر ئەرد بۆ ڤەخوارنێ هەیە، زێدەباری دو رووباران، رووبارێ سەرەکانیێ ل رەخێ باشووری و رووبارێ سادیێ ل باکووری، ژ بلی کانییێن زومێ و بابرێ، کو گەلەك چەم و بیستان ل بەر هاتینە چاندن .

دروودانێن شۆرشا کوردستانێ دا ل سالا (١٩٦١)ێ دگەل دەستپێکرنا شۆرشێ گوند هاتییە سۆتن، و جارەکا دی ل سالا (١٩٨٤)ێ ژلایێ چەتەیان ڤە هاتییە وێرانکرن، سالا (١٩٨٨)ێ کەتە بەر هەوا ئەنفالان و هاتییە خرابکرن، پشتی سالا (١٩٩١)ێ جارەکا دی گوند هاتییەڤە ئاڤاکرن.

بەری گوند خراب ببیت نێزیکی ٦٠ مالان بوون، نها ب تنێ ١٢ مال یێ ل گوندی هەین، سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن[٣٦].

## گوندێ تلاکرۆ:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٣٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری و رۆژئاڤایی:** گوندێن چەمتر و زۆراڤانە.

**باشووری:** گوندێ زێنافا کو رووبارێ رووگەرم دبیتە ناڤبر دناڤبەرا وان دا..

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئاشانکێ.

### پێکهاتا گوندی:

ژ بنەمالێن شێخ رەئووف، شێخ سەعدی، شێخ سالحی، شێخ محەمەدی و شێخ ئەحمەد پێکدهێن، هەر چوار کورێن (شێخ عەبدولرەحمان)ینە ژ کەڤن دا ژ گوندێ (گەلیێ رمان) هاتینە، گوند سەر ب عەشیرەتا دۆسکییانە .

### جهێن دیار ل گوندی:

نهالا گلکەڤو ل باکوورێ گوندی، شکەفتا تەیری ل رۆژئاڤای، چەمێ دارێ چەمێن ئاڤی نە، گەلیکێ بەرخا نهالەکا کیرە ل باکووری، بانییا تلاکرۆ هەمی زەڤیێن چاندنێ نە، زێرێ زەر کوزە، سێ تا ل کوزێ یە ل رۆژهەلاتا گوندی .

### زێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی چەمێن گوندیا دکەڤنە سەر رووبارێ خابووری، بەلێ سنوورێ گوندی نها نا گەهیتە خابووری، هەروەسا رووبارێ رووگەرمی ل باشووری گوندی یە، بەلێ مفا ژێ ناهێتە دیتن ژبەرکو بێ کێمە، بیرەکا ژێر ئەرد بۆ ڤەخوارنێ هەیە و هندەك كانی ژی هەنە وەك كانییا تلاكرۆ، كانییا خرابەی، كانییا بەرواری ل باشوورێ گوندی .

ل سالێن هەشتیان جارەکێ فرۆکەیێن عیراقێ هێرش کریە سەر گوندی و ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند کەفتییە بەر هەوا ئەنفالان و هاتییە کاڤلکرن. سالا (١٩٩٢)ێ جارەکا گوند هاتە ئاڤاکرن، لسالا (١٩٥٧)ێ هژمار خەلکێ گوندی ١١٢ کەس بوو[37]، بەری خراب ببیت نێزیکی ٧٠ مالان بوون، بەلێ ئەڤە پتری ١٠ سالانە ئێك مال ب تنێ یا ل گوندی [38].

سالا (١٩٨٠)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، دیسان خواندنگەهەکا ئایینی ژی ل مزگەفتا ڤی گوندی هەبوو، گوند دکەڤیتە دەڤەرا دۆسکییا [39].

## گوندێ چرانێ:

چرانێ: دکەڤیتە دووراتییا (٢٢کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، ل دۆر رامانا پەیڤا (چرانێ) گۆڕستانەکا هەیی ل رۆژهەلاتێ گوندی دبێژنێ (بابکێ چرێ) و دبیت چران ژ هندێ هاتبیت.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ئۆزمانا.

**باشووری:** گوندێ گەلناسکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن زێوکا عەبو و ئەلندکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دەرگەلا شێخا.

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا مستەفا چرانی دکەڤن دا ژ گوندێ (زێوا شەفیق- دەڤەرا دۆسکی) هاتینە، بنەمالا قاسمی ئەڤ بنەمالە دکەڤن دا ژ گوندێ (دێراگژنیك) هاتینە و بنەمالا سالحێ برەهیمی ژ گوندێ گەلناسکێ هاتینە، ژیانا گوندیان ل سەر کارێ چاندنێ و خودانکرنا کەوالی یە، ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسکی یە، دیارە گوندەکێ بچویك بوو و ل یالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی تنێ ٢٠ کەس بوو[40].

ژ جهێن دیار ل گوندی: بەرۆژ د سەر گوندی دا زەڤیێن چاندنێ نە، نهالا کوردو، بانییا تڤیرکێ، گرێ مەسیح، بانا مەلا ل باشووری، بورێ ڤەرفێ چەمێن داروباری نە، شکەفت خەمرا، کورێ ل باشووری، نزارا ل رۆژهەلاتی، شیڤە کیری ل سنوورێ زێوکا عەبو و مێرگە رەشێ ل سنوورێ ئۆزمانا.

### زێدەرێن ئاڤێ:

رووباری رووگەرمی چەم و بیستان ل بەر دهێنە چاندن، كانی سێڤك ئاڤا وێ بۆ گوندی دئینن ژبەرکو هەتا نها بیرا ژێر ئەرد بۆ ڤەخوارنێ نینە، کانییا قاپو، کانی چیچپك، کانی مەلا .

د روودانێن شۆڕشا کوردی دا ل سالا (١٩٧٥)ێ گوند هاتییەخرابکرن، هەروەسا سالێن هەشتیان

چەند جارا گوند کەفتییە بەر هێرشێن لەشکەرێ عیراقێ، سالا (١٩٨٦)ێ گوند هاتییە بەردان و پشتی زڤرینێ ل ئەنفالان گوند هاتییەڤەخرابکرن، سالا (١٩٩٢)ێ گوند هاتەڤە ئاڤاکرن، ل سالا (١٩٨٢)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، بەری گوند خراب ببیت ١٢ مال بوون و نها ٩ مال ییێ ل گوندی .

برکێ: خرابە گوندەکە ل رۆژئاڤایێ گوندی و تا نها شوینوارێن وی ددیارن، هەروەسا هەتا سالا (١٩٨٨)ێ چەند زۆم ل گوندی مابوون، ئێك ل رۆژئاڤایێ گوندی و زۆما بن گوندی و زۆمەکا دی ل باکوورێ گوندی بوو[٤١].

## گوندێ چەمترێ:

گوندێ چەمترێ دکەڤیتە دووراتییا (٣٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ ل سەر رووبارێ خابووری، ناڤێ گوندی یێ ژ چەمێ تەر هاتی ژبەرکو رووبارێ خابووری یێ بلند بوو و چەم دنزم بوون ئەڤجا چەم تەر دبوون و ژ چەم تەرێ بوویە چەمترێ، هەروەسا گۆتنەکا دی ژی هەیە دبێژیت: دبیت ناڤێ گوندی ژ دەحل و درێ هات بیت، چونکی ل گوندی دمشەنە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** یێ هەڤسنوورە دگەل رووبارێ خابووری.

**باشووری:** گوندێ ئاشانك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ باجلێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زۆرئاڤا. و گوندێ تلاکرۆ ل باشوورێ رۆژئاڤایی .

### بنەمالێن گوندی:

بنەمالا بنیامێ، بنەمالا سلوی ئەڤ هەردو بنەمالە ژ گوندی (پیربلا) ل ناڤ عەشیرەتا سندییا هاتینە، بنەمالا حەمەدی ژ دەڤەرا وانێ ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە، بنەمالا ئۆسێ، ژیانا گوندییا نها ل سەر کارێ چاندنێ یە، گوند ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسکی یە،ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ ٤٣ کەس بوو[٤٢].

### جهێن دیار ل گوندی:

بانێ ل رۆژئاڤایی گوندی، کۆسکێت خەبازا، چالا شاهوی، نەرما فەلەی ل باشووری، وارێ خەزالێ، چالا گەودا، کەڤرێ کۆن مێشێ ل هنداڤ گوندی ل باشووری، ل باکوورێ گوندی چەمن، چەمێ سەری و چەمێ بنی .

### ژێدەرێن ئاڤێ:

رووبارێ خابووری دکەڤیتە باکوورێ گوندی، ل سەر رووبارێ چەمێن فێقی و دارێن سپیندارا هەنە، هەروەسا هندەك کانی ژی هەنە وەك کانی تویك، کانی قەرامك ل رۆژهەلاتێ گوندی .

گەلەك جاران گوند کەفتییە بەر هێرشێن عیراقێ و هاتییە بەردان، و ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند کەتییە بەر هەوا ئەنفالان.

سالێن حەفتیان خواندنگەهـ هاتبوو ڤەکرن و ل ئەنفالان هاتە خرابکرن و پاشان نەهاتییە ئاڤاکرن، گوند بەری خراب بیت نێزیکی ٣٠ مالان بوو و نها ب تنێ ٤ مال لێ هەنە.

گۆرستانا بابی و گۆرستانا حاجی کوشتی وەك شوینوار ل گوندی دهێنە هژمارتن، ژبلی گۆرستانا گوندی کو نها مریا لێ ڤەدشێرن، هەروەسا ئامێدیك ل رۆژئاڤایێ گوندی هەیە و کۆخێ ل رۆژهەلاتێ گوندی خرابە گوندن و هیشتا شوینوارێن وان ددیارن[٤٣].

## گوندێ حۆجاڤا:

گوندێ حۆجاڤا: دکەڤیتە دووراتییا (١٤کم) ژ مانگێش، ل سەر رێکا گشتییا دناڤبەرا مانگێش-کورێت کاڤانا دا، ناڤی گوندی (حەجی ئاڤایە) کو حەجیەکی ژ گوندێ کەربلێ ل باشوورێ حۆجاڤا هاتییە ئەڤ گوندە ئاڤاکرییە و خودانێ گوندی بوو، دگەل بوورینا دەمی حەجی ئاڤا بوویە حۆجاڤا.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ دوبلیا.

**باشووری:** گوندێ کەربلێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن دێراگژنیك و گرێپتێ.
**رۆژئاڤایی:** گوندێن بانەسۆرا و ئالەکینا.

## پێکهاتەیا گوندێ حۆجاڤا:

بنەمالا حەجی ژ گوندێ کەربلێ هاتینە و خودانێن گوندی نە، بنەمالا حسین خانا، بنەمالا مەلا ئەحمەد، بنەمالا گەودا ئەڤ هەردو بنەمالێن داویێ ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە، ل دەمێ هاتن وچوونا کۆچەراتی وانا ژی هاتن و چوون دکر، پشتی شەرێ جیهانیێ ئێکێ و دانانا سنووران ل ڤی گوندی ئاکنجی بووینە، ژیانا گوندیا یا ل سەر کارێ چاندنێ و کارمەندیا حکۆمەتێ یە، ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسکییانە، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٩٢ کەسبوو[٤٤].

## ژ ئاڤارێن گوندێ حۆجاڤا:

پتریا چەم وبیستانێن وان ل گوندێ کەربلێ نە، ل حۆجاڤا ژی ئاڤارێ دێم هەیە وەك گرێ هەڤرانا ل رۆژئاڤایێ گوندی گرەکێ بلندە، نهالا کۆلکا ل دەمێ شۆرشا ئەیلوولێ (١٩٦١- ١٩٧٥)ێ کۆلك لێ چێدکرن، خەلك ژ بەر تۆپ و تەیارا دما د وان کۆلکا ڤە، ناڤ خولپا، کورا مێکیك، دەشتا حۆجاڤا زەڤیێن چاندنێ نە، زیرکا، بن چیایێ ل باکوورێ گوندی، کەندالا .

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی ب تنێ ئێك بیرا ژێرئەرد بۆ ڤەخوارنێ هەیە، ژ بلی کانیکا گوندی و کانیکا قورێ وەکی دی هەمی ئاڤارێ گوندی یێ دێمە و ئاڤارێ ئاڤی یێ ل کەربلێ، ژبەر هندی بەرهەمێن چاندنێ ل حۆجاڤا ب تنێ بەرهەمێ دێمی یە وەك گەنم، جەهـ، نۆك، گژنیژ، گوندۆر، گولبەرۆژ .

ل سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەها سەرەتایی ل گوندی هاتییە ڤەکرن. مزگەفت ل سالا (١٩٧٩)ێ

گوندێ حۆجاڤا



هاتییە ئاڤاكرن، ل هەمان سال بنكەهێ ساخلەمیێ ژی هاتییە ڤەكرن، خواندنگەها دواناڤنجی ل سالا (٢٠٠٠)ێ هاتییە ڤەكرن، نها نێزیكی ٩٠ مالان ل گوندی نە.

ژ جهێن شوینواری ل سنوورێ گوندی: گەلیێ شكەفتێ ل چیایێ باكوورێ گوندی شكەفتەك و ناوسكەك یێن هەین دبەرِوی دا كۆلاینە[٤٥]

## گوندێ دویلیا:

دولیا: یان وەكی بەرنیاس ب گوندێ دویلیا نێزیكترین گوندە ژ مانگێشێ، دكەڤیتە رۆژئاڤایێ مانگێش ب دووراتیا (٣كم)، ل باشوورێ گوندی رووبارێ دویلیا یە و ل بەرامبەر گوندی ل ئالیێ دیێ رووبارێ د گەهیە رەزێن تری، پاشان چیایێ مانگێشێ ل بەرامبەر گوندی. ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ژبەركو دناڤ دۆلەكێ یان بێژین نهالەكێ یە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ ملهمبانێ.

**باشووری:** گوندێ حۆجاڤا.

**رۆژهەلاتی:** یێ هەڤسنوورە دگەل سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زێوكا عەبویی.

### پێكهاتا گوندی:

بنەمالا حەجی تاها دكەڤندا ژ (مام خۆرا) ژ ناڤ كۆچەرا هاتینە، بنەمالا (جبوی) ژ گوندێ بەرۆشكا ژێری هاتینە، بنەمالا ئەحمەد حەلا، بنەمالا حەجی شەروی، بنەمالا محو عەدلانا، پتریا ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر مۆچەیە و هەروەسا كارێ چاندنێ ژی دكەن، خەلكێ گوندی دۆسكی نە .

### جهێن دیار و ناڤدارێن ل گوندی:

حسار، بەرێ كەلشتی ل چیایێ بەرامبەرن، ناڤەبەر هەمی زەڤی و زیرن، كانی حەم رەش، بانەكەت زەڤیێن چاندنێ نە، مەنداڤ چەمن، بەرِوی پیرخشكی، گرێ بەلالیسكێ گرەكێ بلندە دوورێت وی زەڤی و بیستانن، گەڤرێ گەڤەرەشكی، گهورا ب هژیر، گهورا سیتوی، سێلكی، بانیا سوتكی كو هەمی زەڤی نە .

### زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

رووبارێ دویلیا دبن گوندی دا ل باشووری كو هەر ژ رووبارێ مانگێشێ دهێت، هندەك جۆیێن ئاڤێ ژێ دچن ژ وانا جۆیا گوندی، جۆیا سكرێ حەلانی، جۆیا ریا سۆر چەم و بیستان ل بەر دهێنە چاندن، هەروەسا چەند كانی ژێ هەنە ژ وانا كانیا گوندی، كانیكا عەلوی، كانیكا ئامینایێ، كانیا قادێ، كانی حەم رەش، كانی مەخەلك، كانی قەرەچ، كانیا بانا، كانی گرك دهاتە بكارئینان ژلایێ وان كەسین گری دگرتن خو پێ دشویشت .

دشۆرشا كوردی دا چەند جاران كەتییە بەر هێرشێن سوپایێ عیراقێ، هەر ل دەستپێكا شۆرشا ئەیلوولێ (١٩٦١)ێ هاتە سۆتن، پاشان جارەكا دی ل ئەنفالان هاتە خرابكرن و سالا (١٩٩٢)ێ هاتە ئاڤاكرن، ل سالا (١٩٥٧)ێ ٦٠ كەس ل گوندی دژیان[٤٦]، گوند بەری خراب ببیت نێزیكی ٢٠ مالان بوون، نها ژێ ٢١ مال ل سەر گوندی نە. سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن.

هندەك شوینوار هەنە كو نیشانێن كاڤلە گوندانن، وەكی بانا ل رۆژئاڤایێ گوندی، گركێ جەرێ ل رۆژئاڤا ل نێزیك گوندی، كاڤلێت رەش و قەشا، كانی قەرەچ، بەلێ چ تشت ل سەر دیرۆكا وان نە دیارە[٤٧].

## گوندێ دێراگژنیك:

گوندێ دێراگژنیكێ: ب دووراتیا (٢٠كم) دكەڤیتە باشوورێ باژێركێ مانگێشێ، ل بنێ چیایی هاتییە ئاڤاكرن، دو رامان بۆ ناڤێ دێراگژنیك هەنە: یا ئێكێ یێ ژ دێرا جەژنا هاتی ئانكو دێرجەژن، پاشان بوویە دێرگەژن و پاشان دێراگژنیك. یا دووێ دبیت ژ دێرا كچین هات بیت كو ناڤەكە ژ رێورەسمێن ئایینی

یێن مەسیحییان هاتییە، هوسا ژ دێراکچین بوویە دێراگژنیك.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** چیایێ دێراگژنیك کو دکەڤیتە دناڤبەرا گوندی و مانگێشێ دا..

**باشووری:** گوندی کەمەکا.

**رۆژهەلاتی:** هەڤسنوورە دگەل گوندێ بێسفکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن حۆجاڤا و کەربلی و گرێپتێ.

## پێکهاتا گوندی:

بنەمالا گولا، بنەمالا لاڤێ، بنەمالا حەجی، بنەمالا شەمرەخیا (شەمرەخ خرابە گوندەکە دکەڤیتە باشووری دێراگژنیکێ)، بنەمالا صامێ، کو هەمی خۆجهێن کەڤنێن گوندی بووینە ژ عەشیرەتا دۆسکیی نە، دێراگژنیك د بنیاتدا گوندەکێ مەزن بوویە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٩٣٥ کەس بوو[٤٨].

## ئاثار وجهێن دیار ل گوندی:

دێرا جەژنا ل پشتا گوندی، هەڤشیێ لالوی، هەڤشیێ نێرگزا، گەلیێ زەیتینێ، گەلیێ مالا، گەلیێ دو گەلی، گەلیێ مالا میسێ، گەلیێ کەر سەخمێ، گەلیێ ئاخەسپیکێ ئەڤە هەمی یێ ل چیایێ پشتا گوندی، هەروەسا جهێن دیتر ژی وەکی میساڤاکێ، کانی تیکی، گرکێ کاڤا، قەپێ، پیاسۆرك ل رۆژئاڤای، کۆن کێرویشك، باسکێ قافلێ، گرکێ ئیسڤا ل رۆژهەلاتی، ل باشوورێ گوندی هەمی رەزێن تری نە و گوندێ دێراگژنیك ب رەزان یێ ناڤدارە، ژیانا گوندییان بارایتر یا ل سەر چاندنا رەزا.

گوندێ دێراگژنیکێ



## ژێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی ب تنێ هندەك بیرێن ژێر ئەرد یێن کەسایەتی بۆ چاندنێ هەنە، هەروەسا کانییا ئیسڤی و کانییا کورێ لێ کێم بووینە و ژبەر نەبوونا ئاڤێ دەرامەت یێ دێمە و پتر ل سەر رەز و سماق و باهیڤ و حلیکانە، دگەل چاندنا گەنم و جەهـ و نۆکان.

د روودانین شۆرشا کوردی دا گوند چەندین جاران کەفتییە بەر هێرشێن رژێمێن عیراقی یێن وی سەردەمی، سالا (١٩٦٣)ێ گوند هاتییە سۆتن و جارەکادی ل داویا سالێن شێستان هاتییە خرابکرن ڤە، سالا (١٩٨٦)ێ هەڤرویشی هێرشێن حکۆمەتا عیراقێ بوویە، هەتا سالا (١٩٨٨)ێ د هەوا ئەنفالاندا ب ئێکجاری هاتییەکاڤلکرن، سالا (١٩٩٣)ێ هاتەڤە ئاڤاکرن، بەری گوند خراب ببیت نێزیکی ٣٠٠ مالان بوون، نها ژی نیزیکی ١٤٠ مالان ل گوندی نە. دەسپێکا سالێن شێستان ژ سەدساليیا چوویی خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، بەلێ ژ بەر سەروبەرێ وی سەردەمێ یێ دەڤەرێ هەرزوو هاتییەگرتن، پشتی پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ ل ١٩٧٠/١٠/١٩ێ ئەڤ خواندنگەهە سەر ژ نوو هاتییەڤەڤەکرن، پاشان دواناڤنجی ژی هاتییە ڤەکرن[٤٩]. سالا (٢٠٠٦)ێ بنکەهێ ساخلەمیێ هاتییە ڤەکرن .هەژییە بێژین کو خواندنگەهەکا دیرۆکی ل وێرێ بوو[٥٠].

چەندین شوینوار ل گوندێ دێراگژنیك هەنە وەك: قەسرا ئادەم شوینوارێن قەسرەکێ نە ل سەرێ گوندی، دێرا جەژنا ل پشتا گوندی، هەروەسا شوینوارێن ئاشێ ئاڤێ ل بنێ گوندی مانە دگۆتێ ئاشێ جەرکیسی، سێریچ، بەرێ دیوانێ، صادیێ کاڤلە گوندن ل سنوورێ گوندی[٥١].

## گوندێ راسلعەین:

گوندێ راسلعەینێ دکەڤیتە دووراتییا (٢٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، (راسلعەین) ئانکو

شینوارێن قەسرا ئادەم



(سەرێ كانیێ) ب زمانێ كوردی، گوند ل سەرێ گرەكێ بلند هاتییە ئاڤاكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** رووبارێ خابووری.

**باشووری:** گوندێ ملهمبانێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بەرۆشكا سەعدوونی.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئەردا.

### پێكهاتا گوندی:

بنەمالێن گوندی هەر ژ كەڤن وەرە ژ ناڤ بەرواریا هاتینە، بنەمالا بەرۆشكیيا و بنەمالا ئوتا ئەڤ هەردو بنەمالە ژ گوندێ بەرۆشكا سەعدوونی هاتینە و بنەمالا محو خەما ژ گوندێ (مرتێ) هاتینە، بەلێ نها كاڤلە گوندەكە ل سنوورێ گوندێ راسلعەین و بنەمالا شێخو، ژانا گوندییا یا ل سەر كارێ چاندنێ و خودانكرنا پەزی، گوند سەر ب عەشیرەتا دۆسكی یە، د سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێدا ئاماژە ب دو راسلعەینا هاتییەكرن، راسلعەینا ژووری هژمارا خەلكێ وێ ٢١١ كەس بوو راسولعەینا ژێری ١٢٠ كەس بوو[٥٢].

جهێن دیارێن گوندی، هەڤشیێ میری، پەپیكێ ل رۆژهەلاتی، شیفكا مەمیا ل رۆژئاڤای، خرابا ل باشووری، بانكا، نهێلا، گوند مرتی ل باكووری، هەروەسا رووبارێ خابووری ژی دكەڤیتە باكووری.

### زێدەرێن ئاڤێ:

زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی یێ سەرەكی رووبارێ خابووری یە و چەندین چەم و بیستان ل بەر هەنە، هەروەسا هندەك كانی ژی هەنە وەك كانییا خرابا، كانییا چەم رەشكی، كانییا چرینێ خۆش .

د روودانێن شۆرشا كوردستانێ دا گوند چەندین جاران ل سالێن (١٩٦٤- ١٩٧٥- ١٩٨٨)ێ هاتییە كاڤل وخرابكرن.

سالا (١٩٧٨) خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن، گوند بەری خراب بیت نێزیكی ٤٠ مالان بوون، نها ١٦ مال ل گوندی هەنە، پشتی سەرهلدانێ ل سالا (١٩٩٣)ێ گوند هاتییە ئاڤاكرن ڤە و پاشان ل سالا (١٩٩٩)ێ هاتییە ڤەگوهاستن بۆ جهەكێ بلندتر .

چەندین نیشانێن خرابە گوندان لێ هەنە وەك: گوندێ مرتێ، گوند حدیدێ، گوند مەلیلی، گوند خابوور ل خابووری[٥٣].

## گوندێ زڕهەوا:

گوندێ زڕهـەوا دكەڤیتە دووراتییا (٢٥كـم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ سەر رێكا سەرەكییا دناڤبەرا مانگێش- زاخۆ، زڕهەوا ل دووڤ هندەك گۆتنان ب رامانا هندی دهێت كو گەلەك با (هەوا) لێ دهات، ژبەر كو ل جهەكێ بلند هاتبوو ئاڤاكرن، جهێ وی بلندتر بوو ل جهێ نها ل ئالیێ باشووری.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ تلاكرۆیە كو رووبـارێ روگەرم دناڤبەری دایە.

**باشووری:** چیایە كو دبێژنی سەر سیسن.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زیناڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هارینا یێ عەشیرەتا سلێڤانەیا.

### پێكهاتا گوندی:

تنێ بنەمالەك ل گوندی هەیە، دبێژنی بنەمالا (مستێ فەق عەلی) هەر دكەڤندا خۆجهێن گوندی بووینە، خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسكییانە، زڕهەوا داویك گوندێ عەشیرەتا دۆسكییا و ناحیا (مانگێش)ە ژ ئالیێ رۆژئاڤایی ل سەر سنوورێن قەزا زاخۆ.

### ئاثارێن دیار ل گوندی:

بانكا مزگەفتی، بانا ئومەری، مێرگا ب شافر كو پتر زەڤی نە، هەروەسا كورا قادوی، ملا زرزریكا، چەپەرا، نهالكا ناسری، چەموكا هەمی چەمن، گركێ خەرتێ، هەروەسا كێركێ خەزینی و ملا كورەهیا ل رۆژهەلاتێ گوندی ئالەك یێ زڕهەوایە و ئالەك یێ

گوندێ زیناڤایە، هەروەسا ل چیایێ بەرامبەر چەند گەلی هەنە، وەكی: دولا خاركێ، دولا درێژ، دولا جونیكا هندەك جهێن جونیا لێ هەنە.

## زێدەرێن ئاڤی:

بارا پتر هشك بووینە ژ وان سەرێ كانیێ و كانییا ناڤ جنیكێ و رووبارێ رووگەرم یێ دویرە مفا ب دروستی ژێ ناهێتە وەرگرتن، بیرەكا ژێر ئەرد هەیە بۆ ڤەخوارنێ هەیە، هەروەسا بەرهەمێ چاندنێ ژی گەلەكێ كێمە ژبەركو گوند بدروستی نەهاتییە ئاڤاكرن .

ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٤٦ كەس بوو[٥٤]، گوند ل سالا (١٩٨٤)ێ هاتییە خرابكرن، جارەكا دی ل سالا (١٩٨٨)ێ ل ئەنفالان هاتییەڤە سۆتن و كاڤلكرن، سالا (١٩٩٦)ێ ئێك مال ب تنێ هاتییە گوندی، هەتا نها یێ ل گوندی و یێن بووینە پێنج مال.

ل ئاڤارێ زرهەوا دو جهێن شوینواری هەنە كو نێزیكی (١كم) ژێك دوورن، یێ ئێكێ دبێژنی (قویچكێ) و یێ دوێ بەرسۆركی، ل قویچكێ شوینوارێن كەلایەكێ لێ نە كو دهێتە هزركرن پتری ٣٠٠ ژوورا بوون، نها ژی بەر و كاڤلێن وێ ماینە و ب بەرێن گەلەك مەزن هاتییە ئاڤاكرن، هەروەسا بەرسۆركی ژی دیوارێن وان كاڤلا ماینە و هیشتا پیچەك دبلندن، دبێژن ئەڤ جهە سەر ب كەلا ئەرمشتێ ڤە بووینە، هەروەسا چوار گۆرستان ل گوندی هەنە: داركێت ئەسحابیا، بەرگێرێ، تیا میروی، شێخ پیراموویس كو ئەو مروڤێن لێ ڤەشارتین گەلەك درێژن ئەڤە نیشانەكە كو دكەڤن خەلكەكێ مشە ل ڤیرە ژیایە[٥٥].

## گوندێ زڤنگی:

زڤنگێ دكەڤیتە دووراتییا (١٢كم) ژمانگێشێ، سەر رێكا سەرەكییا مانگێش- بامەرنێ، دكەڤیتە

شینوارێن قویچكێ



سەر لیڤا رووبارێ سپنێ بەهدینان، پرەکا ئاسنی ل سەرە کو دبێژنێ (پرا زڤنگێ)، پشتی ژێ دەرباز دبن دگەهنە گوندێ زڤنگێ، زڤنگ رامانا وێ نهال و شکەفت پێکڤە و گەلەك شکەفت نهال ل گوندی هەنە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ غلبیشی.

**باشووری:** گوندێن گەربەراسکی و زیوکا کەندالا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گولێ یە یێ سەر ب ناحیا بامەڕنێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەندا.

**پێکهاتا گوندی:**

بنەمالێن عبدالقادر، میکائیل، خدرو، میرزا، سلێمانێ هەمزێ، ئەحمد غازی، بارانی، هەمی خۆجهێن رەسەنێن گوندی نە، بنەمالا سلیمانێ هەمزی د کەڤندا ژ دەڤەرا بەرواری بالا هاتینە، ژیانا گوندییا سەر کارێ چاندنێ و کارمەندیا حکۆمەتێ یە، هەمێ خەلکێ گوندی دۆسکی نە.

**ئاقارێن بەرنیاس یێن گوندێ زڤنگێ:**

ملا مەجلسێ مەیدانۆکا، گرێ جانا، خرابا کو هەمی رەز بوون نها بووینە خرابە، قلێپا هەمی زەڤی و رەز و سماقن، چیموکێ جهی نها یێ گوند لێ هاتییە ئاڤاکرن، گرێ کەلوتکێ کو گرەکێ بلندە جهێ هەلکرنا ئاگرێ نەوروزێ یە .

**زێدەرێن ئاڤێ:**

ل گوندی ب تنێ رووبارێ سپنەی هەیە کو دکەڤن دا مفا ژێ دهاتە دیتن، بەلێ نها گەلەك کێم بوویە وج مفا ژێ ناهیتە دیتن .

**پێکهاتا گوندی:**

هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٧٣ کەس بوو[٥٦]، د روودانێن شۆرشا کوردستانێ دا، ل سالا (١٩٦٤)ێ گوندێ زڤنگێ ب تۆپ و تەیارا هاتییە خرابکرن، جارا دووێ ل ئەنفالان هاتییە وێرانکرن، گوند سالا (١٩٩٢)ێ هاتییەڤە ئاڤاکرن. بەری خراب ببیت ٢٣ مال بوون و نها ٢٤ مال ل سەر گوندی نە. سالا (١٩٨٠)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ئاڤاکرن.

ل گوندێ زڤنگێ دو کۆتەلێن ئاشێن ئاڤێ هەنە کو هیشتا هندەك بەرێن ئاشی ماینە دگۆتە ئێك ژ وانا ئاشێ چومارێ رەسولی[٥٧].

## گوندێ زیناڤا:

زیناڤا دکەڤیتە دووراتییا (٢٢کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ ژ ئالیێ رۆژئاڤای ڤە، رامانا زیناڤا (جوانی و زینەت) دهێت.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ تلاکرۆ.

**باشووری:** چیایێ گەلیێ زیناڤا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن دەرگەلا شێخا و ئاشانکی و پرا زیناڤا دبیتە سنوورێ دناڤبەرا وان دا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زرهەوا.

**پێکهاتا گوندی:**

بنەمالا فارسی، بنەمالا بێزوی، بنەمالا حامدا کو خۆجهێن کەڤنێن گوندی نە، بنەمالا هەیدوی دکەڤن دا ژبانەسۆرا ژ ناڤ دۆسکیا هاتینە، ژیانا خەلکی گوندی پتر سەر مۆچانە دگەل کارێ چاندنێ، ژ گوندێن عەشیرەتا دۆسکی یانە.

**جهێن دیارێن گوندی:**

کێرکێ خەزینی و ملا کورەهیا دگەل گوندی زۆرئاڤا د هەڤپشکن، بن گەلی، گرێ شیخ سماهیلی، بانییا زیناڤا زەڤیێن چاندنێ نە ل رۆژهەلاتا گوندی هەنە، ملا قەنتەرێ رەزن دبن گوندی دا، زیارەتێ کانییا مێرا، بەری ب شاشك ل ئاقارێ دناڤبەرا زیناڤا و زرهەوا دا.

## زێدەرێن ئاڤێ:

ڕووبارێ ڕووگەرمە كو ژ گەلی گەرمی و پرا سادیێ دهێت، زێدەباری كانیا عەمەری و كانیا شرتا، بەلێ ل هاڤینا گەلەك كێم دبن یان هشك دبن .

هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٧٧ كەس بوو[٥٨]، گوند چەندین جارا ژبەر هێرشێن حكۆ مەتا عیراقێ هاتییە بەردان، هەتاكو هەوێن ل ئەنفالان ب ئێكجاری هاتییە وێرانكرن، سالا (١٩٩٢)ێ هاتییەڤە ئاڤاكرن، بەری خراب ببیت نێزیكی ٤٠ مالان بوون، نها تنێ ٨ مال ل سەر گوندینە. خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٧)ێ هاتییە ڤەكرن و پشتی سەرهلدانی ژی هەبوو، بەلێ ل سالا خواندنا (٢٠١٣- ٢٠١٤)ێ خواندنگەهـ ژبەر نەبوونا ئاڤاهی و كێمیا خویندكارا بۆ گوندێ ئۆزمانا هاتە ڤەگۆهاستن.

شوینوارێن كاڤلە گوندەكی ل ئاڤارێ زناڤا هەیە دبێژنێ بن گەلی[٥٩].

## گوندێ زێوكا عەبۆی:

زێوكا عەبۆ: ب دووراتییا (١٤كم) دكەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، رامانا زێوك ئانكو زیر یان گر ژبەركو دەوروبەر و ئاڤارێن گوندی زیر یێ لێ مشەیە، عەبۆ كەسەك بوو بەراهییا هەمیا ل زێوكێ جهواربوویە، ئێك مال بوو و پاشان مشەخت بوویە، ل دەمەكێ گوند بناڤێ (زێوكا محەمەدێ یاسینی)یێ ناڤدار بوو، ئەڤ گوندە ژ ٩ گوندان پێكهاتییە ژوانا ژی گوندێ زێوكێ بخۆ، گوندێن دارا وەیسی، كانی لەڤەنكێ، گوندێ سۆتی، گوندێ كەلەشی، چەم سماقی، گەلی گەرمی، كاڤلێت ئامەدی، گوندكێ مارا.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن ملهمبانێ و ئەردا و ناڤشكێ.

**باشووری:** گوندێن ناڤدارا و شاوریكێ.

بەرێ ب شاشك



**رۆژهەلاتی:** گوندێن دولیا و بانەسۆرا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن چرانێ و ئەلندکێ.

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا محێ عەسافا، بنەمالا عەلێ ئەڤ هەردو بنەمالە دسەرەکینە، ژ بلی بنەمالێن: بنەمالا لاڤێ، بنەمالا گوڤەیا، بنەمالا کۆچەرا ژ ناڤ کۆچەران هاتینە، بنەمالا ئێکمالا سەیدا، بنەمالا سەرحانی، بنەمالا عەبدێ نەجمی، بنەمالا میرەبەگا، خەلکێ گوندی هەمی ژ عەشیرەتا دۆسکی نە.

زێوکا عەبۆی ئاقارەکێ بەرفرەهـ یێ هەی، ژ جهێن دیار ل گوندێ زێوکێ: گهورا زەڤیێن چاندنێ نە، چواریانێ، کۆزێ ل باکووری، بان دەلالێ، زەڤیێن راست، کانی سارکێ، دارا رەش، بانەکەتێ دکەڤیتە سنوورێ گوندێ دولیا ل ئالیێ رۆژهەلاتی، گەلی گەرمی هەمی چەم و بیستانن، چەم سماقی، رەزکێ کەندالا، بەرۆژی، گرێ رەزا، نەرمکێ، گێلە شینکا، کانی بەنیشتی، چالا هژیرا رەش، هەڤشینێ درێژ ل ئالیێ باشووری، گوندی کەلەش، نهالا جنیکا ریڤی، مێوا تەحل، نهالا زنجا جهێ کۆچەراتی بوو، نهالا تینێ، زیارەتێ گوندکێ مارا، شیڤە کویرێ، جوما ڤاسوی ل رۆژئاڤای .

### زێدەرێن ئاڤێ:

رووبارێ گەلی گەرمی، کانیا نحیتێ دو جۆیێن ئاڤێ ژبەر دچن جۆیێن گەلی گەرمی و خالد ئاغا، جۆیا چەم سماقی، کانی سارکێ، کانیا بن جویێ، کانیا جونیکێ، کانیا سکری، کانیکا ئاڤکا بیکا دکەڤن دا زاڤا دبرنە سەر ڤێ کانیێ سەرێ وان دشویشت، کانی بەنیشت، کانیا زەلاما، کانی مەندانێ، کانی کەزوانێ، کانی لەڤەنکێ، چەندین کانیێن دیتر کو بیستان لبەر دهێنە چاندن.

ل سالا (١٩٦٣)ێ خواندنگەهـ لێ هاتیە ڤەکرن، دکەڤن دا مزگەفت هەبوو و مەلایێن خودان مۆلەت و فەقی لێ هەبوون دخواندن و وانە دگۆتنە فەقیان، وەك: مەلا حسێن مارونسی، مەلا ئیسماعیل ناڤشکی، مەلا نەزیر، مەلا یاسین گۆیی، مەلا تاهر ئێکمالەی[١٠].

## گوندێ زێوکا کەندالا:

گوندێ زێوکا کەندالا: دکەڤیتە دووراتیا (٨کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ زڤنکێ.

**باشووری:** گوندێن ئەلکیشك و مەجلمەختێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گەریەراسکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەندا.

### پێکهاتا گوندی:

گوندێ زێوکا کەندالا ژ دو بنەمالێن سەرەکی پێکدهێت: بنەمالا بـازدارا د بنیاتدا ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە، بنەمالا عەلێ دکەڤندا ژ ناڤ بەرواری بالا هاتینە، ل دووڤ هندەك سەرهاتییان سەیدێن سەیداڤا بەری زێوکیان ل ڤی گوندی بوون، خەلکێ گوندی ب عەشیرەت دۆسکی نە.

### جهـ و ئاقارێن دیار ل گوندی:

بن کێری ل باشوورێ گوندی، باسکی، ئاقارێ ژێری دبن گوندی دایە، حەزگەولەی، بەرە گەورا، دارا دەشت، نزاریسا، دوگالێ، بەرۆژێ خرابەی ئەڤە باراپتر زەڤیێن چاندنێ نە، هەروەسا بەهژیرکێ، کەندالا، نزارێ خدرێ، سەر کورێ کو هەمی رەزن، هەروەسا سپیندارۆکێ بیستان و زەڤی نە.

### زێدەرێن ئاڤێ:

ژ کانیێن گوندی: کانیا پاتوخێ، کانیا بەرگوندی، کانی سارکێ، سپیندارۆکێ، بەر گەرکێ ئەڤ کانیە بۆ ئاڤدانا بیستانان د هاتنە بکارئینان، بەلێ نها هشکبووینە یان گەلەك کێم بووینە.

گوندێ زێوکا کەندالا دو جاران ژ لایێ حکۆمەتا

عیراقێ ڤە هاتییە وێرانکرن، جارەکێ ل دەستپێکا سالێن شێستان و جارا دووێ ل سالا (١٩٨٨)ێ و گوند چەندین جاران ژ ترسێن تۆپ و فرۆکەیێن رژێمێ ڤە هاتییە بەردان.

**پێکهاتا گوندی:**

هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٤٠ کەس بوو[٦١]، بەری گوند بهێتە خرابکرن نێزیکی ٣٠ مالان بوون و نها ١٣ مال ل گوندی دژین. سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ ل گوندی ڤەبوویە .هەژییە بێژین کو خواندنگەهەکا ئایینی ل مزگەفتا ڤی گوندی هەبوو[٦٢].

شوینوارێن کاڤلە گوندان ل ئاقارێ گوندی هەنە، وەك خرابکێ دبن گوندی دا، بەرۆژێ خرابەی ل رۆژهەلاتێ گوندی و زەڤیا کاڤلا[٦٣]

## گوندێ سەرئاڤکێ:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (٢٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، دبێژنێ سەرئافك ژبەر سەرەکانییا ئاڤێ ل ڤی گوندی یە، سەرەکانییا رووبارێ ناڤەشانێ ژ کانی کەرکی دەردکەڤیت ل سەرئاڤکێ کو ئەڤ رووبارە خەلکێ چەند گوندان مفایی ژێ دبینن، هەتا دگەهیتە سەر رووبارێ رووگەرمی ل نێزیك گوندێ ئاشانکێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوند کۆسە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئۆزمانا.

**باکوورێ رۆژئاڤایی:** گوندێ باجلێ.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند ژ سێ بنەمالا: بنەمالا حەسوی، بنەمالا سیتوی، بنەمالا فارسا پێکهاتییە، دبنیاتدا ژ گوندێ ئیکمالا خابووری هاتینە، ژیانا خەلکێ گوندی نها پتر سەر مووچانە و هەروەسا کارێ چاندنێ، خەلکێ گوندی ب عەشیرەت دۆسکی نە.

**ئاقار و جهێن دیارێن گوندی:**

نزاری ل بەرامبەر گوندی زەڤی نە، بێدەرکا زیا ل بنێ گوندی و کوتەلێ ل رۆژئاڤای هەمی بیستانن، بێدەرێن گوندی جهی بێدەرا و گێرا یە دکەڤنە سەر گرێ باکوورێ گوندی، ل رۆژهەلاتێ گوندی کۆزە جهێ چەرینا تەرش و کەوالی یە .

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ل گوندی: رووبارێ سەرئافکێ، کانی کەرکا سەری و کانی کەرکا بنی د نێزیکی ئێکن، کانییا مێرا، کانی سرکێ، کانی تابر کو بۆ برینا تایا دهاتە بکارئینان، چەندین چەم و بیستان ل بەر دهێنە کرن.

هژمارا خەلکێ گوندی ل دووف سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٤١ کەس بوو[٦٤]، گوند هەتا سالا (١٩٨٨)ێ چەند جارا کەتییە بەر هێرشێن تۆپ و فرۆکەیێن عیراقێ و هاتییە خرابکرن. خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٦)ێ هاتییە ڤەکرن، بەری گوند خراب ببیت ٣٥ مال بوون ونها ٢٠ مال ل گوندی دژین. شوینوارێن کۆتەلەکا ئاشی ل رۆژئاڤایێ ئاقارێ گوندی هەیە[٦٥].

## گوندێ شاوریکێ:

شاوریکێ: دکەڤیتە دووراتییا (١٥کم) ژ مانگێشێ، بەرامبەری گوندی زنجیرا چیایێ سپی یە، ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن نها کاڤلە گوندەك ل رۆژئاڤایێ شاوریکێ هەیە دبێژنێ (کانی کافرك) ئەڤ گوندە دکەڤندا هندی مەزن بوویە وەك (شار) ناڤی وی هاتییە و شار بوویە شاوریك.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ زێوکا عەبۆی.

**باشووری:** چیایە و ل پشتا چیای گوندێن پیرەفاتی و بۆتیانە .

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بانەسۆرا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن بروحەجەرا و ناڤدارا.

ل ڤی گوندی گەلەك ژ روودانێن میرگەها بەهدینا هاتینە نڤیسین، نەخاسمە سەردەستێ (ئیبراهیمێ كورێ جامی) كو روودانێن سالا (١١٠١مش/ ١٦٨٩ز)ێ و روودانێن (١٢٧٦مش/ ١٨٥٩ز)ێ نڤیسینە، كو بەحسێ روودانێن خۆرستی دكەن، وەكی (تاعونێ و هشكاتییێ)، زێدەباری یێن لەشكەری و رێڤەبرنێ[٦٦].

## پێكهاتا گوندی:

بنەمالا گەرو، بنەمالا تەیار، بنەمالا شوخمەر، بنەمالا ئەسعەد كو هەمی برایێن ئێكن كورێن بشاری نە، ژ كەڤن وەرە هەر خۆجهـ و خودانێن ڤی گوندی بووینە، ژیانا گوندیا ل سەر مۆچا وكارێ چاندێ یە پێكڤە، گوند ژ گوندێن دۆسكی یە.

## ئاثار و جهێن دیارێن گوندی:

ل چیایێ بەرامبەر سێ گەلی هەنە دبێژنێ گەلیێ كاروانا كو رێكا كاروانیا بوو، گەلیێ پیرەفاتێ، گەلیێ حلی شكەفتەكا مەزن یا لێ هەی، هەروەسا جۆمێن شاوریكێ ل باشوورێ گوندی ل بنێ چیاینە، خرابێت شاوریكیا، بانیێ، گرێ عەلی، كانی كافركی، حەویكا.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤی نها بیرا بن ئەرد بۆ ڤەخوارنی یا هەی، بیرەكا بن ئەرد و سكرەك بۆ چاندنێ یێن هەین، هندەك كانی ژی هەنە وەكی: كانیا خال بیب، كانی خۆیسكا، كانیكا قورێ، كانیا بیشی، سیلاڤێ كانیەكە ل باشووری گوندی، بەلێ كانی هەمی یان كێم بووینە و یان هشكبووینە و مفا ژێ نا هێتە دیتن .

د رووداننێن شۆرشا گەلێ كوردستانێ دا و ژبەركو بارەگایی هێزا دهۆك (بارەگایێ عەلی خەلیل) یا پێشمەرگەی ل شاوریكێ بوو، چەندین جاران بوویە ئارمانجا فرۆكە و هێرشێن حكۆمەتا عیراقێ، ل سالێن (١٩٧٤، ١٩٨٤، ١٩٨٨)ێ گوند هاتییە سۆتن و خرابكرن، جارەكا دی پشتی سەرهلدانێ، شاوریكێ ل سالا (١٩٩٢)ێ هاتە ئاڤاكرن. هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٩ كەس بوو[٦٧]، بەری خراب بیت نێزیكی ٦٥ مال بوون و نها ب تنێ ٧ مال ل گوندی دژین.

سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن، ل دەستپێكا سالێن هەشتییان بنكەهی ساخلەمیێ هەبوو و ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتە ژناڤبرن و جارەكا دی نەهاتییە ئاڤاكرن.

شوینوارێن دو كاڤلە گوندان ل سنوورێ گوندی هەنە، ئەوژی كەلەكێ ل رۆژهەلاتا گوندی و كانی كافركێ ل رۆژئاڤایی گوندی[٦٨].

# گوندێ كەربلێ:

كەربلێ: دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (١٨كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، ل دۆر ناڤێ گوندی بۆچوونەك هەیە، دبێژیت: ناڤێ وێ ژ كێفل هاتییە ئانكو بەهەشتا سەر ئەردی ل دووڤ زمانێ جوهیا، ژبەركو گوندەكێ خۆشە و هەمی داروبارێ فێقی یە. بۆچوونا دیتر دبێژیت ناڤ یێ ژ كەرب (نەخۆشی) هاتی، ژبەركو دبێژن: دو برا هاتینە ڤی گوندی ئاڤاكەن، ئێكی گۆتی كەربە یێ دی گۆتی بلا دی ئاڤاكەم و هۆسا بوویە كەربل.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ حۆجاڤا.

**باشووری:** گوندێ بێشینكێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گرێپتێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئالەكینا.

د وەقفێن سولتان حسێنێ وەلی دا ئاڤری پێ هاتییە كرن، كو بەحسێ كەنیسا وی دكەت، كو حەفت قرویش و چارێكەك ل سەر هاتبوونە سەپاندن[٦٩].

هەمی خەلكێ گوندی ژ ئێك بنەمالن، دبێژنێ (گۆیی) ژ ناڤ عەشیرەتا گۆییا ل سالا (١٩١٢)ێ و

سالێن شەرێ جیهانی یێ ئێكێ ژ دەڤەرا شەرنەخێ هاتینە و مشەختی ڤی جهی بووینە، ژیانا گوندییا ل سەر كارێ چاندنێ و كارمەندییا حكۆمەتێ یە، خەلكێ گوندی نها ب عەشیرەت دۆسكی نە.

## جهـ و ئاقارێن دیار ل گوندی:

شكەفتا خەتیرە، چەمێ دیوانێ، چەمێ مزگەفتێ، چەمێت خانمێ، مێرگا كولیێ رەش، ئاشێ حەجی، كورا ب بەرەزیڤ، بەرێ خاتینا، باسكێ سركێ، دەراڤێ بەزاڤ.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی رووبارێ سادیێ یە و سێ جۆیێن ئاڤێ ژێ دهێنە سەر چەم و بیستانان، هەروەسا چەند كانی ژی هەنە وەك: كانییا سەینێ، كانییا ئاشی، كانی سركێ و پترییا ئاقارێ گوندی چەم وبیستانن.

د رووداNێن شۆڕشا كوردستانێ دا چەندین جاران گوند كەتییە بەر هێرشێن رژێمێن عیراقی، ل سالا (١٩٦٩)ێ گوند هاتە خرابكرن، پاشی جارەكا دی هاتییە ئاڤاكرن، سالا (١٩٨٦)ێ ژ ئەگەرێ هێرشێن حكۆمەتا وی سەردەمی، خەلكی گوند بەردا و هندەك ژ وان چوونە گوندێ چرانێ و هندەك ژی چوونە كۆمەلگەها كۆرێت گاڤانا، هەتا سالا (١٩٨٨)ێ گوند هاتە وێرانكرن، جارەكا دی پشتی سەرهلدانێ سالا (١٩٩٢)ێ گوند هاتە ئاڤاكرن. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٨٥ كەس بوو[٧٠]، بەری گوند خراب بیت نێزیكی ٢٠ مالان بوون و نها ژی ١٢ مال ل گوندی نە. سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن[٧١].

## گوندێ كەمەكا:

كەمەكا: دكەڤیتە دووراتییا (٢٢كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانكێش ل بنارا زنجیرا چیایێ سپی. ژ هەردو تاخێن مالێت مەلا و كرمانجا پێكدهێت. ل دۆر رامانا ناڤێ گوندی چەند بۆچوون هەنە، بۆچوونەك دبێژیت: جهەكێ پیرۆزە (كەمەكە)، ئانكو وەكی باژێرێ مەكەهێ یە، هەروەسا ناڤێ كەمەكا د بەلگەنامێن فەرمی یێن عەرەبی دا ب (كمكە) هاتییە نڤیسین، ئەڤە ژی هەر وەكی كەمەكەهـ دیار دبیت، بۆچوونەكا دیتر ل دووڤ بووچوونا (عەساڤێ كەمەكی) كو د ژیێ پتر ژ ١٢٠ سالا وەغەركری دگۆت: ناڤێ كەمەكا ژ كێمەكا هاتییە ئانكو كێم ژبەركو دەمەكی دا گوند ل نك باسكێ ئاشێ سادیێ بوویە، ل وی دەمی زارۆكێن وان ژبەر ئێش و نەخۆشییا و هەبوونا پێشییا و گیانەوەرا دمرن و نەدمان، ئەڤجا بوویە كێمەكا و پاشان كەمەكا. بۆچوونەكا دی ژی دبێژیت كو گوندەكێ كێم مرۆڤ بوویە و ناڤ یێ ژ (كێمەكا) هاتی و پشتی دروستبوونا دەولەتا عیراقی و زمانێ عەرەبی بوویە زمانێ فەرمی، كێمەكا بوویە (كمكە) و ڤان بۆچوونان پتر دووڤچوون یێ دڤێن.

ل دۆر مێژوویا گوندی دبێژن د بەرێ دا ئێزدی لێ دژیان، پشتی هینگێ دناڤبەرا سالێن (١٥٥٠-١٦٠٠)ێ ژ لایێ دو برایان ڤە ب ناڤێن سۆفی عەلی و حەجی محەمەد ڤە هاتییە ئاڤاكرن، سۆفی عەلیێ كەمەكی ئێك بوویە كو د هەوارا خانێ لەپ زێرین چووی و پشكداری د شەری دا كری وەكی د بەیتێ دا هاتی:

**صۆفی عەلیێ كەمەكی**
**تۆ ب عەبایێ بەلەكی**
**تۆ ل ناڤ شەرا گەلەكی**

دیسان دبێژن پشتی شەر ل سالا (١٦٠٨)ێ ب داوی هاتی ل ڤەگەریانێ صۆفی عەلی ل گوندێ كانی قرژالە ل رۆژئاڤایێ هەولێرێ وەغەرا داویێ كرییە و هەر ل وێرێ هاتییە ڤەشارتن.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن شەمرەخ و دێراگژنیك.

**باشووری:** زنجیرا چیایێ سپی ل بەرامبەر گوندێن ئێكمالا عەلی گێندەلا و قارقاراڤا .

**رۆژهەلاتێ:** گوندێن دەرگەلێ و مەمانێ و گرسەبیسی.

**رۆژئاڤایی:** هەردو گوندێن بێشینكێ و بابۆخكێ.

## پێكهاتا گوندی:

گوند ژ چەند بنەمالان پێكدهێت، وەكی: بنەمالێن مەلا كو وان گوند یێ ئاڤاكری و ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان لێ ئاكنجی بووینە، نها ئەو ژی بووینە چەند بنەمال، وەكی مالێن (عەبدولعەزیزی، فەیزولای، حاتەمی، ئەحمەدی، ئیمبارەكی "مالا ئمبوی")، بنەمالا زێوەیا دكەڤن دا ژ گوندێ زێوە ژ ناڤ دۆسكی ژووریا هاتینە و ئەو ژی دو جوینن، جوینەك مایە ل گوندی و جوینەك ژبەر كێشەكا جڤاكی چووینە ناڤ سلێڤانەیان، زێوەیی ژی چەند بنەمالن، وەكی مالێن (مەرعانی، زیوەیی، عەزیزی، ئینسی، عەبدی)، بنەمالا مەلاكێ "محێ ئەمینێ" ژ ناڤ دۆسكی ژووریا هاتینە، بنەمالا ئینس حەنۆكا، بنەمالا دەرگەزنی "مالا عەموی"، بنەمالا ئوسێ، بنەمالا بلكا، بنەمالا شینێ، بنەمالا سێڤیا، بنەمالا زاهری، بنەمالا عەبوی "عەبو مامیكا"، بنەمالا عەتمانی، بنەمالا ئەحمد قیروی، بنەمالا عەبێ مستەفای، مالا فەقوی، مالا مەلا عیسای، مالا باكۆزیا، مالا ئیمامی، مالا برەهیمێ سەعدی. گوند ئێكە ژ گوندێن دۆسكیان ژ تیرەییا چیاییان. بەری ب ئێكجاری ل ئەنفالان خراب ببیت نێزیكی ٧٠ مالان بوون ل گوندی هەبوون و نها ٥١ مال لێ هەنە.

گوندێ كەمەكا د روودانێن شۆرشا كوردستانێ دا چەندین جاران كەفتیيە بەر هێرشان و هاتییە سۆتن و كاڤلكرن، سالا (١٩٥٨)ێ هندەك ژ خەلكێ گوندی بووینە رێكخستییێن پارتی دیموكراتی كوردستان، سالا (١٩٦١)ێ گوند ب فرۆكەیان هاتییە تۆپبارانكرن، ل پاییزا سالا (١٩٦٣)ێ هێزێن حكۆمەتا عیراقی دگەل چەتەیان هێرش ئینایە سەر گوندی و سۆتینە، سالا (١٩٦٤)ێ گوند هاتییە ئاڤاكرنڤە، سالا (١٩٦٩)ێ

گوندێ كەمەكا



گوند جارەکا دی هاتیە سۆتن و هەتاکو جارا داویێ ل ئەنفالان ویران بوویە، پشتی سەرهلدانێ ل سالا (١٩٩٢)ێ گوند هاتیە ئاڤاکرن ڤە.

## شوینوار ل گوندی:

**قوپا:** ئەڤ قوپە ئاڤاهیەك بوو ل بنێ گۆرستانێ ب رەخ گوندی ڤە هاتیە ئاڤاکرن و دیرۆکا هندەك کێلیبان گەلەك د کەڤنارن و ل ئەنفالان ژ ناڤچوون، تنێ زیارەتێ سەلیمێ کورێ عەبدولعەزیزی مایە، ژێ وی پترە ژ سەد سالان.

**دەریێسێ:** رامانا وی ئانکو دەرێ گرتی دەریێسێ دۆرماندۆر لاتن و چ رێك ناچنێ و پێنج شکەفت دناڤ دا هەنە دبیت کاڤلە گوندەك بیت.

**چەپەرێ عەبدلعەزیزی:** کەڤر و لاتەکا خۆرستی یا بلندە، شکەفت و شوینوارێن گەلیێ ئاڤێ ل رۆژئاڤایێ گوندی.

**قەسرکێ:** کاڤلە گوندە ل رۆژئاڤایێ گوندی.

**کەلی ژارکی:** کەلایە دکەڤیتە باشوورێ گوندی ل چیای، دبیت ژارێ ناڤێ ژنەکی بیت خودانا کەلێ بیت.

**کەلێژارکێ توسنێ:** شوینوارەکێ کەڤنارە ل رۆژهەلاتێ گوندی شوینوارێن کاڤلە گوندەکی و دێرەکێ لێ هەنە.

دگەل هەبوونا هندەك گۆرستانێن کەڤن وەك گۆرستانا کەمەکا، گۆرستانا ئاڤا گویزێ، مناسبێ پشت گرکێ سۆر، گۆرستانا برکا تۆسنی، گۆرستانا سەیید غەفیری ل سەرەکانیێ کو مەرقەدێ سەیید غەفیری لێ یە و دو گۆرستان ل سادیێ هەنە، دبیت یێن کەمەکییێن کەڤن بن[٧٢]، دیسان زیارەتۆکا و گوندکێ ئامێ و... هتد.

## شکەفتێن گوندی:

ڤی گوندی چەند شکەفت هەنە، وەك: شکەفتێن گەلیێ ئاڤێ، شکەفتێت گەلی ناوسکی، شکەفتێت دەریێسێ، شکەفتا کەلێژارکێ، سەرێ پیا سندورێ، جوهنیکی، شکەفتکا حامدی، شکەفتکا دزا، هندەك ژ ڤان شکەفتا بدەست هاتینە چێکرن.

## ئاثار و جهێن دیار ل گوندی:

گرێ شێرا، سەرێ حەسیا مەمانێ، ناڤ کەندالا، گرێ حەجی حسنا، گرسەئیس، گەلی بربری، چاپانك "چەپانکی" ل رۆژهەلاتی، جویا سولتانی، گەرا زڤرکێ، ربار ل باکووری، گەلیێ عەبدولا یێ شەش تل، کورا مێکیك، بن کانییا سەرەکانیێ، باسکێ ئاشی ل رۆژئاڤای، سەرێ دەریێ خەجوکێ، سەرێ پیا سۆتی، سەرێ پیا ئەحمەد، پیا تەمەکێ، سەرێ پیا تەحتا، سەرێ دەریێ کەمەکا، سەرێ پێزراڤکێ، سەرێ پیا پەحن، سۆرك، بەربنی، دەریێسێ، بابرێ، شاتانا، دەشتا ترسا، کەڤرێت فارۆق، ئاڤا گویزێ، کورکا گولا، ئاخەسپیکێ، گەلیکێ پیرێ بابەکر، شیڤ پیڤازکێ، بامێرانکێ. هەر وەسان چەند جهـ وەکی زۆم ژی هەبوون، مینا بن بابرێ و مێرگا میرا "دالاڤا".

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی کانی و بیرێن بن ئەردن یێن کەسایەتی بۆ کارێ چاندنێ هەنە، دیسان چەندین کانی ل سنوورێ گوندی هەنە، هندەك ژ وانا هشك دبن و هندەك کێم دبن، وەك کانییا گوندی (سۆرکێ)، کانی ئاڤدەلێ، مێرگا میرا، گەلیێ ئاڤی، دەریێسێ، کانییا بهارێ، کانیکا حەمیدی، بنێت بیها، کانیکا عبدولقادری، کانیکا هژیرا توفێقی، برکا توسنێ، ئاڤا گویزێ، کانیکا خەمێ باپیری، دەحلە سیرکی، نهێلێ، کانی کەوکێ، کانیکیت فەقیا، جورنە و ل ڤان سالان سکرەکێ ئاڤێ ژی لێ هاتییە دروستکرن.

ژیانا گوندییا نها ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنێ یە و عەردەکێ باشێ چاندنێ لێ هەیە، رووبەرێ وی یێ گشتی دگەهیتە (٥٩٤١) دۆنەمێن عەردی، (٣٥٠٣) دۆنەم ب کێر چاندنێ دهێن. نها پرۆژەیێن خودانکرنا مریشکان لێ هەنە.

خواندنگەهەکا ئایینی هەتا سالا (١٩٥٨)ێ ل گوندی مابوو. کو خواندنگەهەکا گەلەك کەڤن

بوو، حەجی عیسایێ کەمەکی (ل سالا ١٩٢٨ز وەغەرکریبە) وانە لێ دگۆتن، ل (١٩٥٨/١٢/٢٥)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەها سەرەتایی ل کەمەکا هاتیە ڤەکرن [٧٣] و ل ئەنفالان دگەل گوندی هاتیە وێرانکرن و پشتی سەرهلدانێ هاتییە ڤەکرنڤە. سالا ١٩٧١ێ بنکەهێ ساخلەمیێ ل ڤی گوندی هاتبوو ئاڤاکرن و نها لێ نینە، پشتی سەرهلدانێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن و کارەب ژی گەهشتیێ[٧٤]. هەژیە بێژین ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٥٧٣ کەس بوو[٧٥].

## گوندێ کورێمێ:

گوندێ کورێمێ دکەڤیتە باکوورێ سەنتەرێ ناحیا مانگێش ل پشتا زیری ب دووراتیا (٥کم)، ناڤێ گوندی ژ کورە مێو هاتییە، دبیت ژبەرکو گوند یێ کورە و گەلەک رەز و مێو لێ هەنە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** رووبارێ سپنەی.

**باشووری،** سەنتەرێ ناحیا مانگێش.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن بەندا و کۆڤلێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بەرۆشکا سەعدوونی.

**پێکهاتا گوندی:**

بنەمالا شیرالی، بنەمالا بەرواری دکەڤن دا ژ ناڤ بەرواریا هاتینە، بنەمالا بادەرەشی، بنەمالا مەلا دکەڤن دا ژ ناڤ زێباریا هاتینە، بنەمالا سێفالی، بنەمالا ئەسعەدی ژ گوندێ بابۆخکێ هاتینە، بنەمالا سەییدا ژ گوندێ بانکا ناڤ دۆسکیا هاتینە. ژیارا گوندیا ل سەر خودانکرنا پەزی و کاری چاندنێ یە، هەمی ژ عەشیرەتا دۆسکییانە .

هەژیە بێژین دو کورێمێ هەنە کورێمێ بەرواری و کورێمێ شیرالی، نهالەك د ناڤبەرا واندا هەیە، لێ

گوندێ کورێمێ



د سەرژمێریا (١٩٥٧)ێدا وەك یەك گوند ب ناڤێ کورێمێ هاتیبە تووماركرن.

## جهێن دیار ل گوندی:

تەڤداری ل هنداڤ سپنەی، بانیا خرابا ل باكووری، گرێ بادەرەشێ، شیڤا بێشیلێ، گرێ مالا مەلا ل رۆژئاڤای، گەراڤكا ل رۆژهەلاتی، زەڤیا فەلەی، مێرگا عەولاكێ، باسكێ باسداری ل باشووری .

## زێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێ ئاڤێ ل گوندی کانینە، بەلێ هشك بووینە و سپنە ژی هشك دبیت و چ مفا ژی ناهێتە دیتن، لەوا كارێ چاندنی هەمی دێمی یە وەك چاندنا گەنم، جەهـ، زێدەباری باهیڤ و رەز و سماق .

ل گوندی گیانەوەرێن پەز و بزن و مریشك دهێنە ب خودانكرن، گیانەوەرێن كیڤی ژی هەنە وەك بەراز، گورگ، كێرویشك، ریڤی، ژیژی، سڤۆرە. هەروەسا تەیر و تەوال ژی ل ئاقارێ گوندی وەك كەو، سیسك، تڤیرك، رەشوێلە، بوم، سڤیانۆك، داركوكەو... هەنە.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكی گوندی ٤٢٢ كەس بوو[٧٦]، درووداێن شۆرشا كوردستانێ دا گوند چەندین جاران هاتیبە خرابكرن، سالا (١٩٦٤)ێ هاتیبە سوتن، سالا (١٩٦٦)ێ مالێن هندەك پێشمەرگان ل گوندی سوتن، ل ئەنفالان هەمی گوند هاتە سوتن و نێزیكی ٢٠ كەسان ل گوندی لایێ لەشكەرێ عیراقێ ڤە هاتنە گوللە بارانكرن، و هندەكێن دی ل كەلا نزاركێ هاتنە كوشتن و هندەكێن دی هەتا نها د بێ سەروشوینن.

پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ ب فەرمانا كارگێریا رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆكێ هژمار٦٨٠٤/٥٠ رۆژا ١٠/١٩ ١٩٧٠ێ بۆ یەكەمین جار خواندنگەها سەرتایی ل ڤێ گوندی هاتیبەڤەكرن، گوند بەری خراب بیت نێزیكی ١٥٠ مالان بوون و نها ب تنێ ٣ مال ل سەر گوندی دژین .هەژییە بێژین كو خواندنگەهەكا ئاییی ژی ل ڤی گوندی هەبوو[٧٧].

گرێ گازا قەسری، بادەرەش دو كاڤلە گوندن ل سنوورێ گوندێ كورێمێ[٧٨].

## گوندێ كۆڤلێ:

كۆڤلی: ب دووراتیا (٥كم) دكەڤیتە رۆژهەلاتێ ناحیا مانگێشێ، ل بنێ گرەكێ دبێژنێ (كیرێ كۆڤلی) ل جهێ گوندێ كەڤن هاتیبە ئاڤاكرن، رامانا كۆڤلی (مل یان گر)ە.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ كورێمێ.

**باشووری،** ناڤەندا مانگێشكێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بەندا.

**باشوورێ رۆژهەلاتی،** گوندێ مەجلمەختێ.

## پێكهاتەیا گوندێ كۆڤلی:

بنەمالا هەسن فەتا، بنەمالا شێخێ، ئاغاكێ، بنەمالا محمد حسین كو ئەڤ بنەمالا ژ كەڤندا ژ گوندێ راڤینا ل ناڤ بەرواری بالا هاتینە، خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسكی نە، ژیانا خەلكێ گوندی یا هندەكا یا ل سەر كارێ چاندنێ و كارێ حكۆمەتێ یە.

## ئاقارێن گوندی:

نهالا گویزێ زەڤی وچەمێن داروباری نە، چەمێ ب رەشاد، نهالا مێمێ كانیبەكا ئاڤێ یا لێ وەكی دی هەمی زەڤیێن چاندنێ نە، بەرۆژی ئەڤ ئاقارە دكەڤیتە دناڤبەرا مانگێشێ و گوندێ مەجلمەختی دا، سەرێ كێری ل هنداڤ گوندی، باسكێ مناسبی، كادزا هەمی چەمێن فێقی نە، عەلیاسی، نهال گەرمكا، كهورا هەمی رەز بوون نها خرابەنە.

## زێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی كانیك و برك و بیرن كو مفا بۆ ڤەخوارنێ ژێ دهێتە وەرگرتن، ژ كانیێن گوندی

کانیکا گویزێ، کانیا گوندی، برکا کوشتیا ئەڤە بەرێ جهێ بالاڤا بوو.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٤١٣ کەس بوو[٧٩]، گوندێ کۆڤلی د شۆرشا گەلێ کوردستانێ دا سێ جاران هاتییە خرابکرن، جارا ئێکێ ل سالا (١٩٦٣)ێ، جارا دووێ ل (١٩٦٨)ێ و جارا دوماهیێ ل ئەنفالان، پشتی سەرهلدانێ گوند ل سالا (١٩٩٢)ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە، گوند بەری خراب ببیت نێزیکی ٧٥ مالان بوون، نها نێزیکی ١٥ مالان ل سەر گوندی دژین. سالا (١٩٥٩)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن[٨٠]. خواندنگەهەکا ئایینی ژی ل ڤی گوندی هەبوو[٨١].

ژ کەساتیێن ناڤدارێن ڤی گوندی (حاجی قادرێ کۆڤلی)، کو ل دەستپێکا چەرخێ چوارێ مشەختی مریە، مرۆڤەکێ نە خویندەوار بوو، بەلێ شعرەکا ژنهاتی یا رومانسی دگۆت، شعرێن خۆش و رەهوان دگۆتن، شێخ غیاسەددینێ نەقشبەندی د کتێبا خۆ دا (ترجمة ادباء بهدینان) گەلەك بەحسێ وی یێ کری[٨٢].

## گوندێ گرێ پتێ:

گرێ پتێ: دکەڤیتە دووراتییا (١٨کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش، گرەکێ بلند دکەڤیتە هنداڤ گوندی ل باکووری، دبێژن ناڤێ ژنەکێ (پتێ) بوویە و دەسەلات ل ڤی جهی و ڤێ دەڤەرێ کریە ژبەرکو ئەڤ گرە شویرهین کەلایەکێ لێ هەنە ژبەر هندێ دبێژنێ گرێ پتێ، ل پشت گرێ مەزن گرەکێ بچویکتر هەیە هەر ئەو ژی یێ شویرهە کریە، کو نیشانا وێ چەندێ یە کو هندەکان دەستەلاتداری ل ڤی جهی کریە.

### سنوورێن گوندی:

**باکوور و باشوور و رۆژهەلاتی:** گوندێ دێراگژنیك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن کەریلێ و حۆجاڤا.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی هەمی ژ ئێك بنەمالن (بنەمالا هەمزێ گرێ پتی نە)، دکەڤندا ژ ناڤ عەشیرەتا دۆسکی ژووریا ژ گوندێ توتمێ هاتینە، ژانا

**گوندێ گرێ پتێ**



گوندییان یا ل سەر مۆچان و کارێ چاندنێ، خەلکێ ژ عەشیرەتا دۆسکی نە.

ژ جهێن دیار ل گوندی: میسافاکێ رەزن، گەرا دوشەڤی ل سەر توخیبی دگەل دێراگژنیك، بەرهەوکێ جهێ بێدەرا بوو، دەحل، بەرگری .

## زێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی بیرەکا ژێر ئەردە بۆ ڤەخوارنێ و هندەك كانی هەنە، وەك: كانیكا پارزی، كانییا دەحلکێ بچویك، سکرێ سماقێ، کانیکا خەندەکێ، کانیکا عەدلایێ، کانیکا بیهێ چەم و بیستان ل بەر دهێنەکرن، بەلێ ئاڤ گەلەك کێم بوویە.

گەلەك جاران گوند تووشی سۆتن و هێرشێن لەشکەرێ بەرێ یێ عیراقێ بوویە، ب تایبەت ل سالێن هەشتیان، ل سالا (١٩٨٨)ێ گوند هاتییە خرابکرن و کاڤلکرن، و ل سالا (١٩٩٢)ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، گوند بەری خراب بیت نێزیکی ١٢ مالان بوو، نها ٦ مال یێ ل گوندی دژین .

هندەك شوینوار ل ملا هنداڤ گوندی ل باشووری و هەتا دگەهیتە گرێ باکوورێ گوندی هەنە، هەمی شوینوارێن کاڤلە گوندان بووینە، ل نهالا رۆژئاڤایێ گوندی سێ جهـ هەنە نیشانا جهی زیرەڤانا یە، کو دبیت زیرەڤانێن کەلا سەرێ گری بن[٨٣].

## گوندێ گەربەراسکێ:

گەربەراسکێ: دکەڤیتە ئالیێ رۆژهەلاتێ ناحیا مانگێش ب دووراتییا (١٥کم) ژسەنتەرێ ناحیێ ل جهەکێ کویر هاتییەئاڤاکرن، دبێژن دکەڤن دا ل ژێریێ جهێ نها گوند لێ هاتییە ئاڤاکرن گەرەکا ئاڤێ هەبوو و بەراز دهاتنە تێدا و ژبەر هندێ ب گەربەراسك هاتە ناڤکرن.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێن زێوکا کەندالا و زڤنگێ نە.

**باشووری،** چیایە و ل پشت چیای سیارەتویکایە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گۆلێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مەجلمەختێ.

## پێکهاتا گوندی:

بنەمالێن عەلی، بنەمالا شەهبازی کو هەردو پسمامن و بنەمالێن سەرەکینە ل گوندی، بنەمالا قادرێ موسای، بنەمالا عەبدولا سالحی کو هەمی خۆجهێن گوندی بووینە، خەلکێ گوندی هەمی کوردێن موسلمانن ژ عەشیرەتا دۆسکییا، نها ژیانا خەلکێ گوندی پتری ل سەر مۆچا و چاندنێ یە .

## جهـ و ئاثارێن دیار ل گوندی:

شیڤا شاتانا، مەیدانۆکا، نزارا زەڤی کو رەزن، رەژی کەرا، گرێ وریا، شیڤا شتلا، خرابێ میسێ، کوکەلکێ، بەزا شێری، گرێ کولکی، سەر کورێ، بن کەڤری، بانییا ئێکمالێ پتری رەز و باهیڤن، چەمێ مێویژا، چەمێ سەعیدی، چەمێ مێویژا بیستانن، برەنگەکێ گشتی ئاڤارێ گەربەراسکێ پتری رەزێن تری نە و بەرهەمێ مێویژا گەلەك هەیە .

## زێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ بیرێن سەر ئەردن دگەل کانییا هیرڤست، کانییا گوندی هندەك چەم و بیستان یێ ل بەر، بەلێ پتریا سالان کێم دبن و مفا ژێ ناهێتە وەرگرتن. بەرهەمێن چاندنێ ژی گەنم و جەه بوون، بەلێ باراپتر رەز و باهیڤن، دگەل هەبوونا داروبارێ فێقی وەك خۆخ، سێڤ، هنار، هژیر، هرمیك، تری.

د روودانێن شۆرشا کوردی دا چەندین جاران گوند هاتییە بەردان و چووینە د کۆلکان ڤە، هەتا سالا (١٩٨٨)ێ کەتییە بەر ئەنفالان و ویرانکرن، جارەکا دی پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٣٨٤ کەس بوو[٨٤]، بەری گوند خراب بیت نێزیکی ١٠٠ مالان بوو و نها نێزیکی ٤٠ مالان ل سەر گوندی نە. خواندنگەهـ ل سالێن شێستان دا هاتییە ڤەکرن[٨٥].

## گوندێ گوند کۆسە:

(٢٠کم) ژ باکووری رۆژئاڤای سەنتەرێ ناحیێ دووره، دکەڤیته سەر لێڤا رووبارێ خابووری، خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٢٢)ێ پشتی شەرێ جیهانێ یێ ئێکێ و ژبەر راکرنا فەرمان و کۆمکوژیان دژی مەسیحیان ژلایێ دەولەتا ئۆسمانی ڤە ژ هەکارێ قەستا باشوور کریە، ل بەراهیێ ل چەند جهان ماینه وەك (ناڤ بەرواریا و ناڤ گولیا) پاشان هاتینه گوند کۆسەی و لێ ئاکنجی بووینە، رامانا گوند کۆسە ب زمانێ سریانی (گنپە) ئانکو بیستان و کۆسە ناڤێ زەلامەکی بوویە ئانکو بیستانێ کۆسەی.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووبارێ خابووری.

**باشووری:** گوندی ئۆزمانا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن بالەکا وئێکمالێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باجلێ.

### پێکهاتا گوندی:

ژ بنەمالێن گوندی ئەڤە نە: بێ سەورو، بێ بنیامێ، بێ دکا، بێ نەوریایا، بێ سولامن، بێ ئێجێ، بێ هرمز، بێ ئوشانا، بێ زیزو، بێ ستەبنو، بێ چوکا، هەمی پێکڤە ژ ناڤ تیاریا هاتینە، ل دەسپێکێ هندەك ل باکوورێ گوندی ل گوندێ نازێ بوون و هندەك ل گوند کۆسە بوون، پاشان ژ بۆ خۆ پاراستنێ ژ فەرمانا سالا (١٩٣٣)ێ خۆکرنه ئێك گوند، ب هاریکاریا گوندێن موسلمانێن دەوروبەری خۆ، شیان خۆ ب پارێزن و چ زیان نە گەهشتنێ، خەلکێ گوندی ژ ئایینێ مەسیحی نە، ژ نەتەوا ئاشووری نە، گوند سەر ب گوندێن عەشیرەتا دۆسکی یە، د بنەرەت دا ژ عەشیرەتا تیاری نە ژ بابکێ گیەی.

ئاڤارێ گوندی پتر چەم و بیستانن ژبەرکو گوند یێ ل سەر خابووری، ژ وان جهان ژی: چەمێ بنی، چەمێ سەری یێ ل بەر خابووری و ئەڤ چەمە یێن گوند کۆسە و ئێکمالێ هەردو یانە، هەروەسا بانیێ زەڤی نە، کۆز یا پاوانکریە بو چەرا پەزی، گرێ مانگا، گرێ گورگا، گرێ غازی، تلخێ، چەمێ مانگێ، چەمێ نازێ، قەسیلا زەڤی نە، رومتا تمرێ، بەقچانێ بیستانن.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی رووبارێ خابووری یە کو دبیتە ناڤبەر دناڤبەرا سنوورێ عەشیرەتا دۆسکی و عەشیرەتا سندی یا ل ئالیێ دی یێ خابووری ل سنوورێ قەزا زاخۆ، دیسان چەند کانی ژی هەنە وەك کانی قوربانا، کانییا نازێ، کانی قاشا، بەلێ چاندن و ئاڤدانا دەرامەتی هەمی ل بەر ئاڤا رووبارێ خابووری یە .

ژ خوارنێن بەربەلاڤ ل گوندی خوارنێن کوردەواری نە، بەلێ ب ناڤێن سریانی وەك دخۆا ئانکو کەشك، دولمە، بریانی، کوتلك، کفتانێ ئانکو کفتە یان کڤشك .

د رووداننێن شۆرشا کوردستانێ دا ل سالا (١٩٦١)ێ ب فرۆکەیێ هاتیە تۆپبارانکرن، هندەك بریندار بووینە، سالا (١٩٨٨)ێ ل هەوێن ئەنفالان گوند هاتە خرابکرن و پتری ٣٠ کەسان ژ خەلکی گوندی بوونە قوربانی، جارەکا ل سالا (١٩٩٢)ێ گوند هاتە ئاڤاکرن ڤە.

ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٣٦ کەس بوو[٨٦]، گوند بەری خراب ببیت نێزیکی ٤٥ مالان بوون، نها ٢٢ مال ل گوندی نە، سالا (١٩٦١)ێ خواندنگەهـ ل گوندی ڤەبوویە و دکەڤن دا کەنیسە هەبوویە، حکۆمەتا هەرێمێ کەنیسەك پشتی سەرهلدانێ بۆ ئاڤاکریە، هۆلا تازییا ژی ل سالا (٢٠٠٦)ێ هاتیە ئاڤاکرن .

گوندێ نازێ خرابە گوندەکە ل باکوورێ گوندی[٨٧].

## گوندك نەبی:

گوندك نەبی: گوندەکە دکەڤیتە دووراتییا (١٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، ل بنێ چیایی

دناڤا گەلییەكی دا ل سەر ریا مانگێش- باگێرا، ل دۆر بنیاتێ ناڤێ گوندی دبێژن ئەو بخۆ ژ گەلەك گوندان پێكهاتیبە و گەلەك گوند تێدا خرڤەبووینە، بووینە ئێك گوند و نەبی ددەمەكی دا موختارێ گوندی بوویە لەوا بوویە گوندك نەبی یان گوندێ نەبی، گوندێ نها ل بەرامبەری جهێ گوندێ كەڤن ل سەر جادا گشتی هاتییە ئاڤاكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ مەجلمەختێ.

**باشووری:** چیا دبیتە سنوور دگەل گوندێن دەوروبەر و هەڤسنوورە دگەل كۆمەلگەها باگێرا و گوندێ كەڤلەسنێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن لۆمانا و سیارەتویكا ل پشت چیایی،

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێركێ یە هەر ئەوژی دكەڤیتە پشتا چیای .

### پێكهاتا گوندی:

بنەمالا خازێ ژ گوندێ بێسفكی هاتینە، بنەمالا قەپلانی، بنەمالا شویكەیا، بنەمالا سەییدا د دەستپێكا سەد سالا چوویی ژ كەلیتانێ باكوورێ كوردستانێ هاتینە. ژیانا خەلكێ گوندی پتری ل سەر مۆچانە، بەلێ هەر كارێ چاندنێ ژی دكەن، خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسكی نە.

### جهـ و ئاتارێن گوندی:

پتریا گوندی یێ ئاڤی یە و چەم و بیستان و مێرگن، هەروەسا دناڤبەرا چیایاندایە ژ ئاقار و جهێن دیار ل گوندی، رەزكێ خرابی، گەلیێ شێخی هندەك ناوسكێن لێ هەین وەك ناوسكا خالاسكا، گەلیێ پێزیكێ كانی یە چەم و بیستان ل بەر دئێنە چاندن، دەحلێ گوندكا، مێرگە رەشێ، مێرگا پەلكا، شیڤا مارا ل چیایی، سەركێش ل چیایێ هنداڤ گوندی، قوپێ گوندكا دبێژنە كومتا چیایی دناڤبەرا گوندكا و ئەلكیشك وسیارەتیكا دا دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ گوندی، بەرۆژی دبێژنە چیایێ ل هنداڤ گوندی ل رۆژئاڤای .

### زێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤی ل گوندی كانی نە، ژ وانا: كانیا گەلیێ پێزیكی كو دبیتە رووبار هەتا دگەهیتە كۆمەلگەها باگێرا، كانیا پێزیكی، كانیا سكری، كانیا گوندێ كەڤن چەم و بیستان ل بەر دهێنە چاندن. بەرهەمێن چاندنێ ل گوندی چەندین چەمێن داروباری هەنە وەك سێڤ، خۆخ، هنار، مشمش، هژیر، حلیك، ترێ تایفی دناڤ دا هەنە، هەروەسا دارێن گویز، باهیڤ، رەزێن تری ژی هەنە، زێدەباری چاندنا گەنم و جەهـ و نۆك وەك دەرامەتێ دێم .

ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٠٦ كەس بوو [٨٨]، د روودانێن شۆرشا گەلێ كورد دا گوندك نەبی چەندین جاران كەتییە بەر هێرشێن حكۆمەتا عیراقێ و هاتییە خرابكرن، سالا (١٩٦١)ێ ل شەرێ لۆمانا گوند هاتییە سۆتن، جارەكا دی ل سالا (١٩٧٤)ێ ب تۆپ و تەیارا هاتەخرابكرن، سالا (١٩٨٨)ێ ب ئێكجاری هاتە خرابكرن. گوند بەری خراب ببیت نێزیكی ٥٠ مالان بوو، نها ٣٢ مال یێ ل سەر گوندی. سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن .

چەند كاڤلە گوند ل رەخۆدۆرێن گوندی هەنە ئەوژی: گركێ نالبەندا، رەزكێ خرابی، مورتەزا، كانیا بیهی[٨٩].

## گوندێ مەجلمەختێ:

مەجلمەختێ: دكەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیا مانگێش ب دووراتیا نێزیكی (٧كم) ل سەر رێیا مانگێش– دهۆكێ، ل سەرێ گرەكێ بلند ل بەرامبەر چیایێ بیك ستیری یان (بیستێری) ئەوێ دكەڤیتە باشوورێ گوندی هاتییە ئاڤاكرن، بنارێ چیایی هەمی رەز و بیستان و داروبارێ ڤێقی نە، گوند یێ ناڤدارە ب كەتنا بەفرەكا مەزن ل وەرزێ زڤستانێ.

**ناڤێ گوندی:**

ل دۆر ناڤێ گوندی دهێتەگۆتن: دبیت ژ پەیڤا (مجال وەخت) دەلیڤە وەخت هات بیت، ژ بەر کو هەمی دەما بەفر لێ دبارێ ئانكو چ دەم نەبوو ل زڤستانا ژبەر بەفرێ، هەروەسا بۆچوونەكا دیتر دبێژن مەجلمەخت پەیڤەكا ئارامی یە ب رامانا (مێرگ و دەشت).

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** هەڤسنووره دگەل گوندێن زێوكا كەندالا و بەندا و كۆڤلێ.

**باشووری:** گوندێن گوندك نەبی و دێركێ ل پشتا چیایی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئەلكیشكێ.

**رۆژئاڤایی:** سەنتەرێ ناحیا مانگێش.

**پێكهاتا گوندی:**

بنەمالا زاهری (ظاهری) و بنەمالا تەیاری و بنەمالا فەتەحی كو هەرسێ برایێن ئێك بوون، كورێن كەلەشی بوون، دكەڤن دا ژ دەڤەرا (جولەمێرگێ) ژ گوندێ ماریونسێ ل باكوورێ كوردستانێ هاتینە، ل گوندێ بێسفكی ماینە و پاشان (زاهرێ كەلەش) هاتییە مەجلمەختێ ئاڤاكرییە، ل وی دەمی برازایی وی (رەشید) ل گوندێ (پێزیكی) بوو ل باشوورێ گوندی، پشتی شەری جیهانی یێ ئێكێ و فەرمانا مەسیحییان ژلایێ دەولەتا ئۆسمانی ڤە هندەك ژ مەسیحییان هاتینە مەجلمەختێ تا فەرمانا مەسیحییا ل دەستپێكا سالێن سیهان (ل سالا ١٩٣٣ فەرمانا فەلا راكربوو) باركرییە و چووینە وەلاتێ سوریا، هەروەسا ل دووڤ سەرهاتییان د دەمەكی دا ئێزدی ل گوندێ مەجلمەختێ بووینە ل گرێ غەبری ل باكوورێ گوندێ نها و كانییەكا ئاڤێ هەبوویە، بەلێ پشتی ئێزدی چووین ئەو كانی هەرفاندییە دا

چیایێ بیستێر ل بەرامبەرا گوندێ مەجلمەختی و ل لایێ باشووری



کەس مفای ژێ نەبینیت و میرێ ئێزدیان ل چیایێ بیك ستیری بوو، ب داڤەرستێ خوارن و پێدڤی ژ گرێ غەبرێ تا کوپێ بیستیری ڤەدگوهاستن. ژیانا گوندییان ل سەر کارێ چاندنێ و خودانکرنا پەزی یە، خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسکی نە .

### جهـ و ئاڤارێن دیار ل گوندی:

ل باشووری ل بەرامبەر گوندی چیایە، کوپێ ژ هەمیا بلندتر بیك ستێرە و ل رۆژئاڤایی وی دبێژنێ میر بڤر، دەربێ بەنکێ و چەند گەلی یێن تێدا وەك گەلیێ مهەمەد و گەلیێ فرەهـ گەلیێ ناوسکێ و دەحلکێ گورگا ل چیایی، ل رۆژهەلاتی سەرکورکا، پاسیارکا، بانیێ هەمی زەڤیێن چاندنێ نە، ل پشتا گوندی ل باکووری زیرن، کۆزا زاهری، تەمباڤێ ،هەروەسا گرێ غەبرێ، گرێ جندکێ، بەرهەڤشیا ل رۆژئاڤای و شیڤا باسکی، شیڤا بیتا ل رۆژهەلاتی، بیرکێ، کانی خۆلپێ ل باشووری.

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی بیرن هندەك بیرێن بن ئەرد هەنە و هژمارەکا مەزنا بیرێن سەر ئەرد بۆ چاندنێ هەنە و مفا ژێ دهێتە دیتن، هەروەسا کانییا گوندی.

بەرهەمێن چاندنێ ل گوندی گەنم، جەهـ نۆك، باجان سۆرك، گوندۆر.... دهێنە چاندن، ژ بلی داروبارێ فێقی وەك سێڤ، خۆخ، هنار، هژیر، هرمیك، حلیك یێن هەین، دگەل هەبوونا رەز و باهیڤ وسماقێ ژی، زێدەباری هەبوونا بەرهەمێ خۆرستی ل چیایی وەك بەروی، مازی، هەلهەلۆك، کەزان، بیهۆك، کێرات، کەڤۆت.

گوند د شۆرشا کوردی دا جهێ هاتن و چوونا پێشمەرگەی بوویە، لەوا چەندین جاران ل سالێن (١٩٦١- ١٩٦٣- ١٩٦٨)ێ هاتییە خرابکرن و سۆتن و کاڤلکرن، سالا (١٩٨٨)ێ کەتییە بەر ئەنفالان، سالا (١٩٩٧)ێ ئێك مال چوویە سەر گوندی، پاشان زێدەبووینە و خەلکی بخۆ گوند ئاڤاکرینە.

ل ناڤەراستا سالێن پێنجیان خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، د سالێن شۆرشا ئەیلوولێدا هاتییەگرتن، پشتی پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ ل ١٩٧٠/١٠/١٩ێ سەرژنوو هاتییەڤە ڤەکرن. ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٣٧ کەس بوو [٩٠]، ل سالا (١٩٨٨)ێ د هەوا ئەنفالاندا گوند هاتییە خرابکرن و نها خواندنگەهـ لێ نینە، بەری گوند خراب ببیت نێزیکی ٣٠ مالان بوون، نها تنێ ١٠ مال ل گوندی نە.

گرێ غەبرێ ل رۆژئاڤایی گوندی، باسکێ کانیێ ل باکووری، کەڤرێت گەرگامیشێ ل باشووری دهێنە نیاسین وەك کاڤلە گوند ل سنوورێ گوندێ مەجلمەختێ[٩١].

## گوندێ ملهمبانێ:

ملهمبانێ: دکەڤیتە دووراتییا (١٦کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، ل سەر کانییەکا ئاڤێ هاتییە ئاڤاکرن، ملهمبان ئانکو ئەو مل یان گرێ گەلەك با لێ دهێت.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ راسلعەینێ.

**باشووری:** گوندێ دوبلیا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بەرۆشکا سەعدوینی.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئەردا.

### پێکهاتا گوندی:

هەمی ئێك بنەمالن ژ بابکێ حەسەن شەهوانی، کورێن وی بووینە بنەمال ب ناڤێ بنەمالا مستەفای و بنەمالا حێولی و بنەمالا سماهیلی و بنەمالا قاسمی، نها هەر ئێك بنەمالەکە کو دکەڤن دا ژ گوندێ (ئەرتیس)ێ عەشیرەتا دۆسکی ژووری هاتینە، ژیانا خەلکی گوندی پتر داهاتێ چاندنی و وەرگرتنا مۆچانە، خەلکێ گوندی هەمی عەشیرەتا دۆسکی نە.

ملهمبانێ گوندەکێ ئاڤی یە و ئاڤارێ وان پتری چەم وبیستانن ژ ئاڤارێن گوندی: جۆما ملهمبانێ ل

باكوورێ گوندی چەمێن ئاڤی نە، مێرگەرەش ئەو ژی چەمن، ملهمبانا خراب زەڤی نە هەروەسا زیرێ لاڤێ و گهورا باهیڤێ، جەلالی، زیرێ قلوس ئەو ژی كۆزە جهی چەرینا پەزی یە، بانیا عەبیجال، گەلی بزنكی ل نێزیك سنوورێ گوندێ ئەردا، هەفشێ كەرێ و بەستا حەیرانی، شكەفتا عەلوی كو پتریا وان چەم و بیستانێن ئاڤی نە و هەروەسا جهێ دەرامەتی دێم ژی هەیە .

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی ژ چەند كانیا پێكدهێن، وەكی: سەروكانییا ملهمبانێ، كانیا خمخۆرێ، كانیا سێلكێ، كانیا مێرگە رەشێ، كانیا حەم رەشێ، كانیا سلێمان سیسكی، شیفكا حەجی قاسمی، بركا داوودی هەمی مفا ژی دهێتە وەرگرتن بۆ ئاڤدانا چەما و چاندنا بیستانان.

پشتی روودانا شۆرشا كوردستانێ ل دەستپێكا سالێن شێستان جارەكێ گوند هاتییە سۆتن، پشتی ئاڤاكری جارەكا دی ل سالا (١٩٦٦)ێ ژلایێ چەتانڤە هاتە كاڤلكرن ڤە، سالا (١٩٨٣)ێ گوند هاتییە بەردان و ل ئەنفالان ب ئێكجاری هاتییە وێرانكرن، سالا (١٩٩٢)ێ گوند هەر ل جهێ كەڤن هاتییە ئاڤاكرن.

گوندێ ملهمبانێ بەری خراب ببیت نێزیكی ٨٠ مالان بوون و نها نێزیكی ٣٠ مالان ل سەر گوندی دژین، سالا (١٩٦٨)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و بەری هینگی بۆ خواندنێ دچوونە گوندێ بەرۆشكا سەعدوینی.

ل ئاقارێ گوندی هندەك شوینوارێن كاڤلە گوندان هەنە مینا ملهمبانا هیموی، ملهمبانا خراب، ئێكمالێ، كاڤلێت گوندێ عەلی، گرێ رومیا[٩٢].

## گوندێ ناڤدارا:

گوندێ ناڤدارا: دكەڤیتە دووراتیا (١٨كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش ژئالیێ باشوورێ رۆژئاڤای ڤە، گەلەك دار ل گوندی هەبوون و هەنە و گوند ل ناڤ داران بوویە، لەوا ب ڤی ناڤی هاتییەناڤكرن.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ زێوكا عەبۆی.

**باشووری:** گوندێ بروحەجەرا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شاوریكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئەلندكێ.

## پێكهاتا گوندی:

گوند هەمی ئێك بنەمالە دبێژنێ مالا عەرەبی ژ گوندێ گەلناسكێ هاتینە، بەری ئەو بهێن ئەڤ جهە ئاقارێ گوندێ شاوریكێ بوو، پاشان ژ شاوریكییان كرین و ل سالێن چلان ئاڤاكرن، ژیانا گوندیان ل سەر مۆچا و كارێ چاندنێ یە، خەلكێ گوندی هەمی كوردێن موسلمانن ژ عەشیرەتا دۆسكیا .

ژ جهێن دیارێن گوندی: نهالا بۆتێ، كانی بەنیشتێ، نزارا شێخالی، گرێ تەمەری د سەر گوندی دا، نهالا گردولاڤێ.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی رووبارە ژ گەلیێ گەرمی دهێتن و سێ جۆیێن ئاڤێ ژێ دهێنە سەر ئەردێ چاندنێ و چەم و بیستان ل بەر دهێنە چاندن، ژبەرهەمێن چاندنێ ل گوندی هەمی داروبارێ فێقی یە وەك خوخ، ترێ تایفی، هنار، حلیك، مشمش، ژ بلی دارێن سپیندارا و چاندنا دێم یا كێمە.

گوند ل سالا (١٩٨٤)ێ ژلایێ چەتان و لەشكەرێ عیراقێ نیڤ نیڤە هاتە سۆتن و بەردان، سالا (١٩٨٨)ێ ب ئێكجاری هاتە خرابكرن، سالا (١٩٩٢)ێ هاتەڤە ئاڤاكرن، گوند بەری خراب بیت نێزیكی ٢٠ مالان بوون، نها ١٠ مال ل گوندی دژین.

سالا (١٩٧٩)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتەڤەكرن و ژبەر كێمیا خویندكاران، ل سالا خواندنێ (٢٠١٣-٢٠١٤)ێ هاتەدائیخستن و خویندكار بۆ خواندنێ دچنە گوندێ شاوریكێ[٩٣].

## گوندێ ناڤشکێ:

ناڤشکێ: دکەڤیتە دووراتییا (١٢کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگیشێ، ل دۆر ناڤێ گوندی گەلەك ئاخفتن هەنە، بەلێ یا بەرئاقل دبێژن یا ژ ناڤشکان هاتی، ئانکو دەمێ ئێکی مولکێ خۆ د داڤ یێ دی وەك رەهینە و هندەك پارە یان زێر ژێ وەردگرتن هەتا بۆ دزڤراند، پاشی ئەو ناڤشکانە ل سەر ملکێ وی رادکر.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ئیکمالێ.

**باشووری:** گوندێ زێوکا عەبۆی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئەردا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئۆزمانا.

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا ئوتا (بنەمالا سلێمانا) بنەمالا هەرە مەزنە ل گوندی، هەروەسا بنەمالا بارانییا، بنەمالا مەلا، بنەمالا گۆڤەییا، بنەمالا سێڤی، بنەمالا (پیرئێزدین) کو نها ل گوندێن ناڤشکی و ئۆزمانێ ئێك بنەمالن، بنەمالا محدارا ئەڤ بنەمالە دکەڤن دا ژ ناڤ مزووری یا هاتینە، بنەمالا سادینی ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە، بنەمالا زێوکیێت کۆچەر ژ ناڤ عەشیرەتا کۆچەران هاتینە، ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر وەرگرتنا مۆچا و کارێ چاندنێ یە، خەلکێ گوندی ژ کوردێن موسلمانن ژ عەشیرەتا دۆسکییا.

### ئاقار و جهێن دیار ل گوندی:

بن مێرگا، وارگەهی، نەرما ل رۆژئاڤایێ گوندی، مەکەها، شیڤا کیر، بێرورێ، ل بەری ڤەی گوندی ل باشوورێ، ئاقاری گوندی باراپتر زەڤیێن چاندنێ و رەزن، ب تنێ ل بەری ڤە هندەك کانی هەنە .

پتریا ئاقارێ گوندی یێ دێمە، نها هندەك بیرێن کویر (ئیرتیوازی) بۆ ڤەخوارنێ کۆلاینە و بۆ چاندنێ ژی مفا ژێ دهێتە وەرگرتن، هەروەسا چەند کانی ل باشوورێ گوندی ل بەرێڤەی زیری هەنە، ژ وانا کانییا ئاڤیکێ، چناروکێ، تەحتیکی، کانی سویرکێ،

گوندێ ناڤشکی



دەحوکێ هندەك بیستانان ل بەر دکەن و هەروەسا کانییا قاسوی ل رۆژهەلاتێ گوندی هەیە، بەلێ ئەڤ کانییە هەمی گەلەك کێمبووینە و چ مفایێ بەرچاڤ ژێ ناهێتە وەرگرتن .

گوندێ ناڤشکێ ژبەر هێرشێن حکومەتا عیراقێ چەندین جارا هاتییە بەردان، هەتاکو ل هەوێن ئەنفالان ب ئێکجاری هاتییە خرابکرن و هەرفاندن، سالا (١٩٩٢)ێ گوند هاتە ئاڤاکرن ڤە.

سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، سالا (٢٠٠٦)ێ بنگەهێ ساخلەمیێ هاتییە ڤەکرن کو خەلکێ وان گوندێن دەوروبەر هەمی مفای ژێ وەردگرن، هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٢٧٢ کەس بوو[٩٤]، بەری گوند بهێتە خرابکرن نێزیکی ٨٠ مالان بوون، نها ٢٧ مال ل سەر گوندی دژین.

نیشانێن کاڤلە گوندان ل سنوورێ گوندی هەنە وەك سێڤیا، زیارەتێ کانییا، ناڤشکا ژووری[٩٥].

## گوندێ ئاشانکێ:

گوندێ ئاشانکێ دکەڤیتە دووراتییا (١٧کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش ل ئالیێ رۆژئاڤای، دبێژن گەلەك ئاش لێ بوون لەوا دبێژنێ ئاشانك.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ چەمترێ.

**باشووری:** گوندێ دەرگەلا شێخا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئۆزمانا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زیناڤا

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا شێخا، بنەمالا حەسوی، بنەمالا بلك کو هەمی د سالێن حەفتیان ژ گوندێ دەرگەلا شێخا هاتینە و بەری هینگی ئەڤ جهە ئاقارێ گوندێ دەرگەلا شێخا بوویە، خەلکێ گوندی هەمی کوردێن موسلمانن ژ عەشیرەتا دۆسکییا.

### ئاثار و جهێن دیار:

بانیێ، وارێ ئیبوی، ترپاتوکێ زەڤیێن چاندنێ نە، چەمێ مزگەفتێ، پشت دەحلی، چەمێ بەلکی، تی قەرەچێ هەمی چەم و بیستانن و هەروەسا چەندین رەز هەنە ل پشتا گوندی، وارکێ قولیا.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

رووبارێ ئاشانکێ، نهالا سەرئاڤکێ، سەرەکانییا گوندی کو چەم و بیستان پێ ل بەر، د رووباری دا چەند گەر هەنە، ژوان گەرا بۆتا، گەرا کۆترا، گەرا پارسا، بەرهەمێن چاندنی تنێ هندەك گەنم دهێتە چاندن ژ بلی داروبارێ فێقی وەك خۆخ و سێڤ و مشمش و حلیك و هرمیك و هنار و هژیر و تری.

سالا (١٩٧٨)ێ گوند ب ئێکجاری هاتییە خرابکرن و بەردان، جارەکا دی ل (١٩٩٢)ێ هاتە ئاڤاکرن و پاشی جارەکا دی هاتە بەردان، بەری خراب ببیت ١٤ مال بوون. شوینوارێن گوندی جهەکێ لێ دبێژنێ دارا شێخێ هیزانی و مەزاری وی ل وێرێ یە، شوینوارێن کاڤلە گوندەکی ل باشوورێ گوندی کو دبێژنێ ناڤ کاڤلا هەیە [٩٦].سولتان حسێنێ وەلی سێ قرویش و نیڤ ل سەر سەپاندبوون، دا کو ببنە وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل ئامێدیێ[٩٧]، ئەڤە ب خۆژی نیشانا کەڤناتییا ڤی گوندی یە.

## گوندێ ئالەکینا:

ئالەکینا: دکەڤیتە دووراتییا (١٨کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش ژ ئالیێ باشوورێ رۆژئاڤای ڤە، ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن دبیت ژ کین (نەڤیانی) هات بیت.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ بانەسۆرا.

**باشووری:** چیایە .

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کەربلێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندی شاوریکێ.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند هەمی ژ بنەمالا (شێخ مەحمود ئالەکینی)نە، تنێ ئەڤ بنەماله ل گوندی یه دکەڤنن ژ گوندێ مەمانێ هاتینه ئالەکینا، ب عەشیرەت ئەڤ گوندە دۆسکی یه.

**جهـ و ناڤارێن دیارێن گوندی:**

بێدەرکا کەربلێ، کاڤلا ل رۆژهەلاتی، نزارێ ئالەکینا رەزن دکەڤنه رەخێ باشووری، کۆزێ ل باکووری، نهالا گوندی، چەمێت خرابا ل رۆژئاڤای، پیاکا جامێ ل چیایێ بەرامبەر ل باشووری.

ژێدەرێن ئاڤێ رووبارێ صادیی یه ل بنێ گوندی بیستان و چەم ل بەر کرینه، هندەك کانی ژی هەنه وەك کانییا کۆزێ، کانییا گوندی، کانییا مێرا، کانی قەپۆك .

بەرهەمێن چاندنێ ل گوندی: گەنم و نۆك و داروبارێ ڤێقی یه، زێدەباری هەبوونا رەز و باهیڤ وسماقێ و دارێن سپیندارا.

هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (۱۹۵۷)ێ ۵۵ کەس بوو[۹۸]، گوند ل سالێن شێستان هاتییه خرابکرن هەروەسا ل سالێن حەفتییان ژی گەلەك جارا هێرش هاتینه سەر گوندی و خەلك مشەختبوویه، سالا (۱۹۸۸)ێ گوند هاتییه کاڤلکرن، سالا (۱۹۹۲)ێ گوند هاته ئاڤاکرن ڤە، لێ جارەکا دی بەره بەره هاتییه بەردان، نها کەس ل گوندی نینه. سالا (۱۹۷۸)ێ خواندنگەهـ ڤەبوویه، گوند بەری خراب بیت نێزیکی ۱۵ مالان بوون .کاڤلێن پشت چەما نیشانێن کاڤله گوندەکینه ل رۆژهەلاتا گوندی[۹۹].

## گوندێ بابۆخکا ژووری:

بابۆخکا ژووری: دکەڤیته دووراتییا (۲۰کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش، دۆر ناڤێ گوندی دبێژن دبیت ژ کوخ ئانکو (زنج) هاتبیت یان رەنگەکێ گیای (ستریەك) هەیه دبێژنێ (باخۆخك) هاتبیت.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ بانەسۆرا.

**باشووری:** چیایە ل راستا گوندی دبێژنێ (پیاکا بابۆخکێ)، کو ژ زنجیرا چیایێ سپی یه .

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئالەکینا.

**رۆژئاڤایی:** بابۆخکا ژێری.

**پێکهاتا گوندی:**

بنەمالا گەورا خۆجهێن کەڤنێن گوندی نە، بنەمالا نەبی ژ ناڤ سندییا هاتینه، بنەمالا (چەم تی) یا ژناڤ دۆسکی ژووریا هاتینه، بنەمالا حەسەن پەرییا ژ رۆژهەلاتێ کوردستانێ هاتینه، خەلکێ گوندی عەشیرەتا دۆسکییانە.

**جهـ و ناڤارێن ناڤدار ل گوندی:**

پیاکا بابۆخکێ ل چیایێ باشوورێ گوندی، کەلاتێ ل سەرێ چیایی، بانییا بلو، زەرارێ گۆرستانەکە ل رۆژهەلاتی، کورە ماصر دسەر گوندی دا، برکا قورە بەیت، نهالا گولە زەرێ ل رۆژئاڤای، کانیکا حەلێ جهی رەز وخرابا یه، کاهیرێ زەڤیێن چاندنێ نە، مالکا.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی ل باکووری رووبارێ سادیێ یه و چەم و بیستان ل بەر دهاتنه کرن، گەرا ساڤارا ل سەر رووباری، کانییا گوندی، کانییا بەرەکات کو یێن کێمبووین.

د سەرژمێرییا سالا (۱۹۵۷)ێدا تنێ ناڤێ گوندەکی ب ناڤێ بابۆخکێ هاتییه هژمارا خەلکی وی ۱۷۲ کەس بوو[۱۰۰]، د روودانێن شۆرشا کوردستانێ دا چەندین جاران گوند هاتییه سۆتن و خرابکرن ژبەرکو بارەگایێن پێشمەرگەی ل وێرێ بوون، سالا (۱۹۶۳)ێ گوند هاته سۆتن و بەردان، جارەکا دی ل سالا (۱۹٦٦)ێ هاته خرابکرن، د سالێن هەشتییاندا هندەك ژ خەلکێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندی و

گوند ئاڤاكرەڤە، سالا (١٩٨٨)ێ (٢٠) مال ل گوندی بوون، ئەو ژی كەتنە بەر هەوا ئەنفالان و گوند هاتە كاڤلكرن و ئەو خەلكە مشەخت بوونە كەمپێن مشەختان ل باكوورێ كوردستانێ[١٠١]، سالا (١٩٩٣)ێ هاتە ئاڤاكرن ڤە. نێزیكی ١٠ مالان ل گوندی بوون، هەتاكو سالا (٢٠٠٣)ێ هاتە بەردان، نها ب تنێ مالەك ل گوندی یە .

گۆڕستانەك ل بنێ چیایی هەیە، دبێژنێ گۆڕستانا دەنكێ، هەروەسا چەند جهـ و شوینوارێن خرابە گوندان هەنە وەك خۆیریزی ل رۆژهەلاتی و زەراری، ترزینە، ملهمبان ل باكوورێ گوندی كو هیشتا نیشانێن وان ماینە[١٠٢].

## گوندێ بابۆخكا ژێری:

بابۆخكا ژێری: دكەڤیتە دووراتیيا (٢٠كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، ل دۆر ناڤێ گوندی هەروەكی بابۆخكا ژووری، دبیت ژ كوخ یان رەنگێ گیایێ ستریەك هەیە دبێژنێ (باخۆخك) هاتبیت.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ بانەسۆرا.

**باشووری:** بابۆخكا ژووری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئالەكینا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شاوریكێ.

### پێكهاتا گوندی:

بنەمالا شەفیق، بنەمالا توفیق، بنەمالا عەلی هەمی پسمامێن ئێكن، دكەڤن دا ژ گوندێ زێوا شەفیقی هاتینە، خەلكێ گوندی ژعەشیرەتا دۆسكیا نە.

### جهـ و ناڤارێن ناڤدار ل گوندی:

چەمێت بن گوندی، نهالا كەلەكێ ل رۆژئاڤایی گوندی، كەلیێ تاڤێ خرابەنە، دەراڤێ گوندی ل سەر رووبارێ رووگەرمی ل رۆژهەلاتی، نهالا تل زینا، زەڤیا سێ مالكا و سنوورێ گوندی دچیت تا گرێ هەڤرانا ل نێزیك گوندێن بانەسۆرا و حۆجاڤا.

### زێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی رووبارێ رووگەرمە ل باكوورێ گوندی چەم و بیستان ل بەر دهێنە چاندن وەك چەمێ خۆلیێ، كون رویڤێ، هەروەسا كانیيا گوندی ژی هندەك بیستان ل بەر دهێنە كرن. ژ بەرهەمێن چاندنێ ل گوندی گەنم و چەمێن فێقی نە وەك خۆخ، سێڤ، حلیك، ترێ تایفی، زێدەباری هەبوونا رەز وباهیڤان.

د روودانێن شۆڕشا كوردستانێ دا گوند ل سالا (١٩٧٩)ێ كەفتیيە بەر هێرشێن حكومەتا عیراقێ، جارەكا دی ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتە خرابكرن و هەتا نها نە هاتییەڤە ئاڤاكرن. سالا (١٩٧٧)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتبوو ئاڤاكرن، بەری گوند خرابیت نێزیكی ١٠ مالان ل گوندی بوون.

### شوینوارێن گوندی:

زیارەتێ گركێ گویزێ ل رۆژهەلاتێ گوندی و هندەك گۆڕێن دیتر ژی هەنە دبێژن یێن وی وەختی (خەلاییێنە) دەمێ ژبەر گرانیێ و نەبوونا خوارنێ خەلك ژ برسا دمر، هەروەسا ل رەخێ دیتر یێ گوندی جهێ كاڤلە گوندەكی یە ب رەخ گوندی ڤە هەتا دەمەكێ نێزیك ئەڤ شوینوارە مابوون[١٠٣].

## گوندێ بۆترشێ:

گوندی بۆترشێ دكەڤیتە دووراتیيا (٢٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ژبەركو گەلەك سماق یا لێ هەی و سماق بخۆ یا ترشە لەوا دبێژنێ بۆترشێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن شاوریكێ و ئەلندكا.

**باشووری:** چیایە .

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بابۆخكا ژێری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كەلناسكێ.

### پێکهاتا گوندی:
ئێك بنەمال ل گوندی هەیە، دبێژنێ بنەمالا (حەمید گەمۆ) ژ گوندێ شاورێکی ل دەستپێکا سالێن سیهان چووینە بۆترشێ، گوندی ژ عەشیرەتا دۆسکی نە .

### جهێن دیار ل گوندی:
جوما ئاغاکێ گرەکێ بلندە سەرێ وی بانیە، گەلیێ هشك ل رۆژهەلاتێ گوندی، ل چیایێ باشووورێ گوندی گەلی هەنە وەك گەلیێ گیسکی، گەلیێ مالا، حەفت ئاڤکا ل رۆژئاڤای، ئاخە سپیك دناڤبەرا بۆترشێ و شاوریکێ وبابۆخکێ دا، زەڤیا بارزانێ، جنیکا جندوی .

### زێدەرێن ئاڤێ:
ژێدەرێن ئاڤێ کانی بوون، کو نها کێمبووینە وەك کانیا گەلیێ مالا، کانیا شاتانا، کانیا گەلی گیسکی، بەرهەمێن چاندنێ ل گوندی باهیڤ وسماقن و داروبارێ فێقی ژی هەیە.

گوند بەردەوام دکەفتە بەر هێرشێن حوکمەتا عیراقێ ژبەرکو بارەگایێ پێشمەرگەی ل وان دەڤەران بوون خەلك نەچار بوون گوندێ خۆ ل سالا (١٩٧٩)ێ چۆل بکەن، هەتا ئەنفال ب سەردا هاتی هەمی خرابکر و پاشان نەهاتییە ئاڤاکرن، گوند بەری بهێتە بەردان نێزیکی ٢٠ مالان بوون. سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ لێ هاتە ڤەکرن .

بنێ کەڤرکا جهێ کاڤلە گوندەکی یە، هەروەسا ل گەلی گیسکی و گەلیێ مالا ژی هندەك شوینوار هەنە[١٠٤].

## گوندێ بالەکا:
**بالەکا:** دکەڤیتە دووراتیا (٢٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ ل سەر لێڤا رووبارێ خابووری، رامانا بالەکا ئانکو بەلەك (ئەو جهـ یان تشتێ ژ پتر ژ رەنگەکی پێکدهێت).

### سنوورێن گوندی:
**باکووری،** رووبارێ خابووری یە.

**باشووری،** گوندێ ئێکمالا خابووری.

**رۆژهەلاتی،** ناڤاشکا کو کاڤلە گوندە دناڤبەرا راسلعەینێ و بالەکا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گوندکۆسە.

### پێکهاتا گوندی:
گوندی هەمی ژ ئێك بنەمالن، پسمامێن ئێکن دبێژنێ بنەمالا سەید محەمەدی، کو دبنەرەت دا ژ گوندێ بانکا دەڤەرا دۆسکییا سەرێ چیایێ مەتینی هاتینە بالەکا، خەلکێ گوندی هەمی سەیدن ژ عەشیرەتا دۆسکییانە.

### جهـ و ئاثارێن دیار:
گوندێ بالەکا یێ ل سەر لێڤا رووبارێ خابووری ژ ئاقار وجهێن دیارێن گوندی: چەمێ کارێ کو هەمی چەمێن ئاڤی نە، بانیا بالەکا، زیرکا کو زەڤی نە بۆ چاندنا گەنمی ودەرامەتی دهێنە بکارئینان، ئومەرك کاڤلە گوندەکە، گرێ گورگا، گرێ کەلەکێ، کو کەلەك ل سەر خابووری هەبوو، ل سالانێن شۆرشا ئەیلونێ بۆ دەربازبوونا خەلکی وپێشمەرگەی دهاتە بکارئینان، بەری نیشانێ هەر سالا ئاڤا خابووری د سەر بەری دا هاڤیت نیشانا هندێ یە کو ئاڤا زێدە بووی، گرێ کۆن میریێ، گرێ خزینی، چالکێت عەمەروکی، کورا حاجی سینەمێ، باسکێ پیرۆیی، چەمی گوندی، مەمینێ، باسکێ شاویشی، کۆزا گوندی، ناڤ قاچا. گەلەك چەمێن داروباری و بیستان هەنە ل گوندی ل بەر رووباری خابووری و هەروەسا جهێن بەرفرەهـ بۆ چاندنا دەرامەتێ دێم هەنە.

هەروەسا چەندین شکەفت ل گوندی هەنە وەك شکەفتکا ئەجنا، شکەفتا نهالا رەزا، شکەفتا هشارێ، شکەفتا مەلای دگەل دا ژی سێ خرابە گوند ل ئاقارێ بالەکا هەنە دبێژنێ کاڤلێ زیرکا، ئومەرك، ناڤ قاچا کو شوینوار و کاڤلێن وان د دیارن.

### زێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی ژ رووبارێ خابووری پێك دئێت، ئەوێ دكەڤیتە باكوورێ گوندی، هەروەسا رووبارەك ژی هەیە، زێدەبارى چەندین كانییان مینا بركا گوندی، كانی گەرمك، كانییا محێ، كانییا ئاڤ ئاشكا، كانییا حەویكێ، كانییا چەمۆكا، كانییا گەرا ئاغایی، كانییا سەید عەلی، كانییا عەلی مەحمیدا كو چەم و بیستانێن ئاڤی ل بەر ڤان ژێدەرێن ئاڤی دهێنەكرن، دگەل چەند حەودكێن سپیندااران.

هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٦٢ كەس بوو[١٠٥]، گوند دەمێ یێ ئاڤا نێزیكی ٢٠ مالان بوون، خواندنگەهـ ل سالێن حەفتیان لێ هاتییە ڤەكرن، سالا (١٩٨٦)ێ گوند هاتییە بەردان و خەلك نە ڤەگەریایە، ل ئەنفالان گوند ب تەمامی هاتییە كاڤلكرن و نە هاتییە ئاڤاكرن[١٠٦].

### گوندێ بێسفكا ژووری:

بێسفكا ژووری: دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (٣٠كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ ل بنارێ چیایێ بێسفكی، رامانا بێسفكی دبیت ژ (پێ سڤكی) هاتبیت، ژبەركو دبێژن خەلكێ وێ یێ پێ سڤكە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** چیایێ بێسفكی یە، پشتا چیایێ مانگێشێ.

**باشووری:** گوندێ بێسفكا ژێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دێركێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێراگژنیك.

### پێكهاتا گوندی:

بنەمالا كەلەش، بنەمالا شەرەف، بنەمالا كەلەش

گوندێ بێسفكا ژووری



ژ گوندێ ماریونس باکوورێ کوردستانێ هاتینە، ئەڤ بنەمالە نها دئاکنجی نە ل گوندێن بێسفکا ژووری و بێسفکا ژێری و گوندێ مەجلمەختێ، ب ئێك ژ گوندێن دۆسکییان دهێتەهژمارتن.

### ژ ئاثار و جهێن دیار ل گوندی:

هارێ ل رۆژهەلاتا گوندی، گرکێ سوور، گرکێ غەلێ، کەڤرێ باسێ ل هنداڤا گوندی ل باکووری، دولکا تەیری ل بنێ گوندی، کورێ ئەڤە جهی مەخەلا پەزی بۆ دارێت کەزانا لێ هەنە، شکەفتەکا ل گەلیێ بنێ گوندی هەی دبێژنێ ناوسکی دەرێ بەنکێ لسەرێ چیایێ پشتا بێسفکێ، هەروەسا ئاقارێ وان دچیتە ئالیێ مانگێش ل پشتا چیایی دبێژنێ کانی خیلێ .

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی برك و کانی نە، ژ وانان کانیا گوندی، کانیا ئوسمانکێ و بەرگەرکێ ل بنێ گوندی، نها بەرهەمێن چاندنێ دکێمن ژبەر کو نە هاتییە ئاڤاکرن بەلێ رەزێن تری و باهیڤ هەنە .

بێسفکی د روودانێن شۆرشا کوردستانێ دا چەندین جاران هاتییەسۆتن و کاڤلکرن، جارا بەراهیێ ل سالا (١٩٦٥)ێ و جارەکا دیتر ل سالا (١٩٦٨)ێ، سالا (١٩٨٦)ێ ژبەر هێرشێن لەشکەرێ عیراقێ گوند هاتییە بەردان و نەزڤرینەڤە گوندی، ل ئەنفالان گوند ب ئێکجاری هاتییە سۆتن و تانها نە هاتییە ئاڤاکرن ڤە. گوند بەری بهێتە کاڤلکرن نێزیکی ١٥ مالان بوون. سالا (١٩٨٣)ێ خواندنگەهـ لێ هاتبوو ڤەکرن[١٠٧].

## گوندێ دەرگەلا شێخا:

گوندێ دەرگەلا شێخا دکەڤیتە دووراتیا (٢٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ ل ئالیێ باشوورێ رۆژئاڤایی ڤە، گوند دکەڤیتە دەرێ گەلی دا و ژبەر ڤێ چەندێ ناڤێ وی بوویە دەرگەل، خەلکێ گوندی شێخن لەوا دبێژنێ دەرگەلا شێخا.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ئاشانکێ.

**باشووری:** چیایە.

**رۆژهەلاتی:** گەلناسکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زیناڤا.

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا شێخ سماهیلی، بنەمالا شێخ عبدالحلیم، بنەمالا شێخ محمد سەلیم هەرسێ ژ شێخێن (گەلیێ رمان)ن، هەروەسا بنەمالا خەتیبی، بنەمالا حەجی میرزا ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە، بنەمالا حەسوی ژ ناڤ مزووریا هاتینە، بنەمالا ئاقیبی ژ گوندێ بانکا (ناڤ دۆسکیا) هاتینە، بنەمالا سۆفی محوی ژ ناڤ کۆچەران هاتینە، هەمی گوند سەر ب عەشیرەتا دۆسکی یە .

### جهێن دیارێن گوندی:

ل چیایێ بەرامبەر گرەکێ مەزنە دبێژنێ گرێ رەش، هەر ل چیایی زۆم هەبوون دگۆتێ مێرگا دەرگەلێ، خرابا، بەرکەڤری، ل رۆژئاڤای، بانا دوخرکێ، بانا دەرگەلێ، بانا زیناڤا، نهالا دەرگەلێ ل باکووری، هەڤشکا، زراڤکێ .

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی رووبارێ رووگەرمە ل باکووری، هەروەسا کانی ژی هەنە وەك کانیکا تاهای، کانی شافرێ ل مێرگێ .

سالا (١٩٧١)ێ خواندنگەهـ ل گوندی ڤەبوویە، دکەڤن دا خواندنگەها ئایینی ژی هەبوو، فەقی و مەلا لێ دخواند و وانە دگۆتن، وەك مەلا حسێن مارونسی، مەلا ئیسماعیل نافشکی، شێخ محمد دەرگەلی، ملا عوبەید سلێڤانەیی، هەتا سالا (١٩٦٨)ێ خواندنگەها ئایینی مابوو. گەلەك شاگردێن ئایینی قەستا ڤێ خواندنگەهێ دکر، ژ مامۆستایێن

وێ یێن نافدار (شێخ مەعروفێ دەرگەلی ئەوێ ل سالا (١٣٢٤مش/ ١٩٠٦زێ وەغەركری)[١٠٨]، پشتی دەستویریا زانینێ وەرگرتی، دەست ب وانە گۆتنێ ل مزگەفتا دەرگەلا شێخی كر، دیسان مەلا شێخ نوری كورێ شێخ مستەفای (١٣٣٨مش/ ١٩١٩زێ وەغەركریە) كو ژ وانەبێژێن ڤێ خواندنگەهێ و چەند خواندنگەهێن دی ل دەڤەرا دۆسكییا بوون[١٠٩].

ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢١٥ كەس بوو[١١٠]، ئەڤ گوندە چەندین جاران ب تۆپ و تەیارا ل سالێن (١٩٦٥- ١٩٨٨)ێ هێرش كرینە سەر، سالا (١٩٨٨)ێ گوند هاتییە خرابكرن و پاشان نە هاتییەڤەئاڤاكرن، بەری خراب بیت نێزیكی ١٠٠ مالان بوون، بیركێ، زێدكا، میرگێ خرابە گوندن ل ئاقارێ دەرگەلێ[١١١].

## گوندێ دێركێ:

دێركێ دكەڤیتە دووراتییا ٣٥كم ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ ل باشوورێ رۆژهەلاتی، ل دۆر ناڤێ دێرك هاتییە ژ دێرەكا مەسیحیان كو هێشتا شوینوارێن وێ ل رەخێ باكوورێ گوندی د دیارن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ مەجلمەختێ.

**باشووری:** گوندێ رەشێورێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گوندك نەبی.

**رۆژئاڤایی:** گوندی بێسفكی.

### پێكهاتا گوندی:

ل گوندی دو بنەمال هەنە ئەوژی: بنەمالا سلویێ

شینوارێن مزگەفتا كەڤن ل گوندێ دێركێ



شویکەیی کو دکەڤن دا ژ باکوورێ کوردستانێ هاتینە، بنەمالا شکەفتە رەشیا ژ گوندێ شکەفتە، (شکەفتە رەش) نها کاڤلە گوندەکە ل پشت چیایی دێرکێ ل ئالیێ رۆژهەلاتی .

## جهێن دیار ل گوندی:

بانیا دێرکێ ل رۆژهەلاتێ گوندی، بانیا رەزا، چیایێ بیك ستیر ل باکووری ل هنداڤ گوندی، بانیا بەروی سۆر ل باشووری، بانیکا بێلێ ل رۆژئاڤای .

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی (کانییا نزێر)ە نها کرییە بیرا سەرئەرد، هەروەسا بیرەکا بن ئەرد ژی بۆ چاندنێ هەیە کو پتر سێڤ و ترێ تایفی ل بەر دکەن، دگەل هەبوونا رەز و باهیڤا .

ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٩٥کەس بوو[١١٢]، سەردەمێ شۆرشا کوردستانێ گوند ل سالا (١٩٦١)ێ هاتییە خرابکرن، جارەکا دی ل سالا (١٩٨١)ێ گوند هاتەسۆتن و هندەك ژ گوندیا گرتن، گوند هاتە بەردان و چوونە گوندێ بێسفکێ، جارەکا دی هاتییەڤە ئاڤاکرن، سالا (١٩٨٨)ێ ل هەوێن ئەنفالان هاتە کاڤلکرن. گوند ل سالا (١٩٩٣)ێ هاتە ئاڤاکرن ڤە، لێ ل سالا (٢٠٠٠)ێ هاتەڤە بەردان، نها هندەك خانی لێ هەنە بەلی وەك خۆجهی کەس لێ نینە، دەمی گوند بەردان نێزیکی ١٢ مالان بوون. سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ ل گوندی ڤەکربوو . هندەك شوینوار ل گوندی هەنە ژوانا دێرەکا کەڤن ب رەخ گوندی ڤە، دیسا مزگەفتەکا گەلەکا کەڤنا دوقاتی کو ژ مێژە یا خراب بووی، لێ شوینوارێن وێ هێشتا مانە، هەروەسا بارزانکا خرابە گوندەکە دناڤبەرا بێسفکی و دێرکێ، گەلیێ کیرێ خرابە گوندەکێ دی یە دناڤبەرا دێرك و رەشێورێ دا[١١٣].

## گوندێ زۆرئاڤا ژووری:

گوندێ زۆرئاڤا ژووری دکەڤیتە دووراتییا (٣٢کم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، دکەڤیتە سەر لێڤا

رووبارێ خابووری کو دبیتە دویماهی گوندێ عەشیرەتا دۆسکییا، ژبەرکو ل ئالیێ دیێ خابووری سنوورێ قەزا زاخۆیە، ل دۆر رامانا زۆرئاڤا دو بۆچوون هەنە: یا ئێکێ زۆر ئاڤا ئانکو ب زۆری هاتییە ئاڤاکرن، یا دووێ دبیت ژبەر ئاڤا زۆر یا رووبارێ خابووری بیت.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووبارێ خابووری.

**باشووری:** گوندێ تلاکرو.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ چەمترێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زۆرئاڤا ژێری.

## پێکهاتا گوندی:

گوندی هەمی ئێك بنەمالە ب ناڤێ (بنەمالا صوفی) ژ باکوورێ کوردستانێ بەری سێ بابا هاتینە، هەمی کوردێن موسلمانن، خەلکێ گوندی خۆ ژ عەشیرەتا سندیا دهەژمێرن، بەلێ وەك گوند ژ عەشیرەتا دۆسکییانە.

## جهێن دیار ل گوندی:

بانا زۆرئاڤا زەڤیێن چاندنێ نە، نزارێ زۆرئاڤا، شکەفتا زۆرئاڤا، زیارەتێ بەنۆکێ، چەمێ زۆرئاڤا ل سەر خابووری، زیارەتێ فەق تاجدینا.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی رووبارێ خابووری یە و چەم و بیستان ل بەر دهێنە کرن، هەروەسا بەرهەمێن چاندنێ داروباری فێقی هەیە و رەز وباهیڤ و زەیتوون ژی هەنە و گەنم و جەهـ و گوندۆر و زەبەش ژی دهێنە چاندن.

ل سەردەمێ شۆرشا کوردی ل سالا (١٩٦٧)ێ ب فرۆکەیان گوند هاتییە خرابکرن، سالا (١٩٨٦)ێ جارەکا دی هاتییەڤە خرابکرن، ل ئەنفالان جارەکادی خرابکرن. سالا (٢٠١٠)ێ تنێ خانییەك لێ هاتییە

ئاڤاکرن، گوند بەری خراب ببیت نێزیکی ٢٠ مالان بوون، بەلێ نها گوند یێ بەردایە[١١٤].

## گوندێ زۆرئاڤا ژێری:

زۆرئاڤا ژێری: ب دووراتییا (٣٢كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێش دوورە، دکەڤیتە سەر رووبارێ خابووری و دبیتە دوماهیك گوندێ ناحیا مانگێش و عەشیرەتا دۆسکییان ل ئالیی رۆژئاڤایی، دەربارەی رامانا زۆرئاڤا ژ هندێ هاتییە کو ب زۆری هاتییە ئاڤاکرن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووبارێ خابووری.

**باشووری:** گوندێ تلاکرو.

**رۆژهەلاتی:** زۆرئاڤا سەری.

**رۆژئاڤایی:** سنوورێ قەزا زاخۆ چەمێ مەسلمەتێ .

### پێکهاتا گوندی:

گوند هەمی ئێك بنەمالە دبێژنێ بنەمالا (ئەحمەدێ سالحێ پیرێ) ژ کەڤن وەرە ژ ناڤ عەشیرەتا سندیا هاتینە، نها گوندێ عەشیرەتا دۆسکییانە .

### جهێن دیار ل گوندی:

گرکێ دریزیا، ناڤداری ل رۆژئاڤا، نهالا کوریەنێ، زیرێ شینك، لیسێ تەیری ل رۆژهەلاتی، ل باکووری رووبارێ خابووری یە، تیێ بەنۆك ل باشووری .

### زێدەرێن ئاڤی:

ژێدەرێن ئاڤی ل گوندی رووبارێ خابووری و چەم وبیستان ل بەر دهێنە کرن و بەرهەمێن چاندنێ وەك داروبارێ فێقی یێ هەی، زێدەباری چاندنا گەنم و جەهـا. هەروەسا ل گوندێ زۆرئاڤا هندەك پەز و بزن دهێتە ب خودانکرن و چەندین گیانەوەرێن کیڤی ژی هەنە وەك بەراز، گورگ، تویری، سیخور، کێرویشك، سڤۆرە، زێدەباری هەبوونا تەیر وتەوالان وەك کەو، پۆر، سیسك، تەیرێ مریشکا، سمسیارك، تڤیرك، رومێلە .

ل سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ٤١ کەس ل گوندی دژیان[١١٥]، گوند ل سالا (١٩٦٣)ێ هاتییەسۆتن، سالا (١٩٧٩)ێ گوند هاتییە بەردان ونەزڤرینە ڤە، هەتا ل هەوێن ئەنفالان ب تەمامی هاتییەخرابکرن، سالا (١٩٩٢)ێ گوند هاتییە ئاڤاکرن، لی هەر زوو هاتە بەردان ڤە و نها کەس لێ نینە، گوند بەری خراب ببیت نێزیکی ٦ مالان بوون، سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ هاتییە ڤەکرن[١١٦].

## گوندێ گەلناسکێ:

گەلناسکێ: دکەڤیتە دووراتییا نێزیکی (٣٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیا مانگێشێ، گوند دناڤبەرا دو گەلیان دایە گەلیێ گوندی و گەلیێ هشك ل چیایی، دبیت ناڤێ گوندی ژ گەلیێ نازێ هاتبیت و نازێ ژنەك بیت گەلی ب ناڤێ وێ بیت یان ژی گول نازك ژ بەر کو گەلەگ رەنگێن گولا لێ هەنە، هوسا ناڤ بۆ گەلناسکێ هاتبیتە گهورین.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن چرانێ و ئەلندکێ.

**باشووری:** چیایە و ل پشت چیایی گوندێن زێوا شەفیق و بێسکێ نە .

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بۆترشێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دەرگەلا شێخا.

### پێکهاتا گوندی:

بنەمالا صادقی، بنەمالا دربو، بنەمالا خەتیبی، بنەمالا تاها، بنەمالا حەسەن سۆرا، خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا دۆسکیی نە .

جهێن دیار ل گوندی باراپتر گەلی نە، وەکی: گەلیێ گولێ، دووت بەکر، گەلی چنارکێ، گەلی مێوکی ل رۆژهەلاتی، گەلی هشکی، گەلی بابنکی، گەلیێ عەمەر بریندارا، گەلیێ هەسناڤاکێ ل رۆژئاڤای،

گەلیێ گوندی، دوخركێ، گەلیێ شەهمیرانێ، گەلی گەوركی، چەمكێ ب چنار، بانا مەلای، تربێ نوردی، ئیچەپی، بانیێ سەركورا، باسكا.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی بیرێن ژێر ئەرد بۆ ئاڤدانێ و هندەك كانی هەنە، بەلێ نها یان هشك بووینە یان كێم بووینە وەك: كانییا ڤاقە رەشێ، كانییا گەلیێ شەهمیرانێ، كانییا گەلی بابنكی، كانییا گەلی مێوكی، كانییا گوندی، كانییا قوقلكێ. ژ بەرهەمێن چاندنێ ل گوندی رەز و باهیڤ و سماق و داروباری فێقی یە .

گەلناسكێ د دەمێ خۆدا گوندەك مەزن بوو ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٥٣٨ كەس بوو[١١٧]، د روودانێن شۆرشا كوردستانێ دا بارەگایێ هێزا دهۆكێ یا پێشمەرگەی ل گەلیێ گوندی بوو، هەروەسا د شۆرشا گولانێ ژی دا بارەگایێ (لێژنا ناوچا دهۆكێ) یا پارتی ل گەلیێ هەسناڤاكێ ل رۆژئاڤایێ گوندی بوو، لەوا چەندین جارا كەفتییە بەر هێرشێن عیراقی، سالا (١٩٦٣)ێ ب فرۆكەیان گوند خرابكرییە، جارەكا دی ل (١٩٨٤)ێ هندەك ژ گوندی سۆتییە و پاشان ل سالێن (١٩٨٧ و ١٩٨٨)ێ گوند ب تەمامی هاتییە كاڤلكرن، سالا (١٩٩٢)ێ گوند هاتە ئاڤاكرن ڤە لێ جارەكا دی ژبەر كاودانێ ناڤخۆ و هێرشێن فرۆكەیێن تركی گوند ل سالا (١٩٩٣)ێ هاتە بەردان، نها هندەك خانی ئاڤاكرینە لێ كەس خۆجهێ گوندی نینە .

چەندێن شوینوارێن كەڤن لێ هەنە وەك: زیارەتێن شكیركی، زیارەتێ دێرگەهێ، زیارەتێ جنیكا، زیارەتێ پیر هەمزە، زیارەتێ پیر محمد، سیاروكی، هەروەسا گرتیخانا زمبل هەلیلی كو دبێژن گرتیكەها (بۆت پەریسا) بوویە و جهەكی دبێژنێ بەرِوی بیكا، مەزارێ (تەلحە و زبێر)، گۆرێ شیخ ئەحمەد بەسراوی. هندەك شوینوارێن كاڤلە گوندان هەنە وەك دوخركێ، كەندال سۆری، حاجی لوك، شیخ ئەحمەد، گەلبابنك، گەلیێ هەسناڤاكێ[١١٨].

## گوندێ شەمرەخێ:

ئێك ژ گوندێن هەرە كەڤنێن دەڤەرا دوسكییانە، هەروەك دهێتەڤەگێران ل سالا (١٩٣٩)ێ خەلكێ گوندی ژ بەر بەلاڤبوونا نەخوشییا تاعۆنێ گوندێ خۆ بەردایە و یێن ساخ ژێ چووینە گوندێ دێرا گژنیكێ و وی دەمی هژمارا گوندی ٢٠ خێزان بوون.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ دێراگژنیك.

**باشووری:** چیا پانكە و گوندێ كەمەكا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن دێركێ و بێسفكێ.

**رۆژئاڤای:** گوندێ گرێ پتێ.

د چەندین ژێدەرێن كەڤندا ناڤی ڤی گوندی هاتییە كو نیشانا كەڤنارییا گوندی نە، ژ وان ژێدەران: پەرتووكا توما المرجی ئەوا ب ناڤێ (الرؤساء) ل سالا ٨٤٠ زایینی هاتییەنڤیسین، هەروەسان پەرتووكا (الكامل فی التاریخ) یا دیرۆكنڤیسێ ئیسلامی ئیبنولئەسیر ئەوێ ل د ناڤبەرا ١١٦٠- ١٢٣٢ز ژیای، د ڤی ژێدەریدا هاتییە ل سالا ٨٨١ز دا شەرەك د ناڤبەرا هەردو سەركردەیێن خەوارجان (هارون الخارجی و محمد خرزادی) ل ڤی گوندی روودایە[١١٩].

هەروەك د هێتەڤەگێران ڤەگێران ل سالا (١٨٣٢)ێ دەمێ لەشكەرێ میرێ رەواندزێ محەمەد پاشایێ ناڤدار ب میرێ كورە ب سەر دەڤەرێدا د ڤی گوندی را بوورییە. هەروەسان د چەند سترانێن فولكلوریدا ئاماژە ب چەند بۆیەر و شەران كرییە یێن ل ڤی گوندی روودایْن.

هەژییە بێژین گوندەكێ دی ل باكوورێ كوردستانێ پارێزگەها مێردینێ دەڤەرا چیایێ مازی ب ناڤێ شەمرەخ هەیە.

# ناحیا زاویتە

بێوار ئیدریس دەحلێنەوی

زاویتە ئێكە ژ ناحیەیێن سەر ب قەزا دهۆك ڤە، ب دووراتییا (١٦-١٧) كم دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ مەلبەندێ قەزا دهۆكێ[1]، رووبەرێ وێ ل دووڤ پیڤانا سالا ٢٠٠٩ێ، ٤٦٨كم دوجاركینە[2]، ل دووڤ لیستا ناحیا زاویتە، زاویتە ژ(٦٩) گوندا و دو كۆمەڵگەهان پێكدهێت، ژوان گوندان (٤٣) دئاڤانە و (٥) خرابەنە و (٢٣) ژ وان دبەردانە. ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینیا رێڤەبەریا ئامارا دهۆكێ بۆ سالا (٢٠١٦)ێ سەرجەمێ خەلكێ ناحیا زاویتە ٢٠٩٢٢ كەسن ژ وانا ١٢٩٦٠ كەس باژێرنشین و ٨٢٣٢ كەس گوندنشینن[3].

دگەل دامەزراندنا ناحیا زاویتە، گوندێ زاویتە بوویە مەلبەندێ ناحیێ، گوندێ زاویتە دبەرێدا گوندەكێ بچویك بوو سەر ب ناحیا مانگێشكێ ڤە، پاشی ژ ئەگەرێ هندەك رووداںان بۆ دەمەكی ب ناحیا سێمێلێ ڤە سەر ب قەزا دهۆكێ هاتە گرێدان[4]. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٤٧)ێ خەلكێ زاویتە نێزیكی (٣٧٤) كەسان بوون، ١٩٢ ژوان نێرینە و ١٨٢ ژوان مێبینە بوون[5]، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ زاویتە (٤٣٤) كەس بوو[6]، بەلێ ئەڤێ هژمارێ گەلەك زێدەكرییە ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، نۆكە گوند پتر ژ ٨٥٠ خانییانە، و بلندییا وێ ل سەر ئاستێ دەریایی نێزیكی (٩٠٠م)، وبلندترین پلەیا گەرماتییێ د دەمێ هاڤینێدا دگەهیتە ٣٨ێ[7]، و دكەڤیتە دگەلییەكێ كند دا، دەوروبەرێن وێ چیا و دارستانێن كاژانە، و رووبارەكێ بچویك تێرا دەربازدبیت، رێژەیا باران بارینێ ژ (٨٠٠-٨٥٠ملم)انە، و گەلەك بەفر لێ دباریت[8].

ل دۆر پێكهاتەیا گوندێ زاویتە، هەمی كوردێن موسلمانن و سونە مەزهەبن و گوند سەرب عەشیرەتا مزوورییاڤەیە، و گوند ژ پازدە مالباتان پێكدهێت، ئەوژی ئەڤەنە: (حەجی سەعدی، عەزووی، شێخی، چاڤینی، حەسێ، بەرۆشكییان، حەجی مستەفا، میسایێ شەریفی، چەلەبیا، حەجی، حەجی سالح، مەحمید، مێسلی، سەرمێسكیان، مەلان)[9].

ل دۆر ناڤێ زاویتە دو بۆچوون هەنە، یا ئێكێ دبێژیت: ناڤەكێ كەڤنە، دبێژنە وان جهێن گەلەك بەفر لێ دكەڤیت و سار (سەلاجە)[10]، یا دووێ دبێژیت: (زاویثة) پەیڤەكا سریانییە ب واتایا سێ گۆشە دێت، ژ ڤێ ژی دو واتە ژێ دچن، یا ئێكێ، یان ژبەرهندێیە، كو دكەڤیتە دناڤبەرا سێ چیان و دبیتە سێگۆشە، یانژی ژبەركو دكەڤیتە دناڤبەرا سێ عەشیرەتان، مزووریا و بەرواریا و دۆسكییان، یا دووێ دبێژیت: زاویتە ژ (الزاوية) هاتییە، كو ئەو قولاچكە (الزاوية) دكەڤتە د پاشییێن مزگەفتان و تێدا وانەیێن ئایینی دخواندن[11]، دبیت ژی ئەڤە یادروست بیت؛ چونكە گوندیێن كەڤن دبێژن خواندنگەهـ ل سالا

(١٩٣٩)ێ گەهشتیە زاویتە و بەری هنگی ژی هەر خەلکێ گوندی ل مزگەفتا زاویتە یا کەڤن ـ ژ کەڤنترین مزگەفتێن دەڤەرێ ـ دخواند، و دهاتە نیاسین وەکو خوێندنگەهەکا ئایینی ل دەڤەرێ، گەلەك زانا دەرچوویێن ڤێ مزگەفتێ نە و پاشی وانەیێن ئایینی داینە فەقییان وەکو: مەلا سەید عەبدوللا و مەلا دەرویش و مەلا حسێن سپینداری و ... هتد[١٢].

ل دووڤ مەرسومێ کۆماریێ ژمارە (٥١٦)، ل ٢٩/ تەباخ/١٩٦٠ێ گوندێ زاویتە هاتییە هەلبژارتن وەکو مەلبەندێ ناحیا زاویتە، کو ژ ٦٩ گوندان پێکدهات[١٣]، بەلێ وی دەمی تاخێ نزارکا ئەڤرۆ و بەرۆشکێ (ل ناڤ دهۆکێ) و دناڤ سنوورێن ویدابوون. ئێکەم رێڤەبەرێ ناحیا زاویتە (کامل زەینەل)، کو مفەوزەکێ پۆلیسا بوو ب وەکالەت ببوو رێڤەبەرێ ناحیێ، و هەتا نۆکە چەندین رێڤەبەرێن دی هاتینە، دوماهیك رێڤەبەر (موشیر محەمەد بەشیر)ە، کو ل ٢٣/١٠/٢٠١٦ێ دەست ب کار بوویە.

## سنوورێن ناحیێ:

**رۆژهەلاتی:** ناحیا ئەترووش.

**رۆژئاڤا:** قەزا سێمیلێ و مەلبەندێ قەزا دهۆك.

**باکور:** ناحیا مانگێشکێ.

**باشووری:** ناحیێن ئەتریش و فەیدێ.

ژبەر گرنگی و ستراتیجیەتا وێ، دەڤەرا زاویتە بوویە داستانێن نەمری و قارەمانیێن شۆرشا ئەیلوولا سالا (١٩٦١)ێ و جهێ توومارکرنا داستانێن کوردی، ئێك ژ وان داستانان، داستانا لۆمانا – کەڤلەسنێ ل ١٢/١٢/ ١٩٦١ێ بوو، کو تێدا زیانەکا مەزن ب دوژمنی ئێخست[١٤]، هەروەسا شەرێ گەلیێ قەنتارا یێ رۆژا ١٩٦٢/٣/١٨ێ بوو، کو جهەکێ گرنگە ژلایێ عەسکەریڤە، تێدا زیانەکا مەزن ب لەشکەرێ حکۆمەتا بەغدا ئێخست[١٥].

ژیارا خەلکێ مەلبەندێ ناحیا زاویتە ل سەر گەلەك بوارێن جودا جودایە، وەکو جۆتیاریێ، فەرمانبەریێ،

جادا گەلیێ زاویتە



بازرگانیێ، لەشکەریێ و کارێن پیشەیی و ...هتد، هەروەسا هژمارەکا زۆرا دام و دەزگەهێن حکۆمی ل مەلبەندێ ناحیێ هەنە، کو زێدەتر ژ بیست دام و دەزگەهانە، وەکو پۆلیسان، ئاسایش، شارەوانی، ساخلەمیێ وچاندنێ و ... هتد.

# گوندێن ناحیا زاویتە

## گوندێ باجلۆرێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن: ناڤێ گوندی ژ باج وەرگرتنێ هاتییە، واتە ب ئاخفتنا گوندیان ل سەردەمێ ئوسمانییان رێکا سەرەکی د گوندیرا دچوو و ل ڤی جهی باجا دەڤەرێ دهاتە وەرگرتن، دگۆتنێ جهێ باج وەرگرتنێ، و ب درێژاهیا دەمی بوویە باجلۆر.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن سندوور و قارقاراڤا.

**باشووری:** گوندێ گرێ قەسرۆکا و بازێرێ دهوکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێسرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن پشتا گری و گەرماڤا.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ سێزدە مالباتان پێکدهێت، ئەوژی بریتینە ژ مالباتێن (ئەحمەد بازغا، محەمەد سەرما، دری، ئیسڤ، ناصر، شەمووی، مەمیانی، محەمەد خەجوکا، غازی، قادر، مال عەرەبا، گزیر، عومەر حسنا)، سەر ب عەشیرەتا دۆسکییانڤەنە، هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٣٢٤کەس بوو[١٦]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٤٠ هەتا ٤٥ مال بوون، نها ئەڤێ هژمارێ زێدەکرییە و نێزیکی ٢٥٠ هەتا ٣٠٠ مالانە، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل بازێران دژین.

ئەڤ گوندە چەندین جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ گوند هاتییە بەردان، و ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٨، ١٩٧٤- ١٩٧٥، ١٩٨٨)ێ ژی هاتییەڤەبەردان، ل سالێن ١٩٩١-١٩٩٢ێ جارەکا دی هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەکا جهێن کەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، وەکو شکەفتێن (دەرسبن، ئەحمەد ئەسوکا، زمهریرێ)، هەروەسا دو جهێن دی یێن شوینواری لێ دهێنە دیتن، ئێك ژوان دبێژنێ: دیوانکا ئیمام عەلی و قەنتەرە، مەزارەکێ کەڤن ژی ل ڤی گوندی دهێتە دیتن، ل سەرکێلێن گەلەك ژ وان قەبرێن دناڤ ڤی مەزاریدا مێژوویا کۆچی ل سەر هاتییە نڤیسین، کو دبێژنێ مەزارێ هەڤرستێ.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (چیایێ سپیرێز، رێتا قەشەی، سیڤەلۆ، عەرەبۆکێ، هەڤشێ کیرکا، شیڤ زیارەتێ، بارسکێ، نهالا بادار، مەمالێ، هەڤشێ میرا، گرێ سوور، نهالا سێریجی، گەرماڤۆکێ، بن بیستانا).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانیێن (زینەلکا زەلاما، زینەلکا ژنکا، پشتهەنا، سڤۆك، رووبارێ کبریتێ)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانیێن (زینەلکا زەلاما و زینەلکا ژنکا) بوو، نها ژی پرۆژێ ئاڤێ ل گوندی هاتییەچێکرن و ئاڤ ل سەر مالان دابەشدبیت.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا عەردێ ئاڤییە، وەکو خۆخ و هنار و سێڤ... هتد، هەر وەسان یێ دێمی وەکی باهیڤ و سماق و رەزا و.... ژیلی خودانکرنا تەرش و کەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان ل سالا (٢٠٠٤)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن[١٧].

## گوندێ بادێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن: ناڤێ گوندی ژ (با-دهێت) هاتییە، ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان گەلەك با ل ڤی گوندی دهێت، پاشی ب درێژیا دەمی ناڤێ گوندی بوویە بادێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێن كورێت گاڤانا و مەمانێ.

**باشووری:** گوندێن بابلۆ و بەرێ بهار و بێسرێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زاویتە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سندوورێ.

**پێكهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ سێ مالباتان پێكدهێت، ئەوژی مالباتێن (ئیلیاس، شێرویا، مەلا)نە، هەروەسا هندەك مالێن جودا جودایێن دیژی ل گوندی دژین وەكو مزووری و بەرواری و كۆچەران، ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا دۆسكیان ڤەیە، هژمارا خەلكێ گوندی، بەری سالا (١٩٧٠)ێ نێزیكی ٣٠ هەتا ٤٠ مالان بوون، نها دگەهنە نێزیكی ٢٥٠ هەتا ٣٠٠ مالانە، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل بازێران دژین.

ئەڤ گوندە شەش جاران هاتیە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٤،١٩٦٨، ١٩٧٤، ١٩٨٧)ێ ژی ئەڤ گوندە هاتیە بەردان، تا سالێن ١٩٩١-١٩٩٢ێ جارەكا دی گوند هاتیە ئاڤاكرنڤە.

**شوینوار و جهێن كەڤنار:**

د ڤی گوندیدا هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا جودا هەنە، ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان هەفت كاڤلە گوند دناڤ ئاقارێ گوندیدا هەنە، هەروەسا دو قوبێن كەڤن دناڤ مەزارێ گوندیدا هەبوون، لێ دگەل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ هاتینە خرابكرن، دبێژن مزگەفتەكا كەڤن ژی ل گوندی هەبوو كو بیرا كەسێ ل ئاڤاكرنا وێ نەدهات، ئەوژی دگەل گوندی هاتیە خرابكرن. گرنگترین شوینوارێن دی ل گوندی، شوینوارێن قەسرا بادێ بوون، كو دهاتە نیاسین ئێك ژ مەزنترین ئاڤاهی ل دەڤەرا بەهدینان، مێژوویا ئاڤاكرنا وێ دزڤریتەڤە بۆ سالا (٩٣٨مش/١٥٣١ز)ی [١٨] ) بەلی مخابن داویجار دەمێ گوند هاتیەخرابكرن ئەو ژی هاتەخرابكرن و پشتی ئاڤاكرنەڤا گوندی گرنگی

بادێ (گوندێ كەڤن)



ب شوینوارێن قەسرێ نەهاتەدان و ل شوونا وێ ئاڤاهیيەك هاتيەئاڤاکرن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (کەلا مەميا، دەریێ خەجۆکێ، گرێ سوور، گرێ شین، نزارۆك، سپیرێز، شکێرك، دەشتا بادێ، دەشتە بیرێ، کەندالا).

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەبوون، وەکو کانیێن (زیارەتوك، سکری، دەوارا، برکا خەجووی، برکا دەرویشا، عەجەموکێ، جەمی، جومێ، کەندالا)، نها ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل سەر بیرئیرتیوازيانە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریيا دێم بوو، وەکو باهیڤ و سماق و گەنم و نیسك و نۆك و ...هتد، زێدەباری خودانکرنا تەرش و کەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ ل دەسپێکا سالێن پێنجيان ل گوندی هەبوو، سالا (١٩٧٨)ێ نەمايە[١٩].

## گوندێ باکۆزێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ناڤێ گوندی ژ هەردو پەیڤێن (با - کۆز) پێکهاتييە، واتە ناڤێ وی ژ بایێ کۆزا هاتيە، دیارە کۆزەك نێزیکی گوندی بوویە و بایێ وێ کوزێ ب سەر گوندیدا هاتيە، لەوما ئەڤ ناڤە دانایە سەر گوندی.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** چیایێ باکۆز.

**باشووری:** گوندێ پشت گری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئێکمالە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بۆتیا.

دەرگەهێ قەسرا بادێ



### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ چوار مالباتان پێکدهێت، ئەوژی ئەڤەنە (عەسکەر مەسو، مستەفا داود، سالح داود، نەبی داود)، ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا دۆسکیان ڤەیە، هژمارا خەلکێ گوندی، بەری سالا (١٩٧٠)ێ نێزیکی ٢٠ هەتا ٣٠ مالان بوون، نها بووینە پتر ژ ٧٠٠ مالان، لێ کەس ل گوندی ناژیت و گوندەکێ کاڤلە[٢٠].

ئەڤ گوندە ل سالێن (١٩٦١، ١٩٦٤)ێ هاتییە بەردان، جارەکا دی خەلکێ وی زڤرییە سەر گوندی، دهەوا ئەنفالێن دەڤەرا بەهدینان‌دا ل تەباخا (١٩٨٨)ێ گوند ب ئێکجاری هاتییە خرابکرن وی دەمی ١٢ مال ل گوندی ئاکنجیبوون [٢١] و تا ئەڤرۆ نەهاتییە ئاڤاکرنڤە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (کانیکا عەمەر عیسا، گێریی ب قۆلنگ، ئاڤەبەنێ، چار هەڤشێ، کورا تەبقی، ئاڤەمێوکێ).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

هژمارەکا کانییان ل گوندی هەنە، وەکو کانیێن (عەمەر عیسا، عەبێ بەکر، نهالا گوندی، گولکۆلیکێ)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانیێن (عەمەر عیسا و گولکۆلیکێ) بوو.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا دێم بوو، وەکو گەنم و جەهـ و نۆك و نیسك و باهیڤ و سماق و ...

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ چ جاران ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەکرن[٢٢].

## گوندێ باگێرا سەری:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یائێکێ دبێژیت: ناڤێ گوندی ژ بابێ بێدەرا هاتییە و ب درێژاهیا دەمی بوویە باگێرا، یا دووێ دبێژیت: پەیڤەکا سریانیە ب واتا (تیر و کڤان) دهێت، ژبەرکو ل ڤی گوندی شەرەکێ مەزن ب تیروکڤانا هاتبوو کرن، لەورا دبێژنێ باگێرا.

ئەڤ گوندە نەیێ ئاڤایە، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان بریارا ئاڤاکرنا شازدە خانییان ژ ئالیێ حکومەتا هەرێما کوردستانێڤە دەرکەڤتییە لێ هێژ نەکەڤتیە د بارێ جێبەجێکرنێدا.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ کەڤلەسنێ.

**باشووری:** گوندێ کۆرا و گەلیێ قەنتارا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ غەلبۆکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باگێرا فەلا.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ دو مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (مەلا کینە، مەنگەلانی)نە، هەروەسا هندەك مالێن دیێن جودا جودا ل گوندی دژین، هژمارا خەلکێ گوندی، بەری سالا (١٩٧٠)ێ نێزیکی ١٠ هەتا ١٥ مالان بوون، نها بووینە نێزیکی ٧٠ هەتا ٨٠ مالانە و ل جهێن جودا دبەربەلاڤن.

ئەڤ گوندە چوار جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٥ و ١٩٨٨)ێ، ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، لێ تا نها ئەڤ نەهاتییە ئاڤاکرن.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ناڤ ئاقارێ ڤی گوندیدا هژمارەکا جهێن کەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ژ وان کاڤلە گوندێ باگێرا کەڤن، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان بتنێ ئەڤ باگێرە هەبوویە، هەروەسا شکەفتەکا مەزن و بەرفرەهـ ب ناڤێ شکەڤتا رەش، شوینوارێ هندەك کەلایێن بچووك ژی ل ڤی گوندی دهێنە دیتن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (بەرێ خاتینا، شکەفتە رەشێ، هریا سپی، پشتا گوندی).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو كانیێن (سیلاڤێ، بیهوك، شرتا، هۆزكێ، تا، شیڤ جویا جیهیان).

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریێ ئاڤییە؛ چونكە گوندەكێ پڕی كانیێن بۆشە و تێرا جۆتیاریێ دكەن، وەكو چاندنا برنج و سێڤ و خۆخ و هنار و تری و... هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ هەتا نها ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەكرن[٢٣].

## گوندێ باگێرا فەلان:

گوندەكێ مەسیحی نشینە، ژ وان گوندانە یێن ل سالا (١٩٢٧)ێ ب پێكهاتنا ناڤبەرا دەستەلاتداریا ئینگلیزی ل عیراقێ و حكۆمەتی مەلكیا عیراقێ ئەو مەسیحی یێن ژ دەڤەرا تیارێ ل باكوورێ كوردستانێ مشەختبووین لێ هاتینەئاكنجیكرن[٢٤]، ل دۆر ناڤێ گوندی هەمان دو بۆچوونێن پێشترن و ناڤێ وی یێ ژ ناڤێ (باگێرا سەری) هاتییە وەرگرتن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** كۆمەلگەها باگێرا.

**باشووری:** گوندێ كورێت گاڤانا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خرابیا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێسڤكێ.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ دو مالباتان پێكدهێت، ئەوژی مالباتێن (یوخەنا حەدا، دیشو)نە، هەروەسا هندەك مالێن موسلمانان ژی ل ڤی گوندی دژین، هژمارا خەلكێ گوندی، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٣٠ هەتا ٤٠ مالان بوون، نها بووینە ٢٥٠ هەتا ٣٠٠ مالانە و دبەر بەلاڤن، هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دژین.

ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتییە خرابكرن و تالانكرن و بەردان، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا سالا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٥، ١٩٧٥، ١٩٩٨)ێ گوند هاتییە خرابكرن.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا جودا هەنە، شكەفتا ینخیزائێ (واتە جهێ خواندنا پەرتووكا) گرنگترین شوینوارێ ڤی گوندییە، دكەڤیتە پشتا گوندی، هەروەسا شكەفتا بەرزە، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان ئەڤ شكەفتە د شوینوارێن دێرینێن ئیراقێدا هەیە؛ لێ نها ناهێتە دیتن، دبیت دبن ئاخێڤە بەرزەببیت.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (موغبەرا گوندی، كانیا قەرەچا، پشتا گوندی، شكەفتا بەرزە، كانیا بەسێ).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی بتنێ دو كانی هەنە، ئەوژی كانیا بەسێ و كانیا قەرەچێ، كانیا بەسێ هەر ژ كەڤن وەرە ژێدەرێ ئاڤا گوندیە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا دێمە، وەكو باهیڤ و سماق و گەنم و نیسك و نۆك و ...هتد، ژبلی خودانكرنا تەرش و كەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ ل دەسپێكا سالێن هەشتێیان ل گوندی هەبوو، سالا (١٩٨٨)ێ دگەل ئەنفالان نەمایە[٢٥].

## گوندێ باگێرا موسلمانا:

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان ئەڤ گوندە یێ نوی یە، سالا (١٩٥٧)ێ بوویە گوند و هێدی هێدی خەلكی بەرێ خودایێ، ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ باگێرا سەری هاتییە وەرگرتن.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کەڤلەسنێ.

**باشووری:** گوندێ کورێت گاڤانا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ غەلبۆکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێرکێ.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ دو مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (حەجی ئەحمەد کۆرەمارکی، سلێمان شێکەیی)نە، ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا دۆسکیان ڤەیە، هژمارا خەلکێ گوندی، بەری سالا (١٩٧٠)ێ نێزیکی ٣٠ هەتا ٤٠ مالان بوون، نها ژمارا وان دەوروبەرێن ٢٥٠ هەتا ٣٠٠ مالانە، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دژین.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان ئەڤ گوندە وەکی گوندێن دیێن دەڤەرێ گەلەك جاران نەهاتییە بەردان، بتنێ ل سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ یێ هاتییە بەردان، لێ جارەکا دی خەلکێ گوندی زڤرینە سەر گوندی ڤە و نها گوندەکێ ئاڤەدانە.

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

ل رۆژئاڤایێ گوندی هندەك شکەڤتێن بچووك دگەل هندەك ناوسکان هەنە، ل سەر دەرێ ڤان ناوسکان هندەك وێنە هاتینە کۆلان و شوینوارێن نڤیسینێ ژی هەنە، هەروەسا ل باشوورێ گوندی ئاشەکێ کەڤن هەیە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (شیڤ بالین، شیڤا گیزێ، کانییا قەرەچیێ، کانییا جندیا، کانییا بەسێ).

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانیێن (گوندی، پشتا گوندی، قەرەچیێ، جندیا، بەسێ)، بەری سەرهلدانا (١٩٩١)ێ ژێدەرێ ئاڤا گوندی کانییا گوندی بوو، نها ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل سەر بیرئیرتیوازینە، کو ل سالا (١٩٩٣)ێ ژ ئالیێ رێکخراوا ڤەندیل ڤە هاتبوو کۆلان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا ئاڤییە، وەکو سێڤ و حلیك و ترێ تایفی و ترەڤیان و... هتد، ژبلی خودانکرنا تەرش و کەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ ل سالا (١٩٨٣)ێ هاتییە گوندی و هەتا سالا (١٩٨٨)ێ یا بەردەوام بوو[٢٦].

## گوندێ بانیێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی بۆچوونەك دبێژیت: ناڤێ گوندی ژ دو پەیڤان پێکدهێت، ئەوژی (بان- نوی)، واتە بانێ نوی، ئەم دوورنابینین گوند ب جهێ جوگرافیێ وی ڤە هاتبیتەناڤکرن کو دکەفتە سەر بانییەکێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ ستوکورکێ.

**باشووری:** گوندێن چەڤریکێ و قرەشو.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ صوریا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێرالۆش.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە د بنیاتدا ژ شەش مالباتان پێکدهێت، ئەوژی ئەڤەنە (حسێن شینو، عەلی سێڤدین، عیسی صوری، بابیاکێ، مامیکی، ئیسڤێ زۆلەیخا)، سەر ب عەشیرەتا مزووریاڤەنە، هژمارا خەلکێ گوندی بەری ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ نێزیکی ٧٠ مال بوو، بەلێ ب بوورینا دەمی نها بووینە نێزیکی ٢٠٠ هەتا ٢٥٠ مالانە، دبەربەلاڤن هند ل گوندی کو پتر ژ ١٠٠ مالانە و هندژی ل باژێران دژین.

ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٠٨ کەس بوو[٢٧]، گوند سێ جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و

خرابکرن، دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ و ل سالا (١٩٦٢)ێ ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، دوماهیك جار دهەوا ئەنفالێن دەڤەرا بەهدینان‌دا د ناڤبەرا ٨/٢٥- ١٩٨٨/٩/١٥یـدا گوند ب ئێکجاری هاتییە خرابکرن وی دەمی ٣٠ مال ل گوندی ئاکنجیبوون[٢٨]. ل سالا (١٩٩١)ێ جارەکا دی گوند هاتییە ئاڤاکرن و نها گوندێ ئاڤایە.

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

د ڤی گوندیدا هژمارەکا شوینواران هەنە، رۆژهەلاتا گوندی جهەکێ شوینواری دهێتە دیتن، هەروەسا دناڤ ئاڤاریێ گوندیدا چوار شکەڤت ب ناڤێن (ئاصێ، خرو خرو، حاجیا، بانیێ) هەنە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (بانیا عاقار، شیڤا مشارا، کابن مەزنێ، خەندەکێ، راڤۆ، شکێرکا، نهالا فرەهـ).

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانییێن (ژێری، خەندەکێ، نزاروکی، سەرو کانیێ)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (سەرو کانیێ) بوو.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر چاندنا دێمە، وەکو سماق و ترێ رەشمێوی و باهیڤ... هتد.

پشتی بەیانا یازدەی ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ گەهشتییە گوندی[٢٩]، ل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ دگەل گوندی هاتییە خرابکرن[٣٠].

## گوندێ بەرێ بهار:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن دەمێ ل زڤستانێ بەفر دهات، هەمی دەڤەر دگرت، لێ ئەڤ گوندە باش نەدگرت و بەری هەر گوندەکێ دیێ دەوروبەری، بهارێ ل ڤی گوندی سەرهەلددا، واتە بهارا ڤی گوندی بەری گوندێن دی دهات، پاشی گوتنێ (بەرێ بهار).

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ بادێ.

**باشووری:** گوندێ ئێمینکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بابلۆ.

**رۆژئاڤایی:** چیایێ سپیرێز و گوندێ بێسرێ.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ دو مالباتان پێکدهێت، ئەوژی (مالا حەمێ، مالا عەلی عەبدیا)نە، سەر ب عەشیرەتا دۆسکییانڤەنە، هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٢ کەس بوو[٣١]، بەری گوند ل ١٩٨٧/٤/٢٠ێ بێتەخرابکرن ٢٠ مالبوون، نها بووینە ١٥٠ هەتا ٢٠٠ مالان.

ئەڤ گوندە چوار جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولێ گوند هاتییە بەردان، دیسان ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٧٤)ێ ژی و داوی جار ل (١٩٨٧/٤/٢٠)ێ بوو کو ب ئێکجاری ژ هاتییە خرابکرن، تا سالێن ١٩٩٢-١٩٩٣ێ جارەکا دی گوند ژئالیێ رێکخراوا هەیڤا سۆرڤە هاتییە ئاڤاکرن.

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

د ڤی گوندیدا هژمارەکا ناوسکان هەنە، دەرێن وان د بچووکن و ژ ناڤدا د بەرفرەهن، هەروەسا شوینوارێن دو کاڤلە گوندا ژی دهێنە دیتن، دبێژنە ئێك ژوان گوندێ ژووری، و یێ دی خرابێ ماری.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (هەفشێ تەعلی، بەرهەڤیێ، بەربەرایێ، گرێ شین، کورا عەلی حەوج، پشتا بەرێ، سەرێ کوزێ، کولوخکێ مەلەی).

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانییێن (کانییا مەزن، گوندێ ژووری، برکا کورێ، سەرێ کانییا مەزن، شیفکا بریل، برکا عەمەر)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (سەرێ کانییا مەزن) بوو.

### زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریێ ئاڤییە، وەكو ترێ تایفی و سێڤ و خۆخ و حلیك و....، گوند ب ترێ تایفی یێ بناڤ و دەنگە.

خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٧)ێ كەهشتییە گوندی، سالا پاشتر (١٩٧٨)ێ ئاڤاهیێ وێ هاتە چێكرن، و ل هەمان سالدا دگەل گوندی هاتییە خرابكرن[٣٢].

## گوندێ برجینێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێكێ دبێژیت: ل ڤی گوندی گەلەك كەلۆك و زیر و چیایێن وەكی برجان هەنە لەورا دبێژنێ برجینێ، یا دوویێ دبێژت: ناڤێ گوندی ژ (پر- جین) ێ هاتییە، واتە گەلەك جین هاتینە ئەڤی گوندی و لێ ژیاینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ زینەڤا.

**باشووری،** گوندێ بێسكێ.

**رۆژهەلاتی،** دەرگەلێ و دوخركێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ كواشێ.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ شەش مالباتان پێكدهێت، ئەوژی بریتینە ژمالباتێن (حەجی محویی، سەعدوی، ئینسان، ئەحیا، ئیسو بەگیا، تەمووی) ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا دۆسكییان ڤەنە، هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٧١ كەس بوو[٣٣]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیكی ١٠ هەتا ١٥ مالان بوون، نها ژمارا وان نێزیكی ١٠٠ هەتا ١٥٠ مالانە، دبەر بەلاڤن و كەس ل گوندی نائژیت.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان ئەڤ گوندە گەلەك جاران هاتییە بەردان و تالانكرن، لێ چووینە دەوروبەران پاشی جارەكا دی زڤرینە گوندی، بەلێ ل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ گوند ل (١٩٨٨/٨/٢٥)ێ گوند هاتییە كیمیابارانكرن و ب ئێك جاری هاتییە خرابكرن، وی دەمی ٢٥ مال ل گوندی د ئاكنجیبوون[٣٤]. خەلكێ گوندی ب نەچاری گوند بەردایە و بەرەف كەمپا دیاربەكر و قزلتەپە ل تركیا چووینە، تا سالا (١٩٩١-١٩٩٢)ێ جارەكادی زڤرینە گوندێ خۆ، لێ نها هندەك ژ خەلكێ گوندی دەمكی دچنە گوندی و هندەك ئاڤاهی بۆ خۆ لێ ئاڤاكرینە..

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ل رۆژئاڤایێ گوندی دو شكەفت ب ناڤێن شكەفتا فەلەی و شكەفتا ستوین هەنە، هەروەسا شكەفتەكا دی كو ب هۆنەرەكێ جوان و ب دەستی هاتییە چێكرن ل باكوورێ گوندی ب ناڤێ شكەفتا دو تەبەق هەیە، دیسان ل باكوورێ گوندی چەند ناوسكەك ل هنداڤی گەلییەكی ب ناڤێ گەلیێ ناوسكێن گەلی دهێنە دیتن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (خوارێ گوندو، گەوریكێ، كێچینێ، گرێ تەحلاڤێ، كوركا ب هەلز، نهالا قرێژی، خوارێ لەگەنێ، فەرشێ پەحنێ، كوخێ چەپەرا، چارچەل).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو كانیێن (گوندی، دووری، مەسهەبووكێ، مێوكێ، دەحلكی، مالا حەسەنی، مالا حەجی محووی، گوندێ ژێری، سپی دەلان، دەحلێ خیزی، سەعدی چاڤرەشا، تەحلاڤێ) كانییا گوندی ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو.

### زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا دێم بوو، وەك گەنم و نیسك و باهیڤ و سماق و ...هتد، و بخودانكرنا تەرش و كەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٧)ێ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، سالا (١٩٨١)ێ دەرێ وێ هاتییە گرتن[٣٥].

## گوندێ پشت گری:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ژبەرکو ئەڤ گوندە دکەڤیتە پشت گرێ گەرماڤا، لەورا دبێژنێ پشت گری.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری**، گوندێ باکۆز.

**باشووری**، گوندێ باجلۆر.

**رۆژهەلاتی**، گوندێ قارقاراڤا.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ گەرماڤا.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا دۆسکییا ڤەیە، ژ هەرسێ مالباتێن (سەعدو پشت گری، جەمیل پشت گری، عەبدوئالیێ حەلێ) پێکدهێت، هژمارا خەلکێ گوندی، بەری سالا (١٩٨٨)ێ ١٠ هەتا ١٥ مال بوون، نها دگەهنە ٥٠ هەتا ٦٠ مالان، نها گوند یێ کاڤلە و کەس لێ ناژیت.

ئەڤ گوندە چوار جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٧٤)ێ و داوی جار ل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابکرن و تا نها نەهاتییە ئاڤاکرن، سالا (٢٠١٤)ێ حکۆمەتا هەرێمێ بریارا ئاڤاکرنا ٣٣ خانییان دایە، بەلێ هەتا نها ئەڤ بریارە نە کەڤتییە د وارێ جێبەجێکرنێدا.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (زەڤیا کوشتیا، تەعلکێ، زەڤیێن خرابەی، گر بجیکێ).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان چ کانی ل گوندی نینن، بتنێ رووبارەکێ بهاری لێ هەیە، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل سەر بیرئیرتیوازیانە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێمە، وەکو نیسك و گەنم و ترێ رەشمێوی و باهیڤ و سماق و...

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ چ جاران ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەکرن[٣٦].

## گوندێ بێتاسێ:

گوندەکێ نوییە و سالا (٢٠٠٦-٢٠٠٧)ێ بوویە گوند، ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ناڤێ گوندی ژ (بێ داسێ) هاتییە، ڤێ ژی دو رامان هەنە، یان دبێ داسك بوون، یانژی گوندێ کێم داسی بوو.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی**، گوندێ پیرمۆس.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ ئێتیت.

**باکووری**، گوندێ چەمان.

**باشووری**، گوندێ کانی گۆلانێ.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤی گوندی چ مالبات نینن، بەلکو گوندەکێ نوی یێ تێکەلە ژ مالبات و گوند و عەشیرەتێن جودا جودا، وەکو عەشیرەتێن مزووری و بەرواری و دۆسکی و زێباری و کۆچەر....، هژمارا خەلکێ گوندی کو نها لێ دژین نێزیکی ١٠٠ مالانە.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا سێ جهێن شوینواری هەنە، کەلوتکا هەسەنی ل باکوورێ گوندی ل جهەکێ ئاسێ، شکەفتەکا مەزن و ئاسێ دکەڤیتە رۆژهەلاتا گوندی، هەروەسا کاڤلە گوندەك دناڤ ئاقارێ گوندیدا هەیە دبێژنێ بێتاسێ، دبیت ئەڤ کاڤلە گوندە بێتاسا بەرێ بیت ئەوا گوند پێهاتییە ناڤکرن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (گەلی کوتکی، تەڤەرەش، ئاقار، کەلوتکا هەسەنی، بەروژ).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان چ كانی ل گوندی نینن، ژێدەرێ ئاڤا گوندی بیرئیرتیوازیەكە كو ل سالا (٢٠٠٨)ێ ژ ئالیێ حكومەتا هەرێما كوردستانێڤە هاتییە كۆلان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

پتریا ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر مووچەیانە و كێمەك ژوان كارێ چاندنا دێم دكەن، وەكو باهیڤ و ترێ رەشمێوی و ...

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان، ل سالا (٢٠٠٨)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەكرن، سالا (٢٠٠٧)ێ مزگەفتەك ژی بۆ گوندیان دناڤ گوندیدا هاتییە دروست كرن[٣٧].

## گوندێ پیرمۆس:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ناڤێ گوندی ژ دو پەیڤان پێكهاتییە (پیر - موسی)، ب درێژیا دەمی بوویە پیرمۆس.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ چەمان.

**باشووری:** گوندێ باساوا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خوركی.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێتاسێ.

### پێكهاتا گوندی:

گوندە سەر ب عەشیرەتا مزووریاڤەیە، تنێ ژ مالباتا (عەبێ محوی) عەبدولئالیێ نەبی پێكهاتییە، ل سالا (١٩٧٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٩٢ كەس بوو[٣٨]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ١٥ - ٢٠ مال ل گوندی بوون، نها ٦٠ هەتا ٧٠ مالن، دبەربەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران.

ئەڤ گوندە چوار جاران هاتییە بەردان و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٧)ێ و ل سالا (١٩٧٥)ێ ب ئێكجاری هاتییە بەردان، تا سالا (١٩٩٤)ێ ژنوو جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان تنێ یەك شكەفت كو دكەڤیتە جهەكێ ئاسێ د كەڤرەكیدا ل پشتا گوندی هەیە، لێ شكەفتەكا بچووكە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (كورە مێوكێ، گەلی، سەرێ گوندی، گرێ غەبریا، كەڤرێ وەزیری).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی بتنێ یەك كانی ب ناڤێ كانییا گوندی هەیە، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل نها بیرئیرتیوازیەكە كو ل گەلیێ گوندی هاتییە كۆلان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا دێمە، وەكو گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و باهیڤ و سماق و تەرش و كەوالی....

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان، خواندنگەهـ ل گوندی نە بەرێ و نەژی نها نەبوویە[٣٩].

## گوندێ پیرۆمەرا:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژن: ناڤێ گوندی ژ دو پەیڤێن (پیر - ئومەرا) پێكدهێت، پاشان ب درێژاهیا دەمی بوویە پیرومەرا.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** كێلیا فرعینی ل چیایێ سپی هنداڤی بازێرێ دهۆكێ.

**باشووری:** گوندێ باخرنیف.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گەرماڤا سەعید ئاغایی.

**رۆژئاڤایی:** چیایێ پیرۆمەرا.

## پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ سێ مالباتان پێكدهێت، ئەوژی مالباتێن (محەمەد فەرخا، بەدران، سیاران)، سەر ب عەشیرەتا دۆسكییان ڤەنە، راپۆرتەكا پشكێنەرییا زانیاریا گشتی (مفتشیة المعارف العامة) یا نیسانا (١٩٥٦)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ب (٤٠٠)كەسان دەستنیشانكریە[٤٠]، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٤٦٥ كەس بوو[٤١]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٤٠ - ٤٥ مال بوو، نها دگەهنە ٢٥٠ هەتا ٣٠٠ مالان، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ل باژێران دژین.

ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٦، ١٩٧٠، ١٩٨٨)ێ، تا ڤان سالێن داویێ گوند جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن.

## شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان مەزارەكێ گەلەكێ كەڤن ب ناڤێ مەزارێ گرێ پیرا هەبوو، لێ دبن ئاڤا بەنداڤا دهۆك كەفتییە. هەروەسا كەلایەكا مێژوویی یا مەزن د ناڤ ئاقارێ گوندیدا هەیە، كو دبێژنێ (سیك و دوكانێت كافرا)، دكەڤیتە سەر زنجیرا چیایێ سپی و ناڤێ وێ د شوینوارێن مێژوویێن عیراقیدا هاتییە[٤٢]، ئەڤ كەلایە یا ل جهەكێ ئاسێ و ب بلندییا ١٠٠٠م ل سەر ئاستێ دەریای، دناڤ ڤێ كەلێ دا گەلەك جهێن مێژوویی وەكو پەرستگەهـ و بیر و... هتد هەنە[٤٣].

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (ملا پاتكا، كورە سیارێ، كەلاتا پیرومەرا، بانیكا گری، نهالا رەنیێ، ئاڤا سیر، نزارێ سەینی).

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو كانیێن (گەرمكێ، شرین، تەعلكێ، حەسەن گێژوو)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ كانییا (شرین) بوو.. و نها پرۆژێ ئاڤێ بۆ گوندی ل سەر ڤێ كانییێ هاتییەچێكرن و ئاڤ ل سەر مالان دهێتەلێكڤەكرن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر چاندنا ئاڤییە، وەكو خۆخ و هنار و سێڤ و... هتد، هەر وەسان یێ دێمی مینا باهیڤ و سماق و تری و... ژی، ژبلی خودانكرنا تەرش و كەوالی و مێشێن هنگڤینی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، ل سالا (١٩٥٢)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەكرن و تا سالا (١٩٦١)ێ هەبوو[٤٤]، دەمێ ل سالا (١٩٦١)ێ شۆرشا كوردستانێ دەسپێكری، گوند هاتییەبەردان و پتریا خەلكێ گوندی ل تاخێ گرێ باسێ یێ دهۆكێ نیشتەجێبوونە، خواندنگەها وان ژی هەر ب هەمان ناڤ هاتییە ڤەگوهاستن بۆ دهۆكێ و دگەل ئاڤاهیێ خواندنگەها نەورۆز (دهوك الثانية) دەوام دكر[٤٥].

# گوندێ پیرەفاتێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ناڤێ گوندی ژ هەردو پەیڤێن (پیر- فاتێ) پێكدهێت، پیر ناسناڤەكێ چینەكا ئێزیدیانە، فاتێ ژی ناڤێ ژنێیە، ئانكو دبیت دكەڤندا ئەڤە گوندێ ژنەكا ئێزدی یا بناڤ و دەنگا چینا پیرابیت، كو ناڤێ وێ (فاتێ) بوویە.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ بۆترشێ.

**باشووری:** گوندێ لیناڤا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بۆتیا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ زێوا شەفیق.

## پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ هەردو مالباتێن (عەجەمێ، سەلیم بوتی) پێكدهێت، گوند سەر ب عەشیرەتا دۆسكییان ڤەیە، هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٤٣ كەس بوو[٤٦]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ١٠ هەتا ١٥ مال بوون، نها دگەهنە نێزیكی ٥٠ هەتا ٦٠ مالانە، دبەر

بەلاڤن و كەس ل گوندی ناژیت.

ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی تنێ ٤٣ كەس بوو[٤٧].

ئەڤ گوندە شەش جاران هاتییەبەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەر وەسان ل مەها یازدەیا سالا (١٩٨٧)ێ گوند ژ بەر تۆپان هاتییەبەردان، داوی جار ل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ ب ئێك جاری هاتییەبەردان و خرابكرن، وی دەمی (١٣) مال ل گوندی نیشتەجێبوون، ئەو ژی ل (١٩٨٨/٨/٢٥)ێ بەرەڤ باكوورێ كوردستانێ مشەختبوونە و ل كەمپا پەنابەران ل دیاربەكرێ ئاكنجیبوونە[٤٨]، تا نها ئەڤ گوندە نەهاتییە ئاڤاكرن. هەژییە بێژین خرابە گوندەك ل نێزیكی ڤی گوندی ب ناڤێ پیرەفاتا خراب هەیە و خرابە گوندە و نەهاتییەزانین كەنگی هاتییەبەردان و بوویە خرابە[٤٩]، د سەرژمێریا سالا ١٩٥٧یدا ئاماژە ب ڤی گوندی وەك خرابە گوند هاتییەكران[٥٠].

## شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ل رۆژهەلاتا گوندی شوینوارێن گوندەكی دهێنە دیتن، شوینوارێن هندەك ئاڤاهیێن مەزنن و دیوارێن بەرفرەهن دبێژنێ گوندێ عەلی ئاغایی، هەروەسا ل رۆژئاڤایێ گوندی كاڤلە گوندەكێ دی هەیە دبێژنێ كاڤلكێن میرا.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (گرێ بەرانا، زیارەتێ سەید ئەحمەدی، نهالا صوری، پشتا گوندی).

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی دو كانیێن سەرەكی ب ناڤێن كانیا گوندی و كانیا تیانە هەبوون، ژ بەرێ و هەتا نها كانیا گوندی ژێدەرێ سەرەكیێ ئاڤا گوندییە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریێ دێم بوو، وەكو باهیڤ و سماق و گەنم و نیسك و نۆك و ...هتد، ژبلی خودانكرنا تەرش و كەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان خواندنگەهـ ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەكرن[٥١].

## گوندێ چەڤریكێ:

گوندەكێ عەشیرەتا مزووریانە، ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ژ رێكێن چڤر (ئاسێ) هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ بانیێ.

**باشووری:** گوندێ مێسكێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێنارینكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێرالۆش.

### پێكهاتا گوندی:

بتنێ یەك مالبات ل گوندی هەیە، ئەوژی مالباتا حەجی مستەفایە، هژمارا خەلكێ گوندی، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیكی ١٠ مالان بوو، لێ نها بووینە ٤٥ هەتا ٥٠ مالان، نها گوندەكێ كاڤلە و كەس ل گوندی ناژیت.

گوند سێ جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالا (١٩٦٢)ێ و داوی جار سالا (١٩٨٨)ێ بوو كو گوند پشتی هینگێ نەهاتییە ئاڤاكرن.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ئاقارێ گوندیدا هژمارەكا شوینواران هەنە، ئێك ژ وان دكەڤیتە باشوورێ گوندی ئەوژی وەكو دەرگەهەكێ بەری یێ مەزنە، دبێژنێ دەرێ خزینێ، هەروەسا كاڤلە گوندەك ب ناڤێ خرابێ فەلەی دهێتە دیتن، دیسان بەرەكێ مەزن و نەخشاندی دهێتە دیتن، دبێژنێ بەرێ دفن برِی، هەر ل باكوورێ گوندی هندە ناوسك دگەل شكەفتەكێ هەنە، دبێژنێ گەلیێ عەلیێ، هەروەسا كاڤلە گوندەكێ دیژی ل ئاقارێ گوندی ب ناڤێ گرێ مشتاخێ هەیە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (خرابێ فەلەی، نزاری، گەلیێ عەلی، کانیسکێت زێدکا، بەرۆژێ عەبدال، مناسبێ کێلیا درێژ، خارێ ب سیسن).

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانییێن (زێدکا، بەرۆژێ عەبدال، چەمە سووری، نیبرکا، تابرکا، گوندی، جوکا بچووک، جۆکا مەزن)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (گوندی) بوو.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر چاندنا ئاڤییە، وەکو برنج و تویتن و خۆخ و سێڤ و تری و هنار و مژمژە و حلیك و... هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ پشتی بەیانا یازدەی ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ گەهشتییە گوندی، سالا (١٩٨٨)ێ د گەل گوندی هاتییە خرابکرن[٥٢].

## گوندێ خروە:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن دەمێ بۆ جارا ئێکێ خەلکێ ڤی گوندی هاتینە سەر گوندی و ل دەمێ دیارکرنا سنووران گۆتنێ (ئەڤە خرێ وەیە) و ب بوورینا دەمی (خرێ وە) بوویە (خروە).

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ سەرمێسکێ.

**باشووری:** گوندێ مێرینا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کورەدێرێ.

**رۆژئاڤایی:** خرابێ شێخ محەمەد.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا مزووریا ڤەیە. ژ هەردو مالباتێن (جاسمێ کزۆیی، حەجی عەبدالی). پێکدهێت

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

ل گوندی هژمارەکا جهێن کەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، دووڤ ئاخفتنا گوندییان مەزارەکێ گەلەکێ کەڤن لێ هەیە دبێژن مەرقەدێ ئەیوب پێغەمبەرە. هەروەسا هژمارەکا شکەفتان د ئاقارێ گوندیدا هەنە، دناڤ ڤان شکەفتادا هندەك تێکۆلین سەر دیوارێن ژ ناڤداییێن ڤان شکەفتانڤە دگەل هندەك وێنان دهێنەدیتن، هندەك شوینوارێن دیژی ل باکوورێ ڤان شکەفتان دهێنەدیتن وەکو مەزەلێن خانییانە و د کەڤریدا هاتینە کۆلان، دووڤ ئاخفتنا ژێدەرەکێ ئەڤە جهێ لەشکەرێ ئوسمانییان بوو دەمێ هاتینە دەڤەرێ[٥٣].

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی تنێ دو کانی هەنە، ئەوژی کانییێن (شێخێ نەدرا، خروە)نە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

دەمێ گوندێ ئاڤا ژیارا خەلکێ وی ل سەر جۆتیاریا دێم وەکو نیسك و نۆك و تری و جۆتیاریا ئاڤی وەکو هژیر و سێڤ و ...هتد بوو.

ئەڤ گوندە نها کاڤلە و کەس لێ ناژیت[٥٤]، تنێ مایە وەکی شوینوار و هندەك گوندێن دەور و بەر جۆتیاریێ لێ دکەن[٥٥].

## گوندێ دێرالۆش:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ناڤێ گوندی ژ (دێر) و (الوش) پێك دهێت، بێی رامانا (الوش) بهێتە زانین.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ رەشانکێ.

**باشووری:** گوندێ مێسکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بانیێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سەرمێسکێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوندە ژ چوار مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (ئیبراهیم ئەحمەد دەلۆ، حەجی عەمەر، ئیسڤی عەبووی، تاهر)ن، هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٧٢ کەس بوو[٥٦]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ نێزیکی ١٥ هەتا ٢٠ مالان بوون، نها دگەهنە نێزیکی ١٥٠ هەتا ١٧٠ مالان، دبەر بەلاڤن لێ کەس ل گوندی نازیت و گوند یێ کاڤلە[٥٧].

ئەڤ گوندە تنێ جارەکێ ل سالا (١٩٦١)ێ هاتییە بەردان و جارەکا دی خەلکێ وێ زڤریە سەرگوندێ خۆ، داوی جار ژی کەتییە بەر هەوێن ئەنفالا و پشتی هینگێ گوند نەهاتییە ئاڤاکرن.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ئاقارێ ئەڤی گوندیدا تنێ دو ناووسک، ئێکا مەزن و ئێکا بچووك ل باکوورێ گوندی هەنە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (گەلیێ چل کانیکا، ئاڤیا شێخا، گەلیێ سەروکانیێ).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانیێن (گوندی، سپیکێ، ئاڤیا شێخا، باسێ، سەروکانی)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانیا (سەروکانی) بوو، هەروەسا رویبارەك کو دبێژنێ رووبارێ گوندی تێرا دەرباز دبیت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا ئاڤییە، وەکو حلیك و ترەڤی و تریێ تایفی و خۆخ و هنار و سێڤ .. هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ چ جاران ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەکرن[٥٨].

## گوندێ رەشانکا بەرواریا:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن دەمێ بەفر دباری و هەمی دەڤەر ڤەدگرت ل ئەڤی گوندی بەفر زوو دحەلیا، بەری هەمی گوندێن دەوروبەرێن خۆ رەشاتی پەیدا دبوو، لەورا دبێژنی رەشانکێ، ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ رەشانکا مزووریا هاتییە وەرگرتن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ غەلبۆکێ.

**باشووری،** گوندێ مێسکێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ رەشانکا مزووریا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ کۆرا.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ ڤی گوندی د بنیاتدا خەلکێ گوندێ ستوکورکێ نە کو ئەو ژی دبنیاتدا خەلکێ گوندێ زروێنە، هندەك ژی خەلکێ گوندێ خرابیانە، چ مالباتێن دروست د گوندیدا نینن، بەلکو مالێن جودا جودانە ژ مالباتێن هندەك گوندێن بەرواریان هاتینە، پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ هاتینە رەشانکێ و ئاڤاکرینە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (کورە زۆمکێ، کانیا تیێ، شکێری، پشتا کوپکی[٥٩]).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی دو کانیێن سەرەکی هەنە، ئەوژی کانیا گوندی و کانیا بلقێنە، بەری سالا (٢٠٠٣)ێ کانیا گوندی ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو، لێ پاشی بیرەکا ئیرتیوازی ژ ئالیێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێڤە هاتییە کۆلان و بوویە ژێدەرێ ئاڤا گوندی.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا دێمە، وەکو باهیڤ و سماق و گەنم و نیسك و نۆك و ...هتد، ژبلی بخودانکرنا تەرش و کەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ ل سالا (٢٠١١)ێ ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن، د هەمان سالێدا کارەب ژی گەهشتییە گوندی[٦٠].

## گوندێ رەشانكا مزووریيا:

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٩١)ێ جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن، ل دووڤ ئاخفتنا گوندیيان ئەڤ گوندە ل سالێن پیستاندا یێ ئاڤابوو، لێ پشتی هینكی تا سالێن پشتی سالا (١٩٩١)ێ نەهاتییە ئاڤاكرنڤە. ل دۆر ناڤێ گوندی ژی هەمان بۆچوونا پێشترە ل گوندێ (رەشانكا بەرواریا).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن ستوكوركێ و خرابیا.

**باشووری:** گوندێ دێرالۆش.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بانیێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ رەشانكا بەروارِیا.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ خەلكێ نها ل گوندی دبنیاتدا خەلكێ گوند ژ گوندێ بانیێ (دەڤەرا مزووری) هاتینە و ل گوندی ئاكنجی بووینە، پێكهاتییە ژ مالباتا حەجی نەبی. هژمارا خەلكێ گوندی د سالێن بیستاندا نێزیكی ١٠٠ مالان بوون، پشتی هینكی ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، نها ئاكنجیێن گوندی بتنێ ١٥ مالن.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

كاڤلە گوندەك د ناڤ ئاقارێ گوندیدا دهێتە دیتن، ل دووڤ ئاخفتنا گوندیيان ئەڤە گوندێ رەشانكا كەڤنە، هێشتا شوینوارێن وی دهێنە دیتن، هەروەسا ل پشتا گوندێ كەڤن شوینوارێن مزگەفتەكێ دهێنە دیتن، وەسا دیارە یا بەرفرەهـ بوویە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (بەرێ ماتورا، زەڤییێت كورێ، چەم حلیك، دەرێ ئاشی، دەرێ كەلی).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی كانیەكا بۆش ب ناڤێ كانییا كاڤلا هەبوو، ژێدەرێ ئاڤا وان بوو، ژبۆ ڤەخوارن و جۆتیاریێ، پشتی گوند هاتییە ئاڤاكرن بیرێن ئیرتیوازی ژ ئالیێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێڤە هاتینە دروستكرن، و بووینە ژێدەرێ ئاڤا گوندی.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریيا دێم و ئاڤییە، دێم وەكو باهیڤ و سماق و ترێ رەشمێوی و .... یێ ئاڤی ژی وەكو سێڤ و حلیك و خۆخ و مشمژە و ... هتد.

كارەب ل سالا (٢٠٠٧)ێ و خواندنگەهـ سالا (٢٠٠٨)ێ و پرۆژێ ئاڤێ ل سالا (٢٠١٠)ێ گەهشتینە گوندی [٦١].

## گوندێ رۆمتا:

گوندەكێ نوویە، ل (٢٠٠٧/٩/١)ێ ل سەر ئاقارێ گوندێ غەلبۆكێ هاتییە ئاڤاكرن، ناڤێ گوندی ناڤەكێ نوویە، پەیڤەكا سریانییە ب واتایا جهەكێ بلند دهێت، كو گوند ل جهەكێ بلندە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ غەلبۆكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باكێرا.

**باكووری:** گوندێ چیایێ باكێرا.

**باشووری:** گوندێ رەشانكێ.

### پێكهاتا گوندی:

گوندەكێ مەسیحییانە، ژ سێ مالباتان پێكدهێت، ئەوژی ئەڤ مالباتەنە (نهاوا، خەرجاوا، گربیش)، خەلكێ گوندی ٢٠ مالن و ١٢ مالێن ئاوارە ژی ل گوندی دئاكنجینە .

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

كانی ل ڤی گوندی نینن، ژێدەرێ ئاڤا وان ژی بیرەكە ژ گەلیێ ڤەنتارا دهێت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر پیشەیا وایە،

واته هندەك جۆتیارێ دکەن وهندەك فەرمانبەر و مووچەخورن[٦٢].

## گوندێ سپیاڤا خارێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: سپیاڤێ ناڤێ زەڤییەکێ بوو، ئاخا وێ یا سپی بوو، پاشی گوند ل وێرێ هاته ئاڤاکرن و ناڤێ گوندی ژێ هاته وەرگرتن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ مێرگەهەلێ.

**باشووری،** گوندێ گابێرکێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خۆرینێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بهێرێ.

### پێکهاتا گوندی:

د بنیاتدا گوند ژ یەك مالبات ئەوژی مالباتا عەبداله پێکهاتییه، هژمارا خەلکێ گوندی، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیکی ١٥ هەتا ٢٠ مالان بوون، نها ٦٠ هەتا ٧٠ مالن، دبەر بەلاڤن هند ل جهێن جودا جودا دژین.

ئەڤ گونده سێ جاران هاتییه بەردان و تالانکرن ئەوژی ل سالێن (١٩٦١، ١٩٦٣)ێ، داوی جار ژی سالا (١٩٨٨)ێ ب ئێکجاری هاتییه خرابکرن و تا نها نەهاتییه ئاڤاکرن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنه (زەڤیا کۆڤا، ناوسێ، گوندی، بناڤیا، خارێ بەکرا، سوور زەڤی، خارکێ ملا پانێ).

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

ل رۆژهەلاتا گوندی شوینوارێن مزگەفتەکێ ل دەڤەرێ ب ناڤێ (جامعا ئاڤدەل عومەرا) یا بناڤ و دەنگه دهێته دیتن، ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان مێژوویا وێ بۆ بەری ١٠٠ هەتا ١٥٠ سالان دزڤریتەڤه.

ل ڤی گوندی ئێك ژ شەرێن میرگەها بەهدینان رویدایه، نەخاسمه ل سەروەختێ میر (بەهرام پاشایێ مەزن)[٦٣] و میر مەلکی سەرکێشێ لەشکەرێ سەیدی خان بەگێ ل سالا (١١٣٣مش/١٧٢٠)زێ. بەلێ هەتا نها ناسناما ڤی سەیدی خانی نەهاتییه زانین، دیسان ئەگەرێ هنارتنا لەشکەری بۆ ڤی شەری دیار نینه، نڤیسەڤانەکێ هەڤدەم ئاڤرییەك ب ڤێ چەندێ کرییه، نەخاسمه وەختێ نێرینێن خۆ ل سەر دەستنڤیسا ژمار (١٦٩٢٢) ل ناڤەندا نشتمانی یا دەستنڤیسا ل بەغدا کری[٦٤].

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنه، وەکو کانیێن (هات، ناوسێ، گوندی)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (گوندی) بوو.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر چاندنا ئاڤییه، وەکو خۆخ و هنار و سێڤ و تویتن و حلیك و مژمژه و تری و ... هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان، خواندنگەهـ چ جاران نەگەهشتییه ڤی گوندی[٦٥].

## گوندێ سپیاڤا سەری:

ناڤێ ئەڤی گوندی ژ گوندێ سپیاڤا خارێ هاتییه وەرگرتن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ مێرگەهەلێ.

**باشووری،** گوندێ سپیاڤا خارێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خورینێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بێهێرێ.

### پێکهاتا گوندی:

بتنێ یەك مالبات ب ناڤێ مالباتا محەمەد ل گوندی هەبوو، هژمارا خەلکێ گوندی، بەری سالا (١٩٧٠)ێ نێزیکی ٣ هەتا ٧ مالان بوون، نها دگەهنه ٣٠ - ٣٥ مالان و کەس ل گوندی ناژیت.

گوند دو جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولێ و داوی جار ل هەوێن ئەنفالا بوو کو ب ئێکجاری هاتییەخرابکرن و تا نها ئەڤ گوندە نەهاتییە ئاڤاکرن.

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

بتنێ مەزارەکێ کەڤن ل رۆژئاڤایی گوندی هەیە، ل سەر ئێك ژ کێلێن وی، سالا (١٨٧٩)ێ هاتییە نڤیسین، ل سەر هندەك ژ کێلیان تیر و کڤان و کوسك تێرا هاتینە کۆلان، دبێژنێ مەزارێ مەلا دەروێش.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (شیڤا خرابەی، کەزابا، خارێ بلکێ، مێرگا جەلالێ، مێرگا شیلانێ).

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان ل ڤی گوندی بتنێ یەك کانی هەیە، دبێژنێ کانییا سپیاڤێ.

**زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێمە، وەکو و باهیڤ و سماق و هژیر و گەنم و نیسك و جەهـ و... هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان، خواندنگەهـ چ جاران ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەکرن[٦٦].

## گوندێ سەرمێسکێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ژبەرکو ئەڤ گوندە دکەڤیتە سەر گوندێ مێسکێ دا، لەورا دبێژنێ سەر مێسکێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ بەرۆشکا سیڤێ.

**باشووری:** گوندێ مێسکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ رەشانکێ و دێرالۆش.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کورێت کاڤانا.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند ژ حەفت مالباتان پێکدهێت، ئەوژی بریتینە ژ مالباتێن (حەجی محەمەد، میسا، حەجی عەبدولا، سوار، مام شێخا، قادر، حەجی مەلۆ)، سەر ب عەشیرەتا مزووریيا ڤەنە، هژمارا خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ ١٠ - ١٢ مال بوو، نها دگەهنە ٦٠ - ٧٠ مالان، ل دەڤەرێن جودا دبەر بەلاڤن.

ئەڤ گوندە سێ جاران هاتییەبەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٧٥)ێ ژی هاتییە بەردان، هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە.

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

د ڤی گوندیدا هژمارەکا جهێن کەڤن و شوینوارێن جودا جودا هەنە، ل پشتا گوندی شوینوارێن قەسرەکا کەڤن هەنە، وەسا دیارە قەسرەکا مەزن بوویە، هەروەسا شوینوارێن دێرەکێ دناڤ ئاڤاهیێ گوندیدا دهێتە دیتن، ژبلی شکەفتەکا مەزن ژی ل ئاڤاهیێ گوندی یێ هەی.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (شیڤا قەسرۆکا، زەڤیا لبەر قەسرێ، بەرکوزێ، لاتا عوبێد، زەڤیا مژمژێ).

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانییێن (سەرمێسکێ، گوندی، خەندەك، قادر، بن کیزێ، شیڤ قەسرۆکا)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (گوندی) بوو.

**زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا ئاڤییە، وەکو خۆخ و هنار و سێڤ .. هتد، هەروەسا یێ دێمی ژی، مینا باهیڤ و سماق و... ژی، ژبلی خودانکرنا تەرش و کەوالی ژی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان، خواندنگەهـ ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەکرن[٦٧].

## گوندێ ستوکورکێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ئستکرکێ ژ دو پەیڤان پێکدهێت (هستو - کورت)، پاشی ب درێژاهییا دەمی بوویە ئستکرکێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن بێهێرێ و خرابیا.

**باشووری:** گوندێ بانیێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن سپیاڤێ و گابێرکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ رەشانکێ.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ پێنج مالباتان مالباتێن: خورشید تاهر، رەشید تاهر، تاهر حسێن، مستەفا تاهر، حسێن تاهر پێکدهێت، سەر ب عەشیرەتا بەرواری ژێریانڤەنە، د دەمێ ئەنجامدانا سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١٤٥ کەس بوو[١٨]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیکی ١٠٠ مالان بوون، نها دگەهنە نێزیکی ٥٠٠ مالان، دبەر بەلاڤن و کەس ل گوندی ناژیت.

ئەڤ گوندە سێ جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، دەسپێکا شۆرشا (١٩٦١)ێ گوند هاتییەبەردان، سالا (١٩٧٤)ێ ژی هاتییەبەردان، سالا (١٩٨٨)ێ ب تەمامی هاتییەوێرانکرن، سالێن ١٩٩١-١٩٩٢ێ جارەکا دی گوند هاتییە ئاڤاکرن، بەلێ د ئەنجامێ شەرێ ناڤخۆیی ژ سالا ١٩٩٤ێ بەرەف ژوور گوند هاتییەبەردان و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

دو شکەفت د کەڤنە باکوورێ گوندی، دبەرفرەهن و د شۆرش و سەرهلدانێن کوردیدا بووینە جهێ ڤەحەواندنا خەلکێ گوندی، هەروەسا شوینوارێن مزگەفتەکا کەڤن ل ڤێ گوندی دهێتە دیتن، هندەك شوینوارێن دیژی وەکو ئاغدا ل سەر هندەك کانیکێن گوندی دهێنە دیتن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (رێکا ناڤدارا، رێکا شکەفتا عەلی، دوولا مەزن، رێکا زروێ، دولا شکەفتێن ل سەر ئێك، دولا زروێ).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانیێن (بلقێ، گوندی، خارکی)ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (گوندی) بوو، نهاژی هەمان کانی ژێدەرێ ئاڤا گوندییە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێمە، وەکو باهیڤ و نیسك و نۆك و گەنم و مێو و سماق و ...

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان پشتی پێکهاتنا یازدەی ئادارا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، سالا (١٩٨٨)ێ دگەل گوندی هاتییە خرابکرن، جارەکا دی ل سالا ١٩٩٢ێ هاتییە ڤەکرن ڤە[٦٩].

## گوندێ سندۆر:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن سندۆر ژ دو پەیڤان پێکدهێت، (سن- دێر) واتە دانێ دێرێ، پاشی ب درێژاهییا دەمی بوویە سندۆر.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ مەمانێ.

**باشووری:** گوندێن بێسرێ و باجلۆر.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بادێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن قارقاراڤا و ئێکمالە.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ حەفت مالباتان پێکدهێت، ئەوژی بریتینە ژمالباتێن (جەرگیس، ئەبو خورتا، حەسەن ئیبراهیم، مەلایی، حسێن، عەبدوللا، مستەفا)، سەر ب عەشیرەتا دۆسکییانڤەنە، هژمارا خەلکێ

گوندی، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٨ هەتا ١٠ مالان بوو، نها دگەهنە ٢٥٠ هەتا ٣٠٠ مالانە، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دژین.

ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتیە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، دەسپێکا شۆرشا (١٩٦١)ێ و سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٥، ١٩٨٥)ێ هاتیەبەردان، داوی جار سالا (١٩٨٨)ێ بوو کو ب ئێکجاری هاتیە خرابکرن، تا سالێن ١٩٩٢-١٩٩٣ێ جارەکا دی گوند هاتیە ئاڤاکرن ڤە.

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەکا شکەفتا دهێنە دیتن دبێژنێ گەلیێ شکەفتا، بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (گەلیێ مێشێ، ملا کادێ، گەرماڤۆکێ، شکێرکی، گەلیێ شکەفتا، کەڤرك، وارێ قەرەچا).

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانیان هەنە، وەکو کانیێن (گوندی، چیا، شەناکێ، ژنکا، عەزیزاکێ، برکا مەلایی، گوندی، کارێزا مالا جەرگیس)ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانیا (گوندی) بوو.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریێ دێمە، وەکو باهیڤ و نیسك و نۆك و گەنم و مێو و سماق و ...

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ ل سالا (١٩٥٦)ێ ل گوندی هاتیە ڤەکرن، تا سالا (١٩٨٨)ێ هەبوو، لێ جاران دهاتە گرتن، سالا (١٩٩٣)ێ دگەل ئاڤاکرنا گوندی ئەو ژی دەست ب کاربوو[٧٠]، هەژیە بێژین هەتا دەسپێکا سالێن پێنجیيان ژ سەدسالیا بیستێ ئەڤ گوندە گوندێ جوهیيان بوو و پشتی ئەوان کۆچکریە ئیسرائیلی خەلکێ موسلمان لێ ئانجیبوونە .

## گوندێ صۆریا:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ناڤێ گوندی ژ رێکا سوور هاتیە، پاشی ب درێژیا دەمی بوویە صۆریا.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ گابێرکێ.

**باشووری:** گوندێ بێنارینکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کانیباسکا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بانیێ.

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژدو مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (حەجی لەیلا، بابەکری)نە، سەر ب عەشیرەتا مزووری نە، د دەمێ ئەنجامدانا سەرژمێریا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١١٩کەس بوو[٧١]، گوند سالا (١٩٧٠)ێ ٤٠ - ٥٠ مال بوو، نها ١٠٠ هەتا ١٥٠ مالان، دبەر بەلاڤن، هندە خانی ل گوندی هەنە، لێ تنێ خەلکێ گوندی ب بانەهی دچیتە گوندی.

گوند پێنج جاران هاتیە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٨، ١٩٧٤، ١٩٨٨)ێ ئەڤ گوندە هاتیە بەردان، تا سالێن ١٩٩١-١٩٩٢ێ جارەکا دی گوند هاتیە ئاڤاکرنڤە، لێ نها کەس ل گوندی ناژیت.

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا هندەك جهێن کەڤن هەنە، شوینوارەك لێ هەیە وەسا دیارە ئاڤاهیەکە، لێ ناهێتە زانین کانێ چیە؟ دبێژنێ کورا شێخا، هەروەسا کانیەکا دیا کەڤن ل گوندی هەیە دبێژنێ کانیا رزدی. چوار مەزار ل گوندی هەنە، ژوان پیر خەجیج و پیرێ بابەکر و مەزارێ بچووکا و مەزارێ کانی گەرکا.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (پشتا گوندی، ملا سوور، کەڤرێ هەساری، چیایێ زروی).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانیێن (گوندی، گەوری، لاسکێ، بالاڤا، چەمی، رەزی، )، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل سەر کانییا گوندی بوو.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا ئاڤییە، وەکو سێڤ و خۆخ و حلیك و برنج و تریێ تایفی و ترەڤی و... هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ ل دەسپێکا سالێن هەفتێیان هەبوو، ل سالا (١٩٧٨)ێ نەمایە[٧٢].

## گوندێ سارکێ (صارکێ):

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ژبەرکو گوندەکێ سارە و ب تایبەتی ل زستانان، ژبەر هندێ ناڤێ گوندی بوویە سارکێ (صارکێ).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ لۆمانا.

**باشووری:** گوندێن خرابیا و غەلبۆکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بهێرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باگێرا.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ شەش مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (سەعید سارکی، نەعمان، تەمبەلا، کوسا، حەم رەشا، مالا شێخا)نە، ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا دۆسکییان ڤەیە، هژمارا خەلکێ گوندی لسالا ١٩٥٧ێ ٢١٤ کەس بوو[٧٣]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٤٠ هەتا ٤٥ مال بوون، نها دگەهنە ١٣٠ هەتا ١٥٠ مالان، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دژین .

گوند پێنج جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٨، ١٩٧٠، ١٩٨٨)ێ گوند هاتییە بەردان، جارەکا دی ل سالا (١٩٩١)ێ گوندێ هاتییە ئاڤاکرن.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەکا جهێن کەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ل رۆژهەلاتا گوندی سێ کاڤلە گوند هەنە زوان (قورانکێ، جەعفەرێ، جاڤرکی)، هەروەسا کاڤلە گوندێ (زەڤیا کورێ) ژی ل باکوورێ گوندی هەیە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (سێلاڤێ، کانی هژێرکێ، قەسرا میکائیلی).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانیێن (چنارکێ، جەعفەرێ، گربەرازکێ، هژیرکێ، سیلاڤێ، دەحلی، درکێ، کول، میرا)، ل بەرێ کانیکا میرا ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو، لێ نها ژێدەرێ ئاڤا گوندی بیرئیرتیوازییە، کو ل سالا (٢٠١٥)ێ ل گەلیێ قەنتارا هاتییە کۆلان.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا ئاڤییە، وەکو خۆخ و هنار و سێڤ .. هتد، هەروەسا یا دێمی ژی، مینا باهیڤ و سماق و ...، ژبلی خودانکرنا تەرش و کەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ سالێن ١٩٦١- ١٩٦٤ێ ل گوندی هەبوو. پشتی پێکهاتنا یازدەی ئادارا (١٩٧٠)ێ جارەکا دی خواندنگەهـ هاتەڤەکرن[٧٤]، سالا (١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حکۆمەتا بەغداڤە هاتە خرابکرن[٧٥].

## گوندێ تەلوە (طەلوە):

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ناڤێ گوندی ژ تەولە

هاتییە، تەڵوە دبێژنە ئەڤ جهێن كندێن وەكی مێرگا، جهێ گوندی ژی یێ كندە و وەكو مێرگانە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێن مێرینا و كۆزو.

**باشووری:** گوندێ بێتاسێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ چەمان.

**رۆژئاڤایی:** هەردو ئەڤریكێ.

**پێكهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ چوار مالباتان پێكدهێت، ئەوژی مالباتێن (لەشكەری، عەلیێ حەلێ، ناڤێ، بێردیێ)نە، ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا مزووری یە، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٦٦ كەس بوو[٧٦]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٢٠ - ٢٥ مال بوو، نها دگەهنە نێزیكی ١٤٠ هەتا ٢٥٠ مالان، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دژین .

ئەڤ گوندە تنێ ل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابكرن، سالا (١٩٩٣)ێ بیست مال هاتینە ئاڤاكرن، نها گوند یێ ئاڤایە.

**شوینوار و جهێن كەڤنار:**

ل گوندی هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ل رۆژهەلاتا گوندی شوینوارێن دێرەكێ هەنە، دەور و بەرێن گوندی ژی هەفت مەزار هەنە، سێ ژوان ب ناڤێن (ئەسحابە، كانیێ، كێم داریێ) ل رۆژهەلاتا گوندی، ئێك ژی دكەڤیتە باشووریێ گوندی دبێژنێ (حەسیێ) و یێ دی دكەڤیتە باكووریێ گوندی دبێژنێ (ولیەمەدین).

(مێرگەرەشێ، رەزی، چومێ، توخیبی، كوزا عەبدی، خاركی) بەرنیاسترین جهێن گوندی نە.

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو كانیێن (ولیەمەدین، سێ گركا، گركێ زەر، هەڤشێ مێشێ، ئیسڤ، گیزێ).

**زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێم بوو، وەكو گەنم و جەهـ و نۆك و نیسك و باهیڤ و سماق و ...

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ بەرێ ل گوندی نەبوویە، ل سالا (٢٠١٥)ێ ژنوی هندەك كابینە ئینانە گوندی و خواندنگەهـ ڤەكرییە[٧٧].

**گوندێ غەلبۆكێ:**

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ژبەركو ئەڤ گوندە ل جهەكێ خرەبەردایە، ئەو جهێن ژڤی رەنگی دبێژنێ غەلبۆكێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ ساركێ.

**باشووری:** گوندێ بەرۆشكا سێڤێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خرابیا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن باگێرا و رومتا.

**پێكهاتا گوندی:**

گوند د بنیاتدا ژ مالباتا عەبدوللا غەلبۆكی پێكدهێت و هندەك مالێن سپینداریان ژی لێ هەنە، هژمارا خەلكێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ ١٤ هەتا ١٨ مال بوون، نها دگەهنە نێزیكی ٥٠ - ٦٠ مالانە، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دژین.

ئەڤ گوندە سێ جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالا ١٩٧٤ێ ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، داوی جار ژی ل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ بوو هاتییە خرابكرن، ل سالا (١٩٩١)ێ هاتییە ئاڤاكرن، نها گوند یێ ئاڤایە و نەهـ مال لێ دژین.

**شوینوار و جهێن كەڤنار:**

د ڤی گوندیدا بتنێ شوینوارێن هندەك ئاشێن كەڤن دهێنە دیتن، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان هەر ژ كەڤندا ئاش ل گوندی هەبووینە.

(مێرگا غەلبۆكێ، شیڤا خۆخوری، سەرێ حەسەن بەلوی، بانی زراڤکێ، بانیا بەلە گەورا) بەرنیاسترین جهێن گوندی نە.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

هژمارەكا كانییان ل گوندی هەنە، وەكو كانیێن (گوندی، گولاڤێ، بركا مزگەفتێ، بن دیواری، بركا سەرمەندا، بركا مەنهولا، بركا سكری، قەرەمكێ)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ كانییا (قەرەمكێ) بوو، هەر وەسان سكرەكێ بچووكێ ئاخێ ژی بۆ چاندنێ لێ هەیە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر چاندنا ئاڤییە، وەكو هژیر و خۆخ و هنار و تری و هرمیك و سێڤ .. هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ ل داویا سالێن حەفتیان ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، سالا (١٩٨٨)ێ د گەل گوندی هاتییە خرابكرن، سالا (١٩٩١)ێ جارەكا دی دگەل ئاڤاكرنا گوندی هاتییە ڤەكرن ڤە[٧٨].

## گوندێ گابێركێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێكێ دبێژیت: ناڤێ گوندی ژ هەردو پەیڤێن (گا - بێرك) پێكدهێت، واتە جهێ گا و بێركا، ئانكو ئەو جهێ گرنگی ب كشتوكالی و ئالاڤێن وێ ددا، بۆچوونا دی دبێژیت: ئەڤ ناڤە دبنەرەتدا (گاگێركێ) بوویە، ئەو جهێ گایەك لێ گرتلبووی، یان ئەو جهێ گێرە ب رێكا گایان لێ دهاتەكرن، ب بوورینا دەمی بوویە گابێركێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێن خورینێ و سپیاڤێ.

**باشووری:** گوندێ صۆریا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ كانییا باسكا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ستوكوركێ.

**پێكهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ پێنج مالباتان پێكدهێت، ئەو ژی ژ مالباتێن (حەجی حسێن، حەجی محەمەد، حەجی رەشید، صوفی عەبدۆللا، مامێ خورشید)، سەر ب عەشیرەتا مزووریاڤەنە، هژمارا خەلكێ گوندی بەری سالا (١٩٨٨)ێ ١٠ هەتا ١٥ مال بوون، نها دگەهنە ٦٠ هەتا ٧٠ مالان، دبەربەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دژین.

ئەڤ گوندە سێ جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەر وەسان ل سالا (١٩٦٨)ێ و بەری ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ (١٥) ل گوندی دژیان، د ناڤبەرا ٨/٢٥-١٥/٩/(١٩٨٨)ێ گوند ب ئێكجاری هاتییە خرابكرن[٧٩]، تا سالا (١٩٩٣)ێ جارەكا دی گوند هاتییە ئاڤاكرن، پاشی جارەكا دی ل سالا (٢٠٠٠)ێ ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، نها تنێ خەلكێ گوندی ب بانەهی دچیتە گوندی.

**شوینوار و جهێن كەڤنار:**

د ڤی گوندیدا هژمارەكا شوینوارا دهێنە دیتن، پێنج ناوسك د كەڤنە ئالیێ باكوورێ گوندی هەنە، هەروەسا دو ئاشێن كەڤن دكەڤنە باكوورێ گوندی هەنە، دبێژنێ ئاشێن (سمۆی، حەجی سەعید)، دیسان بەرەكێ دی دهێتە دیتن گەلەگ نەخشە و نڤیسینێن كەڤن ل سەر هەنە دبێژنێ بەرێ ناوسكێ، هەروەسا كاڤلە گوندەك ل پشتا گوندی هەیە دبێژنێ (كوكەل).

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (زەڤیا شەمووی، زەڤیا دنخەی، ئاشێ سمووی، ئاشێ حەجی سەعید).

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو

كانیێن (گوندی، چلۆیێ، برکا ژووری، سەرێ كانیێ)،
ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ كانییا (سەرێ كانیێ) بوو.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا ئاڤییە، وەكو حلیك و سێڤ و مژمژە و باجانسۆرك و لۆبیك و.... جۆتیارییا دێم ژی هەیە، وەكو سماق و ترێ رەشمێوی و باهیڤ و... هتد.

خواندنگەهـ سالا (١٩٧٨)ێ گەهشتییە گوندی، سالا (١٩٨٨)ێ دگەل گوندی هاتییە خرابكرن[٨٠].

## گوندێ گەرماڤا:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ناڤێ گوندی ژ گەرماتیا ئاڤا كانیێن گوندی هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ باكۆزێ.

**باشووری:** گوندێ پیرۆمەرا و باژێرێ دهۆك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پشت گری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باخرنیڤا.

### پێكهاتا گوندی:

ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٢٥ كەس بوو[٨١]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٥٦ مال بوون، نها پترن ژ ٤٠٠ مالان و ل جهێن جودا دبەربەلاڤن و گوند د نها كەڤتیە بن بەنداڤا دهۆكێڤە [٨٢].

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤێ گوندیدا هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا جودا هەنە، گرێ گەرماڤا ئێك ژ جهێن شوینوارێن گوندێ گەرماڤایە، هەروەسا دناڤ ئاڤارێ گوندیدا چوار شكەفت هەنە، ژوان شكەفتێن(مەزن، بچووك، كۆترا، كاركا).

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەبوون (گرێ عەمێ، گریچیك، گرێ مەزن، بێدەرول، باسكێ مەمێ، شیڤا گیزێ، شیڤەكیر، كەندالێ شین، كورا خرابا، زەڤیا شێخی، باسكێ تاڤەبەرێ، سەرادا گری، پاوانێ كافرا، بەرێ سیسكا، بانێ تەباخكێ، كەلۆك، كورا مزگەفتێ، ئاستەنكۆك، ناڤ گرا، بەرێ بێهنڤەدانێ).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەبوون، وەكو كانیێن (گەرماڤا ژێری، گەرماڤا ژووری، كانی گرك، گەرا ئاڤەدەوێ، گەرا زمزەلاقێ، پیدگەهوەرێ، كون كبریت).

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا ئاڤی بوو، وەكو خۆخ و هنار و سێڤ .. هتد، و تەرش و كەوالی، و باهیڤ و سماق و ... [٨٣].

## گوندێ كەڤلەسنا خارێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ناڤێ گوندی ژ كەڤرێت ئاسێ هاتییە؛ چونكە دەڤەرەكا كەلەك ئاسێیە، پاشی ب درێژاهییا دەمی بوویە كەڤلەسنێ.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ لۆمانا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باگێرا.

**باكووری:** گوندێ كۆندكا نەبی.

**باشووری:** گوندێ باگێرا سەری.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ حەفت مالباتان پێكدهێت، ئەو ژی مالباتێن (ئەمین، محەمەد، شەعبان، چوپی، دێوالی، ئورەماری، ئالیخان)ن، ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا دۆسكی ڤەیە، هژمارا خەلكێ گوندی بەری سالا (١٩٨٨)ێ كی ١٥ - ٢٠ مال بوو، نها دگەهنە ٥٠ - ٧٠

مالن، دبەر بەلاڤن و نها گوند یێ بەردایە.

ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتییەبەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا (١٩٦١)ێ، و سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٩، ١٩٧٥، ١٩٨٨)ێ هاتییەبەردان تا سالێن ١٩٩١-١٩٩٢ێ جارەكا دی گوند هاتییە ئاڤاكرنڤە بەلێ ب دروستی خەلك نە زڤرینەڤە گوندی تنێ هندەك مال ب بانەهی چووینە گوندی.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ل رۆژهەلاتا گوندی هژمارەكا ناوسكان هەنە، هندەك دبچووكن و هندەك د مەزنن دبێژنێ ناوسكێن قەشا، خەلكێ گوندی دبێژن قەشە دڤان ناوسكاندا هاتینە ڤەشارتن لەورا ڤی ناڤی دبێژنێ، هەروەسا ل رۆژئاڤایێ گوندی بەرەكێ نەخش تێكولایی هەیە دبێژنێ بەرێ خزینا.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (زەڤیا ژن مریا، كانییا تیكا، بركا مەزن، بركا بچیك).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو كانیێن (بجیك، تیكا، بركا بچووك، بركا بەرایێ، بركا مەزن، بركا ژنكا).

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێمە، وەكو باهیڤ و سماق و گەنم و نیسك و نۆك و ...هتد، هەر وەسان خودانكرنا تەرش و كەوالی.

پشتی ١١ ئادارا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی ڤەكرینە[٨٤]، گوندێن دەردور وەكو ساركێ و لۆمانا و كۆندكا و باگیرا هەمی دهاتنە ڤێ خواندنگەهێ دخواندن، تا سالا (١٩٨٨)ێ خواندنگەهـ د گەل گوندی هاتییە خرابكرن[٨٥].

## گوندێ كزۆ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێكێ دبێژیت: ناڤێ گوندی ژ كۆزێن پەزی هاتییە، واتە گەلەك كوزێن پەزی لێ هەبوون، یان ژی ژ كزۆتا بویكێ هاتییە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بابلۆ.

**باشووری،** گوندێ تەلوە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مێرینا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئێمینكێ.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ سێ مالباتان مالباتێن (باپیرا، فەیزووی، حاجی تاهای) پێكدهێت، سەر ب عەشیرەتا مزووری نە، هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ٥٢ كەس بوو[٨٦]، بەری ئەنفالێن (١٩٨٨)ێ ٢٦ - ٣٠ مال بوو، ب بوورینا دەمی زێدە بووینە و نها دگەهنە ٣٠٠ هەتا ٣٥٠ مالان، دبەربەلاڤن هند ل گوندی و هند ل باژێران دژین.

ئەڤ گوندە چوار جاران هاتییەبەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ ئەڤ گوندە ڤالابوویە ژ خەلكی، هەروەسان سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٨)ێ و داوی جار سالا (١٩٨٨)ێ بوو كو گوند ب ئێكجاری هاتییە خرابكرن، تا سالێن ١٩٩٢-١٩٩٣ێ جارەكا دی هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (پشتا گوندی، شیڤ ئەسینا سەرێ گوندی، سەرێ كانیێ).

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

ل پشتا گوندی كەلایەكا مەزن دهێتە دیتن، وەسا دیارە ل دەور و بەرێن وێ شوینوارێن هندەك كاڤلە خانییان دهێنە دیتن.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو كانیێن (سەرێ كانیێ، میرسینا، گری، شیڤا

سینایە، چیما)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ كانییا (سەرێ كانیێ) بوو.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر چاندنا ئاڤییە، وەكو برنج و سێڤ و خوخ و باجانسۆرك و لۆبیك و... هتد.

سالا (١٩٦٨)ێ خواندنگەهـ گەهشتییە گوندی، سالا (١٩٨٨)ێ دگەل گوندی هاتییە خرابكرن[٨٧].

## گوندێ كۆرا (فەلّان):

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن ناڤێ گوندی ژ هەردو پەیڤێن (كۆرك - كەوڤان) پێكدهێت، واتە كۆركێت كەوڤانا، پاشی بوویە (كورێت كەوفانا) و ب درێژاهییا دەمی بوویە (كورێت گاڤانا).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ باگێرا.

**باشووری،** گوندێ زاویتە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ رەشانكێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ رەشاورێ.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ هەشت مالباتان پێكدهێت، ئەوژی ئەڤەنە (جادوو، مەلك چەكو، یوسف، روێل، یەعقوب، مەلك، یوساوێ، داودر)، خەلكێ ئەڤی گوندی ئەو مەسیحیێن تیاری نە ئەوێن ل سالێن بیستان ژ سەدساڵیيا چوویی ل دەڤەرێ هاتینەئاكنجیكرن.

خەلكێ گوندی بەری سالا (١٩٨٨)ێ ١٠ هەتا ١٥ مال بوون، نها نێزیكی ٥٠ هەتا ٦٠ مالانە، دبەربەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دژین.

ئەڤ گوندە چەند جاران هاتییەبەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٨٨)ێ نها گوندەكێ ئاڤایە.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

چ جهێن شوینواری یێن بەرچاڤ نینن، لێ ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان دەمێ كۆمەڵگەها كۆرا دروست دكر گەلەك گۆسكێن كەڤن دەركەڤتن وەسا دیاربوو، كو جهێ مەزارەكێ كەڤن بوو، دیسان خانەكا كەڤن ژی ل ڤی گوندی ل سەردەمێ سولتان حسێنێ وەلی (١٥٣٤- ١٥٧٠)ێ هاتبوو ئاڤاكرن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (ملا گوندی، گەلیێ قەنتارا، گەلیێ كاژا).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی ئاڤ گەلەكا كێمە و ژبلی كانییا گوندی و كانییێن بهارا چ كانییێن دی لێ نینن، ژێدەرێ ئاڤا وان ل سەر بیرئیرتیوازیانە، ئێك ژوان سالا (١٩٨٣)ێ هاتییە كۆلان و یادی پشتی سالا (١٩٩١)ێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا دێمە، وەكو باهیڤ و سماق و گەنم و نیسك و نۆك و ...هتد، و بخودانكرنا تەرش و كەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان خواندنگەهـ ل گوندی نەبوویە، تا سالا (٢٠١٢)ێ ژئالیێ حكومەتا هەرێما كوردستانێڤە هاتییە ئاڤاكرن[٨٨].

## گوندێ كۆرەدێرێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ناڤێ گوندی ژ دێرێ هاتییە، كو ئەو دێرە دكۆرەكێدایە و نها ژی شوینوارێن وێ د دیارن و ب درێژاهییا دەمی بوویە كورەدێرێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ سەرمێسكێ.

**باشووری،** گوندێن پێدە و مێرینا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مێسكێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ خروە.

## پێکهاتا گوندی:

گوند تنێ ژ یەك مالبات ئەوژی مالباتا حەجی عەبدوللا یە پێکهاتییە، هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١١٧ کەس بوو[٨٩]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٢٠ هەتا ٢٥ مال بوون، نها دگەهنە نێزیکی ٩٠ هەتا ١٠٠ مالان، لێ گوند کاڤلە و کەس لێ ناژیت.

گوند سێ جاران ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ و ل سالێن (١٩٧٥، ١٩٨٨)ێ هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، سالا (١٩٩٣)ێ گوند جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن، بەلێ د ئەنجامێ ئالۆزیێن ناڤخۆیی جارەکا دی هەر ل سالێن نۆتان هاتییەبەردان و هێژ کەس لێ ناژیت.

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەکا جهێن کەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ل رۆژهەلاتا گوندی ناوسکەکا مەزن هەیە و جوان هاتییە چێکرن، سێ تەخت تێدا هاتینە چێکرن، ل پشتا گوندی ژی شکەفتەکا مەزن هەیە، ل رۆژئاڤایێ گوندی ناوسکەکادی هەیە، یا ب دەرگەه و پەنجەرە و سێ تەخت ژی تێڤە هەنە، ل ناڤ ئاڤارێ گوندی ژی جهەکێ هەی دبێژنێ بەرناوسکێ، کو پێنج ناوسك لێ نە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (شیڤا ژووری، شیڤ قەسرکا، سەرمێسکێ، شیڤ قیزانێ)، ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە.

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانیێن (گوندی، شیڤ قیزانێ ...)، زێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (گوندی) بوو، هەروەسا رووبارەك ژی هەیە دبێژنێ رووبارێ کۆرەدێرێ.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریێ ئاڤییە، وەکو خۆخ و هنار و سێڤ و حلیك و تویتن و هنار و هژیر و ... هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ چ جاران ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەکرن[٩٠].

## کۆمەڵگەها باگێرا:

کۆمەڵگەها باگێرا ئێك ژ وان کۆمەلگەهان بوو ئەوێن حکۆمەتا عیراقێ بۆ خەلکێ ژ دەڤەرێن وان دهاتنە ڤەگوهاستن بۆ مەرەمێن سیاسی هاتینە چێکرن.

### - ئەگەرێن ڤەگوهاستنا ئەڤی خەلکی بۆ ئەڤان خالێن ل خوارێ دزڤریتەڤە:

١- پتریا ئەو گوندێن هاتینە ڤەگوهاستن یێن دەڤەرێن سنووری بوون، و ب هاریکاریکرنا شۆرشا کوردی دهاتنە تۆمەتبارکرن.

٢- ب دیتنا حکۆمەتا بەغدا ئەڤە تاکە رێك بوو کو بشێن ئەڤێ هەڤبەندییا دناڤبەرا پێشمەرگێ کوردستانێ و خەلکێ دەڤەرێ ڤەقەتینن، دا شۆرشا کوردی نەچاربکەن دەست ژ خەباتا نەتەنەوەیی بەردەت.

### - قۆناغێن ڤەگوهاستنا خەلکی بۆ ڤان کۆمەڵگەهان:

١- قۆناغا ئێکێ: ل هەیڤا هەشتا سالا (١٩٧٨)ێ بوو، هژمارەکا خەلکێ دەڤەرێن سنووری ژ هەردو عەشیرەتێن نێروە و رێکان هینانە کۆمەڵگەهێ، هینگێ هژمارەکا کێما خانییان هاتبوونە ئاڤاکرن، کو هەر دو مال د خانییەکیڤە بوون، بێی پێدڤیێن رۆژانەیێن وی دەمی.

٢- قۆناغا دووێ: ل بهارا سالا (١٩٨٣)ێ بوو، ل دەسپێکێ هندەك ژ گوندێن دۆسکییان ئەوێن دکەڤنە دەڤەرێن دووری دەستێ حکۆمەتێ و پاشی هندەك گوندێن دەڤەرا بالەکایەتی هینان و دناڤ ئەڤێ کۆمەڵگەهێدا ئاکنجی کرن.

## پێکهاتەیا کۆمەڵگەهێ:

ئەڤ کۆمەلگەهە یا تێکەلە ژ گەلەك مالبات

و گوندو عەشیرەتان، وەکو عەشیرەتا (رێکان، نێروە، مزووری، دۆسکی و هندەك خەلکێ بامەرنێ) کو هینابوونە دناڤ ڤێ کۆمەلگەهێ دا و هەتا نهاژی لێ دژین.

هژمارا خەلکێ کۆمەلگەهێ د قۆناغا ئێکێدا نێزیکی ٢٥٠ هەتا ٣٠٠ مال بوون، لێ پشتی قۆناغا دووێ هاتین هژمارا وان بوونە پتر ژ ٥٠٠ مالان، هەتا نها گەلەك ژ وان ل کۆمەلگەهێ ماینە و هند ژێ نها ل باژێرێن هەرێمێ دژین. ئەڤ کۆمەلگەهە هەر ژ دورستکرنا وێ هەتا نها، ل دووڤ ئاخفتنا خەلکێ وێ بتنێ ل سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ بۆ دەمەکێ کێم هاتیە بەردان.

### ژێدەرێن ئاڤا کۆمەلگەهێ:

ل دەسپێکا هاتنا خەلکی بۆ ناڤ ڤێ کۆمەلگەهێ، ئاڤ وەکی پێدڤی گەلەکا کێم بوو، ل دووڤ گۆتنا خەلکێ وێ دەمی هەر دەهـ مال ل سەر ئێك زەمبەلا (حەنەفیا) ئاڤێ بوون، ئەو ژی سێ رۆژان دانەکێ دهات، ژێدەرێ وێ ژی بیرئیرتیوازیەك بوو کو ل گوندێ کەڤلەسنێ دهات. پشتی سالا (١٩٩١)ێ ژنوی پرۆژەیێ ئاڤێ وەکو پێدڤی بۆ خەلکێ کۆمەلگەهێ هاتیە چێکرن، ژێدەرێ وێ ژی گەلیێ ڤەنتارایە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ کۆمەلگەهێ:

ل دەسپێکا هاتنا خەلکی بۆ ڤێ کۆمەلگەهێ، نەدبوو ژ سنوورێن دەست نیشانکری دەربکەڤن و ژیانا وان ل سەر پالەتیێ و جۆتیاریێ بوو، دیسان نەدبوو کەسەکی ژ کۆمەلگەهێ بازرگانی کربا یان ببا فەرمانبەر و کارێن دیێن فەرمی کربانە، هەر وەسان کەتبوونە ژێر فشارێن گران کو دڤیا ببانە بەعسی و ب خورتی دبرنە (جیش الشعبی). لێ پشتی سالا (١٩٩١)ێ گەلەك دام ودەزگەهێن حزبی و حکومی دناڤ کۆمەلگەهێدا هاتنە ڤەکرن، وەکو رێڤەبەریا پۆلیسان، رێڤەبەریا باژێرڤانیێ، نەخۆشخانە، رێڤەبەریا چاندنێ، بنکەهێ ئافرەتان، زێدەبارەی گەلەك بنکەهێن حزبی و مەدەنی و رێکخراوێن لاوان و قۆتابیان و سەنتەرێن رەوشەنبیری.

ل دووڤ ئاخفتنا خەلکێ کۆمەلگەهێ، خواندنگەهـ ل سالا (١٩٨٣)ێ هاتە ڤەکرن، لێ هەر کەسێ ڤیابا بخوینیت پێدڤیبوو فۆرما حزبا بەعس پربکەت پاشان مافێ خواندنێ هەبوو، تاسالێن پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ ژنوو ب بەرفرەهی خواندنگەهـ ل کۆمەلگەهێ هاتنە ڤەکرن و نها دو خواندنگەهـ ئێکا بنەرەتی و ئێکا ئامادەیی ل کۆمەلگەهی هەنە[٩١].

## کۆمەڵگەها کۆرا:

### سنوورێن کۆمەڵگەهێ:

**باکووری:** گوندێ باگێرا بنی.

**باشووری:** ناڤەندا ناحیا زاویتە و گوندێ بادێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ باگێرا فەلان و بەرۆشکا سێڤێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن رەشاورێ و مەمانێ.

### پێکهاتەیا کۆمەلگەهێ:

ئەڤ کۆمەڵگەهە یا تێکەلە ژ گەلەك مالبات و عەشیرەتێن جودا جودا، هەر ل دەسپێکا ئینانا خەلکی بۆ ڤێ کۆمەلگەهێ و تانها خەلك پتر تێکەل بووینە و هژمارا دانشتیێن وێ پتر لێهاتییە، گەلەك عەشیرەتێن جودا تێدا هەنە، وەکو عەشیرەتێن دۆسکی (ژێری، ژووری)، بەرواری ژێری، مزووری (ژێری، ژووری)، نێروەیی، هەر وەسان هندەك مالێن سۆرانی و رێکانی ژێ دناڤ دا کۆمەلگەهێدا هەنە.

### ژێدەرێن ئاڤا کۆمەلگەهێ:

ل دەسپێکا هاتنا خەلکی بۆ ناڤ ڤێ کۆمەلگەهێ، ئاڤەکا بێ سەر وبەر هەبوو، ل دووڤ ئاخفتنا خەلکێ وێ گەلەك زارۆك ژ ئەنجامێ ڤەخوارنا ئەڤێ ئاڤا پیس نەخۆش دبوون، هەر تاخەکێ کۆمەلگەهێ ل سەر ئێك زەمبەلەکا ئاڤێ بوون و هندەك گەرەك پتر ژ ٥٠ مالان بوون، پشتی سالا (١٩٩١)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ هاتییە چێکرن و ئەڤ ئاریشە هاتییە چارەسەرکرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ كۆمەلگەهێ:

ل دەسپێكا هاتنا خەلكی بۆ ئەڤێ كۆمەڵگەهێ ژیانا وان ل سەر جۆتیاریێ دناڤ سنورێن كۆمەڵگەهێ و پالەتییێ دابوو، بەلێ نها بارا پتریا خەلكێ وێ مۆچەخۆرن.

دناڤ ڤێ كۆمەلگەهێدا، نها نەخۆشخانە و بازێرڤانی هەنە[٩٢].

## گوندێ لیناڤا:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: لیناڤا ژ دو پەیڤێن (لین- ئاڤا) پێكدهێت، (لین) واتە (جەرك)، یانژی دەنێ ئاڤێ، (ئاڤا) ئاڤاهی، دبێژن جهێ ڤی گوندی لین لێ دهاتنە چێكرن، پاشی ب بورینا دەمی بوویە لیناڤا.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن بۆتیا و باكوزێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خازیاڤا.

**باكووری:** گوندێ پیرەفاتێ.

**باشووری:** گوندێ باخرنیڤ.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ ڤی گوندی ژ سێ مالباتێن (مالباتا عەبدولعەزیز، مالباتا حەجی محێ، عەبدولقادر)ێ پێكدهێت، سەر ب عەشیرەتا دۆسكی نە، هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا ١٩٧٥ێ ١٤٧ كەس بوو[٩٣]، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٣٠هەتا ٣٥ مال بوو، نها دگەهنە ١٠٠ هەتا ٢٠٠ مالانە، دبەر بەلاڤن .

ئەڤ گوندە چوار جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، جارا ئێكێ ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، جارێن دووڤدا ژی ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٨٣)ێ بوو، داوی جار ژی سالا (١٩٨٨)ێ بوو كو ب ئێكجاری هاتییە خرابكرن، تا سالێن ١٩٩٢-١٩٩٣ێ جارەكا دی گوند هاتییە ئاڤاكرنڤە.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤی گوندیدا پاشماوێ هندەك ئاش و دستاران ماینە، هەر وەسان كاڤلەكێ ل پشتا گوندی هەی دبێژنێ كاڤلكی، ژبلی هژمارەكا جەركێن مەزن و بچووك ژی ل گوندی هەنە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (تەنگێ، گەرماڤۆك، تەحا، گرێ بەرانا، كەڤرێ بسكێ، شیڤا ئێتیما، گێران، قلۆمكێ گەمی).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ رووبارێ گوندی بوو، لێ پشتی سالا (١٩٧٠)ێ بیرەك ل گوندی هاتییە چێكرن و بوویە ژێدەرێ ئاڤا گوندی.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریێ دێمە، وەكو گەنم و نیسك و نۆك و... هتد، هەر وەسان ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی یە.

پشتی بەیانا یازدەی ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن[٩٤]، سالا (١٩٨٨)ێ دگەل گوندی هاتییە خرابكرن[٩٥].

## گوندێ مەمانێ:

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن رەشاورێ و كۆرا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كەمەكا.

**باكووری:** گوندێ دەرگەلا شویكەیا.

**باشووری:** گوندێ بادێ.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ هەردو مالباتێن (مەلا، میرا) پێكدهێت، گوند سەر ب عەشیرەتا دۆسكیان ڤەیە، هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٤٦ كەس بوو(٩٦)، بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٣٠ هەتا ٤٠ مال

بوو، نها دگەهنە ١٤٠ هەتا ١٥٠ مالان، هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دبەر بەلاڤن.

ئەڤ گوندە شەش جاران هاتییە بەردان و تالانکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٩، ١٩٨٥، ١٩٨٦، ١٩٨٨)ێ ژی گوند هاتییە بەردان، سالا (١٩٩٧)ێ جارەکا دی گوند هاتییە ئاڤاکرن.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەکا جهێن کەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ل باشووریێ گوندی شوینوارێن کاڤلە گوندەکی دهێنە دیتن، هندەك بیرێن ئاڤێ ژی دناڤ کەڤرەکیدا ب هونەرەکێ جوان هاتینە کۆلان، دیسان کەلا مەمیا دکەڤیتە دناڤ ئاقارێ گوندیدا، ل بلندترین جهـ ل سەرێ کوپکێ کەلێ شوینوارێن خالەکا زێرەڤانیێ هەنە، کو د سرۆشتێ خۆدا یا ئاسێیە و کەس نەشێت لێ ب سەرکەڤیت[97].

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (شیڤ سماڤۆکێ، گرێن لەندا، برکا بانێ، کەستەکا، ئافکا کەمەکا، کانیا گۆمێ).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانیێن (برکا بانی، کانیا گۆمێ، کانیا ژنا، بنێ گوندی)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی نها ل سەر بیرئیرتیوازیێیە، کو ل سالا (٢٠٠٣)ێ هاتییە کۆلان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا دێمە، وەکو باهیڤ و سماق و گەنم و نیسك و نۆك و ...هتد، هەر وەسان خودانکرنا تەرش و کەوالی ژی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ ل دەسپێکا سالێن هەفتێیان ل گوندی هەبوو، سالا (١٩٨٨)ێ د گەل گوندی هاتییە خرابکرن[98].

## گوندێ مێردینکێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێکێ دبێژیت: ژ ناڤێ مێردین کو باژێرەکێ باکووریێ کوردستانێ یە هاتییە، د ژێدەرێن عەربی دا مێردین-ماردین وەك پەیڤەکا عەرەبی ب واتایا جهەکێ بلند دهێت هاتییەشروڤەکرن[99]، یا دووێ دبێژیت: ژ(دینە مێر) هاتییە، پاشی ب درێژیا دەمی بوویە مێردین، پاشکۆیێ (کێ) بۆ بچوککرنا ناڤی هاتییە بکارئینان. بەلێ ئەم دوورنابینین مێردینکێ ب ناڤێ باژێرێ مێردینێ یێ باکووریێ کوردستانێ هاتبیتەناڤکرن، ئانکو مێردینا بچووك.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ بابلۆ.

**باشووری،** گوندێ ئێتیت.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئەڤریکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئێمینکێ.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ چوار مالباتێن (مستو بهارا، مەلکو، شێخەمی، میسایی) پێکدهێت، گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریا ڤەیە، خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٨٨)ێ ٢٠ هەتا ٣٠ مال بوون، نها دگەهنە نێزیکی ١٠٠ هەتا ١٥٠ مالانە، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران دژین .

ئەڤ گوندە ل بەری ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ بتنێ دو جاران ل سالێن (١٩٦١، ١٩٦٣) هاتییە بەردان، داوی جار ژی ل ئەنفالا (١٩٨٨)ێ هاتییە بەردان و تانهاژێ کاڤلە و نەهاتییە ئاڤاکرن.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەکا جهێن کەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، دو مەزارێن کەڤن ل رۆژئاڤایێ ڤی گوندی ب ناڤێن مەزارێ مامەشیر و مێردینکێ هەنە، دیسان دو کاڤلە گوند ژی د ناڤ ئاقارێ گوندیدا دهێنە دیتن و شوینوارێن وان د دیارن و هندەك کاڤل ژی ماینە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (لیسی، کانیا مێردینکێ، پشتا گری، پشتا لیسی).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانییێن (لیس، مێردینکێ، دەحلکێ)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (مێردینکێ) بوو.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا ئاڤییە، وەکو خۆخ و هنار و سێڤ... هتد، هەر وەسان پێ دێمی ژی مینا باهیڤ و سماق و... هتد، دیسان تەرش و کەواڵی ژی ب خودان دکەن.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ چ جاران ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەکرن[١٠٠].

## گوندێ مێرگەهەلێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یائێکێ دبێژیت: مێرگەك بوو خەلك هەر لێبوو هەتا بوویە گوند، یا دووێ دبێژیت: گیایێ وێ مێرگێ زوی رادبوو لەوما دبێژنێ مێرگەهەلێ.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ سپینداری.

**باشووری:** گوندێ سپیاڤا خارێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سپیاڤا سەری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێهێرێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ ئێك مالبات پێکدهێت، ئەوژی مالباتا حەجی ئیسماعیلە، هژمارا خەلکێ گوندی بەری ئەنفالا سالا (١٩٨٨) ێ ٤ مال بوون، نها بووینە ٣٠ هەتا ٤٠ مالان، لێ گوند کاڤلە و کەس لێ ناژیت.

ئەڤ گوندە بتنێ ل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ پێ هاتییە خرابکرن، سالا (١٩٩١)ێ جارەکا دی هاتییە ئاڤاکرنڤە، لێ زوی گوند هاتییەڤە بەردان.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ئاڤارێ گوندیدا دو کەلایێن مێژوویی هەنە، ئێك ژ وان دکەڤیتە باشوورێ گوندی و یا دووێ دکەڤیتە باشوورێ گوندی، دبێژنە هەردووکان کەلا مێرگەهەلێ.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (کەلا مێرگەهەلێ، مێرگە گۆلێ، سەرێ سپیاڤێ، گرێ مێرگەهەلێ).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانییێن (برکا چەرما، گوندی، سیسکا)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (گوندی) بوو.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێم بوو، وەکو سماق و ترێ رەشمێوی و باهیڤ و... هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ چ جاران ل گوندی نەهاتییە ڤەکرن[١٠١].

## گوندێ مێرینا:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێکێ دبێژیت: د سەردەمێ خۆدا خەلکێ ڤی گوندی مێرانیەك ئەنجامدایە، کو ناڤ لێچووینە و بوویە مێرینا، یا دووێ دبێژیت: پێ کێم زەلام بوویە دگوتنێ (مێرنینن) و ب بوورینا دەمی بوویە (مێرنینا) و پاشی (مێرینا).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ خروە.

**باشووری:** گوندێ تەلوە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کۆرەدێرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کزۆ.

### پێکهاتا گوندی:

بتنێ یەك مالبات ل گوندی هەیە، ئەوژی مالباتا لەشکەرییە، ئەڤ گوندە سەر ب عەشیرەتا

مزووریانڤەیە، هژمارا خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ ١٥ - ٢٠ مال بوون، نها هژمارا وان دگەهنە نێزیکی ٨٠ هەتا ١٠٠ مالان، لێ نها گوند کاڤلە و کەس لێ ناژیت.

دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا سالا (١٩٦١)ێ ئەڤ گوندە هاتییە خرابکرن، پشتی هنگی ب دەمەکی گوند هاتییەڤەئاڤاکرن.

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ئاقارێ ڤی گوندیدا بتنێ شوینوارێ قەسرەکا مەزن ل رۆژهەلاتا گوندی هەیە، کو ژ هۆلەکێ و سێ مەزەلا پێکدهێت، درێژیا هۆلا وێ پترە ژ پازدە مێترا و دو ژ وان مەزەلان دمەزنن، بەرێ وێ دکەڤیتە رۆژئاڤایی.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (ئیشکا، زەڤیێن ملێ، بن ملێ، دووشیڤێ، نهالێ، برکێ، کانیێ، پشتا گوندی).

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان بتنێ دو کانی ل گوندی هەنە، ئەوژی کانیێن (گوندی، نوئین)ن، کانیا گوندی ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا ئاڤی بوو، وەکو تری و باجانسۆرك و خیار و خۆخ و هنار و حلیك و سێڤ .. هتد.

خواندنگەهـ پشتی بەیانا یازدەی ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ هاتییە ڤەکرن[١٠٢]، تا سالا (١٩٨٨)ێ د گەل گوندی هاتییە خرابکرن[١٠٣].

# گوندێ ئەڤریکا خارێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: ناڤێ گوندی ژ هەڤرکیێ هاتییە، واتە دناڤبەرا ئەڤریکا رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی دا هەڤرکی هەبوویە، پاشان بوویە ئەڤریکێ.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ئەڤریکا سەری.

**باشووری:** گوندێ بێتاسێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ تەڵوە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئێتیت.

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ مالباتەکێ پێکدهێت، ئەوژی مالباتا (مستێ)یە، گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، هژمارا خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ نێزیکی ٥ هەتا ١٠ مالان بوون، نها دگەهنە نێزیکی ٩٠ هەتا ١٠٠ مالانە، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێران.

ئەڤ گوندە چەند جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٧٩، ١٩٨٤، ١٩٨٨)ێ ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، تا سالێن ١٩٩٢-١٩٩٣ێ جارەکا دی گوند هاتییە ئاڤاکرنڤە.

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

ل باکوورێ ڤی گوندی شکەفتەکا مەزن و بەرفرەهـ هەیە، ل دووڤ گۆتنا گوندیان د شۆرشێن کوردیدا بوویە جهێ ڤەحەواندنا وان، هەروەسا جاران بوویە جهێ سەرەکیێ هێزێن پێشمەرگەی.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (دەریکێ کورگا، شکەفتا بنیێ، گرێ مێگۆرکێ، مێرگا قەشەی، گرێ هێلەبێ).

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

د ڤی گوندیدا بتنێ یەك کانی ب ناڤێ کانیا گوندی هەیە، ل بەرێ ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوویە، لێ نها ژێدەرێ ئاڤا گوندی بیرئیرتیوازییە کو ل سالا (١٩٩٦)ێ ل گەلی کورتکی هاتییە چێکرن و ڤەگوهاستن بۆ گوندی، پشتی سالا (٢٠١١)ێ دو بیرێن دی ل گوندی هاتینە کۆلان.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر د دەمێ خۆدا ل سەر جۆتیاریا دێم بوو، وەكو گەنم و جەهـ و سماق و نیسك و نۆك و ...هتد، دیسان جۆتیاریا ئاڤی ژی هەیە.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان خواندنگەهـ ل گوندی نەبوویە تا سالا (١٩٩٥)ێ كو هینگێ هاتییە ڤەكرن[١٠٤].

## گوندێ ئەڤریكا سەری:

ل دۆر ناڤێ گوندی هەر هەمان بۆچوونا پێشترە ل (ئەڤریكا خارێ).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن ئێمینكێ و كزۆ.

**باشووری،** گوندێ ئەڤریكا خارێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ تەلوە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئێتیت.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ سێ مالباتان پێكدهێت، ئەوژی مالباتێن (بداغ، عەرەب، رەحمان)ن، سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەنە، هژمارا خەلكێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ ١٠ - ١٥ مال بوون، نها نێزیكی ١٧٠ هەتا ٢٠٠ مالانە، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل بازێران دژین.

ئەڤ گوندە شەش جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا و ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٤، ١٩٦٨، ١٩٧٤، ١٩٨٧)ێ ژی، تا سالێن ١٩٩٢-١٩٩٣ێ جارەكا دی گوندێ هاتیيە ئاڤاكرن.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، ل باشوورێ گوندی ناوسكەك هەیە دەرێ وێ یێ تەنگە و ژ ناڤدا گەلەكا بەرفرەهە، چوار تەختێن بەری هەنە، دو ژوان د بچووكن و دو مەزنن، كانییەك ژی ل ڤی گوندی هەیە، ل سەردا ئاقدەك هاتییە چێكرن و بنێ وێ وەكو شكەفتەكێیە، دیارە هندەك مرۆڤ لێ ژیاینە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (كەلۆكا هەسەن، گرێ میرا، نهالا هۆرێ، كەڤرێت گێچێ، كوركا دارمازیێ).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو كانیێن (تنكەبەرێ، گوندی، ئەبو رحانا، ناڤ كەندالا، شێڤ شەرانكێ، دزا)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل سەر كانییا گوندی بوو.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریا دێمە، وەكو گەنم وباهیڤ جەهـ و سماق و گەنم و نیسك و نۆك و ...هتد، و دیسان جۆتیاریا ئاڤی ژی هەیە.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان خواندنگەهـ تا سالا (١٩٩٥)ێ ل گوندی نەبوویە كو هینگێ ژ ئالیێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێڤە هاتییە ڤەكرن[١٠٥].

## گوندێ ئێمینكێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی ئێك بۆچوون هەیە، دبێژیت: گوند ل سەر رێكا سەرەكی بوو، جهێ رێڤینگ و ڤەحەواندنا مێهڤانان بوو، جهەكێ ئێمن بوو، واتە (رێكا - ئێمن)، پاشی بوویە، ئێمینكێ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بەرێ بهار.

**باشووری،** گوندێ ئێتیت.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كزۆ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بێسرێ.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ حەفت مالباتان: مالا عەلی عومەر، عەبو

كەكا، عەلۆی، صورە سیلا، عەلی نەهلیلا، شێخی، زیدو، مەرعان پێكدهێت، سەر ب عەشیرەتا مزووریيا ڤەنە، ئەڤ گوندە ژ گوندێن مەزنێن دەڤەرێ یە ل دووڤ سەرژمێریيا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٢٣٥ كەس بوو[١٠٦]، خەلكێ گوندی بەری سالا (١٩٧٠)ێ ٥٠ هەتا ٦٠ مال بوو، نها نێزیكی ٤٥٠ هەتا ٥٠٠ مالن، دبەر بەلاڤن هند ل گوندی و هند ژی ل باژێری.

ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، دیسان ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٤، ١٩٧٤، ١٩٨٧) ژی، تا سالێن ١٩٩٢-١٩٩٣ێ جارەكا دی گوند هاتییە ئاڤاكرنڤە.

**شوینوار و جهێن كەڤنار:**

د ڤی گوندیدا هژمارەكا جهێن كەڤن و شوینوارێن جودا هەنە، هند ل باكوورێ گوندی و هند ل رۆژهەلاتا گوندی، وەكو (گەری چالی، سەر قری، بەرێ گوهار زەری، خلوە، خەند خەندوكێ).

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (سەر قەسرێ، دار گری صور، پشتا مناسبی، بەرزێوا، پشتا گوندی).

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو كانیێن (كاڤلكێ، بهاریكێ، سیركێ، گوندی، تروی، ناڤ شیڤا)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ كانییا (گوندی) بوو.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیاریيا ئاڤی بوو، وەكو ترێ تایفی و حلیكێن رەش... و خودانكرنا تەرش و كەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان خواندنگەهـ ل دەسپێكا سالێن شێستان گەهشتییە گوندی و ل سالا (١٩٧٨)ێ نەمایە[١٠٧].

گوندێ ئێمینكێ



## گوندێ بابلۆ:

دبێژن ژبەر کو ل زڤستان و هاڤینا گەلەك با ل گوندی دهێت لەو دگوتنێ (گوندێ بای) پاشی بوویە (گوندێ بابلۆ).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن بادێ و گوندێ زاویتە.

**باشووری:** گوندێن کزو و ئێمینکێ.

**رۆژهەلاتی:** خرابێ شێخ محەمەد و گوند کزۆ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەرێ بهار.

### پێکهاتا گوندی:

بابلۆ تا سالا (١٩٢٦)ێ گوندەکێ موسلمان نشین بوو، پاشی ژ ئالیێ کامبەرلاندڤە ب کۆژمێ (٤٠٠) لیرێن تورکی بۆ هۆزا بازێن مەسیحی هاتیە کرین و نها گوندەکێ مەسیحی نشینە[١٠٨]، ل دووڤ گوتنا وان، ئەوان چ مالبات نینن، بەلکو عەشیرەت هەیە ئەوژی هەمی بازینە. ژێدەرەکێ دی دەربارەی گوندی دبێژیت: پشتی دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ ئەو ئاسووریە لێ هاتینەنیشتەجێکرن ئەوێن ژ وەلاتێ هەکاری مشەختبووین، ئەڤ چەندە ل دووڤ بەرنامەکێ حکۆمەتێ یێ تایبەت و ب هەڤکاریا ناڤبەرا حکۆمەتا عیراقێ و نوونەرێ دەولەتا بریتانیا و مەزنێن ڤان مشەختان هاتییەئەنجامدان[١٠٩].

ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ١١١ کەس بوو[١١٠]، بەری ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ نێزیکی ٢٠ هەتا ٣٠ مالان بوون، نها ڤێ هژمارێ زێدەکریە و نێزیکی ٥٠ هەتا ٦٠ مالانە.

گوندێ بابلۆ چوار جاران هاتییە بەردان و خرابکرن، سالا (١٩٦١)ێ ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، سالا (١٩٦٤)ێ جارەکا دی هاتییە بەردان، سالا (١٩٦٨)ێ گوند هاتییە سوتن، سالا (١٩٨٨)ێ ب ئێك جاری هاتییە خرابکرن، سالا (١٩٩٦)ێ ئەڤ گوندە ژئالیێ رێکخراوا کاریمە ڤە هاتییە ئاڤاکرن.

گوندێ ئێمینکێ



### شوینوار و جهێن كەڤنار:

ل رۆژهەلاتا گوندی شوینوارێن دێرەكا كەڤن هەنە و دیارە دێرەكا مەزن بوویە، هەروەسا ل باكوورێ گوندی شكەفتەكا بەرفرەهـ هەیە، خەلكێ گوندی دبێژنێ (شكەفتا شێخ ئیسف)، دیسان ل پشتا گوندی جهەكێ بلند و ئاسێ شوینوارێن كاڤلە دێرەكێ هەنە خەلكێ گوندی دبێژنێ (رۆمتا دێرێ)، واتە دێرا بلند. هەروەسا تەكیایا (شێخ سەید ئەحمەد ) بابلۆیی لڤی گوندی بوو [111].

بەرنیاسترین جهێن گوندی بریتینە ژ (شیڤا رەولتا "واتە نهالەكا بجویك"، پرێزە، بێدەرێ، شیڤا دووارە واتە "شیڤا بێهنڤەدانێ").

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندێ بابلۆ هژمارەكا كانییان هەنە، وەكو كانیێن (گوندی، بابلۆ، مەرگەها سەری، مەرگەها بنی) زێدەرێ ئاڤا گوندی هەر د بەرێ دا ل سەر كانییا گوندی بوو، سەرەرای كو بیرەكا ئیرتیوازی هاتییە چێكرن لێ چ مفا ژێ نەهاتییە وەرگرتن، چونكە ئاڤا وێ یا پیسە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی، هەر ل بەرێ و نهاژی ل سەر هەردو دەرامەتێن دێم و ئاڤییە، چونكە عەردێ دێم و ئاڤی هەیە، زێدەباری بخودانكرنا تەرش و كەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ چ جاران ل گوندی نەهاتییە ڤەكرن، سالا (٢٠٠٦)ێ دێرەك ل گوندی هاتییە ئاڤا كرن [112].

## گوندێ باخرنیف:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یەك دبێژیت، گەلەك خرنیف ل گوندی هەنە و گەلەك با دهێت و ل وان خرنیڤا د دەت لەو دبێژنێ (با خرنیف). بۆچوونا دووێ دبێژیت، ئەڤ گوندە د بنیاتدا یێ ئیزدیان بوو،

دیمەنەك ژ دەڤەرا بابلۆ



دەمێ کو ل دەسپێکێ داکو گوندی ئاڤاکەن، گۆت دێ ل با خرنیڤا گوندی ئاڤاکەین، واتە ل دەڤ ڤان خرنیڤا.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن لیناڤا و بۆتیا.

**باشووری:** گوندێ پیرومەرا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن پشتگری و باکۆز.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خازیاڤا.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ پێنج مالباتا مالباتێن: (عیسێ، جبرائیل، عەلیێ حەمۆی، فەتاح، ئەحمەدێ حەفزوللای) پێکدهێت، سەر ب عەشیرەتا دۆسکییانڤەنە، هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا ۱۹۵۷ ۱۳٦ کەس بوو[113]، بەری ئەنفالا سالا (۱۹۸۸)ێ ۳۰- ۳۵ مال بوو، نها دگەهنە ۱۰۰ هەتا ۱۵۰ مالان.

ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (۱۹٦۱)ێ ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، هەر وەسان ل سالێن (۱۹٦۳، ۱۹٦۵، ۱۹۷۸)ێ ژی، داوی جار ل سالا (۱۹۸۸)ێ گوند ب ئێکجاری هاتییە خرابکرن، بەری ئەنفالان ۲۲خێزان ل گوندی دژیان و دەڤەر دووری دەستەلاتێ حکومەتێ بوو[114]، سالێن ۱۹۹۳- ۱۹۹٤ێ جارەکا دی گوند هاتییە ئاڤاکرنڤە.

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

د ڤی گوندیدا چوار شکەفت هەنە، ئێك ژ وان یا مەزنە دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی، دیسان سێ شکەفتێن دیژی ل گوندی هەنە، ژوان شکەفتا شێخ سەعید، شکەفتا سمتی، شکەفتا عەبدولباری، زێدەبارەی جهەکێ دیێ کەڤنار ل رۆژئاڤایێ گوندی، کو دبێژنێ قەنتەرا کافری.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (مناسبێ شێخ محەمەد، بەرێت هەسپکا، کەڤرێ بسکێ، کورا نزاری، بانیێ، سەرێ کانیێ، کانیکا سەیدی، خالێ شیخا).

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل گوندێ باخرنیڤ هژمارەکا کانییان هەنە وەکو کانیێن (سەرێ کانیێ، سەیدی، گیزێ، برکێ، گەرمکێ)، ل دەسپێکێ ئاڤا گوندی ژ رویبارێ گوندی دهات، پاشان ژ کانییا گیزێ.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا ئاڤییە، ئەڤ گوندە ب خیار و پیڤازان یێ ناڤدارە، لێ وێ چەندێ ناگەهینیت کو جۆتیارییا دێم نینە، زێدەبارەی بخودانکرنا تەرش و تەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ چ جاران ل گوندی نەبوویە[115].

## گوندێ بازێرکێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، ئێك دبێژیت: ناڤێ گوندی یێ دروست (بازێرینکێ)یە، واتە گەلەك زێر ل گوندی هاتبوونە دیتن، یا دووێ دبێژیت ناڤێ وی ژ هەردو پەیڤێن (با- زیرکێ) پێك دهێت، واتە ل دەڤ کری.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ پێدە.

**باشووری:** گوندێ چەمان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گەلیێ رۆمان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن چەمان و تەلوە.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ شەش مالباتێن: (شێخ عەبدی، حەجی بازێرکی، شێخ سیراج، شێخ غەفیر، سەید سلێمان، عەبوویێ ئەسکەندەر) پێکدهێت، هژمارا خەلکێ گوندی بەری سالا (۱۹۸۸)ێ ۳۰

هەتا ٣٥ مال بوون، نها هژمارا وان دگەهنە ١٣٠ هەتا ١٥٠ مالان.

ئەڤ گوندە ژی چەند جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولێ، هەروەسا ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٥)ێ ژی ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، داوی جار ژی كەتییە بەر هەوا ئەنفالان و ب ئێكجاری هاتییە خرابكرن، تا سالێن ١٩٩٣-١٩٩٤ێ جارەكا دی هاتییە ئاڤاكرنڤە.

**شوینوار و جهێن كەڤنار:**

د ڤی گوندی دا دو مەزارێن كەڤن هەنە، ئێك ل باشووری گوندی و یا دووێ ل رۆژئاڤایێ گوندی ب ناڤێ موغبەرا شێخ میسان، سەر كێلەكا قەبرەكێ ڤی مەزاری سالا (١١٦٦)ێ هاتییە نڤیسین.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (موغبەرا كەڤن، گرێ دێرێ، پشتا گوندی، شێخ میسا، دنگەهێ كانییا قەسرێ)، ئەڤ گوندە مزوورینە.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل گوندێ بازێركێ هژمارەكا كانییان هەنە وەكو كانیێن (ریلكا، قەسرێ، باپیرێ، گوندی، شیڤا گیزێ، سوبحایێ، بیرا)، ل بەرێ كانییا گوندی ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو، لێ نها حوكمەتێ دو بركێن ئاڤێ چێكرینە و بووینە ژێدەرێ ئاڤا گوندی.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێمە، مینا نیسك و نۆك و گەنم و جەهان.... هەروەسا هندەك دەرامەتێن ئاڤیژی هەنە.

خواندنگەهـ چ جاران ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەكرن[116].

## گوندێ بهێرێ:

یەك بۆچوون ل سەر بنیاتێ ناڤێ گوندی هەیە، دبێژن د كەڤندا ئاش ل گوندی هەبوون و گەنم و نیسك و... دهێران، واتە ناڤێ گوندی ژ هێرانێ هاتییە، پاشان بوویە بهێرێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ مێرگەهەلێ.

**باشووری:** گوندێ ستوكوركێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سپیاڤێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن خرابیا و غەلبۆكێ.

**پێكهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ سێ مالباتان پێكدهێت، ئەوژی صالحێ بنەفشێ و عەبدۆئالیێ بنەفشێ و ئوسمانێ بنەفشێ، واتە د بنیاتدا ئەڤ هەرسێ مالەژی یەك بووینە دگوتێ مالباتا بهێری پاشان بووینە سێ، سەر ب عەشیرەتا بەرواری ژێریانڤەنە، هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ تنێ ١٦ كەس بوو[117]، خەلكێ گوندی بەری سالا (١٩٨٨)ێ ١٠ - ١٥ مال بوون، نها دگەهنە نێزیكی ٥٠ هەتا ٦٠ مالان.

سێ جاران ئەڤ گوندە ژ ئالیێ لەشكەرێ حكۆمەتا عیراقێڤە هاتییە خرابكرن و خەلكێ وی مشەخت و دەربەدەر بووینە، سالا ١٩٦١ێ و ١٩٧٤ێ و جارا دتاوێ ژی ل ئەنفالێن (١٩٨٨)ێ ب ئێكجاری هاتییە خرابكرن، تا سالا (١٩٩١)ێ جارەكا دی ژ ئالیێ خەلكێ گوندیڤە هاتییە ئاڤاكرن.

**شوینوار و جهێن كەڤنار:**

د ڤی گوندیدا تنێ یەك جهێ كەڤنار لێهەبوویە، ئەوژی مەزارەكێ كەڤن بوو، پشتی گوند هاتییە ئاڤاكرن ئەو ژی هاتییە خرابكرن، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان دەمێ گوند هاتییە خرابكرن گەلەك هەستی و جەركێن كەڤن ژ ڤی مەزاری دەركەتن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی بریتینە ژ (گرێ مێرگەهەلێ، خارێت خدرا، كیسكێ، كەڤرێ كارا، شیڤا چەمكا، شیف چەكۆیێ، خرابێ ئوسێ، چیایێ زرووێ).

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل گوندێ بێهێرێ كانییەكا بۆش لێهەبوو دگوتنێ

کانییا بهێرێ، لێ نها ئاڤا وێ کانیێ هند نەمایە، هەر ئەڤ کانییە ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوویە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی، بەرێ ل سەر جۆتیارییا ئاڤی بوو ب تایبەتی برنجی، لێ نها ئاڤا گوندی گەلەك کێمبوویە و جۆتیارییا خەلکی باراپتر ل سەر دەرامەتێ دێمە، سەرەرای کو حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ل سالا (٢٠٠٣)ێ بەنداڤەك ل گوندی چێکریە دبێژنێ بەنداڤا بهێرێ.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان، خواندنگەهـ چ جاران ل ڤی گوندی نەهاتییە ڤەکرن[١١٨].

## گوندێ بۆتیا:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یەك دبێژیت، بەدرخان پاشایێ بۆتان هندەك ژ مرۆڤێن خو فرێکربوونە وێرێ و ل ڤی جهی ئاکنجی ببوون، دگوتێ جهێ بۆتیان پاشان بوویە بۆتیا، لێ بۆچوونەکا دی هەیە دبێژیت ناڤێ گوندی ژ بنێ تویا هاتییە، واتە گەلەك دارێت تویا ل گوندی هەنە و گوند ل بنێ وان تویا هاتییە ئاڤاکرن، لەورا دگوتێ (بنێ تیا) پاشان بوویە بۆتیا.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێن بابۆخکێ و بێشینکێ.

**باشووری،** گوندێن باخرنیڤ و لیناڤا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ باکۆز.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ پیرەفاتا ئاڤا.

### پێکهاتا گوندی:

هەر چەندە ئەڤ گوندە نها یێ بۆش و بەربەلاڤ بووی، لێ دبنیاتدا هەمی یەك مالن و کورێن عەبدینە، واتە ب تنێ گوندی ژ مالباتا عەبدی یە، سەر ب عەشیرەتا دۆسکی نە، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٧٦ کەس بوو[١١٩]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیکی ١٠ هەتا ١٥ مالان بوون، نها دگەهنە نێزیکی ١٥٠ هەتا ٢٠٠ مالانە، لێ کەس ل گوندی ناژیت.

ئەڤ گوندە گەلەك جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، هەر وەسان ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٥)ێ ژی، سالا (١٩٧٦)ێ گوند ب ئێك جاری ب شەفەر و دۆزەران هاتییە راستکرن، پاشی خەلکێ گوندی جارەکا دی زڤرینەڤە سەر گوندی، ل سالا (١٩٨٨)ێ و بەری ئەنفالان (٤٠) خێزان ل گوندی هەبوون، رۆژا ٢٥/٨/ (١٩٨٨)ێ و رۆژێن پاشتر گوند بەر ئەنفالان کەت و هاتە خرابکرن و خەلکێ وی مشەختی کەمپێن پەنابەران بوون ل باکوورێ کوردستانێ[١٢٠].

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا هژمارەکا جهێن کەڤن و شوینواری لێ هەنە، ل باکوورێ گوندی شکەفتەکا مەزن ب ناڤێ شکەفتا گەلیێ حلی هەیە، ل باشوورێ گوندی ناوسکەکا ئاسێ ب ناڤێ ناوسکا گلکێ میها هەیە، کاڤلە گوندەك ژی دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی دبێژنێ کاڤلکێت عەبدی ئاغایی، هەروەسا شوینوارێن ئاڤاهییەکێ مەزن ل گوندی هەنە، کو شوینوارێن برجێن زێرەڤانیێ لێ هەنە، دیسان جهێ بیرەکا ئاڤێ ل ناڤ ڤی ئاڤاهیدا هەیە، خەلکێ گوندی دبێژنە ڤی جهی (دیرگەهێ).

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (خرابێ شێخی، بانیا ئاغایی، نهالا ئاڤە مێوکێ، زەڤیا خرا شێخی، کاڤلکێت عەبدی ئاغایی).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوند ئاڤ پاکێمە، ژێدەرێ ئاڤا وی ل سەر کانیا گوندی بوویە، تا سالا ٢٠٠٨- ٢٠٠٩ێ بەنداڤەك ژ ئالیێ حکومەتا هەرێما کوردستانێڤە هاتییە چێکرن، نها ئەڤ بەنداڤە یا بوویە ژێدەرێ ئاڤا گوندی.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێمە؛ چونكە ئاڤ ل گوندی گەلەكا كێمە، ژیارا وان ل سەر ڤان دەرامەتایە، گەنم و جەهـ و نیسك و گژنیژ و باهیڤ و تری و سماق و... هتد.

پشتی بەیانا ١١ی ئادارا سالا ١٩٧٠ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتە ڤەكرن، تا سالا (١٩٧٦)ێ یا بەردەوام بوو، ئەو دگەل بیر و مزگەفتێن گوندی ژ ئالیێ حكومەتا بەغداڤە هاتنە پەقاندن[121].

## گوندێ پێدە:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە رۆژهەلاتا ناڤەندا ناحیا زاویتە[122]، ل سەر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یەك دبێژیت: گوندێ پێدە ژ (سپێدە) هاتییە، واتە زوی رۆژ لێددەت.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن مێسكێ و كۆرەدێرێ.

**باشووری:** گوندێ بازێركێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێدیل.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن میرونا و كۆرەدێرێ.

### پێكهاتا گوندی:

د گوندێ پێدەدا گەلەك مالبات هەنە، مالباتێن خۆجهێن كەڤن ئەڤەنە (حەجی نەبی، جندی، ئوسێ، حسێنێ عەیشوی) هەروەسا مالباتێن (ئیسف دزەیی، ئەحمەدێ فەتەح) ژی هەنە، سەر ب عەشیرەتا مزووری نە[123]، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٦٩٦ كەس بوو[124]، هژمارا خەلكێ گوندی بەری سالێن پێنجیان نێزیكی ١٠٠ مال بوون، نها نێزیكی ٧٠٠ مالانە، هند ل گوندی و هند ل بازێران دژین.

ئەڤ گوندە ژی گەلەك جاران ل سەر دەستێ حكومەتێن بەغدا هاتییە بەردان و خرابكرن، سالا (١٩٦١)ێ گوند هاتییە بەردان و خەلكێ وی ب ئێك جاری گەهشتینە شۆرشا كوردی[125]، ل (١٩٦٥/١٢/١٢)ێ هێزێن حكومەتا بەغدا هێرشەك برە سەرگوندی، لێ ژئالیێ خەلكێ گوندی و ب هاریكارییا پێشمەرگەی هێزا وان هاتە تێكشكاندن[126]، ل سالێن (١٩٦٨، ١٩٧٤، ١٩٨٨)ێ ئەڤ گوندە ژ ئالیێ حكومەتا بەغداڤە هاتییە خرابكرن، سالا (١٩٩٢)ێ جارەكا دی هاتییە ئاڤاكرن.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

كەلایەكا مێژوویا نە گەلەك مەزن ل باكووری رۆژهەلاتا گوندی هەیە، لێ ل جهەكێ بلند و ئاسێیە. هەروەسا شكەفتەكا مەزن دكەڤیتە دناڤبەرا گوندێ پێدە و دزێ، وەسا دیارە شكەفتەكا كەڤنە و هندەك نڤیسینێن وێنەیی ل سەر دیوارێن ڤێ شكەفتێ هەنە. دیسا دو شكەفتێن دی دكەڤنە دناڤ گوندیدا، ئێك ژوان دبێژنێ شكەفتا سەرێ كانیێ و یادی شكەفتا سەعدی.

### بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە:

(گرێ خالومی، نهالا رێ، نهالا بازێركێ، نهالا بركێ، كلوخی، دەراڤێ كانێ، نهالا بەرمێشێ، شالێ گوندی، نهالا شكەفتێ، شیڤا گریلەیی).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل ڤی گوندی دو كانیێن سەرەكی هەنە، كانییا گوندی (سەروكانی) و كانییا كاڤلی[127]، ئەڤ هەردو كانییە زێدەرێ ئاڤا گوندینە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنا گەنم و نیسك و نۆكان بوو، هەروەسا گوندەكێ ئاڤییە، لەورا پتر جۆتیارییا وان ل سەر دەرامەتێن ئاڤییە وەكو برنج و سێڤ و خۆخ و تری و... هتد.

سالا (١٩٢٩)ێ بۆ جارا ئێكێ خواندنگەهـ هاتییە گوندی، سالا (١٩٦١)ێ هاتییە خرابكرن[128]، پشتی بەیانا یازدەی ئادارا (١٩٧٠)ێ جارەكا دی خواندنگەهـ

ل گوندی هاتییە ڤەكرن[129]، سالا (١٩٨٨)ێ هاتە خرابكرن، جارەكادی سالا (١٩٩٣)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتە ڤەكرن و یا بەردەوامە.

## گوندێ بێسرێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێكێ، ناڤێ گوندی ژ بێسیرێ تری هاتییە؛ چونكە گوندەكێ زەنگین بوویە ب تری، یا دووێ گوندەكێ نێزیكی رویبارێ هشكەروو بوویە و سارنەدبوو، لەورا دگۆتێ (بێ سرێ) واتە نەیا سارە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن بادێ و سندۆر.

**باشووری:** چیایێ سپی، ل پشت وی گوندێن ئێتیت و نزاركێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن بەرێ بهار و ئێمینكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باجلۆر.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ حەفت مالباتان پێكدهێت، ئەوژی مالباتێن (پس ئاغا، بارانی، كاتولیا، وەلا، میرزای، چەلەبی، رەش ئاغا)، سەر ب عەشیرەتا دۆسكی نە، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٣٣٦ كەس بوو[130]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیكی ٣٠هەتا ٣٥ مالان بوون، نها دگەهنە نێزیكی ١٥٠ - ٢٠٠ مالان.

گوندێ بێسرێ ل سال (١٩٦٣)ێ ژ ئالیێ حكۆمەتا بەغدا و دووڤەلانكێن وێ ڤە هاتییە سۆتن، سالا (١٩٧٤)ێ ئەڤ گوندە هاتییە بەردان، داوی جار ل سالا (١٩٨٦)ێ گوند ب ئێك جاری هاتییە خرابكرن و خەلكێ وی هاتییە دەربەدەركرن، پشتێ سالا (١٩٩١)ێ جارەكادی ئەڤ گوندە هاتییە ئاڤاكرن. نها گوند مەزن بوویە و كەتییە ناڤ سنوورێ باژێرڤانییا دهۆكێ و وەك تاخەكێ دهۆكێ دهێتەنیاسین.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤی گوندیدا چوار شكەفت هەنە، هندەك ژ وان د مەزنن و هندەك دبچووك و ئاسێنە ژ وان شكەفتان: (مریەمكێ، ناوسكێ، محەمەدێ مالخێ، چەك چەكیلا)، زێدەبارەی هەبوونا سێ ناوسكان، ل جهەكێ ئاسێنە و ب هۆنەرەكێ جوان هاتینە چێكرن، هەروەسا شوینوارێن مزگەفتەكێ ل گوندی هەنە، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان مزگەفتەكا كەڤن بوویە، دیسان شوینوارەكێ دی هەیە خەلكێ گوندی دبێژنێ (هەسپێ میرخان).

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (گرێ دێرێ، ملا ماركیسكا، نزار كەوكی، كەڤرێ بەرتەزینكێ، ملا ڤۆرێ).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندێ بێسرێ هژمارەكا كانییان هەنە وەكو كانیێن (سیركێ، ساركێ، گەركا، حەمكێ، گێچینكێ، گولا سەبری، محەمەد خانا، بەهاری، كەڤركێ نێریا، بێخیرەتا، رەشوویی)، دكەڤندا كانیكا سیركێ ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو، لێ نها ژێدەرێ ئاڤا گوندی ل سەر بیرئیرتیوازیانە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر چاندنا ئاڤی بوو، چونكە گوندەكێ زەنگینە ب ئاڤێ، هەر وەسان چاندنا دێمی ژی، مینا باهیڤ و سماقێ زێدەباری بخودانكرنا تەرش و كەوالی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ سالا (١٩٧٦)ێ ل گوندی هاتییەڤەكرن و ئاڤاهیێ خواندنگەها گوندی ژئالیێ خەلكێ گوندی بخو هاتییە ئاڤاكرن، سالا (١٩٨٦)ێ ژ ئالیێ رژێما بەغداڤە هاتییە خرابكرن[131].

## گوندێ بێسكێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێكێ، دبێژیت: ل دەسپێكێ ناڤێ گوندی (بێ- شك)ێ بوویە، واتە بێشك ژیار یا لێهەی، ل دەمێ ئێزدی هاتینە دەڤەرێ دەنگێ (ش) ژنڤەكر بۆ (بێسك)ێ،

بۆچوونا دووێ دبێژن: بێسکێ یا ژ (بێ زکێ) هاتی، واتە ژ بەر ئاڤا وێیا ساخلەم هندی مرۆڤی ڤەخواربا پێ عاجز نەدبوو.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ هژیرکێ.

**باشووری:** ئاڤەلیاس.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زێوا شەفیق.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ برجینێ.

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ حەفت مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (سیدا، خشمانی، رێکاڤا، لاوکی، خەتیبی، شێخا، گۆڤەیی)، سەر ب عەشیرەتا دۆسکی نە، دەمێ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ هاتییەئەنجامدان هژمارا خەلکێ گوندی ٢٦٩ کەس بوون و ناڤێ گوندی ب بێسکێ شێخ هاتییەتوومارکرن[١٣٢]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیکی ٧٠ - ٧٥ مال بوون، نها دگەهنە نێزیکی ٣٥٠ هەتا ٤٠٠ مالان، لێ کەسەك ل گوندی ناژیت و دبەربەلاڤن، هند ل باژێرێن کوردستانێ هندژی ل دەرڤەی وەلاتی دژین.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، ئەڤ گوندە گەلەك نە کەتییە بەر ستەما دۆژمنان؛ چونکە گوندەکێ ئاسێیە زوو ب زوو دوژمن نەدگەهشتێ، لێ سالا (١٩٧٤)ێ گوند هاتییە تۆپبارانکرن و زیان ب خەلکی کەڤتینە، هەروەسا ل ئەنفالا گوند ب ئێکجاری ژئالیێ حکۆمەتا بەغداڤە هاتییە کاڤلکرن.

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

ل رۆژهەلاتا گوندی شوینوارێن هندەك ئاسێگەها هەنە، خەلکێ گوندی دبێژنێ (بەستێ)، وەسا

گوندێ بێسرێ



دیارە ئەڤە جهێ زێرەڤانیێ بوویە، هەروەسا دناڤ ئاقارێ گوندیدا شوینوارێن کاڤلە گوندەکێ کەڤن دهێنە دیتن، دبێژنێ (گرشێران)، دیسان شوینوارێن مزگەفتەکێ ل گوندێ کەڤن هەنە، خەلکێ گوندی دبێژن گەلەکا کەڤن بوو، لێ سالا (١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حکومەتا بەغداڤە هاتیە خرابکرن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (بەستێ، خرا سلوی، بەرۆژێ سرکێ، خرکا فاتۆکێ، بەرۆژێ عەڤدیشکێ، کەندالێ مەوتێ، کور قەسرێ، مێرگا شینێ، کەندالێ مەموی، کەڤرێ عەیشانێ، بازا میهێ، رەزێ مەزن).

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندێ بێسکێ هژمارەکا کانییان هەنە وەکو کانیێن (گوندی، سەرشۆکێ، شەرا، مالا دیوالی، درکێ، قۆتبەشکێ، دارمازی، ئیبوی، سەعید تاهر، ئێك مالێ، کور مەلا، بەر ئەڤرازی، مێرگا شینێ، شەرەف ئاڤا)، کانییا گوندی ژێدەرێ ئاڤا گوندیە.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

گوندەکێ کێم ئاڤە، لەوما ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر چاندنا دەرامەتێ دێمە؛ وەکی گەنم و نیسك و باهیڤ و جەهـ و گژنیژ و تری و هژیر و سماق و... هتد.

پشتی ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ گەهشتیە گوندی، سالا (١٩٨٨)ێ دگەل گوندی هاتە خرابکرن[١٣٣].

# گوندێ چەمانێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن؛ کو ژ چەما هاتیە، ژبەر کو گوندەکێ ئاڤیە و گەلەك چەم لێ هەبوون، نهاژی هندەك لێمانە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ بازێرکێ.

**باشووری،** گوندێن پیرمیس و بێتاسێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن باڵەتە و خورکی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن تەڵوە و ئەڤریکێ.

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ شەش مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (حەجی عەرەب، حەسەن شاهینا، سمایلێ گولێ، مەحمیدێ بیزویی، حەسەنێ شەمێ، سلێمان میرا)، سەر ب عەشیرەتا مزووریی نە، خەلکێ گوندی، هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٨ کەس بوون[١٣٤]، نها ١٠٠ - ١٣٠ مالن، هند ل گوندی دژین و هندژی د بەربەلاڤن.

ئەڤ گوندە ل سالێن (١٩٦١، ١٩٧٠، ١٩٧٥)ێ هاتیە بەردان و خرابکرن، داوی جار ل سالا (١٩٨٨)ێ ب ئێك جاری هاتیە خرابکرن، پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ جارەکا هاتیە ئاڤاکرن.

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندیدا گەلەك کاڤلە گوند دهێنە دیتن و هێژ شوینوارێن وان مانە، شوینوارێن مزگەفتەکا کەڤن دبێژنێ مزگەفتا سەلمانێ فارسی کو ژ کسلێ هاتیە چێکرن ل گوندی دیارە، هەروەسا گەلەك باگوردان و جەرك و جۆنی و دستار یێن کەڤن ل گوندی هەنە، ژبلی دو شکەفتان، ئێك ل پشتا گوندی کو دبێژنێ شکەفتا کەلۆك، و یادی شکەفتا ئاغایی یە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (گرکێ سوور، گرێ کونەبایێ، گرێ کوزێ، شیڤکا ئەجنا، شیڤکا بالاڤیا، مێرگەویێ، خرا لیسی، خێریزۆکا).

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندێ چەمان هژمارەکا کانییان هەنە وەکو کانیێن (گۆرانگەهێ، کورەژارکێ، گوندی، هرچکێ، محێ تەهایێ چەمانی، حەلیمایێ، مێرگەویێ و ئەڤە ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو)، نها ئاڤا گوندی ل سەر بیرێن ئیرتوازیە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر چاندنا ئاڤییە وەكو برنجێ كوردی و تری و حولیك و سێڤ و توتن و پیڤاز و... هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ ل بەری سەرهەلدانێ نەبوو، لێ دگەل گوندی ژئالیێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێڤە هاتییە ئاڤاكرن[١٣٥].

## گوندێ خرابیا:

ل دووڤ گوتنا خەلكێ گوندی دكەڤندا ئەڤ گوندە خرابە بوویە و گەلەك بیە لێهەبووینە، و دگوتێ (خرابێ بیها)، و ب درێژاهیا دەمی، ناڤێ گوندی ژ (خرابێ بیها) بوویە (خرابیا).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن بەرئاشێ و صاركێ.

**باشووری،** گوندێن ستوكوركێ و رەشانكێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن بێهێرێ و ستوكوركێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ غلبۆكێ.

### پێكهاتا گوندی:

دكەڤندا ب تنێ یەك مالبات ل ڤی گوندی هەبوویە ئەوژی مالباتا (حسێن ئاغای) بوو، لێ ب بوورینا دەمی هندەك مالێن دی جودا جودا هاتینە گوندی و لێ ئاكنجیبووینە، نها ب خەلكێ گوندی دهێنە نیاسین، وەكو مالێن حەجی سەعید ئومەری و حەجی ئیبراهیم و عەبدولرەحمان و حەسەنێ مەیانێ و... هتد، هژمارا خەلكێ گوندی ل سالا (١٩٥٧)ێ ١٤٦ كەس بوو[١٣٦]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیكی ٤٠ مالان بوون، نها بووینە ٢٠٠ -٢٥٠ مال و د بەریەلاڤن هند ل گوندا و هندژی ل باژێران دژین.

هەر ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا (١٩٦١)ێ، ئەڤ گوندە هاتییە خرابكرن، ل سالێن (١٩٦٨، ١٩٨٦، ١٩٨٨)ێ جارەكا دی هاتییە بەردان و خرابكرن، تا بهارا سالا (١٩٩١)ێ جارەكا دی هاتییە ئاڤاكرنڤە.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

شكەفتا فەلا دكەڤیتە باكوورێ گوندی، شكەفتەكا مەزن و بەرفرەهە، هەر دناڤ ئاقارێ گوندیدا كاڤلە گوندەك هەیە، خەلكێ گوندی دبێژنێ (زهێدا)، هەر چەندە شوینوارێن گوندی د دیارنینن، لێ مەزارێ وی هێژ دیارە و گەلەك نەخشە ل سەر كێلێن مریا هەنە[١٣٧]. هەروەسا كاڤلە مزگەفتەك ل گوندی هەیە تا نها شوینوارێن وێ د دیارن، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان ئەڤە مزگەفتەكا مەزن بوو، ل رۆژێن هەینی خەلكێ سێ چوار گوندێن دەور و بەر نڤێژا هەینیێ لگەل خەلكێ گوندی د ڤێ مزگەفتێڤە دكرن.

### بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە:

(خارێ ب گۆل، خارێ عەلی داودا، شیف باپیرێ، راستێن كانی گەرمكێ، ملا لاتا، دارێت وەقفێ، مێرگا كەپرا، كۆرەماڤێ، كۆرا خرابێ وەیسی، مزگەفتا كەڤن).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

هەژمارەكا كانییان ل گوندی هەنە، وەكو كانیێن(ژووری، گەرماڤێ، بركا رەشوی، بركا سلێ، بەربركێ، زهێدا)، زێدەرێ ئاڤا گوندی ژ كانییا (ژووری) بوو.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

گوندەكێ ئاڤییە لەوما ژێدەرێ ژیارا گوندییان بەرێ پتر ل سەر برنج و سێڤ و خۆخ و تری و نیسك و نۆك و... بوو، بارا پتریا جۆتیاریا گوندی ل سەر دەرامەتێ ئاڤییە.

خواندنگەهـ ل داویا سالێن حەفتییان تا پۆلا سێێ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، پۆلێن دووڤدا ژی دچوونە گوندێ ستوكوركێ، پشتی سالا (١٩٩١)ێ خواندنگەهـ ل گوندێ هاتییە ڤەكرن ڤە[١٣٨].

## گوندێ خورپنییێ:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە رۆژهەلاتا ناڤەندا ناحیا زاویتە[139]، ل دووڤ گۆتنا خەلكێ وی ئەڤ گوندە ل دەسپێكێ یێ مەسیحییان بوو، كو دگوتێ (خۆش پنی)، واتە جهەكێ باش[140]، بۆچوونەكا دی هەیە، كو ناڤێ گوندی هەر د كەڤندا (خورپنی) یە، واتە جهێ بەر رۆژ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ سپینداریێ.

**باشووری:** گوندێ گابێركێ.

**رۆژهەلاتی:** ئاڤاریێ چەلۆكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سپیاڤێ.

### پێكهاتا گوندی:

دكەڤندا ب تنێ یەك مالبات دڤی گوندیدا هەبوو، ئەوژی مالباتا (شێخی) بوو، ب بوورینا دەمی مالباتا (حەجی مەجید) ژ گوندێ سپینداریێ ل ڤی گوندی ئاكنجی بوو و بوونە خەلكێ گوندی.

خەلكێ گوندی بەری سالا (١٩٨٨)ێ ٢٠ - ٢٥ مال بوون، نها بووینە ٦٠ هەتا ٧٥ مالان.

ئەڤ گوندە چوارجاران سالێن (١٩٦١، ١٩٦٨، ١٩٧٥، ١٩٨٨)ێ ژئالیێ حكۆمەتا بەغداڤە هاتییە تالانكرن و خرابكرن، ل سالا (١٩٩٢)ێ جارەكادی گوند یێ هاتییە ئاڤاكرن.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

دێرەكا دیرۆكی ل گوندی هەیە، ئەڤ دێرە تا نهۆ شوینوارەكێ دیار و ئاشكەرایە هەر كەسەكێ بچیتە وێرێ دێ ب ساناهی بینیت، دبێژن كو ئەڤ دێرە دزڤریتە چاخێ عیسا پێغەمبەری، گەلەك پەرتووك تێڤەبوون[141]، لێ ژبەر نەپاراستنا وان پەرتووكان ژئالیێ خەلكێ دەڤەرێڤە، هەروەسا ژبەر خرابكرنا دێرێ ژئالیێ حوكومەتا عیراقێڤە ل سالا (١٩٨٨)ێ ئەو پەرتووكە ژناڤچووینە[142]. ل ئاڤاریێ ڤی گوندی

گوندێ خورپنیێ



هژمارەکا ناوسکان ل باکووری و باشووری و رۆژهەلاتا گوندی هەنە، دەرێ وان یێ چوارگوشەیە و پیچەك یێ تەنگە، بەلێ ژناڤدا بەرفرەهن، هەر ناوسکەکێ ب کێمی ڤە دو تا سێ تەختێن بەری تێڤە هەنە. هەژیە بێژین، کو ناڤێ شکەفت و ناوسکێن گوندێ خورینێ د ناڤ جهێن شوینواریێن عیراقێدا هاتینە بناڤێ (جم ناوسك) و (کهوف برین)[143].

بەرنیاسترین جهێن گوندی پێکهاتینە ژ (بەرناسکا، خرابێت رەزا، مێشێت باخراب، گەلیێ عەزوکێ ...).

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل ڤی گوندی هژمارەکا کانییان هەنە، وەکو کانیێن (زۆزانێ، پێنکێ، گەلیێ عەزوکێ، صوفی، گیزێ، مێرگێ)، ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژ کانییا (گیزێ) بوو. ل سالا (1999)ێ پرۆژەیەکێ ئاڤێ ژئالیێ حکۆمەتا هەرێمێڤە بۆ ڤی گوندی ل سەر هەمان کانیێ هاتییە دروستکرن.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی، بەرێ ل سەر نیسك و نۆك و جەهـ و گەنمی و تری و سێڤان... بوو، بەلێ نها هند گرنگی ب تشتێن دێم ناهێتە دان، ژیانا وان پتر ل سەر بەر و بومێت ئاڤییە، و ئەڤ گوندە ب سێڤان یێ بناڤ و دەنگە.

بەری سالا (1980)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا (1988)ێ د گەل گوندی هاتییە خرابکرن، سالا (1993) جارەکادی هاتییە ئاڤاکرنڤە و هەتا نها یا بەردەوامە[144].

## گوندێ دەرگەلا شیکە:

ناڤێ گوندی ژ دو پەیڤێن (دەرگەل ـ شیکە) پێکدهێت، (دەرگەل) واتە (دەرێ گەلی)، و (شیکە) گوندەکە سەر ب دەڤەرا گەڤەرێ ڤە ل باکوورێ کوردستانێ، ل دووڤ گوتنا خەلکێ گوندی، خەلکێ ڤی گوندی ژ باکوورێ کوردستانێ ژ بەر زۆرداریا دەولەتا ئوسمانی هاتینە باشوورێ کوردستانێ.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن دێراگژنیك و بێسکێ.

**باشووری:** گوندێ مەمانێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ رەشەورێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کەمەکا.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ سێ مالباتێن (مالباتا شرینا، مالباتا الیاس، مالباتا گۆرگۆ) پێکدهێت، دبنیاتدا هەرسێ مال دزڤرنە مالا فەقی، سەر ب عەشیرەتا دۆسکی نە، هژمارا خەلکێ گوندی ل سالا (1957)ێ 195 کەس بوو[145]، بەری سالا (1988)ێ 30 - 40 مال بوو، نها نێزیکی 350 - 400 مالانە، هند ل گوندی د ئاکنجینە و هند ژی ل سەر باژێرك و باژێران د بەربەلاڤن.

سالا (1961)ێ ئەڤ گوندە ژ ئالیێ حکۆمەتا بەغداڤە هاتییە سۆتن، پشتی جارەکا دی هاتییە ئاڤاکرنڤە، سالا (1964)ێ هاتییە بەردان، داوی جار سالا (1988)ێ کەتییە بەر هەوا ئەنفالان و خەلکێ وی دەربـەدەر بوویە، ئەڤ گوندە تا نها نەهاتییە ئاڤاکرن و هەر کاڤل مایە.

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

پێنج ناوسك دکەڤنە باکوورێ گوندی، سێ ژ وان دبەرفرەهن و جهێ تەختێن بەری لێهەنە، و دو ژ وان د بچویکن، هەر وەسا کاڤلە گوندەك دکەڤیتە رۆژئاڤایێ گوندی، دبێژنێ (کاڤلێت نەهاکێ)، هەروەسا مەزارەکێ کەڤن دکەڤیتە رۆژهەلاتا گوندی، کو دبێژنێ (خدر نەبی).

**بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە**

(گرکێ زیوی، گرێ شادێ، گرکێ شێخێ بەغدایێ، گەلیێ تیتێ، گەلیێ ناوسکێ، ملا شکەفتا، گەلیێ مام رەشکا).

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندێ هژمارەكا كانییان هەنە، لێ وەكو پێدڤی مفا ژێ ناهێتە وەرگرتن، لەورا خەلكێ گوندی بیرئیرتیوازی چێكرینە و بۆ ڤەخوارنێ و جۆتیاریێ مفایی ژێ دبینن.

## زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

ژبەركو ئاڤ كێمە ل گوندی، بارا پترا چاندنا گوندی ل سەر دەرامەتێ دێمە، وەكو چاندنا نیسك و نۆك و گەنم و... هتد.

خواندنگەهـ پشتی سالا (١٩٧٠)ێ ل گوندێ هاتییە ڤەكرن، ل ئەنفالا دگەل گوندی هاتییە خرابكرن. هەژییە بێژین كو ل سالا (١٩٥٤)ێ مزگەفتەكا مەزن ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاكرن[١٤٦].

# گوندێ رەشاورێ:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یەك دبێژن، دكەڤندا ئێشەكا ڤەگر ل ڤی گوندی پەیدابوویە و گەلەك ژ خەلكێ گوندی پێ مرین، لەورا دگوتێ (رەش وار) پاشی بوویە (رەشاور)، لێ بۆچوونەكا دی دبێژیت، ژ بەركو خەلكێ گوندی گەلەك نەخۆشی ل سەر ڤی گوندی بریبە ژ هەژاری و دەربەدەریێ لەورا دگۆتێ (وارێ رەش) پاشان بوویە، (رەشاور).

## سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن دێركێ و باگێرا.

**باشووری،** گوندێ بادێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ كورێت گاڤانا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن دەرگەلێ و مەمانێ.

## پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ چوار مالباتێن (سلێمان، مەلا حەجیێ تاهر، قادر، حەجیێ غازی) پێكدهێت، ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان ل ڤێ داویێ مالەكا دی ل گوندی ئاكنجی بوویە كو نها ژ گوندییان د هێنە هژمارتن ئەوژی دبێژنێ مالا (گویان)، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ٦٤ كەس بوو[١٤٧]، خەلكێ گوندی بەری سالا (١٩٧٥)ێ تنێ ٧ مال بوون، نها ١٠٠ هەتا ١٥٠ مالانە.

ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولا سالا (١٩٦١)ێ و د سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٥، ١٩٧٨، ١٩٨٨)ێ دا، تا سالا ١٩٩٤ێ ئەڤ گوندە یێ خرابی بوو، سالا (١٩٩٥)ێ ١٥ خانی ژئالیێ رێكخراوا (KRO) ڤە بۆ گوندی هاتینە ئاڤاكرن.

## شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ڤی گوندیدا شوینوارێن مزگەفتەكا كەڤن دهێنە دیتن، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان ژیێ وێ پترە ژ سەد سالان، ل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حكۆمەتا بەغداڤە هاتییە خرابكرن.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (شیڤا میرا، گرێ مربیا، تیبا میرزاكێ، ئاڤا مەوالێ، كوركا خرو).

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندی تنێ دو كانی ب ناڤێ كانیێن (خرابۆك كو خەلكێ گوندی ئاڤ ژێ دهینا و خەندەكا سلێمان) هەنە، پشتی سالا (١٩٧٥)ێ بیرئیرتیوازی بۆ گوندی هاتینە چێكرن و بوویە ژێدەرێ ئاڤا گوندی.

## زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

ژ بەركو ئاڤا گوندی گەلەكا كێمە، باراپتریا ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر دەرامەتێ دێمە، وەكو چاندنا گەنمی و جەهی و نیسكا و ... زندەباری ب خودانكرنا تەرش و كەوالی.

پشتی سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، سالا (١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حكۆمەتا بەغداڤە د گەل گوندی هاتییە خرابكرن، هەتا نهۆ خواندگەهـ ل گوندی نینە[١٤٨].

## گوندێ زێوا شەفیق:

ناڤێ گوندی ژ دو پەیڤان پێك دهێت (زێوە - شەفیق)، ل دۆر پەیڤا (زێوە) ژی دو بۆچوون هەنە، هند دبێژن یا ژ (زیڤە) واتە (زیڤ) هاتی، و هند دبێژن ژ (زێوە) ژ (زێیێ وە) واتە رویبارێ وە هاتییە، دەربارەی پەیڤا دووێ (شەفیق) ژ (شەفیق ئاغا) هاتییە ئەوێ ئەڤ گوندە ئاڤاکری.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێن بوترشێ و گەلناسکێ.

**باشووری،** قەشەفرێ و هژێرکێ و خازیاڤا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن پیرەفاتا خراب و خازیاڤا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بێسکێ.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ دووازدە مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (عەجەمێ، مەحمود یاسین، فەق عومەر، عەبدۆ، ایب، شەمامێ، مەلمشا، خەتیب، رکاڤایی، سلوغەزال، عومەر بەگ، خاد)ن، سەر ب عەشیرەتا دۆسکی ڤەنە، سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٣١٨ کەس بوو[١٤٩]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ ٦٠ - ٧٠ مال ل گوندی هەبوون، نها دگەهنە ٤٥٠ هەتا ٥٠٠ مالان و نها بەربەلاڤبووینە ل سەر باژێرێن کوردستانێ.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان ئەڤ گوندە سێ جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، جارا ئێکێ ل دەسپێکا پەیدابوونا شۆرشا ئەیلوولا سالا (١٩٦١)ێ بوو، جارا دووێ ژی ل سالا (١٩٨٨)ێ بوو، پشتی سالا (١٩٩٢)ێ ئەڤ گوندە هاتییە ئاڤاکرن.

### شوینوار و جهێن کەڤنار:

د ڤی گوندێ هژمارەکا کاڤلە گوندا هەنە، ژوان (ملا مژمژێ، رکاڤایێ، ئاڤلیاس، شەرەف ئاڤایێ، رەسیلە ئاڤایێ، نزارکێ)، زێدەبارەی هند شوینوارێن دی یێن جودا وەکو ئاشێن ساڤارقوتانێ پیرە مەهند، و پیرەفاتا خراڤ.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (زیارەتێ بیکا، زیارەتێ پیرێ مەهند، کانییا گوندی، رویبارێ گوندی).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندی هژمارەکا کانییان هەنە وەکو کانیێن (چنارێ، گوندی، سارکا، شەرەڤ ئاڤایێ، ئاڤلیاسی، سورکێ، هنارکێ، رویبارێ گوندی)، ژێدەرێ سەرەکیێ ئاڤا گوندی ژ کانییا گوندی دهێت.

### زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

ئاڤ ل گوندی یا کێمە، لەوما ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێمە، ژ وان دەرامەتێن لێ دهێنە چاندن گەنم و نیسك و باهیڤ و جەهـ و گژنیژ و تری و هژیر و سماق و ... هتد.

خواندنگەهـ پشتی سالا (١٩٧٠)ێ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا (١٩٨٨)ێ ل گەل گوندی هاتییە خرابکرن، جارا دووێ سالا (٢٠٠٧)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن و تا نها یا بەردەوامە[١٥٠].

## گوندێ خازیاڤا:

ل دۆر ناڤێ گوندی دبێژن: ناڤێ گوندی ژ دو پەیڤێن (غازی- ئاڤا) پێکدهێت، (غازی) ناڤە (ئاڤا) ژ ئاڤەدانکرنێ هاتییە، واتە ئەو گوندێ غازی ئاڤاکری، ب بوورینا دەمی بوویە (خازیاڤا).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێن پیرەفاتا خراب و زێوا شەفیق.

**باشووری،** گوندێ کێڤلا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ لیناڤا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ زێوا شەفیق.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ چار مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (تەوفیق، حەجی حەلیفا، فەتەح، ئەمین)،

سەر ب عەشیرەتا دۆسكییانڤەنە، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٦٨ كەس بوو[١٥١]، دیارە ژ ئەنجامێ كاودانێن سەختێن دەڤەرێ ئاكنجیێن گوندی ل كێمێ دایە، پاشتر ب ئێكجاری هاتییەبەردان.

گوند چوار جاران هاتییە بەردان و تالانكرن و خرابكرن، هەر ل دەسپێكا شۆرشا سالا (١٩٦١)ێ و ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٧) گوند هاتییە بەردان، د سالێن هەشتییاندا هندەك ژ خەلكێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوند و گوند ئاڤاكرەڤە، بەری سالا (١٩٨٨)ێ (٢٢)مال ل گوندی دژیان، گوند كەتە بەر ئەنفالان و خەلكێ گوند مشەخت بوونە كەمپێن پەنابەران ل باكوورێ كوردستانێ[١٥٢] هەتا نها نەهاتییە ئاڤاكرن.

## شوینوار و جهێن كەڤنار:

د ناڤ ئاڤارێ گوندێ خازیاڤادا شكەفتەكا مەزن ب ناڤێ نهالا شكەفتێ هەیە، د دەمێ شۆرشاندا بوویە جهێ ڤەحەواندنا خەلكێ گوندی و دەڤەرێ، هەوەسا چوار كاڤلە گوند د ناڤ ئاڤارێ گوندیدا هەنە، ئەوژی ئەڤەنە (خرابێ سەیدی، رەسیلاڤا، تەعلكێ، چەپرمیس).

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (گرێ بەرانا، پاگانێ، چركێ پاوانی، گەلیێ هرچێ، خوارا، نزارێ چەپرمیس، بەرگەرا، خرابێ كادێ، پشت گیزا، خرابێ سەیدی، رەسیلاڤا، تەعلكێ).

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندێ هژمارەكا كانییان هەنە وەكو كانیێن (كون ریڤیا، زێرەكی، گەلی هشكێ، جنیكا، گەڕا سیلاڤێ)، كانییا كون ریڤیا زێدەرێ ئاڤا گوندیە.

## زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر هەردو دەرامەتێن دێم و ئاڤییە، وەكو تری و سێڤ و هنار و باهیڤ و جەهـ و نیسك و گەنم و ... هتد، لێ گوندەكێ ب ناڤ و

گوندێ خازیاڤا



دەنكە بۆ ترێ تایفی.

پشتی سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، دگەل گوندی سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابكرن [١٥٣].

## گوندێ قارقاراڤا:

ل دۆر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێكێ، دبێژن ل دەسپێكا ئاڤاكرنا گوندی، خەلكێ گوندی بوونە دو جوین هەر ئێك ژ وان دڤیا ل رەخەكێ گوندی گوندی ئاڤاكەن، لەورا دبێژن قارقاراڤا ژ شەرە دەڤێ وان هاتییە، بۆچوونا دووێ د. رەشید فندی دبێژیت: د بنیاتدا خەلكێ گوندی ژ كورەماركێ هاتینە و گوند ل سەر ئاقارێ هندەك گوندێن دی ئاڤاكرییە و خەلكێ وان گوندان ل بەراهیێ د نەرازیبوون ل سەر ئاڤاكرنێ و ڤێر ڤێر د ناڤبەرا واندا روودایە هەتا رازیبووین ل سەر ئاڤاكرنا گوندی و خەلكێ گوندی دبێژنە گوندێ خۆ قەر قەر ئاڤا دنڤیسنێن رەسمیدا بوویە قار قارئاڤا[١٥٤]، بۆچوونەكا دی نێزیكی ڤێ بۆچوونێ دبیت دبێژیت ژ هەقارێ ئاڤا هاتییە، واتە ل دەسپێكێ گوند ئاقاربوویە، پاشی هاتییە ئاڤاكرن لەو دگوتێ (ئاقارێ ئاڤا) پاشان ب درێژاهییا دەمی بوویە قارقاراڤا.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن ئێكماله و باكۆز.

**باشووری:** چیایێ سپیرێز و گوندێ باجلۆر.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سندۆر.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ پشتا گری.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ چوار مالباتان پێكدهێت، ئەوژی مالباتێن (قادێ، صالحێ غەزالێ، یەحیا، بیركێ) نە، سەر ب عەشیرەتا دۆسكی نە، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلكێ گوندی ١٢٦ كەس بوو[١٥٥]، بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیكی ١٥ مال بوون، نها هژمارا وان بووینە نێزیكی ٦٠ مالان، تنێ ٧- ٨ مال ل گوندی و یێن دی ل دهۆكێ و باژێرێن دی دژین.

ئەڤ گوندە چوار جاران ژ ئالیێ حكۆمەتێن بەغداڤە هاتییە خرابكرن و تالانكرن، هەر ل دەسپێكا شۆرشا ئەیلوولێ هاتییە بەردان، سالا (١٩٦٧)ێ ئەڤ گوندە هاتییە سۆتن، سالا (١٩٧٥)ێ جارەكا دی هاتییە بەردان، دواجار ل ئەنفالا سالا (١٩٨٨)ێ ب تەمامی هاتییە خرابكرن.

### شوینوار و جهێن كەڤنار و بەرنیاس:

ل دووڤ ئاخفتنێن گوندییان ڤی گوندی تنێ كاڤلە گوندێ بەرێ لێ هەیە، ژ جهێن بەرنیاسێن گوندی ژی ئەڤەنە (رێكا كاروانیا، رێكا ئێكمالێ، شیڤا تەعلكێ، رێكا شیڤا تەعلكێ، كانییا گوندی).

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندی كانیەك ب ناڤێ كانییا گوندی یا هەی، د كەڤندا ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوویە، سالا (١٩٩٢)ێ بیرئیرتیوازیەك د بن گوندیدا بۆ هاتییە كۆلان و بوویە ژێدەرێ سەرەكیێ ئاڤا گوندی.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ئاڤ ل گوندی یا كێمە، لەوما ژیارا خەلكێ گوندی پتر ل سەر دەرامەتێ دێمە، وەكو تری و هژیر و حلیك و باهیڤ و سماق و... هتد.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، خواندنگەهـ چ جاران ل گوندی نەهاتییە ڤەكرن[١٥٦].

## گوندێ گرێ قەسرۆكێ:

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، جهێ گوندی هندەك شوینوارێن كاڤلە قەسركا ل سەرێ وان زیركا هەبوون و ب كسل و كێچان هاتبوونە چێكرن، لەو د گوتنێ (گركێت قەسرۆكا)، پاشی بوویە (گرێ قەسرۆكا)؛ چونكە گوند ل سەر یەك زیر هاتییە ئاڤاكرن.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ پشتا گری.

**باشووری:** كەلیێ دهۆك.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بێسرێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ باجلۆر.

## پێکهاتا گوندی:

ل دووڤ گۆتنا گوندییان، گرێ قەسرۆکا گوندەکێ نوییە، سالا (١٩٧٢)ێ هاتییە ئاڤاکرن، خەلکێ وی هەر ژ گوندێ باجلۆرێ هاتینە، سەر ب عەشیرەتا دۆسکییانە، خەلکێ گوندی ل سالا ١٩٧٢ێ نێزیکی ٥٠ مالان بوون، نها بووینە نێزیکی (٦٥) هەتا (٧٠) مالان.

سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ بوویە بەرۆکا شەری د ناڤبەرا هێزێن پێشمەرگەیێ کوردستانی و لەشکەرێ حکۆمەتا عیراقێ و گوند هاتییەبەردان، پشتی ئادارا ١٩٧٥ێ خەلکێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندی، بەلێ ل سالا ١٩٨٢ێ گوند کەتە بەر پرۆژێ سکرێ دهۆکێ و ژێرئاڤ بوو و نها گوند ل هنداڤ جهێ بەرێ یێ گوندی ئانکو ل رۆژهەلاتێ سکرێ دهۆکێ هاتییەئاڤاکرن.

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

شکەفتا چارستین دکەڤیتە دناڤ ئاڤارێ گوندیدا ل باشوورێ رۆژهەلاتا گوندی، هەروەسا دو مەزارێن دیێن کەڤن دکەڤنە پشتا گوندی ژ ئالیێ باکوورێ رۆژهەلاتا گوندی، گەلەك ژ کێلیێن ل سەر قەبرێن وێ نەخشێن جودا ل سەر هاتینە نەخشاندن، خەلکێ گوندی ئەوان مەزارا ب مەزارێن (باجلۆر و کانی درکێ) ناڤکرینە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (چیایێ شکەفتێ، کانی درکێ، پشتا گوندی، شکەفتا محەمەد سەعید).

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ل گوندێ گرێ قەسرۆکا یێ نوو تنێ دو کانیێن سەرەکی ب ناڤێن (کانی درکێ، کانیا ئەحمەد صوری) هەنە، ل دەسپێکی کانیا درکێ ژێدەرێ ئاڤا گوندی بوو، پاشی ل سالا (١٩٩٧)ێ بیرئیرتیوازیەك بۆ گوندی هاتییە چێکرن و بوویە ژێدەرێ ئاڤا گوندی.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێم بوو، وەکو رەزا و چاندنا گەنم و جەهـ و... هەروەسا دەرامەتێ ئاڤیژی ب رێژەیەکا کێم هەیە.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان ل سالا (١٩٩٣)ێ خواندنگەهـ ل گوندێ نوو هاتییە ڤەکرن[١٥٧].

## گوندێ لۆمانا:

ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان، دەمێ میر محەمەد رەواندوزی (میرێ کۆرە) هاتییە دەڤەرێ، خەلکێ گوندێ لۆمانا گوند بەرنەدا و رێك نەدا لەشکەرێ میری بچنە دگوندیدا و بەرەڤانی ژ گوندی کر، لەورا دەمێ میر محەمەد هاتی گوت: "ئەڤ گوندە لومانە". واتە بۆ مەیە، وەسا ناڤێ گوندی بوویە ( لۆمانا)، تا نهاژی مەزارەك ب ناڤێ (مەزارێ میرێ کۆرە) ل گوندی هەیە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ ئەلکیشکێ.

**باشووری،** گوندێ صارکێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بەرئاشێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ کەڤلەسنێ.

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ سێ مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (حەجی عوسمان، حەجی، سەلمان)ن، سەر ب عەشیرەتا دۆسکی نە، ل سالا (١٩٥٧)ێ هژمارا خەلکێ گوندی ٢٨٥ کەس بوو[١٥٨]، ژ ئەنجامێ کاودانێن دەڤەرێ گوند رۆژ ل دووڤ رۆژێ هاتییەبەردان هەتا بەری سالا (١٩٨٨)ێ تنێ (٣- ٤) مال مابوونە ل گوندی، هەتا د هەوا ئەنفالاندا ب ئێکجاری وان ژی گوند بەردای، پشتی سالا ١٩٩٣ێ گوند سەرژنوو هاتییەڤەئاڤاکرن، نها ٣٠- ٤٠ مال ل گوندی دژین.

لۆمانا چەند جاران هاتییە خرابکرن و تالانکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولێ (١٩٦١)ێ پشتی شەرێ لۆمانا گەلەك ژ خەلکێ وی ژئالیێ حکۆمەتێڤە هاتنە گرتن گوند هاتەخرابکرن، سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ

گوند هاتییەبەردان پشتی ئادارا ١٩٧٥ێ خەلکێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندی، سالا (١٩٨٠)ێ ئەڤ گوندە هاتییە خرابکرنڤە، بەری ئەنفالان (٣- ٤)مال ل گوندی بوون، پشتی سالا (١٩٩٣)ێ جارەکا دی گوند هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

ل ڤی گوندی دو شکەفت ب ناڤێن (شکەفتا فەیرۆزێ و شکەفتا سێگرکا) هەنە، دیسا چیایەکێ بلندێ ئاسێ دکەڤیتە هنداڤی گوندێ کەڤن دبێژنێ چیایێ قۆپی، شوینوارێن کەلایەکێ لێهەنە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (مێرگا درێژ، چیایێ قۆپی، کانییا زەلاما، گوندێ کەڤن، سەرێ مێلکا).

**زێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل گوندێ لۆمانا هژمارەکا کانییان هەنە وەکو کانیێن (زەلاما، ژنکا، گوندی، سماقێ، مێرگا درێژ) ل دەسپێکێ ژێدەرێ ئاڤێ ل گوندی ل سەر هەدو کانیێن زەلام و ژنکا بوو، لێ نها ل سەر بیرەکا ئیرتوازی کو بۆ گوندی ل گەلیێ ڤەنتارا کۆلاینە.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا دێمی بوو، وەکو رەزا و چاندنا گەنم و جەهـ و... هەر وەسا چاندنا ئاڤی و مفا ژ سرۆشتی و بەروی و مازی و... وەرگرتن، ژبلی چێکرنا کومرا ژی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان، خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٨)ێ هاتییە گوندی، لێ گەلەك ڤەنەکێشا و سالا (١٩٨٠)ێ دگەل گوندی ژئالیێ حکۆمەتا بەغداڤە هاتنە خرابکرن[١٥٩].

**گوندێ مێسکێ:**

ل دووڤ گۆتنا گوندیان، دکەڤندا گوندێ مێسکێ گوندەکێ فەلآن بوو، گوندەکێ زەنگین بوو ب دەرامەتێن ئاڤی ب تایبەت تری، لەورا خەلکێ

گوندێ لومانا



گوندی ب چێکرنا (مەی - سێکێ) رادبوون، واته ناڤێ گوندی (مەی و سێك) بوویە، ب درێژاهییا دەمی بوویە (مێسکێ).

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن دیرالۆش و چەڤریکێ.

**باشووری:** گوندێ پێدە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێدیل.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کورەدێرێ.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ سێ مالباتان پێکدهێت، ئەوژی مالباتێن (حەجی محەمەد سەلیم، سلۆ مێسکی، میرزایی) سەر ب عەشیرەتا مزووری نە، خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٨٨)ێ نێزیکی ٣٠- ٣٥ مالا بوون، نها بووینە نێزیکی ١٠٠ هەتا ١٥٠ مالانە.

ئەڤ گوندە پێنج جاران هاتییە بەردان و تالانکرن و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولێ ئەڤ گوندە هاتییەبەردان، سالا (١٩٦٣)ێ هاتییەسۆتن، سالا پاشتر (١٩٦٤)ێ ژ ئالیێ کرێگرتیانڤە جارەکا دی هاتییەسۆتن، سالا (١٩٧٤)ێ هاتییەبەردان، داوی جار سالا (١٩٨٨)ێ ئەڤ گوندە ب ئێك جاری ژ ئالیێ حکۆمەتا بەغداڤە هاتییە خرابکرن، تا سالا (١٩٩٢)ێ جارەکا دی هاتییە ئاڤاکرنڤە، بەلێ ژبەرکاودانێ ناڤخۆیی ل سالێن نوتان سەر ژنوو هاتییە بەردان.

**شوینوار و جهێن کەڤنار:**

ل باشوورێ گوندی کەلایەکا بلند ب ناڤێ (کەلوتکا مێسکێ) هەیە، هەروەسا کەلایەکا دی دکەڤیتە ئالیێ باشووری، دناڤدا دو تەنویرێن کەڤن تێدا د کۆلاینە، رووبارەك دکەڤیتە دناڤبەرا ڤان هەردوو کەلایاندا، دیسان سێ ناوسکێن دی دکەڤنە باکوورێ گوندی، شکەفتەکا دی دکەڤیتە باشوورێ گوندی، هەروەسا شوینوارێن دێرەکێ ل رۆژهەلاتا گوندی هەنە، ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان گەلەکا کەڤن بوویە و ناڤ و دەنگێ خۆ ل دەڤەرێ هەبوویە؛ دێرەکا مەزن بوو، لێ ل سالا (١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ رژێما بەغداڤە هاتییە خرابکرن. ل سەر کانییا ب ناڤێ قدکری، شوینوارێن ئاقدەکا کەڤن هەیە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە (بانیێ، بەرۆژی، خارێ مارا، کانییا بن بەری، کانییا زەینۆکێ).

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ل گوندێ مێسکێ هژمارەکا کانییان هەنە وەکو کانیێن (شیڤا قەسرۆکا، بن بەری، قدکری، زەینۆکێ، شەعبانۆکێ).

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

گوندەکێ زەنگینە ب ئاڤێ، لەورا ژیارا خەلکێ گوندی پتر ل سەر جۆتیارییا ئاڤییە و ل دووڤ گۆتنا خەلکێ گوندی هەمی جۆرێن دەرامەتێن ئاڤی ل گوندی هەنە، ژبلی دەرامەتێ دێمی ژی.

ل دووڤ ئاخفتنا گوندیان، چ جاران خواندنگەهـ ل گوندی نەهاتییە ڤەکرن و بۆ خواندنێ زارۆکێن وان دچوونە گوندێ پێدە [١٦٠].

**گوندێ ئێکمالە:**

ل دووڤ گوتنا خەلکێ گوندی دکەڤندا ئەڤ گوندە ب تنێ یەك مالبوو، لەورا دبێژنێ ئێکمالە، پاشان رۆژ بۆ رۆژێ خۆ ل زێدەییێ دایە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کەمەکا.

**باشووری:** گوندێ قارقاراڤا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سندۆرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باکۆز.

**پێکهاتا گوندی:**

هەر ل دەسپێکا ئاڤاکرنا گوندێ تا نها ب تنێ یەك مالبات ل ڤی گوندی ژیایە، ئەوژی مالباتا (عەلی گەندەلا) یە، سەر ب عەشیرەتا دۆسکی نە، خەلکێ گوندی بەری سالا (١٩٨٨)ێ ٢٥٠- ٣٠٠ مال بوون، نها بووینە ١٥٠٠ هەتا ١٩٠٠ مال، د بەربەلاڤن هند ل

گوندا و هندژی ل بازێران دژین.

ئەڤ گوندە چەند جاران هاتییە بەردان و خرابکرن، ل دەسپێکا شۆرشا ئەیلوولێ گوند هاتییە بەردان، ل سالا (١٩٦٨)ێ هاتییە سوتن و کاڤلکرن، ل هەوا ئەنفالان ب ئێك جاری هاتییە خرابکرن، تا سالا (١٩٩٢)ێ جارەکا دی ژ ئالیێ گوندییانڤە هاتییە ئاڤاکرن.

## شوینوار و جهێن کەڤنار:

ل رۆژئاڤایێ گوندی مەزارەکێ کەڤن ب ناڤێ (مەزارێ عەلی گەندەلا) لێهەیە، پتریا کێلیێن قەبرێن وی دنەخشاندینە، ل سەر هندەك ژ ڤان کێلیان نیشانێن خەنجەرا و هەسپا و نەخشێن جودا جودا هەنە، ل دووڤ ئاخفتنا گوندییان مێژوویا وی بۆ بەری ٥٠٠ سالان د زڤریتەڤە.

بەرنیاسترین جهێن گوندی ئەڤەنە: (کەڤلا گوندی، حوتێ، ملا حیرا، کەڤرکا، سیلاڤۆکێ، سەرۆکانیێ ).

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

هژمارەکا کانییان ل گوندی هەنە، گرنگترین ئەو کانیە ئەڤەنە: (سیلاڤۆکێ، و سەرۆکانیێ)، و ژێدەرێ ئاڤا گوندی بەرێ ل سەر کانییا سیلاڤۆکێ بوو، سالا (٢٠١٤)ێ بیرئیرتیوازیەك ژ ئالیێ حکومەتا هەرێما کوردستانێڤە بۆ هاتییە کۆلان و بوویە ژێدەرێ ئاڤا گوندی.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ئەڤ گوندە گوندەکێ دێمە، ژیارا خەلکی وی پتر ل سەر جۆتیارییا دێمە وەکو باهیڤ و تری و نیسك و نۆك و... هتد.

پشتی سالا (١٩٧٠)ێ بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتە ڤەکرن، و خویندکارێن گوندێن دەور و بەر ژی بۆ خواندنێ دهاتنە ڤی گوندی، تا سالا (١٩٨٨)ێ ئەڤ خواندنگەهە د گەل گوندی هاتنە خرابکرن و هەتا نها خواندنگەهـ ل گوندی نەهاتییە ڤەکرنڤە[١٦١].

**تێبینی:**

**ئاڤلیاس، خرابەشێخ محمەد، کانی کوکا، بەرۆشکا سێڤێ، دەرگەل گرسیس، زاویتا ژووری، قەرەشو، مێرکا درێژ گوندێن ڤالانە ژ خەلکی.**

ژبلی ڤان گوندان دناڤ سنوورێ ناحیا زاویتەدا هژمارەکا گوندێن دی هەنە، کو ناڤێن وان دلیستا ناڤێن گوندانداندا نەهاتینە تومارکرن، و ناڤێن وان دنەخشێ ناحیێدا هەنە، ئەوژی: باصورێ و خرابێ شێخ محەمەد و بەرۆشکا سێڤێ، هەروەسا هندەك ناڤ دلیستا گوندانداندا هەنە و ئەو گوند ل سەر نەخشەی نینە، وەکو: کەلۆکێ و گرێ قەسرۆکا و گابێرکێ و باگێرا موسلمانا و هەردو کۆمەڵگەهێن کۆرا و باگێرا و مێمەدەلێ و مێردینکێ وروەتە و بێتاسێ، هەروەسا هژمارەکا دیا گوندا ل سەر نەخشەی یەك جار ناڤێ وان هاتییە و دلیستا ناڤێن گوندێن ناحیێدا دو گوندن، وەکو: رەشانکێ، کونۆکە رەشانکا بەروارێا و رەشانکا مزووریا هەنە، و گوندێ سپیاڤێ، کو نۆکە دو سپیاڤێنە، یا سەری و یا بنی، و گوندێ کەڤلەسنێ، کو نۆکە دو گوندن یا سەری و یا بنی، و گوندێ زاویتە، کو نۆکە دو زاویتەنە یا کەڤن و یا نوی، و ناڤێ گوندێ (دەرگەلا شیکە) دنەخشێ ناحیا زاویتەدا (دەرگەلا کریس)ە، و گوندێ پیرموس د لیستا ناڤێن گوندێن ناحیێدا دووبارەبوویە.

# ژێدەر و پەراوێز:

١. دەربارەی دووراتییا ناحیا زاویتە ژ مەلبەندێ دەڤەرداریا دهۆکێ بۆچوونێن جودا هەنە، هندەك دبێژن (١٧)کم، وەکو: Major resorts, A Tour in the north, ١- zawita, p١٤، جمال بابان، اصول اسماء المدن و المواقع العراقية، الجزء

# كورتییەكا دیرۆكی ل سەر رەوشا كارگێڕی و جڤاكی ل زاخۆ

## هەر ژ سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی هەتا سالا ٢٠١٥ ێ

م. وەصفیە محەمەد شێخو سندی
وەرگێران: صالح یوسف صوفی

### جهێ جوگرافی و ناڤكرن:

زاخۆ ل سەردەمێ حوكمداریا ئۆسمانی (١٥١٥-١٩١٨) دكەڤتە دورترین دەڤەرا باكوورێ رۆژئاڤایێ ویلایەتا مووسل، سنوورێ وێ ژ باكوور هەردو ویلایەتێن وان و بدلیس، ژ رۆژئاڤا ویلایەتا دیاربەكرێ و ژ باشوور ژی هەردو قەزایێن دهۆك و ئامێدیێ بوون[1]، نۆكە ژی قەزا زاخۆ ل باكوورێ رۆژئاڤایێ كوردستانا باشووره و ل دورترین دەڤەرا باكوورێ عیراقێ یە و نێزیكی ١١٤ كیلۆمەتران ژ باكوورێ مووسل و ٥٨ كیلۆمەتران ژ دهۆك (سەنتەرێ پارێزگەها دهۆك) دوره.

ژ لایێ باكوورڤە، سنوورێ وێ دگەل تركیا (باكوورێ كوردستانێ) و ژ لایێ رۆژهەلات ڤە رووبارێ خابوور و قەزا ئامێدیێ نە، لایێ رۆژئاڤا رووبارێن دیجلە و هیزلن و هەردو رووبار وی باژێری ژ كانتۆنا بۆتان ل كوردستانا باكوور جودا دكەن و هەردو قەزایێن سێمێلێ و دهۆك ژی دكەڤنە باشوورێ زاخۆ.

قەزا زاخۆ گرنگییەكا جۆگرافی هەیە چونكی دكەڤیتە سەر سنوورێ عیراقێ - تركیا - سوریا و سەنتەرێ قەزایێ تنێ دو میلان دوری باشوورێ تركیا و ١٢ میلان دوری رۆژهەلاتێ سوریایە، زاخۆ ب ڤی جهێ خۆ ب دەرگەهەكێ سەرەكیێ نێڤدەولەتی ل ناڤبەرا عیراقێ ژ لایەكی و هەر ئێك ژ تركیا و سوریا ژ لایەكێ دیڤە دهێتە هژمارتن، هەروەسا كلیل و دەرگەهێ كوردستانا باشووره.

ژ لایێ فەلەكناسی ڤە ژی هێلا درێژاهیا ٤٢,٤١ ژ رۆژهەلات ڤە و بازنەیا فرەهیێ یا ٣٧,٨ ژ باكوور ڤە باژێرێ زاخۆ دبڕیت و ٤٤٠ مەتران[2] ژ ئاستێ روویێ دەریایێ بلندە، هەروەسا رووبەرێ قەزا زاخۆ ١٥٢١,٥١ كیلۆمەترە و نۆكە ژ لایێ كارگێری ڤە سەر ب پارێزگەها دهۆكێ یە[3].

ل سەر ناڤکرنا وێ ژی دیتن وبۆچوونێن دیرۆکنڤیسان نەوەك ئێکن، لێ تشتێ دیار ئەوە کو قەزا زاخۆ وەکی قەزایێن دی یێن کوردستانێ، گەلەك یا دێرینە و ب درێژاهییا دیرۆکێ رۆلەکێ گرنگ د ژیانا ڤێ دەڤەرێ دا دیتییە.

ناڤێ وێ ژ ناڤێ سەنتەرێ باژێڕێ زاخۆ هاتییە کو دکەڤیتە ناڤ گزیرتەیەکی ل ناڤ رووبارێ خابوور[٤] کو ژ لایێ رۆژئاڤا ئەو رووبار[٥] باژێڕی دسمیت، ل نیڤا باژێڕی ژی خابوور دبیتە دو تا، ل داویێ ژی هەردو تا، پشتی گزیرتەیەکی پێك دئینن، دوبارە دگەهنە ئێك، هەروەسا باژێڕ ل ناڤبەرا دو سرتێن چیایێن درێژە، ل باکوورێ باژێڕی سرتا چیایێ گێرەیە ب بلنداهییا ٤٠٥٠ پییانە و درێژبوونا سرتا چیایێ جوودی یە و رووبارێ هیزل دبیتە ناڤبرێ وان، ل باشوور ژی سرتا چیایێ بێخێرێ یە[٦] کو ٤٨٥٠ پییان بلندە و درێژبوونا سرتا چیایێ سپییە[٧].

هەمی دیتن وبۆچوون بۆ ناڤکرنا زاخۆ ل سەر دەرئەنجامێن دیرۆکی و زمانڤانی هاتبوونە ئاڤاکرن و نێزیکییەك ژی ل ناڤبەرا وان دیتن وبۆچوونان هەیە، نەخاسمە کو پتریا وان پشتا خۆ ب دیرۆکێ پاشی ب ژیواری و هندەك جاران ژی ب رووداںێ گەرمکرینە، هەر بۆ نموونە ل سەر وان بۆچوونان: ناڤکرن ژ دەستەپەیڤا کوردی (زێ خوین) ئانکو (رووبارێ خوونێ) هاتییە سڤك کرن وەك ئاماژە بۆ روودانەکا گرنگ یا ل وی جهی چێبووی و خوون لێ هاتییە رێتن، هەروەسا قەشە (انستاس ماری الکرملی) گۆتییە کو پەیڤا (زاخۆ) د جووکانیێ دا رامانا وێ (سەرکەڤتن)ە ئانکو پەیڤا (زاخۆتا) رامانا وێ (سەرکەڤتن)ە، تشتێ پشتەڤانییا ڤێ رامانێ دکەت پەیڤا (زاخ) یا زمانێ کوردییە کو رامانا وێ (هێز و موکمی)یە، د ڤی ئاراستەی دا هۆزانڤانێ کورد ئەحمەدێ نالبەند دبێژیت: (چوومە زاخۆ، زاخ مە دا خۆ) ئانکو: (چوومە زاخۆ و ل وێرێ من خۆ گورج و کشت کر و ب هێز کەڤتم)[٨].

زاخۆ



## کارگێرییا حکومی ل زاخۆ ژ ژ سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی هەتا سالا ٢٠١٥ێ :

زاخۆ ل سالا ١٥١٦ێ کەڤتە بن کۆنترۆلا ئۆسمانی و دەمێ ل سالا ١٥١٨ێ ویلایەتا دیاربەکرێ هاتییە دامەزراندن، زاخۆ بوو سنجەقەك ژ سنجەقێن ڤێ ویلایەتێ[٩]، لێ ل سالا ١٥٣٣ێ پشتی مووسل بوویە بنگەهەکێ ولایەتەکا مەزن یا ئۆسمانی، ناحیا سندی بوو ئێك ژ ناحیێن سنجەقا زاخۆ[١٠].

سەرانسەری زاخۆ تەڤلی ویلایەتا مووسل نەبوو سالا ١٥٣٩ێ نەبیت، ئەڤە پشتی رەوشا مووسل بنەجهـ بووی کو سەنتەرێ ویلایەتێ بوو و هەر سێ لیوائێن مووسل و زاخۆ و عانە پێڤە گرێدای بوون[١١]، (دکتۆر عەلی شاکر عەلی) ئاماژەیێ دکەتە وێ چەندێ کو سنجەقا زاخۆ هەتا سالا ١٥٥٢ێ ل ناڤ ویلایەتا مووسل بوو[١٢]، دەمێ دزڤرینە وێ دەفتەرێ یا ئاماژەیێ دکەتە دابەشبوونێن کارگێری یێن ویلایەتا بەغدا کو هژمارا وێ ١٤٥٢ یا سالا ١٥٤٩-١٥٥١ێ یە، تێدا هاتییە کو ل وی سەردەمی ٢٩ لیوا ژ وانا لیوا زاخۆ ژی سەر ب ویلایەتا بەغدا بوون کو وی دەمی زاخۆ ل بن دەستەلاتا حسێن بەگێ (١٥٣٣–١٥٧٤) میرێ بەهدینان بوو، ئانکو ژ لایێ رێبەرێن کورد ڤە دهاتە رێڤەبرن، هەر ب ڤی ئاوایی، دەفتەرا حوکمێن دارایی هژمارە ٥٦٣ زانیاریان ل سەر رەوشا کارگێرییا ویلایەتا بەغدا ددەتـە مە و تێدا دابەشبوونێن کارگێری ل ناڤبەرا سالێن ١٥٦٨-١٥٧٤ێ دیار دبن و تێدا هاتییە کو ویلایەتا بەغدا ژ ٢٨ لیوایان پێك دهێت و ئێك ژ وان لیوا زاخۆیە و ناڤێ دی یێ وێ سندی سلێمانی (سلێڤانەیی)یە. پشتی هنگی و ل دووڤ دەفتەرا هژمارە ٢٦٢ یا فەرمانێن دامەزراندنێ ل ویلایەت و لیوایێن ئۆسمانی ل ناڤبەرا سالێن ١٥٧٣-١٥٨٨ێ و دابەشبوونێن کارگێری یێن مووسل پشتی بوویە ئەیالەت تێدا هاتینە توومارکرن و دیار دبیت کو مووسل ژ هەشت لیوایان پێکدهێت کو ئەو ژی ئەڤەنە: مووسل، ئەربیل، ئەسکی مووسل، واعضە قەلعە، نسێبین، زاخۆ[١٣].

پاشی ل هەردو سەدسالێن هەڤدێ و هەژدێ، زاخۆ ژ لایێ کارگێری ڤە، ژ بەر ئەگەرێن جودا جودا، جار سەر ب ویلایەتا مووسل و جار ژی سەر ب ویلایەتا بەغدا بوو، لێ ل سالا ١٦٤٨ێ گوهورینەکا مەزن کەڤتە دابەشبوونێن کارگێرییێن ئەیالەتا مووسل و وێ ئەیالەتێ ژ بەر لاوازییا ئاستێ خۆیێ کارگێری لیوا زاخۆ ژ دەستدا و بوو ئێك ژ لیوایێن سەر ب ئەیالەتا بەغداڤە و هەتا سالێن دوماهیێ یێن سەدسالیا هەڤدێ سەر ب وێ ئەیالەتێ بوو و دەفتەرا هژمارە ١٥٥١ ژی ئاماژەیێ دکەتە سالێن ١٦٨٧-١٧٠٠ێ دیار دکەت کو زاخۆ سەر ب وێ ئەیالەتێ ڤە بوویە و فەرمانێن دامەزراندنێ ژی هەر ب دەستێ ویلایەتا بەغدا بوون، لێ دگەل دەستپێکا سالێن ١٧٠١-١٧٠٢ێ و هەروەکی د وێ دەفتەرێ دا هاتی، دبینین لیوا زاخۆ دوبارە دبیتە ئێك ژ ویلایەتێن ئەیالەتا مووسل[١٤].

دگەل دەستپێکا سەدسالییا ١٩ێ ژی حکومەتێ دەست ب بەرفرەهکرنا ئیمتیازێن دەستەلاتێن کارگێری یێن باشوورێ کوردستانێ و گوندێن مووسل کر و بەرفرەهکرنا ئمتیازێن کارگێری یێن حوکمدارێن بەغدا بوونە ئەگەرێ وێ چەندێ دەولەتێ بشێت رێکارێن دژوارتر بۆ موکمترکرنا کۆنترۆلا خۆ ل سەر سنوورێن خۆ بسەپینیت، هۆسا، ل نیڤا دووێ یا سەدسالییا ١٩ێ ل سالا ١٨٥٠ یێ مووسل و بازێرێن سەر ب وێ ڤە، ژ وانا زاخۆ ژی، کەڤتنە بەر ویلایەتا بەغدا و ل سالا ١٨٧٩ێ زاخۆ و دهۆك و ئامێدیێ دوبارە کەڤتنە بەر ویلایەتا مووسل، ئەڤە ژی پشتی ئەڤا داویێ دوبارە بوویەڤە ویلایەت، ب ڤێ چەندێ، زاخۆ ل سەردەمێ ئۆسمانی ژ لایێ کارگێری ڤە بەردەوام سەر ب ویلایەتەکێ نەبوویە، بەلکی ژ بەر گەلەك ئەگەران هەر جارێ سەر ب ویلایەتەکێ بوویە، لێ ب کریار هەر ژ لایێ بنەمالا حوکمدارا میرگەها بەهدینان دهاتە ب رێڤەبرن[١٥].

لێ تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە زاخۆ ل سالا ١٨٦٤ێ بوویە یەکەیەکا کارگێری ب پلا قەزا و ب لیوا (سنجەقا) مووسل ڤە هاتییە گرێدان

كو سەنتەرێ ویلایەتا مووسل بوو[16]، هەروەكی د سالنامەیا[17] ویلایەتا مووسل یا سالا ١٨٩٠ێ دا هاتی تنێ ناحیەك سەر ب قەزا زاخۆ بوو كو ئەو ژی ناحیا سلێڤانەی بوو و ناڤێ ڤێ ناحیێ د سالنامەیا سالا ١٨٩٢ێ دا دوبارە دبیت دگەل ئاماژەكرنێ كو زاخۆ قەزایەكا پلە دویە و ناحیا (سندی - گولی) ژی ل سالا ١٨٩٢ێ ب زاخۆ ڤە هاتیە گرێدان كو بەری هنگی و ل قووناغەكا دەستنیشانكری سەر ب سنجەقا هەكاری بوو، لێ د هەردو سالنامەیێن سالێن ١٩٠٧ێ ١٩١٢ێ دا ناڤێ دو ناحیێن سەر ب قەزا زاخۆ هاتینە گۆتن كو ئەو ژی هەردو سلێڤانەیی و (سندی - گولی) نە.

هەروەسا سالنامەیا ١٩٠٧ێ ئاماژە كریە وێ چەندێ كو زاخۆ قەزایەكا پلە دویە، ئەڤە ل وی دەمێ قەزا ئامێدیێ پلە ئێك بوویە و هەردو قەزایێن دهۆك و ئاكرێ ژی پلە سێ بووینە[18].

سیستەمێ كارگێڕیا ئۆسمانی ل قەزا زاخۆ گەلەك یێ جودا نەبوو ژ وی سیستەمێ ل قەزایێن دی یێن ئۆسمانی دهاتە ب كارئینان ڤێجا چ ل ویلایەتا مووسل یان ویلایەتێن دی یێن ئۆسمانی بیت، هەر بۆ نموونە، قائیمقام سەرۆكێ دەزگەهێ كارگێڕیێ قەزایێ بوو[19] و هەر ئەو بەرپرسێ رێڤەبرنا كاروبارێن قەزایێ [20] و كاروبارێن دارایی و ئێمناهیێ و هەلبژارتنا رێڤەبەرێ ناحیێن وێ قەزایێ بوویە یا وی سەرۆكاتیا وێ دكر و ئەو ب خۆ ژی ژ لایێ حكومەتا ناوەندی ڤە ل ستەنبۆلێ دهاتە دامەزراندن، ئەڤە ل وی دەمێ رێڤەبەرێ ناحیێ سەرۆكێ دەزگەهێ كارگێڕیێ ناحیێ بوویە و ژ لایێ والیێ ویلایەتێ دهاتە دامەزراندن پشتی وەزارەتا ناڤخۆیی ل ستەنبۆلێ ئەو دامەزراندن پەسند دكر[21]، هەروەسا ئەركێ رێڤەبرنا گوندی كارێ موختاری بوو و ئەو بچووكترین بەرپرسێ كارگێڕیێ ویلایەتێ بوو[22]، پتریا جاران ژی هەر گوندەكی موختارەك هەبوو، لێ هەكە گوندەكی پتر ژ تیرەیەكێ تێدا هەبانە، هەر تیرەیەكێ ماف هەبوو موختارەكێ تایبەت بۆ خۆ ژێ بگریت[23]، هەڤدەم قائیمقامی سەرۆكاتیا جڤاتا كارگێڕیا قەزایێ ژی دكر[24].

ژ وان یەكەیێن كارگێڕیێن ل سەردەمێ ئۆسمانی ل زاخۆ هەبوون هەردو دادگەهێن بەراهی (دەستپێكی)[25] و شەرعی بوون[26]، هەروەسا دەزگەهێ دارایی ژی ل قەزایێ، هەیكەلێ وێ یێ كارگێڕی ژ رێڤەبەرێ دارایی( مال مدیری) كو بەرپرسێ ئێكسەرێ دارایی بوو ل ناڤ قەزایێ بەرپرسێ رێكخستنا كاروبارێن ژمێرباری یێن وێ بوو و وی و قائیمقامی بەرپرسیاریەكا هەڤپشك د رێڤەبرنا كاروبارێن دارایی یێن دەولەتێ دا هەبوون[27].

ل سەر كارگێڕیا ئێمناهی و سەربازی ژی ل قەزا زاخۆ، هێزێن جەندرمەیان (قوات الضبطية) بەرپرسیا پاراستنا تەناهی و كاروبارێن دەولەتێ و خەلكی ب ستۆیێ خۆڤە گرتبوو و سەرپەرشتیا وی بیاڤی دكر، بۆ وێ چەندێ ژی ل زاخۆ مەفرەزەیەكا جەندرمەیێن بەتالیۆنا ئێك هەبوو كو بارەگەهێ وێ مووسل بوو[28]، ئەڤە سەرباری كو زاخۆ بارەگەهێ بەتالیۆنا چوار یا لیوا ٩٦ یا هێزێن یەدەك (باشبزۆق Başibozuk) بوو[29].

ل سەر خزمەتێن فێركرنێ ژی ل زاخۆ ل سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی، تنێ خواندنگەهێن دەستپێكی و خواندنگەهێن ئایینی یێن كلاسیكی هەبوون[30] و ئێك ژ وان خواندنگەهێن ئایینی یێن ل زاخۆ هەبوون ناڤێ وێ (خواندنگەها زانستی) بوو كو ل ناڤ سەنتەرێ قەزایێ بوو و ل سالێن ١٨٩٩-١٩٠٠ هژمارا خووندكارێن وێ ١٤ خووندكار بوون و وانەبێژێ وێ ژی مەلا ئەحمەد بوو[31]، هەروەسا خواندنگەها (ئەرمشتێ) ل ناحیا سلێڤانەیی و شێخ حەسەن خۆرانی (كو ل سالا ١٣٢٥ێ مشەختی/١٩٠٦ێ زایینی وەغەرا داویێ كریە) ئێك بوو ژ مامۆستایێن وانە لێ گۆتن و زانستێن جودا جودا دگۆتنە خووندكارێن وێ خواندنگەهێ[32]، هەروەسا خواندنگەها شەرانش ژی ل ناحیا سندی هەبوو[33].

ل سالێن نۆتێ یێن سەدساڵیا ١٩ێ گرنگیەكا بەرچاڤ ب فێركرنا دەستپێكی وەك بنەما بۆ سیستەمێ فێركرنا فەرمی هاتە دان و چەندین

خواندنگەهێن فەرمی ل مووسل و دەڤەرێن وێ هاتنەڤەکرن کو ئێك ژ وان زاخۆ بوو، هەر بۆ نموونە، ل سالا ۱۸۹۳ێ ئێکەمین خواندنگەها دەستپێکی ل قەزا زاخۆ ل ناحیا سندی ــــ گولی هاتە ڤەکرن[٣٤] کو دشیاندایە ب ئێکەمین خواندنگەها دەستپێکی بهێتە ل قەلەمدان یا ل سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی ل دەڤەرا بەهدینان هاتبیتە ڤەکرن، هەروەسا ل سالا ۱۸۹۸ێ خواندنگەهەکا دەستپێکی ل سەنتەرێ قەزا زاخۆ هاتە ڤەکرن[٣٥] هەروەکی سالنامەیا ۱۹۱۲ێ ئاماژە کریە هەبوونا خواندنگەهەکا دەستپێکی ل زاخۆ[٣٦].

ل سالێن داویێ یێن سەدسالییا ۱۹ێ هژمارەکا خواندنگەهێن تایبەت و بیانی و خواندنگەهێن فەرمی ل زاخۆ هاتنە ڤەکرن، یێن ئێکێ ژی خواندنگەهێن تیرەیێن مەسیحی و جوهی یێن هەڤوەلاتیێن دەولەتا ئۆسمانی بوون، لێ پتریا یێن دووێ خواندنگەهێن شاندێن مسیۆنێری بوون[٣٧].

هەر بۆ نموونە، خواندنگەهەکا جوهیان ل زاخۆ هەبوو و ل سالا ۱۹۰۳ یێ هژمارا خووندکارێن وێ ۳۰ خووندکار[٣٨] و هژمارا مامۆستایێن وێ ژی چوار مامۆستا بوون، پاشی هژمارا خووندکاران زێدەبوو هەتا ل سالا ۱۹۲۰ێ هژمارا وان گەهشتییە ۲۵۰ خووندکاران[٣٩]، هەروەسا ل سالا ۱۸٦٧ێ شاندا مسیۆنێریا دۆمەنیکی خواندنگەهەکا کوڕان ل زاخۆ دامەزراند[٤٠]، ل سالێن هەشتێ یێن سەدسالییا ۱۹ێ ژی بارەگەهێ مار یەعقووب ل ئامێدیێ بوو و سەرپەرشتیا سێ خواندنگەهێن دی یێن قەزا زاخۆ دکر[٤١].

ل سەر کەرتێ ساخلەمیێ، د سالنامەیێن ئۆسمانی دا چ ئاماژە بۆ هەبوونا چ کلینیکان یان نوژداران یان ژی فەرمانبەرێن ساخلەمیێ ل زاخۆ نینن، رامانا ڤێ ژی ئەوە کو کارگێڕیا ئۆسمانی خەمساری د ئالیێ ساخلەمیێ دا کریە و کێماسی د خزمەتێن ساخلەمی دا هەبووینە، لێ ل سالێن

پرا دەلال



داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی نووشدار ئستەرجیان كار ل زاخۆ كریە[٤٢] كو ل سالا ١٩١٣ێ ب فەرمی وەك نووشدار ل ولایەتا مووسل هاتبوو دامەزراندن[٤٣] و وی سەرپەرشتییا هەر چوار قەزایێن كوردی یێن زاخۆ، دهۆك، ئامێدیێ و ئاكرێ دكر[٤٤] و زاخۆ كربوو سەنتەرێ كارێ خۆ[٤٥].

ل سەر فەرمانگەها بازێرڤانیێ ژی ل زاخۆ ل سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی، فەرمانگەها بازێرڤانی(جڤاتا بازێرڤانی) ل سالا ١٨٧٥ێ هاتبوو دامەزراندن، لێ رێڤەبەریا پۆستە و تیلیگرافێ و خزمەتێن وێ، سالنامەیا ئۆسمانی یا سالا ١٨٩٢ێ[٤٦] ئاماژە كریە وێ چەندێ كو هێلەكا تیلیگرافێ ل جهێ باستكە (باستكێ) هەبوویە و قەزا زاخۆ ب وانێ و دیاربەكر و هەكاری گرێ ددا[٤٧]، هەروەسا هەردو سالنامەیێن سالێن ١٩٠٧ێ ١٩١٢ێ بەحسێ هەبوونا هێلەكا تیلیگرافێ ل زاخۆ كرینە[٤٨].

ل سەر خزمەتێن رێ و ڤەگوهاستنێ ژی ل زاخۆ ل سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی، دەولەتا ئۆسمانی ل سالا ١٨٨٣ێ دەست ب كاركرنێ د رێیا زاخۆ دا كربوو و د چارچۆڤێ گرنگیدانا دەستەلاتا ئۆسمانی ب وێ رێكێ هەمی شیانێن خۆ بۆ ڤەكرنا رێیا گەلیێ بۆغاز (گەلیێ زاخۆ) تەرخان كربوون، ل سالا ١٩٠١ێ ژی رۆژنامەیا فەرمییا ولایەتا مووسل ئاگەهدارییەك بەلاڤ كریە و تێدا هاتییە: فەرمانگەها نافیعە ( كارێن گشتی) ل ولایەتێ ل سەرێك كێمكرنەك دابوو لایەنەكێ تایبەت بۆ ب جهئینانا ٣١٤٣ مەترێن رێیا گەلیێ زاخۆ وەك پشكەك ژ رێیا گرنگ یا ل ناڤبەرا مووسل و ستانبۆلا پایتەخت، لێ وی لایەنی پێكیری ب مەرجان نەكریە و ل دەمێ دەستنیشانكری ئەركێ خۆ ب جهـ نەئینایە، ژ بەر هندێ، فەرمانگەها ناڤبری ب جهئینانا وی پرۆژەی رادەستی لایەنەكێ دی كریە[٤٩].

ژ بلی كار و ئەركێن كارگێرییێن مە ل سەری بەحس كرین، هندەك كارێن دی ژی ل قەزایێ هەبوون و هەر ئێك ژ وان یێ تایبەت بوو ب لایەنەكێ دەستنیشانكریێ لایەنێن كارگێرییێن وێ قەزایێ، هەر بۆ نموونە، (قەلەم نفووس) ل قەزایێ هەبوو كارێ وێ توومارکرنا ئاكنجی و ژ دایكبووی و مریان و كاروبارێن دی بوو و دو فەرمانبەران لێ كار دكر كو ئەو ژی مەئمووری نفووسێ و نڤیسەرێ نفووسێ بوون[٥٠]، هەروەسا نڤیسەرێ تاپۆیێ و نڤیسەرێ باجا ژی ل زاخۆ هەبوون[٥١].

ژ بەركو كارگێری ل هەر دەولەتەكێ رەنگڤەدانا خۆرستێ دەستەلاتا حوكمدار و ئاراستەیێن وێ یێن سیاسی و ئابووری جڤاكییە، هەروەسا ژ بەركو دەولەتا ئۆسمانی ل سالێن داویێ یێن سەردەمێ خۆ تەڤلی قووناغا لاوازی و داكەڤتنا سیاسی و ئابووری ببوو، دشێین بێژین ڤێ چەندێ رەنگڤەدانا خۆ ل سەر رەوشا وێ یا كاگێری هەبوویە، نە تنێ ل ناڤ دەولەتا ئۆسمانی، بەلكی ل هەمی دەڤەرێن ژێر حوكمێ وێ، كو ئێك ژ وان ویلایەتا مووسل و قەزایێن وێ بوون و زاخۆ ژی ئێك ژ وان قەزایان بوو.

تشتێ پەیوەندی ب كارگێرییا بەریتانی ل زاخۆ هەی، هێزێن بەریتانی ل رۆژا ١٠ی چریا دووێ یا سالا ١٩١٨ هاتبوونە ناڤ بازێرێ مووسل و بازێر كەڤتە د دەستێ كۆلۆنێل لیچمەن دا و هەر زوو وەك حوكمدارێ سەربازیێ مووسل و وەك ئەفسەرێ سیاسیێ سەرانسەری ویلایەتا مووسل هاتە دامەزراندن[٥٢] و ل رۆژا ٢٠ چریا دووێ یا سالا ١٩١٨ێ هێزێن بەریتانی هاتنە ناڤ بازێرێ زاخۆ[٥٣].

ل داوییا چریا دووێ یا سالا ١٩١٨ێ ژی كارگێرییا بەریتانی هەمی دەڤەرێن سەر ب مووسل ڤە كۆنترۆل كرن كو ئەو ژی ئەڤە بوون: تەلەعفەر، شنگال، زاخۆ، ئامێدیێ، دهۆك و ئاكرێ و كۆلۆنێل لیچمەن سەرەدانا وان كر و ئالایا بەریتانی ل سەر فەرمانگەهێن وان بلند كرن و هاریكارێن حوكمدارێن سیاسی لێ دامەزراندن[٥٤]، ب ڤێ چەندێ، هاریكارێن حوكمدارێن سیاسی ل شوونا قائیمقامێن قەزایان هاتنە دانان و رێڤەبرنا ناحیيان ژی رادەستی رێڤەبەرێن خۆجهی هاتنە كرن[٥٥].

ویلایەتا مووسل ل بن سیبەرا كارگێرییا بەریتانی بۆ حەفت قەزا كو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە: مووسل

(سەنتەرێ ویلایەتێ)، ئاكرێ، ئامێدیێ، تەلەعفەر، دهۆك، زاخۆ و شنگال و هەر قەزایەك بوو خودان میلاكێ خۆیێ وەزیفی كو پێك دهات ژ: حوكمدارێ سیاسی، هاریكار، دادوەر، نڤیسەرێ دادگەهێ، رێڤەبەرێ دارایی، نڤیسەرێ نڤیسكاریێ (تەحریرات)، وەرگێر، فەرمانبەرێ(مەئموورێ) گومركێ، ژمێریار، فەرمانبەرێ پۆستە و تیلیگرافێ، فەرمانبەرێ ساخلەمیێ، سەركردێ جەندرمان (دەرەكان)، نڤیسەرێ باژێرڤانیێ[56]، هەروەسا گرنگی ب پاراستنا تەناهییا ناڤخۆیی دا و بۆ ڤێ چەندێ ژی پۆلیسێن خۆجهی دانان كو وی دەمی ب هێزا (شبانە) هاتبوو ناڤكرن و ئەڤ هێزە ببوو دەستپێك بۆ پێكئینانا هێزا پۆلیسان[57].

ژ پێشكەڤتنێن دی یێن كارگێری ل بن سیبەرا كارگێرییا بەریتانی ل زاخۆ چێ بووین، ڤەكرنەڤا خواندنگەهەكا دەستپێكی بوو ل سالا ١٩١٨ێ[58] و ل شوانا سالا ١٩١٩ێ ئەحمەد ناجی ئەو خواندنگەهە ب رێڤەبریە[59] و ب ڤێ چەندێ ژی ئەو دبیتە ئێكەمین مامۆستا و ئێكەمین رێڤەبەرێ وێ خواندنگەهێ پشتی سەردەمێ ئوسمانی[60]، هەروەسا ل زاخۆ ئێكەمین بنكەهێ ساخلەمیێ هاتەڤەكرن و جڤاتا وێ یا باژێرڤانی هاتە هەلوەشاندن و كاروبارێن باژێرڤانیێ كەڤتنە د دەستێ هاریكارێ حوكمدارێ سیاسی دا و جڤاتەكا شیرەتكاریا كارگێرییا كاروبارێن قەزایێ هاریكاریا وی د رێڤەبرنا كاروبارێن باژێرڤانیێ دا دكر[61].

دەولەتا عیراقێ رێڤەبرنا كاروبارێن قەزایێ ژ دەستەلاتا داگیركەرا بەریتانی وەرگرت، لێ چ گوهورین د یەكەیێن كارگێرییێن هەبی دا نە كرن و هەر ل سەر وی سیستەمی ب رێڤە چوو و تێرما (لیوا) وەك پێكوهور بۆ تێرما (سنجەق) ب كار ئینا و تێرمێن دی (قەزا، ناحیە، مۆتەسەرف، قائیمقام، رێڤەبەرێ ناحیێ) وەكی خۆ هێلان، موختار ژی ل سەر رێكخستنا پەیوەندییا ل ناڤبەرا كارگێریێ و ئاكنجیێن گوندان بەردەوام بوون، هەروەسا هەر حەفت قەزایێن: مووسل، ئامێدیێ، ئاكرێ، زاخۆ، دهۆك، شنگال و تەلەعفەر هەر مانە سەر ب لیوا مووسل ڤە[62]، ل دووڤ دابەشبوونا نوویا كارگێرییا حكومەتا عیراقێ، زاخۆ بوو ئێك ژ قەزایێن لیوا مووسل و ل دەستپێكێ ناحیا (سندی ـــ گولی) و سەنتەرێ باژێرێ زاخۆ قەزایێن زاخۆ بوون[63].

حكومەتا ئێكێ یا عەبدلرەحمان گەیلانی پێكئینانا جڤاتێن قەزایێن لیوا مووسل پەسند كر و جڤاتا قەزایێ ژ سێ ئەندامێن فەرمانبەر پێكدهات كو ئەو ژی ئەڤەنە: هاریكارێ حوكمدارێ سیاسی یان قائیمقام و دادوەر (ژ بلی قەزا مووسل) و رێڤەبەرێ دارایی، ئەڤە سەرباری هەشت ئەندامێن دی یێن نە فەرمانبەر ل دووڤ رێژا قەبارێ قەزایێ، هەروەسا دەمێ ل رۆژ ٢٧ى نیسانا سالا ١٩٢٧ێ یاسایا كارگێرییا لیوایان هژمارە ٥٨ ب پشتەڤانییا ماددێ ١٠٩ یێ یاسایا بنكەهین(بنەرەت) دەركەڤتی[64]، دەقێ یاسایا نوویا كارگێری، پێكئینانا جڤاتێن كارگێری ل هەر لیوا و قەزایەكێ تێدا هاتبوو، ل دووڤ رێكارێن بۆری، جڤاتەكا كارگێرییا تایبەت ب زاخۆ هاتە پێكئینان[65].

هەر ژ سالا ١٩٢١ هەتا ١٩٥٨ێ ئەڤێن ناڤێن وان ل خوارێ پۆستێ قائیمقامێ زاخۆ وەرگرتینە:

١- داود ئەلیاوەر ١٩٢١/٨/٨.

٢- عەبدلفەتاح بەگ ١٩٢٣/١/٢٢.

٣- مەحمود فەخری ١٩٢٤/١٠/٥-١٩٢٧.

٤- جەمیل ئەفەندی ١٩٢٨.

٥- مستەفا بەگ ئەلعومەری ١٩٣٠/٦/١١-١٩٢٨/٨/٢٥، هەر ئەو بۆ جارا دووێ ژ ١٩٢٨/١٢/١٢-١٩٣٠/٣/٢٨.

٦- حسێن عەونی ١٩٣٠/٦/٢.

٧- مەكی ئەلشەربەتی (ل سالێن سیهان دو جاران وەك قائیمقامێ زاخۆ هاتییە دامەزراندن).

٨- عەبدلحەمید ئەلدەبونی ١٩٣١/٩/١٤-١٩٣٣.

٩- سالم نامق ١٩٣٦/٨/٩.

١٠- سەعید ئەلقەزاز ١٩٣٩/٤-١٩٤٠.

١١- مستەفا ئەلیەعقوبی ١٩٤١.

١٢- شاکر ئەلهورمزی ١٩٤١-١٩٤٢.

١٣- ناجی عەلی ئەلهورمزی ١٩٤٣/٣/١١.

١٤- سەدیق ئەلقادری ١٩٤٤/١٢/٢١-١٩٤٥.

١٥- ئەمین قەیرەدار ١٩٤٥-١٩٤٦.

١٦- لازارلام ئیبراهیم (دو جاران وەك قائیمقامێ زاخۆ هاتییە دامەزراندن، یا ئێکێ ژ ١٩٤٦/١٠/٧-١٩٤٨ێ و یا دووێ ل سالا ١٩٥٤ێ).

١٧- نازم سەعید ئەلوەنداوی (دو جاران وەك قائیمقامێ زاخۆ هاتییە دامەزراندن، یا ئێکێ ژ ١٩٤٩/١/١٣-١٩٥٠، یا دووێ ل سالا ١٩٥٤ێ).

١٨- عەبدلقادر بابان ١٩٥٢/٣/٢٦.

١٩- سوبحی عەلی ئاغا ١٩٥٤-١٩٥٦.

٢٠- شاکر فەتاح ١٩٥٧/١/٢-١٩٥٨/٧/٣٠[٦٦].

ل ناڤبەرا سالێن ١٩٢٣-١٩٥٨ێ سەرباری سەنتەرێ قەزا زاخۆ، هەردو ناحییێن سلێڤانەیی و سندی سەر ب قەزا زاخۆ بوون، ل دۆر سنوورێ کارگێرییێ سەنتەرێ قەزایێ ژی، ل باکوور دۆلا جەلال و هەتا کانییا ئاڤێ یا تلکەبەرێ یە، ل باشوور رووبارێ خابووره هەتا دەرگەهێ گەلیێ زاخۆ، لێ ل رۆژهەلات پرا عەباسیکێ (پرا دەلال) هەتا رووبارێ خابووره، ئەڤە ل وی دەمێ عەردێ وەقفێ هەتا گوندێ بێدارێ سنوورێ رۆژئاڤایێ کارگێرییا سەنتەرێ قەزا زاخۆیە.

ناحیا سلێڤانەیی ل سالا ١٩٢٣ێ هاتییە دانان و سەنتەرێ وێ گوندێ (ئاسیهێ) بوو کو دکەڤیتە نێزیك گەلیێ زاخۆ و سوریا و ترکیا سنوورێن وێ یێن باکوورن و ناحیا سندی ـــ گولی ژی سنوورێ باشوور و ل رۆژئاڤاژی ژی رووبارێ دیجلە سنوورێ وێ ناحیێ یە، هژمارا گوندێن وێ ٩٧ گوندن، لێ ناحیا سندی ل سالا ١٩٢٥ێ هاتییە دانان و ل پێشیێ سەنتەرێ وێ گوندێ بێرسڤێ بوو پاشی بۆ گوندێ شەرانش هاتە ڤەگوهاستن و دەڤەرا سندی دبوو ناڤبر، شەرانش

پرا دەلال



دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ سەنتەرێ قەزا زاخۆ و هژمارا گوندێن ڤێ ناحیێ ٧٢ گوندن، ناحیا گولی ژی ل سالا ١٩٢٥ێ هاتییە دانان و ل پێشیێ گوندێ دێمكا سەنتەرێ وێ ناحیێ بوو، لێ پاشی بۆ گوندێ بەهنوونێ پاشی بۆ گوندێ باتیفا هاتە ڤەگوهاستن كو دكەڤیتە باكوورێ رۆژهەلاتێ سەنتەرێ قەزا زاخۆ و هژمارا گوندێن ڤێ ناحیێ ٦٥ گوندن[١٧].

ل سەر كارگێرییا دادوەری ژی ل قەزا زاخۆ، پێكئینانا دادگەهان ل زاخۆ هەر ژ سالا ١٩٢١ێ هەتا سالا ١٩٥٨ێ ب ڤی ئاوایێ خوارێ بوو: دادگەها بەراهیێ، دادگەها شەرعی، دادگەها سزایێ، دادگەها پێكئینانێ، ئەڤە سەرباری فەرمانگەها(مەئموورییا) تاپۆیا زاخۆ كو ئێك بوو ژ یەكەیێن وەزارەتا داد.

هەروەسا ژ فەرمانگەهێن ل زاخۆ هاتینە دانان، ڤەكرنا تایێ فەرمانگەها گومرك و باجا رێك ویران (الكمرك و المكوس) بوو كو ل سالا ١٩٣٣ یێ سێ تا ل هەر ئێك ل بازێرێ زاخۆ و دورناخێ ل ناحیا سندی و پێشابیرێ ل ناحیا سلێڤانەیی ل سالا ١٩٣٦ێ هەبوون، هۆبا تووتنێ ژی كو ئێك بوو ژ فەرمانگەهێن رێڤەبەرییا گشتییا گومرك و باجا رێك ویران ل سالا ١٩٣٠ێ بۆ باشتركرنا چاندنا تووتنێ هاتبوو دامەزراندن، هەروەسا تا یان هۆبا فەرمانگەها تووتنێ ل زاخۆ هاتە ڤەكرن، ژ فەرمانگەهێن دی یێن ل زاخۆ هاتبوونە ڤەكرن، فەرمانگەها بەكاربرنێ (الاستهلاك) بوو، ل دۆر فەرمانگەها چاندنێ ژی، هاتییە گۆتن كو ل سالا ١٩٤٦ێ تایەكێ فەرمانگەها چاندنێ ل زاخۆ هاتییە ڤەكرن، ل سالا ١٩٤٧ێ ژی تایێ(هۆبا) فەرمانگەها زاخۆ بوو (فەرمانگەها چاندنێ)[١٨].

ل دۆر پێكهاتێن كارگێرییێن سەربازی و ئێمناهیێ ل سەردەمێ شاهینیێ (مەلكی) ل قەزا زاخۆ و بۆ پشتەڤانیكرنا هەلویستێ سیاسی ل مووسل كو تركیا داخوازا ویلایەتا مووسل دكر، هەروەسا ژ بەر تێكچوونا رەوشا كوردستانا باشوور و ژ بەر ڤێكنەكرنا تركی - بریتانی - عیراقی ل سەر وێ ویلایەتێ ل سالێن ١٩٢٢-١٩٢٥ێ و زێدەگاڤیێن وێ یێن بەردەوام ل سەر هندەك پشكێن دەڤەرێن سنووری نەخاسمە ژی ل سەر زاخۆ، حكومەتا عیراقی و بەریتانی هندەك یەكەیێن سەربازی هنارتنە زاخۆ و ئەڤ یەكە بهێزكرن و بنەجهكرن ل زاخۆ، ل سالا ١٩٢٣ یێ ژی دەنگ وباسەك بەلاڤ بوو كو تركیا هێزێن خۆ ل سەر سنووری كۆمكرینە و ل بەرە هێرشێ بكەتە زاخۆ، كو دەمی دو بەتالیۆنێن هێزێن پیادە ل دەڤەرا مووسل هەبوون و ئێك ژ وان ل زاخۆ و یا دی ل مووسل بوو.

ل هەیڤا چریا ئێكێ یا سالا ١٩٢٥ێ یەكەیێن لەشكەرێ عیراقێ ل دەڤەرا مووسل ل ناڤبەرا زاخۆ و مووسل هاتنە بەلاڤكرن، ل سەر دەڤەرا زاخۆ ژی، بەتالیۆنا سێ یا پیادە و سریا سنووری دو دەستەیێن (پۆلێن) كەتیبا هاشمی ل زاخۆ هاتنە بەلاڤكرن و ئەڤە هەمی وەك پەل و دەستە ل سەر سنووری هاتنە بەلاڤكرن كو وی دەمی ئەڤ هێزە نێزیكی چارێكا لەشكەرێ عیراقێ بوون، هەروەسا دەمێ ل سالا ١٩٣٣ یێ بزاڤا چەكدارییا ئاشووری هاتییە روودان، دیرەبوون ب درێژاهییا لێكدانێن خوینەلوویێن تەباخا وێ سالێ ل ناڤبەرا ئاشووریان و هێزێن عیراقێ هاتینە روودان، ببوو سەنتەرەك كو هێزێن عیراقێ سەربازگەهێن خۆ دانە وێرێ و چەندین چەپەرێن سەربازی لێ هاتنە دانان.

د شەرێ جیهانیێ دووێ دا، بریتانیا بریاردا بنگەهێن خۆ یێن بەرەڤانیكرنێ ل هژمارەكا وەلاتان ب هێزتر لێ بكەت كو ئێك ژ وان عیراق بوو و بریتانیا دەست ب هەلكۆلانا بەریەستێن بەرەڤانیێ ل زاخۆ كر و وێرێ بوو مەیدانا مەشق و راهێنانێن هێزێن بریتانی ل سەر نووترین هۆیێن شەركرنێ، هەروەسا بەتالیۆنا سنوورییا هژمارە (١) ل زاخۆ ژ لەشكەرێ عیراقێ بۆ پشتەڤانیكرنا تیپا هەشت یا هندی ل عیراقێ هاتە پێكئینان، پشتی داگیركرنا دووێ یا بەریتانی بۆ عیراقێ ل سالا ١٩٤١ێ، لایەنێن بەرپرسێن عیراقی ل بن گڤاشتنا بریتانی، هێزێن چەكدارێن عیراقی كێمكرن و گەلەك یەكە و پێكهاتێن لەشكەری هەلوەشاندن كو ئێك ژ وان بەتالیۆنا سنوورێ زاخۆ بوو، سەرباری ڤان هەمییان، ل سەردەمێ شاهینی (مەلكی) فەرمانگەها سەربازگیریێ (تەجنید) ل

زاخۆ هەبوو[٦٩].

ل سەر كارگێڕیا ئێمناهیێ ئانكو پۆلیسان ژی، ژ بەركو زاخۆ ئێك بوو ژ گرنگترین قەزایێن سنووری چونكی دكەڤیتە سێگۆشەیا سنووریا عیراقی - توركی - سوری، ژ بەر هندێ، حكومەتا عیراقێ گەلەك پۆلیسخانە دانانە سەر وی سنوورێ زاخۆ، ئەڤە ژی بۆ پاراستنا تەناهیێ ژ دەستێ دز و خرابكار و پشتەڕێیان ژ لایەكی و نەهێلانا قەچاغچیاتیا ل سەر سنووری دهاتە كرن ژ لایەكێ دیڤە.

هەر بۆ نموونە، ل سالا ١٩٣٥ێ هژمارا پۆلیسخانەیان (مەخفەران) ل زاخۆ گەهشتبوو ١٩ پۆلیسخانەیان كو ئەو ژی ل ڤان جهێن خوارێ بوون: سەنتەرێ قەزا زاخۆ، دورناخێ، شەرانش، بێرسڤێ، بەرخێ، دەشتتاخ، سناتێ، بەهنوونێ، سندی، مارسیس، هوریز ل ناحیا سندی، ئاسیهێ، گەلیێ زاخۆ، پێشابیرێ، هیتیان، ل ناحیا سلێڤانەیی، دێمكا، كەشانێ، نزدۆرێ، باتیفا، بەهنوونا گولییان ل ناحیا گولی، ئەڤە سەرباری كو هژمارا پۆلیسان ل هەمی ڤان پۆلیسخانەیان گەهشتبوو ١٥٣ پۆلیسان[٧٠]، هەروەسا ل سالا ١٩٥٧ێ بڕیار هاتەدان رێڤەبەرێن نوو بۆ پۆلیسێن قەزایێن لیوا مووسل، رێڤەبەریا پۆلیسێن لیوایێ بهێنە دانان، كو ئێك ژوان رێڤەبەریا پۆلیسێن دهۆك بوو كو سەرپەرشتیا قەزایێن دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ و شێخان دكر[٧١].

ل دۆر گرتیخانەیا زاخۆ ژی، ئەو ب گرتیخانەیەكا كەڤن دهێتە ل قەلەمدان و دزڤرێتە سەردەمێ ئۆسمانی كو ل نهۆما عەردی یا بۆرجە كەلا قشلەیا ل ناڤ بازێڕێ زاخۆ بوو[٧٢].

هەروەسا ژ وەرارێن كارگێڕیێن گرنگ یێن ل زاخۆ د كەرتێ ئێمناهیێ دا هاتینە رووداں، دانانا فەرمانگەها پاسەپۆرتان بوو ل پێشابیرێ ل سالا ١٩٣٦ێ، هاتییە گۆتن كو ژ بەر زۆریا هاتنا بیانییان بۆ مووسل و سەرباری زۆریا پۆلیسخانەیان، لێ ئێك ژ پێنگاڤێن دی یێن گرنگ یێن رێڤەبەریا پۆلیسان بۆ چاڤدێریكرنا سنووری، دانانا فەرمانگەها پاسەپۆرتان بوو ل پێشابیرێ و دامەزراندنا فەرمانبەرەكی بوو بۆ وێ فەرمانگەها گەلەك گرنگ[٧٣].

ئێك ژ فەرمانگەهێن دی یێن مۆرەكا خزمەتگوزاری هەی، فەرمانگەها بازرڤانیێ بوو كو ل سالا ١٩٢٠ێ ل زاخۆ هاتییە دامەزراندن و ئەوێن هەر ژ سالا ١٩٢١ێ هەتا ١٩٥٨ێ ئەڤ فەرمانگەهە ب رێڤە برین ئەڤێن ناڤێن وان ل خوارێ بوون:

١- محەمەد شەمدین ئاغا ١٩٢٠-١٩٢٤.

٢- حاجی محەمەد شەمدین ئاغا ١٩٢٤-١٩٥٨.

٣- حوسنی حەجی رەشید (نیڤا سالا ١٩٥٨ێ بۆ ماوێ چەند هەیڤەكان).

ل دووڤ یاسایا كارگێڕیا بازرڤانی هژمارە ٨٤ یا سالا ١٩٣١ێ، بازرڤانی بۆ چوار جۆران ل سەر بنەمایێ داهاتێ وان یێ سالانە هاتبوونە رێزبەند كرن و بازرڤانییا زاخۆ ژ جۆرێ سیێ یێ وان بازرڤانییان بوو[٧٤].

ل دۆر كارەبا زاخۆ ژی، ل ئادارا سالا ١٩٣٣ێ كارەب گەهشتییە وی بازێڕی[٧٥] و هاتییە گۆتن كو ل سالا ١٩٥٢ێ دەست ب پرۆژەیەكێ نوویێ كارەبێ ل زاخۆ هاتبوو كرن، (ئەڤ پرۆژە ژی دو مووەلیدان پێكدهێت، ئێك ژ وان ب هێزا ٣٠ كیلۆواتان و یا دی ب هێزا ٢٠ كیلۆواتان، لێ پرۆژە نەشێت كارەبێ بۆ هەمی ئاكنجییان و بۆ رۆهنكرنا جاددان دابین بكەت، ژ بەر هندێ، پێتڤییە مووەلیدەكا دی ب هێزا ١٠٠ كیلۆواتان بهێتە كڕین داكو تێرا بكەت)، هەر وێ سالێ ژی هژمارا پشكدارێن كارەبێ گەهشتە ١٩٦ پشكدارێن ب پیڤەر، لێ پشكدارێن ئاڤێ هژمارا وان ٢٧٧ پشكدارێن ب پیڤەر و ١٠٢ ئەو پشكدار بوون یێن پارەیەكێ ڤەبڕی ددان)[٧٦].

لێ فەرمانگەها پۆستە و تیلیگرافێ ل زاخۆ، د چارچۆڤێ گرێدانا سەنتەرێ مووسل و قەزا و ناحیێن وێ ب تۆرێن تێلەفۆنێ، ل سالا ١٩٣٦ێ فەرمانگەها پۆستە و تیلیگرافێ دەست ب گرێدانا هێلێن تێلەفۆنێ ل گەلەك دەڤەران كر كو ئێك ژ وان قەزا زاخۆ بوو و وێ سالێ هژمارا تێلەفۆنان ل وی بازێڕی گەهشتە ١٨ تێلەفۆنان كو پێنج ژێ ل سەنتەرێ قەزا زاخۆ و ١١ ل نك پۆلیسێن زاخۆ بوون، ل چریا

ئێکێ یا ساڵا ١٩٣٦ێ ژی دەستنیشانکرن و ڤەکرنا هێلەکا تێلەفۆنێ ل ناڤبەرا زاخۆ و ئاسیهێ سەنتەرێ ناحیا سلێڤانەیی هاتە ب جهئینان و دەست ب پەیوەندیێن تێلەفۆنی هاتەکرن. هەروەسا د چارچۆڤێ بەرفرەهکرنا تۆرێن تێلەفۆنێ ل لیوا مووسل، ل ساڵا ١٩٣٧ێ فەرمانگەها پۆستە و تیلیگرافێ دەست ب گرندانا هێلێن تێلەفۆنێ ل گەلەك دەڤەرێن لیوایێ کر کو سێ ژ وان دەڤەران ل قەزا زاخۆ ل سەنتەرێ قەزایێ و باتیفا و شەرانش بوون، هەروەکی هاتییە گۆتن کو ل سالێن پێنجییان ژی هێلەکا تێلەفۆنێ ل ناڤبەرا زاخۆ - دهۆك، زاخۆ - پێشابیرێ، زاخۆ و بنگەهێن پۆلیسان ل دورناخێ، شەرانش، باتیفا، گەلیێ زاخۆ و ل ناڤبەرا زاخۆ و جزیرێ ل کوردستانا باکوور هەبووینە، ئەڤە سەرباری هێلەکا تیلیگرافێ ل ناڤبەرا زاخۆ و ترکیا ژی[٧٧].

هەروەسا ژ فەرمانگەهێن دی یێن خزمەتگوزاری یێن ل زاخۆ هاتینە ڤەکرن، هەردو فەرمانگەهێن نفووس و ئەوقافێ و هۆبا فەرمانگەها ئاهێن خوارنێ بوون ئەڤە ژی پشتی گرفتارییەك د ئاهێن خوارنێ دا پەیدا بووی[٧٨] و بۆ کۆنترۆلکرن گرفتاریا ئابووری یا ل سالێن شەرێ جیهانیێ ئێکێ ل عیراقێ هاتییە روودان، حکومەتێ سیستەمێ فۆرمێن ئاهێن خوارنێ بۆ کرینا مادێن پێتڤی ب کارئینا، بریکارێ ئێکانە ژی ل زاخۆ بۆ دابەشکرنا ئاهێن خوارنێ (شەکر، تۆڤچا، پەرۆك ... هتد.) حەجی خدر عەبدلقادر سەعدوللا بوو و وی ئەو ئاهێن خوارنێ ب سەر بریکارێن دی دابەش دکرن و ڤان ژی ل دووڤ رێنماییێن حکومی ب سەر خێزانان دا دابەش دکرن[٧٩].

لێ د بیاڤێ خزمەتێن فێرکرن و ساخلەمیێ دا، هەر ژ ساڵا ١٩٢١ێ هەتا ١٩٥٨ێ ئانکو ل سەردەمێ شاهینی هژمارەکا باش یا خواندنگەهێن دەستپێکی و ناڤنجی و دواناوەندی یێن حکومی و تایبەت(اهلی) ل زاخۆ هاتنە ڤەکرن، هەر بۆ نموونە، پشتی دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ ل سالێن ١٩٢١-١٩٢٢ێ خواندنگەهەکا دەستپێکی ل زاخۆ هاتە ڤەکرن کو ئەو ژی خواندنگەها زاخۆ یا ئێکێ (مدرسە زاخۆ الاولی)یە یاکو ب (رێڤەبەریا خواندنگەها زاخۆ) دهاتە نیاسین، خواندنگەها نۆکەیا بۆتان، ئێکەمین خواندنگەها دەستپێکی یا تایبەت کو ئەو ژی خواندنگەها دەستپێکی یا ئەرمەن یا تێکەلە و ل ساڵا ١٩٤٩ێ ل زاخۆ هاتییە ڤەکرن، ئێکەمین خواندنگەها ناڤنجی یا تێکەل ژی ل ساڵا ١٩٥٢ێ ل زاخۆ هاتییە ڤەکرن (کو ئەو ژی خواندنگەها بەدرخان یا بنەڕەتییا کوڕان یا نۆکەیە)، ئێکەمین خواندنگەها ناڤنجی یا کچان ژی ل زاخۆ ل ساڵا ١٩٥٧ێ هاتییە ڤەکرن (یا پاشی ناڤێ وێ بوویە دواناوەندییا گەلاڤێژ)، هەروەسا ئێکەمین دواناوەندی ژی ل زاخۆ بۆ کوڕان ل ساڵا ١٩٥٨ێ هاتییە ڤەکرن[٨٠].

هەرچەندە ژی گەلەك خواندنگەهێن فەرمی ل زاخۆ هاتبوونە ڤەکرن، لێ هەڤدەم ئەو بازێڕ بێ ڤالا نەبوو ژ خواندنگەهێن ئایینی و ب درێژاهییا سەردەمێ شاهینی خواندن لێ یا بەردەوام بوو و زانستێن (عەقلی و نەقلی)یێن وەکی: بنەما، زمان و ئاخڤتن، زانستێ حوکمێن شەریعەتێ(فقه)، فەلسەفێ، ژیریێژی (منطق)، فەرموودە (حدیث)، بیرکاری، وشەسازی(صرف)، رێزمان(نحو)ێ و زانستێن دی یێن جودا جودا لێ دهاتنە خواندن[٨١]، کو ئێك ژ وان خواندنگەهان خواندنگەها زاخۆ ل مزگەفتا مەزن بوو[٨٢].

لێ د بیاڤێ خزمەتێن ساخلەمیێ دا، هەتا سالێن داویێ یێن چلان ل سەدساڵیا بۆری چ نەخۆشخانە ل زاخۆ نەبوون ژ بلی هندەك کلینیکێن ل قەزایێ هەبن، هەروەسا نووشدار ژی ب تنێ ل سەنتەرێ قەزایێ هەبوون و پتریا جاران ژی نۆژدارەك بوو، ل سەردەمێ شاهینی هژمارەکا سازیێن ساخلەمیێ ل زاخۆ هاتنە ڤەکرن، ژ وانا: کلینیکا زاخۆ یا شاهینی (کو ل ساڵا ١٩٢٢ێ هاتبوو ڤەکرن[٨٣]، فەرمانگەها ڤێتێرنەریا زاخۆ (ل ساڵا ١٩٣٣ێ هاتبوو دانان)، کلینیکا سندی (ل ساڵا ١٩٣٦ێ هەبوو)، کلینیکا گولی (ل ساڵا ١٩٣٦ێ هەبوو، کلینیکا هوریسك (ل ساڵا ١٩٣٨ێ هاتبوو دانان)، کلینیکا ئاسیهێ (ل ساڵا ١٩٣٨ێ هاتبوو دانان، نەخۆشخانەیا زاخۆ

(ل سالا ١٩٤٥ێ بڕیارا دانانا وێ هاتبوو دان و ل سالا ١٩٤٨ێ هاتە ڤەکرن) و کلینیکا سناتێ (ل سالا ١٩٥٧ێ هاتبوو دانان[٨٤].

ژ یا بۆری دیار دبیت کو حکومەتا عیراقێ یا سەردەمێ شاهینی گرنگی ب لایەنێ کارگێڕیێ زاخۆ دایە، ئەڤە ژی ژ بەر جهێ وێ یێ سنووریێ ستراتیژیێ گرنگ، هەرچەندە ژی ئەو کارگێڕی یا ڤالا نەبوو ژ نەرێنییان، هەر بۆ نموونە، پتریا فەرمانبەرێن زاخۆ وەکی دەڤەرێن دی کوردی عەرەب بوون و نە خەلکێ دەڤەرێ بوون کو ئەڤ راستییە ژی ژ لایێ بەلگەنامەیەکا بەریتانی ڤە هاتییە پشتڕاست کرن دەمێ گۆتی کو ل سالا ١٩٣٠ێ هژمارا فەرمانبەرێن کورد ل کوردستانا عیراقێ ٣٢٤ فەرمانبەر بوون ژ کۆما ٧٣١ فەرمانبەرێن حکومی یێن ل دەڤەرێ[٨٥].

هەر چەوان بیت، زاخۆ ل سەردەمێ شاهینی، ژ هەر باژێرەکێ دی یێ بەهدینان پتر گرنگیا خۆیا کارگێڕی هەبوو ئەڤە ژی ژ بەر تایبەتمەندیا جهـ و کارگێڕیا وی باژێری[٨٦].

ل سەر رەوشا کارگێڕی ل زاخۆ ل سەردەمێ کۆماری هەر ژ سالا ١٩٥٨ێ هەتا ١٩٩٠ێ، چ تشتێ وەسا نینە ئاماژە بیت بۆ پێشکەڤتن یان بەرفرەهبوون یان گرنگیدانێ ب لایەنێ کارگێڕیێ وێ قەزایێ د وی ماوەی دا، ئانکو پێکهاتێن کارگێڕی یێن ل سەردەمێ شاهینی هەبوون، ل سەردەمێ کۆماری ژی هەر ئەو بوون و ب تنێ گوهوڕینێن سڤک تێدا هاتینە کرن، وەکی هەلوەشاندن یان تێکەلکرنا دو فەرمانگەهان، هەر بۆ نموونە، پشتی کەڤتنا رژێما شاهینی، فەرمانگەها چاندنێ و تووتنێ هاتنە تێکەلکرن و ژ وان هەردوان فەرمانگەهەکا دی ب ناڤێ (فەرمانگەها چاندنێ) هاتە دانان[٨٧]، دشیاندایە بێژین ژی کو حکومەتا عیراقێ، بەرۆڤاژی سەردەمێ شاهینی، ژ ئەنقەست گرنگی ب لایەنێ کارگێڕیێ ڤێ قەزایێ نەدایە، چونکی ل سەردەمێ کۆماری و هەتا هەلبوونا سەرهلدانا کوردی ل کوردستانا باشوور ل ئادارا سالا ١٩٩١ێ، زاخۆ ببوو ئێك ژ گرنگترین سەنتەرێن بزاڤا نەتەوەیی یا کوردی ل دەڤەرا بەهدینان.

ل دۆر خزمەتێن حکومەتا عیراقێ ل سەردەمێ کۆماری پێشکێشی قەزا زاخۆ کرین، هندەك ئاماژە هەنە کو کارگێڕیا خۆجهیا پارێزگەها دهۆك پشتی ئەڤ باژێرە ل سالا ١٩٦٩ێ بوویە پارێزگەهـ و زاخۆ بوویە قەزایەکا وێ، گەلەك پرۆژە ب گوژمێ سەدان ملیۆن دیناران ب جهـ ئینانینە کو پرۆژێ ژ هەمیان گرنگتر ئاڤاکرنا یازدە گوندێن هەڤچەرخ بوو بۆ جۆتیاران ل هەردو قەزایێن زاخۆ و ئامێدیێ.

حکومەتا عیراقێ خالا سنووری یا ئیبراهیم خەلیل ژی ل قەزا زاخۆ پێشئێخست و ب هزاران دینار ل ئەنجامدانا ڤی کاری مەزاختن، هەروەسا تۆرێن ئاڤا ڤەخوارنێ ل زاخۆ باشتر لێ کرن و چوار ژوور ل سەر بیرێن ئیرتیوازی یێن دەڤەرا زاخۆ ئاڤاکرن، ئەڤە سەرباری ڤەکرنا تۆرێن رێیان ل زاخۆ بۆ پێکڤەگرێدانا دەڤەرێن وێ ژ لایێ رێڤەبەریا رێ یێن دهۆکێ ڤە، ژ وانا رێ یێن: هێزاوا - شەرانش، شەرانش - قەسرۆکێ - مێرگەشیش، قەسرۆکێ - بەهنوونێ، شەرانش - پیربلا - ملا عەرەبێ، ئیبراهیم خەلیل - پێشابیرێ - گرشینی، زاخۆ - ئیبراهیم خەلیل[٨٨].

ل دۆر گرنگترین پرۆژەیێن رێڤەبەریا ئەشغالا دهۆك د شەرێ ل ناڤبەرا عیراقێ - ئیرانێ یێ سالێن هەشتێ یێن سەدسالیا بۆری دا ل زاخۆ ئەنجامداین، ئەڤ پرۆژەیێن خوارێ بوون: نەخۆشخانەیەکا ١٠٠ تەختی، ئاڤاکرنا ئاڤاهیێ دادگەها زاخۆ، بنگەهەکێ سەرەکیێ ساخلەمیێ دگەل چوار خانییان ل دەرکار عەجەم ل زاخۆ، ئاڤاهیێ خواندنگەها ئامادەیی یا چاندنێ ل زاخۆ، خالا پشکنینێ یا سنووری ل زاخۆ[٨٩].

ژ یا بۆری دیار دبیت کو خزمەتگوزاریێن حکومەتا عیراقێ ل سالێن هەشتێ یێن سەدسالیا بیستێ ل زاخۆ ئەنجامداین، ئەو بوون یێن وی دەمی خزمەتا ستراتیژیا وێ حکومەتێ دکرن، نەخاسمە کو ژی حکومەت دگەل ئیرانێ د رەوشا شەری دا بوو و زاخۆ ژی دەڤەرەکا سنووری یا گرنگ و سەنتەرەك بوو کو یەکەیێن سەربازی یێن لەشکەرێ عیراقێ لێ بهێنە ئاکنجیکرن، هەروەسا پتریا رێ یێن هاتینە ڤەکرن

ژی، ل وان گوندێن سنووری بووینە یێن خەلکێ وان هاتییە مشەختکرن و بۆ هندێ بوو ڤەگوهاستن و هاتن وچوونا یەکەیێن لەشکەری لێ ب ساناهی بکەڤیت، ئانکو ئەو خزمەتگوزاری پێشکێشی زاخۆ کربوون یێن د خزمەتا وێ حکومەتێ دا بوون.

پشتی سەرهلدانا ئادارا سالا ١٩٩١ێ، ڤالاتییەکا کارگێری ل دەڤەرێن کوردی یێن سەرهلدای پەیدابوو کو ئێك ژ وان زاخۆ بوو ب تایبەت پشتی کو حکومەتا عیراقێ بریارا ڤەکێشانا فەرمانگەهێن کارگێری ل دەڤەرێن ژێر دەستەلاتێ بەرەیێ کوردستانی دای، لێ ب کار وخەباتێن بەرەیێ کوردستانی ل رۆژا ١٩٩٢/٥/١٩ێ ئێکەمین هەلبژارتنێن پەرلەمانی ل کوردستانا باشوور هاتنە کرن و ل رۆژا ١٩٩٢/٧/٤ێ ئێکەمین حکومەت ل کوردستانا باشوور هاتە پێك ئینان، ب ڤێ چەندێ ژی، دوبارە ب کار وخەباتێن خەلکێ دەڤەرێن کوردی، فەرمانگەهێن حکومی دەست ب کارێ خۆ کرنەڤە و ڤالاتیا کارگێری پر کرن.

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە کو ل ناڤبەرا سالێن ١٩٩٢-٢٠٠٠ێ، وەکی دەڤەرێن دی یێ کوردستانا باشوور، چ بەرفرەهبوون و وەرار نەکەڤتنە فەرمانگەهـ و سازێن حکومی یێن زاخۆ، ئەڤە ژی ژ بەر رەوشا سیاسی و ئابووری یا کوردستانا باشوور تێرا دبۆری، ژ بلی ڤەکرنا هندەك زانکۆ و پەیمانگەهێن زانستی کو دامەزراندنا وان تشتەکێ گەلەك یێ گرنگ بوو و دەڤەر پێتڤی وان بوو، ژ بەرکو خووندکارێن کورد نەدشیان ل زانکۆ و پەیمانگەهێن عیراقێ بەردەوامیێ ب خواندنا خۆ بدەن.

دشێین بێژین کو پشتی سالا ٢٠٠٠ێ ڤەژاندنەکا کارگێریا بەرچاڤ ل فەرمانگەهـ و سازی یێن حکومی یێن خزمەتگوزاری و د کەرتێن فێرکرن و ساخلەمی و ئێمناهی و کەرتێن دی دا پەیدا بوویە، دشیاندایە ژی گرنگترین پێکهاتێن کارگێری یێن زاخۆ ل ناڤبەرا ١٩٩٢-٢٠١٥ێ ب ڤی ئاوایێ خوارێ پۆلێن بکەین:

## ئێك: قائیمقامی:

هەر ژ سەردەمێ ئۆسمانی و هەتا نۆکە بلندترین سازیا کارگێرییە ل زاخۆ و هەر سێ ناحیێن رزگاری، دەرکار و باتیفا سەر ب قەزا زاخۆنە[٩٠] و قائیمقام ل سەرێ ڤی دەزگەهێ ئیدارییە، قائیمقامێن زاخۆ ژی هەر ژ کەڤتنا سیستەمێ شاهینی ل سالا ١٩٥٨ێ و هەتا داویا سالا ٢٠١٤ێ ئەڤێن خوارێن بوون: عەقید عادل جەلال، سالم عەبدلرەزاق ئەسعەد، محەمەد تاهر زەهاوی، جەلال بابان، نامق سوورچی، یاسین ئاکرەیی، سەباح عەبدلستار، عەدنان ئەحمەد فەتحی، عەبدلنەبی جەسام، سافی عەبدللەتیف، محەمەد نەجیب سەفەر، حەسەن داود سلێمان، موساوات حەسەن ئیسماعیل، محەمەد عەلی حسێن، خدر کەرکوکلی، نزار رەحمەتوللا عەبدلعزیز، محەمەد مەجید عیسا سلێڤانەیی، رەشید حسێن ئەحمەد، محەمەد حەسەن هاجانی، ئاخر شێخ جەمال[٩١]، قەیس عەبدلمەجید، حسێن خالد چەلکی و خەلیل مەحمود حاجی.

**خشتەیێ هژمارە (١)**[٩٢]

| سازێن حکومی | ناڤێ رێڤەبەری |
|---|---|
| رێڤەبەریا ساخلەمیا زاخۆ | قەرەنی سەعید عەبدوللا |
| رێڤەبەریا پەروەردێ | نەزیر یوسف تاهر |
| رێڤەبەریا ئەوقافێ | سەعید عەبدلرەحمان حەمید |
| رێڤەبەریا گەشت وگوزارێ | چیا ئەمین ئۆسمان |
| رێڤەبەریا کارەبێ | خالد سالح حەسەن |
| رێڤەبەریا چاندنێ | سەعید سەلمان فندۆ |
| رێڤەبەریا سایلۆیا زاخۆ | سەربەست عەبدلستار مووسا |
| رێڤەبەریا گەنجینێ | شەوکەت ئەحمەد محەمەد |
| رێڤەبەریا گومرکا زاخۆ | حەمید عەبدال عەلی |
| رێڤەبەریا چاڤدێریا جڤاکی | ئەحمەد محەمەد ئەحمەد |
| رێڤەبەریا رۆشنبیری و هونەری | دلخاز مووسا محەمەد |
| رێڤەبەریا شەهیدان و ئەنفالکریان | محەمەد حاجی ئەحمەد |

| | |
|---|---|
| رێڤەبەریا باجا خانووبەرەی | سالح عەبدلرەحمان تەیب |
| رێڤەبەریا باجا داهاتی | ئەحمەد جەمیل |
| رێڤەبەریا بازرڤانیا زاخۆ | بشار مونیب مەحمود |
| رێڤەبەریا ڤەگوهاستنێ | حەسەن ئیبراهیم تەمەر |
| رێڤەبەریا ئاڤا زاخۆ | هەوار عەبدلسەلام تاها |
| رێڤەبەریا خانەنشینییا زاخۆ | فازل عەبدوللا عوبەید |
| رێڤەبەریا ئاسایشا زاخۆ | فەرحان شەفیق عەلۆ |
| رێڤەبەریا راهێنانا پیشەیی | جۆتیار خدر تاهر |
| رێڤەبەریا توومارکرنا خانووبەرەی ل زاخۆ | یونس محەمەد ئەحمەد |
| فەرمانگەها بارێ شارستانی | دلێر ئەحمەد محەمەد |
| رێڤەبەریا ئامارا زاخۆ | رەمەزان سەعدی سلێمان |
| فەرمانگەها كەشناسیێ | شێرزاد حەسەن یۆنس |
| فەرمانگەها دادنڤیسییا زاخۆ | سەوسەن غازی عبدلئەمیر |
| فەرمانگەها دارستانێ | فوئاد حەسەن فەرمان |
| بجهئینەرێ دادوەری | خدر محەمەد حەسەن |
| سەنتەرێ ڤیتێرنەری | رەشید ئیسماعیل محەمەد |
| سەنتەرێ چاڤدێریا بازرگانی | داخاز حسێن عەبد |
| سەنتەرێ ڤەكۆلینێن چاندنێ | حسێن محەمەد عەلی |
| سەنتەرێ شوونواران | محەمەد ئەحمەد مستەفا |
| سەنتەرێ ئاهێن خوارنێ | خالد ئەحمەد محەمەد |
| پۆستە و گەهاندن | یوسف عەلی غازی |
| نڤیسینگەها مافێن مرۆڤی | موئەییەد جاسم محەمەد |
| سەنتەرێ وەرزش و لاوان | شەمدین عبدلرەحمان یوسف |
| پەرتووكخانەیا گشتی | عەبدلجەلیل خەلیل |
| تاپێ باخچە و دارستانان | ئیسلام سلێمان عەلی |
| هۆبا تاقیگەها ئاڤاهیيان | ولیەم تیۆدۆر ئەرمیا |
| نڤیسینگەها توندوتیژیا دژی ژنان | شڤان سەعدی ئۆسمان |
| بنكەهێ پۆلیسین كارەبا زاخۆ | رائد عەلی حاجی ئەمین |
| پشكا پۆلیسان | شەعلان ئەحمەد مستەفا |
| پشكا هاتن وچوونا زاخۆ | خەلات كامل محەمەد |
| پشكا بەرەڤانیا شارستانی | زیاد بەیار خەلیل |

| | |
|---|---|
| پشكا پۆلیسێن دارستان و ژینگەهێ ل زاخۆ | رائد شەعبان عەبدۆ محەمەد |
| بانكا خانووبەرەی | محەمەد زەكی عەبدلسەلام |
| بانكا خابوور | سەوسەن یوسف |
| بانكا هیزل | فەهمی ئیسماعیل رەمەزان |
| بانكا دەلال | ڤیان عەبدوللا سەعید |
| هۆبا ئاڤا ژێر عەرد | محەمەد یاسین عەبدوللا |
| هۆبا ئاڤدانێ ل زاخۆ. | سەلمان محەمەد جەهور |

## دو: سازیێن حكومەتێ ل زاخۆ:

ل ڤان سالێن داویێ بەرفرەهی و پێشكەڤتنەكا بەرچاڤ كەڤتە زاخۆ و چەندین سازیێن حكومی لێ هاتنە ڤەكرن، ئەڤە ژی پشتی قەزا بەرفرەهـ بووی و هژمارا ئاكنجییێن وێ زێدەبووی و پێتڤی ڤەكرنا ڤان سازیان بووی بۆ پركرنا پێتڤیێن ئاكنجییان و پێشكێشكرنا خزمەتگوزاییان بۆ خەلكی د بیاڤێن جودا جودا دا.

دشیاندایە د ڤی خشتەیێ خوارێ دا ئاماژەیێ بكەینە گرنگترین وان سازیێن هەتا داویا سالا ٢٠١٤ێ ل زاخۆ هاتینە ڤەكرن:

سەرباری یا ل سەر سازیێن حكومی یێن زاخۆ هاتییە گۆتن، دڤێت ئاماژەیێ بكەینە لایەنێ پەروەردەیی و فێركرنێ ژی ل وێ قەزایێ كو هەردو كەرتێن ناڤبری دو ئاڤاهیێن گرنگێن رابوون و پێشكەڤتنا زاخۆنە ژ لایێ زانستی و رۆشنبیری ڤە و رەنگڤەدانا خۆ ل سەر لایەنێن دی یێن ژیانێ هەنە.

تشتێ پەیوەندی ب لایەنێ پەروەردەیی ڤە هەی، وەرار و بەرفرەهییەكا بەرچاڤ كەڤتە هژمارا خواندنگەهێن بنەرەت و ئامادەیی، ئەڤە سەرباری باخچەیێن زارۆیان یێن حكومی و تایبەت، ئەڤە ژی ژ بەر زێدەبوونا هژمارا خووندكارێن قەستا خواندنێ دكەن، هەر وەكی دهێتە زانین، هژمارا خواندنگەهێن دەستپێكی و ناڤنجی و ئامادەیی و دواناوەندی یێن حكومی و تایبەت ل زاخۆ ل سەردەمێ شاهینی ٢٥

خواندنگە بوون[٩٣]، لێ ل دووڤ ئامارەکا ڕێڤەبەریا پەروەردەیا زاخۆ هژمارا وان هەتا داوییا سالا ٢٠١٤ێ ب ڤی ئاوایی بوویە: باخچەیێن زارۆیان (٦)، خواندنگەهێن بنەڕەت (١٤١)، ئامادەیی (٣٤).

ل سەر هژمارا خووندکاران ژی، هژمارا خووندکارێن باخچەیێن زارۆیان (١٧١٨ )خووندکار، خواندنگەهێن بنەڕەت (٦٦١٣٣) خووندکار، خواندنگەهێن ئامادەیی (١٦١٠٦٩) خووندکار[٩٤]، سەرباری خواندنگەهان، ل سالا ٢٠٠٠ ی پەیمانگەها ناوەندیيا مامۆستایان ل زاخۆ هاتە ڤەکرن کو سەر ب وەزارەتا پەروەردێ بوو، سەرباری ڤێ پەیمانگەهێ، ل سالا ٢٠٠٢ێ پەیمانگەها هونەری یا سەر ب وەزارەتا خواندنا بلند و ڤەکۆلینێن زانستی هاتە ڤەکرن و هەتا داوییا سالا ٢٠١٠ێ ژ نەهـ پشکێن زانستی پێك دهات، ژ وان پشکان: کۆمپیوتەر، رووبەر، دەرئێخستنا نەفتێ، ژمێرباری، ئامار.. هتد.[٩٥]، هەروەسا سەرباری یا هاتییە گۆتن، پێتڤییە ئاماژەیێ بکەینە ئاڤاهییەکێ دی یێ زانستیێ گرنگ ل دەڤەرا بەهدینان کو ئەو ژی پشتی زانکۆیا دهۆك، زانکۆیا زاخۆیە یا ل سالا ٢٠١٠ێ هاتییە ڤەکرن و هژمارەکا ڤاکۆلتییێن زانستی و مرۆڤایەتی ب خۆڤە دگریت.

## سێ: سنوورێ کارگێڕیێ قەزا زاخۆ:

ل دۆر سنوورێ کارگێڕیێ قەزا زاخۆ ل سەردەمێ کۆماری، لێ سەرباری گەڕیان و ڤەکۆلینێن مە کرین، نەشیاین نەخشەیێ کارگێڕیێ زاخۆ یێ وی سەردەمی ب دەست خۆ بێخین، چونکی ئەرشیفێ فەرمانگەهێن حکومی ل سەرهلدانا ئادارا سالا ١٩٩١ێ هاتبوو سۆتن و ژ ناڤبرن و بێسەرشوون ببوو، هەمی تشتێ ب دەست مە کەڤتی هژمارا تاخێن زاخۆ یا سالا ١٩٩٢ێ بوو کو ئەو تاخ دبنە توخیبێ کارگێڕیێ باژێرێ زاخۆ سەنتەرێ قەزایێ و هژمارا وان ١٩ تاخ بوون کو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە: ئاشتی، ئاشێ چەمی، سەلاحەددین، گوندك، فەلەیان، خابوور (تاخێ رویتا د بەرێ دا)، ئازادی (تاخێ جوهییان د بەرێ دا)، کێستە، بەدرخان (تاخێ حسێنیکێ د بەرێ دا)، رکاڤا، دەلال، نەورۆز، شۆرش، برایەتی، سەرهلدان، کاوە، خەبات، سێمالکا و مەهمەدیکێ، لێ پشتی بەرفرەهبوونەکا کارگێڕییا بەرچاڤ کەڤتیە هژمارا ئاکنجییێن زاخۆ، هژمارا خانی و ئاڤاهیێن وی باژێری زێدەبوو.

ب ڤێ چەندێ ژی هژمارا تاخێن زاخۆ زێدە بوو، نەخاسمە پشتی سالا ٢٠٠٣ یێ (کو پاشی دێ ئاماژە پێ هێتە دان) و هژمارا تاخێن وی باژێری هەتا سالا ٢٠١٤ێ گەهشتبوو ٤٦ تاخان و ئەو دبنە سنوورێ کارگێڕیێ باژێرێ زاخۆ هەروەکی فەرمانگەها پەیوەندیدار ل زاخۆ ئەو چەند رۆهن کری، هەر وێ فەرمانگەهێ ئەو زانیاری دانە مە کو هەتا نۆکە دشیاندا نینە سنوورێ کارگێڕیێ زاخۆ بهێتە دەستنیشان کرن، ئەڤە ژی ژ بەر بەرفرەهبوونا ل باژێری دهێتە روودان، ژ بەر زێدەبوونا هژمارا ئاکنجییێن زاخۆ.

هەر ٤٦ تاخێن باژێرێ زاخۆ ژی ئەڤێن خوارێ نە: بارزان، کۆمەلگەها بازرگانی، بێداری، ئاشێ چەمی، ئاشتی، سەلاحەددین، شەهیدان، کرامیل، زانکۆ، فەلەیان، ئازادی، خابوور، گوندك، رکاڤا، کێستە، بەدرخان، شەعبانیکێ، خەبات، نەورۆز، کاوە، برایەتی، دەلال، مەهاباد، جەلال سێمالکا، زاگرۆس، ئیلۆن، پێشمەرگە، گولان، وەلات، مەهمەدیکێ، ئەردەوان، شکەفتا مارا، سێمالکا، ئەیاز، جەگەرخوین، سنوور، تلکەبەرێ، هیزل، سەرهلدان، پیشەسازی، دریم ستی، نیو زاخۆ، دەشتمرا ژووری، دەشتمرا ژێری، ئەفرما، صلکا[٩٦].

ژ یا بۆری دیار دبیت کو سنوورێ باکوور و رۆژهەلاتێ زاخۆ بەرەڤ گوندێن دەڤەرا سندییان یێن ناحیا دەرکار عەجەم درێژ دبیت و سنوورێ باشوور و رۆژئاڤا ژی بەرەڤ گوندێن هەردو عەشیرەتێن کۆچەر و سلێڤانەیی یێن ناحیا رزگاری درێژ دبیت.

## پێكهاتا جڤاكی یا ئاكنجییێن زاخۆ هەر ژ سەردەمێ ئۆسمانی هەتا سالا ۲۰۱۵ێ:

دشیاندایە ئاكنجییێن قەزا زاخۆ هەر ژ سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی هەتا داویا سەردەمێ شاهینی د سێ جوونێن سەرەكی دا پۆلێن بكەین كو ئەو ژی ئەڤەنە، ئێك: جوونا عەشیرەتان، دو: جوونا خێزانێن زاخۆیی، سێ: جوونا شێخ و زانایێن ئایینی و وانەبێژ و مەلایێن مزگەفتان.

قەزا زاخۆ ئێكە ژ وان قەزایێن كوردی یێن هێشتا مۆرا عەشیرەتی ل سەر زاڵە ئەڤە ژی بەر زۆریا هژمارا ئەندامێن عەشیرەتێن وێ قەزایێ، عەشیرەتێن سەرەكی یێن زاخۆ سلێڤانەیی و سندی و گولی نە و عەشیرەتا سلێڤانەیی ئێكە ژ عەشیرەتێن مەزن یێن دەڤەرا زاخۆ و وارگەهێ وێ دكەڤیتە باشوورێ زاخۆ و ب خۆڕستێ خۆ ئێكە ژ عەشیرەتێن بنەجهـ هەروەسا ژندەر ئاماژە دكەنە وێ چەندێ كو عەشیرەتا سلێڤانەیی ئێكە ژ عەشیرەتێن كەڤنێن دەڤەرێ و هەبوونا وێ ڤەدگەڕیتە سەدساليیا ۱۹ێ بەری زایینێ، هەڤدەم عەشیرەتەكا مێرچاك و هێزدار (وكانت ذات بأس وشوكة تيرهبة المذهب والعقيدة)، هەروەسا هندەكان ژی ئاماژە كریە وێ چەندێ كو سندی و سلێڤانەیی دو عەشیرەتێن سەردەستێن دەڤەرا زاخۆ بووینە[97].

عەشیرەتا (سلێڤانەیی) خودان رووبەرەكێ جوگرافیێ بەرفرەهە و هەرچوار دەڤەرێن لهفێ(لێفێ، سینا، زێباریا و دودبادا) ب خۆڤە دگریت و ناحیەك ب ناڤێ وێ هاتە دانان كو سەنتەرێ وێ گوندێ ئاسیهێ یە[98] و هەر وەكی هاتییە گۆتن، هژمارا خێزانێن وێ ل سالێن پێنجییان ل ناڤبەرا ۳۰۰۰-٤۰۰۰ خێزانان بوو و ب سەر هژمارەكا تا و ئۆجاخان دا دابەش دبیت كو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە: خێزانا (شەمدین ئاغا، ئاغا شەمسان - شەمسكان)، تركژان، بابلا، مالا

پرا دەلال



ئاتی (مالا عەتێ)، مالا مەلە تەیب) و ناڤدارترین گوندێن وان ژی ئەڤ گوندەنە: ئاسیهێ، ئەرمشتێ، باڤیان، بالقۆسێ، دێرەبوونێ، قەرەقۆلا، صۆریا و .. هتد، هەروەسا تایێن عەشیرەتا ئەرتووشی (کۆچەر) و مەسیحی (کلدان و ئەرمەن) و ئێزدی ل ناڤ خەلکێ ڤێ عەشیرەتێ ئانکو ل دەڤەرا سلێڤانەییان دژین[99].

ل دۆر عەشیرەتا (سندی) ژی، هندەکان ئاماژە کریە وێ چەندێ کو ناڤێ ڤێ عەشیرەتێ ب لێڤکرنا (زندی) د رووداڼێن سالا ٤٠٥ێ زایینی دا هاتییە، لێ هندەکێن ئاماژە ب وێ چەندێ دکەن کو ئەڤ ناڤکرنە د بنکۆکا خۆ دا (صندی) بوویە و رامانا وێ ب عەرەبی (الوتد القوی الذی لا یهتز) ئانکو ب کوردی (سنگێ هێزدارێ ناهژیێت)ە، هەروەسا هاتییە گۆتن کو هندەك دیتن وبۆچوونێن دی ژی ل سەر رەهـ وریشالێن ڤێ عەشیرەتێ هەنە، هەر بۆ نموونە هندەکان ب (سند) ل قەلەمدایە و هندەکێن دی ژی بنەکۆکا وان زڤراندیە ئارییان، لێ هەر چەوان بیت، عەشیرەتا سندی ئێکە ژ کەڤنترین هەر چوار عەشیرەتێن کوردی یێن دەڤەرا بەهدینان[100].

عەشیرەتا سندی رووبەرەکێ جۆگرافیێ بەرفرەهـ هەیە، ژ باشوور بازێرێ زاخۆیە و ژ باکوور ژی سنوورێ ترکیایە، هەروەسا رووبارێ هێزل سنوورێ رۆژئاڤا و عەشیرەتا گولی سنوورێ باشوورێ وێ عەشیرەتێ یە.

مارك سایکس یێ ل دەستپێکا سەدسالییا بیستێ سەرەدانا کوردستانا باکوور و باشوور کری، ئاماژە کریە وێ چەندێ کو وی دەمی عەشیرەتا سندی ١٥٠٠ خێزان بوو و عەشیرەتەکا تێکلەیە ژ موسلمان و مەسیحییان و جوونا دووێ کێمینەیە[101].

عەشیرەتا سندی ژ چەند ئووجاغەکان پێك دهێت کو چ ژ وان پەیوەندییا مرۆڤاینیێ دگەل ئێك نینە و هەمی نە ژ ئێك بابینن، بەلکی دەڤەرا ئاکنجیبوونێ و دەستەلاتا عەشیرەتی ئەو لێك کۆمکرینە، ژ ئووجاغێن عەشیرەتا سندی: (پس ئاغا (پساغا)، مجولی، بەنستانی، بۆسەلی، شەرانشی، ئال عەجەم، شیڤ ئەرمەنی، شێخ ئێزدینی، جونکی، نیری، بەرخی، مندۆزا، بالك، سۆفی بابلا) و ناڤدارترین گوندێن عەشیرەتا سندی ئەڤێن خوارێ نە: (شەرانش، دارهۆزانێ، دەرکار عەجەم، هیزاوا، قەسرۆکێ، بۆسەلێ، هەڤشنێ، بێرسڤێ ...)[102].

لێ مارك سایکس ل دەستپێکا سەدسالییا بیستێ عەشیرەتا (گولی) وەك عەشیرەتەکا خۆسەر بەحس نەکریە، بەلکی وەك ئووجاغەکا عەشیرەتا سندی بەحس کریە و گۆتییە کو وی دەمی ژ ٣٠ خێزانان پێك دهات، هەروەسا هندەکێن دی ژی پشتراست کرینە کو عەشیرەتا گولی د بنەکۆکا خۆ دا ئووجاغەك بوویە ژ ئووجاغێن عەشیرەتا سندی، لێ هندەکێن دی گۆتینە کو عەشیرەتا گولی عەشیرەتەکا خۆسەرە و نە ئووجاغەکە ژ عەشیرەتا سندی، لێ ژ بەر هەبوونا پەیوەندیێن موکم ل ناڤبەرا هەردوان و ژ بەر لێکنێزیکییا دەڤەرێن وان هەردەم وەسا هاتینە دیتن کو ئێك عەشیرەت بن، وەسا دیارە ژی ئەڤ دیتن وبۆچوونە پتر نێزیکی ژیواری بیت، چونکی دەڤەرێن سندی و گولییان هەر ژ سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی و هەتا پشتی دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ ل سالا ١٩٢٥ێ، وەك ئێك ناحیە ب ناڤێ ناحیا (سندی - گولی) دهاتنە ب رێڤەبرن.

عەشیرەتا گولی ژی ل باکوورێ بازێرێ زاخۆ ئاکنجییە، عەشیرەتا سندی توخیبێ وێ یێ رۆژئاڤا و رووبارێ خابوور توخیبێ وێ یێ رۆژهەلاتە، هەروەسا عەشیرەتا دۆسکی دبیتە توخیبێ باشوور و عەشیرەتا گۆیان ژی دبیتە توخیبێ وێ یێ باکوور.

عەشیرەتا گولی ژ هژمارەکا ئووجاغان پێك دهێت کو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە: (کەشانی، بلیجانی، بێجانی، بەهنوونێ، سیل، نـزۆری) و ئووجاغێن عەشیرەتا گولی ژی وەکـی عەشیرەتا سندی بنەکۆکا وان ئێك نینە، بەلکی هەر ئووجاغەك یا خۆسەرە، بەلکی گولیاتیێ ئەو لێك کۆمکرینە و کورد ژی پتریا جاران ب ناڤێ وێ عەشیرەتێ دهێنە ناڤکرن یا تەڤلی دبن و دبنە ئێك ژ ئەندامێن وێ، ناڤدارترین گوندێن عەشیرەتا گولی ئەڤێن خوارێ

نە: (بەهنوونێ، کەشانێ، باتیفا، دێمکا، زرێزە و .. هتد)، هەروەسا کێمینەیەکا مەسیحی ژی د ناڤ عەشیرەتا گولی دا هەیە.

سەریاری ڤان هەر سێ عەشیرەتێن سەرەکی یێن زاخۆ یێن مە بەحس کرین، هندەك ئووجاغێن عەشیرەتا ئەرتووشی ژی ل زاخۆ دژیان کو هندەك ژ ئووجاغێن وێ دکۆچەر بوون، هندەکان ژی ئاماژە کریە وێ چەندێ کو پشتی ل سالا ١٩٢٦ێ نەخشەیێ توخیبی ل ناڤبەرا عیراقێ و ترکیا ب تمامی هاتییە کێشان، پتریا چەروانێن عەشیرەتا ئەرتووشی یا کۆچەر کەڤتنە ناڤ توخیبێ ترکیا، ژ بەر هندێ، وێ عەشیرەتێ دەست ژ ژیانا کۆچەریێ بەردا و ئاکنجی بوو و ل هژمارەکا دەڤەرێن کوردستانێ لێك خرڤەبوون و دەست ب کار و پیشەیێن جودا جودا کرن.

ئووجاغێن عەشیرەتا ئەرتووشی ل هژمارەکا گوند و ناحیە و قەزایێن زاخۆ و دهۆك و شێخان و دەڤەرێن دی ئاکنجی بوون، لێ ل ڤێرە تشتێ بۆ مە گرنك ئەوە ئەم ئاماژەیێ بکەینە ئووجاغێن ڤێ عەشیرەتێ یێن ل قەزا زاخۆ ئاکنجی بووین.

دشیاندایە بهێتە گۆتن کو ئووجاغێن ڤێ عەشیرەتێ ب سەر دو ناحیان دابەشبووینە، یا ئێکێ: ناحیا گولی کو ژ ئووجاغا (صەیدا)یە یا ل سەر رووبارێ خابوور ل باکوورێ زاخۆ ئاکنجی بووی و ئەو ژی دبیتە دو ئووجاغێن چەمانی و ئۆدیان، ئووجاغا چەمانی ل گوندێن بەرزیرکێ، کۆفکێ، زێوکێ و مێزکێ و ئووجاغا ئۆدیان ژی ل هەرکەندێ و بلدێشا ئاکنجی ببوون، هەروەسا هندەکان ئاماژە ب وێ چەندێ کریە کو وی دەمی زێدان(زێدکا) ژ ٣٤ خێزانان پێك دهات و ل زڤستانێ ل دەڤەرا گولییان و ل هاڤینێ ل گوندێ فەراشینێ (ل کوردستانا باکوور) دژیا، ئەڤە ل وی دەمێ هەردو ئووجاغێن هاجان و زێوکێ ل گوندێن ناحیا سلێڤانەیی جهوار ببوون، هندەك خێزانێن ئووجاغا ئێکێ ل گوندێن دکەڤنە پشکا رۆژهەلاتێ یا دەشتا سلێڤانەیی کو دبێژنێ (سینا) و هندەکێن دی ژی ل گوندێن دەڤەرا (لهفێ یا لێفێ) ل خوالش، گرزێوکێ و چەم باهیڤ ئاکنجی ببوون، لێ ئووجاغا زێوکی ل هژمارەکا گوندان ئاکنجی ببوون ژ وانا: (حەسەن ئاڤا، صلکا، ئافرما، چەم زراڤ، باجۆکا، دەشتمرا ژۆری، دەشتمرا ژێری، خرابداری)[١٠٣].

لێ جوونا دووێ یا پێکهاتا جڤاکی یا زاخۆ ژێ پێك دهێت جوونا خێزانێن(مالێن) زاخۆیی یە، ئەڤە ژی ئەون یێن گەلەك ژ مێژە ل زاخۆ جهوار بووین و ل سەردەمێ شاهینیێ ل هەر یازدە تاخێن زاخۆ ئاکنجی ببوون کو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە: (تاخێ کندك، تاخێ رۆتا، تاخێ قەسابان، تاخێ بازاڕی (سووکێ)، تاخێ فەلەیان، تاخێ شەمدین، تاخێ حسێنیکێ، تاخێ کێستە، تاخێ گۆییان، تاخێ عەباسیکێ، تاخێ رکاوە (رکاڤا).

هندەك ژ ڤان خێزانان ب ناڤێ وی پیشەیێ یان سنعەتێ ژ باب و باپیران بۆ مابن دهاتنە نیاسین، وەکی: مالا جغسی (چاککەرێن چەکی)، مالا گازچی، مالا گۆشتفرۆشان (قەسابان)، مالا نەجاران (دارتاشان)، مالا سەفاران (سفرگران)، مالا بەزازان (پەرۆکفرۆشان)، مالا حەدادان، مالا شەکرچی (چێکەرێن شرینییان)، مالا رەزڤانان، ئەڤە ل وی دەمێ هندەك خێزانێن زاخۆیی ب ناڤێ باپیر یان داپیرێ دهاتنە نیاسین، هەر بۆ نموونە، ئەوێن ب ناڤێ باپیری دهاتنە نیاسین ئەڤێن خوارێ بوون: (مالا جنێدی، مالا عەلی ئەحمکێ، مالا سەعدوللای، مالا حەجی عەبدولحەلیمی، مالا عیساوی، مالا قوچا بەگێ، مالا سمێ مراد، مالا سلۆ شەعبانی، مالا محۆ خەلیلا، مالا قادرێ سۆر، مالا ئینسێ محۆ نعمەتا، مالا هیدایەت، مالا سالح سەعدی، مالا حسێن بەگێ، مالا حاجی، مالا خەلەفا، مالا دربازی، مالا نەسیما، مالا سەید عەزیزی، مالا عارف مەمۆ، مالا زەرۆ، مالا ئیسماعیل ئەفندی).

لێ خێزانێن زاخۆیی یێن ب ناڤێن داپیران دبەرنیاس بوون، ژ ناڤێن وان ژنێن ناڤدار هاتینە یێن ب چاڤنەترسی، یان شارەزایی، یان پێگەهێ وان یێ جڤاکی یان ئابووری و.. هتد، دبەرنیاس بوون، وەکی: مالا عەلەمێ کو دزڤریت بۆ ناڤێ (عەلەم)ا داپیر، مالا حەفسێ کو دزڤریت بۆ ناڤێ (حەفسێ)یا داپیر،

(مالا درێ) کو دزڤڕیت بۆ ناڤێ (درێ یا دریە)یا داپیر و مالا موومێ کو دزڤڕیت بۆ ناڤێ (موومێ)یا داپیر.

سەرباری ڤان خێزانێن مە گۆتین، هندەك خێزانێن دی یێن زاخۆیی ژی ل زاخۆ ئاکنجی بیوون و ب هندەك ناڤێن دی دهاتنە نیاسین وەکی: مالا سێرانێ و مالا قازی[١٠٤].

لێ جوونا سێ یا پێکهاتا جڤاکی یا خەلکێ زاخۆ، جوونا خێزانێن شێخێن رێبازێن ئایینی و زانایێن ئایینی وانەبێژ و مەلایێن مزگەفتانە کو پێگەهەکێ جڤاکیێ هەژی و بلند هەبوون و حکومەتێ و خانەدان و خەلکێ ئاسایی رێز ل پەیڤا وان دگرت، یێن ژ هەمیان دیارتر ژی ئەڤێن خوارێ بوون: مالا شێخ یوسفێ زاخۆیی کو ئێك بوو ژ شێخێن رێبازا نەقشبەندی، مالا شێخ عەبدلقادر کو ئێك بوو ژ شێخێن رێبازا قادری، لێ دیارترین زانایێن ئایینی ژ وانەبێژ و مەلایێن مزگەفتێن زاخۆ ئەڤێن ناڤێن وان خوارێ بوون: مەلا یونسێ زاخۆیێ، مەلا ئەحمەد عەبدلخالق ئاکرەیی[١٠٥].

هەروەسا ل ناڤبەرا سالێن ١٩٢١-١٩٥٨ێ و بەری هنگی ژی هژمارەکا خێزانێن مشەخت، ژ وانا هندەك خێزانێن کوردێن کوردستانا باکوور و هندەك خێزانێن عەرەبێن مووسلی ژ عەشیرەتا شەرابی و ژ عەشیرەتێن دی ل زاخۆ ئاکنجی بیوون کو پالدەرێ ئابووری هۆکارێ سەرەکیێ مشەختبوون و ئاکنجیبوونا پتریا وان خێزانان بوو بۆ زاخۆ و ئارمانجا هندەکان باشترکرنا رەوشا خۆ یا ئابووری و یا هندەکێن دی مفاکرن و زێدەکرنا پارێ خۆ بوو ل وی بازێڕی داکو ب وی پارەی وەبەرهێنانێ د بیاڤێ بازرگانی دا بکەن، هەروەسا سەرباری پالدەرێ ئابووری، هۆکارێن سیاسی ژی بۆ مشەختبوونا گەلەك ژ وان خێزانێن کوردێن کوردستانا باکوور بۆ زاخۆ هەبوون.

ب ڤی ئاوایی، ئەو خێزانێن کوردی یێن مشەختبووینە زاخۆ و لێ جهوار بووین و پاشی بووینە پشکەك ژ پێکهاتا وێ یا جڤاکی و نوکە ژی پشکەکن ژ وێ

زاخۆ



پێكهاتێ، ب تمامی تێكەلی جڤاكێ زاخۆیی بووینە و پەیوەندیێن جڤاكی دگەل خەلكێ زاخۆ گرێداینە، نەخاسمە ژی پەیوەندیێن خزمانی و مرۆڤانیێ كو ئەو خێزان ژ هژمارەكا دەڤەرێن كوردستانا باكوور یێن وەكی باشكالا، جزیرا بۆتان، سلۆپی، و شرنەخێ و دەڤەرێن دی هاتبوونە زاخۆ[106] و لێ ئاكنجی ببوون، ژ وانا: مالا خالد عەلی، مالا یەعقووب یوسف، مالا هەمزە عەبدوللا، مالا زبێر قۆلچی، مالا مەحمود حسۆ، مالا ئەحمەد تاهر جزیری، مالا عەلی جزیری، مالا سالح جزیری و یێن دی.

هەروەسا ژ خێزانێن مووسلی یێن ل سەردەمێ شاهینی هاتینە زاخۆ و لێ ئاكنجی بووین ئەڤێن خوارێ بوون: مالا جەوادی، مالا تاها قەساب باشی، مالا سەید حەسەن، مالا ئیسماعیل عەوواش، مالا جارەللا مالەللا، مالا شەهاب برهاوی و چەندین مالێن دی، لێ خێزانێن عەشیرەتا شەرابی یێن ل زاخۆ ئاكنجی بووین خێزانێن عابد و سالح و عەبۆ شەرابی بوون[107].

هەروەسا پێتڤییە ئاماژەیێ بكەینە وێ چەندێ كو ل ناڤ ڤان هەمی جوونان، تەخا سەرۆك و خانەدان و ماقوول و خەلكێ ئاسایی یێ جۆتیار و پیشەكارێن خودان داهاتێن سنووردای و هەژار و یێن دی ژی هەبوون.

لێ ل سەر پێكهاتا جڤاكیا خەلكێ زاخۆ هەر ژ سالا ١٩٦١ێ هەتا ٢٠١٤ێ، دشێین بێژین كو ژ بەر رەوشا سیاسیا عیراق ب گشتی و كوردستان ب تایبەتی تێرا بۆری، سەرباری رەوشا سیاسیا دەولەتێن هەڤسوویێن عیراقی و كوردستانێ ژ وانا تركیا و سوریا و ژ بەر جهێ زاخۆ یێ جوگرافیێ سنووری و نێزیكیا وی بازێری ژ وان هەردو دەولەتان، گوهورینەكا مەزن كەڤتییە پێكهاتا جڤاكیا خەلكێ زاخۆ و ئەڤ بازێرە هەر ژ كەڤندا و هەتا نۆكە ژی بوویە سەنتەرەك بۆ هاتنا مشەخت و ئاوارەیان ژ هەردو دەولەتێن ناڤبری و ڤێ چەندێ كاریگەریا خۆ ل سەر پێكهاتا وێ یا جڤاكی هەبوویە، هەروەسا سەرباری جهێ زاخۆ یێ جوگرافی، تشتێ دی یێ زاخۆ ژ دەڤەرێن دی جودا دكەت، خۆرست و سنج و رڤشتێ خەلكێ وێ یە د مەسەلەیێن لێبۆرین و و ڤیان و قەبوولكرنا یێ بیانی و درێژكرنا دەستێ هاریكاریێ بۆ هەر بیانییەكی ژ هەر ئایین و نەتەوەیەكی بیت[108].

یا گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە كو دشێین قووناغێن گوهورینا پێكهاتا ئاكنجیێن زاخۆ (بازێرێ زاخۆ سەنتەرێ قەزایێ) و سەرانسەری قەزایێ ب سەر چوار قووناغان دا دابەش بكەین:

قووناغا ئێكێ: ژ ١٩٦١-١٩٧٧ دەست پێ دكەت ئانكو د شۆرشا كوردی یا كوردستانا باشوور (شۆرشا ئیلۆنێ) دا، ژ بەركو زاخۆ ئێك بوو ژ سەنتەرێن شۆرشێ، نەخاسمە ژی گوند وناحیێن وێ كو دەستپێكا هەلبوونا شورشێ ژ زاخۆ دەست پێ كر بوو، كو ئەڤە ژی ژ بەر وێ سیاسەتێ بوو یا وی ماوەی حكومەتێن عیراقێ یێن ئێك ل دووڤ ئێك ب كار دئینا و و ژ لایێ كارگێری و ئابووری ڤە گوند و ناحیێن زاخۆ پشتگوهڤەدهاڤێتن، ئەڤە سەرباری بومبەبارانكرن و كاڤلكرنا وان دەڤەران، خەلكێ ناحیا سندی - گولی نەچار ببوون دەڤەرێن خۆ بهێلن و قەستا بازێرێ زاخۆ بكەن و لێ ئاكنجی بن، ئانكو دشێین بێژین د ڤێ قووناغێ دا گوهورین كەڤتبوو پێكهاتا جڤاكیا بازێرێ زاخۆ ب تنێ و عەشیرەتێن زاخۆ و خێزان و مالێن ئاكنجیێن زاخۆ تێكەلی ئێك بوون.

هەروەسا پشتی ئیمزاكرنا رێككەڤتنا جەزائیر یا سالا ١٩٧٥ێ و شكەستنا شۆرشا كوردی، ئاكنجیێن ٦١ گوندێن سلێڤانەیی و خەلكێ هەمی گوندێن كەمەرا سنووری ل دەڤەرا سندی و گولی هەتا داویا سالا ١٩٧٧ێ هاتنە ڤەگوهاستن و پتریا خەلكێ وان دەڤەران ل ناڤ بازێرێ زاخۆ ئاكنجی بوون.

قووناغا دووێ: ئەڤ قووناغە ژ سالێن ١٩٨٨-١٩٩١ێ دەست پێ دكەت، ئانكو پشتی شەرێ عیراقێ - ئیرانێ و دەستپێكرنا هەوێن ئەنفالان ژ لایێ حكومەتا عیراقێ ڤە كو وان هەوان كاریگەرییەكا

گەلەك مەزن ل سەر دەڤەرێن سنووری هەبوون، نەخاسمە ژی ل سەر هەردو ناحیێن سندی و گولی و دەڤەرێن قەدەغەکری کو حکومەتێ ئەو گوندێن سنووری کربوونە گوندێن قەدەغەکری و ب بەهانا حەواندنا هێزێن پێشمەرگەیێ کوردستانێ گەفا کوشتنێ ل خەلکێ وان گوندان دکر، ژ بەر هندێ، پشکەکا خەلکێ وان گوندان کو پتریا وان ژ هەردو عەشیرەتێن سندی - گولی بوون، نەچار بوون ئاوارە ببن و قەستا باژێرێ زاخۆ بکەن و پشکا دی ژی کو پتریا وان خێزانێن پێشمەرگەی بوون، ل بن کیمیاباران و تۆپبارانێ نەچار بوون مشەخت ببن و قەستا ئیرانێ و ترکیا بکەن، ئەڤ ژ لایەکی، ژ لایەکێ دیڤە ژی، سیاسەتا عەرەبکرنێ یا حکومەتا بەعس ل دەڤەرێن کوردی ب کاردئینا و ئاوارەکرنا خەلکێ وان دەڤەران کو ئێك ژ وان دەڤەرا سلێڤانەیی بوو، خەلکێ وان نەچاربوو گوندێن خۆ بهێلن و ل زاخۆ ئاکنجی ببن.

قووناغا سیێ: ئەڤ قووناغە ژ سالێن ۱۹۹۱-۲۰۰۳ێ دەست پێ دکەت ئانکو ژ هەلبوونا سەرهلدانا کوردی ل کوردستانا باشوور ل ئادارا سالا ۱۹۹۱ێ و هەتا ئێخستنا رژێما سەددامی ل نیسانا سالا ۲۰۰۳ یێ، جوداهیا ل ناڤبەرا ڤێ قووناغێ و هەردو قووناغێن دی ئەوە کو ڤێ قووناغی کاریگەریەکا مەزنتر ل سەر گوهۆرینا پێکهاتا جڤاکیا ئاکنجیێن زاخۆ هەبوویە، نەخاسمە ژی کو تێکەلبوونەك ل ناڤبەرا عەشیرەت و خێزانێن رەسەنێن زاخۆیی و پەنابەرێن کوردێن ژ ترکیا و ئیرانێ و هەتا یێن ژ دەولەتێن ئەورۆپی ژی هاتین پەیدا کریە.

قووناغا چوارێ: قووناغا چوارێ ژ سالێن ۲۰۰۳-۲۰۱۵ێ دەست پێ کریە و د ڤێ ماوەی دا چەندین خێزانێن کورد و عەرەب یێن مووسل و پارێزگەهێن ناڤەراست و باشوورێ عیراقێ ژ بەر ئالۆزیا رەوشا سیاسی ل وان پارێزگەهان پشتی سالا ۲۰۰۳ێ ئاوارەی زاخۆ بووینە ئەڤە سەرباری ب سەدان خێزانێن کوردی یێن ژ کوردستانا رۆژئاڤا پشتی هەلبوونا شۆرشا سوریا ل ئادارا ۲۰۱۱ێ پەنابرینە زاخۆ، هەروەسا ب سەدان خێزانێن کوردی و مەسیحی یێن مووسل و ب سەدان خێزانێن ئێزدی و موسلمانێن شنگال ئاوارەی زاخۆ بووینە پشتی رێکخراوا تیروریستیا دەولەتا ئیسلامیا عیراقێ ل شامێ و عیراقێ یا بەرنیاس ب (داعش) ل ناڤبەرا خزیران - تەباخا ۲۰۱٤ێ هاتییە ناڤ مووسل و شنگال و ناحیێن وێ، ژ بەر هندێ، چەندین کەمپ بۆ وان ئاوارێن هاتینە زاخۆ هاتنە ڤەکرن، ژ وانا: کەمپا بێرسڤێ، چەم مشکۆ و یێن دی، هەرچەندە ژی کاریگەریا وان ئاوارەیان ل سەر پێکهاتا جڤاکیا خەلکێ زاخۆ کاریگەریەکا بەروەختە و هەردەمێ رەوشا دەڤەرێن وان باش ببیت، دور نینە ڤەگەڕێنە دەڤەرێن خۆ، لێ ل پاشەرۆژێ دێ کاریگەریا خۆ ل سەر تەڤنێ جڤاکیێ خەلکێ زاخۆ هەبیت[۱۰۹].

## پێکهاتا ئەتنیکی و وەرارا دیمۆگرافی یا ئاکنجیێن زاخۆ هەر ژ سالێن داویێ یێن سەردەمێ ئۆسمانی هەتا سالا ۲۰۱۵ێ :

قەزا زاخۆ ب پێکهاتا ئەتنیکیا خۆیا هەمەڕەنگ یا فرەئایین و رێباز، سەرباری هەبوونا کێمینەیەکا نەتەوەیی یا ئەرمەنی، ژ دەڤەرێن دی یێن بەهدینان دهێتە جودا کرن، دبیت ئەڤە ژی ژ بەر جهێ وێ سنووری و گرنگیا وێ یا ئابووری بیت.

دشیاندایە پێکهاتێن ئەتنیکی یێن زاخۆ زێدەباری پرانییا موسلمان ل دووڤ زۆرینەیێ ل سەردەمێ شاهینی (۱۹۲۱-۱۹۵۸) ی ب ڤی ئاوایی بهێنە رێزبەند کرن: ئێك: جوهی، دو: مەسیحی (کلدان، سریان، ئاشووری، ئەرمەنی)، سێ: ئێزدی. جوهیان هەبوونا خۆ ل پتریا دەڤەرێن کوردستانا باشوور هەبوو، ژ وانا ل دەڤەرا زاخۆ ژی، ل دووڤ زانیاریێن ل بەر دەستێ مە، ئەو ل قەزا زاخۆ ل سەنتەرێ باژێرێ زاخۆ، شەرانش، تلکەبەرێ ئاکنجی بووینە، لێ پتریا مەزن یا جوهی

یێن زاخۆ ل ناڤ سەنتەرێ بازێرێ زاخۆ ل تاخەکێ تایبەت ب وان یێ ب ناڤێ (تاخێ جوهیان) بەرنیاس ئاکنجی بووینە و وان دو پەرستگەهـ ل قەزا زاخۆ هەبوون کو یا ئێکێ ل شەرانش و یا دووێ ل تاخێ جوهیان ل زاخۆ بوو.

جوهی ماوێ چەندین سەدسالییان ل زاخۆ ژیاینە و ل وێرێ کارێن جودا جودایێن وەکی چاندن و بازرگانی و سنعەت و پیشەیێن دی کرینە، نەخاسمە ژی د بیاڤێ بازرگانیێ دا کو جوهیان رۆلەکێ باش تێدا هەبوو[110].

ل دۆر سەرژمێریا جوهیان ژی ل زاخۆ، هاتییە گۆتن کو هژمارا وان ل نیڤا سەدسالیا ١٩ێ ل ناڤبەرا نیڤ هەتا دو سێکێن سەرانسەری ئاکنجییان بوویە، لێ ل چارێکا داویێ یا وێ سەدسالێ هژمارا وان ب ٤٣٦ کەسان هاتییە تەخمین کرن[111]، هەروەسا ل داویا شەرێ جیهانیێ ئێکێ ژی هژمارا جوهیان ل زاخۆ ٢٤٠٠ کەس، بوو، ئەڤە ل وی دەمێ هژمارا وان ل سالا ١٩٢٩ێ گەهشتبوو ٤٠٠٠ هزار کەسان.

لێ هندەکان ئاماژە کریە وێ چەندێ کو ل سالا ١٩٣٠ێ ژ بەر مشەختبوونا وان، ب تنێ ١١٧١جوهی ل زاخۆ مابوون، لێ دووڤ ئاماژەیا هندەکێن دی سالا ١٩٣٠ هژمارا خەلکێ زاخۆ ٢٦٨٥٤ کەس بوو و ١٤٧١ێ جوهی بوون، ئەڤە ل وی دەمێ هەر ل دووڤ ڤێ ئاماریۆ(سەرژمێریێ) هژمارا جوهیان ل ڤان بازێران ب ڤی ئاوایی بوویە: ئامێدیێ ٧٣٢، ئاکرێ ١٠٠٠، دهۆك ٨٤٢ و ل سالێن ١٩٤٠-١٩٤٥ێ ١٥٠٠ جوهی ل زاخۆ دئاکنجی بوون.

ل دووڤ ئامارا سالا ١٩٤٧ێ، ١٣٩٤ جوهی ل زاخۆ هەبوون، هەروەسا هاتییە گۆتن کو ل سالێن ١٩٥٠-١٩٥١ێ، ئانکو بەری مشەختبوونا ب کۆم یا جوهیان بۆ ئسرائیل ١٨٠٠ جوهی ل زاخۆ هەبووینە، هەروەسا هەنە دبێژن کو ل سالا ١٩٥١ێ جوهیێ داویێ ژ زاخۆ دەرکەڤتییە، ئەڤە ژی پشتی دامەزراندنا دەولەتا ئسرائیل ل سالا ١٩٤٨ێ پشتی مشەختبوونا جوهیێن هەمی دەولەتێن جیهانێ بۆ فلەستینێ، هەروەسا پشتی حکومەتا عیراقێ ل دووڤ یاسایا هژمارە (١) یا سالا ١٩٥٠ یێ رەگەزنامەیا عیراقی ژ جوهیان ستاندی[112].

ژ وان ئاماران هژمارە زۆریا هەبوونا جوهیان ل زاخۆ دیار دبیت، دبیت ئەڤە ژ بەر وێ چەندێ بیت کو زاخۆ ژ لایێ ئابووری ڤە چالاکترین بازێرێ دەڤەرا بەهدینان بوویە، کو فاکتەرێن مفاکرن و حالخۆشییا ژیارێ بۆ پیشەکاران تێدا هەبووینە، نەخاسمە ژی بۆ جوونا جۆتیاران، ئەڤە سەرباری هەبوونا پێکڤەژیانا تمام و لێبۆرینا ئایینی ل ناڤبەرا هەمی ئایین و تیرەیێن ل زاخۆ هەین، تشتێ پشتەڤانییا ئاخفتنا مە دکەت ل سەر باشییا رەوشا جوهی یێن زاخۆ ئەوە ژێدەرێن جوهیانی زاخۆ ب (ئۆرشەلیما کوردستانێ) ناڤ کریوو[113].

هندی پەیوەندی ب مەسیحی یێن زاخۆ ڤە هەی، ئەوە کو ئەو ب هژمارە پشتی جوهیان ل پلا دووێ یا پێکهاتێن ئەتنیکی یێن زاخۆ دهاتن، هەروەسا ل سەردەمێ شاهینیێ، ئایینێ مەسیحی ئایینێ سیێ یێ ئاسمانی بوو ل زاخۆ پشتی هەردو ئایینێن ئیسلام و جوهیانی.

ل دۆر دابەشبوونا ئاکنجیبوونا مەسیحی یێن زاخۆ ژی، مەسیحی یێن کلدان و سریان تاخەکێ تایبەت ب خۆ ل بازێرێ زاخۆ ب ناڤێ (تاخێ فەلەیان) هەبوو و نۆکە ژی هەیە، هندەك دبێژن کو پتریا مەسیحی یێن ئاکنجییێن ڤی تاخی هەتا هەلبوونا شەرێ جیهانیێ ئێکێ سریان و ئاشووری یێن (هۆزا تیاری) بووینە و وی دەمی هژمارا سریانێن وی تاخی ١٨ خێزان بووینە، لێ پشتی ئاوارەبوونا مشەختی یێن کلدان بۆ زاخۆ و ئاکنجیبوونا وان ل وی تاخی ل سالێن شەرێ جیهانیێ ئێکێ و پشتی هنگی ژی، هەروەسا ژ بەر دەرکەڤتنا تیاریان ژ بازێرێ زاخۆ ژ بەر کێشەیێن جڤاکی یێن تووشی وان بووین، ئەڤە هەمی بوونە ئەگەرێ وێ چەندێ کلدان ببنە زۆرینە ل زاخۆ و ئەرمەن ل پلا دووێ بهێن و نۆکە ژی هەر وەسایە.

لێ تشتێ پەیوەندی ب ژێیاتییا ئایینزایی (المذهبی) یا کلدان و سریانێن ل زاخۆ و هژمارا وان ڤە هەی، ئەو سەر ب ئایینزایێ کاسۆلیکی بوون و هندەك ئاماژێ دکەنە وێ چەندێ کو ل سالا ١٩٤٧ێ ٤٠ خێزانێن

کاسۆلیکی ل زاخۆ هەبووینە، لێ هندەکێن دبێژن کو ل نیڤا دووێ یا سەدسالیا ١٩ێ ١٣٥٩٠ مەسیحی ل زاخۆ هەبوون و پتریا وان کلدانی و ئەرمەنی بوون، ئەڤە ل وی دەمێ کو د سالنامەیا ئۆسمانی یا سالا ١٩١٢ێ دا هاتییە کو هژمارا کلدانیێن ژ رەگەزێ نێر ل زاخۆ ٣٥٥ کەس بوون، لێ یێن سریان ٧٧ کەس بووینە، هەروەسا کلدانیێن ژ رەگەزێ مێ ٢٠٩ کەس، لێ یێن سریان ٧١ کەس بووینە[١١٤].

ل دووڤ ئامارا سالا ١٩٤٧ێ ٨٠٧٢ مەسیحی ل سەرانسەری قەزا زاخۆ هەبووینە[١١٥]، لێ هندەك هەنە دبێژن کو ل سالێن چلان پتر ژ ١٠٠٠٠ کلدانییان ل زاخۆ و دهۆك هەبووینە[١١٦]، هەروەسا ل دووڤ ئامارا سالا ١٩٥٧ێ ژی هژمارا مەسیحی یێن سەرانسەری قەزا زاخۆ ژ رەگەزێ نێر ٥١٣٨ و ژ رەگەزێ مێ ٤٧٤٩ کەس بووینە[١١٧].

مەسیحیيان ل زاخۆ پشکەکا جڤاکێ زاخۆیی پێك ئینانە و مەسیحیی یێن کلدان ژی پیشەیێن جودا جودایێن وەکی چاندن و پیشەسازی و بازرگانی و چەندین پیشەیێن دی ل وی باژێری کرینە، هەروەسا د پتریا چالاکی یێن زانستی و رۆشنبیری دا شوونتبلێن وان دیار بووینە، ژ لایێ جڤاکی ڤە چالاك بووینە ئەڤە ژی ب رێیا ئاڤاکرن و نووژەنکرنا پەرستگەهـ و دێران کو گرنگترین هێمایێن ئایینی یێن وانن، هەروەسا زاخۆ بەرێ و نۆکە ژی سەنتەرێ مەترانیێ یە و هندەکان ئاماژە کریە وێ چەندێ کو کورسییا مەترانێ زاخۆ ل وی بازێری هەیە کو دەستەلاتا وی ژ لایێ باکوورڤە دگەهشتە هەردو ویلایەتێن شرنەخێ و هەکاری ل کوردستانا باکوور و ژ لایێ باشوورڤە ژی دگەهشتە دەڤەرێن دهۆك.

لێ تشتێ پەیوەندی ب مەسیحیێن ئەرمەنی ڤە هەی[١١٨] ئەوە کو (جۆن ئاشەرێ) گەریدە یێ ل سالا ١٨٦٤ێ سەرەدانا زاخۆ کری ئاماژە کریە وێ چەندێ کو خەلکێ بازێرێ زاخۆ پێکهاتەیەکە ژ کورد و کلدان و ئەرمەنان، لێ هندەکێن دی ژی گۆتینە کو ل نیڤا دووێ یا سەدسالیا ١٩ پتریا مەسیحی یێن زاخۆ کلدان و ئەرمەنی بووینە، لێ سالنامەیا ئۆسمانییا سالا ١٨٩٤ێ وەسا دیار دکەت کو ٢٥ ئەرمەنی ل زاخۆ هەبووینە، ئەڤە ل وی دەمێ ل دووف سالنامەیا ویلایەتا مووسل یا سالا ١٩١٢ێ هژمارا وان ٦٨ ئەرمەنی بووینە ژ هەردو رەگەزێن نێر و مێ.

ئەرمەنی نە تنێ ل بازێرێ زاخۆ هەبوون، بەلکی گەلەك ژ وان ل گوندێن هەوریسکێ و ئاڤزوریکێ و سمایل ئاڤا ل ناحیا سلێڤانەیی ژێ ئاکنجی ببوون، لێ پتریا وان ل هەوریسکێ جهوار ببوون، ل دۆر ڤێ چەندێ ژی هندەکان ئاماژە کریە وێ چەندێ کو لیۆن پاشا (لیڤۆن پاشا) کو ئێك بوو خانەدانێن ئەرمەنان ئێکەمین گوندێ نموونەیی ل عیراقێ ئاڤاکریە و ب گوندێ (هەوریسکێ) هاتییە ناڤکرن، لیڤۆن پاشا و گرۆپا ەگەل وی ژ وانێ مشەختی ئیرانێ ببوون و پاشی هاتبوونە عیراقێ و ل گوندێ هەوریسکێ ئاکنجی ببوون کو هژمارا وان ٧٠٠ خێزانێن ئەرمەنی بوون و ل دووف هژمارەیێن کارگێرییا ناڤخۆیی یا سالا ١٩٥٦ێ ٣٠٠ ئەرمەنی ل گوندێ هەوریسکێ هەبوون[١١٩].

ل سەر هەبوونا ئێزدییان ژی ل زاخۆ[١٢٠]، چ تشتێ وەسا ل بەر دەست نینە ئاماژەیێ بکەت کو ئەو ل بازێرێ زاخۆ هەبن، بەلکی ئەو ب ئاوایەکێ سەرەکی ل دەڤەرا سلێڤانەیی ل گوندێن: دێرەبوونێ، قەرەولا، باجد میری، باجد کەندال، باجد بەراڤێ، کانی عەرەبێ، تربە سپی، پێبزنێ بوون و هندەك خێزانێن ئێزدی ل گوندێن هیتیان و تیان(تویان) و ل سەر رێیا زاخۆ - دێرەبوونێ - پێشابیرێ ئاکنجی ببوون کو ئەو ژی عەشیرەتێن ماسکێ و مووسانە و هەوێری بوون کو یا داویێ ئێکە ژ کەڤنترین عەشیرەتێن ئێزدی یێن ل دێرەبوونێ و گوندێن دەردۆرێن وێ ئاکنجی بووین.

ل دەستپێکا سەدسالیا بیستێ مارك سایکس ئاماژە کریە هەوێرییان گوتییە کو وی دەمی ئەو ٣٠٠ خێزان بووینە و ل نێزیك زاخۆ دژین و ئێکە ژ عەشیرەتین کۆچەر و تەرش وکەوالی نەخاسمە پەزی ب خودان دکەن و ل ناڤ کوونان(خیڤەتان) دژین و بۆ پەیداکرنا ئاڤ و چەروانێن نوو بۆ تەرش وکەوالێ خۆ دچوونە دەڤەرێن دور هەتا دگەهشتنە

گۆما وانێ (بەحرا وانێ)، هەر وەكی هاتییە گۆتن ژی، عەشیرەتا هەوێری ب زەنگینترین عەشیرەتا ئێزدی دهێتە ل قەلەمدان ژ بەكو خودان گەلەك سەرێن پەزی و گارەشان بوو[١٢١].

ل دۆر هژمارا وان ژی ل قەزا زاخۆ، ل دووڤ ئامارا سالا ١٩٤٧ێ هژمارا وان ٨٨٤ كەس بوویە ژ هەردو رەگەزێ نێر و مێ[١٢٢]، هەروەكی د خشتەیێ هژمار (٢)دا دیارە، لێ ل دووڤ ئامارا سالا ١٩٥٧ێ هژمارا وان ل قەزا زاخۆ گەهشتبوو ١٤٩٧ كەسان ژ هەردو رەگەزێن نێر و مێ[١٢٣].

سەرباری یا بۆری، پێتڤییە ئاماژەیێ بكەینە وێ چەندێ كو خۆڕستێ پەیوەندییان ل ناڤبەرا پێكهاتێن ئەتنیكی یێن زاخۆ و موسلمانێن وی باژێری هەبوو، پەیوەندییەكا باش و موكم بوویە، هەتا هندەكان گۆتینە كو موسلمان و جوهی و مەسیحی یێن باژێری ب ئاوایەكێ گەلەك باش ڤێككرینە و خۆ ب كورد قەلەمداینە بەری خۆ ب موسلمان یان جوهی یان مەسیحی ل قەلەم بدەن و پشكدارییا خۆش و نەخۆشی یێن ئێك ودو دكرن[١٢٤] و پێكڤە پشكداری د بازرگانی و چالاكی یێن دی یێن ئابووری دا دكرن، هەروەسا د هەلكەڤتێن جودا جودایێن وەكی جەژن و شاهی و بەهییان دا سەرەدانا ئێك ودو دكرن و پێكڤە ب خۆشی دژیان و كەسێ ژ وان هەست نەدكر كو یێ دی یێ زڤرییەكێ بەرامبەری وی ب كار دئینیت[١٢٥].

تشتێ پەیوەندی ب وەرارا دیمۆگرافییا زاخۆ ڤە هەی، پشتی ماندێتا(ئینتیدابا) بەریتانی ئێكەمین ئامارا تەخمینكرییا گرنگییا خۆ هەبیت ل عیراقێ هاتە كرن، پاشی ئامارەكا دی یا هەڤشێوە هەر ل وی سەردەمی و ئێكا دی ل سەردەمێ خۆسەرێ هاتنە كرن[١٢٦]، ل دووڤ ڤان ئاماران، هژمارا ئاكنجی یێن زاخۆ (سەنتەرێ قەزایێ) ل سالێن ١٩٢٥-١٩٢٦ێ ٤٠٠٠ موسلمان و جوهی و مەسیحی

**خشتەیێ هژمارە (٢)** [١٣١]

| ئایین | رەگەز | سەنتەرێ قەزا زاخۆ | | ناحیا سلێڤانەیێ | | ناحیا سندی | ناحیا گولی | سەرجەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | باژێر | گوند | باژێر | گوند | باژێر | گوند | |
| موسلمان | نێر | ١٧٩٥ | ٢٩١٤ | ٢١٣ | ٣٥٠٥ | ٢٥٠١ | ٢٠٢٦ | ١٢٩٥٤ |
| | مێ | ١٨٠٤ | ٢٦٦٨ | ٢٤٠ | ٣٧١٢ | ٢٤١٥ | ٢٠١٢ | ١٢٨٥١ |
| | سەرجەم | ٣٥٩٩ | ٥٥٨٢ | ٤٥٣ | ٧٢١٧ | ٤٩١٦ | ٤٠٣٨ | ٢٥٨٠٥ |
| مەسیحی | نێر | ٦٨٣ | ١٠٤٥ | ١٠ | ٣٠٢ | ١٣٧٢ | ٦٧٠ | ٤٠٨٢ |
| | مێ | ٦٧٥ | ١٠٥٣ | ٨ | ٣٠٦ | ١٢٩٨ | ٦٥٠ | ٣٩٩٠ |
| | سەرجەم | ١٣٥٨ | ٢٠٩٨ | ١٨ | ٦٠٨ | ٢٦٧٠ | ١٣٢٠ | ٨٠٧٢ |
| جوهی | نێر | ٦٩٠ | ١٣ | - | ٥ | ٢٦ | - | ٧٣٤ |
| | مێ | ٦٣٦ | - | - | ١ | ٢٣ | - | ٦٦٠ |
| | سەرجەم | ١٣٢٦ | ١٣ | - | ٦ | ٤٩ | - | ١٣٩٤ |
| ئێزدی | نێر | ١ | ١٠٦ | - | ٢١٨ | - | - | ٣٢٥ |
| | مێ | - | ١٦٢ | - | ٣٩٧ | - | - | ٥٥٩ |
| | سەرجەم | ١ | ٢٦٨ | - | ٦١٥ | - | - | ٨٨٤ |
| سابئی | نێر | ٤ | - | - | - | - | - | ٤ |
| | مێ | - | - | - | - | - | - | - |
| | سەرجەم | ٤ | - | - | - | - | - | ٤ |

بووینە[127]، لێ هژمارا ئاکنجیێن سەرانسەری قەزا زاخۆ ل سالا ١٩٣٠ێ ٢٦٨٥٤ کەس بوویە هەروەکی د بەلگەنامەیێن بەریتانی دا هاتی کو ئەو هژمارە ب ڤی ئاوایی هاتبوو دابەش کرن: موسلمان ١٨٧٣١، ئێزدی ٥٠٠، مەسیحی ٥٩٥٤، جوهی ١٤٧١ و عەرەب ١٩٨[128]، لێ ل سالا ١٩٣١ێ هژمارا خەلکێ زاخۆ (سەنتەرێ قەزایێ) گەهشتییە ٥٠٠٠ کەسان کو پتریبا وان موسلمان و ل پلا دووێ جوهی بوون.

لێ ل سالێن ١٩٣٥-١٩٣٦ێ هژمارا ئاکنجی یێن قەزا زاخۆ گەهشتییە ٦٦٧٤٧ کەسان[129]، فەرە بێژین کو ب ئامارا فەرمییا ئێکێ یا سالا ١٩٤٧ێ بۆ جارا ئێکێ د دیرۆکا عیراقێ دا کەسانێن پەیوەندیدار شیان هوورکاریێن نەخشەیێ ئایینی یێ ئاکنجی یێن وەلاتی، ژ وانا یێ قەزا زاخۆ ژی بزانن[130]، لێ بەری هنگی، پشت ب تەخمینکرنێن جودا جودا دهاتە گەرم کرن و ژ بەر گەلەک ئەگەران شرۆڤە و لێکدان و زێدەکرن و کێمکرن بۆ دهاتنە کرن.

ل دووڤ وێ ئامارێ، دشیایە ب رێیا دابەشبوونا ئایینی یا ئاکنجیێن زاخۆ، هژمارا ئاکنجیێن قەزا زاخۆ بهێتە زانین هەروەکی د خشتەیێ هژمار (٣)ێ دا دیارە:

ژ خشتەیێ ژمارە (٢) دیار دبیت کو ل سالا ١٩٤٧ هژمارا ئاکنجیان ل سەرانسەری قەزا زاخۆ گەهشتبوو ٣٦١٥٩ کەسان و هژمارا رەگەزێ مێ یا ل قەزا زاخۆ هاتییە توومار کرن ژ هژمارا رەگەزێ نێر زێدەتر بوویە، دبیت ئەڤە ژی ژ بەر هندێ بیت کو گەلەک ژ رەگەزێ نێر ژ بەر سەربازگیریێ و ژ بەر ئەگەرێن دی نەهاتبنە توومار کرن، نەخاسمە ژی ل دەڤەرێن عەشیرەتان (ل گوندان).

لێ ل دووڤ زانیاریێن ئامارا سالا ١٩٥٧ێ، نەخشەیێ دابەشبوونا خەلکێ قەزا زاخۆ، ژ بەر هندەک ئەگەران هاتییە گوهورین و ئەگەرێ ژ هەمیان گرنگتر دەرکەڤتنا جوهیان بوو ژ عیراقێ و زێدەبوونا مشەختبوونا مەسیحیان بوو بۆ بەغدا پایتەخت و مووسل و باژێرێن دی و هەروەسا بۆ دەرڤەی عیراقێ ژی و گەلەک ئەگەرێن جودا جودا بۆ مشەختبوون و دەرکەڤتنا وان هەنە، ژ بەر هندێ، ل دووڤ ئامارا وێ سالێ هژمارا ئاکنجی یێن زاخۆ گەهشتبوو ٤٥٦٦٥ کەسان، هەروەکی د خشتەیێ خوارێ دا دیارە:

هەروەسا ژ بەر ئەنجام نەدانا چ ئامارێن (سەرژمێریێن) فەرمی ل عیراقێ ب گشتی و ل کوردستانێ ب تایبەتی کو یا سالا ١٩٨٧ێ ئامارا داویێ بوو، نەشیاین ئامارەکا هوور ل سەر هژمارا ئاکنجییێن زاخۆ و پێکهاتێن وێ یێن ئەتنیکی ب دەست خۆ بێخین، هەمی تشتێ شیاین ب دەست خۆ بێخین ئامارەکا تەخمینکری بوو ژ فەرمانگەها پەیوەندیدار ل زاخۆ ل سەر هژمارا خەلکێ وێ ل هەردو سالێن ١٩٩٢ێ و ٢٠١٠ێ، کو ل سالا ١٩٩٢ێ هژمارا ئاکنجییێن سەرانسەری قەزا زاخۆ ل دۆرێن ٨٧٦٨٨ کەسان بوو، لێ ل سالا ٢٠١٠ێ هژمارا خەلکێ باژێرێ زاخۆ (سەنتەرێ قەزایێ ل دۆرێن ١٧٥١٥٥ کەسان، ناحیا رزگاری ١٢٠٠٠، ناحیا دەرکارێ ١٣٣٣٢، ناحیا باتیفا ١٥٠٠٠ کەس و سەرانسەری قەزایێ نێزیکی ٢٠٤٧٥١ کەسان بوو[132].

**خشتەیێ هژمارە (٣)** [133]

| رەگەز | موسلمان | مەسیحی | جوهی | ئێزدی | سەرجەمێ ئاکنجیان |
|---|---|---|---|---|---|
| نێر | ١٧٨٤٠ | ٥١٣٨ | ١ | ٧٥٠ | ٢٣٧٤٨ |
| مێ | ١٦٣٩٩ | ٤٧٤٩ | - | ٧٤٧ | ٢١٩١٧ |
| سەرجەم | ٣٤٢٣٩ | ٩٨٨٧ | ١ | ١٤٩٧ | ٤٥٦٦٥ |

# ناحیا دەرکـــارێ

ئازاد عیزەدین

ناحیەك ژ ناحییێن قەزا زاخۆ یێن سەر ب پارێزگەها دهوکێ ڤە ژ سێ کۆمەلگەهـ و (٦٣)[١] گوندا پێکدهێت، دکەڤیت باکوورێ رۆژهەلاتێ باژێرێ زاخۆ ب دویراتییا ١٤ کم، ل سالا ١٨٩٢ وەکو ناحیە بناڤێ ناحیا سندی گولی هاتییەنیاسین وەك د سالناما ئوسمانی دا هاتی[٢]. ل دەسپێکێ ناحیا دەرکارێ ب ناحیا (سندی)[٣] دهاتە نیاسین چونکی بەرێ ناحیە بناڤێ عەشیرا دهاتنە بناڤ کرن[٤]، و ناحیا سندی ئێکە ژ ناحییێن کەڤن ل دەڤەرێ وەکو د سالنامێن ئوسمانی دا یێن سالێن ١٨٩٤ و١٩٠٧ و ١٩١٢ێ دا هاتی ناحیە بوویە بناڤێ ناحیا سندی گولی[٥]، چونکی سندی و گولی وەکو ئێك عەشیر دهاتنەنیاسین[٦]، و ل سالا ١٩٢٥ بوویە ناحیا سندی[٧]، تاکو داوییا سالێن نوتا بوویە ناحیا دەرکارێ. ناحیا دەرکارێ گرنگییەکا تایبەت هەیە ژ چەندین لایان ڤە بتایبەتی ژ ئالیێ زانستی و ئابووری و دیرۆکی و جڤاکی و سیاسی و کارگێری ڤە چونکی دەڤەرەکا ئیستیراتیجی یە و ب سەنتەرێ دەڤەرا سندییا دهێتە نیاسین . ژ ئالیێ زانستی ڤە: خەلکێ دەڤەرێ هەر ژ کەڤن دا گرنگی ب زانست و زانینێ دایە و خواندنگەهـ ل دەڤەرێ هەبووینە وەکو خواندنگەها شەرانشێ ل سەر دەمێ میرگەها بەهدینان ل گوندێ شەرانشێ هات بوو چێکرن ژ ئالیێ میرێ وی سەر دەمی ڤە حەسن عەباسی ل سالا١٤٧٠ ـ ١٥٣٣[٨]، و چەندین زانایێن بناڤ و دەنگ ل ڤێ دەڤەرێ هەبووینە وەکو شێخ محەمەد شەرانشی[٩]، و خواندنگەها شەرانشێ ئێکە ژ خواندنگەهێن بناڤ و دەنگێن دەڤەرا بەهدینان[١٠]، تاکو سالا ١٩٢٥ێ خواندنگەهەکا خواندنێن ئێسلامی ل گوندێ شەرانشێ هەبووو[١١]، و ل سالا ١٨٩٣ێ ئێکەم خواندنگەها سەرەتای ل دەڤەرا بەهدینان ل ناحیا سندی گولی هاتییە ڤەکرن[١٢]. کەڤنترین خواندنگەها سەرتایی ل سنوورێ ناحیێ ل سالا ١٩٣١ێ ل گوندێ سناتێ هاتییەڤەکرن[١٣]، پاشتر ل گوندێ بێرسڤێ سالا ١٩٤٣، ل گوندێ مارسیس سالا ١٩٥٢ێ، ل گوندێ شەرانشێ سالا ١٩٥٦ێ، ل گوندێ بوسەلێ سالا ١٩٥٧، ل گوندێ گەورکێ ١٩٥٨ێ خواندنگەهـ هاتینەڤەکرن و خواندنگەهـ ل هندەك گوندێن دی ژی هەبوون وەکو خواندنگەهێن گوندێ نوردینا و گوندێ بەرزیرێ و پشتی رێکەفتناما ١١ ئاداری ل سالا ١٩٧٠ێ خواندنگەهـ ل گەلەك گوندا هاتنە ڤەکرن وەکو گوندێن (دورنەخ، شەرانشا سەری، دەرکار عەجەم، قەسروك، بەهراڤا، دەشماسەك مەلا، مێرگەشیش، پەرخ) و پاشی خواندنگەهـ ل هندەك گوندێن دی ژی هاتنە ڤەکرن وەکو گوندێن (سنداڤا، بێشیلك، تێرك مامێزدین، تێرك حەسەن،

تێرك سمو، داسیك، سەركو، سەرسیلافك، عەمەر ئاغا، كەبەروك، مامیسا، مێرگێ)[١٤]، و نها نەهـ خواندنگەهێن بنەرەت و سێ یێن ئامادەیی ل سنوورێ ناحیێ هەنە[١٥].

## ژ ئالیێ ئابووری ڤە:

ل سنوورێ ناحیێ چەندین ژێدەرێن ئابووری هەنە تایبەتی سامانێن سروشتی وەكو پەترولێ و كومرێ و هندەك سامانێن دی ژی لێ هەنە و هەروەسا هندەك جهێن كەشت و گوزاری یێن بناف و دەنگ و دەڤەرەكا بەرنیاسە ب بەرهەمێن چاندنێ ل سەر ئاستێ كوردستانێ بتایبەتی ب بەرهەم ئینانا گەنمی ل دەشتا سندی، ژێدەرێن ئابووری یێن قەزا زاخۆ زۆربەیا وان ل سنوورێ ناحیا دەركارێ نە[١٦].

## ژ ئالیێ دیرۆكی ڤە:

دەركارێ دەڤەرەكا دێرینە[١٧]، و چەندین جهێن شوینەواری یێن ناڤدار ل سنوورێ وێ هەنە وەكو گوندێ دورنەخێ دیرۆكا ئاڤا كرنا وێ ڤەدگەڕیت بو سەردەمێ نوح پێغەمبەر (س)، سنوورێ ناحیێ ژ ئالێ باكوورێ رۆژئاڤای ڤە نێزیكی چیایێ جودی یە[١٨]، و (پرا بێشوكێ) ل گوندێ رەبەنكا[١٩] ل سەر رووبارێ هیزل بجهەكێ شوینەواری یێ دێرین و گرنگ دهێتە هەژمارتن ل سەر ئاستێ كوردستانێ، و ل ڤێ دەڤەرێ میرگەهەك هەبوو بناڤێ میرگەها سندی وگوندێ شەرانشێ وەكو سەنتەرێ وێ دهاتە نیاسین[٢٠]، و ل دەمێ چێكرنا پرا دەلال ل زاخۆ بەرێن وێ ژ چیایێ كێرە ل باكوورێ گوندێ دەركارێ برینە زاخۆ ژ بو چێكرنا پرێ و هندەك شوینەوارێن كەڤن یێن سەر دەمێ میرگەها بەهدینان یێن ب ناڤ و دەنگ ل سنوورێ ناحیێ هەنە وەكو خواندنگەها شەرانشێ و جوا میری یا ئاڤدانێ[٢١].

## ژ ئالیێ جڤاكی ڤە:

خەلكێ دەڤەرێ ب عەشیرا سندییا دهێنە نیاسین و عەشیرا سندی ئێكە ژ عەشیرێن هەرە كەڤن و رەسەن ل دەڤەرا بەهدینان[٢٢]، شەرەفخانێ بدلیسی دەمێ بەحسێ زاخۆ دكەت دبێژیت لسەر دەمێ میرگەها بەهدینان زاخۆ ناحیەك بوو سەر ب میرگەهێ ڤە ل وی سەردەمی خەلكێ دگوتێ ناحیا سندی[٢٣]، و دەڤەرا سندییا یا بەرنیاسە ب پێكڤە ژیانێ و تێكەلیێ دنافبەرا موسلمان و مەسیحی و جوهیان دا[٢٤]، و هەر دكەڤندا پەیوەندییەكا بهێز د نافبەرا واندا هەبووویە[٢٥]، و زۆربەیا مەسیحییان سەر ئاستێ قەزا زاخۆ ل سنوورێ ناحیا دەركارێ دژین[٢٦]، و چەندین مزگەفت و دێرێن كەڤن ل سنوورێ ناحیێ نە وەكو مزگەفتا گوندێ بوصەلی[٢٧]، ودێرا گوندێ بێرسڤێ[٢٨]، و كنیشتا جوهیان لگوندێ شەرانشێ[٢٩].

## ژ ئالیێ سیاسی ڤە:

خەلكێ دەڤەرێ د بەرنیاسن ب هەلویستێن نەتەوەیی و وەلاتپارێزی بەرامبەر رژێمێن داگیركەرێن كوردستانێ و رۆلەكێ بەرچاڤ هەبووویە دبزاڤا رزگاریخوازا كوردی دا و ل دەمێ پەیدا بوونا رێكخستنێن سیاسی یێن پارتی ل زاخۆ هەژمارەكا خەلكێ دەڤەرێ پەیوەندی ب رێكخستنێن پارتی كرن و بوونە ئەندام دناڤ رێزێن پارتی دا، و هەر ل دەسپێكا شۆرشا ئیلونێ خەلكێ دەڤەرێ دەڤەرێن خو رزگاركرن و هەژمارەكا زۆر پەیوەندی ب شۆرشا كوردستانێ كرن و پیشوازی ل جەنابێ سەركردێ شۆرشێ (مستەفا بارزانی) كرن و بوونە پێشمەرگەهێن شۆرشێ و رۆلەكێ بەرچاڤ هەبوو دناڤ شۆرشێ دا، و ل شۆرشا گولانێ ل ٢٦/ ١٩٧٦/٥ هەر ل دەسپێكێ هژمارەكا زۆر ژ خەلكێ دەڤەرێ ڤەستا ناڤ رێزێن شۆرشێ كرن و رۆلەكێ بەرچاڤ هەبوو د دەسپێكرنا شۆرشێ دا، ل هەردو شۆرشێن ئیلون و گولانێ زۆربەیا دەڤەرێ ل ژێر دەستەلاتا شۆرشێ دا بوو، ژبەر هەلویستێ كوردایەتیێ خەلكێ دەڤەرێ بەرامبەر رژێمێن ئێك ل دووڤ ئێكێن عێراقێ هەر ژ سالا ١٩٦١ تاكو سالا ١٩٨٨ ب دەهان جارا هێرش هاتینە سەر دەڤەرێ و

٨٧[٣٠] گوندێن دەڤەرێ هاتنە کاڤل و وێران کرن و هەژمارەکا خەلکێ دەڤەرێ ئاوارە بووینە و گەلەك هاتنەگرتن و نەفیکرن و راگوهاستن و ئەنفالکرن، ل ئەنفالا رەش سالا ١٩٨٨ ێ ٥٩ گوندێن دەڤەرێ کەتنە بەر کریارێن ئەنفالێ، و گەلەك خەلکێ دەڤەرێ هاتنە گرتن و برنە قەلعێن دهوکێ و سەلامیێ و بەحرکێ و گەلەك ژی ئاوارە بوونە وەلاتێن ترکیا و ئیرانێ، خەلکێ دەڤەرێ گەلەك خزمەتکریە و قوربانی دایە، ل سەرهلدانا پیروز ل ١٩٩١/٣/١٣ ناحیا دەرکارێ وەکو ئێکەم دەڤەر ل پارێزگەها دهوکێ هاتە رزگارکرن، ل هەیڤا دەهـ سالا ١٩٩١ جەنابێ رێزدار مەسعود بارزانی سەروکێ کوردستانێ سەرەدانا دەرکارێ کر[٣١].

## ژ ئالیێ کارگێری ڤە:

ل دووڤ سالنامە یا ئوسمانی دا یا سالا ١٨٩٢ دا ناحیا سندی گوللی هاتیە گرێدان دگەل قەزا زاخۆ، کو پێشتر دماوەکێ دیارکریدا سەر سەر ب سنجەقا هەکاری ڤە بوو[٣٢]، و د سالنامەیێن سالا ١٨٩٤ و ١٩٠٧ و ١٩١٢ هاتیە ناحیا سندی گوللی ناحیەك بوویە سەر ب قەزا زاخۆ ڤە یا سەر ب سنجەقا مووسل ڤە[٣٣]، ل سەر سیستەمێ پاشایەتیێ ل عێراقێ ل سالا ١٩٢٥ وەکو ناحیا سندی گوللی هاتیە دامەزراندن و ل ١٩٢٥/٩/٢٦ ناحیا گوللی ژێ هاتیە جوداکرن و ناحیە مایە بناڤێ ناحیا سندی و پشتی ماوەیەکێ سەنتەرێ وێ ژ گوندێ بێرسڤێ هاتیە ڤەگوهاستن بۆ گوندێ شەرانشا بنی چونکی دکەڤتە ناڤەندا دەڤەرا سندیا[٣٤]، و ل سالا ١٩٧٨ رێڤەبەریا ناحیێ ژ گوندێ شەرانشا بنی هاتیە ڤەگوهاستن بو گوندێ دەرکار عەجەم[٣٥]، و ل داویا سالێن نوتا ناڤێ وێ ژ ناحیا سندی هاتیە گوهورین بۆ ناحیا دەرکارێ چونکی رێڤەبەریا ناحیێ ل گوندێ دەرکار عەجەم بوو[٣٦]، ئەڤ ناڤێن ل خوارێ هاتینە دیار کرن ناڤێن رێڤەبەرێن ناحیێ نە یێن لسەر دەمێ سیستەمێ شاهیێ عیراقێ:

١ ـ نەشأت بەك (١٩٢٦/١/١)

٢- شاکر ئەفەندی سەلیم (١٩٢٧)

٣- محەمەد نوری ئەفەندی (١٩٣٠/١٠/٢٢ - ١٩٣٢)

٤- محەمەد سادق الجبوری (١٩٣٥)

٥- سادق سالح (١٩٣٦)

٦- شاکر محەمەد عارف (١٩٣٦/٩/٣٠)

٧- محەمەد ئەمین (١٩٣٩/١١/٢٢)

٨- عەبدولمەجید رەشید برواری (١٩٤٧)

٩- جەلال عەبدولحەمید (١٩٥٣)

١٠- محەمەد سالح جبرائیل (١٩٥٥)

١١- محەمەد ئەلحاج ئەلیاس (١٩٥٦)[٣٧]

پشتی سەرکەفتنا شۆرشا ١٤ تەمووزێ لسالا ١٩٥٨ و گوهورینا سیستەمێ پاشایەتی بو کوماری چەندین گوهورینێن سیاسی ل عێراقێ پەیدا بوون و حکومەتا نوی گەلەك سوز و پەیمان دان، بەلێ چ ژ سوز و پەیمانێن خو جێبەجێ نەکرن، سالا ١٩٦١ شۆرشا کوردستانێ دەسپێکر و گەلەك دەڤەر هاتنە ئازاد کرن و کەتنە ژێر دەستەلاتێ شۆرشێ و د ئەنجامدا بوشاهییەکا کارگێری پەیدا بوو، ژبو پرکرنا وێ بوشاهییا کارگێری ل سالا ١٩٦٤ جڤاتا سەرکردایەتیا شۆرشێ هاتە پێکئینان ب ئەرکێ یاسا دانانێ را دبوو ل کوردستانێ[٣٨]، و نڤێسینگەها جێبەجێکاری بۆ رێڤەبرنا کارو بارێن دەڤەرێن ژێر دەستەلاتا شۆرشێ، هاتەراگەهاندن، نڤێسینگەها جێبەجێکاری بریارا دامەزراندنا (رێڤەبەرێن ناحیا) ل دەڤەرێن رزگارکری دا[٣٩]، ناحیا سندی ژی ئێك بوو ژ وان ناحیا یێن کو رێڤەبەر بۆ هاتینەدانان شەعبان سەعید زاخۆی (١٩٦٦)[٤٠].. و ئەڤ ناڤێن خوارێ هاتینە دیار کرن ناڤێن رێڤەبەرێن ناحیێ نە یێن سەر دەمێ شۆرشا ئیلونێ[٤١] و پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ:

١- سەعید تەها حامد ئامێدی (١٩٦٩/١٠/١٢ - ١٩٧٢/١٢/١٠).

٢- عصمت عابد مزۆری (١٩٧٤ - ١٩٧٥/٣/١١)[٤٢].

ناڤێن ل خوارێ هاتینە دیار کرن ناڤێن رێڤەبەرێن

ناحیێ نە یێن لسەر دەمێ رژێما بەعسا ژ ناڤچووی:

١- یاسین عەبدولوەهاب ئاكرەی (١٩٧٥ - ١٩٧٨)
٢- عەبدولمەجید سەمین عەلی (١٩٧٨ - ١٩٨٣)
٣- حەمید كازم ناسر عەلوی (١٩٨٣ - ١٩٨٧)
٤- خورشید فەیسل خورشید هەركی (١٩٧٨/٩/٢٩ - ١٩٩٠/٩/٢)
٥- حەمید فەیزولله عەبدوله (١٩٩١)
٦- خەلف عەلی خەلبوس (١٩٩١)[٤٣].

ئەڤ ناڤێن لخوارێ هاتینە دیار كرن ناڤێن رێڤەبەرێن ناحیێ نە یێن پشتی سەرهلدانا پیروزا ١٩٩١

١- محەمەد حەسەن حسین خەیات (١٩٩٧/٤/٣ - ١٩٩٨/١١/٢٩)
٢- ئەیسر جرجیس حەمید (١٩٩/١٢/٢ - ٢٠٠٠/٨/١٧)
٣- موشتاق عصمت عابد (٢٠٠٠/٨/١٧ - ٢٠٠١/١/١٥)
٤- رێبوار صەلاحەلدین ئیبراهیم (٢٠٠١/١/١٥ - ٢٠٠٢/٤/٦)
٥- موشتاق عصمت عابد (٢٠٠٢/٤/٦ -٢٠٠٢/٧/١)
٦- خالد عەباس حاجی (٢٠٠٢/٧/١ - ٢٠٠٥/١/٢)
٧- محەمەد حەسەن حسین خەیات (٢٠٠٥/١/٢ - ٢٠١٠/٥/١٧)
٨- سەگڤان صەبری عەزیز (٢٠١٠/٥/١٧ - ٢٠١٣/١/١٤)
٩- فرهاد مەحمود یوسف (٢٠١٣/١/١٤ بەردەوامە)[٤٤].

## جوگرافییا ناحیێ:

### سنوورێ كارگێری:

ژ ئالیێ باكووری ڤە كوردستانا باكوورە و ژ ئالیێ باشووری ڤە باژێرێ زاخۆ یە و گوندێن دەڤەرا سندییانە یێن سەر ب هەردو ناحیێن باتیفا و رزگاری[٤٥]، ژ ئالیێ رۆژهەلاتی ڤە ناحیا باتیفا یە و ژ ئالیێ رۆژئاڤای رووبارێ (هیزل) ە یێ كو دكەڤیت د ناڤبەرا كوردستانا باكوور و باشوور دا.

## كەش و هەوا:

ل زڤستانا سارە و بارن و بەفر دباریت ب تایبەتی لدەڤەرێ چیایی وەكو گەلیێ پساغا و دەڤەرا لێهڤینی و تاكو شەرانشا سەری، ل بهارا باران دهێت و سروشتەكێ خۆش و جوان هەیە، ل هاڤینا دەڤەرێن چیایی هینن و دەڤەرێن دەشتێ گەرمن و ل پایزا سارە و باران دهێت، بلند ترین پلا گەرمێ (٤٥ °) و نزمترین پلە (ژێر سفر)دایە، رێژا باران بارینێ دناڤبەرا (٤٥٠ تا ٦٥٠ ملم) دایە، بایێ دەڤەرێ ژ دەریا ناڤەراست دهێت[٤٦]. سنوورێ ناحیێ ل دووڤ تایبەتمەندیا وێ هاتییە دابەشكرن لسەر سێ دەڤەرێن چیای و زیری و دەشتی:

### أ - دەڤەرێن چیای:

دەڤەرا چیای دكەڤینە باكوورێ ناحیێ دو زنجیرە چیا لێ هەنە وەكو زنجیرە چیایێ (كێرە) بلنداهیا وێ ٤٠٥٠ پێ یە[٤٧]، و چیایێ (خامتیر) بلنداهیا وێ ٢٠٢٠ مێترن[٤٨]، و و ل ڤان هەردو چیا هندەك كوپیتكێ بلند هەنە وەكو كوپیتكا (صەقر، و دودانكێ، سەرێ دێرێ، شاقولێ، كوخێ مچولیا، كوربلێ سناتێ، ملا هرچیینكێ)، و چەندین شكەفتێن بناڤ و دەنگ ل ڤان هەردو چیا هەنە وەكو (شكەفتا خانە میرێ، شكەفتا كونا بەنێ، شكەفتا بهێرێ، شكەفتا بازنگیرا، شكەفتا تومەی، شكەفتا قولاچێ، شكەفتا سپی، شكەفتا كورخانێ، شكەفتا بێواری، شكەفتا گەلیێ عەلوی ..... هتد) و هندەك گەلیێن بناڤ دەنگ ژی ل ڤان هەردو چیا هەنە وەكو (گەلیێ پساغا، گەلیێ باجوانێ، گەلیێ پەرەخێ، گەلیێ شیشێ، گەلیێ میسای، گەلیێ نارا......هتد) و گەلەك جورێن دارێن سروشتی ل ڤان چیا هەنە وەك: دارێن كەزوان، بێوك، گوهیشك، سماق، بەری، مازی، رێلك، هەل هەلوك، حاجی باهیف ...هتد و گەلەك

جورێن گیایێ سروشتی ژی لێ هەنە وەك: کاری، قورات، ترشوك، ڕێڤاس، بەلبەنە .......هتد، و چەندین جورێن گولێن بناڤ و دەنگ ژی هەنە وەك: گول نێرگز، گول نەخوین، هەلز، پیژان .....هتد، و گەلەك جورێن گیانەوەرێن کیڤی ژی ل سنوورێ ناحیێ هەنە وەك: بزنا کیڤی، سڤورە، ریڤی، گورگ، هرچ، کێڤریشك، ژیژی، بەراز ..... هتد و گەلەك جورێن تەیر و تەوال ژی لێ هەنە وەك: کەو، سیسك، پور، سڤیانك، قش قلانك، کەڤو شین، بوم، تڤیرك..... هتد و ل ڤان دەڤەرا گەلەك جهێن شوینەواری هەنە وەکو کەلها سلمانێ سندی و گەلەك جهێن دی ژی هەنە. و هەر وەسا ل ڤێ دەڤەرێ گەلەك ژێدەرێن ئاڤێ هەنە و گەلەك زەڤیێن ئاڤی ژی هەنە ژ بۆ چاندنا ئاڤی و بەرهەمێ باش پێ چاندنا ئاڤی ژێ دهێت وەك: هنار، هژیر، تری، مشمش، هەرمیك، خوخ، حلیك، گیز، و دارێن سپینداری....هتد) وگونجی، ماش، باجان سور، خیار، گولند، و کەسکاتیێ....هتد، هەروەسا دەڤەرەکا گەلەك زەنگینە ب گژ و گیای ژبو خودانکرنا تەرشی و کەوالی و حێوانی. هژمارەکا گوندێن سنوورێ ناحیێ ل ڤان دەڤەرێن چیای یێن بناڤێ (بەهنونە سندی، دەشتەتەخ، سنات، ئاڤا گیزێ، مێرگەشیش، دێرەشیش، قەسروك، پەرەخ، باجوا، ئێرە، بێنخرێ، مارسیس، ئەلانش، کەلوك، پەترومە، گوندوك، کرکرانك، گەورك، بازنگیرا، شەرانشا سەری، شەرانشا بنی، بهێر، ستەڤلان، بوصەل، زنۆك/ بوصەل، دێرێ) هەنە.

دکەڤندا خەلکێ دەڤەرێ ل هاڤینا ژ دەشتێ قەستا دەڤەرێن چیای دکرن و دچوونە دەڤەرێن زۆزانی[٤٩] ژبەر گەرما هاڤینێ و ژبو چەراندنا تەرشی و کەوالا، ل وی سەر دەمی جهێن زۆزانا جهێن تایبەت بوون و جهێن بناڤ و دەنگن دناف خەلکێ دەڤەرێ دا و هەر هندەك خەلکێ دەڤەرێ جهێن خۆ یێن زۆزانا

گوندێ سناتێ



یێن تایبەت هەنە و چەندین جهێن زۆزانی لدەڤەرێ هەنە وەکو زۆزانا (ئافروکی، سەرکی، کیرانش، ئاڤا گیزێ، وارێ کەمال، حەفت تەنین، تیا بادائە، مێدانێ، سەرێ بەستێ، زاویتێ)[٥٠].

## ب - دەڤەرێن زیری (گر - بان):

ل سنوورێ ناحیێ بتایبەتی رۆژهەلات و رۆژئاڤا و باشوورێ ناحیێ دبیت دەڤەرەکا زیری دو زنجیرە زیر لێ هەنە ول دەڤەرێ ئەڤ زیرە بەرنیاسن ب دوازدەملانێ و ب زیرێن هیزاوا ژی دهێنە نیاسین کو ژ گوندێ خرابابکێ دەست پێدکەت و بەرەف گوندێ دارهوزانێ و هیزاوا دهێت تاکو دگەهیت رۆژئاڤایێ گوندێ ئاڤگەنیێ، هەشت گوندێن سەر بناحیێ ڤە ل ڤێ دەڤەرێ نە ئەوژی: سەر سیلافک، بەهراڤا، تێرک سمو، تێرک مامێزدین، تێرک حەسەن، عەمەر ئاغا، سەرکو، بێشیلک و زیرێن بەرزیرێ کو ژ گوندێ رەبەنکا دەست پێدکەت و بەرەف گوندێن کەرنێ و بەرزیرێ و متیفا و دەرجەلال و گوندک جەلال و دەرکارا نیری و مێرگێ و دەرکار عەجەم و بێرسڤێ ڤە دهێت تاکو دگەهیتە باکوورێ گوندێ ئاڤگەنیێ، دەڤەرا زیری یا رۆژهەلات و رۆژ ئاڤایێ ناحیێ دکەڤیت بەر چیایێ کێرە دووازدە گوندێن سەر ب ناحیێ ل ڤێ دەڤەرێ نە بناڤێن: هەفشن، هەورێز، دەحلک مەلک، دەشتماسەک مەلا، دەشتماسەک قەرا، نوردینا، دەحلک گوندک، مامیسا، یوسف ئاڤا، گەلی دەرگەل، سنداڤا، گوندک ئەیوب، و ل ڤێ دەڤەرێ هندەک گرێن بەرنیاس هەنە وەک: گرێ گوزێ، گرێ بێرسڤێ، گرێ مام ئوسمانی، گرێ شبلی، گرێ خەزینا، گرێ عەجەما، گرێ مێرا، گرێ بەنوک، گرێ شێخا، گرێ صور، گرێ میرگەهێ..... هتد)، و هندەک بانێن بەرنیاس ژی ل ڤێ دەڤەرێ هەنە وەک: بانا باجلێ، بانا زاخۆ، بانا گەگووی، بانا ژژی، بانا بەرینێ ستێ، بانا شێخا ..... هتد و ل ڤێ دەڤەرێ هندەک رەزێن دێمی و هندەک جنیکێن فێقی

کۆمەلگەها دەرکار عەجەم



هەنە وچەرەكا باش ژی هەیە ژبۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی و گیانەوەرێ دی[٥١].

## ج - دەڤەرا دەشتی:

ب دەشتا (سندی) ناسیارە دەڤەركا بەرفرهە دكەڤیت دناڤبەرا دو زنجیرە زیران یێن ئاماژە پێ هاتییە دان، رووبەرێ وێ (٦٠٣٦٧) دۆنەم ئەردێ راستن یێ كێری چاندنێ دهێت، وەك سێگوشەیەكێ یە درێژیا وێ ژ شەنكستێ وێ ژ رووبارێ هیزل دەسپێدكەت تاكو دگەهیت گوندێ ئاڤكەنیێ یێ سەر ناحیا باتیفا ڤە ٢٨ كم و ل باشوورێ وێ بازێرێ زاخۆ یە و ل باشوورێ رۆژئاڤایێ وێ رووبارێ خابوور دبووریت تاكو دگەهیت سەر رووبارێ هیزل، دورێن وێ ١٩ گوند هەنە بناڤێن: داسیك، بێرسڤێ، دەركار عەجەم، هیزاوا، مێرگێ دەركار نیری، گوندك جەلال، دەرجەلال، متیفا، بەرزیر، كەرنێ، رەبەنكا، وارصور، دورنەخ، چەم مشكو، مولكێ گوندێ بوصەلێ یێ سەر بناحیا دەركارێ[٥٢]، و هەر سێ گوندێن دی (گرك سندی، دارهوزان، تلكەبەر) سەر ب ناحیا رزگاری ڤە[٥٣].

ئەڤ دەشتە یا ب ناف و دەنگە ل سەر ئاستێ كوردستانێ و بەرهەمێن وێ یێن چاندنێ وەكو ژێدەرێن هەرە سەرەكی یێن ئابوریا دەڤەرا زاخۆ دهێتە هەژمارتن و دووڤ پێشبینییا سالانە (٢٣٠٠٠ - ٢٦٠٠٠) هزار تەنێن گەنمی بەرهەم دئینیت و چەندین بەرهەمێن دی ژی لێ دهێنە چاندن وەك: جەهـ نوك، گوندور و هندەك بەرهەمێن ئاڤی ژی لێ دهێنە چاندنا وەكو دارێن فێقی و باجانێن صور، پتات، خیار، تلوزی، شتی، بامی، باجانێن رەش، گول بەرۆژ، لۆبیك و گەلەك جورێن كەسكاتیێ......هتد برێكا بیرێن ئیرتیوازی و هندەك ژی ب ئاڤا رووبارێ هیزل و خابور دهێنە ئاڤدان[٥٤].

گوندێ بوصەلێ سالا ١٩٨٠



## ژێدەرێن ئاڤێ (باران - بەفر)[٥٥]:

ژێدەرێن هەرە سەرەکی نە ل سنوورێ ناحیێ، و هەروەسا چەندین ژێدەرێن دی ژی هەنە وەك رووبارێ خابوور کو لبەر گوندێن باشوورێ ناحیێ دا دبووریت ژ گوندێ بێشیلکێ دەسپێدەکەت و دناڤ بازێرێ زاخۆ دا دبووریت تاکو دگەهیت گوندێن چەمشکو و دورنەخێ، و رووبارێ هیزل ل گوندێ دەشتەتەخێ دکەهیتە سنوورێ کوردستانا باشوور بدرێژیا ٣٦کم ژ خالا گەهشتنا کوردستانا باشوور تاکو دگەهیتە سەر رووبارێ خابوور ل نێزیك کۆمەلگەها ئیبراهیم خلیل سەنتەرێ رێڤەبەریا ناحیا رزگاری و ئەڤ رووبارە ل رۆژئاڤایێ ناحیێ لبەر گوندێن دەشتەتەخ و بەهنونە سندی و هەفشن و هەوریز و کیزاف و رەبەتکا و وارصور و دورنەخێ دا دبووریت تاکو دگەهیتە سەر رووبارێ خابوور و هندەك روو ژی ل سنوورێ ناحیێ هەنە وەکو رووێ گەلیێ پساغا، رووێ شەرانشێ ئاڤا وان دچیت سەر رووبار هیزل و هندەك روویێن بچووك ژی لێ هەنە وەك: رووێ چنار، رووێ ئەلانشێ ئاڤا وان دچیت سەر رووێ گەلیێ پساغا و رووێ سناتێ ئاڤی وی دچیت سەر رووبارێ هیزل و رووێ دووڤ روو ئاڤا وی دچیت سەر رووبارێ خابیر، و جەلالێ نهالا دەحلێ، جەلالێ نهالا کەحێلوکێ ل دورێن گوندێ دەرکار عەجەمن، و هندەك جەلالێن وەرزی ژی ل سنوورێ ناحیێ هەنە وەکو جەلالێ بەرزیرێ، جەلال گوندك جەلال، جەلالێ گەلی ل دەرکارێ، جەلالێ لێهڤانێ ل بوصەلێ، جەلالێ گەلیێ مێرگەشیشێ، جەلالێ دەشتماسەکێ[٥٦].

و گەلەك کانیێن ئاڤێ ل سنوورێ ناحیێ هەنە وەك: کانیا شکەفتا بهێرێ، کانیا پل سپیێ، کانیا قەدومێ، کانیا گەرماڤێ، کانیا چەمێ مەرعانێ، کانیا دەلکا، کانیا سموی، کانیا زهێدێ، کانیا هەرفتێ، کانیا ئاڤرا، کانیا گیزێ، .....هتد و گەلەك بیرێن ئیرتیوازی ژی ل سنوورێ ناحیێ هاتینە کۆلان تایبەت ل دەشتێ.

دو سکرێن ئاڤێ ژی ژ ئالیێ حکومەتا هەرێما کوردستانێ ڤە ل سنوورێ ناحیێ هاتینە چێکرن یێ ئێکێ بناڤێ (سکرێ دەرکارێ) ل گوندێ دەرکار عەجەم (١٨٠٠٠٠) سەدو هەشتی هزار مەترێن سێ جارکی ئاڤێ کۆمدکەت ل ٢٠٠٢/٣/١٩ داویهاتییە، یێ دووێ (سکر بوسەلێ) ل باشوورێ گوندێ بوصەلێ (٣٥٠٠٠٠) سێ سەد و پێنچی هزار مەترێن سێ جارکی ئاڤێ ڤەدگریت ل ٢٠٠٥/١١/١١ داویهاتییە و ژێدەرێ ئاڤا ڤان سکرا سەر رێژا باران بارینێ یە و ئەڤ هەردو سکرە ژبۆ بهێزکرنا کەرتێ چاندنێ هاتینەچێکرن و سکرێ دەرکارێ وەکو جهەکێ

سیلاڤا شەرانشێ



کەلها هەوریزێ ل دەڤەرا بەنستانیا



گەشتیاری ژێ دهێتە نیاسین. جوا میری[57] جووەكا ئاڤدانێ یا بناڤ و دەنگە ل دەڤەرێ تاكو سالا ١٩٩١ دگەهشتە مولكێ هەشت گوندا و مفایەكێ گەلەك باش ژێ دهاتەوەرگرتن [58].

## سامانێن سروشتی:

ل سنوورێ ناحیێ گەلەك جورێن كانزان هەنە وەكو پترۆلێ ل دەشتا سندی (نەفت)ێ[59]، و ئەڤ دەڤەرا پترۆل لێ ل قەزا زاخۆ یا بەرنیاسە ب (تاوكێ)[60]، ئەڤ دەڤەرە یا زەنگینە ب هەبوونا پترۆلێ و دووڤ جورێن پەترولێ پترۆلا ڤێ دەڤەرێ ژ جورێ قورسە و گەلەك مادێن ئەسفلتێ تێدا هەنە و مفا وەرگرتن ژ پترۆلا ڤی كێلكەهی ل داوییا سەردەمێ ئووسمانییا بوو، دەسپێكا دیتنا پەترۆلا خام ل بیرێن زاخۆ ژ ١٤/٢٣/ تاكو ١٨٩٥/٥/١٠ بوویە، پشتی شەرێ جیهانیێ ئێكێ ئەلمانیا بیرێن نەفتێ ل دەڤەرا زاخۆ كولاینە و نەفت ژێ ئینایە دەر، و بسپورێن بریتانی ل سالێن بیستان ژ چەرخێ بیستێ ١٢ بیرێن پەترولێ ل كێلكەهێ تاوكێ كولا بوون[61].

ل ٢٠٠٥/١١/٢٩ ئێكەم بیرا پترۆلێ ل كوردستانێ ل سنوورێ ناحیا دەركارێ ل گوندێ (كەبەروك) ێ ل دەڤەرا سندیا هاتییە كۆلان ژ ئالیێ كومپانیەكا نەرویجی ڤە یا بناڤێ[62] (D. N . O)، و ئەڤ بیرا پەترولێ ئێكەم بیرە دبیرۆكا كوردستانێ دا هاتییە كۆلان ب گرێبەستەكێ كو ژ ئالیێ حكومەتا هەرێما كوردستانێ ڤە هاتییە ئیمزا كرن[63]، ل ٢٠٠٩/٦/١ ب فەرمی نەفت ژێ هاتییە هنارتن بو بازارێن جیهانی[64]، و زۆربەیا پەترولێ ل دەڤەرا زاخۆ ل سنوورێ ناحیا دەركارێ یە ل باشوور ناحیێ ل گوندێن (كەبەروك، تێرك حەسەن، تێرك سمو، تێرك مامێزدینی، بەهراڤا، سەر سیلافك)[65].

هەر وەسا هندەك جورێن دی ژێ یێن سامانێن سروشتی ل سنوورێ ناحیێ هەنە وەكو كومرێ ل دەڤەرا شەرانشێ، و كبریت ل گونێ بەهنونە سندی، و ئاخا رەنگا و رەنگ یا ژ بۆ چێكرنا بویاغێ دهێتە بكار ئینان[66]، و هندەك جورێن دی ژێ یێن كانزاێن خام ل گوندێ شەرانشێ هەنە وەكو (رساس و زەنگ)[67]، و بەرێن صور ل گوندێ دەركار عەجەم هەنە ل سالێن هەشتیا دهاتنە هنارتن بو میسلێ ژ بو چێكرنا كاشی دهاتنە بكار ئینان و زۆربەیا مەقلەعێن رەملێ و حەصویێ ل بەر رووبارێ خابوور ل دەڤەرا زاخۆ د سنوورێ ناحیا دەركارێ نە ل دورێ گوندێن چەمشكو و دورنەخێ[68].

## جهێن گەشت و گوزاری:

ل ناحیێ حەفت جهێن گەشت و گوزاری ژ ئالیێ رێڤەبەریا گەشت و گوزاری هاتینە دەسنیشانكرن ل سەر ئاستێ قەزا زاخـۆ[69]، ژڤان جهان هندەك جهـ گەلەك ب ناڤ و دەنگ و بەرنیاسن ل سەر ئاستێ پارێزگەها دهوكێ و دهێنە هەژمارتن ژ جهێن گەشت و گوزارێن بەرنیاس ل كوردستانێ وەكو (سیلاڤا شەرانشێ شكەفتا بهێرێ)[70].

جهێن گەشت و گوزارێن دكەڤنە سنوورێ ڤان گوندا:

١- سیلاڤا شەرانشێ ل گوندێ شەرانشا بنی باكوورێ سەنتەرێ ناحیێ ٤كم.

٢- شكەفتا بهێرێ ل گوندێ بهێرێ دكەڤیت باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیێ ٨كم.

٣- دەڤەرا شیشێ نێزیك گوندێ مێرگەشیشێ باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیێ ٢٠كم.

٤- سینومەرا ل گوندێ قەسروكێ دكەڤیت باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیێ ١٩كم .

٥- سكرێ دەركارێ ل گوندێ دەركار عەجەم.

٦- دەڤەرا دەشتەتەخ ل دورێن گوندێ دەشتەتەخێ دكەڤیت باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیێ ٢٥كم.

٧- دەڤـەرا سەركوی ل دورێـن گوندێ سەركوی باشوورێ ناحیێ ٢٥ كـم[71]. رۆژهەلاتێ زاخۆ ١٠كم.

## جهێن شوینواری:

ل سنوورێ ناحیێ (٤١) جهێن شوینواری یێن تومارکری هەنە[٧٢]، و هندەك ژ ڤان جها ناڤدار و بەرنیاسن سەر ئاستێ دەڤەرێ و دهێنە هەژمارتن جهێن شوینواری یێن دێرین و گرنگ ل کوردستانێ وەکو (پرا بێشوکێ)[٧٣] ل گوندێ رەبەنکا ل رۆژئاڤایێ باژێرێ زاخۆ، و گەلەك جهێن دی یێن شوینواری ل سنوورێ ناحیێ هەنە وەك:

١- شکەفتا وارێ دەمال ل گوندێ بازنگیرا

٢- گرێ گوزێ ل گوندێ دەرکار عەجەم و شکەفتا گەلیێ عەلوی.

٣- گرکێ ئاخی ل بێرسڤێ.

٤- شکەفتا کال کال ل گوندێ ڤەسروکێ.

٥- شکەفتا زێرنگر و کەلها هەورێزێ ل گوندێ هەورێز کەلهەکا ناف دەنگە ل دەڤەرا سندیا.

٦- شکەفتا ستینك گوندێ بێشیلکێ و هندەك جهێن دی یێن شوینەواری لڤی گوندێ صوفیا هەنە.

٧- شکەفتا کاترین ل گوندێ شرانشا بنی[٧٤].

٨- کەلها سلمانێ سندی، قەلعا سناتێ، شکەفتا ستەفلانێ[٧٥].

٩- چەندین جهێن شوینواری ل گوندێ بوصەلێ هەنە وەکو شکەفتا دیرها (دیلهە)[٧٦].

١٠- خەزینوك جهەکە دکەڤیت سەرێ دیرهێ ل گوندێ سنداڤا[٧٧].

## رووبەرێ ناحیێ:

رووبەرێ ناحیێ دووڤ خشتێ ل خوارێ هاتیەدیارکرن:

١- رووبەرێ ئەردێ کێری چاندنێ دهێت.

٢- رووبەرێ ئەردێ مولکێ (صرف) ب ئاڤی و دێمی ڤە.

٣- رووبەرێ ئەردێ مولکێ (میری) ب ئاڤی و دێمی ڤە.

٤- رووبەرێ گشتی یێ دەڤەرێن کەڤر و بەر و چەروانی.

٥- رووبەرێ گشتی یێ ناحیێ[٧٨]:

| رووبەرێ گشتی یێ کێری چاندنێ دهێت/ دونم | | ٥٤٨٣٤ |
|---|---|---|
| یێ ملك (صرف) | دێم | ٢٨٧٠١ |
| | ئاڤی | ٢٦٦٨ |
| | سەرجەم | ٣١٣٦٩ |
| یێ میری | دێم | ٢٠٠٣٦ |
| | ئاڤی | ٣٤٢٩ |
| | سەرجەم | ٢٣٤٦٥ |
| رووبەرێ گشتی بەردەلان و چەروان/دونم | | ٦٠٥٠٤ |
| رووبەرێ گشتی | | ٥٣١ کم٢ |
| | | ١١٥٣٣٨ دونم |

## گوند و ئاکنجیێن ناحیێ:

٣ کۆمەلگەهـ و ٦٣ گوند سەر بناحیا دەرکارێ ڤە نە[٧٩]، دەسپێکێ ئاکنجیێن ناحیێ ژ سندی و گولیان پێکدهاتن چونکی هەردو وەك عەشیر دهاتنە نیاسین[٨٠]، پشتی ناحیا گولی هاتیە دامەزراندن ل دەڤەرا گولی نها ب ناحیا باتیفا دهێتە نافکرن[٨١]، ناحیە ما بناڤێ سندی چونکی هەمی ئاکنجیێن وێ سندی بوون، ژ (موسلمان و مەسیحیان) پێکدهاتن[٨٢]، و بەری جوهی کوچێ بکەن هندەك مالێن وان ل گوندێ شەرانشێ هەبوون، سالا ١٩٧٨ رژێما بەعسا ژنافچووی خەلکێ هندەك گوندێن دەڤەرا بەرواری بالا راگوهاستن هەر سێ (کۆمەلگەهێن بزۆری) ل گوندێن دەرکار عەجەم و هیزاوا و بێرسڤێ[٨٣].

دووڤ ئامارا سالا ١٩٤٧ هاتیە ئەنجام دان ل

سنوورێ ناحیێ هەژمارا ئاکنجیان (٧٦٣٥) کەس بوون کو پێك هاتین بوون ژ (موسلمان مەسیحی جوهی) و هەژمارا هەر پێك هاتەکێ دڤی دخشتەیێ خوارێ هاتییە دیار کرن[٨٤]:

| ناڤێ پێکهاتێ ل ناحیێ | ژمارا مێیان | ژمارا نێران | سەرجەمێ هەر پێکهاتەکێ |
|---|---|---|---|
| موسلمان | ٢٥٠١ | ٢٤١٥ | ٤٩١٦ |
| مەسیحی | ١٣٧٢ | ١٢٩٨ | ٢٦٧٠ |
| جوهی | ٢٦ | ٢٣ | ٤٩ |
| سەرجەمێ گشتی | ٣٨٩٩ | ٣٧٣٦ | ٧٦٣٥ |

دووڤ ئامارێن سالێن ١٩٤٧ تاکو ١٩٩٨ هاتینە ئەنجام دان هەژمارا ئاکنجیان ل سەنتەرێ ناحیێ بڤی رەنگی لخوارێ بوو وەکو دخشتەی دا هاتییە دیار کرن [٨٥].

| سالا ئامار هاتییە ئەنجام دان | ژمارا ئاکنجیا ل ١٩٩٨ سەنتەرێ ناحیێ |
|---|---|
| ١٩٤٧ | ٢١٢ |
| ١٩٥٧ | ٢٧٩ |
| ١٩٦٥ | - |
| ١٩٧٧ | ٣٢٢٠ |
| ١٩٨٧ | ٢٥٥٨ |
| ١٩٩٨ | ٥٢٠٥ |

هەژمارا ئاکنجیان ل سنوورێ ناحیێ ل سالا ٢٠٠٤ (١١٠٤٨)[٨٦] کەس بوون.

دووڤ ئامارێن رێڤەبەریا ناحیێ ل سالا ٢٠١٠ هەژمارا (تاك و رەگەزا و مال و خانیا) ل گوند و کومەلگەهێن سنوورێ ناحیێ بڤی رەنگێ ل خوارێ بوون وەکو دخشتی دا هاتییە دیارکرن[٨٧]:

هژمارا خەلکێ ناحیێ ل دووڤ ئامارێن تەخمینکری یێن رێڤەبەریا ئامارا دهوکێ بۆ سالا (٢٠١٦)ێ ژێ ١٧٣٥٢ کەسن، ژ وانان ١٦١٢٤ کەس ل باژێرکان دژین و ١٢٢٨ کەس ل گوندان.

| | | |
|---|---|---|
| کۆمەلگەهـ و گوندێن دەرکارێ و هیزاوا و بێرسڤێ یێن( کەڤن و نوی) | ژمارا تاکان | ١٣٢٣٣ |
| | ژمارا نێران | ٦٥٦٦ |
| | ژمار مێیان | ٦٦٦٧ |
| | ژمارا مالان | ٢١٨٥ |
| | ژمارا خنیا | ٢٢٩٥ |
| | ژمارا کولانا | ٢٧ |
| | خانیێن ب کار هاتی | ١٧٦١ |
| | ژمارا خانیێن بەردای | ٥٥ |
| | ژمارا مالا ل دەرکارێ | ٨٠٧ |
| | ژمارا مالا ل هیاوا | ٧٢٨ |
| | ژمار مالا ل بێرسڤێ | ٦٥٠ |
| گوندێن سەر ب ناحیێ ڤە | ژمارا کەسان | ١٦٦٧ |
| | ژمارا خێزانا | ٢٤٧ |
| | ژمارا ئاکنجیا | ٢٤٤ |
| | ژمارا خانیا | ٣٦٠ |

## خرابکرنا گوندا و راگوهاستن:

دنافبەرا سالا ١٩٦١ تاکو سالا ١٩٧٥ گەلەك گوندێن ناحیێ هاتنە توپ بارانکرن ب فرۆکە و توپان، هندەك هاتنەسوتن و هندەك ژێ هاتنە چولکرن. و پشتی پێکهاتنا خیانەتکارانە یا جەزائیرێ ل سالا ١٩٧٥ هەژمارەکا زۆر یا خەلکێ ناحیێ ئاوارەی وەلاتێن ئیران و ترکیا بوون و گەلەك ژێ هاتنە گرتن، دەمێ حکومەتا بەعس دەست ب خراپکرنا گوندێن کوردستانێ کری سالا ١٩٧٦ێ ٣٣ گوند ل سنوورێ ناحیێ ل قوناغا ئێکێ وێران و ڤالاکرن و خەلکێ

وان راگوهاستنە گوندێن دەرکار عەجەم و هیزاوا و بێرسڤێ و گرك سندی و دارهوزانێ و تلکەبەرێ و زاخۆ و هەژمارەکا خەلکی ژی نەفیکرنە باشووری عێراقێ. و ل سالا ١٩٧٧ سێ کۆمەلگەهێن بزۆری ل سنووری ناحیێ گوندێن دەرکار عەجەم و هیزاوا و بێرسڤێ چێکرن[٨٨].

ل ١٩٧٨/٧/١٣ ئێکەم قوناغا راگوهاستنا خەلکێ هندەك گوندێن دەڤەرا بەرواری بالا بۆ ناحیا دەرکارێ دەسپێکر و ل هەر سێ کۆمەلگەهێن ئاماژە پێکری ئاکنجیکرن[٨٩].

و قوناغا دووێ ٢ گوند ل سالێن هەشتیيان ب شەڤەلا هاتنە خرابکرن و قوناغا سیێ ل سالا ١٩٨٧ ێ ٢٥ گوندێن دی ل سنووری ناحیێ هندەك ب هێرشان و توپباران کرنێ و هندەك ب سوتنێ و هندەك شەڤەلا کاڤل و ویرانکرن و خەلکێ وان هندەك ئاوارەی دەڤەرێن ژێر دەستەلاتا شۆرشێ بوون و گەلەك ژی مشەختی کۆمەلگەهێن دەرکار عەجەم و هیزاوا و بێرسڤێ و تلکەبەرێ و گوندێن گرك سندی و دارهوزانێ و باژێرێ زاخۆ بوون[٩٠]. ژ سەرجەمێ ٦٣ گوندێن سەر بناحیێ ڤە ٦٠ گوند و ٢٥ مزگەفت و ٦ دێر و ٢٧ خواندنگەهـ و ١٤ ئاشێن ئاڤێ و دەهان رەز و جنێك و رێك و پر هەمی کاڤل و ویرانکرن. ل ئەنفالا رەش ل سالا ١٩٨٨ ێ ٣٢ گوندێن سەر بناحیێ ڤە کەفتنە بەر کریارێن ئەنفالێ[٩١].

پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ خەلکێ قەستا گوند و وارێن خو کرن و جارەکا سەر ژ نوو ڤە دەست ب ئاڤەدانکرنا دەڤەرێن خۆ کرن وەکو جاران ب جهـ و وارێن خو شاد بوونە ڤە، و ل سنووری ناحیێ تاکو نوکە ٧ گوند هاتینە ئاڤاکرن یێن بناڤێن: شەرانشا سەری، شەرانشا بنی، پەرەخ، دەشتەتەخ، رەبەنکا، تێرك حەسەن، دێرەشیش) و هێشتا ٥٣ گوند مانیە و نەهاتینە ئاڤاکرن و ل هندەك گوندا جەند مالەك چووینە سەر گوندێن خو ژبۆ خودان کرنا تەرش و کەوالی و کارێ چاندنێ[٩٢].

## رێکێن هاتن و چوونێ:

- زاخۆ - دەرکار - باتیفا - کانی ماس
- دەرکار - شەرانشا بنی دبیت (مفرق) بو:

أ- شەرانشا بنی - شەرانشا سەری - سیارا گەورك[٩٣]
- بو گوندێن گەلیێ پساغا - بازنگیرا گەورك
- کوندوك - پەترومە - کەلوك - مارسیس - ئەلانش

ب- بوصەل - باندروو - دبیت (مفرق) بو:
١- پیربلا - ئەفلە
٢- چەم کیرك دبیت (مفرق) بو بانکا بنی - بانکا سەر سەری - منین
٣- بانکا بنی - بو دەڤەرا گولیان - کەشان
٤- خیزاڤا - رێکا سەرەکی زاخۆ - دەرکار - باتیفا کانی ماس

ج- بهێر - ستەڤلان - پەرەخ - قەسروك دبیت (مفرق) بو:
١- قەسروك - دێرەشیش - مێرگەشیش - بو ئێرە بو ئاڤا گیزێ
٢- قەسروك - دەشتەتەخ - رووبارێ هیزل
٣- قەسروك - بەهنونە سندی

- دەرکار - هیزاوا - بێرسڤێ دبیت (مفرق) بو:

١- گوندك ئەیوب سنداڤا گەلی دەرگەل یوسف ئاڤا
٢- داسیك - ئاڤگەنی - خووەك سندی - لیڤو باگولاتك - مێرگە سور - زێوك سندی - سەرکو - تێرك حەسەن - کەبەروك - تێرك مامێزدینی - تێرك سمو - سەر سیلافك

- دەرکار - هیزاوا - گرك سندی - دەرکار نیری گوندك جەلال - دەرجەلال
- دەرکار - زاخۆ - تاوك - تێرك حەسەن - کەبەروك تێرك مامێزدین - تێرك سمو
- دەرکار - زاخۆ - چەم مشکو - دورنەخ - وارصور رەبەنکا - کیزاف

- دەركار - زاخۆ - بەرزیر - هەورزیز - هەڤشن
- دەركار - زاخۆ - دەشتماسەك چەم - دەشتماسەك مەلا - دەحللك مەلەك
- رێكێن ئێك سەر ژ سەنتەرێ ناحیێ دچن بو گوندێن نوردینا - مێرگێ - مامیسا - هیزاوا
- جادە تاكو نوكە نەگەهشتیە گوندێن سنات - بینخرێ - باجوا

## دام و دەزگەهێن میری:

- رێڤەبەری یا ناحیا دەركارێ
- سەروكاتیا باژێرڤانیا دەركارێ
- بنكەهێ ساخلەمیا دەركارێ
- بنكەهێ پولیسێن دەركارێ
- جێگری یا ئاسایشا دەركارێ
- نڤێسینگەها پوستە و گەهاندنا دەركارێ
- نڤێسینگەها زانیاری یا دەركارێ
- پشكا دارای یا دەركارێ
- بنكەهێ شیرەتكاری یێ چاندنا دەركارێ
- فەرمانگەها بارێ شارستانی یا دەركارێ
- خواندنگەهێن بنەرەت یێن بناڤێ (كێرە، سنوور، دەركار، شەرانش، هیزاوا، هەست، ئومێد، بێرسڤێ، زاخوتا)[٩٤].
- خواندنگەهێن ئامادەی یێن بناڤێ (دەركار هیزاوا بێرسڤێ، زاخۆتا)[٩٥].
- سەروكاتیا باژێرڤانی یا بێرسڤێ .
- بنكەهێ ساخلەمیا بێرسڤێ .
- پرۆژێ ئاڤێ ل هیزاوا .
- بنكەهێ ساخلەمیا هیزاوا .
- بنكەهێ فیتەرنەری یا هیزاوا .
- پولیسێن هاتن و چوونێ .

## ژێدەر و پەراوێز:

١. ئەڤ هەژمارا گوندا ل دووڤ سنوورێ كارگێری یێ ناحیا دەركارێ یە نە وەكو سنوورێ دەڤەرا سندیا .

٢. وصفية محمد شيخو السندی، زاخۆ فی العهد الملكي ١٩٢١ ـ ١٩٥٨، الطبعة الاولی، ص ٤٢ .

٣. سندی عەشیرەكە ژ عەشیرێن كوردی سەبارەت ناڤێ سندی هندەك بۆچوون دبێژن یێ ژ (زیندی) هاتی وەرگرتن د روودانیێن ٤٠٥ ز و دبەرامبەر دا هندەك بۆچوونێن دی هەنە دبێژن رەسەناتییا پەیڤا (سندی) دبنەرەت دا (صندی) یە رامانا وێ (صنگێ ب هێز و نە لڤ) و هندەك راو و بۆچوونیێن دی هەنە دبێژن ریهـ و ریشالیێن ڤێ عەشیرێ ڤەدگەرن بو مللەتێ (السند) و دبەرامبەر دا هندەك لایەنیێن دی دبێژن عەشیرا (سندی) ژ مللەتێ (ئاری) نە و بەلێ بۆچوونا هەرە بهێز ئەوە كو عەشیرا (سندی) ئێكە ژ تایێن مللەتێ بوختی (البختیه) ئانكو بوتی بهەر ئاوایەكێ بیت عەشیرا (سندی) ئێكە ژ هەر چار رەسەنترین عەشیرێن دەڤەرا بەهدینان كوپێكدهێن ژ عەشیرێن (زێباری، مزوری، سلیڤانەی، سندی) و جارێ ئێكەم ناڤێ عەشیرا سندی دژێدەرێن دیروكی دا نڤێسین ڤەدگەریت بو دیرۆكنڤێس (ابن فضل الله العمری) ل سالا ١٣٤٨ ز عەشیرا سندی یا پێكهاتییە ژ (پساغا، مالا عەجەمێ، شیڤەرمنی، چونكی، بوسەلی، شەرانشی، بەنستانی، نیری، مامێزدینی، مچولی، صوفی بابلا، پەرخی، بلكی، مەندوز، شیخ ئیزدینی) هەر وەسا مارك سایكس دەمێ هاتیە كوردستانا باكوور و باشوور ل چەرخێ بیستێ دبێژیت عەشیرا سندی ١٥٠٠ خێزان بوو و عەشیرەكا تێكەلە ژ موسلمان و مەسیحییا سنوورێ دەڤەرا سندیا ژلایێ باكووری ڤە كوردستانا باكوورە و ژلایێ باشووری ڤە روبارێ خابیرە و ژلایێ روژهەلاتی ڤە ناحیا گولی یە و ژ لایێ روژئاڤای ڤە رووبارێ هیزلێ دنافبەرا كوردستانا باكوور و باشوور دا دەڤەرا سندییا ب شێوەیەكێ گشتی یا پێك هاتییە ژ (٩٦) گوندا و چوار گوند ژ ڤان گوندا یێن بناڤێ (شكەفت مار، مەهەندیك، تلكەبەر، خرابابك) یێن كەتینە د سنوورێ باژ]رڤانییا زاخۆ دا و گوندێن دەڤەرا سندییا ژ لایێ كارگێری ڤە سەر ب سێ

# گوندێن ناحیا دەرکارێ

ئازاد عیزەدین

## گوندێ دەرکار عەجەم

بنیاتێ ناڤێ گوندی ژ (دەرێ کاری) هاتییە وەرگرتن، رێکەکا سەرەکی بوو بۆ هاتن و چوونا گوندێن دەڤەرێ ل بانکێ و هەردو شەرانشا و گەلیێ پساغا و ستەڤلانێ و پەرەخێ و قەسرۆکێ و دەشتەتەخێ و سناتێ[1]. بۆچوونەك هەیە دبێژیت ژ (دەرـ دەرگە) هاتییە وەرگرتن، ئانکو ل هنداڤی گوندێ دەرکارێ ل چیایێ کێرە وەك دەرگەهەکێ یە بۆ هاتن و چوونا گوندێن دەڤەرێ پێن پشت چیایێ کێرە، گوندێ دەرکارێ ب گوندێ دەرکار عەجەم دهێتە بناڤکرن، (عەجەم)[2] ئەو کەسە یێ کو گوندێ دەرکارێ ئاڤاکری. ١٤کم ژ سەنتەرێ قەزا زاخۆ دوورە، دکەڤیتە باکووری رۆژهەلاتی قەزا زاخۆ، سرۆشتێ وی گوندەکێ نیمچە چیایی یە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** چیایێ کێرە و گوندێن: مامیسا وشەرانشا بنی.

**باشووری:** گوند و کۆمەلگەها هیزاوا.

**رۆژهەلاتی:** گوند و کۆمەلگەهێن بێرسڤێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مێرگێ.

### رووبەرێ گوندی[3]:

| کەرت | رووبەرێ گشتی دۆنەم | رووبەرێ کێری چاندنێ دهێت دۆنەم | بەردەلان و چەروان و دۆنەم |
|---|---|---|---|
| ٤٦ | ١٨٨٣ | ١٥٨٢ | ٢٠١ |

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەندین کانی لێ هەنە وەك کانییا مێرا و کانییا شەهزادێ و کانییا گەلیێ عەلوی و کانییا شێلێ و کانییا پەخێ و هندەك ژێدەرێن دی ژی لێ هەنە وەك ئاڤێن نهالا کەحێلوکێ و نهالا دەحلێ و نهالا ریلێ، هندەك ژێدەرێن وەرزی ژی لێ هەنە و ل سالا ١٩٩٧ سکرەك لێ هاتییەچێکرن.

### جهێن بەرنیاس:

گرێ چەپەرێ و گرێ گوزێ و سێ گرکا و دەشت هێژیکێ و گەلێ رەشوی و چەمکێ جندوی و گرێ کەحێلوکێ و ملا رەشوی و گەلی و نهالا کەهنی سپیێ و گوهورێ و خرابوکی و جهێ بێدەرا .

### رێکێن گوندی:

- دهۆك ـ زاخۆ ـ دەرکار.

- دهۆك ـ زاویتە ـ سەرسنك ـ بامەرنێ ـ باتیفا ـ دەرکار.
- زاخۆ ـ هیزاوا ـ دەرکار.
- زاخۆ ـ خرابابك ـ تاوك ـ سەرکو ـ مێرگەسۆر ـ باگولاتك ـ لێڤو ـ خوەك ـ ئاڤکەنی ـ هیزاوا ـ دەرکار.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی سندینە دبێژنێ (مالا عەجەمێ)، ژ بنەمالا (خلیفەی و حوچەی و بوهتیێ و تەهی و برەهیمێ و شەنگی و بوزەی و شێخێ و ئاغوی و منینی)، هژمارا خەلکێ ناحیێ ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١١٢٥٧ کەس بوون[٤] و هژمارا وان وەکی گوند ل دووڤ هەمان سەرژمێری ٢٢٩ کەس بوون[٥]. نها گەلەك خەلکێ دی لێ ئاکنجینە، ل سالا ٢٠١٠ێ هژمارا ئاکنجییان ل گوند و کۆمەلگەهێن دەرکارێ بڤی رەنگێ لخوارێ بوو:

| هژمارا مالان | هژمارا نێرا | هژمارا مێیان | هژمارا تاکان |
|---|---|---|---|
| ٨٠٧ | ٢٣٠٢ | ٢٣٩٥ | ٤٦٩٧ |

هژمارا خەلکێ ناحیێ ل دووڤ ئامارێن تەخمینکری یێن رێڤەبەریا ئامارا دهۆکێ بۆ سالا (٢٠١٦)ێ ژی ١٧٣٥٢ کەسن، ژ وانان ١٦١٢٤ کەس ل باژێرکان دژین و ١٢٢٨ کەس ل گوندان.

گوندێ دەرکارعەجەم کەڤنترین گوندێ (مالا عەجەمێ)[٦] یە ل دەڤەرا سندییان، ل سالا ١٩٣٨ێ مزگەفت لێ هاتییە ئاڤاکرن، ل بهارا سالا ١٩٦٢ێ ژ ئالیێ رژێما وی سەر دەمی ڤە هاتییە سۆتن، ل سالا ١٩٧٠ێ ئاشەك ب ناڤێ (ئاشێ خموی) لێ هاتییەدانان، ل سالا ١٩٧١ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، ل سالا ١٩٧٧ێ کارەب گەهشتیێ، ژ سالا ١٩٧٦ێ تاکو سالا ١٩٨٧ێ د چەندین قۆناغاندا

گوندێ دەرکار عەجەم



رژێما بەعسا ژنافچوویی خەلكێ گوندێن (مینێ و چەم كیركی و باندرو و سناتێ و دەشتەتەخێ و شەرانشا بنی و شەرانشا سەری و نۆردینا)[٧] یێن دەڤەرا سندیا راگوهاستنێ، ل سالا ١٩٧٧ێ حكومەتا بەعس كۆمەلگەهەكا بزۆری ب ناڤێ (كۆمەلگەها دەركارێ) لێ چێكر، سالێن ١٩٧٨ – ١٩٧٩ێ د چەندین قۆناغاندا خەلكێن گوندێن (كانی سارکێ، قومرێ، سەرەروو، ئەدنێ، ئۆرمانێ، بێقولكێ، دیشیشێ و هرورێ)[٨] یێن دەڤەرا بەرواری بالا راگوهاستنێ، و ل سالا ١٩٧٨ێ حكومەتا بەعس رێڤەبەریا ناحیا سندی ژ گوندێ شەرانشا بنی ڤەگوهاستە گوندێ دەركار عەجەم، سەرهلدانا ١٩٩١ێ ل رۆژا ١٩٩١/٣/١٣ێ هاتییە ئازادكرن ژ رژێما بەعسی، سالا ١٩٩١ێ ل كۆچا ملیونی گوند و كۆمەلگەهێن دەركارێ هاتینەبەردان و خەلكێ وێ هەمی ژ بەر هێرشێن حكومەتا بەعس بۆ سەر كوردستانێ ئاوارەی تركیا و سەر سنوورێ تركیا بوون و پشتی (دەڤەرا ئێمن) ل سالا ١٩٩١ێ هاتییە دانان جارەكا دی خەلكێن وێ ڤەگەریانە سەر جهـ و وارێن خۆ، ل سالا ١٩٩١ێ جەنابێ رێزدار (مەسعود بارزانی) سەرەدانا دەركارێ كرییە، ل ١٩٩٩/١٠/٧ێ سەرۆكاتییا باژێرڤانیێ لێ هاتییە دامەزراندن و ئێكەم سەرۆك باژێرڤانی (ئیراهیم لەزگین صالح) بوو، سالا ٢٠١٠ێ باژێرڤانییا هیزاوا دگەل سەرۆكاتییا باژێرڤانییا دەركارێ هاتییە گرێدان.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل سەرچاندنا دێمی وەك (گەنم و جەهـ و نۆك و نیسك) و چاندنا ئاڤی وەك (كونجی و برنج و ماش و گارس) و چاندنا (هژیر و تری و هنار) و بەرهەمێن سرۆشتی وەك (كەزوان و مازی) وچوونا كاروانان و خودانكرنا تەرش و كەوالی.

### گەشت و گوزار:

سكرێ دەركارێ وەك جهەكێ گەشتیاری دهێتە هژمارتن ل سنوورێ ناحیێ.

### پیشەسازی:

كارێ چێكرنا مەحفیرا ل گوندێ دەركارێ دهاتەكرن، هندەك جۆرێن بەرێن سۆر ل سالێن هەشتیان ژ دەركارێ دهنارتنە مووسل بۆ چێكرنا كاشی و هندەك كارێن دی دهاتنە بكار ئینان.

### شوینوار:

شكەفتا گەلیێ عەلوی و گرێ گوزێ وەك جهێن شوینواری ل دەركارێ دهێنە هژمارتن.

## گوندێ هیزاوا

بنیاتێ ناڤێ گوندی: ژ (هێزا ئاڤێ) هاتییە وەرگرتن، بەرێ هندی ئاڤ ل ڤی گوندی هەبوو، ژ بەر هندێ ئەڤ گوندە یێ ب هیزاوا هاتییەناڤكرن[٩].
دكەڤیتە دووراتییا (٣كم) باشوورێ سەنتەرێ ناحیێ، سرۆشتێ وی گوندەكێ دەشتی یە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوند و كۆمەلگەهێن (دەركار عەجەم).

**باشووری:** گوندێ بەهراڤا.

**رۆژهەلاتی:** گوند و كۆمەلگەهێن بێرسڤێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گرك سندی، كو سەر ب ناحیا رزگاری ڤەیە.

### روبەرێ گوندی:

| كەرت | روبەرێ گشتی دۆنەم | روبەرێ كێری چاندنێ دهێت دۆنەم | بەردەلان و چەروان دۆنەم |
|---|---|---|---|
| ٤٦ | ١٨٨٣ | ١٥٨٢ | ٢٠١ |

### زێدەرێن ئاڤێ:

چەندین كانی لێ هەنە وەك كانییا سركێ و كانییا هەڤشی و كانییا نهالا قەرامی و كانییا نهالا مێوكێ و هندەك زێدەرێن وەرزی ژی لێ هەنە.

**جهێن بەرنیاس:**
چەپەرا ئەسمەر و چەمێ رملك و نەرمە و زراڤك و بەرزویر و تیا هیزاو.

**رێکێن گوندی:**
- دەرکار ـــ هیزاوا
- دەرکار ـ شەرانشا بنی ـ بانك ـ خیزاڤا ـ ئاڤکەنی ـ هیزاوا
- زاخۆ ـ هیزاوا
- زاخۆ ـ خرابابك ـ تاوك ـ سەرکو ـ مێرگە سور ـ باگولاتك ـ لێڤو ـ خوەك ـ ئاڤکەنی ـ هیزاوا

**پێکهاتا گوندی:**
پێك هاتینە ژ بنەمالا (کەریم دوشە و شلەیمون و بەحو و بتروس زەیتو و ئیصتەیڤان)[10]، و نها کەلەك خەلکێن دی لێ ئاکنجینە، ل سالا ٢٠١٠ێ هژمارا ئاکنجیان، گوند و کۆمەلگەها هیزاوا بڤی رەنگێ لخوارێ بوو:

| هژمارا مالان | هژمارا نێرا | هژمارا مێیان | هژمارا تاکان |
|---|---|---|---|
| ٧٢٨ | ٢١٢٦ | ٢٠٦٩ | ٤١٩٥ |

گوندێ هیزاوا[11]، دێرەك لێ هەیە، ل سالا ١٩٧٦ێ خواندنگەهـ لێ هاتیبە ڤەکرن، ژ سالا ١٩٧٦ێ تاکو ١٩٨٧ێ بەردەوام و دچەندین قۆناغاندا حکومەتا بەعس خەلکێ گوندێن (ئەلانشێ و بازنگیرا و بەهراڤا و سەرسیلاڤکێ و کەبەرۆکێ و مێرگێ) یێن دەڤەرا سندیان راگوهاستنێ و ل سالا ١٩٧٧ێ حکومەتا بەعس دو کۆمەلگەهێن ب زۆر بناڤێ (کۆمەلگەها هیزاوا) لێ چێکرن، و ل سالا ١٩٧٨ێ تاکو سالا ١٩٧٩ێ رژێما بەعس خەلکێ گوندێن (هدێنێ وئۆرمەوداودا ومائێ وبناڤێ وچەلکا موسلمانا) یێن دەڤەرا بەرواری بالا راگوهاستنێ، و ل سالا ١٩٩١ێ ل کۆچا ملیونی گوند و کۆمەلگەهێن هیزاوا هاتینە بەردان و خەلکێ وێ هەمی ئاوارەی ترکیا و سەر سنوورێ ترکیا بوون، ژ بەر هێرشێن رژێما بەعس بۆ سەر کوردستانێ و پشتی (دەڤەرا ئێمن) ل سالا ١٩٩١ێ هاتیبە دانان جارەکا دی خەلکێن وێ ڤەگەریانە سەر جهـ و وارێن خۆ، ل سالا ٢٠٠١ێ سەرۆکاتیا باژێرڤانیێ لێ هاتیبە دامەزراندن و ئێکەم سەرۆکێ باژێرڤانیێ (مصلح عسمان صەدیق) بوو، ل سالا ٢٠١٠ێ باژێرڤانیا هیزاوا دگەل سەرۆکاتیا باژێرڤانیا دەرکارێ هاتیبە گرێدان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**
لسەر چاندنا ئاڤی بو وەك (هنار و هەژیر و تری) و چاندنا (برنجی و باجانێن سۆر) و کەسکاتیێ و چاندنا دێمی وەك (گەنم و جەهـ و نۆك و نیسك) و خودانکرنا تەرشی و کەوالی و حێوانی[12].

## گوندێ بێرسڤێ/ کۆمەلگەها بێرسڤێ

بنیاتێ ناڤێ گوندی: ژ پەیڤێن (بر ساوا) هاتیبە وەرگرتن، ئەڤ هەردو پەیڤە دناڤ دێرا گوندی دا ل دەمێ ئاڤاکرنا گوندێ بێرسڤێ هاتینە نڤیسین و ب بۆرینا دەمی یێن بووینە بێرسڤێ. دووراتیا (٧کم) ژ رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیێ دوورە، سرۆشتێ وێ گوندەکێ دەشتی یە.

**سنوورێن گوندی:**
**باکووری،** گوندێ نداڤا.
**باشووری،** گوندێ سەر سیلاڤکێ.
**رۆژهەلاتی،** گوندێ داسیك.
**رۆژئاڤایی،** گوند و کۆمەلگەهێن دەرکار عەجەم.

**رووبەرێ گوندی:**

| کەرت | | رووبەرێ گشتی دۆنەم | رووبەرێ کێڵێ چاندنێ دهێت دۆنەم | بەردەلان و چەروان دۆنەم |
|---|---|---|---|---|
| رۆژهەلات | ٤٦ | ١٨٨٣ | ١٥٨٢ | ٢٠١ |
| رۆژ ئاڤا | ٢ | ٢٥١٩ | ١٩٦٧ | ٥٥٢ |

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەندین کانییێن ئاڤێ لێ هەنە وەك کانییا دادیك و کانییا ئیسحاق و کانییا بەلالا و کانییا عەودیش و کانییا شەمو و جووا میری[13]) تاکو سالا ١٩٩١ێ دگەهشتە بێرسڤێ.

### جهێن بەرنیاس:

گرێ قەبرا و گرێ رەزا و گرێ دێرا مارشمونی و کەڤرا دادیك و چەمێ رەزا وکەرمانێ وناعورێ.

### رێکێن گوندی:

- دەرکار ـ هیزاوا ـ بێرسڤێ.
- دەرکار ـ شەرانش ـ بانك ـ خیزاڤا ـ ئاڤکەنی ـ بێرسڤێ.

زاخۆ ـ هیزاوا ـ بێرسڤێ.

- زاخۆ ـ خرابابك ـ تاوك ـ سەرکو ـ مێرگە سور ـ باگولاتك ـ لێڤو ـ خوەك ـ ئاڤکەنی ـ بێرسڤێ

### پێکهاتا گوندی:

ب عەشیرەت سندی نە (مەسیحی ـ کلدانی) پێکهاتینە، ژ بنەمالا (قەشە مامو و ئیشو ومشو زویرو و یەونان گەورو کرێتو و پونێ و گەروما و هێلانکێ و گەزنەخی و هوزی و مەرگەهی و بێجهی و نیسانۆکا و بەبێ و توتا و کوروری) و نها گەلەك خەلکێ دی لێ ئاکنجی نە، هژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٨٦ کەس بوون[14] و سالا ٢٠١٠ێ هژمارا ئاکنجییان ل گوند و کۆمەلگەهێن بێرسڤێ بڤی رەنگێ لخوارێ بوو:

| هژمارا مالان | هژمارا نێرا | هژمارا مێیان | هژمارا تاکان |
|---|---|---|---|
| ٦٥٠ | ٢١٣٨ | ٢٢٠٣ | ٤٣٤١ |

گوندێ بێرسڤێ کەڤنترین و بناڤ ودەنگترین گوندێ (مەسیحیانە)[15] ل دەڤەرا سندییان، دێرەکا گەلەك کەڤن ب ناڤێ (مارگورگیس) لێ هەیە، دیرۆکا ئاڤاکرنا وێ ڤەدگەریت بۆ سالا ١٢٠٠ێ، و ل دەسپێکا دامەزراندنا ناحیا (سندی گولی) سەنتەرێ ناحیێ ل گوندێ بێرسڤێ بوو پشتی ناحیا (گولی) هاتییە دامەزراندن ل سالا ١٩٢٥ ژێ هاتییە ڤەگوهاستن بۆ گوندێ شەرانشا بنی، مەخفەرەك لێ هەبوو، ل سالا ١٩٤٣ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن، و ژ سالا ١٩٧٦ێ تاکو سالا ١٩٨٧ێ چەندین قۆناغان دا رژێما بەعس خەلکێن گوندێن (باجوا و شەرانشێ و دێرەشیشێ و ئێرێ و کرکرانکێ و سنداڤا ویوسف ئاڤا ودێرێ وگەلی دەرگەل وماميسا و سەرسیلافك وداسیك وگوندك ئەیوب وبۆصەلێ وزێوکا بۆصەلیا) یێن دەڤەرا سندییان راگوهاستنێ، ل سالا ١٩٧٧ێ رژێما بەعسی کۆمەلگەهەکا ب زوری ب ناڤێ (کۆمەلگەها بێرسڤێ) لی چێکر، و ژ سالا ١٩٧٨ێ تاکو سالا ١٩٧٩ێ د چەندین قۆناغاندا رژێما بەعسا ژناڤچوويی خەلکێن گوندێن (بەربیرێ و تروانشێ وچەلکا مەسیحیان و تشیشێ و دەرگەلا سەیدا و چەقەلا و جدیدکێ و کانی ماسێ و بیکداودا) یێن دەڤەرا بەرواری بالا ژی راگوهاستنێ، و دو ئاشێن ئاڤێ لێ هەبوون، بەر جووا میری کار دکر، ئێك ب ناڤێ ئاشێ دێرێ و یێ دی ئاشێ کانییا کوترێ بوو، ل سالێن پێنجیا ئاشەکێ دی ژی لێ هاتە دانان ب گازێ کار دکر بناڤێ ئاشێ عەبدولئەحەدی ناڤکربوون، سالا ١٩٩١ێ ل کۆچا ملیونی گوند و کۆمەلگەهێن بێرسڤێ هاتنە بەردان و خەلکێ وێ هەمی ئاوارەی ترکیا و سەر سنووری بوون و پشتی (دەڤەرا ئێمن) سالا ١٩٩١ێ هاتییەدانان، جارەکا دی خەلکێ وێ ڤەگەریانە سەر جهـ و وارێن خو، و ل ٢٠٠١/٦/٩ێ سەرۆکاتییا باژێرڤانیێ لێ هاتییە دامەزراندن و ئێکەم سەرۆك باژێرڤانی (کامل ئەحمەد عسمان) بوو، ل سالا ٢٠٠٥ێ گەلەك خەلکێن ڤی گوندی و گەلەك مەسیحییێن دی ژ ناڤەراست و باشووری عێراقێ ڤەگەریانێ[16].

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

لسەر چاندنا ئاڤی بوو وەك: هنار و هژیر و تری و خۆخ و مشمش و حلیك و سێڤ و چاندنا (کونجی

و برنجی) وچاندنا باجانێن سۆر و خیار وكەسكاتیێ وچاندنا دێمی وەك گەنم و جەهـ و نۆك و نیسك و گوندور و رەزێن دێمی و كارێ شڤانیێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی و گیانەوەرا.

**شوینوار:**

گركێ ئاخی وەك جهەكێ شوینواری دهێتە هژمارتن ل گوندێ بێرسڤێ.

ل هاڤینان خەلكێ گوندی دچوونە زۆزانا ل سەركێ (گەزنكێ و ئاڤروكی) ل دەڤەرێن چیایی ل باكوورێ رۆژهەلاتێ ناحیێ[17].

## گوندێ ئاڤا گویزێ

**بنیاتێ ناڤێ گوندی:**

ژ كانییەكا ئاڤێ و دارەكا گویزێ هاتییەوەرگرتن، دارەكا گویزێ ل ڤی گوندی هەبوو و ل بنێ وێ دارێ كانییەكا ئاڤێ ب ناڤێ ئاڤا گویزێ هەبوو، ژ بەر هندێ دبێژنێ گوندێ ئاڤا گویزێ. دكەڤیتە دووراتیيا (٢٨كم) باكوورێ سەنتەرێ ناحیێ، سرۆشتێ وی گوندەكێ چیایی یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ بلەهێ نێروە ل باكوورێ كوردستانێ.

**باشووری:** گوندێ ئەلانش.

**رۆژهەلاتی:** دەڤەرا زاویتێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سنات.

**رووبەرێ گوندی:**

| كەرت | رووبەرێ گشتی دۆنەم | رووبەرێ كێری چاندنێ دهێت دۆنەم | بەردەلان و چەروان دۆنەم |
|---|---|---|---|
| ٥٧ | ٢٧٣١ | ٦١ | ٢٦٧٠ |

**زێدەرێن ئاڤێ:**

چەندین كانی لێ هەنە وەك كانییا گویزێ و كانییا سێ كوچێ و كانییا كوكیتێ و كانییا كولیتێ و كانییا مەزن و ل بنێ گوندی سیلاڤەكا ئاڤێ هەیە.

**جهێن بەرنیاس:**

خارا هەسپا و مەیدانكا و هەڤشێ شبلی و بەنا ئەحمەرێ و كیزێ صۆر و گرێ بێنخرێ و شكەفتا گەلیێ سیلاڤێ.

**رێكێن گوندی:**

- دەركار ـ شەرانشا بنی ـ بهێر ـ ستەفلان ـ پەرەخ ـ قەسرۆك ـ مێرگەشیش ـ ئاڤاگویزێ.
- دەركار ـ هیزاوا ـ ئاڤكەنی ـ خیزاڤا ـ بانك ـ شەرانشا بنی ـ بهێر ـ ستەفلان ـ پەرەخ ـ قەسرۆك ـ مێرگەشیش ـ ئاڤاگویزێ.
- زاخۆ ـ دەركار ـ شەرانشا بنی ـ بهێر ـ ستەفلان ـ پەرەخ ـ قەسرۆك ـ مێرگەشیش.

**پێكهاتا گوندی:**

سندی نە دبێژنێ ( پساغا)، پێكهاتییە ژ (مالا ئاقیب ئاغای). هژمارا وان ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٠ كەس بوون[18]. سالا ١٩٧٦ێ حكومەتا بەعس گوند خرابكر خەلكێ وی بۆ باژێرێ زاخۆ راگوهاستن و تا نها گوند نە هاتییە ئاڤاكرن.

**زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ل سەر چاندنا ئاڤی بوو وەك: گویز و خۆخ و سێڤ و حلیك و دارێن سپینداری وچاندنا كونجی و ماش و كارس و فاصولی و خودانكرنا تەرش و كەوالی و گیانەوەران.

گوندێ ئاڤا گویزێ گوندەكێ چیایی یە و دەڤەرەكا بەرنیاسە بجهێن (زۆزان) یێ ل دەڤەرێ[19].

## گوندێ ئەلانش

بنیاتێ ناڤێ گوندی: ژ ناڤێ ئانوش هاتییە وەرگرتن.

دکەڤیتە دووراتییا (٢٦كم) باكوورێ سەنتەرێ ناحیێ، سرۆشتێ وی گوندەکێ چیایی یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ ئالوش ل باكوورێ كوردستانێ.

**باشووری:** چیایێ خامتیرو گوندێ ستەفلان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ كركرانك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مێرگە.

**رووبەرێ گوندی:**

| کەرت | رووبەرێ گشتی دۆنەم | رووبەرێ کێڕی چاندنێ دهێت دۆنەم | بەردەلان و چەروان دۆنەم |
|---|---|---|---|
| ٦٣ | ٢٤٣٢ | ٢٣٧ | ٢١٩٥ |

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەندین کانی لێ هەنە وەك: كانییا حەپوی، كانییا بەزوی، كانییا سەرێ ئاڤێ، كانییا روخەی و .... هتد و رووەکێ بچوویك لێ هەیە دبێژنێ رووێ ئەلانشێ.

**جهێن بەرنیاس:**

زەڤیا دێمك و خرابەی و دێمك و جەمێ بەروژا مامێ میخو و کەلێت و هندەك شکەفت ژی لێ هەنە وەك شکەفتا سەرێ ئاڤێ و شکەفتا سپی و شکەفتا لاتا زەمێ و شکەفتا کەر.

**رێکێن گوندی:**

- دەرکار ـ شەرانشا بنی ـ شەرانشا سەری ـ بازنگیرا ـ گەورك ـ كوندوك ـ پەترومە ـ كەلوك ـ مارسیس ـ ئەلانش
- دەرکار ـ هیزاوا ـ ئاڤگەنی ـ خیزاڤا ـ بانك ـ شەرانشا بنی ـ شەرانشا سەری ـ بازنگیرا ـ گەورك ـ كوندوك ـ پەترومە ـ كەلوك ـ مارسیس ـ ئەلانش
- زاخۆ ـ دەرکار ـ شەرانشا بنی ـ شەرانشا سەری ـ بازنگیرا ـ گەورك ـ كوندوك ـ پەترومە ـ كەلوك ـ مارسیس ـ ئەلانش

**پێکهاتا گوندی:**

ب عەشیرەت سندی نە، (مەسیحی ـ کلدانی) نە، ژ (مالا حەنەکەڤەرا و مالا ئوشانەی) پێکهاتینە. هژمارا وان ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٦٤ کەس بوون[٢٠].

گوندێ ئەلانشێ: دێرەك بناڤێ (مار یوحنا) لێ هەبوو، ل ١٩٧٦/٨/٨ێ حکومەتا بەعس خەلکێ گوندی راگوهاستنە گوندێ هیزاوا و گوند هەمی خرابکر، و ل سالا ١٩٨٦ێ گوند ژ دەڤەرێن رزگارکریێن ژێردەستەلاتێ شۆرشا گولانێ بوو و خەلکەك زڤرینەڤە سەر گوندی جارەکا دی هاتییەڤە ئاڤاکرن بەری دەسپێکرنا هەوا ئەنفالێن دەڤەرا بادینان ٥٠ خێزان ل گوندی دژیان، د ڤێ هێرشێدا خەلکێ گوندی مشەخت بوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ[٢١] و حکومەتا بەعس گوند خرابکرە ڤە و تاکو نها نە هاتییە ئاڤا کرن، ل سالا ٢٠١٢ێ جادە گەهشتییە گوندی

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

سەر چاندنا ئاڤی بوو وەك: گویز و هنار و هژیر و تری و چاندنا ماش و گارس و کونجی و برنج و چاندنا دێمی وەك: گەنم و جەهـ و رەزێن دێمی وبەرهەمێن سرۆشتی وەك (کەزوان و مازی و گوهیشك) و خودانکرنا تەرشی و کەوالی و چوونا کاروانان.

ل هاڤینان خەلکێ گوندی دچوونە زۆزانـا ل مەیدانێ ب دەڤەرا ب (مەیدانۆك) ناسیارە دەڤەرەکا چیایی یە[٢٢].

## گوندێ ئێرە

مەسیحی دبێژنە ڤی گوندی (بەردە)، دکەڤیتە

دووراتیبا (٢٩كم) باكوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ، گوندەكێ چیایی یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ ئاڤا گویزێ.

**باشووری،** گوندێ باجوا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بێنخرێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مێ

**رووبەرێ گوندی:**

| كەرت | رووبەرێ گشتی دۆنەم | رووبەرێ كێری چاندنێ دهێت دۆنەم | بەردەلان و چەروان دۆنەم |
|---|---|---|---|
| ٦٥ | ٦٤٠٥ | ٩٠٨ | ٥٤٩٧ |

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەندین كانی لێ هەنە وەك كانیا باهیڤ و كانیا سرك و كانیا كوزەل و كانیا بنێ گوندی وهندەك ژێدەرێن وەرزی ژی لێ هەنە.

**جهێن بەرنیاس:**

كێرا بەنێ و بێكلالێ و گرێ ئێرێ و زەڤیا تومەی و زەڤیا قەشەی و دەراڤێ ئێرێ و گەلەك شكەفت ژی لێ هەنە وەك شكەفتا رەولەی و شكەفتا دەگالە و شكەفتا كوچو و شكەفتا كوریێ وشكەفتا دو دەرگەهـ

**رێكێن گوندی:**

- دەركار ـ شەرانشا بنی ـ بهێر ـ ستەڤلان ـ پەرخ ـ قەسرۆك ـ مێرگەشیش ـ ئێرە
- دەركار ـ هیزاوا ـ ئاڤكەنی ـ خیزاڤا ـ بانك ـ شەرانشا بنیـ بهێرـ ستەڤلان ـ پەرخ ـ قەسرۆك ـ مێرگەشیش ـ ئێرە
- زاخۆ ـ هیزاوا ـ دەركار ـ شەرانشا بنی ـ بهێر ـ ستەڤلان ـ پەرخ ـ قەسرۆك ـ مێرگەشیش ـ ئێرە

**پێكهاتا گوندی:**

(مەسحی ـ كلدانی)نە ژ بنەمالێن (قەشە یوخەنوی وئیسفوكی و مەرقوسی وكانونی و ساواكی) پێكهاتینە. هژمارا وان ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤٠ كەس بوون[٢٣].

سالا خواندنێ ١٩٧٠- ١٩٧١ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتیبەڤەكرن[٢٤].

گوندێ ئێرێ: دێرەك گەلەك كەڤن بناڤێ (مریەم عەزرا) لێ هەبوو، سالا ١٩٧٦ێ حكومەتا بەعس خەلكێ گوندی راگوهاستنە زاخۆ و گوند هەمی خرابكر و تاكو نها نە هاتیە ئاڤاكرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

سەر چاندنا ئاڤی بوو وەك: گویز و هژیر وتری و هنار و چاندنا برنج و گارس و ماش و چاندنا دێمی وەك: گەنم و جەهـ و نیسك و رەزێن دێمی و چێكرنا مێویژا وبەرهەمێن سرۆشتی وەك (كەزوان و بیۆك و مازی و گوهیشك و رێلیك) وخودانكرنا تەرش و كەوالی و چوونا كاروانی.

**شوینوار:**

جهەكێ شوینواری لێ هەیە دبێژنێ قەندیشوك، ل هاڤینان خەلكێ گوندی دچوون بێكلالێ[٢٥].

## گوندێ باجوا

دكەڤیتە دووراتیبا (١٨كم) باكوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ، گوندەكێ چیایی یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ ئاڤاگویزێ.

**باشووری،** كەلیێ باجوایێ و گوندێ پەرەخ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێنخرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئێرە.

**جهێن بەرنیاس:**

رەزێ رەشوی و سەرێ خووێ و قەسرێ رەشوی و دەرە زڤێ و خوارێ زینك و شكەفتا كالاب و شكەفتا تومەی و شكەفتا زینك و شكەفتا غەریب و شكەفتا بانە و شكەفتا قەشەی و شكەفتا كەڤرا خەلێف و شكەفتا دەرێ بوز.

**ریكێن گوندی:**

- دەركار ـ شەرانشا بنی ـ بهێر ـ ستەڤلان ـ پەرەخ ـ باجوا[٢٦].
- دەركار ـ هیزاوا ـ ئاڤكەنی ـ خیزاڤا ـ بانك ـ شەرانشا بنی ـ بهێر ـ ستەڤلان ـ پەرەخ ـ باجوا.
- زاخۆ ـ هیزاوا ـ دەركار ـ شەرانشا بنی ـ بهێر ـ ستەڤلان ـ پەرەخ ـ باجوا.

**پێكهاتا گوندی:**

ب عەشیرەت سندی نە، ئایین مەسیحی و نەتەوە كلدانی نە ژ (مالا رشوێ سیمكێ و مالا قەشە یوخەنەی و مالا صەپنوی و مالا بیقاشا و مالا كەنوی و مالا یاقوی) پێكهاتینە. هژمارا وان ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٩ كەس بوون[٢٧].

سالا ١٩٧٦ێ حكومەتا بەعس خەلكێ گوندی راگوهاستنە گوند بێرسڤێ و گوند هەمی خرابكر و هێژ نە هاتیە ئاڤاكرن.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەندین كانیێن ئاڤێ لێ هەنە وەك كانیا دەحلێ و كانیا گێمێ بەرۆژا و كانیا هەرفتێ و كانیا بەرێ بەریێ و رووەك گەلیێ پساغا ل بەر گوندی دا دبۆریت دبیت.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

سەر چاندنا ئاڤی بوو وەك: هنار و هژیر و تری و هرمیك و سێڤ و خۆخ و چاندنا باجانێن سۆر و خیار و كەسكاتیێ وچاندنا ماش و كونجی و برنجی و چاندنا دێمی وەك گەنم و جەهـ و رەزێن دێمی و چێكرنا مێویژا وبەرهەمێن سرۆشتی وەك: (كەزوان و مازی و گوهیشك) وخودانكرنا تەرش و كەوالی و گیانەوەرا و چوونا كاروانی. هاڤینان خەلكێ گوندی دچوون چیایێ خامتیری ل باكوورێ ناحیێ[٢٨].

## گوندێ بازنگیرا

بنیاتێ ناڤێ گوندی: ژ تەیرێ (باز و گر) هاتیە وەرگرتن، رامانا وان ڤەدگەریت بۆ هەبوونا جهەكی ل گوندی ب ناڤێ دەرگەهێ (باز) و (گر) ل دۆرێن گوندی هندەك گرێن بلند هەنە و ناڤێ گوندی یێ ژ (بازێن گرا) هاتیە وەرگرتن و ب بۆرینا دەمی ناڤێ گوندی بوویە بازنگیرا، (٢٠كم) ژ باكوورێ سەنتەرێ ناحیێ دوورە، گوندەكێ چیایی یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ كركرانك.

**باشووری:** سیارا گەورك و گوندێ گوندێ شەرانشا سەری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پیر بلا، كو سەر ب ناحیا باتیفا ڤەیە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گەورك.

**رووبەرێ گوندی:**

| كەرت | رووبەرێ گشتی دۆنەم | رووبەرێ كێری چاندنێ دهێت دۆنەم | بەردەلان و چەروان دۆنەم |
|---|---|---|---|
| ٥٨ | ٤٤٢١ | ١٧٨ | ٤٢٤٣ |

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەندین كانی لێ هەنە وەك كانیا رەش و كانیا چیق و كانیا گویزا تەحل و رووەك ئاڤێ ل بەر گوندی د بوریت.

### جهێن بەرنیاس:

چەپەرێن ئینگلیزی و دەرشیڤا و دەرێ بازی و چەلێ کەهرا و زەڤیا مێرگێ و هندەك شكەفت ژی لێ هەنە وەك شكەفتا بازنگیرا و شكەفتا بەرزا و شكەفتا لاتا بارێ وشكەفتا وارێ كەمال یانڤێسی.

### رێکێن گوندی:

- دەرکار ـ شەرانش بنی ـ شەرانش سەری ـ بازگیرا.
- دەرکار ـ هیزاوا ـ ئاڤگەنی ـ خیزاڤا ـ بانك ـ شەرانشا بنی ـ شەرانشا سەری ـ بازگیرا.
- زاخۆ ـ دەرکار ـ شەرانشا بنی ـ شەرانشا سەری ـ بازگیرا.

### پێکهاتا گوندی:

سندی دبێژنێ (پساغا) پێکهاتینە ژ بنەمالێن (مستەفای و کەك میرزای و خواستی و مەندوزا و عەمەری). هژمارا وان ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٨٨ کەس بوون[٢٩].

گوندێ بازنگیرا: ل سالا ١٩٧٦ێ حکومەتا بەعس خەلکێ گوندی راگوهاستنە باژێرێ زاخۆ و گوندێن گرك سندی و هیزاوا و گوند هەمی خرابکر و هێژ نە هاتییە ئاڤاکرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

سەر چاندنا ئاڤی و رەزێن دێمی و بەرهەمێن سرۆشتی و خودانکرنا تەرش و کەوال و گیانەوەرا و چوونا کاورانی.

### شوینوار:

شکەفتا ( نڤێسی) گەلێ کەمال وەك جهەکێ شوینواری دهێتە هژمارتن ل گوندێ بازنگیرا.

ل هاڤینان خەلکێ گوندی دچوونە زۆزانا ل دەڤەرێن وارێ کەمال و تیا بادائە ل باکوورێ رۆژهەلاتێ ناحیێ[٣٠].

## گوندێ بەهراڤا:

بنیاتێ ناڤێ گوندی: ژ (بەهرا ئاڤێ) هاتییە وەرگرتن، رامانا وی ڤەدگەریت بۆ کێماتییا ئاڤێ ل ڤی گوندی و ژ بەر هندێ دبێژنێ گوندێ بەهراڤا. (٧کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ دوورە، دکەڤیتە باشوورێ ناحیێ، سرۆشتێ وی گر و زوینە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوند و کۆمەلگەهێن (هیزاوا).

**باشووری:** گوندێ کەبەرۆك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سەرسیلاڤك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ عەمەر ئاغا.

### رووبەرێ گوندی:

| کەرت | رووبەرێ گشتی دۆنەم | رووبەرێ کێری چاندنێ دهێت دۆنەم | بەردەلان و چەروان دۆنەم |
|---|---|---|---|
| ٣٠ | ٢١٥٩ | ٥١٦ | ١٦٤٣ |

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەندین کانی لێ هەنە وەك کانیا رەزك و کانیا تەیاری وکانیا قاچك و کانیا عەردا و کانیا بن بەست و کانیا گرێ پیش و نهالا بن بارێ ئاڤەکا وەرزیە.

### جهێن بەرنیاس:

بەستا حاجی و ملا زیارەتا و باسکێ عەلو و لیسێ تەیری و رێکا گازێ و جنینکا تەیاری و تیژکێ.

### رێکێن گوندی:

- دەرکار ـ هیزاوا ـ بەهراڤا.
- دەرکار ـ هیزاوا ـ ئاڤگەنی ـ خوەك ـ لێڤو ـ باگولاتك ـ مێرگە سور ـ سەرکو ـ تاوك ـ

خرابابك - عەمەر ئاغا - بەهراڤا.

- دەركار - زاخۆ - خرابابك - عەمەر ئاغا - بەهراڤا.

**پێكهاتا گوندی:**

سندی نەدبێژنێ (مامێزدینی)، پێكهاتینە ژ بنەمالا (جبێ و شەموی و ئەحمو بشارا). هژمارا وان ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٠ كەس بوون[٣١]. پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ ل سالا خواندنێ ١٩٧٠- ١٩٧١ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن[٣٢].

گوندێ بەهراڤا: سالا ١٨٩٥ێ هاتییە ئاڤاكرن، مزگەفتەك لێ هەبوو، سالا ١٩٧٠ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن، سالا ١٩٨٧ێ حكومەتا بەعس خەلكێ گوندی راگوهاستنە كۆمەلگەها هیزاوا و گوند خرابكر و تا نها نە هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ل سەر چاندنا دێمی بوو وەك: (گەنم و جەهـ و نۆك و نیسك وگوندۆر) و رەزێن دێمی و خودانكرنا تەرش و كەوال و حێوانی.

**سامانێن سرۆشتی:**

پەترول ( نەفت) ل ڤی گوند هەیە.

ل هاڤینان خەلكێ گوندی دچوون (كەپرا) ل زۆما تەیارێ و زۆما گوندی وزۆما رەزك ل دەوروبەرێن گوندی[٣٣].

## گوندێ بەهنونە سندی

بنیاتێ ناڤێ گوندی: ژ بێهنەك كانییەكا ئاڤێ هاتییە وەرگرتن بناڤێ (گەرماڤ)، كانییا گەرماڤێ بێهنەك ژ ئاڤا وێ دهات، ئانكو ئاڤا وێ كانیێ ب بێهن بوو و ژ بەر هندێ دبێژنێ گوندێ بەهنونە. ب گوندێ بەهنونە سندی دهێتەناڤكرن چونكی گوندەكێ دی ژی لدەڤەرا گولیا بناڤێ بەهنونە هەیە. دكەڤیتە دووراتییا (٢٣كم) باكوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ، سرۆشتێ وێ گوندەكێ چیایی یە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ دەشتەتەخ.

**باشووری:** چیایێ كێرە و گوندێ دەحلك مەلەك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ قەسرۆك.

**رۆژئاڤایی:** رووبارێ هیزل كو دكەڤیتە دناڤبەرا باكوور و باشورێ كوردستانێ دا.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەندین كانی لێ هەنە وەك: كانیا بسیسێ و كانیا خوارێ بركێ و كانیا گەرماڤێ و كانیا قەشەی، هەروەسان رووبارێ هیزل رۆژئاڤایێ گوندی دا دبۆریت.

**جهێن بەرنیاس:**

نهال زەیتونێ و شەواتا حەنە و خوارێ تكو و جەمێ شەخصی و رمتا زاخۆ و جالا مەركو و گەرماڤێ .

**رێكێن گوندی:**

- دەركار - شەرانشا بنی - بهێر - ستەڤلان - پەرەخ - قەسرۆك - بەهنونە سندی.
- دەركار - هیزاوا - ئاڤكەنی - خیزاڤا - بانك - شەرانشا بنی - بهێر - ستەڤلان - پەرەخ - قەسرۆك - بەهنونە سندی.
- زاخۆ - دەركار - شەرانشا بنی - بهێر - ستەڤلان - پەرەخ - قەسرۆك - بەهنونە سندی.

**پێكهاتا گوندی:**

سندی نە، (مەسیحی - كلدانی) نە، ژ بنەمالێن (ئیلیا ساوا و ئوراها یاقو و سیسو و توما مەرقوص و عەبدول الاحد ئوراها و گورگیس ساوا و مەنصور گولێ و مەتێ و یوخنا یاقو و حنا عیسا) پێكهاتینە. هژمارا وان ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١١١ كەس بوون[٣٤].

بەهنونێ مەخفەرەك لێ هەبوو، سالا ١٩٧٦ ێ

**٩- کانییا قول قولێ،** دکەڤیتە بنێ چیایێ بەهنونێ و گوند ل بەر ئاڤا وێ بوو، کانی ژکەڤری دەردکەڤیت و دەنگێ ئاڤێ ژێ دهێت و دبێژن قولقولی، ئاڤا ڤێ کانیێ نها ب بۆریا گەهاندیە باتیفا.

**١٠- کانی گیسك،** دکەڤیتە گوندێ سیر کوتکی و دبیت ناڤێ وێ ژ وێ چەندێ هاتبیت کو هندی ئاڤەکا بۆش بوو گیسکەك کەتبیتە تێدا و ئاڤێ بربیت. گوند مفای ژێ دبینن و ژێدەرکێ سەرەکیێ ئاڤا رووباری یە.

**١١- کانی ماسیك،** ب دووراتیا (٥,١٠م) ژ رووبارێ خابووری دکەڤیتە بنێ ئاقارێ گوندێ کانییا تویا، ناڤێ کانیێ یێ ژ وێ چەندێ هاتییە کو دەمێ ئاڤا خابووری شێلی دبوو ماسیا قەستا کانیێ دکر و بوو کانی ماسك.

١٢- کانییا ندورێ: دکەڤیتە ناڤبەینا گوندێ ئێکمالێ و نزۆرێ دا و ئاڤەکا زۆر باش بوو، دەمێ گوندییا پەز دبرن سەر، بێ دۆر پەز ئاڤ ددان و ناڤێ وێ کرە کانییا نەدور.

**١٣- کانییا بەر کەڤرێ خاتینا،** دکەڤیتە ئاستەنگا گوندێ بارهولێ و ئاڤەکا بۆشە و گوندی مفا ژێ وەردگرن، ناڤێ کانیێ یێ هاتی کو دکەڤیتە بەر کەڤرکێ و نێزیك (١٠تا ١٥) م ژ خابووری دوورە و جهەکێ گوزاریە.

**١٤- کانییا ئاصوص،** دکەڤیتە ناڤبەینا گوندێ سیلێ و دارا مەلای و ئاڤا وی د گەلی دا دهێتەخوارێ، دگەهیتە سەر سیلاڤا ئاصوص، خەلکێ گوندێ سیلێ هاڤینا دچوونە سەر وێ کانیێ و جۆ ژ کانیێ دبرن مفا ژێ ددیتن.

**١٥- کانییا بیشێ،** دکەڤیتە زنارێ کەڤرا ئالی ل سنوورێ گوندێ نزۆرێ، بەرامبەر گوندی ناڤێ کانیێ (دەحلك، دروویێ، تراشەکێ زۆر تاری) و دبێژنێ بیش ئانکو جهەکێ ڤارێ و (پیش و

**کانی شیلانێ**



پەلاشی و قەرامی)، ئاڤەکا زۆر بۆشە و مفا ژێ دديتن.

١٦- **کانییا شیلانێ**: کانییا گوندی یە دکەڤیتە نێزیکی مزگەفتێ، ئاڤەکا بۆشە و گوندیا مفا ژێ دديت و جهەکێ گوزاری یە.

## زۆزانێن دەڤەرا گولییان:

ل دەڤەرا گولییا زۆزان هەنە، ل هاڤینان خەلکێ قەستا وان دکرن مینا: سیارا ستەورێ ل بەهنۆنەی، کانییا ئاشا ل نزۆرێ، کانییا باڤێ، کانییا ئاصوصێ ل سویلێ، گەلی نۆکی ل سویلی، دەشت خوارێ ل رویسێ، سەرێ خواری ل کەشانێ، زۆما هێریشی ل رویسێ، زۆما رهالی ل سویلێ، زۆما دێرکی ل نزۆرێ.

## چیا و کوپێن دەڤەرێ:

چەلێ ستیا، چیایێ شابانێ، سەرکێ مام مەلا، چیایێ بهنونێ، کەفرێ بێجانێ، چیایێ بێجانێ، سەرێ گالگوهوری، بێکوڤا، کوخێ بیرکا مەلا زەینی، سویلێ، کاتوێ سویلێ، ملا بلیجێ، دارکا مەلای، گر بەخشوی، گرێ بەستێ، باتیفا، دوگورگ، باتیفا، گرێ نۆکا، باتیفا، گرێ سلێمانی، گرێ خەزینێ، باتیفا.

## گەلیێن ب ناڤودەنگ:

گەلیێ کەشانێ، گەلیێ شیلانێ، گەلیێ ئاڤهێ، گەلیێ بێکتورێ، گەلیێ سویلێ، گەلیێ سەر ڤەرشی، گەلیێ نهارا شیڤا مێزی، گەلیێ کوروویێ، گەلیێ بیتەلما، نهالا سیدکێ، نهالا زیارەتی، نهالا گەلیێ ئاڤهێ، گەلیێ بلێجانێ، کەڤرێ سیداڤەی.

## جهێن سرۆشتی یێن بناڤودەنگ:

### سوارا بەنا:

جهەکێ بلندێ ب ناڤودەنگە ل دەڤەرا گولییا و (١٢) کم ژباتیفا دوورە، ئینگلیزی ئەڤ جهە بۆ لەشکەری خۆ بکاردئینا، جهەکێ بەفرو بارانی یە.

ناڤێ وێ ژ سواریەیا هاتییە دەمێ بەرێ سویار ژ دەوارا دهاتن خوارێ هەتا ل سویارکێ بەرێ ڤەدبوون و گۆتن سوارا پەیا پاشی بۆ سورا بەنا.

## لوفێن زرێزە:

دکەڤنە بنێ سورابەنا و ب زەحمەتی جادە ل نزاری وێ دەرباز کریە، پتر ژ (٩) لۆفان لێ هاتینە ڤەکرن، سالانە ژ بەر سەقای و ئاخا وێ یا سۆر ئەڤ لوفە د رهێێن.

## کەڤرێ سیداڤەی:

دکەڤیتە ئاستەنگا رێوانێ دەمێ ل ئاستەنگا سیداڤەی دەرباز دبی، ل ئاقارێ گوندی کورکا دا، ل نێزیکی پرا کورکا و دەمژمێرکێ ژ گوندی کورکا دوورە، جهەکێ گوزاری یە.

## سەر سیارا:

جهەکێ ب ناڤودەنگە ل دەڤەرێ و (٥)کم ژ باتیفا دوورە، دبیتە سێ گوشە ئانکو دوریانا جادا ژ زاخۆ دەرکەڤیت و ل سەر سیارا دگەهیت جادا باتیفا و بامەرنێ، گرێ بەرزویرکێ دکەڤیتە رۆژئاڤا سەرسیارا، سەرسیارا دبیتە سنوورەکێ جوگرافی دناڤبەرا باتیفا وگوندێ بەرزویرکێ وگۆفکا سەری و درەنگ ئاڤا وگۆڤکا بنی.

## گەلیێ کەشانێ:

گەلیەکێ بناڤ و دەنگە هەر ژ گوندێ کەشانێ هەتا حەفتەنینێ، نێزیکی (٢٥)کم ژباتیفا دوورە، ئاڤا رووبارێ دنیڤەکا گەلی را دەرباز دبیت و هەردو لایێن رووباری گویز و چنارن.

## ئاستەنگا زرێزە:

گەلیەکێ بەرتەنگە و هەتا سالێن ١٩٧٠ێ هاتن و چوونا مرۆڤ و دەوارا لێ یا ب زەحمەت بوو و ئاڤ دناڤبەرا وانرا دەرباز دبوو، گەلی پێکهاتییە ژ بەرێ

گەنمی و کەڤرێن مەزن، د ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٨٠ێ رێك لێ ڤەکریە و جادەکا بەرفرەهـ لێ دروستکریە وجهەکێ گوزاری یە.

## ئاستەنگا رویسێ:

گەلیەکێ کوورە و خابوور دنیڤەکا گەلی را دەرباز دبیت، هاتن و چوون ژ بەر خابووری و کەڤرو کاشان بۆ گوندێن نزۆر و ئێکمالێ یا ب زەحمەت بوو.

## چەلێ ستیا:

چەلەکێ سرۆشتی و مەزنە دکەڤیتە بلنداهیا کەلا شابانیێ و (٣٠٠)م بلندە، ئەڤ چەلە وەکی خالەکا زێرەڤانیا کەلایێ بوو. چەلێ ستیا یێ زالە ل سەر دەڤەرا دەشتا سندیا – تا گر بەخشوی و گرێ بەرزیرکێ، و ل وێرێ مرۆڤ هەمی رێبواران دبینت و ناڤێ (ستیا) ژ وێ چەندێ هاتیە کو دەوروبەرێن کەلێ بستێت چیایێن ئاسێ و بلندبوون و رێکەکا پەیادە ل دۆر چەلی دزڤریت، فرەهیا سەرێ چەلی (٥)م. ژ بەر چوونا ژنێن میرێ کەلێ بۆ سەر چەلی ناڤێ (چەلێ ستیا) ل سەر هات دانان و تەنها بۆ ژنان ڤەکری بوو کو بچنە سەر، ستی ئانکو ژن و خاتینێن کەلێ.

## کەندالێ ئاسێ:

دکەڤیتە بستا چیایێ بەهنونێ، پێکهاتییە ژ کەندالەکێ ئاخسۆر و ئاخا سپی د نزارێ چیایدا. لێ دەربازبوون و هاتن وچوون یا بزەحمەتە ژ بەر هندێ دبێژنێ (کەندالێ ئاسێ).

## نهالا شکەفتێت میرا:

نهالەکا کویرە و پتر ژ (١٠) شکەفتا ل هەردو لایێن نهالێ هەنە. ئەڤ شکەفتە پێکهاتینە ژ

جەلی ستیا کەلها شابانیی



بەرزیڤرێن بەرخابووری و حەسو و خیزی و مرۆڤ دشێت ڤان شکەفتان ب ساناهی بەرفرەهـ کەت، و دکەڤنە ئاقارێ گوندێ (گۆڤك گوللی دا) نێزیکی جادا سەرەکییا باتیفا – گۆڤك گوللی و نێزیکی (٢٠)م ئالیێ رۆژئاڤا جادێ نە. ئەڤ شکەفتە بۆ خودانکرنا تەرش و کەوالی ب کار ئینیانە و هندەك شکەفت پتر ژ (٥٠٠) کەوالا د حەوینیت ئانکو زۆر مەزنن و دبێژنێ (شکەفتێت میرا).

## ئاشێن دەڤەرێ:

هەلبەت ل بەرێ ئەو جهێن گەلەك ئاڤ لێ هەین ئاش ژی بۆ هێرانا دەخل و دانی و دروستکرنا تەحینێ هەبوون و گەلەك گوندان ئاشێن خۆ هەبوون و مفا د گەهاندنە گوندێن دەوروبەر ژی، بەرێ پارە د کێم بوون لەوما خودانێ ئاشی (مزە) وەکی سیستەم رادکر، (مزە) ژی ئامانەکێ وەکی (ترارەك)ێ سفری بوو ژ(٢) کیلوا پتر دان دچوویێ و ئاشڤانی مزە وەکی کرێ رادکر و دبیت ب دلێ خودانێ دانی نەبا چونکی دانێ وان کێم بوو. ژ ئاشێن دەڤەرێ:

١- **ئاشێ پیرموسی،** ئاشەکێ کەڤنارە یێ مالا (پیرموس یونس)ی بوو ل بەری (١٠٠) سالەکان هاتییە دروستکرن و ل سالێن (١٩٤٠ تا ١٩٧٠) ێ کاردکر، نێزیکی ١کم ژ گوندێ دێریشکێ دوورە.

٢- **ئاشێ تەحتێ،** ئەڤ ئاشە یێ مالا (پیرموس یونس)ی بوو، تایبەت بوو ب دروستکرنا (تەحینێ)، سالێن حەفتییان ل ئاقارێ گوندێ دێریشکێ هاتییە دروستکرن و هەتا سالا ١٩٩٠ێ کار دکر، نۆکە ژی کۆتەلا ئاشی یا دروستە.

٣- **ئاشێ رەشوێ عبوی،** ئاشەکێ کەڤنارە یێ هێرانا دەخل و دانی بوو، دکەتە گوندێ ئاڤهێ ل سەر جووا رووباری و شوینوارێن وێ ماینە، ل سالێن ١٩٣٠ ێ تا سالا ١٩٦٥ێ ئەڤی ئاشی کار دکر.

٤- **ئاشی قادری،** ئاشەکێ کەڤنارە دکەڤیتە سەر جووا گوندی ئاڤهێ، د ناڤبەرا ١٩٣٠- ١٩٤٠ێ هاتییە دروستکرن و تایبەت بوو ب هێرانا (کونجیا)، شوینوارێن وی د دیارن.

٥- **ئاشێ شیلانێ،** ئاشەکێ کەڤنارە، ل نێزیکی پرا شیلانێ، شیلانێ گوندەکێ کەڤنارێ دەمێ میرگەها ئامیدیێ یە، ئەڤ ئاشە یێ مەلا زادەی بوو، کو وەك دهێتەڤەگێران ژ ئامیدیێ هاتبوو دەڤەرێ. ئاشەکێ دیێ کەڤنار ل ڤی گوندی هەبوو و دگوتنێ ئاشێ چەپێ نێزیکی (٤)کم ژ گوندی دوورە.

٦- **ئاشێ دێمکا،** ئاشەکێ نوی یە ل نێزیکی پرا دێمکا، ل سالێن ١٩٥٠- ١٩٧٠ێ هاتییە دروستکرن، ئاش یێ (تەها بلێجانی) بوو و شوینوارێن وی دیارن.

٧- **ئاشێ مارستانێ،** دکەڤیتە بنێ گوندێ دێمکا ل نێزیکی ئاستەنگا زریزە، ل سالێن شێستان هاتییە دروستکرن و یێ (موحسن نەعموی)، شوینوارێن وی دیارن.

٨- **ئاشێ گری،** ئاشەکێ مەزنێ ناڤدار بوو دگوتنێ ئاشێ مەکینێ، سالێن ١٩٦٠ - ١٩٨٠ێ کاردکر، یێ مالا (حەجی سادق برۆی) بوو و (سلێمان سالح یحیی) ل بەربوو و شوینوارێن وی د دیارن.

٩- **ئاشێ گری** یێ مالا (مەحمەد تاهر سادق ئیبراهیم) ل سەر ڕوویێ خیزاڤا.

١٠- **ئاشێ چەمکێ پیری** یێ مالا (مستەفا محوی باتیفی) بوو ل سەر ڕوویێ خیزاڤا یێ تەحینێ بوو.

١١- **ئاشێ شێرخاسکێ** یی مالا (سلێمان ئاغا) بوو، ل سەر ڕوویێ کەشانێ.

١٢- **ئاشێ رەشوێ عەبوی** ل گوندێ ئاڤهێ ل سەر ڕوویێ بەری یێ بارهولیا بوو.

١٣- **ئاشێ (حەجی حەیدەر)** ل گوندێ ئاڤهێ.

١٤- **ئاشێ (تەحتی)** ل سەر ڕوویێ ل گوندێ دیریشکێ یێ مالا (پیرموس یونسی) .

١٥- **ئاشێ دێمکا** ل سەر رووباری بوو، یێ (حەجی سەدیقی وحەجی حسێن و عەلی عەسلان) و ل بەرێ ئاشی تەها بلێجانی بوو.

١٦- **ئاشێ جەمەکێ** گوندێ بێغبارا بنی.

١٧- **ئاشێ (مەحمەد سالح)** ل گوندێ کەشانێ ل سەر ڕوویێ گوندی.

**١٨- ئاشێ (حەجی حاجوی)** ل گوندێ کەشانێ ل سەر ڕوویێ گوندی.

**١٩- ئاشێ (کەمالی)** ل گوندێ کەشانێ لسەر ڕوویێ جەمێ ساما.

**٢٠- ئاشێ (عەلی)** ل گوندێ نزۆرێ سەر ڕوویێ ئێکمالێ و سوبلێ.

**٢١- ئاشێ گوندێ ئێکمالێ** ل سەر ڕوویێ ئێکمالێ بوو، یێ (حەجی خواجە ئێکمالەی) بوو.

**٢٢- ئاشێ (حسێن ئاغایی)** ل گوندێ شیرخواسکێ.

**٢٣- ئاشێ (مەلازدەی)** گەلەکێ کەڤنارە ل گوندێ شیلانێ ل سەر ڕووباری.

**٢٤- ئاشێ چەپێ** گەلەکێ کەڤنارە ل گوندێ شیلانێ.

**٢٥- ئاشێ زیوکێ** یێ (حسێن ئاغای) ل گوندێ شێرخواسکێ.

**٢٦- ئاشێ بێمکا** ل نێزیك ئاستەنگا زرێزێ، یێ حەجی نەعموی دگۆتێ ئاشێ مارستانی.

**٢٧- ئاشێ ئاستەنگا** ئاڤهێ و زرێزێ یێ (حەجی تاهر زرێزەیی).

**٢٨- ئاشێ سەرحانی** ل گوندێ رویسێ ل سەر ئاڤا کانیا و نهالا بوو.

**٢٩- ئاشێ بنێ گوندی** ل رویسێ.

**٣٠- ئاشێ درەنگ ئاڤا** ل سالێن ١٩٧٠ێ ل سەر ڕووبارێ کەشانێ یێ (محەمەد میرانی) بوو، ئاشەکێ گەلەك مەزن و ب ئاڤ و دەنگ بوو و مەکینە بوو.

**٣١- ئاشێ دەرۆکێ کیرێ** ل سەر ڕوویێ ئێکمالێ یێ (ئیبراهیم مسیسی) بوو، (سلێمان صادق) ئاشڤان بوو.

**ئاشێ قادری ل گوندێ ئاڤهێ**



**٣٢- ئاشێ گرێ میرزای** ل شێرخواسکێ.

**٣٣- ئاشێ دەحلی.**

**٣٤- ئاشێ دو دەراڤێ** ل خرابەی.

**٣٥- ئاشێ بنێ قەصرێ**، گری.

**٣٦- ئاشێ بێدەرا خەرابەلی.**

**٣٧- ئاشێ جۆدی** ل خیزاڤا، ئاشێ حجی فەتاح.

**٣٨- ئاشێ خوکێ.**

# شوینوار و شکەفت و جهێن ناڤدار:

## مەزارگەهێ زەمبیل فرۆشی و زیارەتێن دەڤەرێ:

مەزارگەهێ زەمبیل فرۆشی جهەکێ پیرۆزێ کەڤنە ل دەڤەرێ و مینا شوینوارەکی یە، دکەڤیتە ناڤ ئاقارێ باتیفا ل سەر جادا گشتیا زاخۆ - باتیفا ب دووراتییا نێزیکی (٥) کم ژ باتیفا، زەمبیل فرۆش سەرهاتییەکە و وەکی دبێژن یێ بەری (١٤٠) سالانە ئەڤ مەزارگەهە هەبوو. نها هاتییە پەرژانکرن و خەلکێ دەڤەرێ رێزێ ل وی مەزاری دگرن. هەژی ئاماژێ یە مەزار هەر ب ڤی ناڤی ل فارقین و دیاربەکر ژی هەنە.

## شکەفتا ئەجنا:

جهەکێ ئاسێ وخۆشە، دکەڤیتە د گەلیێ دەم دەمۆکا ل ئاڤهێ، نێزیکی (٣)کم ژ گوندی دووره شکەفتەکا دەست چێکرییە، دەرێ شکەفتێ (١)م و بلنداهیا وێ (١٤٠)سم فرەهیا وێ (٨)م چوارگوشەیێ و (٣) تەخت د گەڤرێ کولایی تێدانن ودەڤ هەر تەختەکێ جهێ (زارۆکەکێ یان لاندکەکێ) دکەڤریدا کۆلایە، وەکی دیار کو ژن و زەلام و زارۆك پێکڤە د شکەفتێ دا ژیانە. دەرێ شکەفتێ د کەفیتە دگەلی دا بلنداهیا وی ژ ئاڤا رووباری نێزیکی ٨٠م .

مەزارێ زەمبیل فرۆش



## زەیتونێن گەلیێ ئاڤهێ:

كۆمەكا دارزەیتینێن مەزنن و تا نها دشینن، دكەڤنە دگەلیێ ئاڤهێ دا، نێزیكی ٢كم ژ گوندی دووره و وەسان دیاره كو ئەڤ داره بەری١٠٠ تا ٢٠٠ سالان ب دەست هاتینەچاندن چونكی ئەڤ جۆره داره ل هەمی چیا و دەڤەرا بێجانیا نینه. جهەكێ گوزاری یه ل هاڤینا و نێزیكی جووا ئاڤێ نه. گوندیا بەرێ دكره مەخەلێ تەرش وكەوالا.

## شكەفتا ئاڤهێ:

دكەڤیته پشتا گوندی ل بلنداهیا گركەڤۆكێ ل سەر گەلیێ بەرێ شكەفتێ، رووبەرێ وێ ١٥٠م چوارگوشەیه، ل دەمێ شۆرشێ جهێ ڤەحەواندنا مرۆڤان بوو و ل زڤستانان ژی تەرش و كەوال د كرنه تێڤه.

## كون كەڤووك

دكەڤیته بلنداهیا گركەڤۆكی و پتر ژ ١٠٠٠م ژ ئاڤا رووباری بلنده ل سەرێ گری كو چیایەكێ كەڤروكاش و بەرێ گەنمی یه (كونەكا)زۆر مەزنه. فرەهیا وێ نێزیك (١٢)م و كویراتییا وێ ژ (٨٠)م دكەڤری كۆلایه وەك (مغارەكێ یه)، چو گیاندار نەشێن بچنه تێدا و هەر گیانەوەركێ بكەڤیته تێدا دێ مریت، مرۆڤ ژی نەشێن بچنه تێدا و نەشێن ژێ دەركەڤن، ل تەنشتێت ڤێ (مغارێ) ل (٢٠)م وێڤە كونێن بجویك هەنه و تەیر و تەوال ژ بەر سەرمایێ دچنە تێڤە و گەلەك جاران خەلكێ گوندێ ئاڤهێ ژبۆ نێچیرا كۆترك و كەڤۆكان چووینه و ئاگر بەردانه قاچێن مەزن د (مغارێ) دا و دەمێ د رەڤین ژ كونكێ دەردكەتن د كەتنه تۆرێن وان و هندەكا پتر ژ(٣٠) كەڤۆكا دگرتن.

## كوچا پرێ/ ل بارهولێ:

دنیڤەكا خابووری دا بەرەكێ سرۆشتی یێ زۆر جوان هەیه وەك كوچا پرێ یه د چەرخێن كەڤن دا مرۆڤی كرییه كوچه ژ هەردو ئالیانڤە دار گەهاندینه سەركوچێ و كرییه پر بۆ دەربازبوونێ. و دبێژن بەرێ كوچێ بخۆ سرۆشتی یه و كەڤرەكێ زۆر مەزن دنیڤەكا خابووری دایه ل ئاستەنگا بارهولێ.

## شكەفتا بەهنونێ:

دكەڤیته گەلیێ بەهنونێ دبن گوندی دا و نێزیكی ٧كم ژ سەنتەرێ باتیفا دووره دكەڤیته دناڤبەرا بستێن چیایێن زۆر ئاسێ، درێژاهیا وێ ٢٠م و پانیا وێ ژی١٠م و بلنداهیا وێ ٦م. ئەڤ شكەفته ل شورشا ئەیلوولێ وەكی نەخۆشخانه مفا ژێ دهاتەوەرگرتن، ل سالێن ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ ب داری كربوونه ٢ نهام و نەخۆش تێدا چارەسەردكرن.

## شكەفتێن پێرانێ:

دكەڤیته ئاقارێ كوركا ل بەر خابووری دبن بستەكا چیایێن ئاسێ و بلند ل بەرامبەر زنارێ مەتینی. خەلكێ گوندی بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی بكاردهینا ول شورشان جهێ ڤەحەواندنا خەلكی بوو.

## دویرگەهـ:

ل دەڤەرا گولیا ژمارەكا دویرگەهان ل گوندێن نزۆرێ و رویسێ و بێكۆڤا هەنه، ئەڤ دویرگەهه ژ بەرێن خورست ب قەبارێن مەزن و ب شێوەیێن لاكێشەیی و چوارگۆشەیی دروست كرینه دا خۆ ل سەرێك بكرن و دەمێ گیاندارێن ب هێز پالددەن دا ب ساناهی نەكەڤن، چونكی وی دەمی گیاندارێن مەزن هەبوون.

## چەلێ قەسرێ ل كوركا:

دكەڤیته ئاقارێ گوندێ كوركا ل بلنداهیا چیا، پتر ژ(٤كم) ژ ئاڤا خابوورێ بلندتره، ئەڤ چەله بەرەكێ گەنمی یێ خورستێ مەزنه و د چەرخێن كەڤن دا ئاڤاهییەك ل سەر ڤی چەلی هاتبوو دروستكرن. شوینوار و بەرێن قەسرێ دیارن و دبیت ژ بەر دەهبه وگیانەوەر و تالانچییا نەشیاینه خۆ ل دەشتا كوركا خودان بكەن ل سەر چەلێ قەسرەك ئاڤا كرییه و ل

دەوروبەرێن قەسرێ (جوهنی) هەنە دیاردبیت كو دان تێدا دقوتان و ئەڤە خۆیا دكەت كو ژیان ل سەر وی چیای هەبوو، و ئاڤ ب (كونكا) ئانكو كەڤلێن پەزی دبرنە دقەسرێ دا.

## بەرێ حەمەگوی: گەلیێ كەشانێ:

بەرەكێ گەنمیێ (مكعب)ێ داتراشی یە، ب قەبارەیێ (٤ - ٥)م و گەلەكێ جوانە، دكەڤندا و ژ بەر بەفر و بارانا ژ چیا هاتییە خوارێ و ل ناڤ بیستانەكێ راوەستیایە و سەربانێ بەری بۆ مزەیتا بكاردهینن.

## كونیشك:

شكەفتەكا دەست چێكریا كەڤنە دكەڤیتە ئاڤارێ گوندێ بێگۆڤا ب دووراتییا (٤)كم ژ گوندی ل بەرامبەر گوندێ چەلكا فەلا ل نێزیكی رووبارێ خابووری ب (١٠م)، شوینوارەكێ چەرخێن كەڤنە دكەڤری دا، چەند ژوورەكێن بچویك تێدا دروست كرینە هەر ژوورەك جهێ (٣) كەسا تێدا یە. دەرگەهێ وێ (٥٠)سم فرەهییا شكەفتێ (٣- ٤)م وبلنداهییا وێ (١٢٠)سم.

## شكەفتا كون ئاڤێ:

شكەفتەكا سرۆشتی یە د چیایێ شابانی دا ل بلنداهییا چیایی نێزیك (١٠٠٠)م ژ ئاڤا رووباری بلندە ل بەرامبەری ئاستەنگا بانكێ یان بەرامبەر كانییا خەما. دەرگەهێ شكەفتێ زۆر مەزنە(٤-٥)م پانیا وێ (٥-٥)م، دنیڤەكا شكەفتێ دا كونەكا درێژ ب ناڤێ كون ئاڤ هەیە كو ئاڤ ل بهاران ژێ دەردكەڤیت، درێژاهییا وێ نەهاتییە زانین لێ خەلكی دەڤەرێ هەتا (٢٠٠)م ب كونا شكەفتێ دا چووینە ونەگەهشتینە دوماهییا وێ، (٢٠)م دەسپێكێ مرۆڤ دشێت ب ساناهی بچیت، لێ ژ وێرێ پێڤە ب زەحمەتە، خەلكێ

شینواریت كەلها شابانیی (جهی مزیتا)



دەڤەرێ وێ شكەفتێ ل زڤستانان بۆ تەرشی وكەوالا بكاردهینا.

## جهێن مزیەتا:

ل دیڤ ژێدەران كەلا شابانیێ ل سالا (١١٢٠)ێ یا ئاڤابوو، خەلكێ وێ جهێن (مزەیتا) دكەڤری دا كۆلاینە وجوهنییەكێ مەزن ژی بۆ قوتانا (دەخل و دانی) لێ هەبوو تانۆكە ئەڤ شوینوارە د ئەشكرانە.

## بیرێن كەلێ:

دكەلا شابانیێ دا ب دەهان بیر دكەڤرێن خورست یێن بەرێ گەنمی كۆلاینە، خەلكێ وێ، یان میرێ وێ بۆ عومباركرنا ئاڤێ ل زڤستانان و دەخل و دانی بكار ئینانینە، چونكی سەرێ كەلێ یا ژئاڤێ دوور بوو، و هەتا نۆكە ژی ئەڤ بیرە د ئاشكرانە.

## گوندێ میرا:

شوینوارێن گوندێ میرا د نهالا شكەفتا میرا ل ئاقارێ گوندێ گۆڤك گوللی د دیارن، مفا ژڤان شكەفتا دیتن و ئاڤ ژنهالێ بۆ ڤەخوارنێ بكار دئینا و نێزیك (٥) كم ژئاڤا خابووری دوورە.

## شوینوارێن گوندێ گولكێ:

گوندەكێ كەڤنارە دكەڤیتە بەر زنارێ چیایێ (خرۆەی)، ناڤێ وێ ژ گۆلا ئاڤێ هاتییە، دهێتەگۆتن بەری نێزیكی سێ سەد سالەكان نەخۆشییەك كۆژەك ل گوندی پەیدا بوویە، تنێ دو مرۆڤ ژگوندی خلاس ببوون.

## رێك و پرێن سنوورێ ناحیێ:

ل سالێن (١٩٣٧ تا ١٩٤٥) ێ هەردو رێڤەبەرێن ناوچێن (گوللی و سندی) رێككەفتن كو هەر ئێك ژ ئالیێ خۆڤە ب هاریكاریا گوندیان رێكێ ژ زاخۆ بكەهیننە باتیفا، پشتی دەست ب رێكێ كرین كو هەر گوندەكی رۆژانە چەند زەلامەك دهنارتنە سەر رێكێ و ب تەڤر و بێر و قەزما رێك گەهاندنە باتیفا.

و ژ بەر كو دەڤەر ناوچەكا سنووری و گرنگ بوو، عێراقێ ژی چەند رێك بۆ مەرەمێن لەشكەری ڤەكرن، ژوانان:

رێكا زاخۆ - باتیفا ب درێژاهییا (٣٠كم) و ژ باتیفا بۆ هەر ئێك ژ بێگۆڤا ب درێژاهییا (٢٠كم) و بۆ كانی ماسێ ب درێژاهیا (٤٠كم) و بۆ كەشانێ ب درێژیا (٢٤كم)و بۆ دەڤەرا دۆسكیا ب درێژاهییا (١٤كم).

هەر وەسان چەند پر ژی دناڤبەرا سالێن (١٩٧٦تا ١٩٨٠) ێ و پشتی هینگێ هاتنە دروستكرن ژوانان:

١- **پرا بێگۆڤا** ل سەر رووبارێ خابووری ل سالێن ١٩٧٩-١٩٨٠ێ بۆ گرێدانا دەڤەرا زاخۆ ب دەڤەرا بەرواریاڤە.

٢- **پرا گۆڤكێ** ل سەر رووبارێ خابووری ل سالێن ١٩٧٨- ١٩٨٠ ێ بۆ گرێدانا دەڤەرا زاخۆ و دەڤەرا باتیفا ب دەڤەرێن ئامیدیێ وبامەرنێ و گوندێن دۆسكیاڤە.

٣- **پرا سیركوتكی** كو پرەكا بچویكە ل سالا ١٩٧٨ ێ ل سەر رووبارێ خیزاڤا نێزیك گوندێ خەندەكێ بۆ گرێدانا جادا گشتییا ژ زاخۆ دەردكەڤیت بۆ باتیفا.

٤- **پرا زرێزێ**، پرەكا بچویكە ل سەر رووبارێ كەشانێ ل سالێن ١٩٧٩ ێ ل گوندێ زرێزێ بۆ گرێدانا دەڤەرا باتیفا ب دەڤەرا بێگۆڤا و بەرواری ڤە.

دیسان چەند پرەكێن كشتۆكالی ژی هاتینە دروستكرن، وەكی پرا دەحلك گوللی ل سالا ٢٠٠٥ێ ل سەر رووبارێ خیزاڤا و پرا بورێ سیهلێ ل سەر رووبارێ كەشانێ نێزیكی گوندێ دێریشكێ ل سالا ٢٠٠٧ێ، پرا ئاڤهێ ل سەر رووبارێ كەشانێ دناڤبەرا گوندێ دیریشكێ و ئاڤهێ ل سالا ١٩٩٩ێ، كو گوندێن دیریشكێ و ئاڤهێ و بارهولێ پێكڤە گرێدان، پرا دێمكا ل سالا ٢٠٠٦ێ ل سەر رووبارێ كەشانێ، پرا شیلانێ ل سالا ٢٠٠٧ێ ل سەر رووبارێ كەشانێ بۆ گەهاندنا گوندێ شلینێ و شیلانێ ب گوندێن دەوروبەرڤە، پرا سیركتكی یا كەڤن ل سالێن ١٩٧٠ سەر رووبارێ خیزاڤا نێزیك كانی گیزكێ ل گوندێ سیركتكی، پرا نزۆرێ ل سەر رووبارێ خابووری، ل سالا

١٩٧٩-١٩٨٠ێ هاتییە دروستکرن، رێکا گوندێ نزۆرێ ب جادا سەرەکی باتیفا - کانی ماسێ ڤە گرێ ددەت، ل سالا ١٩٩٧ێ ژ ئالیێ فرۆکێن تورکان ڤە هاتییە خرابکرن ونۆکە پر (تێل و دەپن).

پشتی سالا ١٩٩١ ێ ژێ حوکمەتا هەرێمێ ژێ چەند پر دروستکرینە، ژوانان:

پرا گوندێ دێریشکێ، پرا دێمکا، پرا ئاڤهێ، پرا گوندێ کورکا ل سالا (٢٠٠٧) ێ بۆ گرێدانا هەردو دەڤەرێن دۆسکیا و گولیبا پێکڤە. لێ دسەر هندێ را گوند ل دەڤەرێ ماینە کو رێکێن وان هێشتا ئاخن مینا رێکا گوندێن بێغەبارا سەری، بێغەبارا بنی، دەرەنگ ئاڤا، شێرخواسك، بانی، دێریشك، ئاڤهێ، بارهول، ئاڤا تویکا، کلا خوار، مێرگ، شیلان، صۆریا، رویسێ، شولین، گری، جەم جهور، خەندەك، شیڤ رێزان، ئاڤا خرابا. خوك گولی. یان گوند هەنە رێك هەر ئێکجاری نەگەهشتیێ وەکی: بلێجانێ، کانی تو، کورکا، بهنونێ، ئێکمالێ، سویلێ، حەفتەنین.

## گوندێن گولیبا ل سنوورێ ناحیێ:

گوندێ باتیفا، گوندێ دەحلك گوللی، گوندێ صارکا، گوندێ بێغەبارا سەری، گوندێ بێغەبارا بنی، گوندێ بەهنونێ، گوندێ ئاڤا تویکا، گوندێ بیرکێ، گوندێ پەلکیشك، گوندێ حەفتەنین، گوندێ کورکا، گوندێ بێکۆڤا، گوندێ زرێزە، گوندێ ئاڤا خرابا، گوندێ کلاخوار، گوندێ میرگێ، گوندێ سیرکوتك، گوندێ خوك گوللی، گوندێ خەندەك گوللی، گوندێ چەم جهور، گوندێ گری، گوندێ خیزاڤا، گوندێ شودن، گوندێ گۆفك گوللی، گوندێ دەرەنگ ئاڤا، گوندێ ملاعرب، گوندێ کانی تو، گوندێ بلێجانێ، گوندێ شێڤێ، گوندێ صۆریا، گوندێ دێمکا، گوندێ سەرکێ بێسرێ، گوندێ گریێ بیێ، گوندێ نزۆرێ، گوندێ رویسێ، گوندێ سویلێ، گوندێ ئێکمالێ، گوندێ ئاڤهێ، گوندێ دێریشکێ، گوندێ نەرمك، گوندێ رێوانێ، گوندێ بارهولێ، گوندێ شێرخاسك و بانێ، گوندێ کەشان، گوندێ شیلان، گوندێ شلون.

## گوندێ باتیفا:

ناڤێ گوندی ژ (با و با رۆ ڤە) هاتییە. چونکە ل وەرزێن زڤستاناندا با و باروڤەکا زۆر لێ دهات و ژ بەر هندێ دگوتنێ (با + تیفان) ئانکو (هەوا و تیفان) - (باتیفا).

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** هەردو گوندێن دێریشکا ئاڤا و دێریشکا خراب.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن دەحلی و خرابێ سڤوی.

**باکووری:** گوندێ بەهنینێ

**باشووری:** گوندێ پەلکیشك و گوندێ صارکا.

بەری نێزیکی سێ سەدسالەکان گوند ل سەر دەستێن دو بنەمالا، بنەمالا (شینوی) و بنەمالا (عەمو حەلا) و مالا مەتینێ هاتییە ئاڤاکرن. و پاشان بنەمالا (خاتینێ) ژ گوندێ (بەهنینێ) یا هاتی گوندێ (باتیفا) وە ئەڤ گوندە نە ل جهێ نۆکە بوو بەلکی ل جهەکێ دی بوو دبێژنێ (زیارەتێ بن جنینا) ل (باشوورێ) باتیفایە.

پشتی کو ل ٢٠ گولانا ١٩٦٢ێ لەشکەر و جاشێن عیراقێ گەهشتینە باتیفا گوند سووتیە و ماینە تێدا هەتا ٢١ حزیرانا ١٩٦٢ێ پاشتر ڤەکشیاینە و خەلکێ گوندی هێدی هێدی گوندێ خۆ ئاڤاکریەڤە.

دیسان ل سالا (١٩٧٥)ێ زۆربەیا خەلکێ وێ پشتی سالا (١٩٧٥) ێ ئاوارەی ئیرانێ بوون و ل سالا (١٩٩١)ێ جارەکادی گوند هاتە چۆلکرن و خەلکێ وێ ئاوارەی ترکیا و ئیرانێ بوون.

ژبەر گوندێ باتیفا جهەکێ ب خێرو بەرەکەت بوویە گەلەك خەلکێ دەڤەرێن دی ب ماڵ و حالێن خو ڤە قەستا ڤی گوندی کرینە و تا نۆکە ماینە لێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند د بنیاتدا ژ بنەمالا (خاتینێ)، بنەمالا (مەتینێ) و بنەمالا (ئەحمەدێ سەلیمی) پێکدهات،

پاشتر چەند بنەمالێن دیتر لێ ئاكنجی بووینە، ئەو ژی ئەڤەنە: مالا سارما، مالا مال مەلا، مەلا تەیب مەحمود، مالا مەلا ئەمینی، بەشیر مەلا ئەمین زاخۆ. مالا ئوسمانێ كەلەشی، مالا سەید عەبدوللای،، مالا شێخ جەمالی، هەدریشی، شەرنەخی، گراڤی، (حجی ئەحمەد مستەفا)، گوبی ١، (علی ئەحمەد حسێن)، گوبی ٢، (حاجی محەمەد عومەر)، مالا شێخ حەسەنی، (رزگار عەبدللەتیف حەسەن)، مالا كەمالێ ئەحمەد صورا، (ئەحمەد كەمال).

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

د بنیاتدا ل سەر جۆتیاری و خودانكرنا تەرش و كەوالی و حەیوانێن رەش بوویە، چاندنا وان دێم و ئاڤی بوویە، زێدەباری مفا وەرگرتن ژ بەرهەمێن سرۆشتی یێن چیایێن دەڤەرێ.

## كانیێن گوندی:

د دەمێ خۆدا گەلەك كانی ل گوندی هەبوون، سێ ژێ د سەرەكی بوون، ئەو ژی كانیا گوندی بۆ (ڤەخوارنێ) تەنها بۆ ژنان، كانیا زەركێ یا (زەلامان) بوو دناڤ رەزو بیستاناندا بوو كۆلانەكا تایبەت هەبوو دگوتنێ كۆلانا (گەرا زەركێ) و ئەو جهەكێ تایبەت یێ دەست شووا زەلامان و كانیا عەمەراغایی بوو (بالاڤ و سەر شوشتنا ژنان). ژبلی گەلەك كانیێن دی مینا: (سیڤێ بركا مەلایی، شەكرك، تابر، ناڤ كورێ، رهیكێ، بەستا عەجەمێ، نزاری، كون كێڤریشكێ، شكەفتا سەركولا، خانێ حەسەنێ، واركێ تەهایی، بركا سمایلی، شیڤكا پارزا، مەیدانكا هەكاریا، بها، گوهیشكێ، كوسپیندارکێ، ئاڤ ریلكێ). ل سالێن حەفتیان پرۆژێ ئاڤێ ل گوندی هاتییەدانان و ئاڤ لسەر مالێن باتیڤا هاتییەبەلاڤكرن.

## چیا و نهاڵ و مێرگ و شكەفتێن گوندی ژی:

- مێرگا جومێ، نهالا ئاقاری، نهالا رهیا، بانا مازی، چەپەركی، بەستێ، خرابا، شورا گوهیشكێ، گردە هولی، گرسیسنی، نزارێ ئەشپیرانێ، دو كورگی، گركێ مشەدرێ، گركێ سمایلی، گركێ حسەینێ، ملا ئاشكێ بایكورا فات بلكێ، شكەفتا جنا، بان كوركێ گەرمیلكێ، خرابێ توپێ، جوهنیكا، دارا واری، نزارێ دیریشكێ، كەز وانا پیری، سەرێ چالێ، زەڤیا تراشی، گرێ بەستێ، ملا چەپەركی، نزارێ بێغەباری، خرابێ سڤوی، بانا دەحلی، بەر واری، گەرا جهی، زیارەتێ ب كەلەش، زیارەتێ كەڤن، زیارەتێ بن جنینا، زیارەتێ سەید خەزالی، زیارەتێ مەلا بدری، سەرێ تەحتێ، گركێ خەزینێ، قورملێ، بانا بەری، تەحتا شمشكا، گركێ تەی زراڤكا حەیدوی، كورا مزگەفتێ، شیف كەنارێ، تەحتا كونجیا، مێر كوشتێ، لەڤدێن زنجێ، بارزانكێ، تیا كەری، چالاپ شافر، كون كێڤریشكێ.

## رووبەرێ گوندی:

گوند دكەڤیتە كەرتێ (١- ١٦)دا رووبەرێ گشتی (٨١٥٩) دونەمن، دێم و ئاڤی و بیستانێن دێم و چەروان و كەڤر و كاش و دارستانان ب خۆڤە دگریت..

## خواندنگەها گوندی:

ل سالا خواندنێ ١٩٣٤- ١٩٣٥ خواندنگەها سەرتایی ل باتووفا هاتییە ڤەكرن، ژبەركو خەلكێ گوندی ئارەزوو ل سەر خواندنێ نەبوو ل سالا ١٩٤٥ێ ئەو خواندنگەهە هاتییەگرتن، و ل سالا خواندنێ ١٩٥١- ١٩٥٢ سەر ژنوو هاتییەڤەكرن و یەكەمین خواندنكەها نها یا باتیڤا بەردەوامیا وێ خواندنگەهێ یە ل سالا ١٩٥٦- ١٩٥٧ێ یەكەمین پوستێ خویندكارێن ڤێ خواندنگەهێ قۆناغا سەرەتایی ب داویئینایە، د ناڤبەرا ١٩٦١- ١٩٧٠ێدا ئەڤ خواندنگەهە ژ ئەنجامێ سەروبەرێ دەڤەرێ د ناڤبەرا شباتا ١٩٦٢- نیسانا ١٩٦٤ێ هاتییەگرتن، ل ڤێ مەهێ هاتییەڤەكرن و هەتا ١٩٦٩ بەردەوام بوویە و سەر ژنوو هاتییەڤەگرتن، هەتا ل دەسپێكا سالا خواندنێ ١٩٧٠- ١٩٧١ سەر ژ نوو هاتییەڤەڤەكرن.

## گوندێ دەحلێ:

ناڤێ گوندی ژ دەحل و قەرام هاتییە و بوویە

'دەحلك)، ل سالا (١٩٤٢) ێ ل سەر دەستێ (حەجی عەلی عیسا) هاتیبە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٥ كەس ل ڤی گوندی دژیان. بۆ جارا ئێكێ ل سالا (١٩٦١)ێ ژ ئالیێ عیراقێ ڤە هاتیبە سۆتن، جارا دووێ ل سالا (١٩٧٥)ێ و بۆ جارا دوماهیێ ل سالا (١٩٧٧)ێ كو ب ئێكجاری هاتیبە خرابكرن و خەلكێ وی هاتینە ڤەگوهاستن بۆ باتیفا.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** باتیفایە.

**رۆژئاڤایی:** گر بەقشو و بانا نۆكا.

**باكووری:** گوندێ بەهنۆنە.

**باشووری:** گوندێ بێغەبارا سەری یە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ب شێوەیەكێ گشتی ل سەر جۆتیاریێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، زێدەباری مفا وەرگرتن ژ چۆلی و خرڤەكرنا كەزوان و مازی و بەروی و گوهیشكان.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

كانی و رووبارێن گوندی ژێ رووبارێ دەحلی و كانیا ئەحمەدێ سەلیمی و كانیا بن چنارێ نە.

### چیا و شكەفت و جهێن گوندی:

هشكە مێرگ، شكەفتا هەرفتی، مێرگا دەحلی، نهالا نۆكەرێ، نهالا مێركوشتێ، لەڤدێن شەبەكا، لەفدا شافر، تەحتا صاوكا، تەحتا حلی، گرێ هەسن پیركی، نهالا كر، ئاڤكا قەدیم، گركێ خركا، بانیكا خویرنس، گر سیسن، گر دەهول، خرابێ كەفن، لەڤدێن زنجێ، سیلاڤا نهالا نۆكەرێ، بانیكا بەراشی، خركا، نهالا ئاڤكا قەدیم، كەناریا ئاشێ رۆخكی.

### رووبەرێ گوندی:

رووبەرێ گشتیێ گوندی (٦٦٤) دونەمە.

## گوندێ صاركا:

ناڤێ گوندی ژ (سارمایێ) هاتیبە ژبەركو جهەكێ زۆر سار و بەفرین بوو، سالا (١٩٧١)ێ ل سەر دەستێن (حەجی سلێمان وحەجی قوتاس و حەجی فەتاح). ژ مالا خاتینێ كو دبنەرەت دا ژ باتیفا چووینە گوندێ ساركا هاتیبە ئاڤاكرن. گوند ل سالا (١٩٧٥) ێ ژ ئالیێ عیراقێ ڤە هاتیبە خرابكرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ درەنگ ئاڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ پەلكیشك و گوندێ بێغەبارا بنی.

**باكووری:** باتیفا.

**باشووری:** بان مازیكا بێغەبارابنی و گرێ بەرزیركێ.

### پێكهاتا گوندی:

صاركا وەك گوند و ملك یێ مالا (خاتینێ) یە. بەلێ بنەمالا (محوی) گوندێ ئاڤاكری و ئەو ل سەر گوندی بوون و نۆكە مالێن وان یێن ل (باتیفا).

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

د بنیاتدا ل سەر جۆتیاریێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو و مفا ژ بەرهەمێن سرۆشتی وەكی كەزوان بەروی و مازی و گوهیشكان وەردگرتن.

### كانیێن گوندی:

كانیا ئاڤ تەحلێ و كانیا ئاڤ سیركێ و كانیا گەرا لەهندك.

### چیا و و شكەفتێن گوندی:

شكەفتا دەرمانی، شكەفتا قاسوی، شكەفتا جانێ، شكەفتا مرادی.

## گوندێ بێغەبارا سەری:

ناڤێ گوندی یێ ژ (بێ غوباركێ ئانكو بێ هەوا) هاتی، گوند سالا (١٩٦٣)ێ ل سەر دەستێ (عەموێ محوی) هاتیبە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا

(١٩٥٧)ێ ژمارا خەلكێ گوندێ بێغەبارا ٦٥ كەس بوون. سالا (١٩٨٨) ژئالیێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابكرن.

## سنوورێن گوندی

**رۆژهەلاتی**، باتیفا و گر گەوری.

**رۆژئاڤایی**، لێڤو و گر بەخشو.

**باكووری**، گوندێ سیركوتك.

**باشووری**، گوندێ بێغەبارا بنی.

## زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

د بنیاتدا ل سەر جۆتیاریێ یە ل ئەردێ ئاڤی و دێم و خودانكرنا تەرش و كەوالی و مفا ژ بەرهەمێن سرۆشتی وەردگرتن.

## زێدەرێن ئاڤا گوندی:

سیلاڤا چەمی، كەر مێوك، كانییا گوندی، چەمێ قەدیم، كانی كەك، ئاڤا بڤری. زێدەباری ئاڤا رووباری كو ل بەر تەنشتا گوندی رادبووریت و چەند (جوو) ژێ دچن.

## چیا و شكەفت و جهێن گوندی:

شكەفتا عەبوكی، شكەفتا فەلا، نهالا چەمێ دەولەتێ، نهالا چەمكێ پیری، نهالا كەر مێوكی، نهالا شكەفتا بوكی، نهالا لاتا پەلگ، چرێ عەمو حاجیا گر بەخشو دكەڤیتە هنداڤ گوندی.

ڕووبەرێ گوندی، دكەڤیتە كەرتێ (٢٤)دا كو هەردو بێغەبارا بخۆڤە دگریت و ڕووبەرێ هەر دو گوندا (١٢٧١) دونەم.

# گوندێ بێغەبارا بنی:

ناڤێ گوندی ژ (بێ غوباركێ یان بێ هەوا) هاتییە و ژیان لێ ب زەحمەت بوو. ل سالا (١٩٢٥ - ١٩٢٦) گوند ژ ئالیێ (محوێ سلوی) باتیفی ژ (محو عەرەبا یێ كۆچەرات) ب مەبلەغێ (٤٠) زێرێن (رەش) هاتییە كرین و ل سالا (١٩٥٠ تا ١٩٥٧)ێ گوند وەك (پیش - چەر) یێ دایە مالا (عەمەرێ عەزوی)، سالا (١٩٥٨)ێ ل سەر داخوازا مالا (محۆی) خودانێن گوندی هاتە ئاڤاكرن و شینكرن ژئالیێ بنەمالا (عەمەرێ عەزوی) ڤە چونكی وەك (كەراخێن ملكێ دێم و ئاڤی) ب هاریكاریا مالا (محو)ی دكر. ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٥٨ - ١٩٥٩)ێ ژ ئەگەرێن جڤاكی كاڤل بوویە و ل سالا (١٩٨٨)ێ ژی كەتیە بەر هەوا ئەنفالان و خراب بوویە.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی**، گوندێ صاركا و گوندێ درەنگ ئاڤا.

**رۆژئاڤایی**، گربەخشو و لێڤو.

**باكووری**، گوندێ پەلكیشك و گوندێ بێغەبارا سەری.

**باشووری**، بەرزۆرك و هەر كوند.

## زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

د بنیاتدا سەر جۆتیاریی و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، مفا ژ بەرهەمێن سرۆشتی وەك كەزوان، بەروی، مازی، گوهیشك، وەردگرتن. زێدە باری ئاڤا رووباری كو ل بەر تەنشتا گوندی دا دبووریت و بۆ چاندنا دەرامەتێ ئاڤی مفای ژێ دبینن و گوندەكێ ب ناڤ و دەنگ بوو بۆ چاندنا برنجی.

## كانی و رووبارێن گوندی:

ئاڤا رووبارێ گوندی كو مفا ژێ وەردگرتن.

## چیا و نهاڵ و مێرگ و شكەفتێن گوندی ژی:

(گر بەخشو، گر بەركی، بان مازیكا، نهالا زیارەتێ كەلەش، چەمێ تی رەشكێ، چەموكێ سماق، زرافكا هاجا، چەمێ دەرئاشی، سێ گوشێ، ناڤ كورێ، دەراڤێ پەزكێ، چەمێ پەلگ، بەر هێرا، زیارەتی شێخ عوسمانی).

**رووبەرێ گوندی:**

دکەڤیتە کەرتێ (٢٤)دا کو هەردو بێغەبارا بخۆڤە دگریت و رووبەرێ هەر دو گوندا (١٢٧١) دونەم.

## گوندێ بەهنۆنە:

ناڤێ گوندی دو رامان هەنە، یائێکێ ژبەرکو جهەکێ هوین بوو د ناڤ بیستێت چیایی دا وجهێ بێهن ڤەدانێ بوو، و یا دووێ فێقی یەك بناڤێ (بەبیهـ) هەبوو کو بێهنەکا خۆش ژێ دهات و بۆ (بەهنون) ئانکو بێهنا بها. گوند ل دووڤ ڤەگێرانان بەری چوارسەد سالەکان هاتییەئاڤاکرن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٩٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان. و گوند سێ جاران ل سالێن ١٩٢١ێ، ١٩٦٢ێ و ١٩٨٦ ێ هاتییە سۆتن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** رووبێ دێمکا.

**رۆژئاڤایی:** تەنگا بانکێ.

**باکووری:** خارێ خەلێ هنداڤا منینێ.

**باشووری:** گوهیشکا شێخێ سنوورێ باتیفا.

**پێکهاتا گوندی:**

ژ بنەمالێن: صادقێ بروی، شەهبازی، جۆتیاری، کولکا، فارسی و کەکێ پێکهاتییە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ل سەر خودانکرنا تەرش وکەوالی و دروستکرنا رەزا بوو. هەر وەسان مفا ژ بەرهەمێن سرۆشتی ژی وەردگرتن.

**کانییێن گوندی:**

قولقول، بارزانی، سوارا ستەورێ، کرمی، گێزێ، کەلێ، ئافری، مزگەفتوکێ.

**شکەفت و جهێن ئاڤدار:**

شکەفتا تەنگا بەهنینێ، شکەفتا ئاستەنگا بەهنینێ، شکەفتا کون پلنگی، نهالا کانی قیرێ، نهالا شیف کیرێ، زیارەتێ شێخ عومەر، زیارەتێ شێخ ئیبراهیم/ فقە، زیارەتێ سەید عەبدولکەریم.

**رووبەرێ گوندی:**

دکەڤیتە کەرتێ (٥٩) کو (گوندێ بهنونە و مێرگ و ئاڤا تیکا) بخۆڤە دگریت رووبەرێ وان(٥٤٩٠) دونەمە.

## گوندێ ئاڤا تویکا:

بەری ئەڤ گوندە ئاڤاببیت (توی هیرکەك) ل سەر کانییا ڤی گوندی هەبوو. پشتی گوند ل سالا (١٩٦٣)ێ هاتییە ئاڤاکرن ئەڤ ناڤە دانانە سەر، ل سالا (١٩٨٧)ێ ژئالیێ عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** ئاڤا خرابا و بیرکێ.

**رۆژئاڤایی:** کەلە خوار و مێرگێ.

**باکووری:** گوندێ بەهنینێ.

**باشووری:** باتیفایە.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوند ژ تنێ بنەمالەکێ پێکهاتییە، ئەو ژی (مال مەلا)یە. سێ مالێن (گۆییا) ژی ل ڤی گوندی یێن هەین.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا گوندیان ب گشتی ل سەر جۆتیاریێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، مفایەکێ باش ژ بەرهەمێن سرۆشتی ژی وەردگرت.

ئێك کانی ب ناڤێ کانییا گوندی لێ هەیە.

**ژ چیا و نهالێن گوندی ژی:**

چیایێ گردەهولی، چیایێ بەرێ توی، چیایێ دولك، ملێت بلند، گرێ تەیرا، نهالا ئاڤا تویکا، نهالا چەلێ

سڤورەی، نهالا رەزێ صوفی عبدالقادرێ، رزدا چالا ب كێرات.

## ڕووبەرێ گوندی

دكەڤیتە كەرتێ (٥٩) دا و گوندێ (بهنونە و مێرگ و ئاڤا خرابا) بخۆڤە دگریت ڕووبەرێ وان (٥٤٩٠) دونەمن.

## گوندێ بیركێ:

ناڤێ گوندی یێ ژ هەبوونا گەلەك بیرێن ئاڤێ هاتی. سالا (١٩٣٠) ێ گوند هاتییە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٨ كەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند ل سالێن (١٩٧٥) و (١٩٨٨)ێ ژئالیێ عیراقێ ڤە هاتییەخرابكرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زرێزە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەهنینێ.

**باكووری:** گوندێ شیلان.

**باشووری:** گوندێ ئاڤا خرابا.

### پێكهاتا گوندی:

بیركێ ژ چوار بنەمالان: بنەمالا (ئیبراهیم محەمەد)، بنەمالا (قاسم عەبدولرەحمان)، بنەمالا (حەسەن محەمەد ئیسماعیل) و بنەمالا (حەجی خەتیب)ی پێكهاتییە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

د بنیاتدا ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و جۆتیاریێ بوو دگەل مفا وەرگرتن ژ بەرهەمێن سرۆشتی وەكی كەزوان، مازی، بەڕوی، گوهیشك بوون.

### كانیێن گوندی:

كانیا ب ناڤێ كانیا گوندی و كانیا بهارێ.

### چیا و نهاڵ و مێرگ و شكەفتێن گوندی:

مێرگا سیارێ، مێرگا كانیا بهارێ، چیایێ كەلوكێ، چیایێ كفری، نهالا هەفشیێ محمیدی، شكەفتا سەرحانی.

### ڕووبەرێ گوندی

دكەڤیتە كەرتێ (٣٣)دا گوندێ (دێریشك، ئاڤا خرابا و بیركێ) پێكڤە ڕووبەرێ وان (٢٤٨٧) دۆنەمە.

## گوندێ پەلگیشك:

ناڤێ گوندی ژ (دارا پەلگ) هاتی كو زۆر ل سەر كانیا گوندی هەبوون. سالا (١٩٦٢)ێ گوند ل سەر دەستێ (محەمەد شریف علی) هاتییە ئاڤاكرن و ل سالێن (١٩٧٦)ێ و (١٩٨٨)ێ ژئالیێ عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ صاركا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێغەبارا سەری.

**باكووری:** باتیفا.

**باشووری:** گوندێ بێغەبارا بنی.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ب گشتی وەك گوندێن دیتر ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و جۆتیاریێ و دەرامەتێ سرۆشتی بوو.

### كانیێن گوندی:

كانیا سەرێ گوندی و كانیا بنێ گوندی.

### چیا و نهاڵ و مێرگ و شكەفتێن گوندی ژی:

گرگەوری، پشت كەرێ، چالا گوندی، شكەفتا سەركولا، بانیكێن عەمەرا، مێرگا گوندی.

### ڕووبەرێ گوندی:

دكەڤیتە كەرتێ(١)دایە دگەل سنوورێ باتیفا.

## گوندێ حەفتەنینێ:

دبێژن بەفر حەفت جارا هندی (تەنیرەكێ) ل گوندی دباریت، ناڤێ گوندی ژوێ چەندێ هاتیيە، ئانكو حەفت تاینێن (بەفرێ) لێ دكەڤن. سالا (١٩٥٣)ێ گوند هاتیيەئاڤاكرن. پێشتر هندەك كاڤلێن خرابە ل ڤی گوندی هەبوون وەكی شوینوار. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٦٢ كەس ل ڤی گوندی دژیان. سالا (١٩٧٨)ێ گوند هاتیيەسۆتن و خرابكرن ژ ئالیێ حكومەتا عیراقێ ڤە، ل دەسپێكا سالێن هەشتیيان ژ سەدسالیيا چوویی گوند ژ دەڤەرێن رزگاركرینێن ژێر دەستەلاتێ شۆرشا گۆلانێ بوو و هندەك ژ خەلكێ گوندی زڤرینەڤە و گوند ئاڤاكرەڤە، بەلێ ل ئەنفالا ١٩٨٨ێ دوبارە ژ ئالیێ لەشكەر و جاشێن عیراقێ ڤە هاتەڤە خرابكرن و هێژ نەهاتیيەڤە ئاڤاكرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن سیلێ و ئێكمالێ و رویسێ.

**رۆژئاڤایی:** بیتەلما.

**باكووری:** گوندێن ئالێشك و گەرینۆك و كیرانش ل باكوورێ كوردستانێ.

**باشووری:** گوندێ كەشانێ.

### پێكهاتا گوندی:

(حەفتەنین)ێ ژ (ئێك) بنەمال ئەو ژی بنەمالا (عەمەرێ)یە پێكهاتیيە.

ژیارا گوندیان ب گشتی ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و جۆتیاریێ و بەرهەمێن سرۆشتی بوو، ژبەركو گوندەكێ سنوورییە بازرگانی و كاروان دكرن.

### كانی و زێدەرێن ئاڤی:

گوندی سەروكانی و جهێن هوین وەك زۆزان هەنە مینا ئاڤا رووبار و سەروكانیيا حەفتەنینێ و كانیێن (بەلاڤێ، پەرزك و كانیيا گوندی و كانیيا هەرفتەی).

چیا و شكەفتێن گوندی ژی چیایێ كەهنی كەڤروكێ، چیایێ حەم صوْرا، چیایێ كەڤرێ دیزە، چیایێ كون بایی، شكەفتا كون بایی، شكەفتا كار وانیيا، شكەفتا كتەڤرێ دیزە، شكەفتا كورە پەپی).

### رووبەرێ گوندی

رووبەرێ گشتیێ گوندی (٢٤٤٨) دونەمن.

## گوندێ كوركا:

ناڤێ گوندی ژ ناڤێ دو برا (خدر و عومەر) هاتیيە، هەردو برا ژ (خوركا) هاتبوون دەف (میرێ كەلێ). میری گۆتە وان هەرن ئاڤاهیيەكێ بۆ خۆ چێكەن. هینگێ ناڤ بوویە (كوركا). نێزیكی سێ سەدسالەكانە گوند هاتیيە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١١٥ كەس ل ڤی گوندی دژیان، سالا(١٩٨٨)ێ هاتیيە خرابكرن.

### سنوورێن گوندی

**رۆژهەلاتی:** گوندێ رێوانێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بلێجانێ.

**باكووری:** گوندێ شیڤێ.

**باشووری:** ئاڤا خابووری یە.

### پێكهاتا گوندی:

گوندێ (كوركا) هەشت بنەمالن، ئەو ژی بنەمالێن: دریازی، خالدی، شەریفی، شكری، ئەحمەدی، صالحێ غازی، عەمەری، رشید موسا.

زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی: ب گشتی ل سەر ئاڤا خابووری و گرتنا ماسیان و خودانكرنا تەرش و كەوالی و جۆتیاریێ و بەرهەمێن سرۆشتیێ یێن دەڤەرێ بوو.

### كانیێن گوندی:

كانیيا گوندی، كانیيا نهالا دەحلی، كانیيا دەشتێ، كانیيا جوما سەری، كانیيا كانی ماصێ، كانیيا قوقلك، كانیيا وەكاشی و رووبارێ خابویری ژ ب رەخڤە دبۆریت.

### چیا و شکەفت و جهێن گوندی:

(چیایێ پیرانێ، چیایێ گرێ کورکا، چیایێ سەرکێرا پیرانێ، مێرگا بن گوندی، گەلیێ قەسرا، لاتا علی خانی بانێ، نهالا گەلی، نهالا دەحلی، نهالا شیفکێ، نهالا ئاخ سپیکێ، شکەفتا چەمێ خالوك، شکەفتا مەیران، شکەفتا قولینی، شکەفتا چەمێ مسیا، شکەفتا گورا دەرمێرنێ، شکەفتا کورێ لاتا پیران).

### رووبەرێ گوندی

دکەڤیتە کەرتێ(٣٧) دا، رووبەرێ گشتیێ وی (١٩٩٧) دونەمە.

## گوندێ بێگۆڤا:

د هێتە گۆتن ناڤێ گوندی ژ (بێ کۆلێت حەیوانا) هاتییە. ئانکو ژ نەبوونا تەرش و کەوالی. لێ هندەك دبێژن ژ هەبوونا (گۆڤان) هاتییە و ژ بەر هندێ دبێژنی گوندێ (بێگۆڤا). ئەڤ گوندە ل سالا (١٩١٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١١٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان. ئەڤ گوندە چ جاران نەهاتییە خرابکرن. بەلکی ل سالێن (١٩٧٧ - ١٩٧٨)ێ بوویە کۆمەلگەهـ و خەلکێ گوندێن هەردو دەڤەرێن (بەرواری ژووری و گوللی) پشتی راگوهاستنێ هینانە ڤێ کۆمەلگەهێ.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** ئاڤا خابووری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گرێ بێ و چیایێ کال گهوری.

**باکوور:** گوندێ رویسێ.

**باشووری:** گوندێ نەرمکێ یە.

### پێکهاتا گوندی:

گوندێ (بێگۆڤا) بەری ببیتە کۆمەلگەهـ ژ دو بنەمالان، بنەمالا (علێ) و بنەمالا (بێ گۆڤییێت کەڤن) پێکهاتبوو.

گوندێ بێگۆڤا



### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا وانا سەرەکی ل سەر ئاڤا خابووری و خوارنا ماسیان بوو، دیسان جۆتیاریێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی.

### کانی و زێدەرێن ئاڤێ:

ئاڤا خابوور، کانی بێسکێ، کانیا بەر زیارەتی، کانیا بەرانشێ.

### چیا و شکەفت و جهێن گوندی:

چیایێ کال گهوری، بەرانشێ، چەلە بەشی، کەڤرێ سور، شکەفتا کونیشکێ.

ڕووبەرێ گشتیێ گوندی (١٥١٠) دونەمە.

## گوندێ زرێزە:

ناڤێ گوندی ژ زنجیرا گوندێن (دێریشك و ئاڤە و گرێ بیێ)، ژ بەر هندێ دبێژنێ گوندێ (زرێزە). رامانەك دی ژێ هەیە (زنجیرە) ئانکو رستك، ل سالا (١٥٠٧)ێ ل سەر دەستێ (ئیسماعیل پاشایی) هاتییە ئاڤاکرن. ول سالا (١٩١٤)ێ ژئالیێ (ئوسمانییان)ڤە، ل سالا (١٩١٨) ێ ژئالیێ لەشکەرێ (بریتانیا)ڤە و سالا (١٩٨٧) ێ ژئالیێ عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن، هەردو جارێن بەراهیێ هاتییەڤەئاڤاکرن، بەلێ بۆ جارا داویێ هێژ نەهاتییەڤەئاڤاکرن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣١ کەس ل ڤی گوندی دژیان.

### سنوورێن گوندی:

**ڕۆژهەلاتی،** گوندێ بێجانێ.

**ڕۆژئاڤایی،** گوندێ بیرکێ.

**باکووری،** گوندێ دێمکا .

**باشووری،** گوندێ ئاڤهێ یە.

### پێکهاتا گوندی:

زرێزە ژ سێ بنەمالا: بنەمالا محەمەد ئێزدینی، بنەمالا حاجی یوسف و بنەمالا بابلی پێکهاتییە.

ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی: ژیارا گوندیان ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر رووبارێ گوندی و

**گوندێ زرێزە**



جۆتیاریێ داروباریێ فێقی و خودانكرنا تەرش و كەوالی و بەرهەمێن سرۆشتیێ یێن دەڤەرێ بوو.

**كانی و رووبارێن گوندی:**

رووبارێ گوندی، كانییا حەلانی، كانییا مارستانێ، كانییا بیشكی، كانییا بێجانێ.

**چیا و شكەفت و جهێن گوندی:**

(چیا بێجانێ، نهالا گەلی، شكەفتا دو دەروك).
رووبەرێ گشتیێ گوندی (٢١٧٥) دونەم.

## گوندێ ئاڤا خرابا:

هەتا سالا (١٩٧٢)ێ دگوتنە ڤی گوندی (دێرشكا خراب). نۆكە دبێژنێ (ئاڤا خرابا)، سالا (١٩٤٨)ێ هاتییە ئاڤاكرن، سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دێریشكێ.
**رۆژئاڤایی:** ئاڤا تیكا كەلا خار.
**باكووری:** گوندێ بیركێ.
**باشووری:** ژی گوندێ دێریشكا خراب.

**پێكهاتا گوندی:**

ئاڤاخرابا ژ (٣) بنەمالان: كولكا و شەهبازا و بلالی پێكهاتییە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

بەری خرابكرنا گوندان جۆتیاری و خودانكرنا تەرش و كەوالی و دەرامەتێن سرۆشتی ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی بوون.

**كانییێن گوندی:**

كانییا گوندی، كانییا قەسیلێ، كانییا باشیلانكێ، كانییا ڤزڤزكێ، و كانییا خوێریسانی.

**چیا و شكەفت و جهێن گوندی ژی:**

مێرگا قەسلێ، نهالا نەعمەتی، گرێ قلۆز، باشیلانكێ، كەلاعلی، نهالا گوندی، گرێ هرچێ، كەلا میرخدری، نهالا خەلیفەی.

**رووبەرێ گونی:**

گوند دكەڤیتە كەرتێ (٣٣)ێ كو گوندێن (دێریشك و ئاڤا خرابا و بیركێ) ب خۆڤە دگریت و رووبەرێ هەر سێ گوندان (٢٤٧٨)دونەمن.

## گوندێ كەلا خوارێ:

وەكی دیار كەلا شابانیێ دكەڤیتە پشتا گوندی و كەلایەكا بچویك ل جهێ گوندی هەبوویە لەوما گۆتینێ (كەلا خـوارێ). گوند ل سالا (١٩٤٥)ێ هاتییە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریبا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٧ كەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند ل سالێن ١٩٦٢ و١٩٨٦ ێ ژ ئالیێ عیراقیێ ڤە هاتییە خرابكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** ئاڤا تیكا.
**رۆژئاڤایی:** گوندێ مێرگێ.
**باكووری:** گوندێ بەهنینە و كەلا شابانیێ.
**باشووری:** گوندێ دەحلێ.

**پێكهاتا گوندی:**

ئێك بنەمالە ئـەو ژی بنەمالا (كەكێ)یە پێكهاتییە.
ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر تەرش و كەوالی و چاندنا دەخل و دانی بوو.

**كانی و رووبارێن گوندی:**

كانییا سەری، كانییا بنی، نهالا كومارتێ، كانییا كولكا، نهالا گەرا جهی.

### چیا و شکەفت و جهێن گوندی:

مێرگا عەلی، نهالا کومارتێ - نهالا کولکا - نهالا کەرا جهی، گرێ مەزن - ملا کوهیشك - ملێن بلند - گرێ هناروکێ، شکەفتا بەریا - شکەفتا دەرمانی - شکەفتا ئاغاکی.

ڕووبەرێ گشتیێ گوندی (١٣٦٥) دونەمە.

## گوندێ مێرگێ:

مێرگ ژ ناڤێ مێرگێ هاتیە گۆتنێ (مێرگێ)، ل سالا (١٩٣٠)ێ هاتبوو ئاڤاکرن، سالێن(١٩٦٢)ێ و (١٩٨٧) ێ ێ هاتیە خرابکرن.

### سنوورێن گوندی:

**ڕۆژهەلاتی،** گوندێن کەلا خوارێ و بەهنینە.

**ڕۆژئاڤایی،** گوندێن گری و سیرکوتکی.

**باکووری،** چیایێ شابانیێ و گوندێ بەهنینە.

**باشووری،** ژی گوندێن دەحلی و سیرکوتك.

### پێکهاتا گوندی:

ژ ئێك بنەمال ئەو ژی بنەمالا برەهیمی یە پێکدهێت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا گوندیان ل سەر چاندنا دەخل ودانی و کۆمکرنا بەرهەمێن سرۆشتی و خودانکرنا تەرش و کەوالا بوو.

### کانی و ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

کانییا گوندی، بنێ مێرگێ، کارێز، سیلاڤا بنێ گوندی.

### چیا و شکەفت و جهێن گوندی:

میرگا گوندی، مێرگا شافر، مێرگا شێخ شبلی، شکەفت هەرفتێ، شکەفتا قاچاغا ل بنێ چیایێ شابانیێ هنداڤا گوندی، شکەفتا هەلاویستی.

### ڕووبەرێ گوندی:

دکەڤیتە کەرتێ (٥٩) دا کو گوندێن (بەهنۆنە و مێرگ و ئاڤا خرابا) بخۆڤە دگریت، ڕووبەرێ وان (٥٤٩٠) دونەمن.

## گوندێ سیرکوتکی:

ناڤێ گوندی سیرکوتك ژ گیایێ (سیرك) هاتیە کو گەلەك ل دەوروبەرێن گوندی هەبوون. ل سالا (١٩٣٠)ێ گوند هاتیە ئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان. و ل سالێن (١٩٦٢) ێ (١٩٨٧)ێ گوند هاتیە خرابکرن.

### سنوورێن گوندی:

**ڕۆژهەلاتی،** باتیفا.

**ڕۆژئاڤایی،** دەشتا چیێ.

**باکووری،** مێرگ شابانی.

**باشووری،** گوندێ بێغبارا بنی.

### پێکهاتا گوندی:

سیرکوتك پێك هاتییە ژ دو بنەمالان: بنەمالا (مکوی) بنەمالا (عبوێ عیسی) پێکهاتییە.

ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی: ب گشتی ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنێ بوو.

کانی و ئاڤێن گوندی: کانی گیسك، ئاڤا ڕووبار و چەند جو ژ ڕووباری.

### چیا و شکەفت و جهێن گوندی:

بانا کونا ریڤی و گرێ نۆکا.

### ڕووبەرێ گوندی:

دکەڤیتە کەرتێ (٣) کو گوندێ (سیرکوتك و خندك) بخۆڤە دگریت کو ڕووبەرێ وان (١٩٧٠) دونەمن.

## گوندێ خوك گوللی:

ناڤێ گوندی ژ جهێ (ژیانێ) ئانکو (خاکا من -

واریێ من) هاتییە و ژ بەر هندێ دبێژنێ (خوەك). د ناڤبەرا سالێن (١٧٩٤ - ١٨٠٨) هاتییەئاڤاكرن، و نیشانێن كەڤنار ل ڤی گوندی هەنە وكو مەزاركەهـ و شوینوارێن ژیانێ و رێكا وان مرۆڤان بوویە ئەوێن د كەلا شابانیێ دا دژیان. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٥ كەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند دو جاران سالا (١٩٦٢)ێ و (١٩٨٧)ێ ژ ئالیێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** مێركێ.

**رۆژئاڤایی:** خیزاڤا.

**باكووری:** گوندێ بانكێ و سیارا ستەورێ.

**باشووری:** گوندێ كری.

## پێكهاتا گوندی:

ژ هەشت بنەمالان: بنەمالا (برەهیمی)، بنەمالا (جانگوی)، بنەمالا (عەڤدلێ یاسوی)، بنەمالا (یوسڤێ رەصولی)، بنەمالا (حەجی مەحمیدی)، بنە مالا (میر شاما)، بنە مالا (علێ)، بنەمالا (محەمەد ئیبراهیمی) پێكهاتییە.

## زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ب گشتی خەلكێ گوندی كارێ جۆتیاریێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی دكر و مفا ژ بەرهەمێن سرۆشتی یێن دەڤەرێ وەردگرت.

## كانی و رووبارێن گوندی:

رووبارەكێ ئاڤێ ل بەر تەنشتا گوندی را دهێتە خوارێ و (سێ) جووێن ئاڤێ ژێ دهێنە سەر ملكێ گوندی. ژ بلی كانییا ڤولیتەیێن، ملا علی.

## ژ چیا و نهاڵ و مێرگێن گوندی ژی:

(نهالا كێشێ، كەلیێ تیێ، نهالا كندالا، نهالا ملا علی، نهالا موقبلێ، مێرگا هەفشیێ مێزگەهێ).

## رووبەرێ گوندی

دكەڤیتە كەرتێ (٥)دا، رووبەرێ گشتیێ گوندی (١٢١٦) دونەم.

## گوندێ خەندەك گوللی:

ژبەر كو گوند ل سەر (رووبارەكێ ئاڤێ) یە و هندی (خەندەك و جویێن ئاڤێ) بۆ ئاڤدانا ملكی لێ هەبوون گۆتنێ گوندێ (خەندەكێ). ل سالا (١٩٠٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن و ل سالا (١٩١٩)ێ د روودانێن وێ سالێدا ژ ئالیێ لەشكەرێ (بریتانیا)ڤە هاتییەخرابكرن و سۆتن، سالێن(١٩٦٢)ێ و (١٩٨٧)ێ ژ ئالیێ لەشكەرێ عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سیركوتك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مەلا عەرەب.

**باكووری:** مێرگێ وچیایێ شابانی.

**باشووری:** گر بەخشو. پێكهاتا گوندی:

خەندەكێ ژ دو بنەمالان: بنەمالا (مال مەلا) و بنەمالا (كەكێ) پێكهاتییە.

## زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ب گشتی ل سەر جۆتیاریێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی ژی بوویە.

## كانی و زێدەرێن ئاڤا گوندی:

رووبارێ گوندی ژ ئالیێ باكووریڤە دهێتە خوارێ و بەرەڤ باشووری دچیت و د بەر ملكێ ڤی گوندی رادبووریت. كانی سیسركێ، كانییا بەرگێری و كانییا پیزەلیخێ.

## نهاڵ و مێرگێن گوندی:

مێرگا كانی سیسركێ، نهالا قەبركا، نهالا بەرگێری.

## ڕووبەرێ گوندی

ڕووبەرێ گشتیێ گوندی (١٢١٦) دونەمە.

## گوندێ چەم جهور:

ل دووڤ گۆتنان ڤی گوندی ئێك چەم هەبوو، بەرهەمێ ژێ دهات تنێ (ئێك جهورێ دانی) بوو لەوما گۆتنێ (چەم جهور). گوند سالا (١٩٣٢)ێ هاتیبە ئاڤاکرن، ل سالێن (١٩٦٢)ێ و (١٩٨٧)ێ هاتیبە خرابکرن .

## سنوورێن گوندی:

**ڕۆژهەلات:** گوندێ گری.

**ڕۆژئاڤایی:** ملا عەرەب.

**باکوور:** خوەك گوللی.

**باشووری:** سیرکوتك.

## پێکهاتا گوندی:

چەم جهور ژ (ئێك) بنەماڵ ئەو ژی بنەمالا (میرزایی) پێکهاتییە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی مینا گوندێن دیتر ل سەر جۆتیارییە ب تایبەت رووبار دبەر گوندی را دهێت و بۆ چاندنێ مفایەکێ باش ژێ دهێتەوەرگرتن.

## کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

کانیا گوندی، جووا گوندی یا ئاڤێ ژ خوەکێ دهێت، جووەکا دی یا ئاڤێ ژ خیزاڤا تێت، زێدەباری ئاڤا رووباری لبەر گوندی را دبووریت.

## ڕووبەرێ گوندی

گوند دکەڤیتە کەرتێ (٤)ێ یێ گوندێن (گری و چەم جهور) بخوڤە دگریت رووبەرێ وان پێکڤە (٦٧١)دونەمە.

گوندێ چەم جهور



## گوندێ گری:

ژبەر کو جهێ گوند لێ هاتییە ئاڤاکرن گرکەك لێ بوویە لەوما گۆتینێ (گری). سالا (١٩١٨)ێ هاتییە ئاڤاکرن، سالا (١٩١٩)ێ ژ ئالیێ لەشکەرێ ئینگلیزی ڤە و سالێن (١٩٦٢)ێ و(١٩٨٧)ێ ژ ئالیێ لەشکەرێ عیراقێ ڤە هاتییەخرابکرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مێرگێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ملا عەرەب.

**باکووری،** گوندێ خیزاڤا.

**باشووری،** گوندێ خەندەك.

### پێکهاتا گوندی:

گوند دو بنەمالان: بنەمالا (خاتینێ)، بنەمالا (حسەینی) ب خۆڤە دگریت.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا گوندیا ب گشتی ل سەر جۆتیاریێ و خودان کرنا تەرش و کەوالی و مفا وەرگرتن ژ بەرهەمێن سرۆشتی یە.

### کانی و زێدەرێن ئاڤێ:

رووبارەك د بەر گوندی رادبووریت و چەند جوێن ئاڤێ ژێ دچن، زێدەباری کانییا گوندی و جووێن ئاڤێ.

### چیا و شکەفتێن گوندی:

چیایێ شابانی، شکەفتا هلاویستی.

### رووبەرێ گوندی

دکەڤیتە کەرتێ (٤)ێ یێ هەردو گوندێن (گری و چەم جهور)ی بخۆڤە دگریت و (١٢١٦)دونەمە.

## گوندێ (خیزاڤا):

خیزاڤا ژ (خیز + ئاڤ) هاتییە، سالا (١٩٣٩)ێ سەر دەستێ (حەجی حسێن) هاتییە ئاڤاکرن، دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٩ کەس ل گوندی دژیان. سالێن (١٩٦٢)ێ و(١٩٨٧) و (١٩٨٨)ێ گوند هاتییە خرابکرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی،** خوەکا گوللیا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بوصەلێ.

**باکووری،** بانکا بنی.

**باشووری،** ژی ملا عەرەب.

### پێکهاتا گوندی:

گوندێ خیزاڤا ژ (٤) بنەمالان: بنەمالا (جۆتیارا)، بنەمالا (مەلا عەرەبی)، بنەمالا (میرشاما) و بنەمالا (حسەینی) پێکهاتییە.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ل سەر جۆتیاریێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە.

### کانی و زێدەرێن ئاڤێ:

رووبارەکێ ئاڤێ بەر گوندی را دهێتە خوارێ و چەندین جووێن ئاڤێ ژێ دچن بۆ چاندنا سێڤ، خۆخ، سپیندار، مژمژە و تری، کانییا خەما ئەڤ کانیە کانیەکا گەلەك ب مفایە و هەردەمە و ناڤ و دەنگێ وێ ل دەڤەرێ یێ هەی، کانییا دوڤێ پرێ.

### چیا و شکەفت و جهێن گوندی:

مێرگا کەرکێت گا، نهالا کویر، نهالا مخەلوکێ، چیایێ دێرێ، سەرێ دێرێ، شکەفتا ئاسێ، شکەفتا سویتێ.

### رووبەرێ گوندی

دکەڤیتە کەرتێ (٦)یدا، رووبەرێ گشتیێ گوندی (١٢٣٤) دونەمە.

## گوندێ (شودن):

سالا (١٩٢٥) ێ گوند ل سەر دەستێ (حەجی

صادق برو) هاتییەئاڤاكرن، گوند ژ ئالیێ بنەمالا حەجی صادق بڕوویێ ڤە ژ رەجوینێ بێجی ل سالا ١٩٢٥ێ هاتبوو كرین، بنەمالەكا مەسیحی ژ مەرگەهێ ئینانە سەر گوندی وەك كەراخ موختارێ گوندی (صلیڤو) بوو. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢١ كەس ل ڤی گوندی دژیان. ل سالا (١٩٧٦)ێ گوند هاتییە چۆلكرن و مەسیحیێن كەراخ بەرەڤ گوندێن زێباریا و بەغدا و مووسل چووینە.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** رووبارێ خابوور.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن شلین و سوریێ.

**باكووری:** گوندێ رویسێ.

**باشووری:** گوندێ گرێبیێ و چیایێ بەرانشێ.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ب گشتی ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و چاندنا دەخل و دانی و دروستكرنا رەزا بوو.

### كانییێن گوندی:

كانیا رەزا، كانیا خێلاڤتێ، كانیا ماردی و كانییا گوندی.

### چیا و شكەفت و جهێن گوندی:

زنارێ كال گوهوری، چیایێ بیركا مەلا زەینی، شكەفتا بەرانشێ و زیارەتێ گوندی: (زیارەتێ بیامێ) زیارەتەكێ بناڤ و دەنگە.

### رووبەرێ گوندی:

ڕووبەرێ گشتیێ گوندی (٦٥٠٠) دونەمە.

## گوندێ گۆڤك گولی:

هەردەم ئەڤ جهە جهێ خودانكرنا پەزی بوویە و گۆڤ لێ هاتینە دروستكرن و ناڤ ژ كولێن (گۆڤێن) حەیوانان هاتی یە. گوند سالا ١٨٩٠ ێ هاتییە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٥٢ كەس

**گوندێ خیزاڤا**



ل گوندێ گۆفکێ دژیان. گوند ل سالێن ١٩٦٢ ێ و ١٩٨٨ ێ هاتییە خرابکرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دو کەرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بلدێشا.

**باکووری:** گۆفکا سەری.

**باشووری:** ژی بەروشکا سەعدوینی.

### زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

ل سەر چاندنا بیستان و جنیکا و چاندنا دەخل و دانی و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە.

### کانی و زێدەرێن ئاڤێ:

رووبارێ خابوور، کانی تەحتکێ، کانیا دارا پیشێ، جووا گوندی، کانیا دانهێرکێ.

### چیا و شکەفت و جهێن گوندی:

چەمێ قەشەی، شکەفتێن گەلی، نهالا گەلی، بانیا دەلێ.

### رووبەرێ گوندی:

دکەڤیتە کەرتێ (٢٧)ێدا، رووبەرێ گشتی (١٢٩١) دونەم.

## گوندێ درەنگ ئاڤا:

ب ڤی ناڤی هاتییە ناڤکرن ژبەرکو رۆژ درەنگ لێ ئاڤا دبیت، یان دەرامەتێ وی درەنگ دهێت یان دگەهیت. سالا ١٩٥٠ێ هاتییەئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٨٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان. سالا ١٩٨٨ێ دەمێ ئەنفالان هاتییە خرابکرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** بانیێ.

**رۆژئاڤایی:** سەرێ سیارا.

**باکووری:** گری گۆڤکێ.

**باشووری:** گوندێ شێر خاسکێ.

### کانی و زێدەرێن ئاڤێ:

رووبار، جووا گوندی و کانیا گوندی.

### چیا و نهالێن گوندی:

بانیا عەرەبا، گرێ گوشکێ، پەلکیشکێ، نهالا پەلکیشکێ.

### رووبەرێ گوندی:

دکەڤیتە کەرتێ (٦١) ێدا،

رووبەرێ گشتیێ گوندی (١٣٣٧) دۆنەمە.

## گوندێ ملا عەرەب:

وەك دهێتە زانین سالا (١٧٨٠)ێ کەسەك بناڤێ (مەلا محەمەد) سەر ئەمرێ میرێ (ئامێدیێ) هاتییە ڤی جهی و ئەڤ جهە کرە گوند و ناڤێ ئویجاخا خو دانا سەر و بوو گوندێ (مەلا عەرەبی). پشتی دەمەکێ درێژ گوند هاتەچۆلکرن. سالا (١٩٣٢)ێ سەر دەستێن گوندیێن نۆکە هاتەڤە ئاڤاکرن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٣٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان.ل سالێن (١٩٦٢)ێ و (١٩٨٥)ێ گوند هاتییە خرابکرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** سیارکا دەشتا چیێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئاڤکەنی.

**باکووری:** سەرێ چیایێ دێرێ.

**باشووری:** گوندێ خوەك سندی.

### پێکهاتا گوندی:

ژ چوار بنەمالان: بنەمالا (حەسەنێ مەلایی)، بنەمالا (شەرووێ عەلوی)، بنەمالا (میرزایی) و بنەمالا (کێراتی) پێکهاتییە.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**
ب گشتی ل سەر جۆتیاریێ بوویە.

**کانیێن گوندی:**
کانیا عین جوزی، کانیا گوندی، کانیا بەحرکێ، کانیا ناف شێلا.

**ژچیا و شکەفت و جهێن گوندی:**
سەرێ دێرێ، نهالا زێرنگری، نهالا شێلا شێل مازیکێ، شکەفتا رزدا صور.

**ڕووبەرێ گوندی:**
دکەڤیتە کەرتێ (٧)یێدا، ڕووبەرێ گشتیێ گوندی (٣١٢٧) دونەمە.

## گوندێ کانی تو، یان کانی تویا:

ناڤێ گوندی ژ کانیا بن توی هاتییە و بوویە (کانی تویا). سالا ١٩٠٠ێ هاتییە ئاڤاکرن، دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٢٥٢ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند ل سالا ١٩٧٨ێ ژ ئالیێ لەشکەرێ حکومەتا عیرقێ ڤە هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی دەربەدەری جهێن دی بووینە، سالێن هەشتیيان گوند دکەڤتە دەڤەرێن ژێر دەستەلاتێ شۆرشا گولانێ، هندەك ژ خەلکێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندی و ئاڤاکرنەڤە بەلێ ل ئەنفالێن ١٩٨٨ێ جارەکا دی حکومەتێ خرابکرەڤە.

**سنوورێن گوندی:**
کانیا تویا یا هەڤسنووره دگەل حەفت گوندان:
**رۆژهەلاتی:** گوندێ کورکا.
**رۆژئاڤایی:** گوندێن ئاڤە و زرێزه.
**باکووری:** گوندێن شیڤێ و گرێ بیێ.
**باشووری:** ژی گوندێن بلێجانێ و وەرمێلێ.

گوندێ مەلا عەرەب



### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ ڤان بنەمالان: بنە مالا تەها بلێجانی، مال تەها، فەیصل سەلیم، مالا ئەحمەدی، توفیق محەمەد عەلی، مالا محوی، محەمەد صالح، مالا سلوی، نەبی حمام لدین، بنەمالا ئوسێ، ئوسێ عومەر عومەر، بنە مالا قوتاسی، ئەحمەد محەمەد قوتاس، مالا (بابلی) پێكهاتییە.

### زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

ل سەر خودانكرنا پەز و بزن و چێل و مریشكا بوو. هەروەسا پتریا گوندیان كارێ (كەرخان) بۆ زاخۆ دكرن، دیسان مفا ژ سرۆشتێ و دەشتا بێجانێ و چاندنا دەرامەتێن دێم و چێكرنا رەزا وەردگرت.

### كانیێن گوندی:

كانی تو (كانییا تویا)، كانییا خراب خاسی، كانییا سیرهێ، كانییا مێرگا جانا و كانییا بن بیستانا.

### چیا و شكەفت و جهێن گوندی:

مێرگا كەهنییا تویا، كەلا بێجان، دەشتا بێجان، شكەفتێن گوندی (شیف كویرێ - عەفانی - مەندیس... هتد).

### رووبەرێ گوندی:

دكەڤیتە كەرتێ (٣٥) یدا، رووبەرێ گشتیێ وی دبیتە (١٨١٠) دونەم.

## گوندێ بلێجانێ:

ناڤێ گوندی ژ هەوایەكێ ناڤنجی هاتییە، واتە ل زڤستان و هاڤینان هەوایەكێ هوین هەیە، و جهەكێ جوانە و ژ بەر هندێ دبێژنێ (بلێجانێ). گوند ل سالا (١٨٣٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٢ كەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند ل سالێن (١٩٧٥)ێ (١٩٨٨) ژ ئالیێ عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن وەرمێلێ و گەرەگوهـ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئاڤهێ.

**باكووری:** گوندێ كانییاتیا.

**باشووری:** ژی گوندێ بارهولێ.

### پێكهاتا گوندی:

بلێجانێ ژ ئێك بنەماڵ، ئەو ژی بنەمالا قوتاسی یە پێكهاتییە.

### زێدەرێن زیارا خەلكێ گوندی:

ب گشتی سەر ئاڤا خابووری و راڤا ماسیا و چاندنا ئاڤی و دێمی و خودانكرنا تەرش و كەوالی و كاروانان و برنا (كەرخا) بۆ (زاخۆ) و مفا وەرگرتن ژ بەرهەمێن سرۆشتی.

### كانیێن گوندی:

كانییا مێرا، كانییا بەرگوندی، كانییا ناڤ گوندی.

### چیا و نهاڵ و مێرگێن گوندی:

(نهالا شیڤ كوێرێ، نهالا بەر گوندی، مێرگا حەجی، نهالا كەهنی دەرینكێ مێرگا جهێ قادووی، چیایێ ستینا زەرێ، چیایێ جەلا بەری).

### رووبەرێ گوندی:

دكەڤیتە كەرتێ (٤٣) یدا.

رووبەرێ گشتیێ گوندی (١٤٨٦) دونەمە.

## گوندێ شیڤێ:

گوند دكەڤیتە د نهالەكا كویردا و ژووردانیە، ئانكو سەرێ شیڤێ یە، لەوما دبێژنێ شیڤێ، سالا (١٩٥٥)ێ هاتییەئاڤاكرن، و سالێن ١٩٧٥ێ و ١٩٨٨ێ هاتییە خرابكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێن رێوانێ و نەرمکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن زرێزە و دێمکا.

**باکووری:** گوندێ گرێ بیێ.

**باشووری:** ژی گوندێن کانییا تویا و کورکا.

**پێکهاتا گوندی:**

ژ دو بنەمالان بنەمالا تەهای و بنەمالا ئەحمەدی و مالەکا گوییا پێکهاتییە.

ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی: ژیارا گوندیان ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنا دەخل و دانی و چێکرنا رەزا بوو.

**کانییێن گوندی:**

کانییا گولکی، کانییا ئاڤا تویکا، کانییا مام کورکی، کانییا کەراسین، کانییا سویلاڤکێ، کانییا بەحری، کانییا مێرگا سویرا، کانییا بن قەسیلێ، کانییا سیافکێ.

**رووبەرێ گوندی:**

دکەڤیتە کەرتێ (٣٨)یدا گوندێن (رێوان و شێڤێ) ڤەدگریت، رووبەرێ وان (٣٣٥٠) دونەمە.

## گوندێ صۆریا - دەڤەرا گولییا:

ناڤێ گوندی (ژ ناڤێ گیایێ سوریازێ هاتییە)، یان جهێ گوندی ئاخ صۆر بوو و بوویە (صۆریا). سالا (١٩٢٩)ێ گوند هاتییەئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٢ کەس ل ڤی گوندی دژیان، و گوند ل سالا ١٩٧٨ێ هاتییەخرابکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** سەرێ بێسیلی.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شلون.

بلێجانێ



**باکووری،** گوندێ شـودن.

**باشـووری،** گوندێ بیرکـێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ بنەمالێن: (نەعموی)، (گوسـی)، (بنیامـێ)، (ملا عومەر)ی و (حمد)ی پێکهاتییە.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی و چێکرنا رەزا و بیستان و جنیکا بوو.

### کانیێن گوندی:

ڕوویێ گوندی، کانیا بنێ گوندی، کانیا مخلێ، کانیا جومێ، کانیا بەرمشکی. چیا و شکەفت و جهێن گوندی:

ژ مێرگان مێرگا حەسەنێ، مێرگا یحیا، مێرگا دارا قەشەی.

ژ چیان ژی چیایێ گرێ قەشرکێ، سەر خوارکی، کورا بەندا.

ژ نهالان تلارا، کورا بەندا، دیکل و مریشك.

ژ شکەفتان ژی دولێ، نهی، کەلەش، کونیشك، کوخکێ پیرێ.

### ڕووبەرێ گوندی

دکەڤیتە کەرتێ (٤٤)ێدا، ڕووبەرێ گشتی دبیتە(٨٨٠) دونەم.

## گوندێ دێمکا:

دهێتەگۆتن ئەو جهـێ یێ دێم بوو لەوما ب (دێمکا) هاتەناڤکرن. ئاڤاکرنا گوندی ل دووڤ ڤەگێرانان بۆ بەری نێزیکی سێ سەد سالەکان ڤەدگەریتەڤە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٥٦ کەس ل ڤی گوندی دژیان، و ل سالا ١٩٨٦ ێ هاتییە خرابکرن.

### سنوورێن گوندی:

**ڕۆژهەلاتی،** گوندێن شیڤیێ وگرێ بیێ.

**ڕۆژئاڤایی،** گوندێ بەهنینە.

**باکووری،** سەرکێ بێسیرێ و صوریێ.

**باشـووری،** گوندێ زرێزە .

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ بنەمالێن:

مالا بەیرەم، مالا حەمە رەشك، مالا پیرانی، مالا هاجو یوسف علی حاجی پێکهاتییە.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی مینا گوندێن دیتر ل سەر کارێ چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

### کانی و زێدەرێن ئاڤێ:

ڕووبار، کانیکا بن رەزا، کانیکا ئاڤا تەزی، کانیکا جوما میرزای، کانیکا گرێ بیێ، کانیکا بەر سیارکێ، کانیکا حجی صالح.

### چیا و شکەفت و مێرگێن گوندی ژی:

مێرگا گرێ بیێ، شکەفتا نهێلێ، نزارێ مارستانێ، نهالا دویلا مارستانێ، نهالا شەمیر ینمایێ.

### ڕووبەرێ گوندی:

گوند دکەڤیتە د ناڤسنوورێ کەرتێ (٤٣)ێدا و ڕووبەرێ گشتیێ وی دبیتە (٢٦٨٣) دۆنەم.

## گوندێ سەرکێ بێسیرێ:

ناڤێ گوندی ژ جهەکێ (گرو ڤر) هاتییە، ئانکو بنێ (ئێسیلێ). سالا (١٧٨٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٣ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتییە خرابکرن و هێژ نەهاتییەڤە ئاڤاکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گرێ بیێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێمکا.

**باکووری:** گوندێن صوریێ و شیلان.

**باشووری:** نزار.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند ژ چوار بنەمالێن: (شەلالی)، (یەعقوبی)، (حسو خەمریا) و (سورا) پێکهاتییە.

ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی: ب گشتی ل سەر مولکێ ئاڤی و دێم و مفا وەرگرتن ژ بەرهەمێن سرۆشتیێ یێن دەڤەرێ وخودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

**کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:**

رووبارێ گوندی، کانیا گوندی، کانی کەوکێ، کانیا رەزا، کانیا صارمای.

**چیا و شکەفت و جهێن گوندی:**

(نزار، بەرۆژ، مێرگا جوما، رەزا، چەلێ جەلالی).

**رووبەرێ گوندی:**

دکەڤیتە کەرتێ (٤٣) کو گوندێ (دێمکا و سەرکێ بسیرێ) بخۆڤە دگریت رووبەرێ وان (٢٦٨٣) دونەم.

## گوندێ گرێ بییێ:

ناڤێ گوندی ژ دارەکا (بیێ) هاتییە کو ل سەر کانیا گوندی بوو و نێزیکی ڤێ کانیێ (گرەکێ) بلند هەیە. لەوما دبێژنێ گوندێ (گرێ بیێ). سالا (١٩٠٧)ێ گوند هاتییە ئاڤاکرن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان. و ل سالا (١٩٨٧) گوند هاتییەخرابکرن و پشتی سەرهلدانێ سەر ژ نوو هاتییەڤەئاڤاکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** کۆمەلگەها بێکۆڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێمکا.

**باکووری:** گوندێن شودن و شیلان.

**باشووری:** گوندێ کانیا تویا.

**پێکهاتا گوندی:**

گرێ بیێ ژ چوار بنەمالێن: (حەمەرەشی)، (بیرەمێ)، (پیران) و (بابل)ێ پێکهاتییە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندێ ل سەر چاندنا دێم و ئاڤی و خودانکرنا تەرش و کەوالی و بەرهەمێن سرۆشتی یێن دەڤەرێ بوو.

**کانیێن گوندی:**

(کانیا گوندی).

**چیا و شکەفتێن گوندی:**

(شکەفتا شەمریخانێ کورا مەزن).

**رووبەرێ گوندی:**

دکەڤیتە کەرتێ (٤١)ێدا، رووبەرێ گشتی دبیتە (٣٢١٠) دونەم.

## گوندێ (نزۆر)ێ:

ئەڤ گوندە ژ دو پشکان، واتە ژ دو گوندان پێکهاتییە:

**گوندێ ئێکێ:** (قارقوس، سندۆر، نزدۆر، نزۆرێ).

**گوندێ دووێ:** (بارزانکێ - بارزان).

ئەڤ هەردو رامانە کۆمکرینە و دبێژنێ گوندێ (نزدورێ). ل سالا (١٦٣٤)ێ هاتییەئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٨٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان. و گوند ل سالێن (١٩٧٦)ێ و(١٩٨٥)ێ (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابکرن.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** دەڤەرا بەرواری بالا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ رویسێ.

**باکووری:** باکوورێ کوردستانێ و گوندێن هەدریشێ و مەرگەهێ.

**باشووری:** ژی گوندێ کێستە.

## پێکهاتا گوندی:

گوندێ (نزۆرێ) ژ هەشت بنەمالێن: (خاتینێ)، (مامکا)، (گەهوەرێ)، (حەمی)، (خدرا)، (پیر بابێ)، (شێخان) و (شەهوانی) پێکهاتییە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر جۆتیاریێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی و چوونا کاروانی، و راڤ و نێچیر و مفا وەرگرتن ژ بەرهەمێن سرۆشتی و خوارنا ماسیان بوو.

## رووبەرێ گوندی:

دکەڤیتە د کەرتێ(٤٧)ێدا و رووبەرێ گشتی (١٠٤٢٥) دونەمە.

## کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

### ١- ئەڤ کانی یە ل گوندی هەنە:

بیشێ، باڤێ، سێرتێ، رەزکێ، گەرماڤوکێ، دێرکێ، شێڤا کیرس، بێزالێ، بهار، ئاشا، سڤیکێ، ئافرکێ بچیك، ئافرکێ مەزن، خارێ پەمبی، هیدانێ، نهالا بەختێنکێ، چەمێ حاجی، گەرماڤوکێ، بهار، کولندەی، بهاری، بێزالێ، چەموکێ، مام رەش، سەرێ سێهلێ، نهالا ڤرکێ.

### ٢- رووبار:

هەر ژ باکووری دهێت تاکو دگەهیتە گوندێ نزۆری و دکەڤیتە سەر خابووری و ناڤێ جهی ژی دبێژنێ

گرێ بیبێ



ڕوخابووری. هەر وەسا چوار جویێن ئاڤێ ژ رووباری هاتییە کێشان بۆ ئاڤدانا بیستانا.

**٣- خابوورێ گوندێ نزۆرێ:**

ئەڤ خابوورە د نیڤەکا گوندێ ناڤبری دا دبووریت و ژ ئالیێ باکووری ڤە ڕوویەك دهێت.

## چیا و شکەفت وجهێن گوندی:

- چیایێن گوندی: خارێ پنبی، دێرکێ، بالولە، سێرتێ، باڤی، سیلێ فاتیکێ، نزارێ گا، ملا شیڤا کیرسی، ناڤ رەزا، ناڤ هەلزا.
- نهال: نهالا دینا، نهالا باڤێ، نهالا رەزی، نهالا زیارەتی، نهالا سێرتێ، نهالا گا، نهالا نزارێ سینا و نهالا بێزالێ، نهالا شێخوی، نهالا ئاف خودیرێ، نهالا بەختیکێ.
- شکەفت: سلێڤانیکێ، رەشێ، وەسیلا، باڤێ، بەراکێ، سڤوتکا، دوودەرێ، گەلێ دووری، لاتکا ماشێ، ئافروکێ، مێشا هەفشیکێ، ساروکێ، مەلا شهوانی، سەیدی، دودەر، سلوێ ئەحموی، بەراگێ یا سەری، بەراگێ یا بنی، عەرەبێ، لاتا عەلی، گەرماڤوکێ.

## گەلی و کەڤرێن گوندێ:

گەلێ تاوك، چەلێ ملا دەوی، کەڤرێ عەلێ، کەڤرێ ئلیاسوگێ، نهالا کەزوانا فالماکێ، نزارێ گولکا، نهالا قادوی، نهالا قرکێ، گەلێ بێزالێ، نهالا مێشا کەلوکێ، نهالا مێشا چیچی، نهالا کانیبا بهارێ، گەلێ نزۆرێ، نهالا گورتێندێ.

نزۆرێ چەند گوندەکێن دی کو ئەو ب خۆ خرابەگوندن ب خۆڤە دگرتن وەك:

**١- سلێڤانیکێ:**

سلێڤانیکێ گوندەك کەڤنە ملك و ئاخا وێ

نزۆرێ



سەر ب گوندێ نزۆرێ ڤەیە.

- کەڤرێن سلێڤانیکێ: کەڤرێ کوپکێ، کەڤرێ ئیلوخی، لاتا ئوشانەی، کەڤرێ شکاکی.
- کانیێن سلێڤانیکێ: کانیا ئاشا، کانیا باڤێ، کانیا چەمێ عەرەب.
- شکەفتێن سلێڤانیکێ: شکەفتا سلێڤانیکێ یا مەزن، شکەفتا کاڤلێ سلێڤانیکێ، شکەفتا شەنگێ، شکەفتا بێلندورێ، شکەفتا سەڤەری، شکەفتا بەراکێ، شکەفتا سکری،شکەفتا گێرانە عموی، شکەفتا باڤێ، شکەفتا وەسەلا، شکەفتا میسێ، شکەفتا جنا.
- زیارەتێن سلێڤانیکێ: زیارەتێ سلێڤانیکێ، زیارەتێ سکری، زیارەتێ خرابەی، زیارەتێ باڤێ، زیارەتێ سێهکێ، زیارەتێ وەسەل.
- نهالێن سلێڤانیکێ: دولا نزۆرێ سینا، گەلێ گا، نهالا شێخوی، نهالا باڤێ.

**٢- دێرکێ:**

دێرکێ گوندەکێ کەڤنە ملك و ئاخا وێ سەر ب گوندێ نزۆرێ ڤەیە.

- کانێن گوندێ دێرکێ: کانیا دێرکێ، کانیا ئافرکێ عەلی، کانیا شیڤا گێرس، کانیا سەرسرکی، کانیا ئافخودیرێ، کانیا کەهنی سفتیکێ.
- نهالێن گوندێ دێرکێ: دوشاخا گەلێ دودێ، سوارا توخیب.
- شکەفتێن دێرکێ: شکەفتا گەلێ دودێ، شکەفتا گەلێ ئالوزی، شکەفتا ئافرکێ علی، شکەفتا گەلێ ئاڤخودێر، شکەفتا رەشێ، شکەفتا عەڤدیك.
- کەڤرێن دێرکێ: چەلێ گێلك، کەڤرێ ئالوزی، چەلە رەش.

**٣- گوندێ بارزانێ:**

گوندەکێ کەڤنە ملك و ئاخا وێ سەر ب گوندێ نزۆرێ ڤەیە.

- شکەفتێن بارزانێ: شکەفتا بینسرێ، شکەفتا بن تیێ هەفشیکی، شکەفتا کاماشێ، شکەفتا چەمێ یلمانی، شکەفتا گەلێ سیرتێ.
- نهالێن بارزانێ: نهالا گەلێ سیرتێ، نهالا بیشی، نهالا دینا.
- زیارەتێن بارزانێ: زیارەتێ کورا گلگلە.
- کانیێن بارزانێ: کانیا بیشێ، کانیا دسکێ، کانیا مێرگا بیشولێ، کانیا نهالا بەختکێ، کانیا سرتێ.

**٤- گوندێ هورکێ:**

گوندەکێ کەڤنە ملك و ئاخا وی سەر ب گوندێ نزۆرێ ڤەیە، ئەڤ جهێن دیار لێ هەنە.

**١- گەلێ زمندوورەێ.**

**٢- شکەفتا هورکێ.**

**٣- زیارەتێ هورکێ.**

**٤- کەڤرێ نزارێ تەدێ.**

## گوندێ رویسێ:

گوندێ (ریسێ) گوندەکێ تێر (پەز) بوو و (ریسا) پەزێ ناڤ و دەنگێ خو هەبوو، هەروەسا ئەڤ گوندە دکەڤیتە سەر سێ رێکێن سەرەکی و ژ بەر هندێ دبێژنێ (ریسێ). ژ گوندێن هەرە کەڤنە، بەلێ دەسپێکا ئاڤاکرنا وی نەهاتییەزانین، بەلێ ب گورەی دانعەمرێن ڤی گوندی دبێژن بەری (زایینی) ئەڤ گوندە هاتییەئاڤاکرن. لێ گەلەك پەرتووکان رولێ زانایێن ئاینێ ئیسلامێ و ناڤ دەنگێ وان خویندکارێن خواندنگەها (ئاینی) یا ڤی گوندی بەرچاڤکرینە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٧٣ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند ل سالێن (١٩٧٦)ێ (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابکرن.

ل دیڤ ژێدەرێن دیرۆکی ڤی گوندی ل سەر دەمێ میرگەها بەهدینان ناڤداریا خۆ هەبوویە، میرێ بەهدینان سولتان حەسەنی (١٤٧٠- ١٥٣٣)

خواندنگەهەکا ئایینی ل ڤی گوندی ئاڤاکریە، میر زێر پاشای (۱۷۰۲- ۱۷٤۹)ئەڤ خواندنگەهە نووژەنکریەڤە، د دەمێ خۆدا سەنتەرەکێ رەوشەنبیری بوو و ژ جهێن جودا جوداڤە فەقی و قوتابیێن ئایینی قەستا خواندنگەها ڤی گوندی کریە.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** دەڤەرا نزۆر و کێستە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کەشانێ.

**باکووری:** گوندێ گوندێن سیلێ و ئێکمالێ.

**باشووری:** گوندێ شویدنێ.

## پێکهاتا گوندی:

(رویسێ) ژ شەش بنەمالان: بنەمالا (مەلای)، بنەمالا (کەژوی)، بنەمالا (قولی)، بنەمالا (عەمەر کوبا)، بنەمالا (حەسێ خامێ) و بنەمالا (محەمەدی) پێکهاتیە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی ب گشتی زۆر سادە بوو، ل سەرئاڤا خابووری وخودانکرنا تەرش و کەوالی و جۆتیاریێ و بازرگانیەکا سڤك بوویە و مفا ژ بەرهەمێن سرۆشتیێن دەڤەرێ وەرگرتیە.

## کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

ئاڤا خابووری، کانییا گوندی، کانییا بیشێ، کانییا فەقا، کانی صارکێ، کانییا تویا، کانییا گریشی، کانییا گەلی، کانی گویزکێ، کانییا هێوشێ، کانییا ئاستەنگێ، کانییا زولینێ، کانییا بێکتورێ، و هتد ...

## چیا و شکەفت جهێن ناڤدارێن گوندی:

چیا وەك: سەرێ ئاڤێ، کەڤری دەرگەهی، کەڤرکێ بلێ لاتێ، کەڤن رەزا.

شکەفت وەك: شکەفتا سمایلی، شکەفتا سماق، شکەفتا لاتێ، شکەفتا کەڤرکێ بلێ، شکەفتا هێکا، شکەفتا بەرانشێ، شکەفتا کوپکی، شکەفتا هەلاویستی، شکەفتا زولینێ و یێن دیتر.

## رووبەرێ گوندی:

گوند دکەڤیتە د سنوورێ کەرتێ (٤٦) دا و رووبەرێ گشتی (٩٦٦٠) دونەمە.

## گوندێ سویلێ:

ناڤێ گوندی ژ (سیلاڤێ) هاتیە. ل دووڤ ڤەگێرانا پتر ژ چوارسەد سالانە هاتیەئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (۱۹٥۷)ێ ۱۱٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند دو جاران د رووداناێن (۱۹۷٦)ێ و (۱۹۸۸)یدا هاتیەخرابکرن.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئێکمالێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کەشانێ.

**باکووری:** گوندێ مەرگەهێ .

**باشووری:** ژی گوندێ رویسێ.

## پێکهاتا گوندی:

(سویلێ) ژ چوار بنەمالان: بنەمالا (ئاڤدەلی)، بنەمالا (مەلای)، بنەمالا (زێدین)، بنەمالا (هسنکا سێڤوێ سویلی) پێکهاتیە.

ژیارا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ گشتی یا سادە بوو، مژوولی جۆتیاریێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی و کۆمکرنا بەرهەمێ سرۆشتیێ دەڤەرێ و نێچیرێ و کاروانان بوون.

## کانیێن گوندی:

ئاصوصێ، کانییا کۆخی، کانییا میرا، کانییا گەرا ناف مالا، کانییا رهالی، کانی صارکێ.

چیا و شکەفتێن گوندی: (ئاصوصێ، سەرفەرشی، نهێل، کاتوێ سویلێ).

### روویەرێ گوندی

دکەڤیتە کەرتێ (٤٩)یدا، روویەرێ گشتی (٥١٥٣) دونەمە.

### گوندێ ئێکمالێ:

ناڤێ گوندی ژ دویندەها (ئێك مال) هاتییە. ول دووڤ گۆتنان: د دەمەکیدا کەسەك هاتییە ڤێ دەڤەرێ و ل سەر کەڤنە (ئاشەکێ) ئاکنجی بوویە و بۆ خۆ کرییە خانی و تێدا ژیایە و ژ بەر هندێ دبێژنێ (ئێك مالێ). ل دووڤ ڤەگێرانا پتر ژ چوارسەد سالانە هاتییەئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦١ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند ل سالا (١٩١٩)ێ ژئالیێ دەولەتا (بریتانیا) ڤە و سالێن (١٩٧٦)ێ و (١٩٨٣)ێ (١٩٨٨)ێ ژئالیێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابکرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ نزدورێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سویلێ.

**باکووری:** باکووری‌ێ کوردستانێ یە.

**باشووری:** ژی گوندێ رویسێ یە.

### پێکهاتا گوندی:

ژ ئێك بنەمالە کو ب بنەمالا عەتۆی ناڤدارە پێکهاتییە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا گوندیان ب گشتی ل سەر جۆتیارێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی و بەرهەمێن سرۆشتی و کاروانی و نێچیرێ بوو.

### ژ کانی و رووبارێن گوندی:

ئاڤا گوندی دبێژنێ (سەرەرو) و پێکدهێت ژ شەش کانییان، سێ ژ وان یێ ل ئالیێ نزاری و سێ ل ئالیێ بەرۆژی، کانییێن ب ناڤ دەنگ ژی ئەڤەنە: کانییا (نەدوورێ) ئاڤا وێ ل زڤستانێ یا گەرمە و هاڤینێ سار و ل دووڤ گۆتنان بۆ نەخۆشیێن (پیستی) یا باشە. کانییا (ئاڤ رەشکێ) ئاڤا وێ یا رەشە و ب کێر ڤەخوارنێ ناهێت و تاما (گازێ) ژێ دهێت. کانییێن دی ژی ئەڤەنە: کانی هوڤێ، کانییا خیارا، کانییا چەموکا، کانییا وارگەهی.

### شکەفتێن گوندی:

شکەفتا بەراکێ، شکەفتا هەلاویستی، شکەفتا صادە، شکەفتا پشت ئاشی، شکەفتا مەرزا، شکەفتا ئاسێ، شکەفتا نهین، شکەفتا دەراڤی، شکەفتا بەرسۆرکێ.

### مێرگ یان خارێن گوندی:

خارێ صافکا، خارێ پیرێ، خارێ لەهندك، خارێ هرمێ، خارێ کویرکێ، خارێ پاصکێ، خارێ شکاکی، خارێ تەحلی گوسی، خارێ هوڤی.

### نهالێن گوندی:

نهالا مخلێ، نهالا مزگەڤتێ، نهالا سلێمانی، نهالا گرکی، نهالا خرابەی، نهالا شیف قەصرێ، نهالا نیانکێ.

### رووبەرێ گوندی:

دکەڤیتە کەرتێ (٤٨)یدا و رووبەرێ گشتی (٥٠٥٠) دونەمە.

خەلکێ ڤی گوندی شارەزایی د دروست کرنا (ئاشا) دا هەبوو و ژ بەر هندێ شوینوارێ هەشت کاڤلە ئاشان لێ هەنە.

### گوندێ ئاڤهێ:

ناڤێ گوندی ژ زۆربیا ئاڤاهیان هاتییە کو گەلەك ل دەوروبەرێن گوندی وەکی شوینوار هەنە و ڤەدگەرنە بەری زایینێ. ئاڤاکرنا گوندی د زڤریتەڤە بۆ بەری پتر ژ سێ سەد سالەکان، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان. سالێن

(١٩٨٧)ێ و (١٩٨٨)ێ ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** گوندێن کانییا تویا و بارهول.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێریشکێ.

**باکووری:** گوندێ زرێزە.

**باشووری:** ژی بانیێ و درێشکێ.

**پێکهاتا گوندی:**

گوندێ (ئاڤهێ) ژ ئەڤ بنەمالێن: (جونی)، (برەهیمێ)، (قادری)، (ئالێ)، (حجی رشیدی)، (محو کهیبا)، (شەهوانی)، (سید حسێنی) و (حویلی) پێکهاتییە.

ژیارا خەلکێ گوندی ب گشتی ل سەر جۆتیاریێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی و مفا وەرگرتن ژ بەرهەمێن سرۆشتی بوو.

**کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:**

ئاڤا رووبارێ گوندی و (پێنج) جووێن ئاڤێ ژ ڤی رووباری دهێنە سەر ملکێ گوندی، کانییا، پیریلێ، کانییا شکەفت ئیێتینێ، کانی بهاریك).

**چیا و و شکەفت و جهێن گوندی:**

نهالا گەلی، نهالا جەرنا، شکەفتا سێڤدینی، شکەفتا پیری، شکەفتا نهالا گەلی، شکەفتا مشمشکێ، شکەفتا دوودەر، شکەفتا ئەجنا: ئەڤ شکەفتە دبیتە جهێ حیبەتییێ دەمێ مرۆڤ دبینت، دهێتە گۆتن: ئەڤ شکەفتە نە یا قودرەتیە. بەلکو یا هاتییە چێکرن ژ ئالیێ (قرالەکێ) ب هێز و شیان ڤە و ئەڤ شکەفتە دکەڤیتە نێزیکی گوندی ب درێژاهیا (١) کلم. زێدەباری (٢) مغارە یێن ل پشتا گوندی هەین دبێژنێ (کون - کەڤۆك) و ئێك ژڤان موغارا (٨٠)م یا کویرە و هەردو مغارە د کەڤرەکێ حلی دا کۆلاینە و فرەهیا وان نێزیکی (١٠) م دو جارکی یە).

**گوندێ ئاڤهێ**



**ڕووبەرێ گوندی**

دکەڤیتە کەرتێ (٣٢)یـدا و ڕووبـەرێ گشتی (٣٣٧٣) دونەمە.

## گوندێ دێریشکێ:

ناڤێ گوندی ژ (دێرا ل ئیشکی هاتییە، واتە دێرا چۆلێ). ل سالا (١٨٥٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان. ل سالێن ١٩٦٢ و ١٩٨٧ێ گوند ژ لایێ عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن.

**سنوورێن گوندی**

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئاڤهێ.

**رۆژئاڤایی:** سەنتەرێ باتیفا.

**باکووری:** گوندێ بەهنۆنە.

**باشووری:** گوندێ شێر خواسکێ.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند تنێ ژ بنەمالا (حجی حیدر) و بنەمالا (یونس)ی پێکهاتییە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ل سەر دەرامەتی و جۆرێن فێقی بوو، هەر وەسان دو ئاش لێ هەبوون.

**کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:**

رووبار و جۆك، کانییا رەش، کانییا بانا بەری و کانییا چرا.

**چیا و شکەفت و مێرگێن گوندی:**

مێرگا چرا، بانا بەری، کورا گولکا، شکەفتا ئەجنا، گەرکا هێژیری، گرێ سور، گرێ هرچێ، ملا بێریا، نهالا کەهنییا رەش، نهالا ڤزڤزکا، حەلانا.

**ڕووبەرێ گوندی**

دکەڤیتە کەرتێ(٣٣)یدا کو (گوندێ دیریشکێ و ئاڤا خرابا و بیرکێ) بخۆڤە دگریت و ڕووبەرێ وان (٢١٧٥) دونەمن.

## گوندێ نەرمکێ:

ناڤێ گوندی ژ (مسکینی)، یان ژی ژ بەر ئاخا گوند لێ هاتییە ئاڤاکرن یا ب زاخ و نەرمە لەوما گۆتینێ نەرمك. گوندەکێ کەڤنارە و وەك پرانییا گوندان سالا ئاڤاکرنا وی نەهاتییەزانین، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان. د سەردەمێ نوودا سالا (١٩١٩) ێ ژ ئالیێ لەشکەرێ (بریتانیا) ڤە و سالا (١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن.

**سنوورێن گوندی**

**رۆژهەلاتی:** ئاڤا خابووری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گرێ بیێ.

**باکووری:** کۆمەلگەها بێکۆڤا.

**باشووری:** گوندێ رێوانێ.

**پێکهاتا گوندی:**

گوندێ ژ چوار بنەمالان: (مەرعانی)، (حەجی شەریفی)، (بەهرووێ) و (حەجی عومەری) پێکهاتییە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

**کانی و رووبارێن گوندی:**

ئاڤا خابووری، کانییا بەرانشێ، کانییا ملا سیلاڤێ، کانییا بهکێ. زێدەباری جووا سەرەکییا ئاڤا گوندی.

**چیا و شکەفت و جهێن گوندی:**

چیایێ کال گهورێ، نهالا شیڤ کنیستێ، شکەفتا حاجی علی، شکەفتا بەرانشێ، مێرگا بەرانشێ، مێرگا صاك، سێ کوچکێ زەڤیکا.

## ڕووبەرێ گوندی:

دکەڤیتە کەرتێ (٣٩)یدا و ڕووبەرێ گشتی دبیتە (٢٢٩٧) دونەم.

## گوندێ رێوان:

ژبەرکو گەلەك رووبار یان ژ (رێو و رووبارا) ناڤێ گوندی هاتیە. سالا ئاڤاکرنا وی نەهاتییەزانین، بەلێ ل دووڤ ڤەگێرانان د بیت ژێ گوندی پتر ژ پێنج سەد سالەکان بیت، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان. د سەردەمێ نوودا سالا (١٩١٩)ێ ژ ئالیێ دەولەتا (بریتانیا) و سالا (١٩٨٨)ێ د هەوا ئەنفالاندا ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابکرن.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی،** ئاڤا خابووری.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گرێ بیێ.

**باکووری،** گوندێ نەرمکێ.

**باشووری،** گوندێ گەرەگوهێ یە.

## پێکهاتا گوندی:

رێوانێ ژ پێنج بنەمالێن: (مەلا موسی)، (محەمەد)ی، (حسێن ئاغو)، (نعمت محەمەد)ی و (خالد جانگیر)ی پێکهاتییە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ب گشتی ل سەر جۆتیاریێ وخودانکرنا تەرش و کەوالی و بەرهەمێن سرۆشتی و ئاڤا خابووری و راڤا ماسیا بوو.

## کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

ئاڤا خابووری، کانییا دار بوسکێ، کانییا خرابەی، کانییا دەم بوسکا، کانییا گەرماڤێ زێدەباری، (جوەکا ئاڤێ) یا سەرەکی دهێتە گوندی.

گوندێ رێوان



### چیا و تكەفت و جهێن گونی:

چیایێ نزاری، نهالا شیڤێ، شكەفتا سیداڤەی، شكەفتا گوندی، لاتێت گوندی.

### رووبەرێ گوندی:

دكەڤیتە كەرتێ (٣٨) كو گوندێ (شیڤێ و رێوانێ) بخۆڤە دگریت رووبەرێ هەر دو گوندا (٣٣٥٠) دونەمە.

## گوندێ بارهولێ:

بارهولێ دكەڤیتە دەرێ گەلی دا، بایەكێ دژوار لێ دهات و ژبەر كەڤر كاشان دەنگێ هەوایی هول و هول ژێ دهێت، ناڤێ گوندی ژسەر سرۆشتی و هەوایی بوویە (بارهول). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٣ كەس ل ڤی گوندی دژیان. سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە خرابكرن و سۆتن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پاسێ و چیایێ مەتینی یە.

**رۆژئاڤایی:** بانێ.

**باكووری:** گوندێ بلیجانێ.

**باشووری:** گوندێ غولدیایە.

### پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە ژ چوار بنەمالان: بنەمالا (مالا عومەری)، بنەمالا (براهیمی)، بنەمالا (حارسی)، بنەمالا (هەدریشی) پێكهاتییە.

### كانیێن گوندی:

كانیا بەركەڤرێ خاتینا، كانی رەشك و كانیا گوندی.

### چیا و تكەفت و جهێن گوندی:

ئاستەنگا بارهولێ، چەمێ بلێ، قەصرا لاتێ، چەمێ سهێلك، كەڤرێ خاتینێ، بوورێ بارهولێ، نهالا گەلی، شكەفتێت ئەنسی، بان مازیكا.

### رووبەرێ گوندی:

رووبەرێ گشتی (١٦٢٠) دونەمە.

## گوندێ شێر خاسك و بانی:

ناڤێ گوندی ژ (مێرخاسیێ) هاتییە، ژ بەر هندێ دبێژنێ (شێرخاسكێ). هەروەسا گوندێ (بانی) ژبەركو جهەكێ (پانە جهێن دكەڤتنە سەر بانییان دگۆتنێ بانی، سالا (١٧٠٠)ێ گوندێ (شێرخاسكێ) هاتییە ئاڤاكرن، سالا (١٩٥٠)ێ (بانیێ) ل سەر دەستێ (حسەین ئاغا)ی هاتییە ئاڤاكرن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٥ كەس ل ڤی گوندی دژیان. سالێن (١٩٢٠)، (١٩٥٠)، و (١٩٨٨)ێ شێر خاسك هاتییەخرابكرن، (بانیێ) ژی ل سالا (١٩٨٨)ێ هاتییەخرابكرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ غولدیایە.

**رۆژئاڤایی:** باتیفا.

**باكووری:** گوندێ ئاڤهێ.

**باشووری:** زنوكا صەیدا.

### پێكهاتا گوندی:

(شێر خاسكێ) و (بانیێ) پێكهاتییە ژ (ئێك) بنەمال ئەو ژی بنەمالا (پساغا)، چونكە ئەڤ هەردو گوندە ئێك بنەمالن و چ سنوور لناڤ بەرا (ئاقارێن) وان دا نینە.

### زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

وەك گوندێن دیتر چاندنا ملكی و خودانكرنا تەرش و كەوالی و بەرهەمێن سرۆشتی بوو و مفا ژ رووبارێ دناڤ گوندیدا دبۆریت وەردگرت. زێدەباری دو ئاشێن (ئاڤێ) ژی ل ڤی گوندی هەبوون.

### كانی و زێدەرێن ئاڤێ:

رووبارێ ئاڤێ ئەوێ دناڤ گوندی رادبوریت و كانیا بەر گوندی.

## چیا و و شکەفت و جهێن گوندی:

هشکە مێرگ، مێرگا ب شافر، نزارێ سماق، کە پیێ، ئاخ سپیکێ، نهالا پەلگا، نهالا شیڤ جنکێ، نهالا بوتێ، شکەفتا هناروکێ، شکەفتا سیخوری، شکەفتا کون، رێڤیکێ شکەفتا ئاخ رەشێ.

## ڕووبەرێ گوندی

دکەڤیتە کەرتێ (٢٩)ێدا و ڕووبەرێ گشتی دبیتە(٣٢١٠) دونەم.

## گوندێ کەشانێ:

ناڤێ گوندی ژ(شان) هاتییە ژ بەر کو د کەڤندا گەلەك گوند ل دەور و بەران وەکی (شانا هنگڤینی) هەبوون. پاشان پیتا (کە) ل سەر هاتە زێدەکرن و بوویە (کەشان). ل سالا (١٢٠٠)ێ بەری میر و پاشاتی ل کوردستانێ هەبن هاتییەئاڤاکرن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٠٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان. ل سالێن (١٩١٩)ێ ژ ئالیێ لەشکەرێ (بریتانیا) و سالێن (١٩٧٦)ێ و(١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێن رویسێ و شیلان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ منینێ و بانکێ.

**باکووری:** گوندێ حەفتەنین.

**باشووری:** ژی گوندێن شیلان و شلون.

## پێکهاتا گوندی:

(کەشانێ) ژ نەهـ بنەمالان: بنەمالا (ألیاسی)، بنەمالا (عەمەری)، بنە مالا (شێخ ناصرا)، بنەمالا (گورکی)، بنەمالا (گوییا)، بنەمالا (سێرتێ)، بنەمالا (عەلیکی)، بنەمالا (شیری)، بنەمالا (ئاغایی) پێکهاتییە.

## زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

وەك یێن دیتر ل سەر جۆتیاریێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی و رەزێن (تری)و مێشێن هنگڤینی بوو، زێدەباری بازرگانی و کاروانی بۆ سنووری.

## کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

(ئاڤا رووباری، کانییا رەش، کانییا شیڤ پلنگی، کانییا جنێ، کانییا وارا، کانییا سێڤێ کانییا سێڤا بیرکێ، کانییا لاتێن نهالا سیتکی، کانییا نهالا سیتکی، کانییا ئافری، کانییا فەرشی، کانییا هەفشیکێ ئالێ، کانییا بەستا حاجی، کانییا شیڤ مێزێ، کانییا بەروژێ، کانییا قوربادی، کانییا بارزانا، کانییا بهێرێ، کانییا گولا گەرماڤا، کانییا گولا گرێ رصاصی، کانییا ئافری لاتێت شیڤا دزا، کانییا رەشاگیمی، کانییا رەشا نهالا نهێلێ، کانییا کورا بلکێ).

## ژ چیا و نهالێن گوندی:

(چیایێ سەرێ تەنگا کێلی، چیایێ خویروزوکا بیرکێ، چیایێ سەرێ بیرکێ، چیایێ سەرێ، خالۆمەری، چیایێ ئەحمەد زێدینی، چیایێ چەلێ عەلیا، چیایێ کوخێ دوبپشکا چیایێ کوخێ ملا أحیایی، چیایێ کوخێ سیارا خاریفکا، چیایێ چەپەرێ عنگلیزی، چیایێ چەلکێ قارتی، چیایێ سەر خوراکی، نهالا سیتکی، نهالا شیفا دزا، نهالا شیفا مێزێ، نهالا زیارەتی، نهالا کورتکی، نهالا کویزێ خەزینێ، نهالا گەلیێ کەشانێ، نهالا روزکێ سێفی، نهالا تویژی، نهالا خوارێ ئومەری، مێرگا سەرێ خواری).

## ڕووبەرێ گوندی

گوند دکەڤیتە کەرتێ (٥٢)ێدان ب گشتی رووبەرێ وی (٩٨٥٠) دونمە.

## گوندێ شیلان:

رامانا وێ ژ گولا (گول شیلان) هاتییە کو دەوروبەرێن کانیێ هەمی گول شیلان بوون. دناڤبەرا سالێن (١٧٧٠- ١٨٠٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢١٩ کەس ل ڤی گوندی

دژیان. سالا (١٩١٩)ێ دەمێ هێرشێن لەشکەرێ ئینگلیزی هاتیبەدەڤەرێ گوند خرابکریە و خەلکێ وی مشەختبووینە، پشتی تەنا بوونا سەروبەرێ خەلکێ گوندی زڤرینەڤە و ئاڤاکریەڤە، سالا (١٩٧٦)ێ د دەمێ ڤەگوهاستن و خرابکرنا گوندان‌دا جارەکا دی هێزێن حکومەتا عیراقێ گوند خرابکریە و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهان کۆمکرینە، سالێن هەشتیيان هندەك ژ خەلکێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندی و ئاڤاکرەڤە بەلێ ل ئەنفالا ١٩٨٨ێ سەرژنوو هاتەڤەخرابکرن و سۆتن، هەتا پشتی سەرهلدانێ هاتییەڤە ئاڤاکرن و ل سالا (١٩٩٦)ێ ژێ ژ بەر کاودانێ ناڤخۆ هاتییەڤە چۆلکرن.

## سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شلونێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ منینێ.

**باکووری:** گوندێ کەشانێ.

**باشووری:** ئاڤارێ بەهنینێ.

## پێکهاتا گوندی:

(شیلانێ) ژ سێ بنەمالان: (شیخی)، (عەڤدینی) و (سەیدا) پێکهاتییە.

زانایێن ئایینێ پیروزێ ئیسلامێ ل گوندێ شیلانێ:

د کەڤندا خواندنگەهەکا ئایینی یا ناڤدار ل ڤی گوندی هەبوو و فەقی و قوتابیان بۆ خواندنێ قەستا ڤێ خواندنگەهێ دکر و زانایێن ئایینی ل ڤێ خواندنگەهێ باوەرنامێن مەلایەتیێ وەرگرتینە، ژ وانا عەلی کورێ موحسنێ شیلانی کو ل سالا ١١٢٤مش/ ١٧١٣ز پەرتووکەك ب ناڤێ (خلاصە الحساب) نڤیسی یە، ئەڤ دەستنڤیسە ب خۆ نیشانا کەڤناتیا ڤی گوندی یە..

گوندێ کەشانی



### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل سەر چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی و بەرهەمێن سرۆشتی بوویە.

### كانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

ئاڤا رووبارێ گوندی، كانییا گوندی، كانییا زەربیا، كانییا بیێ، كانییا گیزێ، كانییا وەقفێ و كانییا روخكی.

### چیا و نهاڵ و شكەفتێن گوندی:

كوخێ چەلێ رەش، كوكەلێ، لاتا گوندی، نهالا شیڤێ، نهالا گوندی، كانییا بیێ، نهالا گركێ ركو، فەق مەحمیدا، مێرگا سەربانكێ، مێرگا كانییا بیێ، مێرگ كانییا، گیزێ شكەفتا گوندی و شكەفتا نهێلێ).

### رووبەرێ گوندی:

دكەڤیتە كەرتێ (٥١)ێدا، رووبەرێ وی ب گشتی دبیتە (١٨٨٤) دونەم.

### گوندێ شلونێ:

چونكی هەمی دەمێن سالێ رەخ و رویێن ڤی گوندی ئاڤ یا لێ هەی ژ بەر هندێ دبێژنێ گوندێ (شلونێ)، واتە (تێر ئاڤی)، دناڤبەرا سالێن (١٨٩٥ - ١٩٠٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٦ كەس ل ڤی گوندی دژیان. ل سالا (١٩١٩)ێ ژ ئالیێ لەشكەرێ (بریتانیا) و ل سالا (١٩٧٦)ێ ژ ئالیێ عیراقێ ڤەهاتییە خرابكرن.

### سنوورێن گوندی:

**رۆژهەلاتی**، گوندێ شویدنێ.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ شیلانێ.

شیلانێ



**باکووری:** کەشان و شیلان.

**باشووری:** گوندێ صوریێ.

## پێکهاتا گونی:

(شلونێ) ژ سێ بنەمالان : بنەمالا (ئەحمەدی)، بنەمالا (شێخی)، بنەمالا (دەلێ) پێکهاتییە.

## ژێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

ل سەر وی رووباری یە یێ دبەر گوندیدا دهێتەخوار بۆ چاندنا ئاڤی مفای ژێ وەردگرن، هندەکان ژ چاندنا دێم دکر و مژوولی خودانکرنا تەرش و کەوال و مفا وەرگرتنێ ژ بەرهەمێن سرۆشتی بوون.

## کانی و ژێدەرێن ئاڤێ:

ئاڤا رووباری، کانییا بهێرێ، کانییا دەلێ یاب ناڤ و دەنگە و کانییا گولێ.

## چیا و جهێن گوندی:

(کەڤرێ دنگا، کلوخێ کەرکێ، کەلا گرێ، قەسروکێ ملارەدێ، شکێرێ صەی کوخێ رەش، کوخێ وەردێ، کوکەلێ، گرێ مالکا، نهالا کورا، نهالا رەزا، نهالا چەلێ، ئاڤ زە چەلێ صور، نهالا هشاری کار چینییا، هەفشییێ ئاغایی).

## رووبەرێ گوندی

دکەڤیتە د کەرتێ (٥٠) یدا و رووبەرێ گشتی (٢٣٢٥) دونەمە.

## گوندێ خرخەپکا:

گوندەکە پری کەڤر و بەرێن ژ جۆرێ گەنمی یە، د زمانێ کوردی دا ئەو عەردێ پری بەرخر دبێژنێ خرەبەر و ناڤێ گوندی ژ خرەبەر هاتییە و بوویە (خرخەپکا)، کو وەکی دبێژن ل سالا (١٨٨٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، رووبەرێ گشتیێ گوندی ١٠٨٠ دۆنەمن، دێمی چاندی ٦٢٢ دۆنەم، دێمی نەچاندی ٤٥٣ دۆنەم، ئاڤی ٤٠ دۆنەم، بیستان ژی ٣ دۆنەم، کەڤروکاش ٥٤٠ دۆنەم، دارستان ٦٧ دۆنەم.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ باکولاتکێ.

**باشووری:** رووبارێ خابووری دکەڤیتە دناڤبەرا گوندێ خرخەپکا و گوندێ باجلێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سپیندارۆکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەرکەڤری.

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە گوندێ (شیڤ ئەرمەنیانە) کو بابکەکێ عەشیرەتا سندیانە و خەلکێ وی سێ بنەمالن: مالا سەعید قادر، مالا ئەحمەد مستەفا، مالا حاجی محەمەد محەمەدی. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند دو جاران ل سالێن (١٩٧٧، ١٩٨٨)ێ ژئالیێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابکرن.

ژ شوینوارێن گوندی ژی کاڤلە گوندەکێ هەی ب ناڤێ (خرابە)ی و زیارەتێ (مەتا گول).

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

ئاڤا خابویری دبەر گوندی دا دهێت، کانییا دلۆپینکێ، کانییا خرابەی، کانییا (صادق)ی، کانی مەرعانکێ.

## ژێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ب رەنگەکێ گشتی ل چاندنا دخل و دانی و خودانکرنا تەرش و کەوالی چێکرنا بیستانان بوو.

## شکەفت و نهالێن گوندی:

نهالا خرابەی، نهالا دلۆپینکێ، نهالا مەتا گول.

ژ شکەفتان ژی: شکەفتەرەش، شکەفتا دلۆپینکی، شکەفتا گەلوکی.

گیانەوەرێن کیڤی یێن ناڤ سرۆشتێ دەڤەرێ ژی هەین (کەو، پۆر، کێرویشک، سیسک)ن، هەروەسان جۆرێن گیایێن بهاری ژی هەنە، وەکی (تۆلک،

کەرەنگ، کاری، گیرسك، پینك، خەندەلك)، ژبلی جۆرێن داروباری، وەکی سپیندار، بیە، پەلك، داربەڕوی، دارمازی.

خواندنگەهـ ل ڤی گوندی نە هاتییە ڤەکرن، لێ خانیەك وەکی مزگەفت دهاتە بکارئینان.

## گوندێ کەربت /تیمور:

وەکی دهێتە گۆتن گوند دناڤبەرا سالێن (١٨٤٠ تا ١٨٥٠)ێ ل سەر دەمێ (مستو شمو نمر) هاتییەئاڤاکرن و گوند ب ناڤێ کەربت عبوش دهێتە نیاسین.

### رووبەرێ گوندی:

ب ڤی رەنگی یە: کشتی ٣٣٥٨دۆنەمن، دێمی چاندنی ١٢٦٩ دۆنەم، دێمی نەچاندنی ٢٠٣٣دۆنەم، ئاڤی ٢ دۆنەم، بیستان ٣٨ دۆنەم. ناڤێ گوندی یێ ژ (گرێ پیتێ) ئانکو گرەك ل گوندی هەیە دبێژنێ گرێ پیتێ و گرێ پیتێ بوویە (کەربت).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** لێڤو.

**باشووری:** رووبارێ خابویری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ هەر کوند.

**رۆژئاڤایی:** کربت علی.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ بابکەکێ عەشیرەتا سندیانن ب ناڤی (چونکی) و مرۆڤێن ئێکن و ئیك بنەمالە. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ٨٢ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند سالا ١٩٨٨ێ ب ئێکجاری هاتییە خرابکرن، لێ بەری هینگێ بەردەوام دهاتە تۆپبارانکرن.

ژ شوینوارێن کەڤن ل ڤی گوندی دیوارێن مزکەفتێ، سەرێ مالا، کانییا قەلایێ، گرێ کەلوکێ، زیارەتێ شیناکی و زیارەتێ گشتی یێ هەردو کریتان.

ژ نهالێن گوندی ژی: نهالا خرابووکی و نهالا قەلای و نهالا سیلاڤێ.

ژ شکەفتان ژی: شکەفتا بەر خابویری، شکەفتا قەلای ل سەر سنوورێ کریتی، شکەفتا کوماکەوی.

### کانیێن گوندی:

وەك کانییا گوندی، کانییا عەلی یوسف، کانییا قەلای ناسیار ب عەبوش، کانییا مزگەفتێ ناسیارە ب کانییا محوی، دیسان مفا ژ خابویری ژی دهێتە کرن.

سرۆشتێ ڤی گوندی، فڕندە، مینا کەو و چیچك و پۆر و کێرویشکان لێ هەنە و جۆرێن گیایێن بهاری ژی وەکی کەنگر و سیرك و تۆلك و کاری لێ شین دبن، ژبلی دارێ بەڕوی و کەزوان و مازوی و هەلەهەلۆك و...هتد.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ب شێوەیەکی گشتی ل سەر خودانکرنا پەزی بوو، هەر وەسان جۆت و کێل و چاندنا دەخل و دانی و بیستانا ژی لێ دهاتنەکرن، ژبلی مفا وەرگرتن ژ سرۆشتی و گیا و داروبارێ وی.

سالا (١٩٥٩)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ پێرەکا:

وەکی دهێتە گۆتن گوند دناڤبەرا (١٩٢٣– ١٩٢٥)ێ هاتییەئاڤاکرن. پیرەکا دانعەمر ل گوندی بوو ب ناڤی (پێرێ) و ناڤێ گوندی ژ ناڤێ وێ هاتییە وەرگرتن و بوویە (پێرەکا). رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٥٥٧ دۆنەمن، یێ چاندنێ ١٤٠٠ دۆنەم، یێ ئاڤی ٥ دۆنەم. سنوورێن گوندی ژی ب ڤی رەنگی نە:

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** لێڤو.

**باشووری:** رووبارێ خابویری.

**رۆژهەلاتی:** میرکەسۆر.

**رۆژئاڤایی:** چەمکێ دەلا.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند ژ مالا ئوشانەی ب تنێ پێکدهێت.

ئەڤ گوندە سالێن (١٩٧٦، ١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حکومەتا عێراقێ ڤە هاتییەخرابکرن.

ژ شوینوارێن گوندی دیرا مار شمونی و مارقریاقوس.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

ژ ئاڤا خابویری، کانییا کەگو، مەسنوس پێکدهێن.

چیا ونهال ودۆلێن گوندێ: سەرێ دولێ، سەرێ نەرمێ، گری سێ تامێ، گری یوسف، نهالاحەنو، نهالا بەلگێ.

ژ شکەفتان ژی: شکەفتا دولێ، شکەفتا گوندی، بەر ئاڤی.

ژیارا خەلکێ گوندی ب شێوەکی کشتی ل سەر بیستان و گەنم و دەخل و دان و خودانکرنا تەرش وکەوالی بوو.

## گوندێ غولدیا:

ئەڤ گوندە بەرێ گوندێ ئێزدیا بوو و وان ناڤ بێ دانایە سەر، پشتی هاتییە خرابکرن و بەردان جارەکادی ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە ئاڤاکرن، پاشی کۆچەر هاتینە سەر و ناڤێ وی وەکی خۆ مایە، رامانا وی ژی دهێت ب واتایا گولی، مینا گولیا گەنمی.

رووبەرێ وی ژی ب ڤی رەنگی نە: ١٤٧٠ دۆنەم دێمی، چاندنی ٤٢٨ دۆنەم، دێمی کو نەهێتە چاندن ١٠٤٢ دۆنەم، بیستان ١٥٠ دۆنەم.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ بارهول.

**باشووری:** مێسکی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ تەحلاڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شێرخاسك.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ بابکەکی عەشیرەتا کۆچەرانە ب ناڤێ (صەیدا) و پێکهاتا گوندی ژی دو بابکن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان. ئەڤ گوندە سێ جاران سالا ١٩١٩ێ ژ ئالیێ ئینگلیزی ڤە، سالا ١٩٨٨ێ ژ ئالیێ حکومەتا عیراقێ ڤە، سالا ١٩٩٢ێ ژ ئەنجامێ شەرێ ناڤخوو) هاتییە خرابکرن.

ژ شوینوارێن گوندی ژی زیارەتن، وەکی زیارەتێ شێخ داود، زیارەتێ (ئەسحابیان)، زیارەتی خرابەی.

ژ کانی و رووبارێن گوندی: کانییا خیزکێ، کانییا نهالا خلوەکێ، خابیرێ غولدیا، کانییا غولدیا، کانییا چپکێ، کانییا چالا مەزن، کانییا خرابەی، کانییا تیی، کانییا نزاری، کانییا ئەحمەدێ بەسویێ، کانیکا بەرکەڤرێ لیس، کانیکا مێمێ.

**چیا ونهالێن گوندی:**

چیایێ گرحەمری، چالا مەزن.

شکەفتێن گوندی: شکەفتا قەرامی، شکەفتا کون ریڤی، شکەفتا گوندی، شکەفتا جەمی قەرو، شکەفتا خرابەی، شکەفتا چالا، شکەفتا خالیك، شکەفتا بانیا غولدیا.

سالا (١٩٧٧)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن.

## گوندێ بەرزیرکێ:

سالا (١٩٢٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ وی پێکهاتییە ژ دو پەیڤان (بەر+ زیرك) ژ بەر کو جهەکێ تێر بەر و سیر، ئانکو ژ بەری سیر بوویە بەرزیرك.

رووبەرێ گشتی یێ گوندی ٣٤٨١ دۆنەمن، یێ دێمێ کو دهێتە چاندن ٨٩٢ دۆنەم، دێمی کو نەهێتە چاندن ٢٥٨٩ دۆنەم، بیستان ژی ٢٥ دۆنەم.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ بیغەبارێ.

**باشووری:** رووبارێ خابویری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بلدیشا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هەركوندە.

### پێكهاتا گوندی:

ژ لایێ جڤاكی ڤە گوند بابكەكێ عەشیرەتا كۆچەرانە ب ناڤێ (صیدا)، و ژ چوار بنەمالان: بنەمالا حەجی عوسمان، بنەمالا حەجی خەلیل، بنەمالا نەجیم، بنەمالاجەمی پێكدهێت. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٨ كەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند سالا (١٩٨٨)ێ كەتیە بەر هەوا ئەنفالێن رەش.

### ژ شوینوارێن كەڤن ل گوندی

جهەكێ ل گوندی هەی دبێژنی (خرابێ گوندی) كو شوینوار لێ هەنە، هەروەسا جهەكێ دی كو وەكو دیار سەردەمەكی هندەك عەرەب لێ ژیانە و هەتا نها ژی ب ناڤێ (خواكا عەرەبان) دهێتەنیاسین شوینوار لێ هەنە، ژبلی كو چوار مەزارگەهـ ژی ب ناڤێن: مەزارگەهێ ژن مریا، مەزارگەهێ خواكا عەرەبایێ سەری، مەزارگەهێ خواكا عەرەبایێ لایێ بنی، مەزارگەهێ گوندی یێ مەزن لێ هەنە.

ژ گر و نهالێن گوندی ژی: گرێ بەرزیركێ، گرێ ئێزدین، گرێ سیڤ، گرێ وارا. نهالا لەفەنوكێ، نهالا توخیبی، نهالا گوندی.

ژ شكەفتان ژی: شكەفتا سالو فارسا، خرابەی، شكەفتالە فەنوكێ، شكەفتا هشارا فەتو.

ڤی گوندی تنێ لایەكێ وی رووی و لایەكێ دی خابویرە.

ژیارا گوندی ب شێوەكی گشتی ل سەر خودانكرنا پەزی و بزنی و شینكرنا بیستانان و چاندنا و دخل و دانی بوو.

خواندنگەهـ ل ڤی گوندی سالا (١٩٧٢)ێ هاتیەڤەكرن.

## گوندێ هەرگوند:

گوند دكەڤیتە دناڤبەرا هەرسێ عەشیرەتێن دۆسكی و گولی و سندیان، سالێن بیستاندا ژ سەدسالیا چوویی هاتیەئاڤاكرن، سالا (١٩٥١)ێ ژ لایێ كۆچەرێن (صەیدا)ڤە هاتیەكرین، پشتی چەندین جارا هاتیە خرابكرن دیسان هاتییەڤەئاڤاكرن. ناڤێ گوندی وەكی دانعەمرێن وان دبێژن ژ وێ چەندێ هاتییە كو ئەڤە جهەكێ كەڤنارە و (هەر گوند بوویە)، لەوما بوویە (هەر گوند)، و دەمێ كۆچەر هاتینێ كەس تێدا نەبوو و ناڤێ وی كرنە (هەر گوند)، رووبەرێ گوندی ژی ب ڤی رەنگی یە:

گشتێ ١٤٣٩ دۆنەم، دێمی كو بێتە چاندن ٣١٩ دۆنەم، دیمێ كو نەهێتە چاندن ١١٢٠ دۆنەم، بیستان ١٠٠ دۆنەم، ئاڤی ژی ١١٩دۆنەم.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندی بیغەبارێ.

**باشووری:** گوندێ بالەكا.

**رۆژهەلاتی:** گوندی هەركوندێ بەرزیرك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ كەریتێ.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ دو بابكا، مالا حەمویێ لەشكەر، مالا جهوەری پێكهاتییە، دبنە چەندین خێزان. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٦ كەس ل ڤی گوندی دژیان. ئەڤ گوندە سالێن (١٩٧٥ و ١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابكرن.

### شوینوارێن گوندی:

وەك ئاشەكی و دو مەزاران ب ناڤێن مەزارێ گوندی و ئەو مەزارێ دكەڤیتە د ناڤبەرا گوندێ بەرزیركی و هەركوندێ، دیسان چەند شكەفت ژی هەنە ل دەمێ شۆرشێ جهێ ڤەحەواندنا خەلكێ گوندا و پێشمەرگەی بوو، وەكی: شكەفتا شەعبان، شكەفتا كاڤا، شكەفتا حەموی، شكەفتا عەبدلا. هەروەسا گر و نهال ژی هەنە، وەكی: گر گرێ، گركێ سۆر، گربەخشو، گرێ كوزا، نهالا شكەفت كاڤانێ، نهالا ناڤ قاچا، نهالا دلوپكێ.

خەلكێ گوندی مفا ژ رووبارێ خابویری بۆ كاروبارێن ژیانێ دبینن.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ وی ب شێوەکی گشتی ل سەر چاندنا دەخل و دانی و خودانکرنا پەزی و چێکرنا بیستانان و چاندنا برنجی و چەندین دەرامەتێن دی بوو.

سالا ١٩٧٩ێ خواندنگەهەکا ژ سێ پۆلان پێکهاتی ل گوندی هاتیبەڤەکرن.

## گوندێ ئاڤکەندالا:

سالا (١٩٢٨)ێ هاتیبەئاڤاکرن، بۆ جارا دووێ سالا (١٩٩٤)ێ هاتیبەڤەئاڤاکرن. ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتیبە کو دەوروبەرێن گوندی کەندالن، رووبەرێ گوندی ب گشتی ٤٣٥٨ دۆنەمن، یێ دێمی کو بێتە چاندن ٣٧٤٤ دۆنەم.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ بۆصەلێ.

**باشووری،** گوندێ مێرگەسۆرە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خوك سندی و لێڤو.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن سەر سولاڤك و بیرسڤێ.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ب ئایین مەسیحی نە و سەر ب عەشیرەتا سندییان ڤەنە، ژ بنەمالێن: مالا جمو، مالا عەبدلا، مالا شاهین، مالا خۆشو، مالا رڤو، مالا گەکو، مالا رەندێ، مالا نیسان، مالا خنۆ، مالا شابۆ، مالا گوکە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٤٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان. ئەڤ گوندە دو جاران سالا ١٩٦٢و سالا ١٩٨٨ ژ لایێ رژێمێن عیراقێ ڤە هاتیبەخرابکرن.

ڤی گوندی دێرەك ب دێرا ماریوسف هەیە کو ل سالا (١٩٣٢)ێ هاتیبە ئاڤاکرن.

### شوینوارێن گوندی:

گەلەك کاڤلێن کەڤن لێ هەنە، ژ وانا کاڤلێ ئاشەکی سالا (١٩٥٨)ێ هاتبوو ئاڤاکرن، پشتی وی ئاشەکێ دی ب ناڤێ یابوحنا بالیوس هاتەدانان، ڤی ئاشی گەلەك خزمەتا شۆرشێ دکر، ل هەر تەنگاڤییەکێ و دووربێچکرنەکێ ئەڤ ئاشە ددانە کاری، ئەڤ ئاشە ل سالێن هەشتییان مینا هەمی گوندی هاتە ژناڤبرن. دیسان ڤی گوندی دو زیارەت ژێ لێ هەنە، ئەو ژی زیارەتێ کەڤن و زیارەتێ نوی.

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوندی دو کانی هەبوون، ئاڤا وان زۆرا کێم بوو، سالا (١٩٧٨)ێ بیرەکا ئیرتیوازی لێ هاتە کۆلان و هەتا نها ئاڤ ژبەردچیت، دیسان رووبارەك ژی ب ناڤێ (دیڤ دیڤرو) هەبوو، ئەو ژی بۆ ڤەخوارنا تەرش و کەوالی و شوینشتنان دهاتە بکارئینان.

ژ گر و دۆلێن ل گوندی هەین: گرێ سور، دولا سیخوری.

ژ شکەفتان ژی: شکەفتا توما، شکەفتا خنا گوکە.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا گوندی ب شێوەکی گشتی ل سەرچاندنا دێمی، مینا گەنم، نۆکان بوو، هەروەسان گوند ب رەزان ژی یێ ناڤدار بوو، ژبلی خودانکرنا ئاژەلی ژ پەز و بزن وچێلا. دیسان مفا ژ سرۆشتی وەردگرتن، وەکی کۆمکرنا داران کو دبرنە زاخۆ د فرۆتن و ل بەرامبەر کەل و پەلێن پێدڤی بۆ خۆ پێ دکرین.

بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٦)ێ هاتیبە ڤەکرن.

## گوندێ چەمکێ دەلا:

ئەڤ گوندە هەڤسنوورە دگەل ناحیێن باتیفا و دەرکارێ و مانگێشکێ، ل سالا (١٩٣٩)ێ هاتیبەئاڤاکرن، ناڤێ گوندی ل دووڤ گۆتنان دبێژن ژ ناسناڤێ (عیسی دەلا) دەمێ عیسێ ژ دەڤ میرێ ئامیدیێ دەرکەتی و سلبووی ل ڤی گوندی ئاکنجی بوو، رووبەرێ گشتیێ گوندی ١٧٧٨ دۆنەمن، دێمی کو بێتە چاندن ٥٣٢ دۆنەم، دیمێ نەهێتە چاندن ١٢٦٥ دۆنەم، بیستان ٢٠ دۆنەم، ئاڤی ٣٠ دۆنەم.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ سەرکویە.

**باشووری:** رووبارێ خابویرێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پیرەکانە.

**رۆژئاڤایی:** بیشلکیە.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە د بنەرەت دا بابکەکێ سندییانن ب ناڤێ (صوفی)، تنێ ئێك بنەمالن، ئەو ژی مالا پلنکێ یە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان.

گوند ل سالا (١٩٦٩)ێ ژلایی حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابکرن. سالا (١٩٧٨)ێ ژ بەر فرۆکێن عیراقێ هاتییە چۆلکرن، داوی جار ژی کەتیە بەر هەوا ئەنفالان.

ڤی گوندی گەلەك شوینوارێن کەڤن هەبوون، وەکی دیوار و ناوسك وچالێن مەزن، بەلێ سالا (١٩٩٢)ێ دەمێ جووا ئاڤێ هاتییە چێکرن پتریا وان کەتنە بەر دەڤێ شەفەرێ و ژ ناڤچوون، نها جهێ سێ دویرگەهان، ئێك ل رۆژهەلاتی و ئێك ل رۆژئاڤایی و ئێك ل باشوورێ گوندی هەنە و ل هنداڤا گوندێ دبێژنێ (ئامێدیك). ئەڤ هەرسێ دویرگەهە دکەڤنە جهێن بلند، ژبلی مەزار وزیارەتێن گوندی کو پێکدهێن ژ:

١- مەزارێ کەڤن

٢- مەزارێ نوی.

هەر دیسان سرۆشتێ ڤی گوندی چەندین نهال و چال و جهێن بەرنیاس هەنە، وەکی:

نهالا گوندێ، نهالا پشکا شکەفتێ، چالا شکەفتێ، چالا بەرئاڤێ، چالا دارمازی، چالا ئاڤێ، چالا هیژیروکی، چالا باسکێ، فەق، چالا بەنوکێ. گری نەوروزی، گری خازوی، گری چلکی، گری خێریزی، هەفشی چونك، هەفشی شێخا، وارکەلو، تیێ

دیرگەهـ چەمکێ دەلا



شیناك، تیێ شكەفتی، نزاروكی، نزاری قاچ كوند ئیكێ- كونبرسیك- كوركا- بەرزیرێ- كون سیخو- چەمێ گوندی- گەرا گوندی- گەرا نعامێ – گەرا كەهینكێ - گەرا شتكوی- گەرا حیتا – گەرا زوراڤا – هشكە میرێ- بانا كورەمارێ. ژبلی شكەفتا چەمكێ كو گەلەكا مەزنە.

## زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ب رەنگەكێ گشتی ل سەر جۆتیاری و چاندنا درامەتێ ئاڤی و دێمی و شینكرنا بیستانان و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، و مفا ژ ئاڤا خابووری دهاتە وەرگرتن، هەر وەسان كانییەك ژی ل ناڤ ئاقارێ گوندی ب ناڤێ كانییا گرێ خازوی هەبوو.

سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەڤەكرن.

## گوندێ مێرگەسۆر:

گوند سالا (١٩٢٣)ێ ل سەر دەستێ نیانك ئوشانە داود هاتییە ئاڤاكرن. رووبەرێ گوندی ب ڤی رەنگی یە: گشتی ١٩٨٠ دۆنەمن، دێمی بێتە چاندن ١٠٢٦ دۆنەم، دێمی نەهێتە چاندن ٩٥٤دۆنەم، بیستان ٤ دۆنەم.

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ ناڤكەندلا.

**باشووری:** گوندێ توكا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن گربە خشو، زێوك سندی.

**رۆژئاڤایی:** ترك سمو.

## پێكهاتا گوندی:

گوندی د بنەرەتدا (مەرگەهی نە) سەر ب عەشیرەتا سندییاڤەنە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٨٦ كەس ل ڤی گوندی دژیان. ئەڤ گوندە ل سالێن (١٩٧٥، ١٩٨٦، ١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ رژێمێن عیراقێ ڤە هاتییەخراپكرن.

ژ شوینوارێن كەڤن ل گوندی كاڤلێن خانیێن كەڤن و زیارەتێ كەڤن یێ گوندێ و دێرا مار ئەوراها كو ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتییە خرابكرن.

## شكەفتێن گوندی:

شكەفتە زنجی، شكەفتە پایلە، شكەفتە لودە، شكەفتە دنخا نیو.

## ژ كانییان ژی:

كانییا كەڤن یا گوندی، كانییا ماشكە، كانییا پایلە، كانییا زنجی.

## زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل سەر جۆتیاریێ و چاندنا دەرامەتێ ئاڤی و دێم و شینكرنا بیستانان بوو، ژبلی خوداكرنا تەرش و كەوالی.

بۆ جارا ئێكێ سالا (١٩٧٨)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن.

## گوندێ بەركەڤر بەلەك:

سالا (١٨٢٠)ێ پشتی عەشیرەتا بلكیا ئەو گوندە هێلاین گوندێ بەر كەڤرێ ب دەستێ عەبدالێ قروی و مرۆڤێن وی هاتییە ئاڤاكرن. ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو گوند ل بەركەڤری هاتییە ئاڤاكرن.

رووبەرێ گوندی: گشتی ٣٧٠٣٥ دۆنەمن، دێمی كو بێتە چاندن ١٦٣٩ دۆنەم، دێمی كو نەهێتە چاندن١٤٥٠ دۆنەم، بیستان ٨٥دۆنەم، كەڤركاش ١٤٠٩دۆنەم، دارستان ٢٠٠ دۆنەم. سنوورێن گوندی ژی پێكدهێت ژ گوندێن، تویكا و باگولاتكی و خرخەپكا و پیركان.

## پێكهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە دبنەرتدا ژ گوندێ (شیڤ ئەرمنی نە) سەرب عەشیرەتا سندییاڤەنە و ژ سێ بنەمالان پێكدهێت: بنەمالا عەبدالێ قروی، بنەمالا حەجی بشارێ، بنەمالا سەیدوی.

سالێن (١٩٧٧-١٩٨٨)ێ بەرکەڤرێ هاتییەخرابکرن.

ڤی گوندی زیارەتەك لێ هەیە ب ناڤێ مەلا حاجیێ ریکانی. هەر وەسان زۆزانەك ژی ب ناڤێ (سەرکێ رەشینێ) ل سەر سنوورێ ترکیا هەیە.

ژ نهال و شکەفت و سیمایێن دیار ژی ل گوندی نهالا گوندی، نهالا مەلا حاجیێ، کەڤرێن کەهنی درکا، کورا دەرزێ، شکەفتا گوندی و شکەفتا حەجی جێریێ.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ل سەر جۆتیاریێ و چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی و شینکرنا بیستانان، ژبلی خودانکرنا تەرش و کەوالی ژ پەزی و چێل و بزنان.

سالا خواندنێ ١٩٧٩- ١٩٨٠خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ لێڤو:

گوند سالا (١٩٢٨)ێ هاتییەئاڤاکرن، گوندێ دوپارچەیە و ئاڤاکرن ژ بەر لێڤ هاتییە و بوویە لێڤو، و ناڤبەرا دەرباز دبوو یان بەرلێڤیت ئاڤێ گوندی.

رووبەرێ گوندی: ب گشتی ٤٩٧٩ دۆنەمن، دیمێ کو بێتە چاندن ٥٢٣ دۆنەم، دێمی کو نەهێتە چاندن ١٤١٠ دۆنەم، بیستان ٢٠دۆنەم، ئاڤی ٣٠ دۆنەم.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ئاڤکەنی.

**باشووری:** گوندێ باکولاتکە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کریت.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ناڤکەندالا.

خەلکێ گوندی دبنەرەتدا (مەرگەهی) نە سەرب عشیرەتا سندییاڤەنە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦١٦ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند ل سالێن (١٩٧٦ و ١٩٨٨)ێ ژ ئالیێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابکرن.

گوندی چەند کانی هەنە مینا: کانییا گوندێ، کانییا نیرنیکی، کانییا بەرخو، کانییا خدرالی، کانییا

**گوندێ مێرکەسۆر**



سولاقە، کانییا لازاری، کانییا نمرود، کانییا سوکوی. ژبلی چەندین سیمایێن دی، وەکی: گرێ بەخشو، سەردەشت، هوزا حلو، بانی عدیسی، دیڤ رو، نهالا دەشتی، کۆزا تیاریا، بانا کەرکێ، نیرنیکێ، دەشت روما، بانا قومی، شکەفتا رهانو، شکەفتا خایێ.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر چاندنا دەرامەتی و خوداکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا ١٩٢٨ێ دێرا گوندی هاتییەئاڤاکرن و سالا ١٩٤٠ێ ژی خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن.

# گوندێ خوك سندی:

ئەڤ گوندە ل سالا (١٨٧٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ وی ژ بەرخەفە بوو، بۆ خوك هاتییە، رووبەرێ گوندی: ب گشتی ٢٧٢١ دۆنەمن، دێمی کو بێتە چاندن ١٣٢١دۆنەم، ئاڤی ژی ٦ دۆنەمن.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ ملاعەرب.

**باشووری،** لێڤو.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گربە خشو.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ناڤکەندلا.

## پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە بابکەکێ سەر ب عەشیرەتا سندیاڤەنە (شیڤ ئەرمنی نە). ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١١٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند سالا (١٩٦٢)ێ ژ ئالیێ لەشکەرێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییەخرابکرن، پشتی هاتییەئاڤاکرن ل سالا (١٩٨٣)ێ ژ بەر فرۆکان هاتییەچۆلکرن، داوی جار سالا ١٩٨٨ێ کەتیە بەر هەوا ئەنفالان.

ژ جهێن ناڤدار و شوینوارێن ڤی گوندی ژی هندەك کاڤلێن گوندێ کانییا کەرك، زیارەتێ دارمازی، زیارەتێ گوندی، زیارەتێ کاڤلی.

## کانیێن گوندی:

کانییا بهار، کانییا برسی، کانییازیارەتی، کانییا گەربەراسکی، کانییا کەرەحێوکێ، کانییاکەرکێ.

## ژ سیمایێن گوندی:

گربەخوشو، گرێ بانیا رینی، نهالا بانیا نوکا، نهالا کەربەراسکی، دیڤ روی زیوك. نهالا دەری شکەفتێ. بانیا خوکی، گری شێران، نهالائاڤسیرك، چەمی پێری، سەرلیسا، زێرین درێژ، کولینێ شەروی، ئێخرکا، یانیا نوکا، شەکەفتا دەری، و شکەفتێ و شکەفتا خرابەی.

ژیانا گوندی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر چاندنێ و خوداکرنا تەرش و کەوالی بوو.

ل سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن.

# گوندێ ئاڤگەنی (ئاڤ گەهنی):

ئەڤ گوندە سالا (١٨٧٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ وی ژ پەیڤا ئاڤ کانی هاتییە و بوویە ئاڤ گەهنی وا تە ئاڤ کەهنی.

## رووبەرێ گوندی:

گشتی ١٦١٥ دۆنەمن، دێمی کو بێتە چاندن ١٠٠٠ دۆنەم، دێمی کو نەهێتە چاندن ٢٩٨دۆنەم، بیستان ٩دۆنەم، کەڤرو کاش ٢٩٨ دۆنەم، دارستان ١٠ دۆنەم.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ گێری سەرەی دیرێ.

**باشووری،** گوندێ ناڤکەندلا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ باتیفا.

**رۆژئاڤایی،** بێرسڤێ.

## پێکهاتا گوندی:

گوند ژ بابکێ سەر ب عەشیرەتا سندیاڤەنە (شیڤ ئەرمنی نە). ل دووڤ سەرژمێرییا سالا

(١٩٥٧)ێ ١٧٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان. ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٢٠)ێ ژلایێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن، هەروەسان ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٧٤، ١٩٨٨)ێ ژی هاتییە خرابکرن.

## ژ جهێن دیار و بەرنیاس ژی ل گوندی:

ئاشێ کەندالی، ئاشێ گری، ئاشێ جەموکێ هناری، گرێ قەسرکێ، کافل، زیارەتێ شێخ نازل، حەساسی، زیارەتێ خاتینێ.

هەر وەسان کانی ژی لێ هەنە، وەکی: کانییا گەرکەرینی، کانییا شیلمازیك، کانییا محکێ، کانییا بەر زویر بە تالوك، کانییا میرگا عیسی، کانییا بەرەباکێ، کانییا گرێ سلوی. ژبلی چەندین جهێن دی وەکی: نزار تاوکی، گرێ سلوی، نهالا کانییامحکێ، نهالا شلیمازیکی، نهالا ئاڤ سیرك، ملا باهیڤوکێ، نهالا شیڤ پیشی، گرێ سیاروکی، نهالا باهڤوکێ، گرێ سێڤوی، گرێ گوزی.

ژیارا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ گشتی سەر جۆتیاریێ و چاندنێ و خوداکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا ١٩٥٠ێ مزگەفتا گوندی هاتییەئاڤاکرن، سالا ١٩٦٢ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ منین:

گوند سالا (١٩٤٤)ێ هاتییەئاڤاکرن، ناڤێ گوندی ژ هەردو پەیڤێن (من و ین) پێکهاتییە، ئانکو نە ئەز بووم یان نە منی بوم و بوو (منین). هەروەسا (من) بەرەکێ خر بوو، بۆ کێشانا دەرامەتان دهاتە بکارئینان و بوویە (منین). رووبەرێ گوندی ب گشتی ٣٢٨٥ دۆنەمن، دێمی نەهێتە چاندن ٣١٢٤دۆنەم، ئاڤی ١١١دۆنەم.

سنوورێن جوگرافی یێن گوندی ژی پێکهاتینە ژ گوندێن کەشان، بانك، ئەڤلهێ، سیارا ستورێ، گەلێ پێساغا.

گوندێ ئاڤکەنی



**پێکهاتا گوندی:**

بنەمالێن ڤی گوندی ژی (مالا عەجەمێ)نە کو بابەکێ سەرب عەشیرەتا سندییاڤەنە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٢ کەس ل ڤی گوندی دژیان. گوند ئێکجاری ل سالا (١٩٧٦)ێ هاتییە کۆچبەرکرن و خرابکرن.

**شوینوارێن گوندی:**

دویرهوك، خەزینوکی، ئاشێ کەڤن، چەلێ سیارێ، سەلرکی، بەرگەفری، چەلی عەلیا، چەلکی ابراهیم بەگێ، ڤاقوسا، نهالا مدلسێ، ژبلی زیارەتێن گوندی منینی و زیارەتی ئاستەنگێ.

**ژێدەرێ ئاڤا گوندی:**

رووبارێ گوندی پێکدهێت ژ دو کانیێن سەرەکی ب ناڤێن کانییا سماقا کو دبێژنێ کانییا لولەب و کانییا دارێ، ژبلی هندە کانیێن بچویك.

گوندی چەندین جهێن دی یێن دیار و بەرنیاس ژ گەلی و نهال و شکەفت و ...هەنە، وەکی: گەلیێ حاجی، گەلیێ مێوی، خالومە، نهالا مدلسی، ناڤرویێ، ملا ماهتا، کەفرا کورکی، گوخێ رەش، ملا کیزێ، ملکا گەلها، میلا خواری، ملا خەمرایێ، شکەفتا قلایێ، شکەفتاکوخێ هەلیز، شکەفتا سەرکی، شکەفتا خالومەیێ، شکەفتا بازی.

هەروەسان ل ئاڤارێن گوندی گیاندارێن کیڤی وەك: پەز کویڤی، پۆر، کەو، هرچ، کێرویشك، گورك، بەراز، ریڤی هەنە. ژبلی جۆرێن گژ و گیا وەك: گول نخوین، نێرگز، کەلهە، چاترك، قەسەل مەحمود، قوچە بەهدر، کڤارك، تەحلێ تۆز، گەزگەزینك، پوینك، پیز، بیژان، سترك، کرەنك و ...هتد، ژبلی جۆرێن داروبارێ سرۆشتی.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

چاندنا دەرامەتێ دێم و ئاڤی بوو، وەك داروبارێ فێقی و برنج و ماش و دەخل و دان و ...هتد ژێدەرێن سەرەکیێن ژیارا خەلکێ گوندی بوون. دیسان خەلکێ گوندی تەرش و کەوال ژی ب خوداندکرن.

ڤی گوندی ل سالا (١٩٧٤)ێ مزگەفتەك لێ هاتییە ڤەکرن.

**گوندێ زێوك سندی:**

ئەڤ گوندە سالا (١٩١٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن. رووبەرێ وی یێ گشتی ١٨٧٩ دۆنەمن، دێمی بێتە چاندن ١١٧٣ دۆنەم، دێمی کو نەهێتە چاندن ٧٠٦دۆنەم.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ ناڤکەندلا.

**باشووری:** لێڤو.

**رۆژهەلاتی:** گوندی باگولاتکێ.

**رۆژئاڤایی:** مێرگەسۆرێ.

**پێکهاتا گوندی:**

ژ لایێ جڤاکی ڤە گوند بابکەکێ عەشیرەتا سندییانن ب ناڤێ (شیڤ ئەرمنی نە). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان. ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٦٢)ێ ژلایی حکومەتا عیراقی ڤە هاتییەخرابکرن، سالا (١٩٨٦)ێ ژ بەر فرۆکێن حکومەتا عیراقێ هاتییە چۆلکرن و داوی جار ل ئەنفالان هاتە وێرانکرن.

ڤی گوندی هەردو زیارەتێن سێکێ سەید و زیارەتێ خاتێ و کانییا برکێ، کانییا بروی، کانییا سرکێ لێ هەنە. هەر وەسان چەند سیمایێن دی لێ هەنە، وەکی نهالا باب وسانا، نهالا بامۆسانا، خراب رەش، خراب ستینا، گرێ سور، سیلاڤا تەیرکا، قونتار گوزێ، گەرا لەڤدا بهوکێ. ژبلی شکەفتا حەلانیت کایێ.

ژیارا گوندی ب شێوەکی گشتی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا (١٩٧٦)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن.

**گوندێ باگولاتکێ:**

دهێتەگۆتن گوند سالا (١٨٧٢)ێ هاتییە ئاڤاکرن. ناڤێ وی ژ هەردو پەیڤێن (باك + ولات) پێکدهێت و

پیتا کاف بۆ بچویککرنێ ل کارە، واتە رامانا وی دبیتە باك، ژ با هاتییە، واتە باغێ وەلاتی وەلات ژی بەحسێ وێ دەڤەرێ یە چونکی ئاڤ و هەوا و سرۆشتێ ڤی گوندی ژ هەمی گوندێن دەڤەرێ خۆشترە و بوویە (باگولاتك).

## روویەرێ گوندی:

ب گشتی ٢٦٧٥ دۆنەمن، دێمی ١٦٣٦ دۆنەم، بیستان ٥٠ دۆنەم، ئاڤی ١٠٠دۆنەم، کەڤروکاش ژی ٣٥٠ دۆنەم.

## سنوورێن گوندی:

گوند هەڤسنوورە دگەل گوندێن (لێڤو، تویکا، زیوك سندی، مێرگەسۆر، بەرکەفری، خرخەپکان، سپنداروکێ).

## پێکهاتا گوندی:

گوند بابکەکێ سەر ب عەشیرەتا سندییانن ب ناڤێ (شیڤ ئەرمنی نە). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٥٦ کەس ل ڤی گوندی دژیان. ئەڤ گوندە ژ ئەگەرێ شۆرشێن کوردی گەلەك جاران هاتییەچۆلکرن و بۆ ماوەیەکێ کێم جارەکادی زڤرینەڤە سەر گوندی، تا کو داوی جار ل ئەنفالان وێران بووی.

گەلەك سیمایێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی شکەفتا بەلەتیا، شکەفتەکا ب ناڤ ودنگە و پەناگەها پێشمەرگەی وخەلکێ گوندی بوو. هەر وەسان زیارەتێ بەلەتییا، زیارەتێ گەریکێ، زیارەتێ بیرڤروینی، زیارەتێ وارکوزکا، زیارەتێ سێهلکا. کانییا مێرکێ، ژێلی کۆمەکا زیران، وەکی: زیر گەرماڤ، دووگورك، کەپکێ ڤرێ، زیرێ خرا، زیرێت بەلەتیا، زیرێ بریسکێ، هەسیا لێڤو، سیارا لێڤو، سیارا زێوکێ، سیارا مێرگەسۆر.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

جۆتیاری و خوداکرنا تەرش و کەوالی.

بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ سالا (١٩٧٦)ێ لێ هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ سپینداروك:

وەکی دهێتە گۆتن ئەڤ گوندە سالا (١٧٦٥)ێ ل سەر دەستێ(عبدلایێ محێ) ئاڤابوویە، ناڤێ گوندێ کەڤن یێ هاتی کو ل بەرێ گەلەك دار سپیندار لێ دهاتنە چاندن، و سپیندارێن وان گەلەك باش بوون، ژ سپیندار بوویە سپینداروك.

## روویەرێ گوندی:

ب گشتی ١٩٨٠ دۆنەمن، دێمێ کو بێتە چاندن ٤٢٤ دۆنەم، ئاڤی ١٠٠ دۆنەم.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ لێڤو.

**باشووری:** رووبارێ خابویری.

**رۆژهەلاتی:** گوندی کەرێت.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خرخەپکا.

## پێکهاتا گوندی:

گوند بابکەکێ سەر ب عەشیرەتا سندییاڤەنە (شیڤ ئەرمنی نە)، نیزیکی (٢٠) خیزانانن مرۆڤێن ئێکن. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان.

سەردەمێ شۆرشا ئەیلوولێ فرۆکەیێن حکومەتا عیراقێ دو جاران بەرمیلێن (فوسفوری) هاڤێتینە سەر ڤی گوندی و مالێن وان هاتنە سۆتن و گەلەك زیانێن گیانی گەهاندینە وان و داوی جار ل ئەنفالان ئەڤ گوندە هاتە وێرانکرن.

## ژ سێماییێن دیار ل گوندی:

مەزارێ گوندێ، کانییا بەر ریکێ، کانییا کاریزە، خابویر، نهالا سپینداروکێ و ئاغلە باڤێ، نهالا کەڤر و کاش و دارستانن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ب گشتی چاندنا دەرامەتی و خوداکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا (١٩٧١)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەاکرن.

## گوندێ مێسك:

وەکی دانعەمر دبێژن سالا ١٩١٤ێ (یوسف مەروان)ی ئەڤ گوندە ئاڤاکرییە، رامانا ناڤێ گوندی یێ ژ مێرك هاتی، ژ بەر کو لایەکێ وی خابوور دبوورت و لایێ دی رووبار.

### روبەرێ گوندی:

ب گشتی ١٢٤٢ دۆنەمن، دێمی کو بێتە چاندن ٦٧٣ دۆنەم، ئاڤی ١٧٣ دۆنەم، دێمی کو نەهێتە چاندن ٥٦٩ دۆنەم.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ بانێ.

**باشووری،** رووبارێ خابویری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ غولدیا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گوفکا صەیدا.

### پێکهاتا گوندی:

پێکهاتا جڤاکیا گوندی ژی بابکەکێ عەشیرەتا کۆچەرانە ب ناڤێ (صەیدا).

ژ شوینوارێن ڤی گوندی ژی کاڤلێن گوندی بەرێ و زیارەتێ مێسکێ.

### سیمایێن دیار ل گوندی:

چیایێ خلەیێ، نهالا خلەیێ، گرێ کەلەشێ، گرێ حەجی ئەحمدێ، شکەفتا یوسف مروانێ، رووبارێ کەشانێ، خابویر، کو هەردو دبەررا دبوورن، کانییا گرزەرکێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر جۆتیاری و چاندنا دەرامەتی و خوداکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا (١٩٧٩)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن.

## گوندێ بلدیشا:

گوند سالا (١٨٦٠)ێ هاتییەئاڤاکرن، روبەرێ گوندی ب گشتی ٢٨٩٢ دۆنەمە، دێمی کو بێتە چاندن ٧١٧ دۆنەم، ئاڤی ١٣٠ دۆنەم.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ باتیفا.

**باشووری،** رووبارێ خابویری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گۆفك.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بەرزیرك.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە بابکەکە ژ عەشیرەتا کۆچەران ب ناڤێ (صەیدا). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان.

گوند ژ بەر دەستدرێژیێن حکومەتا عیراقێ هاتییەخرابکرن و سالا (١٩٧٦)ێ هاتییەچۆلکرن، داوی جار ل ئەنفالان هاتییە وێرانکرن.

ژ شوینوارێن کەڤن ل ڤی گوندی خرابە کاڤلێن گوندێ بەرێ، زیارەتێ سەید ئەحمەد، زیارەتێ سەید محەمەد، زیارەتێ شیخ شاهو، زیارەتێ خلوەکێ.

### کانی و رووبارێن گوندی:

خابوور، کانییا سەید ئەحمەد، کانییا حەجی خالد، کانییا نزارك.

ژ چیا ونهال ودۆلێن گوندی: نهالا خلوکێ، نهالا بەرگێری، نهالا جینکێ، نهالا کورامێکویك، گرێ جوت، گرێ بانیا دەلێ، گرکێ صا، گرێ کێرویشکێ، گرێ باسکا علی ئاڤا، ناڤ گرا، واری یوسف، جەمێ

چالا، جەمێ رزیان، جەمێ زراڤك، جەمی علی، چالا شەکروك، چەمێ تویا، گرێ تی ڤالکێ، بانیا عەتارکا.
ژ شکەفتان: شکەفتا قەرەچا، شکەفتا خلوەکێ، شکەفتا سورانەی، شکەفتا بانا کێرویشکێ، شکەفتا کونا سیخوری.
ژ دەراڤێن گوندی ل خابوور و گەرێن گوندی: دەراڤێ شاە، دەراڤێ گەری، کەڤرێ کەلەکێ، گەرا حویتا، گەرا زڤرکێ، گەرا چەمی تویا، گەرا کەڤرێ کەلەکێ.
ژیارا گوندی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر جۆتیاریێ و خوداکرنا تەرش و کەوالی بوو.
سالا ١٩٧٩- ١٩٨٠ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ تویکا:

گوند سالا (١٩٠٠)ێ ل سەر دەستێ موڕادێ کورێ عەرەبی هاتییەئاڤاکرن. ناڤێ گوندی یێ ژ هەبوونا گەلەك دارێن تویا هاتی و پاشی بوویە تویکا.
رووبەرێ عەردێ: گوندی ب گشتی ٣٨٨٥ دۆنەمن، دێمی ٢٢٨٥ دۆنەم، ئاڤی ٨٥ دۆنەم، بیستان ١٥ دۆنەم، کەفروکاش ١٤٥٠ دۆنەم، دارستان ٥٠دۆنەم.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ خرخەبکان.

**باشووری:** مێرگە سۆرا.

**رۆژهەلاتی:** گوندی باگولاتکی.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ پیرەکان.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە بابکەکن سەر ب عەشیرەتا سندیاڤەنە(شیڤ ئەرمنی نە). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان.
گوند ل ئەنفالان هاتییە وێران کرن.

### ژ سیمایێن گوندی:

شکەفتا زێدا ڤایێ، گرێ سێ تا، شکەفتا گوندی، شکەفتا ئاڤا پەلك. زیارەتێ گوندێ کەڤن، زیارەتێ بچیکان هاتییە ناڤکرن، زیارەتێ شەهیدان، زیارەتێ مەلا حاجی، نهالا رەزا، چالا کەناری، گرێ شینۆك، زیدا ڤایێ، خرابێ ناڤ جەهدی، هەفشێ گرهالا، دو گورگا، نهالا مەلا حاجی، ملا وارا، بانی کورەماری، بەرزیرا جوهی، نهالا کونا گورگی. ژبلی دو کانییان ل گوندی، ئێك ل رۆژهەلاتی و یا دووێ ل رۆژئاڤایی و دگەل خابیری دکەڤیتە باکوورێ گوندی و دگەل هندەك کانیێن بچویك ب ناڤێن کانییا چلاکوناری، کانییا بنێ گوندی و کانییا شورێ.
ژیارا خەلکێ گوندی ب شێوەیەکێ گشتی سەر جۆتیاریێ و خوداکرنا تەرش و کەوالی بوو.
خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٧)ێ ل گوندی هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ پیربلا:

دەوروبەرێ سالا (١٨٦٠)ێ ژ ئالیێ دو کەسانڤە ب ناڤێن بتال حەمید مامك، وەیسی عومەر هاتییەئاڤاکرن. ناڤێ گوندی ژ پیرێ بابل هاتییە کو ئەو ژی کەڤنە صۆفیە ل باکوورێ کوردستانێ هاتییە و مرۆڤەکێ دیندار بوو.
رووبەرێ گوندی: عەردێ ب گشتێ ٢٥١٠دۆنەمن، نەهێتە چاندن ٢٢٨٠دۆنەم، ئاڤی ١٣٠دۆنەم. گوند هەڤسنووره دگەل گوندێن شەرانشێ، بوصەلێ، ئەڤلهێ، بازنگیرا و کوندوك.

### پێکهاتا گوندی:

گوند بابەکێ عەشیرەتا سندیانە ب ناڤێ (صوفێ) و ژ هەردو بنەمالێن ئۆسێ و وەیسی پێکدهێت. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٦٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان.
ڤی گوندی زیارەت ب ناڤێن زیارەتێ عەجەمیا و زیارەتێ دینکێ و زیارەتێ پشت خانی لێ هەنە. هەر وەسان چیا و نهال و دۆل و مل و شکەفت و کانی ژی لێ هەنە وەك:
چیا لاتا زهنار، چیا شەشدارێ، چیا کوخێ عەمیا،

نهالا لاتازهنار، نهالاکانی بهارا، نهالا لاتا مێشا، نهالا گورانسبا، دۆلا کاڤروکێ، دۆلا مەمولا، دۆلا مێشا، ملا بەڤر.

ژ شکەفتان ژی: گەلۆکا تاوێ، گەلوکا بەتێ لاتا زهنار، مەندسك، جرگەه، هەڤشۆك، سەرشکەفتێ نهی.

کانی و رووبارێن گوندی: کانیا خارێ تەحلە، کانیا کاڤرۆك، کانیا ملاجنینێ، کانیا هەڤشوك، و هەمی کانی کۆم دبن و دبنە رووبارێ گوندی.

ژیارا گوندی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر جۆتیاریێ و خوداکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا (١٩٤٥)ێ مزگەفت ل گوندی هاتییەئاڤاکرن.

## گوندێ ئەڤلەهێ:

گوندەکێ کەڤنارە و مێژوویا ئاڤاکرنا وی ڤەدگەریێتەڤە چاخێ ئەمەوییان. ناڤێ گوندی یێ ژ (ئەڤ- ئاڤ) و (لەهـ- لەهی)، ئانکو یا ژ لەهییا ئاڤێ هاتی و بوویە (ئەڤلەهێ).

رووبەرێ گشتی یێ گوندی ٥١٧٠ دۆنەمن، ئاڤێ ٣٣٠ دۆنەم.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ شێڤا.

**باشووری:** گوندێن باندروو و بوصەلێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن منین، بانك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن پیربلا، بازنگیرا.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی بابکەکێ عەشیرەتا سندیانە ب ناڤێ (ئەڤلهێ)، ژ بنەمالێن: بنەمالا عەباس و بنەمالا مەلای و بنەمالا کمالا پێکدهێت. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان.

ژ دەسپێکرنا ئاڤاکرنا گوندی و هەتا نها پتر ژ (٦-٧) جاران ژلایی رژێمێن عیراقی ڤە هاتییەخرابکرن، گوند کەتیە بەر هەوا خرابکرنا گوندان ل سالا (١٩٧٦)ێ. داوی جار ژی کەتیە بەر هەوا ئەنفالان، پشتی سەرهلدانێ کو گوند ئاڤا بوویەڤە، جارەکادی ژ بەر کاودانێ ناڤخوو و فرۆکێن ترکیا گوند هاتەچۆلکرن.

### شوینوارێن ڤی گوندی:

نهالا زیارەتێ، جویا فقەها، کەلا ئەڤلهێ، دارکا کوشتیا.

### مەزار و زیارەتان:

زیارەتێ گوندی، زیارەتێ فقە یوسف، زیارەتین کەهنی گەرمکێ، زیارەتێ دیمکێ، زیارەتێ فقە احمد، زیارەتێ نهالا زیارەتێ.

### کانی و رووبارێن گوندی:

کانیا سەرێ بەستێ، کانیا واری بابیری، کانیا تیا بەربەری، کانیا بەرێ باندهیا، کانیا سەری ڤەرشێ، کانیا گەرم کێ، کانیا چەمێ علی، کانیا سەری سیلاڤێ، کانیا روما سنێ، کانیا میرگانی، روبارێ سەری بەستێ، و رووبارێ سەرێ سیلاڤێ و رووبارێ روما سنێ.

### ژ چیا و نهال ودۆلان ژی:

نزار، چەلکێ، ناڤ باهیڤا، چەلێ هەسپا، مە شخوین، برویسکێ، پێ کورکێ، گرێ کرەنك زەر، گەرا ئەڤلهێ، چەلێ بلبل، دەروکێ بازێ، دەروکێ سێ دەری، قونتارا زەڤیێ، ویبکا ڤیی، بەروژێ سهێلا، گرێ ئاشتی، سلیبیك، نهالا سهێلا، نهالا گەڤیێ، نهالا بیێ، نهالا گوهور، نهالا زیارەتی، نهالا کیشێ، نهالاسلڤیکێ، نهالا گیزێ، نهالا بەستا حاجێ میشیل، نهالابەستا کا چیکا میمێ، نهالا مام خورشید.

ژ شکەفتان: روماسنێ، ئالومەدگا، ملا سار، لاتا ستین، کەڤێ، سێ دەر، ولیسێ تەیری.

ژیارا گوندی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر جۆتیاریێ و خوداکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا ١٩٧٢- ١٩٧٣ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن.

## گوندێ باندرۆیێ:

(حامد خەلیفە و برایێ وی سەعدو خەلیفە)ی سالا (١٨٥٠)ێ گوند ئاڤاکرییە. ناڤێ گوندی ژ (بان+ درو) پێکهاتییە، بان، واتە جهێ گوندی بانی یە و (درو)، ب واتایا دو رێك دچنێ، یا ئێکێ دچیتە شەرانش و یا دووێ ژی دچیتە گوندێن ئەڤلهێ و پیربلا.

رووبەرێ گوندی ب گشتی ١٨٢٠ دۆنەمن، دێمی کو نەهێتە چاندن ١٣٣٦ دۆنەم، دێمی کو بێتە چاندن ٨٤ دۆنەم، ئاڤێ ٨٤دۆنەم.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** باکوورێ کوردستان، مێزان.

**باشووری:** چیایێ کێرە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن منین، بانك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شەرانش.

### پێکهاتا گوندی:

گوند بابکەکێ عەشیرەتا سندییانە ب ناڤێ مالا عەجەمێ، دبێژنێ بنەمالا (خەلیفە)ی. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان.

گوند ل سالا (١٨٦٧) ژ لایێ ئوسمانیان ڤە هاتییە خرابکرن، و جارەکادی ل سالا (١٩٧٦)ێ ژ لایی حکومەتا عیراقی ڤە هاتییەخرابکرن.

ژ کانی و رووبارێن گوندی: کانییا خارکێ، کانییا زەلامان، کانییا ئاڤا گیزی، رووبێ ئەڤلهێ و پیربیلا.

ژ چیایێن گوندی ژی ژ لایێ باکووری: چیایێ مەشخینا، چیای سێهلایە، چیایێ کێرە.

ژ شکەفتان: شکەفتا قاقوس و شکەفتا سۆر.

### زێدەرێن ژیارا گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی ژی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

## گوندێ بانکێ سەری:

گوند ل سالا (١٩٢٣)ێ ل سەر دەستێ (ئاغوی) هاتییەئاڤاکرن. ناڤێ گوندی ژ (بان) هاتییە و پاشی بوویە (بانك).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ منینی.

**باشووری:** گوندێ ئەڤلهێ.

**رۆژهەلاتی:** سوارا ستەوری.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بانکا بنی.

### پێکهاتا گوندی:

گوند بابکەکێ عەشیرەتا سندییانە ب ناڤێ (مالا عەجەمێ) و هەردو بنەمالێن بنەمالا ئاغوی، و بنەمالا میرزا میرزا بخۆڤە دگریت.

گوند سالا ١٩٧٦ێ ژ ئالیێ حکومەتا عیراقی ڤە هاتییەخرابکرن، پشتی کو د سالێن هەشتێیاندا هندەك ژ خەلکێ گوندی زڤرینەڤە و گوند ئاڤاکرییەڤە ل دەمێ ئەنفالان دیسان هاتەڤەخرابکرن، گوندی بوونە دو گوند ناڤی گوندی بی شیڤامێزی دکەڤیت پشت کەشانی سالا ١٩٦١هات خرابکرن.

### سیمایێن بەرچاڤێن گوندی:

ژ کانییان: کانییا کەری، کانییا زیوی، رووبار. ژ زیارەتان ژی: زیارەتێ گوندی، زیارەتێ کەڤن. ژ شکەفتان ژی: شکەفتا کەری، شکەفتا کەرك، شکەفتا پەلا تینك. هەر وەسان نهالا کەری، نهالا رازیون، شیڤا میزێ، چیا مارکینی، ملا مامیتا، لاتکی زەنکو، سەرکێ کەرزنکێ.

ژیانا خەلکێ گوندی ژی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

## گوندێ چەم کورك (بانکا بنێ):

ئەڤ گوندە ل سالا (١٨٦٠)ێ هاتییەئاڤاکرن، دەستپێکێ گوند سێ چوار مال بوو ل جهەکی هاتبوو ئاڤاکرن د گۆتنێ (ئاشکا)، پاشی دەوروبەرێن

سالێن چلان هاتییە ڤەگوهاستن بۆ جهەکێ دی د گۆتنێ (بەرهێرا) و پشتی چەند سالەکان گوندێ نها (چەم کورك) هاتییە ئاڤاکرن و دەسپێکێ شەش مال. ناڤێ گوندێ هەتا سەردەمێ ئوسمانیان (گرێ مشێلێ) بوو، پشتی دامەزراندنا حکومەتا عێراقێ ناڤێ گوندی هاتە گوهارتن و بوو (چەم کورك)، و ناڤێ گوندی ژ چەم هاتییە.

رووبەرێ عەردێ گوندی ب گشتێ ٨٥٥ دۆنەمن، دێمی کو نەهێتە چاندن ٦٧٥ دۆنەم، دێمی کو بێتە چاندن ٢١٠ دۆنەم، ئاڤی ٨٤ دۆنەم.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری گوندی:** دگەل زۆزانێن سەرکێن سندییا.

**باشووری:** گوندێ مەلا عەرەبێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن بانکا شێخێ و بانکا سەرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باندرو، ئەڤلهێ.

گوند چوار جاران هاتییە خرابکرن، داوی جار ژی ل سالا (١٩٧٦)ێ.

## ژ شوینوارێن ڤی گوندێ:

کەلا گاڤانا و کەلا دمدموکێ.

ڤی گوندی چەندین سیمایێن دی لێ هەنە، وەکی زیارەتێ ب ناڤێ شێخ صالحی، رووبارێ بانکی، کانییا بەر هێرێ، کانییا بوزەی، کانییا تومەی، کانییا گرکێ، کانییا کاوەی، ژێلی زنچیرا چیایێ کیرەی، سهێلا، کەڤرا کورکێ، کەلها گاڤانات، کەلها شەهدزێ، نهالا دووگورگی، نهالا دێرکێ و شکەفتێن (ڤاقوسا، دمدموکی، شکەفتا سورێ، و شکەفتا گولا).

ژیارا خەلکێ گوندی ژی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

بانکێ



## گوندێ (کربت بلك):

ئەڤ گوندە ل دەوروبەرێن سالا (١٧٤٠)ێ ل سەر دەستێ (سلێمان عەلی، ئەحمەد کەلەش، محەمەد حەجی) هاتییە ئاڤاکرن. ناڤێ گوندی یێ هاتی چونکی کار ل سەر پرەکێ دهاتە کرن.

### رووبەرێ گوندی:

ب گشتێ ١٤٢٨دۆنەمن، دێمی کو نەهێتە چاندن ٦٨٩ دۆنەم، دێمێ کو بێتە چاندن ٩٤٠ دۆنەم، ئاڤی ژی ٤٠دۆنەم.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ لێڤو.

**باشووری،** رووبارێ خابویری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هەرکوندی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ کربت عەبوش.

### پێکهاتا گوندی:

ژ لایێ جڤاکیڤە گوندی بابکەکێ عەشیرەتا سندییانن ب ناڤێ (بلکێ) ژ بنەمالا (بلك) نە.

گوند سالێن (١٩٦٣، ١٩٨٧، ١٩٨٨)ێ ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن و وێرانکرن.

سیمایێن دی ل گوندی: زیارەتێ بانێ، زیارەتێ گوندی، زیارەتێ توك.

### ژ شوینوارێن ڤی گوندی:

قەسرا مەلوی، کوچێت ئاڤێ، کاڤلێ مەزارگەهێ.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

رووبارێ خابویری، کانییا گوندی، کانییا پڤزا، کانییا مەحمید، کانییا ئاقوی، کانییا گری، کانییا صالحی، کانییا لاوی، کانییا ئاڤا بڤری، کیرانکی، سیلاڤ خرابەی رەزا.

ژ نهال و گر و بانیێن گوندی: نهالا دەریا، نهالا حەلوی، نهالا گەرکێ، نهالا زراڤکێ، نهالا کەفری خرموی، نهالا هشارێ، نهالا زیارەتوکا، گرێ قاچ، گرێ کولکێ، بانیا دەپا، بانیا حەلوی، بانیا قەلایێ.

دیسان چەند شکەفت ژی ل گوندی هەنە وەك: شکەفتا دەپا، شکەفتا حەمز دینکا، شکەفتا هشاری، شکەفتا کونا سیخورێ، شکەفتا گوندی.

ژیارا خەلکێ گوندی ژی ب شێوەیەکێ گشتی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا (١٩٧٧)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن و ژ ژوورەکا ئاخێ پێکدهات.

## گوندێ گۆڤکا سەری:

سالا (١٩١٤)ێ ل سەردەستێ چۆلی تەیب هاتییەئاڤاکرن. ناڤێ گوندی ژ کۆلێن تەرش و کەوالی هاتییە و هندەك دبێژن گۆڤ بوویە گۆڤك کو بەرێ بتنێ گۆڤەك لێ بوو.

### رووبەرێ گوندی:

ب گشتێ ٢٩٢٣ دۆنەمن، دێمی کو نەهێتە چاندن ٩٩٧ دۆنەم، دێمێ کو بێتە چاندن ٧٢٣ دۆنەم، ئاڤی ژی ١٢٠٣دۆنەم.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** درنك ئاڤا.

**باشووری،** گۆڤکا گولی یا.

**رۆژهەلاتی،** میسکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بلدیشا.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی بابکەکێ عەشیرەتا کۆچەرانە ب ناڤێ (صیەیدا)، ژ بنەمالا تەیب چولی، بنەمالا فندێ، بنەمالا خێڤو، بنەمالا حامدی پێکدهات.

گوند ل سالێن (١٩٧٥ و١٩٨٧)ێ ل سەر دەستێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییەسۆتن و سالا (١٩٨٨)ێ کەتیە بەر هەوا ئەنفالان ژی.

# ناحیا رزگاری

شڤان وەحید عەبدوللا

## ناحیا رزگاری

رزگاری ئێك ژ سێ ناحیەیێن سەر ب قەزا زاخوڤەیە، ب دووراتییا ١٠ کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ باژێرێ زاخۆ، نێزیکی دەرگەهێ سنوورێ ئیبراهیم خەلیل، ناحیە دکەڤیتە سێکوشا سنووریا (هەرێما کوردستانێ- عیراق و ترکیا و سوریا)، هەروەسان هەرسێ پارچێن کوردستانێ باکوور و باشوور و رۆژئاڤا ب هەڤرا گرێددەت.

## سنوورێن ناحیێ:

**باکووری،** هەڤسنوورە دگەل ناحیا دەرکارێ و باکوورێ کوردستانێ- ترکیا

**باشووری،** دکەڤیتە ناڤبەرا هەردو چیایێن سپی و بێخێری، ئالیێ دی یێ چیای دکەڤیتە ناحیا باتێلێ یا سەر ب قەزا سێمێلێ ڤە.

**رۆژهەلاتی،** دکەڤیتە دەڤەرا (لێڤێ) کو ژ گەلیێ هارینا هەتا دگەهیتە گوندێ (حەسەن ئاڤا) و چیایێ سپی ڤەدگریت.

**رۆژئاڤا،** دکەڤیتە ناڤبەرا رووبارێ خابیری و چیایێ بێخێری

## دامەزراندنا ناحیا رزگاری:

ناحیا رزگاری یەك ژ وان یەکەیێن کارگێرییە یێن د قوناغا پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ ئانکو د ناڤبەرا ١٩٧٠- ١٩٧٤ێ هاتییەدامەزراندن

وەکی د رۆژنامەیا (الوقائع العراقیة) دا یا ژمارە (٢١١٩) ل (١٩٧٢/٤/٥)ێ، دا هاتی، ناحیا رزگاری ل (١٩٧٢/٣/٢٨)ێ زایینی هاتییە دامەزراندن، ناڤەندا وێ گوندێ (ئیبراهیم خەلیل) و سەر ب قەزا زاخوڤەیە، و ئەڤ گوند و دەڤەرە ب سەرڤەنە: (تلکەبەر، چەم سیرمو، خراب بانك، دارهۆزان، تاوك، خیلافتە،

**رووبەرێ ناحیێ ب ڤی رەنگی یە**

| روبەرێ گشتی /دونەم | رووبەرێ گشتی یێ ب کێر چاندنێ بهێت /دونەم | ملك | | | میری | | | روبەرێ گشتی بەردەلانو چەروان / دونەم |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | دێم | ئاڤی | سەرجەم | دێم | ئاڤی | سەرجەم | |
| ١٥٨٢٤٣ | ٥٧١٧١ | ٣٢٧٧٦ | ١٨٦٤ | ٣٤٦٤٠ | ٢٠٠٤٣ | ٢٤٨٨ | ٣٥٥٣١ | ١٠١٠٧٢ |

بەركەڤر خابوور، دیرونیك، گرك سندی، بێشابیر، مزری خابوور، قەرەولە، دێرەبوون، ئەرمشت، دۆلا، مامر، بێتاس، بێزە، چەم باهیڤ، خوالش، گرزریۆك، توبانو، هیتیان، شیانوە، باجۆكە، جەوسەق، باكرمە، چەم كورك، خلێخ، خرابدار، بیداسر، سلكە، ئافرمە، كانی سارك، حەسەن ئاڤا، دەشتمر، دوبانك، هارۆنە، بێزال، چەم مسلمت)[1]. یەكەمین رێڤەبەرێ ناحیێ ژی فەرسەت ئەحمەد عەبدوللا بوو.

ل (١٩٨٧/٨/٢٦)ێ وەكی دیسان د رۆژنامەیا (الوقائع العراقية) یا ژمارە (٣١٦١) ل (١٩٨٧/٨/٣)ێ، دا هاتی جارەكادی ناحیە هاتە هەلوەشاندن و ب ناڤەندا زاخۆ ڤە هاتییە گرێدان[2]. لێ ل سالا (١٩٩٨)ێ سەرژنوو ناحیە ژ لایێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ڤە هاتە دامەزراندن ڤە و روژا (١٩٩٨/٢/٢٧)ێ ئێكەمین رێڤەبەرێ ناحیێ د قوناغا نوودا ب ناڤێ (دلشێر عەبدولستار محەمەد) وەكی رێڤەبەرێ ناحیێ بۆ دەمەكێ كێم لێ هاتییە دامەزراندن، و پشتی وی چەندین كەسێن دی وەكی رێڤەبەرێن ناحیێ ل دووڤ لێستێ ژێری ئەڤ ئەركە گرتییەدەست:

| ژ | ناڤێ رێڤەبەری | رۆژا دەست ب كاركرنێ | روژا دەست ژ كاری بەردان |
|---|---|---|---|
| ١ | شمال محەمەد ئەدیب | ١٩٩٨/١٢/٥ | ٢٠٠٠/٨/١٩ |
| ٢ | ئەیسەر جەرجیس حەمید | ٢٠٠٠/٨/١٩ | ٢٠٠٢/٧/١ |
| ٣ | خالد عیزەدین كەریم | ٢٠٠٢/٧/١ | ٢٠٠٥/٩/٢٩ |
| ٤ | صادق ئەحمد عیسا | ٢٠٠٥/٩/٢٩ | ٢٠٠٨/١/١ مریە |
| ٥ | دلشێر عەبدولستار محەمەد | ٢٠٠٨/١/٨ | ٢٠١٠/٥/١٩ |
| ٦ | فەرهاد محەمەد یوسف | ٢٠١٠/٥/١٩ | ٢٠١٣/١/١٤ |
| ٧ | عادل ئەمین عومەر | ٢٠١٣/١/١٤ | ٢٠١٦/١٠/٢٥ |
| ٨ | سەروەر سەعید دیوالی | ٢٠١٦/١٠/٢٥[3] | |

**گوندێ دیرەبوونێ ل ناحیا رزگاری**



## پێکهاتا خەلکێ ناحیێ:

پتریا خەلکێ ناحیێ کوردێن موسلمانن، بەلێ هندەك ئایین و نەتەوەیێن دی ژی لێ هەنە، کو مەسیحی رێژا ١٠٪ و ئێزدی رێژا ٧٪ یاخەلکێ ناحیێ پێکدئینن، ل دووڤ ئامارێن تەخمینکرینێن رێڤەبەریا ئامارا دهۆکێ بۆ سالا ٢٠١٦ هژمارا خەلکێ ناحیێ ٢١٥٥١ کەسن، ژ وانا ١٥٦٠ کەس باژێری و ١٩٩٩١ کەس گوند نشینن[٤].

سەنتەرێ ناحیێ گوندێ ئیبراهیم خەلیلە کو ١٥٠ سەرۆکخێزانان ب خۆڤە دگریت، سەرانسەری ناحیێ نێزیکی ٤١٠٠ خێزانن ، ب گشتی ٢٨ کۆمەلگەهـ و گوندێن ئاڤاکری سەر ناحیێ ڤەنە، ٢٢ گوند د سنوورێ ناحیێدا نەهاتینەئاڤاکرن[٥].

## سەروبەرێ ئابووری:

پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ دەما خەلکێ ناحیێ زڤرینە سەر مال و ملکێن خۆ. کارێ وان یێ سەرەکی جۆتیاری (چاندنا گەنمی و جەهی و نۆکان) و کرێکاری بوو، ب تایبەت کو جهێ وی یێ گونجایە بۆ چاندنێ و هەردو رووبارێن (خابوور و هیزل) دناڤ ئاخا وێ دا دگەهنە ئێك و تێرا دەرباز دبن. نها ژی ئەو چەند یا بەردەوامە، ژبلی کو نها گەلەك ژ خەلکێ ناحیێ فەرمانبەرن، چونکی جهێ ناحیێ یێ ستراتیژی و گرنگە دگەل ترکیا و پارێزگەها مووسل و ناحیا زومار، گەلەك ژ خەلکێ ناحیێ بازرگانن، هەروەسا هەردو گوندێن (چەم کورك و جەل مودو) دەولەمەندن ب بەرێن مەزن و خیز و تێکەلەی، سەرەرای ئەو دەڤەرا دکەڤیتە دناڤبەرا رووبارێ (خابیر و چیایێ بێخێری) یا ب ناڤ و دەنگ ب چاندنێ، تایبەت چاندنا (سپیندارا) کو سالانە نێزیکی (٢) ملیون سپیندار لێ دهێنە بەرهەم ئینان. ناحیا رزگاری ب بەرهەمێن پترولێ ل گوندێ (تاوکێ) ل رۆژهەلاتا ناحیێ یا زەنگینە و (١٣) کانی و بیرێن پترولێ ل سنوورێ وێ هەنە، و کومپانیا (DNO) لێ کاردکەت و گەلەك ژ خەلکێ ناحیێ ژی لێ کاردکەن، کومپانیا (DNO) د تۆومارێن حکومەتێ دا ب ناڤێ (گوندێ تاوکێ) هاتیە تۆومارکرن و کارێ وێ کەتیە دناڤ ئاقارێ گەلەك گوندان دا، لەوما خەلکێ وان ژ بەر زیانا ڤ ئاقارێ گوندێن وان کەتین دهێنە قەرەبووکرن، ئەو گوند ژی پێکهاتینە ژ گوندێن (تاوکێ، دارهۆزان، چەم کورك، باکرمان، جەوسەق، باجیکا، شیناڤا، هتیان، تویان، قەرەولا، دێرەبون، ڤێشخابور، مەرزێ) و بۆرییێن ڤەگوهاستنا پترولێ ژی د ئاقارێ ڤێ ناحیێ را دەرباز دبن کو ئێك ژ وان بۆریان بۆریا کەرکووك- جیهانە، ژبلی ڤێ چەندێ دەرگەهێ ئیبراهیم خەلیل ئێکە ژ مەزنترین دەرگەهێ بەژاییە ل عیراقێ بۆ جیهانا دەرڤە و ب تایبەت ترکیا و ئەوروپا و رۆژانە (١٥٠٠) ترومبێلێن بارهەلگر تێرا دەربازدبن.

سەرەرای گرنگیا ڤێ دەڤەرێ ژ هەمی لایانڤە، بنکەهەکێ لەشکەری یێ گرنگێ هەرێما کوردستانێ ژی ل گوندێ (پێشابیرێ) هەیە، کو دهێتە یە هەژمارتن مەزنترین بنکەهێ مەشقا لەشکەری ل پارێزگەها دهوکێ[٦].

## کۆمەلگەهێن سەر ب ناحیێ ڤە

### کۆمەلگەها ئیبراهیم خەلیل:

ئەڤ کۆمەلگەهە سالا (١٩٧٠)ێ هاتیە ئاڤاکرن، ناڤێ وێ ژ ناڤێ هەبوونا مەزارێ (شێخ ئیبراهیم خەلیل) هاتیە.

#### سنوورێن کۆمەلگەهێ:

باکووری: سنوورێ ترکیا (باکوورێ کوردستانێ).

باشووری: گوندێ جەوسەقێ.

رۆژهەلاتی: گوندێ باکرما.

رۆژئاڤایی: گوندێ باچیکا.

#### پێکهاتا جڤاکی:

خەلکێ وی کۆچەرن ژ مالباتێن: (عەلی عەلی، شەهباز حسێن، جانگیر، چۆڤیا، سمو، خلتو)، ژمارا خەلکێ وێ ل بەرێ (٥٠) سەرۆکخێزان بوون و نها دگەهنە نێزیکی (١٥٠) سەرۆکخێزانان.

سالا ۱۹۷٤ێ هاتییە خرابکرن و سالا (۱۹۷٥)ێ هاتییەڤە ئاڤاکرن.

سالا (۱۹۷۳)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ب ناڤێ (رۆناهی) لێ هاتییە ڤەکرن و سالا (۱۹۸۲)ێ بنگەهێ ساخلەمیێ لێ هاتییە ڤەکرن.

## کۆمەلگەها چەم کورك:

ئەڤ کۆمەلگەهە سالا (۱۹۷۷)ێ ل سەر ئاقارێ هەمان گوندی هاتییەئاڤاکرن، ناڤێ وێ ژ ناڤێ گوندێ چەم کورك، بەری سالا (۱۹۹۱)ێ وەك سەربازگەهەکا لەشکەری دهاتە بکارهینان، کەڤنترین بنەمالێن ڤێ کۆمەلگەهێ (بنەمالا تەیبێ کۆچەرێن صەیدا و بنەمالا (بەلێ) ژ عەشیرەتا (تەیا- طی) یا عەرەبی و بنەمالا (عەرەب) کو ژ عەشیرەتا مۆسا رەشا بوون.

### سنوورێن کۆمەلگەهێ:

**باکووری،** جادا سەرەکییا ئیبراهیم خەلیل.

**باشووری،** ئاقارێ گوندێ خێلەخێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خراب دارێ.

**رۆژئاڤایی،** کۆمەلگەها چەم کورك ۲.

### پێکهاتا جڤاکی:

خەلکێ وێ تێکهەلن ژ چەندین عەشیرەتا و ژ نەبوونی و نەدارێ خەلکی ژ گەلەك جهان قەست کرێ، دکەڤندا دا (۱۸۰) سەرۆکخێزان تێدا دژیان، لێ زێدەگاڤی ل سەر عەردێ وێ هاتینە کرن، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (۱۹۵۷)ێ ۱۳٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان[۷] و نها ژمارا ئاکنجیێن وێ پترن ژ (۵۰۰) سەرۆکخێزانان.

ئیبراهیم خەلیل



سالا (١٩٩٥)ێ یەکەم خواندنگەها سەرەتایی و سالا (٢٠١٥)ێ یەکەم ئامادەیی ل ڤێ کۆمەلگەهێ هاتینە ڤەکرن.

## کۆمەلگەها چەم کورك ٢:

سالا (١٩٧٧)ێ ل سەر ئاقارێ هەمان گوند هاتییە ئاڤاکرن، بەرێ وەکی سەربازگەهەکا لەشکەری و کۆگەهێن کۆمەلگەها ئیبراهیم خەلیل دهاتە بکارهینان، ژ بەر زێدەگاڤیێن سەر عەردێ هەردو کۆمەلگەهان هاتینە کرن نها هەردو گەهشتینە ئێك، کەڤنترین بنەمالێن کۆمەلگەهێ ژی بنەمالا (محەمەد تۆفیق بەرواری- مایی) و بنەمالا (مونیر محەمەد دۆسکی) نە.

سالا (٢٠١٠)ێ خواندنگەها (بەراڤ) ب هەڤپشك دگەل خواندنگەها (کۆمەلگەها چەم کورك ١) هاتییە ڤەکرن و سالا (٢٠١٤)ێ ئاڤاهییەك بۆ هاتییەدروستکرن. سالا (٢٠٠٦) خواندنگەها (زەعفەران) هاتییە ئاڤاکرن.

د بەرێ دا نێزیکی (٢٠) سەرکخێزان ل ڤێ کۆمەلگەهێ هەبوون، نها ژمارا وان دگەهیتە (٢٠٠) سەرکخێزانان.

## کۆمەلگەها باکرما:

سالا (١٩٧٧)ێ بۆ مەبەستێن بعەرەبکرنێ هاتبوو ئاڤاکرن، د رۆژانێن سەرهلدانێدا عەرەب ژ دەڤەرێ رەڤین و پشتی سەرهلدانێ خەلکەکی قەستکرییێ، کەڤنترین بنەمالێن گوندی: (بنەمالا بێریانی ژ شەرنەخیان و بنەمالا شبلی و شێخۆ ژ عەشیرەتا سندیان و بنەمالا تەلەت و دەلیل ژ عەشیرەتا گولیا و بابێ بلێجانی)، ل بەرێ نێزیکی (١٥٠) سەرۆکخێزانان ل گوندی دژیان، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٣٦ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٨]، لێ نها ژمارا وان دگەهیتە (٤٠٠) سەرۆکخێزانان.

خواندنگەهـ بۆ ئێکەم جار سالا (١٩٧٧)ێ ل ڤێ کۆمەلگەهێ هاتە ڤەکرن، لێ دەوام هەتا سالا (١٩٩٧)ێ لێ نەهاتەکرن، مزگەفتا وان دەمێ رژێمێ دا دناڤ ئاڤاهییەکی دا کو بۆ گازینویەکێ هاتبوو دروستکرن، ئەو ئاڤاهی سالا (١٩٩٨)ێ هاتە خرابکرن و کرنە مزگەفت، سالا (١٩٩١)ێ کارەب ژی گەهشتییە گوندی. سالا (١٩٩١)ێ نەخۆشخانە لێ هاتییە ڤەکرن و سالا (١٩٩٣)ێ ئاڤاهییەك بۆ هاتە دروستکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ژی سالا (١٩٩٧)ێ بۆ هاتییە دروستکرن.

ژیانا خەلکێ کومەلگەهێ ل سەر پالەتیێ و کاسبکارییێ یە نەمازە کو کۆمەلگەهـ دکەڤیتە سەر رێکا سەرەکیا (ئیبراهیم خەلیل).

## کۆمەلگەها خێلەخێ:

کۆمەلگەهـ سالا (١٩٧٧)ێ ل سەر ئاقارێ گوندێ (چەم کورکی)دا بۆ بعەرەبکرنێ (تەعریبێ) هاتییە ئاڤاکرن، ل دەسپێکێ (٥٠) سەرکخێزان لێ د ئاکنجی بوون و و ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٣ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٩]. نها ژمارا وان دگەهیتە (٣٥٠) سەرکخێزانان.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووبارێ خابویری.

**باشووری:** گوندێ خێلەخێ.

**رۆژهەلاتی:** کۆمەلگەها چەم کورکا دووێ.

**رۆژئاڤایی:** کۆمەلگەها باکرما.

خەلکێ وێ هەمان خەلکێ دەڤەرێن دەور و بەرێن زاخۆ بوون ژ عەشیرەتێن (سندی و کۆچەر و دۆسکیان) کو گوندێن خۆ بەردابن، ژ بنەمال و کەسایەتیێن بەرنیاس ل کۆمەلگەهێ: (حەجی عەزیز وەرمێلی- دۆسکی، فیقی صوفی سندی، ملا برجس).

ژیانا خەلکێ وی ل سەر جۆتیارییێ و کاسبکارییێ بوویە.

سالا (٢٠٠٢)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن.

## کۆمەلگەها قەرەوولا:

ئەڤ کۆمەلگەهە سالا (١٩٧٧)ێ بۆ تەعریبێ ل ناڤ ئاقارێ هەمان گوند هاتییە ئاڤاکرن و

هەتا سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ كۆمەلگەهەكا تەعریبكری بوو پشتی خەلكێ وی ل سالا (١٩٨٨)ێ دەربەدەری دەڤەرا خانكێ كرین و پشتی سەرهلدانێ جارەكادی ڤەگەریانەڤە سەر واری خۆڤە.

خەلكێ گوندی دبنیاتدا ژ هەردو گوندێن (سینا و شێخدرێ) نە، هەمی ئێك عەشیرەتن و پێك دهێن ژ حەفت بابكان: (بابك بەیرگا، عیسا، تعلكا، بریسكا، ئیسكا، شهاڤكا، دالۆكا). ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٣٤ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٠].

ژیارا خەلكێ وی ژی ل سەر چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی یە.

سالا (١٩٨٧)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییەئاڤاكرن و سالا (١٩٩٤)ێ ئاڤاهیێ خواندنگەهێ جارەكا دی هاتییە نووژەنكرن.

سالا (١٩٩٣)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ كۆمەلگەهێ هاتییە دروستكرن و سالا (١٩٩٥)ێ كارەب ژی گەهشتییە گوندی[١١].

## كۆمەلگەها دێرەبوونێ:

ئەڤ كۆمەلگەهە سالا (١٩٧٧)ێ بۆ تەعریبێ ل ناڤ ئاقارێ هەمان گوند هاتییە ئاڤاكرن و هەتا سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ كۆمەلگەهەكا تەعریبكری بوو، ئانكو عەرەب لێ ئاكنجیكریبوون. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٧٥ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٢].

خەلكێ گوندی دبنیاتدا ژ هەردو گوندێن (سینا و شێخدرێ) نە، هەمی ئێك عەشیرەتن و پێك دهێن ژ حەفت بابكان: (بابك بەیرگا، عیسا، تعلكا، بریسكا، ئیسكا، شهاڤكا، دالۆكا) و نها نێزیكی (٢٥٠) سەركخێزان لێ دژین.

سالا (١٩٩٣)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی كۆمەلگەهێ هاتییە ئاڤاكرن و سالا (١٩٩٦)ێ قۆناغا ئامادەیی ژی لێ هاتییە ڤەكرن.

سالا (١٩٩٦)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ كۆمەلگەهێ هاتییە دروستكرن و سالا (١٩٩٥)ێ كارەب ژی گەهشتییە گوندی

ژیارا خەلكێ وی ژی ل سەر چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی یە[١٣].

## گوندێن سەر ب ناحیێ ڤە

## گوندێ دار هۆزان:

گوندەكێ كەڤنارە ل چاخێ دەولەتا ئوسمانی گوندێ (دارهـۆزان) هەبوو و دكەفتە لایێ دی یێ رووباركی (جەلالێ ئاڤێ) كو دبێژنێ (خرابۆك)، گوند دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (٦كم) ژ مەلبەندێ ناحیا سندی دەركارێ و پشتی پێكهاتنا (١١) ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ و دامەزراندنا ناحیا رزگاری كەتییە سەر وێ ناحیێ.

### پێكهاتا گوندی:

ژ كەڤندا خەلكێ گوندی موسلمانن، بەلێ تاخێ سەری یێ گوندی مەسیحینە و موختار ژی هەر ژ وان ب خۆیە، دیسان ئێزدییان ژی بۆ خودانكرنا تەرش و كەوالی كوینێن خۆ ل وی گوندی ڤەددان و دبوونە كریڤێن وان یێن خوینێ. خەلكێ ڤی گوندی هەمی ژ عەشیرەتا سندی نە و هندەك ژی ژ باكوورێ كوردستانێ نە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٤٤ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٤] و بەری هەوا خرابكرنا گوندان (٧٠) مال ل گوندی هەبوون و نها نێزیكی (٥٠) مالان لێ هەنە.

د دیرۆكا هەڤچەرخدا ئەڤ گوندە چوار جاران هاتییە وێران كرن، جارا ئێكێ ل سالا (١٩٢٣ز) دەمێ (جەمیل ئاغا سندی) دژی حكومەتێ راوەستیای و جارێن دویڤدا ل سالێن (١٩٦١، ١٩٧٤، ١٩٩١)ێ.

جهێن كەڤنار و بەرچاڤێن گوندی:

ژ جهێن بەرنیاس ل گوندێ مێرگا سولتان، دارا كوخانێ، مەزارەكێ سەید عەلی ئەوراس و مەرقەدێ جمیل ئاغایێ سندی و هەر چوار كورێن وی.

### زێدەرێن ئاڤێ:

د دەمێن كەڤندا ل گوندی كانی هەبوون، ژ بەر كێمبوونا ئاڤا وان نها سێ بیرێن ئیرتیوازی هاتینە

كولان، دكەڤندا سكرەك سەر سەروكانییا ئاڤا جەلالی بۆچاندنێ چێدكرن بەلێ ئاڤ نها زۆر یا كێم بووی.

**زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

خەلكێ گوندی كارێ چاندنا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و برنج و گوندۆر و خیارا دكر، و دو جنیكێن دارێن فێقی یێن لێ ماین.

دهێتەگۆتن ل سالا ١٨٨٨ێ خواندنگەهەكا ئوسمانی یا تركی ل گوندی هاتییەڤەكرن، بەلێ چ تشتەك یان بەلگەیەك ژ وێ خواندنگەهێ ل بەردەست نینە. هندیكە خواندنگەها فەرمییە ل سالا ١٩٥٩ێ ل گوندی هاتییەڤەكرن.

سالا (١٩٥٩م) خواندنگەهـ ل دارهـۆزان هاتە ڤەكرن و زارویێن گوندێ (گركا ئیسلام) دهاتنە خواندنگەها دارهۆزانێ. و ل ڤێ سالێ پرۆژەیێ ئاڤێ ژێ هاتییە گوندی، كارەب ژێ ل سالا (١٩٧٧)ێ گەهشتییە گوندی، هەر وەسان ئاشەكێ ئاڤێ ژێ یێ (جەمیل ئاغا) ل گوندی بوو، بەلێ پشتی سالا (١٩٥٠)ێ یێ خراب بووی[١٥].

## گوند ئەرمشتێ:

ب دووراتیا (٢٠كم) دكەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیێ و ژ گوندێن هەری كەڤنە، د ژێدەرێن جوگرافیێن ئیسلامی و عەرەبیدا ب ناڤێ (اردمشت) هاتییە، ژ دەڤەرێن سەر میرگەها بەهدینان بوو[١٦]، رووبەرێ گشتی یێ گوندی (١٦٦٢) دۆنەمێن ئەردی نە، كەلا ئەرمشتێ (اردمشت) د دیرۆكێدا ناڤدارە، بەلێ نەهاتییەزانین گوندی بەری كەلایێ یان كەلا ل پێشتر هاتییەئاڤاكرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ چم مسلمەت.

**باشووری:** چیایێ سپی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێزالكێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دولا.

**پێكهاتا گوندی:**

گوند ژ بنەمالێن (ئیبراهیم ئەرمشتی، مالا مەلای، حاجی مەرجانا، مالا مام ئیسڤی، حەجی سلێڤانەیی) پێكدهێت. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٧٠ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٧].

گوند ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٨٤، ١٩٨٨)ێ ژ لایێ حكومەتا عیراقی ڤە هاتییە سۆتن و بەردان.

**جهێن شوینواری و كەڤنار:**

ئاشێ مەندا، ئاشێ گوندی، گۆرستانا گوندی، گۆرستانا كەلهێ، شكەفتا كەرا، شكەفتا لاتا حەسەن، كاڤلێ ئەرمشتێ، كەلا ئەرمشتێ.

**جهێن بەرچاڤێن گوندی:**

نهالا گوندی، نهالا كەلێ رێ، سەرگەلوكا، گركێ كاڤلا، نهالا بەهلیلێ، بیستانێ كەڤری، بیستانێ جومێ، بیستانێ مەیدانێ، گرێ حلانی كلكێ، گركێ خرابوكا، گركێ نازی.

كانی و ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی، مینا: كانییا شێخی، كانییا متەولا، كانییا میر ئیسف، كانییا جەمكێ بهیێ، كانییا فەوجێ، كانییا سكرك، كانییا كەلی.

**زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیانا خەلكێ گوندی د كەڤندا ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەت چێكرنا رەزا و چاندنا هنارا و گەنمی و نیسك و نۆك و باقلك و... هتد، هەروەسا ل سەر خودانكرنا پەزی و بزنی چێل و مریشكان بوو، نها ژێ ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و سەخبێریكرنا جنیكا یە و گوند ب چاندنا هنارا یێ بناڤ و دەنگە.

هەروەك ئاماژە پێ هاتییەكرن ئەرمشتی ب كەلا خۆ ناڤدارا و ژ دەڤەرێن سەر ب میرگەها بەهدینان بوو، لەوما ژێ ژ دەسپێكا سەدسالییا ١١مش/ و سەردەمێ میرێ بەهدینان زێر پاشای (١٧٠٢-١٧١٤) ب خواندنگەهێن خۆیا زانستی ناڤدار بوویە و ئەڤ خواندنگەهە ل سەردەمێ میرێ ئاماژەپێكری

هاتییەنووژەنکرن و چەندین زانا ل ڤێ خواندنگەهێ پێگەهشتینە و چەندین دەستنڤیس ژی هەر ل ڤێ خواندنگەهێ هاتینەڤەنڤیسین[18].

بەلێ د سەردەمێ نوودا ب درەنگیڤە و ل سالا ١٩٧٠ێ خواندنگەها فەرمی ل ڤی گوندی هاتییەڤەکرن، هەروەسان ل سالا ١٩٩٧ خەتا کارەبێ گەهشتییە گوندی[19]..

## گوندێ باکرما:

ئەڤ گوندە ب دووراتییا (٢,٥کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیێ، دیرۆکا وی دزڤریتەڤە بۆ نەە پشتان، رووبەرێ وی یێ گشتی ژی دگەهیتە (٢٨٠٧) دۆنەمێن ئەردی.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ چەم کورك.

**باشووری:** چیایێ بێخێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خێلەخ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ جەوسەق.

### پێکهاتا جڤاکی:

گوند ژ ڤان بابکان پێکدهێت:

(سەید تاها، سەید غەنی، شێخ یاسین، شێخ جەبار، شێخ نەسرەددین)، کورێن خەلیلی نە، ئەڤە د بنیاتدا خەلکێ گوندی نە و ژ عەشیرەتا سلیڤانەیان، (شێخ عەبدولرەحمان، شێخ جەلالەددین)، هەر سلیڤانەیینە و پاشتر ل گوندی ئاکنجی بووینە، و مالباتێن (حەجی حاجی و ئوسمان و شێخ سالح و حەجی عەرەب) ل داوییێ ل گوندی ئاکنجی بووینە. د بەرێ دا (٤٠) سەرۆکخێزان ل گوندی هەبوون و نها گوند چۆلە.

گوند ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٥، ١٩٧٥)ێ ل سەر دەستێن رژێمێن عیراقی هاتییەخرابکرن و خەلکێ وی قەستا دەڤەرا گولیان کرن و پشتی هینگێ نەزڤرینەڤە سەر گوندی.

### ژ شوینوار و جهێن ناڤدار ل گوندی:

گۆڕستانا شێخ یاسین، مزگەفتا گوندی، گۆڕستانا قاچی، نهالا گەر چنار، نهالا برنجی، بەرزیرا بەرۆژ، چلخێ، خیزکا، نەرمە، ئافروکا، بەرینا، گردەوین.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤی ل گوندی چەند کانی بوون، وەکی: کانیبا زەلاما و کانیبا ژنا و کانیبا هێژیر و سیلاڤا مالا شێخی و سیلاڤا تەحلو

### ژێدەرێ ژیارا خەلکێ گوندی:

ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

خواندنگەها ئایینی (مەدرەسە) ل گوندی هەبوو و دەرسێن دینی د مزگەفتێ ڤە دخواندن، لێ سال نەدیارە و هەتا نها شوینوارێن مزگەفتێ ل گوندی هەنە[20].

## گوندی بێزالێ:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٢٤کم) رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری و مێژوویا ئاڤاکرنا وی نەهاتییەزانین، بەلێ وەك خەلکێ گوندی دبێژن: چوار پشتە ئەو ل ڤی گوندینە. ناڤێ گوندی یێ هاتی کو ل دەمێ گوند هاتییە ئاڤاکرن ژنەك ب ڤی ناڤی لێ هەبوو و ب ناڤێ وێ هاتییە ب ناڤکرن، رووبەرێ گوندی (١٥٢٣) دۆنەمێن ئەردی نە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن تمر ئاڤا و چەم مسلەت.

**باشووری:** چیایێ سپی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دوبانکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ ئەرمشتێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند پێکدهێت ژ بنەمالەکێ کو ئەو ژی دبنە

سێ بابك ب ناڤێن (ئیسماعیل ئەفندی و حەجی عەبدولستار و حەجی خالد)، ئەڤ سێ بابكە ژ عەشیرەتا سلێڤانەیانە، دكەڤندا نێزیكی (٣٠) خێزان ل گوندی هەبوون و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٢ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٢١]. نها گوند یێ بەردایە و بتنێ هندەك ژ گوندیا ئاژەلی لێ بخودان دكەن.

ل سالا ١٩٦١ گوند هاتییە سۆتن و خرابكرن، پشتی كو ل سالا ١٩٦٢ێ هاتییەڤەئاڤاكرن، ل سالا ١٩٦٣ێ ب دەستێن لەشكەرێ سوریا جارەكادی هاتییەخرابكرن، ب ڤی رەنگی مایە هەتا پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ جارەكا دی هاتییەڤەئاڤاكرن، بەلێ د روودانێن شەرێ ١٩٧٤- ١٩٧٥ێدا جارەكا دی هاتییەخرابكرن و مایە كاڤل هەتا ل سالا ١٩٩٢ێ پشتی سەرهلدانێ سەر ژنوو هاتییەڤەئاڤاكرن.

### شوینوارێن گوندی:

گركێ خەزنێ و گۆرستانا ڤوی رزی.

### جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

خربێ حەسەن موسا، ئاستەنگی، لەندا كولیا، شكەفتا سلاڤێ، كەلەكا سنجوی، و نهالا هیردەكی و چم لەگلەكە.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی دو كانی ب ناڤێن: كانیا بابینێ و كانیا خام زێرێ هەنە، هەروەسان مفای ژ هەردو رووبارێن روگەرم و خابویری.

ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی كەڤن ل بەرێ ل سەر چاندنا كشتوكالی و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو.

كارەب ل سالا ٢٠١٣ گەهشتییە گوندی[٢٢].

## گوندێ پێشابیرێ:

گوند دكەڤیتە سەر سێگۆشەیا سنوورێ (توركیا و سوریا و عیراق)، ب دووراتیا (١٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیا رزگاری. ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو دكەڤیتە پێشیا رووبارێ خابیری.

### پێكهاتا جڤاكی:

گوند ژ (١٥٠) خێزانێن كلدان ئاشووری ژ عەشیرەتێن (نەقلی، بلقا، هوزی، بارهیخی، جرا) پێكدهێت. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٩٩ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٢٣].

گوند ل سالێن (١٩٦١، ١٩٧٤)ێ هاتییە سۆتن و بەردان و سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە، بەلێ هەمان سال گوند هاتە تەعریبكرن و خەلكێ وی بۆ دەڤەرا سێمێلێ هاتنە ڤەگوهاستن، سالا (٢٠٠٥)ێ خەلكێ گوندێ زڤرینە سەر گوندی و ژ لایێ حكۆمەتا هەرێمێ ڤە هاتە ئاڤاكرن ڤە.

### شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندی:

كەلها پێشابیرێ، مەزارێ ماركیس، ماراوراها، دێرا گوندی یێ كەڤن، شكەفتا دێرێ، قەسرا عەزیز ئاغا، و پرا رووماتی یێ كەڤن.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

كانی فرارمریم الدیزاو، كانێ هێژیركێ، رووبارێ دجلە، نهالا ماركوركیس، نهالا شێلا.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندێ كەڤن ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەت گەنم و نۆك و... نها ژی هەمان كار دكەن ژبلی كو فەرمانبەرن و پێشمەرگەنە.

سالا (١٩٢٣)ێ یەكەمین خواندنگەها سەرتایی ل گوندی هاتییە ڤەكرن و سالا (١٩٧٢)ێ خواندنگەها ناڤنجی و سالا (٢٠٠٥)ێ یا ئامادەیی (تێكهەل) ل گوندی هاتییە ڤەكرن. سالا (١٩٥٩)ێ كارەبا ماتۆری گەهشتییە گوندی.

سالا (١٩٥٥)ێ بنكەهێ گۆمركێ ل گوندی هاتییەڤەكرن، سالا ١٩٥٩ێ كارەب ب رێكا مووەلیدێ گەهشتییە گوندی، سالا (١٩٦٠)ێ بنكەهێ

ساخلەمیێ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و سالا (١٩٨٥)ێ بنکەهێ پۆلیسان ل گوندی هاتینە ڤەکرن[٢٤].

## گوندێ تاوکێ:

گوندێ تاوکێ ب دووراتیا (٢٥) کم دکەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیا رزگاری، دبێژن بەری سێ سەد سالەکان هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ گوندی ژ ناڤێ (تاوك- دارا تاوکێ) هاتییە کو ل دەڤەرێ هەبوون.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ عمر ئاغا (ناحیا دەرکارێ).

**باشووری:** هەڤسنووره دگەل گوندێن خوالش، چەم باهیڤ، خێلافتە.

**رۆژهەلاتی:** گوند نێزیکی گوندێ مەلا عەربێ (ناحیا دەرکارێ).

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خراب بابك.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ ئێك بابك پێکدهێت، ئەو ژی (مالا هەسنێ)یە، ئەڤ بنەمالە بینێ یە ژ کەڤندا ل گوندی دژین، د بەرێ دا ژمارا سەرۆك خێزانان نێزیکی (١٣) خێزانان بوون کو دبوونە نێزیکی (٩٠) کەسان و نها نێزیکی (١٥٠) سەرۆك خێزان ل گوندی.

گوند گەلەك جاران ژ ئالیێ رژێمێن عیراقی ڤە هاتییە سۆتن و بەردان، سالا (١٩٦٣)ێ هاتییە سۆتن و بەردان و خەلکێ گوندی ل سالا (١٩٦٥)ێ زڤرینە سەر گوندی ڤە، سالا ١٩٧٤ێ گوند هاتییە سۆتن ڤە و سالا (١٩٧٥)ێ هندەك ژ گوندییان زڤرینە سەر گوندی ڤە و هندەك ژی ئاوارەی ئیرانێ بوون، داوی جار ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتییەخرابکرن و سالا (١٩٩٢)ێ گوندی زڤرینە سەر گوندێ خۆڤە.

### شونوار و جهێن کەڤنار و ناڤدار:

چەند جهێن دیار و ب ناڤ ل گوندی هەنە، وەکی (شکەفتا تەختێ محمد بەگی، ئاسارێ چەمێ ناف ئاڤێ، بیرێن نەفتێ کو ل سەر دەمێ دەولەتا (ئوسمانیان) هاتبوونە کۆلان، گۆڕستانا سەید ئەحمەد، وارێ مێرەمێ، چالا بەلوی، چالا خەلەفی، چەمێ دێریا مەلای، هەسیکای، گر مەرجان، لیسێ تەیری، دیڤ روو، نهالا قیری، چەمێ شەروی).

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەند ژێدەرێن ئاڤێ ل ڤی گوندی هەنە، وەکی رووبارێ خابویری و رووبارەکێ دی ژی لێ هەیە دبێژنێ دیڤ روو، ژبلی چەندین کانییان، وەك: کانییا سیلاڤا توری، کانییا نەموی، کانییا زەلاما، کانییا ژنکا، کانییا کاموی.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژێدەرێ ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا کشتوکالی و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، نها ژی ژیانا خەلکەکی ل سەر کشتوکالی یە، ژبلی کو هندەك فەرمانبەرن و هندەك ل کومپانیا (DNO) یا نەفتێ کاردکەن و هندەك ژی بازرگانن.

سالا (١٩٧٩)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن، سالا (٢٠٠٢)ێ پشتی ئاڤاهیێ وێ کەتی هاتییەڤە ئاڤاکرن. سالا (٢٠٠٣)ێ کارەب گەهشتیە گوندی و مزگەفت ژی ل هەمان سال هاتییە ئاڤاکرن[٢٥].

## گوندێ تەمەر ئاڤا:

گوند ل سالا (١٩٥٢)ێ هاتییە ئاڤاکرن، دکەڤیتە دووراتیا (٢٨کم) رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری،

ناڤێ گوندی ژ ناڤێ وی کەسی هاتییە یێ گوند ئاڤاکری و گوند بوویە (تمر ئاڤا).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندی زۆراڤا (دەڤەرا دۆسکیا).

**باشووری:** گوندێ دۆبانك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ تلا کورو (دەڤەرا دۆسکیا).

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دە شمرێ.

**پێكهاتا گوندی:**

گوند ژ ئێك ئیجاخ پێكدهێت، ئەو ژی ئیجاخا تەمەرە، دكەڤندا ئەڤ ئیجاخە ل دەڤەرا سلیڤانەیا دژیان و پشتی گوندێ تمر ئاڤا ئاڤاكری دەڤەرا سلیڤانەیا بجهێلایە.

گوند دو جاران ژ لایێ رژێمێن عیراقی ڤە هاتییە سۆتن و بەردان، جارا ئێكێ ل سالا (١٩٦٠)ێ و سالا (١٩٧٠) خەلكێ وی هاتینەڤە سەر گوندێ خۆڤە، جارا دووێ ژی ل ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ بوو كو خەلكێ وی ئاوارەی باكوورێ كوردستانێ بووینە و پشتی هینگێ نەزڤرینەڤە سەر گوندێ خۆڤە.

**شوینوارێن گوندی:**

ڤی گوندی شكەفتەك ب ناڤێ (شكەفتا بەرێ كون) هەیە، ژبلی شوینوارێ ئاشەكی ژی.

**جهێن بەرچاڤێن گوندی:**

كور بەرازكا و گركێ تورەشی و گرێ خودانی.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ل گوندی بتنێ كانیەك ب ناڤێ كانییا (گەمو) لێ هەیە و نها ئەو ژی هشك بوویە، دیسان رووبارێ (رووگەرم) ژ ناڤ دۆسكییا دهێت و د گوندی را دبووریت.

**ژێدەرێن ژیانا خەلكی گوندی:**

ژیانا خەلكێ گوندی دكەڤندا ل سەر چاندنا كشتوكالی و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو و جنیك ل گوندی هەبوون و جۆرێن دارو باری لێ دچاندن، مینا سپیندار و خۆخ و باجان و هنار و مشمش و نۆك و گەنم و گەلەكێن دی...[٢٦].

**گوندێ چەم مسلمەتێ:**

گوند دكەڤیتە دووراتیا (٢٨كم) رۆژهەلاتێ ناحیێ، سالا (١٩٤٦)ێ ل سەر دەستێ هادی عەڤدی عیسا محێ هاتییە ئاڤاكرن، جهێ گوندی دكەڤیتە ناڤبەرا رووگەرم و خابیری ژ لایەكی و ناحیا رزگاری و مانگیشكێ ژ لایەكێ دیڤەیە.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ زۆراڤا شێخ حەمدی (ناحیا مانگیشكێ).

**باشووری،** گوندێ ئەرمشتێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ تمر ئاڤا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ دێرینك.

**پێكهاتا جڤاكی:**

گوند بتنێ ژ ئێك بابكی پێكدهێت و ڤی بابكی (هادی عەڤدی عیسا محو) گوند ئاڤا كریە. گوندێ كەڤن (٩) خێزان بوون و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢١ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٢٧]. نها (١٩) خێزانن.

سالا (١٩٨٨)ێ گوند هاتییە وێرانكرن و خەلكێ وی ئاوارەی باكوورێ كوردستانێ بووینە.

ڤی گوندی چەند جهین بەرچاڤ هەنە، وەكی: زیارەتێ بنۆك ناڤێ زیارەتی مستەفا پیر محەمەد، بەرێ كون، چەمێ گولك، خرابێ مسلمەتی، پەحناڤ، چەمی كولكا، گرێ دریزوك، بوری سێ گركا، سەید، زیارەتێ خویریزوكا، ژبلی دو ئاشان كو ل گوندی هەبوون. ژبلی زەڤیێن: زەڤیا چەمێ گولك دارێ چالا هفشیی، زراڤك، برزیر، زیڤیا بورێ سێ گركا.

**ژ جهێن روینشتنێ:**

تویا چەمی، چناری، پەلگین بوری سێ گركا.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ل گوندی هەردو رووبارێن رووگەرم و خابویری نە.

ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر دخل ودانێ ئاڤی و دێمی بوویە، ژبلی بەرهەمێ ئاژەلی ژی، نها ژی ژیانا وان هەر ل سەر بەرهەمێن چاندنێ یە مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و بەرهەمێن ئاڤی، ژ

برنج و کونجی و ماش و هژیر و هنار و تری و خۆخ و...هتد.

خواندگەها (نەهێلانا نەخویندەواریێ) ل سالا (١٩٧٧- ١٩٧٨)ێ هاتیە ئاڤاکرن[٢٨].

## گوندێ جەوسەقێ:

گوندەکێ کاڤلە، ل سالا (١٩٥٠)ێ هاتیە ئاڤاکرن، دکەڤیتە باشوورێ چیایێ بێخێری ب دووراتیا (٤کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، واتایا ناڤێ وی دهێت ب واتایا هندێ کو جهەکێ بچویکە، رووبەرێ گشتی یێ گوندی (١٦٦٣) دۆنەمێن ئەردی نە.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** سنوورێ ترکیایە.

**باشووری:** چیایێ بێخێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ باکرما.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باچیکا.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا کۆچەرانە و بەری گوند بهێتە کاڤلکرن نێزیکی دەهـ مالان لێ بوون، ئەڤ گوندە سالا (١٩٦٢)ێ هاتیە خرابکرن.

### جهێن دیارێن گوندی:

گرێ جەوسەقێ و وارکێ بەرخوی و کەلیێ شکەفتێ.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی ژی کانی بوون، مینا کانییا گوندی، کانییا هێژرا تەحل، کانییا نهالا و جەهنەمێ. ژیانا خەلکی وی ل سەر چاندنا کشتوکالی بوو، ژ گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و رەزان و ژیلی خودانکرنا تەرش و کەوالی.

## گوندێ خراب بابکێ:

گوند ب دووراتییا (١٥کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری، رووبەرێ گوندی (٤٤٠٧) دۆنەمێن ئەردی نە. ناڤێ گوندی ل بەرێ دگۆتنێ (سێ دارکا) و ل سالا (١٩٣٠)ێ ناڤ هاتە گوهارتن و بۆ (خراب بابکێ).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** هەردو گوندێن تلکەبەر و دارهۆزان.

**باشووری:** چم سیمو.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ عومەر ئاڤا (سەر ب ناحیا دەرکارێ).

**رۆژئاڤایی:** عەباسیك- زاخۆ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ (١١) بنەمالان ب ناڤێن: حامد عزێر و رەمەزان ئەحمەد، عەبدولحەلیم گولی، محەمەد میرزا، مەحموود عەبدوللا، عومەر صالح، محو سینی، صەبری عەلی، حاجی نهو، سمو محێ و محو عزێر پێکدهێت، کەڤنترین بنەمال بنەمالا (حامد عزێر)ی یە، دکەڤندا نێزیکی (٦٠) سەرۆك خێزانان ل گوندی هەبوون و و ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٦ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٢٩]. نها تنێ (٢٢) سەرۆك خێزان لێ دژین.

گوند ل سالێن (١٩٦١، ١٩٧٥، ١٩٨٨)ێ هاتیە سۆتن و ویرانکرن، لێ هەر جارا هاتیە کاڤلکرن و بەردان، پشتی چەند سالەکێن کێم ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٧٦، ١٩٩١)ێ جارەکادی ئاڤابوویەڤە و خەلکێ گوندی ڤەگەریاینەڤە سەر گوندی ڤە.

### شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

ئەسحابە و خرابێ عەلی و خراب کورکی و گۆڕستانا گوندی و شکەفتا محمد بەگێ بۆتانی.

### جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی ملا دوزدە ملان، ملا خدرێ، زیرێت ترومبێلێ، گری توب لێدا،

واركوزكێ، وارێ عەرەبا، خراب عەلی، خراب كوركی، زیرێت ئاغای، گرێ گوهیش، گرێ مەدرەسێ، بەرزیرا روخەی، گەرا فاكوێ، جوما خرابكێ، ملا سموی، ملا زەر، نهالا سپیندارا، چەمێ سموی، بانیكا ئەحمێ.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤا گوندی پێكهاتینە ژ رووبارێ خابووری، كانییا گوندی، كانییا دنگی، كانییا محو سمایلا، كانییا چومێ و ئاڤا نهالا سپیندارا.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی د كەڤن دا ل سەر چاندن و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، هەروەسا نها ژی ل سەر بەرهەمێن چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی یە، ژبلی كو هندەك فەرمانبەرن.

ئێكەم جار خواندنگەهـ ل سالا (١٩٨١)ێ و مزگەفت ل سالا (١٩٨٧)ێ ل گوندی هاتینەئاڤاكرن و ل سالا (٢٠١٣)ێ مزگەفتەكا دی ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن، كارەب ژی ل سالا (٢٠٠٢)ێ گەهشتیە گوندی[٣٠].

## گوندێ خوالش:

گوند دكەڤیتە دووراتییا (١٧كم) رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری، ل دووڤ گۆتنان دوڕێن (١٥٠) سالا بەری نها هاتییەئاڤاكرن، ناڤێ گوندی هاتییە كو ئەردێ گوندی یێ تێر ئاڤە و یێ ب بەرەكەتە و دكەڤندا دگۆتنێ (خالص)، ئانكو گوندێ پاقژ ژ بەر هندێ دگۆتنێ خالیش.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندی چەم سیرمو.

**باشووری،** گوندی بێتاسێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندی چەم باهیڤ.

**رۆژئاڤایی،** گوندی دەشت مرا بنی.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ حەفت بنەمالان پێكدهێت، كەڤنترین بنەمال بنەمالا حاجی بەیرانی یە، بنەمالێن دی پێكهاتینە ژ چوار عەشیرەتێن كۆچەران (هاجان و ژیركی و مەهمەدا و ئالان) ژێدەباری بنەمالا (عەڤدوی) كو دبنیاتدا گۆیینە و بنەمالەكا شرنەخی (بنەمالا صالحێ شرنەخی). دكەڤندا هژمارا خێزانان ل گوندی دگەهشتە (٣٥) سەرۆك خێزانان و ژمارا خەلكێ وی نێزیكی (٢١٠) كەسا بوون،، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٠٨ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٣١].لێ نها تنێ مالەك ژبۆ خودانكرنا پەزی لێ هەیە.

خوالشێ گەلەك جاران هاتییە سۆتن و بەردان، هەر جارا هاتییەكاڤلكرن پشتی چەند سالەكێن كێم ئاڤاكرینەڤە، سالا (١٩٦١)ێ هاتییەسۆتن و سالا (١٩٦٢)ێ جارەكادی هاتییەئاڤاكرن. سالا (١٩٦٣)ێ جارەكادی گوند هاتییەسۆتن و بەردان، سالا (١٩٦٦)ێ جارەكا دی هاتییەڤە سۆتن، سالا (١٩٧٠)ێ گوند هاتییە ئاڤاكرن و ل سالا (١٩٧٥)ێ گوند جارەكا دی هاتییە سۆتن و بەردان، داوی جار سالا (١٩٨٧)ێ بوو، پشتی هینگێ گوند نەهاتییەڤە ئاڤاكرن و خەلكێ وی قەستا باژێران كرن.

### شوینوارێن گوندی:

وەكی گۆرستانا گوندی، خرابێ چەمێ ئاشی چونكی بەرێ جهێ ئاشێ گوندی بوو، خرابێ چەمێ سێڤێ، كانی مزگەفت چونكی ئەڤ جهە دكەڤندا جهێ مزگەفتێ بوو.

### ناڤێن جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

ژ جهێن بەرچاڤ ل گوندی ئەڤەنە: (چەمێ ناڤ ئاڤێ، جەمێ سێڤێ، كونا محو خانا، زیرێ سمایل گدلوكێ ئالالێ، سنكە فت ریحان، یانەسەر، كون حەفتیارێ قرمێ رەش، بان كەشكول و رەملك).

### زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

چەند کانی ل گوندی هەنە، وەکی کانیێن (کانی مزگەفت، کانی دەحل، کانی قەرەج، کانیا مەلا یونس، کانیا پۆرا، کانی بالیل، کانیا چەمێ هژی، کانیا رەمللك، کانیا قورمێ رەش، کانی ئاڤ بەر، هەوەسا رووبارێ خابووری د باکوورێ گوندی را دچیت و خەلکێ گوندی مفای بۆ چاندنێ ژ ئاڤا وی وەردگرن.

### زێدەرێ زیارا خەلکێ گوندی:

دەبارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا کشتوکالی و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو. نها ژی تنێ ئێك خێزان ل گوندی ئاژەلی خوداندکەت.

سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتبوو ڤەکرن و سالا (١٩٧٢)ێ مزگەفت ل گوندی هاتینە ئاڤاکرن.

کارەب ژی سالا (١٩٨٠)ێ گەهشتیە گوندی، دگەل جادێ[٣٢].

### گوندێ دەشتمرا سەری:

گوندێ دەشتمرێ دکەڤیتە دووراتییا (١٦کم) رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری، ناڤێ گوندی ژ هندێ هاتییە کو جهێ گوندی دەشتەکا بچویك بوو، سەرەرای کو ئەو جهـ دەشتا میری بوو لەوما ب وی ناڤی هاتییە ب ناڤکرن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** ناڤەندا قەزا زاخۆ.

**باشووری،** گوندێ گر زێوك.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ دە شمرا خوارێ و گوندێ خوالش.

**رۆژئاڤایی،** جەهدا سەرەکییا زاخۆ- دهۆك.

### پێکهاتا گوندی:

ڤی گوندی سێ توخمێن مرۆڤان تێدا دژین، یا ئێکێ عەشیرەتا (کۆچەرانە) کو کەڤنترین عەشیرەتە د گوندیدا، ژبلی (شەرنەخی) و (گوییان) کو ئەو بخۆ خەلکێ باکوورێ کوردستانێ نە و بەری چەند سالا هاتینە و ل گوندی ئاکنجی بووینە، هژمارا خەلکێ وی د کەڤندا (٣٥) سەرۆك خێزان بوون کو دبوونە (٢٤٠) کەسان و ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٤٣ کەس ل هەردو گوندێن دەشتمرا سەری و یا خوارێ دژیان[٣٣]. نها هژمارا سەرۆك خێزانێن وی دگەهیتە (١٩٠) خێزانان و هژمارا خەلکی وی دبنە دەوروبەرێن (١٢٠٠) کەس.

گوندێ دە شمرا سەری چەند جاران ژ لایێ رژێمێن عیراقی ڤە ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٦٧، ١٩٧٥)ێ هاتییە سۆتن و بەردان، لێ هەر جارەکا کاڤل بووی جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن ڤە، هەتا داوی جار ل ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ هاتییە کاڤل و وێرانکرن.

### جهێن بەرچاڤێن گوندی:

ژ جهێن بەرچاڤ د گوندی دا، وەکی: گرێ شێخی، گرێ کەلوك، ئاڤە ریول، وارێ عەلی، گرێ نیسکا، وارێ گولا.

### زێدەرێن ئاڤێ:

گوندی بتنێ کانییەك ب ناڤێ کانیا نهالا مالا عەجەمێ لێ هەیە، لەوما بیرەکا ئیرتیوازی لێ هاتییە کۆلان.

### زێدەرێن زیارا خەلکی گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا کشتوکالی و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، نها ژی هەر ل سەر کشتوکالی یە، ژبلی کو هندەك ژ خەلکێ گوندی بازرگان و مووچەخۆرن.

سالا (١٩٧٩)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و بۆ جارا دووێ سالا (٢٠١٠)ێ دووبارە هاتییە ڤەکرن، سالا (٢٠٠٩)ێ ئاڤ و کارەب ژی گەهشتینە گوندی[٣٤]. نها ئەڤ گوندە کەتییە دناڤ سنوورێ بازێرڤانییا زاخۆ و بوویە تاخەك ژ بازێری.

## گوندێ دێرەبوونێ:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (١٧کم) رۆژئاڤایێ ناحیا رزگاری، رووبەرێ وی (٤٦٠٠) دۆنەمێن ئەردینە، ناڤێ گوندی ب واتایا (گوندێ بابو باپیرا) دهێت، ئەڤ گوندە ل سالا (١٩١٨)ێ ژ ئالیێ مەسیحیانڤە هاتییە ئاڤاکرن.

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ دێرەبوونێ سەر ب ناحیا ئاسهێ (سلێڤانەیی) بوو و ٦٧٥ کەس لێ دژیان[٣٥].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووبارێ خابیری- سنوورێ تورکیا.

**باشووری:** گوندێ بێشابیرێ.

**رۆژهەلاتی:** چیایێ بێخێرێ.

**رۆژئاڤایی:** رووبارێ دیجلە و سنوورێ سوریا (رۆژئاڤا کوردستانێ).

## پێکهاتا جڤاکی:

گوند پێك دهێت ژ مەسیحی و ئێزدیان، مەسیحی چوار بنەمالن، ئەو ژی و بنەمالێن (خانو تۆمو) کو وان گوند ئاڤاکرینە و کەڤنترین بنەمالە ل گوندی، ژبلی بنەمالێن (توما عەمسو، بروهو، پولو، بارنجی)، یێن ئێزدییان ژی دو بنەمالن کو پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ هاتینە گوندی و پێکهاتینە ژ هەردو بنەمالێن (سەمیر قادر)و (قاسم مصکو)، دکەڤندا ژمارا سەرۆك خیزانا ل گوندی نێزیکی (٩٠) خێزانان بوون و ژمارا خەلکێ وی دگەهشتنە (٥٤٠) کەسان، نها هەژمارا سەرۆك خێزانێن گوندی (١٥٠) مالێن مەسیحی نە ژبلی کو نێزیکی (٣٠٠) سەرۆك خێزانێن ئێزدی ل گوندی ئاکنجی بووینە.

گوند چەند جاران ل سالا ١٩٣٣ێ، و ١٩٦٦، و ١٩٧٥)ێ ژ لایێن رژێمێن عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن و بەردان و پشتی هەر کاڤلکرنەکێ جارەکادی گوند ئاڤابوویەڤە.

## دێرەبوون د دیرۆکێدا:

دێرەبوون ئێك ژ گوندێن هەرە کەڤن و دیرۆکییە ل دەڤەرێ، ل دووڤ بەلگەنامەیێن مۆزەخانا عیراقی ئەڤ گوندە ل سەر دەمێ ئاشووری ٩١١- ٦١٢ پ ز هەبوویە و د چەرخێن پشتی ئاشووریدا چەندین زێدەراندا ئاماژە ب گوندی و ئاش و دێر و جهێن گوندی هاتییەکرن. زێدەباری ڤێ چەندێ ل سالا ١٩٥٥ێ ژ ئالیێ رێڤەبەرییا شوینوارێن عیراقێ ڤە گرێ دێرەبوونێ و گۆرستانا وێ وەك جهێن شوینەواری هاتینە توومارکرن[٣٦].

## ئاڤ و جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

چەند جهێن دیار و ب ناڤ ل گوندی هەنە، وەکی کانییا دێرەبونێ، بانێ نێرگزێ، بانێ دێرێ، ئاشێ سەری یێ هەڤرانی، ئاشێ نیڤێ یێ تەحینێ، ئاشێ خوارێ کو وی ژی تەحین دروستکر.

## زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

چەند کانی وەکی ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، وەکی کانییا دێرەبونێ، کانییا بازیدێ، کانییا مام رەڤان، هەروەسا رووبارێ خابووری د رەخێ گوندی رادبووریت و خەلکێ گوندی سپیندرا ل بەر ئاڤا وی دچینن.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ل بەرێ ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، نها ژی خەلکێ وی چاندنێ دکەت و هندەك ژی فەرمانبەر و بازرگانن، و هندەك ل کومپانیا نەفتی (DNO) کاردکەن.

سالا خواندنێ ١٩٥٤- ١٩٥٥ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، د ناڤبەرا ١٩٦١- ١٩٧٠ێ خواندنگەهـ هاتییەگرتن و ل ١٩٧٠/١٠/١ێ سەر ژ نوو هاتییەڤەکرن[٣٧]. ل سالا (١٩٩٥)ێ خواندنگەهەکا دی ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن، و خواندنگەها ئامادەیی ژی ل سالا (٢٠٠٥)ێ هاتییە ئاڤاکرن. دیسان چەند خزمەتگوزارییێن دی ل گوندی هەنە، وەکی کارەب ل سالا (١٩٩٢)ێ گەهشتییە گوندی و سالا (٢٠٠٦)ێ ئێستگەهەك دروست کرن،

و نەخۆشخانە ل سالا ( ١٩٩٨)ێ ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن و پرۆژێ ئاڤێ ژی ل سالا (٢٠٠٣)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن.

## گوندێ دولا:

گوند دكەڤیتە بەرچیایێ سپی ب دووراتییا (٢٥كم) رۆژهەلاتێ مەلبەندێ ناحیێ، وەسان دهێتە ڤەگێران كو گوند بەری (٣٠٠) سالەكان سەردەمێ میرگەها بەهدینان هاتبیتە ئاڤاكرن، ناڤێ گوندی ژ ناڤێ دۆلا ب واتایا (دۆل و نهال) هاتبیت.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** چیایێ سپی.

**باشووری:** گوندێ دێرینكێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئەرمشتێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێزهێ.

### پێكهاتا جڤاكی:

گوندی ژ هەردو عەشیرەتێن كۆچەر و گۆییان پێكدهێت، هەردو عەشیرەت دكەڤندا ل ناڤ سلێڤانەیان ژیانە، دكەڤندا نێزیكی (٢٠) سەرۆك خێزان ل گوندی هەبوون و ژمارا وان دگەهشتنە (١٥٠) كەسان، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٧١ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٣٨]. نها گوند خرابەیە و خەلكێ وی قەستا باژێران كرییە و نەزڤرینە سەر گوندێ خۆ.

گوند دو جارا هاتییە سۆتن و بەردان، داوی جار ل سالا (١٩٨٨)ێ بوو، پشتی هینگێ نەهاتییە ئاڤاكرن.

### شوینوار و جهێن كەڤنار:

دگوندی دا هندەك شوینوار و جهێن كەڤنار لێ هەنە وەك: شكەفتا حجی خامێ، شكەفتا حجی عەیشێ،شكەفتا حجی حسینی،شكەفتا حەسەنی، بەری ئەحموی حەجوی و گۆڕستانەك ل گوندی هەیە دبێژنێ (گۆڕستانا سەید عەبدولرەحمانی).

### ناڤ و جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

وەك: زەڤیا تەراشی، زەڤیا بەستێ، زەڤیا عەڤدی و هەوەسا جهێن رونشتنێ وەكی (كۆلانا گوندی و مەیدانۆك).

### زێدەرێن ئاڤا گوندی:

گوندی چار كانیك لێ هەنە ئەو ژی: كانییا سەرەكانیێ، كانییا تەزی، كانییا پیرویێ و كانییا حجی عەیشێ.

ژیارا خەلكی گوندی بەرێ ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و چاندنێ بوو، ب تایبەت یێن دێم مینا: گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و....

سالا (١٩٧٠)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتە ڤەكرن و سالا (١٩٨٠)ێ كارەب گەهشتیە گوندی[٣٩].

## گوندێ دێرینك:

گوندەكێ كاڤلە، سالا (١٩٢٠)ێ هاتییە ئاڤاكرن، دكەڤیتە دووراتییا (٣٠كم) رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری سەر لێڤا خابویری بەرامبەر لیڤێ. رامانا ناڤێ گوندی ژ پەیڤا دێر هاتییە، رووبەرێ گشتی یێ گوندی دگەهیتە (١٢٨٢) دۆنەمێن ئەردی.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ بێزهێ.

**باشووری:** گوندێ تمر ئاڤا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بەركەڤر خابور.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دولا.

### پێكهاتا جڤاكی:

گوند ژ عەشیرەتا سندییانە، (١٥) مالن ژ بنەمالا (حەسێ) و بنەمالا ( سەیدێ).

گوند ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٥، ١٩٦٧، ١٩٧٥) هاتییە سۆتن و وێرانكرن، داوی جار ژی كەتە بەر هەوێن ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ گوند ب تمامی هاتییە وێرانكرن.

### ناڤ و جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

گرێ باسەك، چەمێ بنێ گوندی، زەڤیا پشتا چنینكێ، حەویكێ بنێ گوندی، شكەفتا ژاژی، دیرەكا كەڤن، شكەفتا گوندی.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

گوندی دو كانی ب ناڤێن: كانیا چنارێ و نهالا گوندی هەنە، هەروەسان مفای ژ رووبارێ خابویری وەردگرن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا خەلكی ل سەر جۆتیاریێ بوو، گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و برنج دچاندن و تەرش و كەوال ب خودان دكرن، هەر وەسان مریشك و مێشێن هنگڤینی ژی ب خودان دكرن.

سالا (١٩٨٧)ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتیە ڤەكرن، ئەو ژی ل سالا (١٩٨٨)ێ دگەل گوندی هاتە وێرانكرن[٤٠].

## گوندێ شیناڤا:

شیناڤا ب دووراتیا (٤كم) دكەڤیتە رۆژئاڤایێ ناحیا رزگاری، ناڤێ گوندی ژ شینكاتیا ئەردێ وێ هاتیە، چونكی ئەردێ وی هەردەم ب گیایێن سرۆشتی یێ شین بوو و ئەو شینكاتی بوویە ناڤێ گوندی ژی.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** هەڤسنوورە دگەل باكوورێ كوردستانێ.

**باشووری،** چیایێ بێخێری.

**رۆژهەلاتی،** گوندی گوندێ باجیكا.

**رۆژئاڤایی،** گوندی گوندێ هتیانێ.

### پێكهاتا جڤاكی:

گوندێ شیناڤا ژ دو بنەمالان: بنەمالا عزێز ئەحمەد پس ئاغا كو كەڤنترین بنەمالا گوندی یە و بنەمالا فەرمان ئیسماعیل مال مەلا پێكهاتییە، هەر د كەڤندا و هەتا نها تنێ موسلمان لێ ژیاینە. دكەڤندا نێزیكی (٢٠) سەرۆك خێزان ل گوندی دژیان كو هەژمارا وان نێزیكی (٢٠٠) كەسان بوون، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٨ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٤١]. لێ نها نێزیكی (٤٠) سەرۆك خێزانانن و هەژمارا خەلكی وی نێزیكی (٢٨٠) كەسانە.

گوندێ شیناڤا پێنج جاران ل سالێن (١٩٦١، ١٩٦٣، ١٩٦٥، ١٩٧٥) هاتییە سۆتن و بەردان و داوی جار ژی ل سالا (١٩٨٨)ێ بوو و خەلكێ گوندی قەستا دەڤەرا سندییان كر و سالا (١٩٩٢)ێ ل پشتی سەرهلدانێ خەلكێ گوندی جارەكادی قەستا گوندێ خۆ كرنەڤە گوند ئاڤاكرنەڤە.

### شوینوار و جهێن كەڤنارێن گوندی:

ڤی گوندی چەند شوینوار لێ هەنە، وەكی شكەفتا گەلێ ئاوسكێ، كەلا شیناڤا و گۆرستانا شیناڤا.

هەروەسا جهێن بەرچاڤ ل گوندی هەنە، وەك: گۆرستانا گولخانا شیناڤا، دەرئاڤێ ماسەكا، گرێ ماشا، زیرێ حەمە تولی. ئاڤارێن گوندی، گەرماڤا، تی عەمرێ، شێخ مستەفا، دارێن شیناڤا، كو ل بهاران رێژەیەكا زۆرا خەلكێ دەڤەرێ ب گشتی و یێ زاخۆ ب تایبەتی قەست دكەنە وان داران بۆ سەیرانا.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندێ ل بەرێ چەند كانی بوون، وەكی كانیا گول خانێ، كانیا كەركا شیناڤا، كانیا گوندی، كانیا گوران گەهێ، كانیا دەروێشكێ، كانیا مەلا حاجی، لێ نها ئەڤ كانی یە هەمی هشك بووینە و نها پتر پشتبەستنێ ل سەر بیرێن ئیرتیوازی دكەن.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ وی:

د كەڤندا ژیانا وان ل سەر چاندنێ و خودانكرنا مەرومالاتی بوو، نها ژی ل سەر بازرگانیێ و چاندنێ و مەرومالاتی یە.

سالا (٢٠٠٥)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاکرن و کارەب ژی هەر ل هەمان سال گەهشتییە گوندی و مزگەفت ل سالا (٢٠١٣)ێ ژ لایێ گوندیان بخو ڤە هاتییە ئاڤاکرن[٤٢].

## گوندێ کانی روهال:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (١٥کم) ژ ناڤەندا ناحیێ، ئاڤاکرنا وی بۆ سێ پشتا دزڤریت، ناڤی گوندی ژ ناڤێ کانییەکێ هاتییە کو ب ڤی ناڤی ل ڤی گوندی هەبوو.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گەلیێ زاخۆ.

**باشووری:** زانکۆیا زاخۆ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ حەسەن ئاڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سەلکا.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا کۆچەران (زێوکی)نە. ژمارا وان ل بەرێ (٥٠) کەس بوون و ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٦ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٤٣]. نها هژمارا وان دگەهیتە (٤٠٠) کەسان.

ژ ئەگەرێن نەتەوەیی و سیاسی گوند تا نها نەهـ جاران هاتییە سۆتن و تالانکرن.

### ژ جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

گرێ گوسا، گەلیێ دارە صورێ، ژبلی کو کانیەك ژی ب ناڤێ (کانییا روهالێ) ل گوندی هەیە، هەر وەسان گەلەك شکەفتێن دێرین ل چیای هەنە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکی گوندی:

د کەڤندا و هەتا نها ژی ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ و ب تایبەت یا گەنمی بوو، هەر وەسان تەرش و کەوال ژی ب خودان دکرن.

هێلا کارەبێ ژی ل سالا (٢٠١٤)ێ گەهشتییە گوندی[٤٤].

## گوندێ گر زێوك:

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩٣٥)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ب دووراتییا (٢٤کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری، ناڤی گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە کو هەمی رەخێن گوندی گرن.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ خوالش.

**باشووری:** گوندێ حسن ئاڤا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێتاسێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دەشتمرێ

### پێکهاتا جڤاکی:

گوند ژچوار بنەمالان پێکدهێت: یا ئێکێ (بنەمالا کەجەلا)، کەڤنترین بنەمالە ل گوندی و ڤێ بنەمالێ گوند ئاڤا کریە، ژ هەردو بابکێن (کالو، حاجو) پێکدهێت، دیسان سێ بنەمالێن دی بنەمالا قادو و بنەمالا شاهین و بنەمالا فندی ل گوندی هەنە. ئەڤ چوار بنەمالە ژ ژ ئویجاخا کۆچەرانە و دکەڤندا ژ دەڤەرا میرا هاتبوون، بەری دوا خرابکرنا گوندی نێزیکی (٢٠) سەرۆك خێزانا ل ڤی گوندی دژیان کو هەژمارا وان دگەهشتە (١١٠) کەسان.

گوندێ گر زێوك پێنج جارا ژ ئالیێ رژێمێن عیراقی ڤە هاتییە سۆتن و راکرن، پشتی هەر جارەکا هاتییە وێرانکرن، گوند جارەکادی ئاڤاکرینەڤە و خەلکێ وی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ و داوی جار ژی ل ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ بوو کو گوند خراب بووی و هەتا نها مایە چۆل.

### جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

چەند جهێن بەرچاڤ ل گوندی هەنە، وەکی کتنیا میرخان، وارێ گەمو، گرێ قەسرێ، چالا مەزن، قونتارا.

### ژێدەرێن ئاڤێ:
د گوندی دا چەند كانی هەبوون، دو ژ وان دناڤ گوندی دا بوون ب ناڤێن (كانییا ژوری و كانییا ژێری)، هەوەسا هندەك كانیێن دی ژی هەبوون وەكی كانییا میرخان، كانییا حەسو.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:
خەلكێ گوندی ل بەرێ پتر جۆتیار بوون، ژ بەر كێمییا ئاڤێ خەلكێ وی پتر چاندنا دێم دكرن، لێ نها خەلكێ گوندی قەستا باژێران كرینە و هندەك ژ خەلكێ وی ل وەرزێن چاندنێ دهێنە گوندی و ل زڤستانان ڤەدگەرێنەڤە باژێری.

سالا (١٩٧٨)ێ بو ئێكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاكرن و ل ئەنفالان دگەل خرابكرنا گوندی ئەو ژی هاتە وێرانكرن و چ خزمەتگوزاریێن دی نەگەهشتینە گوندی كو گوند ئاڤا ببیتەڤە[٤٥].

## گرك سندی یا سەری:
گوند د ناڤ زیران دا هاتییە ئاڤاكرن، دكەڤیتە دووراتییا (٣٠كم) ژ سەنتەرێ ناحیا رزگاری، ناڤێ گوندی یێ ژ هندێ هاتی كو گرەك نێزیكی جهێ لێ هاتییە ئاڤاكرن هەبوو.

### سنوورێن گوندی:
**باكووری،** گوندێ دەشتا سندیا.

**باشووری،** گوندێ دارهۆزان.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ عومەر ئاڤا (ناحیا دەركارێ).

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گركا سندی یا خوارێ.

### پێكهاتا جڤاكی:
گوند ژ ئێك مالبات ژ عەشیرەتا سندیان پێكهاتییە، د بەرێ دا (٢٠٠) كەس ل گوندی دژیان و نها (٦٠) كەسن.

**گركێ سەری**



ئەڤ گوندە دو جاران ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٧٤) هاتییە سۆتن و وێرانکرن.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

تنێ کانیا گوندی یە کو دکەڤیتە دناڤبەرا زیراندا.

ژیارا خەلکێ هەر دکەڤندا و هەتا نها ژی ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و نۆکان و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە.

سالا (٢٠٠٥)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاکرن و ڤەکرن، کارەب ژی سالا (١٩٨١)ێ گەهشتییە گوندی[٤٦].

## گرک سندی یا خوارێ:

گوندێ گرک سندی د بەرێ دا و هەتا پێکهاتنا (١١ ئادارا سالا ١٩٧٠) دا سەر ب ناحیا شەرانش ڤەبوو و پشتی ڤێ میژوویێ ئێخستنە سەر ب ناحیا رزگاری ڤە، گوند دکەڤیتە دووراتییا نێزیکی (٤کم) ژ ناحیا دەرکارێ. رامانا گوندی ژ هندێ هاتییە کو گرەکێ بلند دکەڤیتە ناڤ بەینا (دەشتێ سندیا) و چیایێ (کێرە) دا، ئەو ژی جهێ بهێنڤەدانا کاروانییا بوو دەمێ ژ زاخۆ بۆ مەرەمێن بازرگانی دهاتنە دەڤەرێ و چونکی گوند هەر دکەڤندا ژ عەشیرەتا سندیان بووینە لەوما ئەو پەیڤ ژی هاتییە سەر و بوویە (گرک سندی).

## پێکهاتا جڤاکی:

خەلکێ گوندی هەمی خەلکێ گوندی (پسئاغانە) و هەمی ئێك عەشیرەتن، هژمارا خەلکێ گوندی کەڤن (٢٠) مال بوون و نها (٢٠٠) مالن.

گوند بۆ جارا ئێکێ ل سالا ١٩٦١ێ هاتییە سۆتن، جارا دووێ ژی سالا ١٩٧٤ێ گوند هاتە بەردان و خەلکێ وی چوونە مارسیسێ، سالا ١٩٩١ێ خەلکێ گوندی چوونە ترکیا.

گرکێ خوارێ



**جهێن ناڤدارێن گوندی:**

نهالا تیێ، مێرگا خەنگەل، چەمێ رشك، خنگزە، چاهێرە، چەم عەرەبا.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی ژی (کانیا نهالاتیێ، کانیا گەرمك) بوو، نها ژی بیرەکا ئیرتیوازی یە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

کەڤن و نها ژی هەر ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و برنج و نیسك و نۆکان و ب خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا (١٩٧٧)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و کارەب هەر ل هەمان سال گەهشتییە گوندی[٤٧].

## گوندێ بێتاسێ:

گوندەکێ کەڤنارە و دهێتەگۆتن بەری (٥٠٠) سالەکان هاتییە ئاڤاکرن، دکەڤیتە دووراتییا (٢٠کم) رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیێ، رووبەرێ گشتیێ گوندی (٤٤٠٠) دۆنەمێن ئەردی.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ خوالش.

**باشووری:** چیایێ بێخێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێزهە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ حەسەن ئاڤا.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند پێکدهێت ژ بابکێن: حەسکا، مەلەکا، کۆچەر، شەمسا، هەموو، سەید. هەمی بابك سلێڤانەیی نە و کەڤنترین بابك ل گوندی بابکێ (هەموو) یە، کو بەری هەمیان قەستا گوندی یا کری. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٦٣ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٤٨].

گوند ل سالێن (١٩٦١، ١٩٦٦، ١٩٨٥، ١٩٨٨)ێ هاتییە خرابکرن و سۆتن و پشتی سەرهلدانێ جارەکادی گوندیێا قەستا گوندێ خۆ کرییە و گوند ئاڤاکرینە ڤە.

**شوینوار و جهێن بەرچاڤ ل گوندی:**

گری گوند، گری بەندیا، نهالا کورکا، نهالا لەند بابێ، بارزانێ جەمێ مامەرێ، بان شەتکاو، شکەفتا قەپان، گەلیێ قەپان، کەلها هجر مەمکی، گەلیێ هجر مەمکێ، بارزانکی کو دکەڤن دا جهێ گوندەکی بوو.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

چەند کانی ل گوندی هەنە وەك: سەرەکانیا گەلی، کانیا گەرنك، کانیا سرکێ، کانیا هجر مەمکێ، کانیا قەپان، کانیا کەلها مارا، کانیا لەند بابێ، کانیا بان شەدکاو.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ل بەرێ ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنێ بوو، مینا نیسك و نۆك و گەنم و جەهان و نها ژی ئەو چاندن ل گوندی دهێتەکرن، هندەك ژی ژ خەلکێ گوندی فەرمانبەرن.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا خواندنێ ١٩٤٠- ١٩٤١ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، هەتا مەها شباتا ١٩٦٢خواندن ل ڤێ خواندنگەهێ یا بەردوام، بەلێ پاشتر ژ ئەنجامێ روودانێن دەسپێکا شۆرشا کوردستانێ هاتییەگرتن، ل سالا ١٩٦٤ێ دوبارە هاتییەڤەکرن، ل مەها ئادارا ١٩٦٥ێ جارەکا دی هاتییەگرتن، ل سالا خواندنێ ١٩٦٨- ١٩٦٩ێ جارەکا دی هاتییەڤەکرن، هند پێڤەنەچوویە جارەکا دی هاتییەگرتن، هەتا بۆ جارا داویێ پشتی پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ ل ١٩٧٠/١٠/١٩ێ سەر ژ نوو هاتییەڤەڤەکرن[٤٩]. و قۆناغا ناڤنجی ژی ل سالا (١٩٧٨)ێ هاتییە ڤەکرن، مزگەفت ژی ل سالا (١٩٠٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن و پشتی خراب بووی جارەکادی ل سالا (١٩٧٧)ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە و

سالا (٢٠١٥)ێ ژ لایێ گوندیان ڤە هاتیە نویژەنکرن، سالا (١٩٧٨)ێ کارەب ژی گەهشتیە گوندی و ل هەمان سال جادە ژی بۆ گوندی هاتیە ڤیرکرن[٥٠].

## گوندێ هتیان:

هتیانێ ب دووراتیا (٦)کم دکەڤیتە رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ. ل دووڤ ڤەگێرانا خەلکێ گوندی ئاڤاکرنا گوندی بۆ شەش پشتان دزڤریتەڤە، رووبەرێ گشتیێ گوندی (١٩٠٧) دونەمێن عەردییە.

### سنوورێن گوندی:

**باکوور:** رووبارێ خابویری یە و ئالیێ دی یێ رووباری باکوورێ کوردستانێ یە.

**باشوور:** چیایێ بێخێری

**رۆژهەلات:** گوندێ شیناڤا

**رۆژئاڤا:** گوندێ تیان

### پێکهاتا گوندی:

ژ دو بنەمالێن سەرەکی بنەمالا حەسەن عەلی ستا و بنەمالا حەسەن عومەر خاتینا پێکهاتییە، بەری گوند ب یەکجاری خراپببیت (١٩) سەرۆکخێزان بوون و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥١] هەمووژی ژ عەشیرەتا زێباری نە.

### شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

کەلها کافرا، قەسرکا سێڤێ، شکەفتا شێخ عەلی، گورستانا دارکێ تەنێ و گورستانا سەید محەمەدی.

### جهێن ناڤدار و بەرچاڤێن گوندی:

کەلیێ کەلهی، کەلیێ مالا، کەلیێ زێوێ، گرێ ماشا، گرێ زیرکێ ملای، زەڤیا مزگەفتێ، نیرێ بەران، ئاخ شینکێ، زەڤیا خزانا، سەرزیرکا، زەڤیا کیرکێ و زەڤیا مەیدانێ.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

کانیا گەلیێ مارا، کانیا ژێری، کانیا عەبو رەمۆیا، کانیا گوبنێ، کانیا کەرکێ، کانیا تەزکێ و کانیا زەڤیا مزگەفتێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

د دەمێ خۆدا خەلکێ گوندی مژوولی کارێ چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوون و نها ژی گوندێ بەردایە و خەلکێ وی ل باژێری دژین.

د سەردەمێ شۆرشێن کوردستانێ دا ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٥، ١٩٧٥، ١٩٧٦ و ١٩٨٨ێ گوند هاتیە سۆتن و خرابکرن، هەرجار خەلکی گوندێ خۆ ئاڤاکرییەڤە و لێ نیشتەجێ بووینەڤە، لێ داوی جار سالا ١٩٨٨ێ گوند هاتییەڤەخراپکرن و هێژ نەهاتییەڤە ئاڤاکرن.

سالا ١٩٧٣ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، د شەرێ ناڤبەرا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ دگەل بەردانا گوندی ئەو ژی هاتەگرتن، پشتی داویهاتنا شەری هاتەڤەکرن، بەلێ دگەل داوی جارا خرابکرنا گوندی ئەو ژی هاتەخرابکرن[٥٢].

## گوندێ تیان:

گوندەکێ کاڤلە و هەتا نها نەهاتیە ئاڤاکرن، دکەڤیتە رۆژئاڤایێ باژێرێ زاخۆ، ب دووراتیا (٧کم) ژ ناحیا رزگاری. ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتیە ژ بەر کو دارێن تویان لێ د زۆربوون.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** هەڤسنوورە دگەل ترکیا.

**باشووری:** چیایێ بێخێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ هێتیان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ دێرەبوونێ.

### پێکهاتا جڤاکی:

گوند ژ چوار مالباتان ب ناڤێن: (بنەمالا سەلیمێ

نازێ، بنەمالا محەمەدی، بنەمالا سێ سەر، بنەمالا رەحیم رەشید) پێکدهێت. ژمارا خەلکێ گوندی ل بەرێ نێزیکی (١٠٠) کەسان بوون و و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٢٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٣].

نها پترن ژ (٥٠٠) کەسان، لێ هەمی ل باژێران دژین و کەس ل سەر گوندی نینە.

گوند چەند جاران ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٧٣)ێ هاتییە سۆتن و بەردان و سالا (١٩٧٥)ێ خەلکێ گوندی هاتینە راگوهاستن بۆ گوندێ (ئاڤ گەنیێ).

## ژ شوینوار و جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

تەحتۆکا، حزبەی، بێدەر، ئاخ شینك. گەلیێ زێوێ، گەلیێ مالا، گەلیێ هشك، گەلیێ فەلا، گەلیێ تەنگ، گەلیێ میرا، گەلیێ کێرات، گەلیێ مێشێ، ئاخ سپیکێ، ئاشکێ مەسیحایێ، زیرێ مەسیحایێ، شکەفتا ناووسکا، شکەفتا برووشینك و چەند شکەفتێن دی، ژبلی مەرقەدێ سەید محەمەدی.

## زێدەرێن ئاڤێ:

چەند ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، وەکی: کانییا دووریشێ، کانییا عەمەر، کانییا مێرگێ، خەیمەل، نهالا مەیدانێ، کانییا دارا بەنێ، کانییا شکەفتێ، کانییا تیکێ کانیکا ژووری، کانیکا ژێری و ژبلی بیر ئیرتیوازیەکێ کو سالا (٢٠١٣)ێ هاتییە کۆلان.

## زێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

ل بەرێ و نها ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەت چاندنا گەنم و جەهـ و دارێن فێقی و گەلەکێن دی، ژبلی خودانکرنا تەرش و کەوالی.

کارەب ژی سالا (٢٠١٣)ێ گەهشتییە گوندی[٥٤].

# گوندێ چم کویرکی:

وەکی دهێتە گۆتن گوند بەری (١٢٠) سالان هاتییە ئاڤاکرن، دکەڤیتە دووراتییا (٤کم) رۆژهەلاتێ ناحیێ، ناڤێ گوندی ژ هندێ هاتییە کو بەری بهێتە ئاڤاکرن چەمەکێ کویر لێ هەبوو و پشتی گوند هاتییە ئاڤاکرن ئەڤ ناڤە ل سەر هاتە دانان، گوند ل سەر رووبەرێ (٤٤) دۆنەمێن ئەردی هاتییەئاڤاکرن و رووبەرێ گوندی هەمیێ (١٨٦٤) دۆنەمێن ئەردینە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ چەم مشکو.

**باشووری:** گوندێ خێلەخ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێدارێ.

**رۆژئاڤایی:** کۆمەلگەها باکرمان.

## پێکهاتا جڤاکی:

گوند پێکدهیت ژ ئێك بابك، ئەوژی (بابلا) یە ژ عەشیرەتا سلیڤانەیان و ڤی بابکی گوند ئاڤاکرینە، دکەڤندا (٣٧) خێزان ل گوندی هەبوون و نها گوند کاڤلە، جهێ گوندی ل سەر دەمێ حکومەتا عیراقێ مەیدانا ترومبێلێن بارهەلگر. ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٥].

گوند حەفت جاران هاتییە سۆتن و بەردان، داوی جار ژی سالا (١٩٧٥)ێ بوو، پشتی هینگێ خەلکێ گوندی هندەکان قەستا باژێران کرن و هندەکان ژی قەستا باکوورێ کوردستانێ کرن و هندەك ژی ل کۆمەلگەهان هاتینە ئاکنجیکرن و چەند کۆمەلگەهـ ل سەر عەردێ وی هاتینە دروستکرن، وەکی کۆمەلگەهێن چەم کورك و خێلەخ و باکرمان.

## جهێن بەرچاڤێن گوندی:

چەمێ شێلێ و بەرگەر و بەئاڤیك و حەویك وملا زەر و خوی رێزوك و چەمێ مەلا حسنی و ئەردێن قەرام و ناڤ جوو.

## زێدەرێن ئاڤێ:

خەلکێ گوندی بۆ ئاڤێ تنێ پشتگەرمێن رووبارێ خابویری بوون.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ل بەرێ ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و چاندنا كشتوكالی بوو، ب تایبەت یێ دێم، مین نۆك و گەنم و جەهـ و نیسكان و ژبلی برنجی ژی[٥٦].

## گوندێ باچیكا:

گوندەكێ كەڤنە و دیرۆكا وی دزڤریتەڤە دەمێ ئۆسمانییان، دكەڤیتە دووراتییا (١كم) ژ سەنتەرێ ناحیا رزگاری رامانا ناڤێ گوندی یێ ژ (بایێ چیچكا) هاتی، رووبەرێ گشتی یێ گوندی دگەهیتە (٣٧٧٣) دۆنەمێن ئەردی.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوند هەڤسنووره دگەل توركیا.

**باشووری:** چیایێ بێخێری.

**رۆژهەلاتی:** كۆمەلگەها ئیبراهیم خەلیل.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شیناڤا.

### پێكهاتا جڤاكی:

گوندی سێ عەشیرەت لێ هەنە، ئەو ژی: بەگ كو كەڤنترین بنەماله ل گوندی و گوند ل سەر دەستێ وان هاتییە ئاڤاكرن، زێدەباری كۆچەر و شرنەخیان، د كەڤندا (١٠٠) خێزان ل گوندی هەبوون و ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٧١ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٧]. نها (٢٣٥) خێزان لێ هەنە.

گوند ل سالێن (١٩٦٣، ١٩٦٧، ١٩٧٥، ١٩٨٨) هاتییە سۆتن و بەردان.

### شوینوار و جهێن ناڤدار ل گوندی:

شكەفتا توبەل، گۆرستانا شێخ خدری، نهالا جەهنەمێ، گركێ ژن مریا، چەم كافر، گرێ زرتەكا، گەلیێ بەرازا.

### ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

چەند كانی نە، مینا: كانییا زەلامان، وكانییا ژنان، هەروەسا رووبارێ خابویری ژی دسنوورێن گوندی را دبووریت.

ژیارا خەلكێ گوندی د كەڤندا ل سەر چاندنێ و خودانكرنا مەروماڵاتی بوو، نها ژی هەمان ژێدەرێن ژیانێ نە، ژبلی كو هندەك مووچەخۆرن.

ئێكەم خواندنگەهـ سالا (٢٠٠٠)ێ ل گوندی هاتییە ئاڤاكرن، مزگەفت ژی ل سالا (١٩٩٥)ێ هاتییە ئاڤاكرن و كارەب سالا (١٩٩٤)ێ گەهشتیە گوندی[٥٨]. نها ئەڤ گوندە كەتییە دناڤ سنوورێ بازێرڤانییا رزگاری و بوویە تاخەك ژ سەنتەرێ ناحیێ.

## گوندێ چەم باهیڤ:

ئەڤ گوندە ل سالا (١٩١٥)ێ ژلایێ (محو شاهینی) ڤە هاتییە ئاڤاكرن، دكەڤیتە دووراتییا (٢٥كم) رۆژهەلاتێ مەلبەندێ ناحیێ، رووبەرێ گشتی یێ گوندی (٢٦٠٠) دۆنەمێن ئەردی نە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندی تاوكی.

**باشووری:** گوندی بێتاسێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندی بەركەڤرا خابووره.

**رۆژئاڤایی:** گوندی خوالش.

### پێكهاتا جڤاكی:

گوند پێكهاتییە ژ حەفت بابكان ب ناڤێن (رەمەزان رەشید، خالد محەمەد عەلی، رەمەزان عەلی خەلو، صال عەڤدی، رەمەان مەولود، سلێمان شەهباز، محو شاهین) و یێ داویێ گوند ئاڤا كریە، دكەڤندا (٣٥) سەرۆك خێزان ل گوندی هەبوون و و ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١١٤ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٥٩] نها تنێ مالەك ل گوندی مایە و یێن دی كۆچەر بوون.

گوند دو جاران هاتییە خرابكرن و سۆتن، جارا ئێكێ ل سالا ١٩٦٤ێ كو ل سالا ١٩٦٥ێ جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن ڤە و جارا دووێ سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە كاڤلكرن و خەلكێ وی قەستا بازێران كرینە.

**شوینوارێن گوندی:**

شکەفتا کون کافرێ، گۆڕستانا گوندی، گۆڕستانا چەمێ دارێ.

جهێن ناڤدار ژێ: گرکێ گۆڕستانا گوندی، نهالا گەلی ستنگی، گەلوکێ هەمێ، گەلوکێ زاخۆ، کاڤل کوسکا، چەمێ دارێ.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

کانی ستنگێ و رووبارێ خابویری بوون.

ژێدەرێن ژیارا خەلکی ژێ ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو.

سالا (١٩٧٠)ێ بو ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتیە ئاڤاکرن.

## گوندێ خراب دارێ:

ب دووراتییا (١٠کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری، وەکی دهێتەگۆتن دوژێن (٥٠٠) سالەکانە ل سەر دە ستێ (شەمو حسو) هاتییە ئاڤاکرن، رووبەرێ گوندی (١٣١١) دۆنەمێن عەردینە. ناڤێ گوندی ژ هندێ هاتییە کو جهێ گوندی بەری بهێتە ئاڤاکرن گەلەك دار ل جهێ وی هەبوون و گوند ب هندێ هاتییە ب ناڤکرن.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ بێدارێ.

**باشووری،** چیایێ بێخێری.

**رۆژهەلاتی،** گوندی صەلکا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ خێلەخێ.

**پێکهاتا جڤاکی:**

گوند ژ ئێك بابك ئـەوژی (شـەمو حـەسو) پێکهاتییە کو وی گوند ئاڤاکرییە، دکەڤندا نێزیکی (٢٦) سەرۆك خێزان ل گوندی هەبوون و و ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٠]. نها گوند کاڤلە و خەلکێ گوندی قەستا باژێران کرینە.

گوند سێ جاران هاتییە سۆتن، سالا ١٩٦٣ێ ژئالیێ لەشکەرێ رژێما سوریێ ڤە هاتییە سۆتن، هەروەسا ل سالا ١٩٦٥ێ جارەکادی ژ ئالیێ لەشکەرێ عیراقێ ڤە هاتییەسۆتن، و سالا ١٩٦٧ێ هاتییە خرابکرن و هێژ خەلکێ گوندی نەزڤرییەڤە گوندی.

**شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:**

مزگەفتا حەجی سلو، نهالا خوید، گەر خەزێن، بانا سیسی.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

کانییا گوندی و کانییا گەر خەزێمی نهالا بنارێ زیارەتی یە.

ژیارا خەلکێ گوندی دکەڤندا ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، و جنیك ژێ ل گوندی هەبوون و جۆرێن فێقی و داروباری و دەرامەتی لێ هەبوون، وەکی سپیندار، خۆخ، باجان، هنار، مژمژ، نۆك، گەنم و... گەلەکێن دی.

نها پرۆژەکێ ئاڤێ ل سەر دەستێ کەسەکێ خەلکی گوندی ل سەر رووبەرێ رووبەرێ (١کم) درێژی (٥٠٠م) فرهی هاتییە چێکرن[١١].

## گوندێ خێلافتێ:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٢٥کم) رۆژهەلاتێ ناحیێ، وەکی دهێتە گۆتن بەری (٢٠٠) سالان هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ گوندی ژ هندێ هاتییە کو ئەردێ گوندی بۆ چاندنێ یێ باشە و ناڤ ژ بەرەکەتا ئەردێ گوندی یە، رووبەرێ گوندی (٢٢٦٠) دۆنەمێن ئەردینە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندی ترك عرب (سەر ناحیا دەرکارێ ڤەیە).

**باشووری،** رووبارێ خابویری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بەر کەڤر خابوور.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ تاوکێ.

## پێکهاتا گوندی:

گوند پێکدهێت ژ هەردو بنەمالێن (ئیسف و فارس) ژ عەشیرەتا سندیان- ئیجاخا (مامەزدینی)، بنەمالا دووێ (فارسی) کەڤنترین بنەمالە ل گوندی. دکەڤندا (١٧) سەرۆك خێزان ل گوندی هەبوون و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٢ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٢]. نها (١٥) خێزان لێ دژین و یێن دی قەستا باژێران کرینە.

گوند شەش جاران ل سەر دەستێن رژێمێن عیراقی هاتییە سۆتن و وێرانکرن، دو جاران ژ وان پشتی کودتایا سالا ١٩٦٨ بوو ل سالێن ١٩٧٧– ١٩٨٧ێ.

## شوینوار و جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

گرکێ دێرێ، شکەفتێت هشار کو سێ شکەفتن لدەف ئێك، گۆرستانا گوندی، ملا حەلەبێ، ئاڤا گولی، مالا ناڤداراکا، چم گندلی، چم زەیتون، لەڤدا باسکی، بەرزیرا، وارکێ خەلایێ، چالا کەقوت و بانا هێژیروك.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

کانی رەملکێ، کانییا مەزن، کانییا وارکێ خەلایێ، رووبارێ خابویری ژی دسنوورێن گوندی را دبووریت.

سالا (١٩٧٦)ێ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، کارەب ژی سالا (٢٠١٣) گەهشتییە گوندی[١٣].

# گوندێ دوبانکێ:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (٣٥کم) ل رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری، وەکی دهێتە گۆتن بەری سالا (١٨٠٠)ێ هاتییە ئاڤاکرن، ناڤێ گوندی وەك ڤەدگێڕن: ژ هندێ یێ هاتی کو گوندەکێ بۆش بوویە و دو مەلا لێ بانگ ددان لەوما بوویە دوبانك. ژ تایبەتمەندیێن ڤی گوندی ئەو بوو کو (گەلیێ دوبانکێ) ل دەمێ شۆڕشێن کوردی جهێ ڤەحەواندنا خەلکی بوویە و هندەك جارا (١٠٠٠) خێزان دڤی گەلی دا دژیان، رووبەرێ گشتی یێ گوندی (١٨٠٦) دۆنەمێن ئەردی نە.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ تمر ئاڤا.

**باشووری،** چیایێ سپی.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هارینا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بێزالکێ.

## پێکهاتا گوندی:

گوندەکێ عەشیرەتا سلێڤانەیانە، هژمارا خەلکێ وی دکەڤندا نێزیکی (٥٠) خێزان بوون، و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٤]. نها نێزیکی (١٠٠) مالا نە. ژ بنەمالێن گوندی ژی: (ئەحمەد دوبانکی، سەفەر دوبانکی، حەکیم دوبانکی، خشمان دوبانکی، خەلیل دوبانکی، عصمەت دوبانکی) و (یوسف دوبانکی) کەڤنترین بابکە ل گوندی.

ئەڤ گوندە هەشت جاران هاتییە سۆتن و بەردان، جارەکێ ژ ئالیێ فرۆکێن تورکی ڤە و جارێن دی ژ ئالیێ رژێمێن عیراقی ڤە ل سالێن (١٩٥٤، ١٩٦٦، ١٩٧٥، ١٩٧٩، ١٩٨٤، ١٩٨٨)ێ، سالا (١٩٩٤)ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە، لێ ل سالا (١٩٩٥)ێ جارەکادی ژ بەر تۆپبارانا فرۆکێن ترکیا ڤە هاتییە تۆپبارانکرن.

## شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:

شکەفتا دەرێ گەلێ، شکەفتا لێژنا ناحیا زومار، شکەفتا نەخۆشخانا پێشمەرگەی، مەرقەدێ عسلانی، گرکێ تی رەش، ڤیحکبا مهندسا، گەرا خاتینا، سەروکانی.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

بیرەك ل گوندی هەیە.

## ژێدەرێن ژیانا خەلکی گوندی:

ل بەرێ ل سەر چاندنێ و بەرهەمێن گیانەوەران بوو، نها ژی ل سەر چاندنا دار وبارێن فێقی یە.

سالا (٢٠١٣) کارەب بۆ گوندی هاتییە راکێشان

و پروژێ ئاڤێ و كولانا بیرێ ل سالا (٢٠٠٦) بۆ گوندی هاتیه دروستكرن[١٥].

## گوندێ مامەر:

گوند دكەڤیتە دەڤەرا (لیڤێ) ب دووراتیا (١٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیا رزگاری، رووبەرێ گشتی یێ گوندی دگەهیتە (٢٦٤٢) دۆنەمێن ئەردی، گوند یێ ناڤدارە بناڤێ گوندێ (برو رێزو).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێن گرزیوك و دە شمر.

**باشووری،** چیایێ سپی.

**رۆژهەلاتی،** گوندی بێتاسێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ حەسەن ئاڤا.

### پێكهاتا جڤاكی:

گوند ژ هەردو تیرەیێن (هاجان، ئەرتووشی) یێن كوچەران پێكهاتییە.

ئەڤ گوندە دناڤبەرا سالا (١٩٦١- ١٩٨٨)ێ چوار جاران هاتییە سۆتن و بەردان و نها خەلكێ گوندی (٣٠) خێزان.

### شوینوار و جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

رابێ مامەر، خرابێ بلویر، واركێ خەلیلا، دیسان چەند گەلی هەنە، وەكی گەلیێن (قەبان، زبلی)، هەر وەسان دو شكەفتێن كەڤن ژی لێ هەنە ب ناڤێن (قەبان، زبلی)، كو یا دووێ بۆ چەند كیلومەترا یا درێژە.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

كانییەك ب ناڤێ كانی (چنار) و نهالا (بەلك) و نهالا (لەندەبا) ژێدەرێن ئاڤا گوندینە.

ژیارا خەلكێ وی ل بەرێ و نها ژی هەر خودانكرنا تەرش و كەوالی یە[١٦].

## گوندێ هارینا:

گوند دكەڤیتە سنوورێ عەشیرەتا دۆسكییان ب دووراتییا (٢٠كم) ژ ناحیا رزگاری، ناڤێ گوندی ژ واتایا هاریكاری هاتییە كو خەلكێ وی هاریكاربوون دگەل جیرانێن خۆ.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ تلا كورو (سەر ب ناحیا مانگێشكێ).

**باشووری،** چیایێ سپی.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ زیناڤا (سەر ب ناحیا مانگێشكێ).

**رۆژئاڤایی،** گوندی تمر ئاڤا.

### پێكهاتا گوندی:

گوند ژ ڤان سێ بنەمالان پێكدهێت: (مالا ئەحمەد صالحی ژ عەشیرەتا سندی، ئەسعەد گێندو هەر ژ عەشیرەتا سندی، محەمەد جامی ژ عەشیرەتا دۆسكی). هژمارا خەلكی یا كەڤن (١٢٠) كەس بوون. و و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٢ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٧].

گوند سێ جاران هاتییە بەردان و سێ جاران هاتییە سۆتن، لێ سالێن وان ددەستنیشانكری نینن.

### شوینوار و جهێن بەرچاڤێن گوندی:

گەلیێ هارینا، نهالا گوندی، بەستێ، جەبەرێ، چەند زیارەت، جهێن روینشتنێ ل بەر تاقێ مزگەفتێ، تیا كولانێ، ل سەر سوكێ، ژبلی چەند زەڤیان، وەكی: پەستێ، كورێ، رەزێ لودی، زەڤیا سیس. هەر وەسان ناووسكا گەلی، سیلاڤ كركێ مەهمەدا پێدەرا بلند كوریەڤێ، شكەفتا قورتا، شكەفتا لەشێ، شكەفتا گەلی، نهالا گوندی یا مەزن، نهالا دناڤبەرا دوبانك هارینا دا، نهالا بەرا زرهەوا، هارینا.

**زێدەرێن ئاڤێ:**

پێکهاتینە ژ چەند کانییان، وەکی: کانییا سرك، کانییا کجوك، کانییا زهێد، کانییا مەهمەتك، دیسان هندەك کانیێن بهاری ژی هەبوون.

**ژیارا خەلکێ گوندی:**

ل بەرێ ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەت چاندنا گەنم و نۆك و نیسك و ماش و کونجی و برنج و گویز و باهیڤ و تری و هنار و حلیك و سێڤ.. ژبلی خوادنکرنا پەز و بزنان ژی[٦٨].

## گوندێ ئافرما:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (١٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ وێ چەندێ هاتی کو جارەکێ گوند وێران ببوو و تنێ (ئافر- هافر) مان، لەوما ناڤێ گوندی ژی بوو (ئافرما)، دیرۆکا ڤی گوندی دزڤریتەڤە بۆ سێ پشتا، رووبەرێ وی یێ گشتی ژی (١٢٩١) دۆنەمێن عەردی نە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** کۆمەلگەها بیدارێ.

**باشووری،** گوندێ دە شتمرێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سەلکا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ خراب دارێ.

**بیکهاتا گوندی:**

گوند کۆچەرێن زێوکی نە، ژ (١٢) مالباتان ب ناڤێن: (ئەحمەد سۆفی، حەجو، مالا صالح، مالا سیسۆ، مالا گوزەی، مالا محو نەفی، مالا چۆلی، مالا محەمەد، مالا تەمو، مالا عزەت، مالا محو یێ گوهارا، مالا عیسو) پێکدهێت. هژمارا خەلکێ وی دکەڤندا (١٥٠) کەس بوون و و ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٦٩] و نها دورێن (١٢٠٠) کەسن.

ئەڤ گوندە دو جاران ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٦٥)ێ ژ ئالیێ رژێما عیراقێ ڤە هاتییە وێرانکرن و ل سالا (١٩٧٥)ێ گوند هاتە خرابکرن و خەلکێ وی ل سەر گوندێن دەوروبەران هاتنە بەلاڤکرن.

دو گۆرستانێن کەڤنار: گۆرستانا خوشك و برا و گۆرستانا حەجوی ل گوندی هەنە.

ژێدەرێن ئاڤێ ژی ل گوندی دو کانی بوون ب ناڤێن کانییا حەجو و کانییا وردیێ[٧٠].

د کەڤندا ژیارا خەلکی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو و نها ژی ل سەر چاندنێ یە، گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و... هتد دچینن. و ب رەنگەکێ گشتی گوند یێ بێ بەهرە ژ خزمەتگوزارییان.

## گوندێ حەسەن ئاڤا:

گوند ب دووراتییا (١٤کم) دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ناحیا رزگاری، ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ وی کەسی هاتی کو گوند ئاڤاکری، ئانکو (حەسەنی گوند یێ ئاڤا کری)، رووبەرێ گشتی یێ گوندی دگەهیتە (٣٣٠٠) دۆنەمێن عەردی.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ دەشمرێ.

**باشووری،** چیایێ سپی.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مامەریە.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ کانی صارکێ.

**پێکهاتا گوندی:**

گوندی ژ: (بنەمالا گەلحو، بنەمالا کەلو، بنەمالا دربو، بنەمالا مەولو) پێکدهێت، ژ عەشیرەتا (کۆچەرا - زیوکێ) نە، دکەڤندا نێزیکی (٥٢) سەرۆك خێزانا ل گوندی هەبوون، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٠٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٧١].

نها نێزیکی (٢٠٠) سەرۆك خێزانان لێ هەنە.

حەسەن ئاڤا پێنج جاران ل سالێن ١٩٦١، ١٩٦٢ ژ ئالیێ لەشکەرێ حکومەتا عیراقێ ڤە و سالا ١٩٦٣ێ "ژلایێ لەشکەرێ سوری ڤە"، ١٩٧٥ ژ ئالیێ عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن و وێرانکرن و هەر جارەکا هاتییە

کاڤل و وێرانکرن جارەکادی هاتیبە ئاڤاکرن ڤە، داوی جار ژی ل ئەنفالێن سالا (١٩٨٨)ێ بوو، لێ دیسان سالا (١٩٩٢)ێ گوند هاتە ئاڤاکرنڤە.

## جهێن بەرچاڤ ل گوندی وەکی:

(گرێ ئوردیێ، علی نادوکا، نهالا مامەریە، گرێ کوسا، چەپەرێ ئنگلیزی، گەلیێ هەژیرێ، گرێ مەلەشێر، گەلیێ محمد حاجی، گەلیێ ئاخ سپیکی، گەلیێ توخیبی).

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

وەکی (کانییا گوندی، کانییا رەهال، رووبارێ مامەر).

ژێدەرێن ژیانا خەلکی کەڤن ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنێ بوو، ب تایبەت چاندنا دێم، مینا نۆك و گەنم و جەهـ و نیسك و...هتد.

سالا (١٩٧١)ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتیبە ئاڤاکرن، کارەب پشتی سالا (١٩٩١)ێ گەهشتیبە گوندی[٧٢].

## گوندێ قەرەولا:

گوند دکەڤیتە سەر هەردو رووبارێن (دیجلە و خابوور)، ب دووراتییا (٢٠کم) رۆژئاڤا ناحیا رزگاری، ناڤێ گوندی پێکهاتییە ژ دو بڕگان، (قەرە) پەیڤەکا تورکی یە ب واتایا رەنگێ (رەش) و ناڤێ گوندێ قەرەولا ب واتایا (تەیرێ رەش) دهێت، رووبەرێ گوندی دگەهیتە (٣٩٥٨) دونەمێن ئەردی.

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** رووبارێ خابویری.

**باشووری:** گوندێ دێرەبوون.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ تیان.

**رۆژئاڤایی:** ئاڤارێ گوندێ مەرزێ.

گوندێ حەسەن ئاڤا



## پێکهاتا گوندی:

گوند ژ پێنج بنەمالان: (گرکی، تاقیانی، بارنجی، ئەرمەنی، کەلوانی) پێکهاتییە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٣٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان کو هینگێ گوند سەر ب ناحیا سلێڤانەیی ڤەبوو[٧٣] و ژمارا خێزانێن وان ژی ل نها (٦٢) سەرۆك خێزانن و ئایینێ وان مەسیحی نە ژ ئایینزایا کەلوانی و ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٣٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٧٤].

گوندێ قەرەولا سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٧ هاتییە سۆتن و بەردان، سالا ١٩٧٥ێ ب ئێکجاری هاتییە خرابکرن و خەلکێ گوندی دەربەدەربوون، سالا (٢٠٠٦)ێ ب بریارا سەرۆکێ هەرێما کوردستانێ خەلکێ گوندێ زڤرینە سەر گوندێ خۆ گوند ئاڤاکرییەڤە.

## شوینوار و جهێن بەرچاڤێن گوندی:

چەند شوینوار ل گوندی هەنە، وەك: گرێ گوندی، شکەفتا عەشارا، بەرێ قول، پیرەقات، مەرقەدێ (مریەم نەترا زەرکی). هەر وەسان جهێن دیار ل گوندی هەنە وەك: (کوپێ عەشارا، ئاخ سپیك، پیرە قان، گر سمایل، کانییا باجێ، نهالا گرگناسێ، بەرێ قول).

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ل گوندی چەندین ژێدەرێن ئاڤێ هەبوون، وەك: رووباری خابویری، ئاڤا نهالا گوندی، نهالا پیرەڤانی، ژبلی هندەك کانییان کو ئاڤا وانا زۆر یا تەزی یە.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، ئەڤ گوندە جهەکێ ب ئاڤ و دەنگە بو چاندنا زەبەشا، ژیانا خەلکی نها ل سەر چاندنا گەنمی و چاندنا جنیك و بیستانانە.

ژ خوارنێن بەرێ ل گوندی وەکی: (مەیرە، گردو، سەربدەو، قوقتە).

ژ یارێن بەربەلاڤ ژی وەکی: (پرازاڤایی، بوکا میرا، بەلو بەلو، برانێ، بەردەق، جێ تاشو و... هتد.

سالا (١٩٦٧) بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن، بەلێ گەلەك نەڤەکێشایە و گوند هاتییەخرابکرن و بەردان، کارەب و پروژێ ئاڤێ ژی ل سالا (١٩٩٤)ێ گەهشتینە گوندی[٧٥].

## گوندێ خێلەخ:

گوندێ خێلەخ ب دووراتییا (٨کم) رۆژهەلاتێ ناحیێ، وەکی دهێتە گۆتن گوند ل سەر دەمێ (قوباد بەگ)ی هاتییە ئاڤاکرن، رووبەرێ گوندی (٢٢٧٠) دۆنەمێن عەردینە.

## سنوورێن گوندی:

**باکوور:** گوندێ چەم کورك.

**باشووری:** چیایێ بێخێری.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خراب دارێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باکرمان.

## پێکهاتا گوندی:

گوند ژ سێ بابکان پێکدهێت، هەرسێ برانە و گوند ئاڤاکرینە، ئەو ژی: (ئەحمەد بەگ، عوسمان بەگ، شڤان بەگ)، ژمارا سەرۆك خێزانێن گوندی ل بەرێ (٢٠) سەرۆك خێزان بوون و نها (١٥) سەرۆك خێزان ل گوندی هەنە.

گوند چوار جاران ل سەردەمێن رژێمێن عیراقی هاتییە خرابکرن، دو جاران ل سالێن شێستان و دو جارێن دی ل سەر دەستێ رژێما بەعسییان.

## شوینوار و جهێن بەرچاڤ ل گوندی:

ژ شوینواران وەك: شکەفتا شار، گورستانا شێخ محەمەد ئەمین، شوینوارێن مزگەفتێ کو بەری سەد سالان لێ هاتبوو ئاڤاکرن. ژ جهێن دیار ژی وەك: کەلە بەرد، شام زەرکە، وارکە، ئاڤروکە.

### زێدەرێن ناڤێ ل گوندی:

تنێ كانییەك ب ناڤێ كانیبا سیسن لێ هەیە.

### زێدەرین زیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی د كەڤن دا ل سەر چاندن و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، نها ژی ل سەر بەرهەمێن چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی یە، ژبلی كو دەڤەر نێزیكی سنووری یە هندەك ژ خەلكێ گوندی كارێ بازرگانیێ ژی دكەن.

ژ خزمەتگوزاریێن گوندی ژی كارەب سالا (٢٠١٢) ێ گەهشتیبە گوندی[٧٦].

## زێدەر و پەراوێز:


١. عبدالله غفور، التشكيلات الادارية فی جنوب كردستان، ص٩١.
٢. هەمان زێدەر، بپ١٢٩.
٣. پێزانین ژ رێڤەبەریا ناحیێ هاتینەوەرگرتن.
٤. پێزانین ژ رێڤەبەریا ئامارا دهۆكێ هاتینە وەرگرتن.
٥. پێزانین ژ رێڤەبەریا ناحیێ هاتینە وەرگرتن.
٦. پێزانین هاتینە وەرگرتن ژ هەر ئێك ژ ئەڤێن محەمەد مەحمود، محەمەد مەلا رەشید، دلشاد رەشید یوسف.
٧. د. عەبدوللا غەفوور، گوندەكانی باشووری كوردستان لە سەرژمێری دانیشتوانی عێراقدا- ١٩٥٧، ب/ ٢، چ٢، (هەولێر: ٢٠٠٥)، بپ٦٢.
٨. د. عەبدوللا غەفوور، گوندەكانی ....، بپ٦٢.
٩. د. عەبدوللا غەفوور، گوندەكانی ....، بپ٦٢.
١٠. د. عەبدوللا غەفوور، گوندەكانی ....، بپ٦٣.
١١. پێزانین ژ حەسەن شێبو شەمو هاتینە وەرگرتن.
١٢. د. عەبدوللا غەفوور، گوندەكانی ....، بپ٦٣.
١٣. پێزانین ژ (گوری جینا خەلەف) هاتینە وەرگرتن.
١٤. د. عەبدوللا غەفوور، گوندەكانی ....، بپ٦٥.
١٥. پێزانین ژ فەیسەل هردم جەمیل ئاغا، و جەعفەر عەبدولا حاجی ئیزدوو موختارێ گوندی هاتینە وەرگرتن.
١٦. د. عماد عبدالسلام رؤوف، المراكز الثقافية المغمورة فی كردستان، (اربیل- ٢٠٠٨)، ص ٢٣
١٧. د. عەبدوللا غەفوور، گوندەكانی ....، بپ٦١.
١٨. د. عماد عبدالسلام، هەمان زێدەر، بپ ٢٣
١٩. پێزانین گوندی ژ ئەمین محەمەد، موختارێ گوندی هاتینە وەرگرتن.
٢٠. پێزانین ژ موختارێ گوندی هاتینە وەرگرتن-
٢١. د. عەبدوللا غەفوور، گوندەكانی ....، بپ٦٣.
٢٢. پێزانین ژ موختارێ گوندی عادل محمد رشید هاتینە وەرگرتن.
٢٣. د. عەبدوللا غەفوور، گوندەكانی ....، بپ٦٣.
٢٤. پێزانین ژ رێڤەبەرێ خواندنگەها ئامادەییا پێشابیرێ ( فائز گورگیس صومی) هاتینە وەرگرتن.
٢٥. پێزانین ژ رەشید عەزیز، موختارێ گوندی هاتینە وەرگرتن-

# قەزا شێخان (ئێسفنێ)

محەمەد عارف تاتار
وەرگێران ژ عەرەبی: خالد سالح

## ژ لایێ کارگێری ڤە:

قەزا ئێسفنێ (٤٥کم) ژ ناڤەندا باژێرێ مووسل دوورە. شێخان دناڤبەرا سالێن (١٩١٨- ١٩٢٤)ێ و تا دروستبوونا دەولەتا عیراقی ناحییەك بوو سەر ب قەزا مووسل ڤە، پشتی سێ سالان ژ دامەزراندنا دەولەتا عیراقی و ل دووڤ (ئیرادەیا مەلەکی) ژمارە (٣٤٢) ل رێکەفتی ١٩٢٤/١٢/١٦ێ بوویە قەزا، و ژبلی ناڤەندا ناحیا شێخان یا پێکهاتیبوو ژ ناحیێن ئەلقۆش و باشیکێ[1]. پاشی چەند ناحیێن دی مینا ئەتریش و مرێبا لێ هاتنە دامەزراندن و نها ژبلی ناڤەندا شێخان پێنج ناحیە ب سەرڤەنە و ژ لایێ کارگێری ڤە گرێدای پارێزگەها دهۆك و پارێزگەها نەینەواڤەنە، ناحیێن وێ ژی پێکهاتینە ژ:

ناحیا ئەتریش ل سالا ١٨٧٩ێ هاتییە دامەزراندن کو هەتا سالا (١٩٥٦)ێ سەر ب قەزا دهۆکێ ڤەبوو[2]، ناحیا قەسرۆك (ل بەرێ مرێبا) ل سالا (١٩٧٢- ١٩٩٤)ێ هاتییە دامەزراندن، ناحیا باعەدرێ ل سالا ١٩٩٣ێ هاتییە دامەزراندن، و ناحیا زیلکان (الفاروق) ل سالا ١٩٩٨ێ هاتییە دامەزراندن و سەر ب پارێزگەها مووسل ڤەیە، ناحیا کەلەکچی ل سالا ٢٠١٤ێ هاتییە دامەزراندن، ئەڤ هەمی ناحیە ژبلی زیلکان سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەنە.

رووبەرێ قەزایێ (١٢٥٩) هزار و دوسەد و پێنجی و نەهـ کیلومەترێن چوارگۆشەنە، پشتی هەردو ناحیێن مرێبا و ئەتریش ل دووڤ مەرسۆمێ کۆماری ژمارە ٣٢١ ل ١٩٨٧/٦/١١ێ هەلوەشاندین و ب ناڤەندا قەزایێ ڤە گرێداین. ژمارا ئاکنجیێن ناڤەندا قەزایێ ل دووڤ ئامارا سالا ١٩٥٧ێ ١٤٢٧٩ کەس بوون[3] و ل دووڤ ئامارا سالا ١٩٨٧ێ ئامارا قەزایێ (٥٤٥٥٩) کەس بوون و ل بەری هینگێ و ل دووڤ ئامارا سالا ١٩٧٧ێ ئامارا ئاکنجیێن وێ (٣٦٤٢٧) کەس بوون، و ل دووڤ ئامارا رێکخراوا خوارنا جیهانی ل سالا ١٩٩٧ێ ئامارا ئاکنجیێن وێ کو ل ژێر دەسەلاتا حۆکمەتا هەرێما کوردستانێ نە (٥٥٨٦٩) کەسن.

سەنتەرێ قەزا شێخان هندەك ژ دەڤەرێن قەزایێ نها سەر ب پارێزگەها مووسل ڤەیە، و دکەڤیتە ژێر مادەیێ ١٤٠ کو ناکۆکی دناڤبەرا حۆکمەتا بەغدا و حۆکمەتا هەرێما کوردستانێ ل سەر هەی و خەلکێ وێ حەزدکەن ب کەڤنە دناڤ نەخشەیێ کوردستانێ دا، مینا پشکا دی کو پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ کەتییە سەر پارێزگەها دهۆکێ ڤە. نها ب رەنگەك فەرمی دەڤەرێن قەزایێ یێن بەری نیسانا ٢٠٠٣ سەر ب پارێزگەها دهۆکێ ڤەنە و یێن دیتر ژ قەزایێ سەر ب پارێزگەها مووسلێ ڤەنە، بەلێ ب کریار وەك قەزایەکا سەر ب پارێزگەها دهۆکێ سەرەدەری دگەل هەمو سنوورێ وێ دهێتەکرن..

حوكمەتێن عیراقی هەر ژ دەسپێكا شۆرشا ئەیلۆلێ ل سالا ١٩٦١ێ و تا سالا ١٩٦٣ێ و تا داویيا سالا ١٩٦٥ێ و پشتی شكەستنا شۆرشا ئەیلۆلێ ل سالا ١٩٧٥ێ یا بەردەوام بوو ل سەر سیاسەتێن راگوهاستن و تەعریبكرنا دەڤەرێ[٤].

## كورتیەكا میژوویی:

ناڤ: ئەڤ ناڤە پتر ل داویيا سەدسالیيا پێنجێ و دەسپێكا سەدسالیيا شەشێ مشەختی ل سەر هاتییە دانان پشتی شێخادی كورێ مسافرێ هەكاری و شێخ حەسەن و شێخ نورەددینێ بریفكانی و چەندێن دی ژ خودانێن رێكێن جودا یێن سۆفیاتیێ قەستكرینێ.

سەبارەت ناڤێ كەڤنێ (ئێسفنێ) ناڤێ وێ د ژێدەرێن ئارامی دا ب (ئێسپنێ) هاتییە و تا نها ژی سریانی ب هەمان شێوە دبێژن. د سەدسالیيا یەكێ زایینی دا ل سالا ٣١٠ێ ناڤێ وێ ب (ئین سپنا) هاتییە كو هینگێ ل ژێر حوكمدارییا مەتران فولیطلی (١٩) كورسیا ئوسقوفی دا بوو، و ئێسفنێ زنجیرا هەژدێ بوو دناڤ ڤێ زنجیرا ئوسقوفیاندا، و گەلەك چیڤانۆك ل سەر ناڤێ وێ هەنە و وەسان هزر دكەن دیرۆكا وێ ڤەدگەرێتەڤە چاخێ (نۆح پێغەمبەری) و ئەو كانیيا ئاڤێ كو پاپۆر ل نێزیكی وێ دروست بووی دكەڤیتە نێزیكی ئێسفنێ و یا ناڤدارە ب (معیركا)، دیسان وەسان دهێتە هزركرن كو جهێ پاپۆر ژێ دەركەتی ل وێ رۆژا تۆفان چێ بووی كانیيا (مهیركا) بوو ل ئێسفنێ، واتە (كانیا پاپۆرێ- عین السفینە) و تا نها ژی ئەڤ چیڤانۆكە دناڤ خەلكێ قەزایێ دا دهێتە گۆتن[٥].

لێ هزرا پتر جهێ باوەریێ و ب بەلگەیێن زانستی هاتییە سەلماندن ئەوە یا ڤەكۆلەر (محەمەد عارف تاتار)[٦] دگەل ڤەكۆلەر (د. حەسەن ئەحمەد قاسم)[٧] رێڤەبەرێ شوینوارێن دهۆكێ گەهشتینێ پێشتر خواندنا گەلەك پەیڤێن دناڤ زمانێ سۆمەری دا هەین و تا نها ئەو پەیڤ دناڤ زمانێ كوردی دا د بەربەلاڤن و گەهشتینە وێ چەندێ كو بنیاتێ پەیڤا

شێخان



ئێسفنێ یێ ژ (EN-sin-ni) یا سۆمەری هاتی، برگەیا (EN) ب واتایا هێژا (سید) یان خوداوەند یان مەزن هاتی و(sin) هێمایێ خوداوەندێ هەیڤێ یە كو ژ لایێ خەلكێ وەلاتێ دناڤبەرا دو رووباراندا دهاتە پەرستن و د سۆمەری دا دگۆتنێ EN-zu-u[8] و تا درەنگ ژی و ل سەردەمێن ئاشووریێن جودادا و ب تایبەتی د چاخێ ئاشووریێن نوی دا هەر دهاتە پەرستن و دەرگەهەكێ تایبەت هەبوو دهاتە دەڤەرا بەهدینانا نها دگۆتنێ (دەرگەهێ سن). ل سەر برگەیا (ni) ئەو ژی پاشگرەكێ دەنگی یە دناڤ هەمی زمانێن كەڤن دا هەبوو، لێ بەلگەیێ زانستی ل سەر ڤێ بۆچوونێ تا رۆژا ئەڤرۆ ئەوە كو ل جهێ خنس یێ شوینواری هێمایێ خوداوەدێ هەیڤێ (سن) كو یەك بوو ژ خوداوەندێن د وی دەمی دا دهاتە پەرستن. ژ چەندا بووری دیار دبیت كو ئەڤ خوداوەندە ل دەڤەرا ئێسفنێ ل وی سەردەمی دهاتە پەراستن، لەوما دگۆتنە وی جهێ خوداوەند دهاتە پەراستن سن (en- sin- ni) و د زمانێن كەڤن دا و ژبۆ ساناهیكرنێ پەیڤ ب ناڤ یەك دئێخستن و ناڤ بۆ ئەڤ شێوە (en-siv-ni)، دیسان پتر بۆ هندێ دچن كو پەیڤا داسن ژی ژ (d- sin)، ب واتایا خوداوەند (سن) یا سۆمەری هاتبیت، كو وەكی دبێژن (دهۆكا داسنیا)، واتە ل دهۆكێ ژی د هاتە پەراستن. لێ هندی زاراڤێ (عین السفینة) ناڤەكێ ب عەرەبكرنێ یە كو ڤەكۆلەران د وی سەردەمی دا بزاڤ كرینە ب زمانێ عەرەبی ڤە گرێدەن و دووریێخن ژ بنیاتێ وێ یێ دروست[9].

# جهێن شوینواری:

قەزا شێخان (ئێسفنێ) جهەكە كو گەلەك شوینوار و جهێن دیرۆكی و گرنگێن مێژوویا كەڤن لێ هەین، وەكی د رۆژنامەیا (الوقائع العراقية) دا هاتی پێكهاتینە ژ (٢٨٢) جهێن شوینواری یێن راگەهاندی، ژبلی ئەو جهێن شوینواریيا وان نەهاتینە راگەهاندن، ژ جهێن گرنگییەكا گەلەك مەزن هەین خنس- جروانە، كو دهێتە هەژمارتن یەك ژ دەستكەفتیێن مەزن د چاخێ ئیمبراتۆریەتا ئاشووری دا و ب دروستی ل چاخێ شاهێ وان سەنحاریبی (٧٠٤- ٦٨١پ. ز) كو ل وی سەردەمی ئاڤ ژ كانیێن سرۆشتی ژ خنس و گوندێن دەردۆر ب ریا چێكرنا سكرەكێ ژ بەرێن ئەندازەیێن جودا عومبار كری و ژ عومباركرنێ درێكا كەنالەكی را گەهاندیە نەینەوا پایتەختێ ئیمبراتۆریەتا ئاشووری و تا نها شوینوارێن وێ دیارن[10].

ژ جهێن دی یێن گەلەك گرنگیيا خۆ هەی (گرێ جومل)ێ شوینواری یە، كو ب نێزیكی (٢٠كم) ژ ناڤەندا قەزایێ دوورە، د ژێدەران دا ب ناڤێ (گوگامیلا) هاتییە، كو ئەو ژی شەرەك بوو ل سالا ٣٣١پ. ز دناڤبەرا ئەسكەندەرێ مەقدونی و داریوسی رووداى و ئەسكەندەر تێدا ب سەركەتی، ئەڤ شەرە دهێتە هەژمارتن داوی شەر كو ئیمبراتۆریەتا فارسی پێ ب داویدهێت و دهێتە هەژمارتن یەكەم جەنگێ جیهانی د مێژوویا كەڤن دا[11].

ژبلی ڤان شوینواران گەلەك جهێن دی یێن شوینواری هەنە، مینا شكەفتیان كو دیرۆكا وێ ڤەدگەریێتەڤە چاخێن بەردین یێن زوی، و جهێ گەلی زەردك و شكەفتندیان و لالش و بیر و باسفرێ و گەلەك شكەفت و جهێن دی یێن شوینواری[12].

پشتی هاتنا ئیسلامێ ڤێ دەڤەرێ چەندین رووداێن دیرۆكی بخۆڤە دیتینە، ژ وانان مێژوویا (البلاذري) د ڤەكرنا مووسل دا ل سالا ١٨مش ب سەرۆكاتیيا (عەیازێ كورێ غەنەمی) ڤەدگێریت: كو پشتی هینگێ بەرێ خۆ دا دەڤەرا باعەدرێ و ڤەكر و ژ وێرێ بەرێ خۆ دا وەلاتێ داسن و ژ وێرێ بەرەڤ ئەرمەنستانێ، هەر وەسان ئەو هەوا ب سەركێشییا داوی شاهێن ئەتابەگی ل مووسلێ بەدرەددین لوئلوئەی و هێرشا وی بۆ سەر دەڤەرا شێخان و كوشتنا (٤٥) كەسان ژ خەلكێ ڤەزایێ و وێرانكرنا پەرستگەها لالش ژبەر ناكۆكیێن وی یێن دژوار دگەل شێخ حەسەنی.

دیسان ب هەبوونا میرگەها ئێزدیان ل شێخان كو ناڤەندا وێ ئێسفنێ بوو و جهێ ڤەحەواندنا میرێ ئێزدیان یێ نها (میر تەحسین بەگ كورێ سەعید بەگ)، سەرەرای سەرەدانا والی سلێمان نەزیف پاشای ل سالا ١٨٨٩ێ دەمێ تاووس و نیشانێن ئێزدیان كو ژ

لایێ لەشکەرێ (فەریق عومەر وەهبی) ل هەوا سالا (١٨٩٢)ێ کو ب سەر ئێزدیان دا کری هاتینە تالانکرن ڤەگەراندن هینایێن، و تا نها ژی ئێزدی ئاهەنگا ب ڤێ هەلکەفتێ کو دبێژنێ (عید النیاشین) دگێرن.

دەڤەرا شێخان جهەکێ گرنگێ بزاڤا رزگاریخوازیا کوردی بوو، ب تایبەت د هەردو شۆرشێن نوی یێن کوردی دا و گەلەك شەر لێ هاتینە ئەنجامدان و شکەفتێن وێ گەلەك جاران بووینە پەناهگاهـ بۆ مەلا مستەفا بارزانی و پێشمەرگەی، مینا شکەفتا بیر و باسفرا[١٣].

## ژلایێ جوگرافی ڤە:

**باکووری:** قەزا ئامێدیێ.

**باکووری رۆژئاڤایی:** هەردو قەزایێن دهۆك و سێمێلێ.

**باشووری:** ناحیا بەعشیقە.

**رۆژهەلاتی:** قەزا ئاکرێ.

**رۆژئاڤایی:** قەزا تلکێفێ یە.

## پێکهاتا جڤاکی:

سەنتەرێ قەزایێ ژ چەندین مللەت و ئایینزایان پێکدهێت، ژ کورد و عەرەب و کلدو ئاشوور و ئێزدی و موسلمان و مەسیحی. بەلێ ئێزدی ژ هەمیان کەڤنترن و هەتا سالا (١٩٢٠)ێ ب تنێ ئێزدی لێ بوون، لێ ل سالا (١٩٢١)ێ کوردێن موسلمان و مەسیحییان ژی قەستا ڤی جهی کرن و بۆ بازێرەکێ هەڤپشك دناڤبەرا ڤان ئۆل و نەتەوەیان دا. دناڤا قەزایێ دا دو مزگەفت و دو دێر هەنە، ژبلی چەندین مەزار و نیشانگەهێن ئێزدیان وەکی: نۆح پێغەمبەر، ئێزدین ئەمیر، مەزارێ شێخ مەند، مەزارێ شێخ شەمس، شێخ خالێ شەمسا، شێخ بەکر، مەزارێ ستیا تاووس، پیرێ خۆشابا، مەقامێ عەبدێ رەش، مەقامێ بازید، مەقامێ شێخ حەسەن، مەقامێ شێخ حەنتۆش، کورێ رەوال، ژبلی مەزارێ پیرێ جەروا و مەزارێ محەمەد رەشان. هەر وەسان پەرستگەها لالش کو گۆرێ شێخادی دناڤدایە، ژبلی مەزارێ

شوینوارێن خنس



شێخ نورەددینێ بریفكی و گۆرێ ناحوم پێغەمبەری كو یەكە ژ پێغەمبەرێن جویا ل ئەلقوش و مێژوویا وی ڤەدگەرینتەڤە (٧٢١پ. ز)، چونكی ڤێ قەزایێ بەری جوی بچنە ئسرائیلێ لێ هەبوون، ب تایبەت ل ناڤەندا قەزایێ و هندە گوندێن نێزیك، مینا گرزەنگل، شێخكا، مرێبا.

ژ لایێ عەشیرەتینیێ ژ چەند عەشیرەتان پێكدهێت وەك:

ژ عەشیرەتێن موسلمانان ل ڤێ قەزایێ: (مزووری، گۆران، زێدك، شەرەفانی).

ژ عەشیرەتێن ئێزدیان ژێ: (مامۆسی، ترك، هەكاری، حەراقی، خەتاری، دوملی، بەلەسینی، كاشاغی، دنایی، خیسكی، بریمەمی، قایدی و...هتد).

ژ عەشیرەتێن مەسیحیان ژێ: (بازی، تیاری، مەركەهی).

## ژێدەرێن ئاڤێ:

رووبارێ گومل د ئاخا قەزا شێخان را دەرباز دبیت، هەر وەسان گەلەك كانی ژێ ل ناڤەندا قەزایێ هەنە كو مفا بۆ چاندنێ ژێ دهێنە وەرگرتن، وەكی كانیێن (سەرێ كانی ل باكوورێ باژێری و ژێدەرێ سەرەكیێ ئاڤا ڤەخوارنا وێ یە، كانی رەشكێ، گەرا حەلانا، شیڤ بالۆكا، كانی معیركا كو دەمەكی گەلەك دار ل دۆرا بوون)[١٤].

## لایێ چاندنێ:

ژبەر عەردێ چاندنێ ل ڤێ دەڤەرێ گەلەكێ ب زاخ و قەلەوە، لەوما چاندن پیشەیا یەكێ بوو ل دەڤەرێ و دهێتە هەژمارتن گرنگترین دەرگەهێ ژیانا پتریا خەلكێ وێ و دەرامەتێن جۆرا و جۆر لێ دهاتنە چاندن، ب تایبەتی چاندنا دەرامەتێ دێم كو پشتبەستن ل سەر ئاڤا بارانان دكەن و بارگرانیا سەر پشتا جۆتیاری سڤكترە، ژ گرنگترین دەرامەتێن د هاتنە چاندن ل بەری هەر تشتی گەنم و جەهـ بوون و پاشی نیسك و نۆك، ئەڤ جهێن ئاڤ و كانی ژێ لێ هەبن برنج دهاتنە كرن و چاندن ب هەمی قوناغێن خۆڤە ب ئالاڤێن كەڤن و دەوار و شیانێن وان دهاتنە ئەنجامدان، هەر ژ كێلانێ و دروینێ و گێرەكرنێ و دانەبای و ڤەگوهاستنێ و ...تا داوییێ.

سەرەرای چاندنێ گەلەك ژ خەلكێ قەزایێ تەرش و كەوال ژێ ب خودان دكرن، ژ پەز و بزن و چێلا و ئەو گیاندارێن بۆ كارێن چاندنێ بكاردهینان مینا كەر و هێستران. بەروبۆمێ تەرش و كەوالی ژێ مینا گۆشت و پەنیران ب رێكێن دەستپێكی دهاتنە پاراستن و هەلگرتن، چ دناڤ كەدینكادا، یان دناڤ پیستێن هشككری دا.

خەلكێ قەزایێ رستن و چنین و ئاشڤانی (ئاشێن ئاڤێ) ژێ دكرن، و حەكیمێن خۆ هەبوون كو چارەسەری ب دەرمانێن گیایان دكرن.

ژبەر كێمیا هەبوونا دەزگەهێن پەروەردەیی مینا خواندنگەهان و زالبوونا هزرێن عەشیرەتكەرێ و ئایینی ل دەڤەرێ و ژبەر سیاسەتێن شوفینزمی حكۆمەتێن عیراقی، دیاردا نەخویندەوارێ گەلەكا دناڤ خەلكێ دەڤەرێ بەربەلاڤ بوو و یەكەم خواندنگەهـ ل قەزایێ ل سالا ١٩٢٦ێ هاتییە ڤەكرن، ئەو ژێ پێكهاتی بوو ژ خانیەكێ بچویك و زارۆك ل سەر حێسیلا دروینشتن[١٥].

## تاخێن ناڤەندا قەزایێ:

**تاخێ شێخ شەمس،** ب ناڤێ شێخ شەمس كو مەزارەكێ ئێزدییانە هاتییە ناڤكرن، ژمارا سەرخێزانێن وێ دگەهنە (٣٧٠) سەرخێزانان كو دبنە (٢٩٥١)[*] كەس، پتریا وان كوردێن موسلمان و ئێزدی نە. نها بنگەهەكێ ساخلەمیێ سەر ب حكۆمەتا ناڤەندی ڤە لێ هەیە.

**تاخێ شێخ مەند،** ناڤێ تاخی دیسان ژ ناڤێ شێخ مەند كو مەزنەكێ ئێزدییانە هاتییە، پتریا ئاكنجیێن وێ كوردێن ئێزدی و موسلمانن، ژمارا سەر خێزانێن وێ دگەهنە ٤٣١ سەرخێزانان، كو دبنە (٢٩٨٠)كەس، نها سێ خواندنگەهـ سەر ب حكۆمەتا ناڤەندڤە تێدا هەنە.

**١- تاخێ كانی رەشكێ،** ژمارا سەرخێزانێن ڤی تاخی

دگەهنە ٢٣٨ سەرخێزانان كو دبنە (١٧٤٨)كەس، پێكهاتا وێ ژ كوردێن موسلمان و ئێزدی نە، ژبلی هەبوونا مەسیحیان، نها خواندنگەهەك لێ هەیە و سەر ب حكۆمەتا ناڤەندی ڤە هەیە.

٢- **تاخێ خەبات،** پێكهاتا وێ كوردێن موسلمان و ئێزدی نە ژبلی مەسیحیان، ژمارا سەرخێزانێن وێ ٢١٣ سەرخێزانن و ژمارا ئاكنجیێن وێ (١٦٤٤)كەسن. نها خواندنگەهـ لێ هەیە و سەر ب حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ڤەیە.

٣- **تاخێ شۆرەش،** دیسان پتریا وان كوردێن موسلمان و ئێزدی نە، ژمارا سەرخێزانێن وان ٦٤٢ سەرخێزانن و دبنە (٥٠٩١)كەس، نها نەخۆشخانەیەك لێ هەیە و سەر ب حكۆمەتا ناڤەندی ڤەیە.

٤- **تاخێ برایەتی،** پتریا وان كوردێن موسلمان و ئێزدی نە، ژمارا سەرخێزانێن وان ١٧٠ سەرخێزانن كو دبنە (١٣٢٣)كەس.

٥- **تاخێ ئازادی،** دیسان پتریا پێكهاتا وان كوردێن موسلمان و ئێزدی نە، ژمارا سەرخێزانێن وان ٣٤٧ سەرخێزانن و دبنە (٢٤٩٨) كەس.

٦- **تاخێ رۆناهی،** ژمارا سەرخێزانێن وان ٣٢٢ سەرخێزانن و دبنە (٢٣٢٩)كەس و پێكهاتا وان پتر كوردێن موسلمان و ئێزدی نە، خواندنگەهەك لێ هەیە و سەر ب حكۆمەتا هەرێمێ یە.

٧- **تاخێ سەربەستی،** هەمان پێكهاتا كوردێن موسلمان و ئێزدی نە، پێكدهێت ژ٢٦٨ سەرخێزانان كو دبنە (١٦٢٧)كەس، نها خواندنگەهەك سەر ب حكۆمەتا هەرێمێ ڤە لێ هەیە.

٨- **تاخێ ئاشتی،** پتریا پێكهاتا وێ ژ كوردێن موسلمان و ئێزدی نە، ژمارا سەرخێزانێن وێ ١٧٤ سەرخێزانن و دبنە (١٣٢٠)كەس[١٦].

**تێبینی،** ژمارا ئاكنجیان ل ناڤەندا قەزا شێخان (٢٣٥١١)كەسن و دبنە (٣٣٥٠) سەرخێزان ژ كورد و عەرەبان.

ل دووڤ دوائامارێن تەخمینكری (التقدیری) یێن

**شێخان**



رێڤەبەریا ئامارا دهۆكێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ هژمارا خەلكێ سەرانسەری قەزا شێخان ١٥٠٨٠٩ كەسە، ژ وانا ٩٣٤٥٧ كەس ل باژێر و باژێركان و ٥٧٣٥٢كەس ل گوندان دژین[١٧].

## خواندنگەهـ ل ناڤەندا قەزایێ:

ئامادەیێن ئاماد یا كوران، سەركێش یا كوران، هەژەند یا كچان، نیڤار یا كچان، شێخان یا ئێڤاریان كو ل سالێن ٢٠٠٤، ٢٠١١، ٢٠١٢، ٢٠١٢، ٢٠١٤ ل دووڤ یەك هاتینە دامەزراندن. ئامادەیا ئێسفنێ یا كوران، دوواناوەندیا شێخان، ئامادەیا ئێسفنێ یا كچان، یێن كو ل سالێن ١٩٥٥، ١٩٩٤، ٢٠١١ێ ل دووڤ یەك هاتینە دامەزراندن و سەر ب حكۆمەتا ناڤەندی ڤەنە. هەر وەسان خواندنگەها گولا زەر یا كچان، سەرتیپ یا كچان، دیاكو یا كوران یێن ناڤنجی كو ل سالێن ٢٠١١، ٢٠١٤، ٢٠٠٩ێ هاتینە دامەزراندن، ژبلی ناڤنجییا ئێسفنێ یا كوران، كو ل سالا ٢٠٠٥ێ هاتییە دامەزراندن و سەر ب حكۆمەتا ناڤەندی ڤەیە، دیسان خواندنگەهێن سەرەتایی یێن پێكڤە ژیان یا تێكەل، كانی مەهدكا یا كوران، كو ل سالێن ٢٠٠٤، ١٩٦٣ێ هاتینە دامەزراندن، هەر وەسان خواندنگەها ئێسفنێ یا یەكێ- تێكەل، ل سالا ١٩٥٣ێ هاتییە دامەزراندن و سەر ب حكۆمەتا ناڤەندی ڤەیە و خواندنگەهێن خۆشاڤا یا تێكەل، كانی رەشكێ یا تێكەل، ئازادی یا تێكەل، مشەختی، ناڤنجیا سەركان یا كوران، سەروكانی یا سەرەتایی كو ل سالێن ٢٠١٠، ٢٠١١، ٢٠٠٣، ٢٠١٠، ٢٠٠٩، ٢٠٠٦ێ ل دووڤ یەك هاتییە دامەزراندن، ناڤنجیا ئێسفنێ یا كچان، خواندنگەها زەینولعابدین، كو ل سالێن ٢٠٠٩، ١٩٩٠ێ هاتینە دامەزراندن و سەر ب حكۆمەتا ناڤەندی ڤەنە. ژبلی باخچێ زەلال یێ زارۆكان، كو ل سالا ٢٠١٤ێ هاتییە دامەزراندن و باخچێ ئێسفنێ یێ زارۆكان، كو ل سالا ١٩٧٤ێ هاتییە دامەزراندن و سەر ب حكۆمەتا ناڤەند ڤەیە[١٨].

## ناڤێ فەرمانگەهێن حكومی ل ناڤەندا قەزایێ:

دادگەها شێخان، قایمقامیا شێخان، رێڤەبەریێن (پۆستە و گەهاندنێ، ناسنامێ، ئاسایشا شێخان، پۆلیسێن شێخان، نەهێلانا گونەهباریان ل شێخان، ئاڤ و سۆلینان، كارەبێ، باژێرڤانیا شێخان، تاپۆیا شێخان، چاندنێ، گەشت و گوزار، باجێ ل شێخان، رەوشەنبیری و هونەری، چاڤدێریا جڤاكی، پەروەردێ، ئەوقافێ، وەرزش و لاوان، ئامارا شێخان، ئاگر ڤەمراندنا شێخان، توند و تیژیێ دژی ئافرەتێ)، بنكەهێ لالش یێ رەوشەنبیری، بنكەهێ رەوشەنبیری، یانەیا شێخان یا وەرشی، یەكەتیا كرێكاران، یەكەتیا مامۆستایان، یەكەتیا جۆتیاران، یەكەتیا زانایێن ئایینێ ئیسلامێ، یەكەتیا ژمێریاران، بەنكا شێخان، سایلویا شێخان ، كولیژا پەرستیاریێ، كولیژا نۆر یا زانكو، پەیمانگەها تەكنیكی، دەستەكا بلندا دەڤەرێن كوردستانی ژ دەرڤەی هەرێمێ، دەستەكا زیندانیێن سیاسی، نەخۆشخانا شێخان یا گشتی، بنكەهێ ساخلەمیێ، بنكەهێ ساخلەمیێ بۆ خێزانێن شەهیدان.

## ناڤێن قایمقامێن قەزا شێخان:

١- مەروان بەگ (١٩٣٧- ١٩٣٨).
٢- جەلال خالد (١٩٣٨- ١٩٣٨).
٣- لازار تۆما ئیبراهیم (١٩٣٨- ١٩٤٠).
٤- عەبدلهادی ئەلئەعزەمی (١٩٤٠- ١٩٤٢).
٥- سەلمان جویدە (١٩٤٢- ١٩٤٣).
٦- نازم ئەلوەنداوی (١٩٤٣-١٩٤٥).
٧- شاكر فەتاح (١٩٤٥- ١٩٤٧).
٨- جەلال خالد (١٩٤٧- ١٩٥٢).
٩- حەجی فازل (١٩٥٢- ١٩٥٥).
١٠- جەمیل خۆشناو (١٩٥٥- ١٩٥٦).
١١- جون ئەلعەنبەری (١٩٥٦- ١٩٥٨).

١٢- رەشید ئەلجەعفەری (١٩٥٨- ١٩٦٠).
١٣- عەلی نیهاد (١٩٦٠- ١٩٦٢).
١٤- موسا عەلوش (١٩٦٢- ١٩٦٥).
١٥- عەبدولجەبار ئەلدۆری (١٩٦٥- ١٩٦٨).
١٦- حەجی مادۆ حاجی (١٩٦٨- ١٩٦٩).
١٧- سیروان عەبدولا جاف (١٩٦٩- ١٩٧٠).
١٨- محەمەد مەهدی ئەلخەفاجی (١٩٧٠- ١٩٧١).
١٩- حاجی رەسول محەمەد (١٩٧١- ١٩٧٣).
٢٠- سەعید عزەددین حەمودی (١٩٧٣- ١٩٧٤).
٢١- سەعدی رەشید سالح تکریتی (١٩٧٤- ١٩٧٦).
٢٢- محەمەد رزا محەمەد ئەلخەتیب (١٩٧٦- ١٩٧٧).
٢٣- جاسم سالم جاسم ئەلحەمدانی (١٩٧٧- ١٩٧٩).
٢٤- عەباس مەهدی سالح (١٩٧٩- ١٩٨١).
٢٥- ئیبراهیم خەلیل ئەلحەدیسی (١٩٨١- ١٩٨٤).
٢٦- عەبدولرزا کازم عەبدولرزا (١٩٨٤- ١٩٨٥).
٢٧- عەبدولحسێن حەسەن عەلی ئەلیاسری (١٩٨٥- ١٩٨٨).
٢٨- حاکم حسێن جاسم (١٩٨٨- ١٩٩١).
٢٩- شکر مەحمود مخێلف (١٩٩١- ١٩٩٣).
٣٠- راگر (ئەلعەمید) سەعدی شوکری مەحمود (١٩٩٣- ١٩٩٨).
٣١- راگر (ئەلعەمید) عەباس محەمەد عەبدولحسێن (١٩٩٨- ١٩٩٩).
٣٢- راگر (ئەلعەمید) مەجید حسێن محەمەد ئەحمەد (١٩٩٩- ٢٠٠٠).
٣٣- تالب ئیبراهیم سەمیر ئەلدلێمی (٢٠٠٠- ٢٠٠٣).
٣٤- باسل جۆقی دەروێش (٢٠٠٣- ٢٠٠٥).
٣٥- خەیری نەعمو (٢٠٠٥- ٢٠٠٧).
٣٦- بۆتان محسن (٢٠٠٧- ٢٠٠٩).
٣٧- حەسو نەرمو (٢٠٠٩- ٢٠١٣).
٣٨- ئیسماعیل مستەفا رەشید
٣٩- سەردار عەبدولعەزیز ٢٠١٦/٢/١٤ێ دەست ب کار کریە و بەردەوامە

شێخان



# گوندێن سەر ب ناڤەندا قەزا شێخان

محەمەد عارف تاتار
پیر خەلات ئەلیاس جەعفۆ

## گوندێ کێس قەلەە:

پتریا خەلکێ گوندی موسلمانن ژ عەشیرەتا زێدك، سالا ۱۹۷۵ێ و تا سالا ۲۰۰۳ێ هاتبوو تەعریبکرن، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (۱۹۵۷)ێ ۳۹ کەس بوون[19]، نها نێزیکی ۳٦۷ کەسانە کو دبنە ٤٦ سەرخێزان، ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە ژ پەز و چێلان، نها خواندگەهەك و بنکەهێ ساخلەمیێ لێ هەنە کو سەر ب حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ڤەنە.

## گوندێ گەلی خودێدە:

پتریا خەلکێ وێ کوردێن موسلمانن ژ عەشیرەتا کۆچەرێن زێدك، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (۱۹۵۷)ێ ۱۰۰ کەس بوون[20] و نها نێزیکی ۱۳۹ کەسانە کو دبنە ۲۰ سەرۆك خێزان، ژیانا وان ل سەر چاندنا دەرامەتێ دێمە ژ گەنم و جەهـ و نۆکان. نها خواندنگەهەك لێ هەیە و سەر ب حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ڤەیە.

## گوندێ حسێنییێ:

گوندەکێ چۆلە و پتریا خەلکێ وی کوردێن موسلمان بوون.

## گوندێ گرموبارەك:

گوندەکێ ئێزدینشین بوو، دکەتە دووراتییا (۳۰۰م) باشوورێ جادا سەرەکییا دهۆك- هەولێر، رووبەرێ وی (۹۰۰) دۆنەمێن عەردی نە، سالا ۱۹۷۱ێ هاتییە خرابکرن و هەتا نها چۆلە و خەلکێ وی ل کۆمەلگەهـا مەهەتێ دژین کو ئەو ژی هەمی ژ مریدانە ژ عەشیرەتا هەکاریا، ناڤێ گوندی ژ ناڤێ گۆرەکێ پیرۆز ل نك ئێزدیان هاتییە و هەر سال تەوافا وی دکەن، سنوورێن وی ژی ب ڤی رەنگی نە:

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** ناڤەندا قەزا شێخانە.

**باشووری:** گوندێ کەندالە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێتناز.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گرخاس.

ڤی گوندی چەند نیشانێن خاسان و بابچاکان لێ هەنە، وەکی: دایکا پیرۆز ل سەرێ گری، شێخ بازید کو ل سەدسالیا یازدێ ژیایە دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گری ب دووراتییا (۵۰م)، و کیژا ب کەنیش ل رۆژهەلاتێ گری ب دووراتییا (۲۰۰م)، وەك: چیڤانۆك دبێژن ئەو دگەل دایکا پیرۆز ڤەدگەرینەڤە سەر دەمێ تۆفانا نۆحی ، چونکی نۆحی سێ کور ب ناڤێن (سام و لام و کام)

هەبوون و پشتی ئاڤا تۆفانێ ژ چیایێ جۆدی هاتییە لالشێ و ل قەزا شێخان ژیایە و (گر موبارەك) دایە کورێ خۆ (کام).

ژمارا خەلکێ ڤی گوندی دگەهیتە (٤٠) سەرۆکخێزانان، کو دبنە (١٣٠) کەس[21] ل کۆمەلگەهێ مەهەتێ دژین.

## گوندێ مەمان:

یەك بوو ژ گوندێن تا سالا ٢٠٠٣ێ ب عەرەبکری، پێکدهێت ژ کوردێن موسلمان ژ عەشیرەتا کۆچەرێن زێدك، ژمارا سەرخێزانێن وان ٢٤ سەرخێزانان کو دبنە ٢٤٠ کەس، ژیانا وان یا سەرەکی ل سەر چاندنێ و ب خودانکرنا تەرش و کەوالی یە، خواندنگەها وێ ل سالا ١٩٧٦ێ هاتبوو دامەزراندن و نها سەر ب حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ڤەیە.

## گوندێ مام رەشان:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (٢کم) باکوورێ رێکا سەرکییا دهۆك- هەولێر، رووبەرێ عەردێ وی (٥٠٠٠) دۆنەمن، تا سالا (٢٠٠٣)ێ یێ ب عەرەبکری بوو، ناڤێ گوندی ژ ناڤێ عەشیرەتا (مام رەشان) هاتییە، سنوورێن وی ژی ب ڤی رەنگی نە:

**باکووری:** گوندێ جەروانە.

**باشووری:** کۆمەلگەها مەهەتێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ پیران.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باقەسرێ.

### پێکهاتا جڤاتی:

ئەڤ گوندە گوندەکێ ئێزدینشینە ژ هەرسێ چینان شێخ و پیر و مریدانە، چینا شێخا ژ

**گوندێ کیس قەلعە**



شێخێن ئامادین و شێخێن خاتۆنی و چینا پیران پیرێن محەمەد رەشان و پیرێن هاجیالی و پیر بالی نە و مرید ژ ڤان عەشیرەتێن: (دوملی، خیسکی، هەکاری، خەتاری، قایدی، ماسەکی، مامۆسی، هەراقی، پێدەیی)نە.

## نیشانگەهێن خاس و بابچاکان:

(پیر داود، محەمەد رەشان، شێشمس، مەلك شێخسن، شێخادی)، ڤان خاسان ل سەدسالیا دووازدێ سەرەدانا پیر داود و محەمەد رەشان کرینە و نیشانێن وان هاتینە دانان.

ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ئەڤ گوندە ١٨٦ کەس بوونو نها ژ ٢٦٥ خێزانانن، دبنە نێزیکی ١٤٣٠ کەسا، ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و نۆك و خیارانە، خواندنگەها وێ ل سالا ١٩٥٨ێ هاتیە دامەزراندن و نها خواندنگەهەك سەر ب هەرێما کوردستانێ ڤە لێ هەیە[٢٢].

## گوندێ باقەسرێ:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (٢کم) باکوورێ رێکا سەرکییا دهۆك- هەولێر، رووبەرێ عەردێ وی (٣٥٠٠) دۆنەمن، ناڤێ گوندی ژ (قەسر) هاتیە، دگۆتنێ (قەسرۆك) کو ل جهێ گوندی هەبوو یا شێخ عەمەری بوو کو ل وی سەردەمی قەسر کەلەك کێم هەبوون. پشتی فەرمانەك هاتیە سەر گوندی شێخ عەمەر چوو پێشییا وان و گۆتێ من بکوژن و قەسرێ خراب نەکەن، بەلێ وان شێخ عەمەر ژی کوشتن و قەسرا وی ژی خرابکرن و خەلکێ گوندی شێخ عەمەر ل نك قەسرێ ڤەشارتن و گۆتنێ: باقەسرێ، و ژ قەسرۆکێ بۆ باقەسرێ. ئەڤ گوندە هەر ژ سالا ١٩٧٥ێ و تا سالا ٢٠٠٣ێ کەتبوو ژێر هەوا تەعریبێ، سنوورێن وی ژی ب ڤی رەنگی نە:

## سنوورێن گوندی:

**باکوورێ رۆژئاڤایی،** ناڤەندا قەزا شێخان.

**باشووری،** گوندێ بێتناز.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مام رەشا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ دوشیڤان.

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

ئەڤ گوندە گوندەکێ ئێزدینشینە، ژ هەرسێ چینێن شێخ و پیر و مریدان، ژ شێخان شێخێن شێخ مۆس، شێخۆ بەکر. ژ پیران ژی پیرێن هاجیالی، مرید ژی ژ عەشیرەتێن خیسکی، دوملی، بەلەسینی، دنایی نە. ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩١ کەس بوون[٢٣] و نها (٢٦) سەرۆکخێزانن، کو دبنە نێزیکی (١٤٠) کەس.

## نیشانگەهێن خاس و بابچاکێن:

(عەڤدێ رەش، شێخۆ بەکر، مەلك شێخ سن، ئێزی، خاتۆنا فەخرا، عەبدلعەزیز ل حەربێ، ئەڤ خاسە ل سەدسالیا دووازدێ بوون.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و نۆك و خیارانە[٢٤].

## گوندێ بیت نار:

ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ وی گری هاتی کو دکەڤیتە رۆژهەلاتێ گوندی و وەسان دهێتە هزرکرن کو پەرستگەهەکا ئاگری یا سەردەمێ زەردەشتیان بیت. ل دووڤ ڤەگێرانێن خەلکێ گوندی ئەڤ گوندە ژ ئالیێ (لام)ێ کورێ نوح پێغەمبەری (س)ڤە هاتییەئاڤاکرن و دگۆتنێ (بێت لام) ئانکو مالا لامی، هەر دەربارەی ناڤێ گوندی (بێت نار) ژ ئاگری هاتیە وەك دهێتەڤەگێران ل مەها ئەیلوولا ١٨٩٩ێ گوندیان دروینا خۆ ب داوی ئینابوو، قرشێ وان ل ناڤ گوندی تایبەت سەرێ گری کۆمکربوو ژ بەر دێرانێ کو گەنم و جەهـ و نیسك و نوك و باقلك بوو ژبەر بای و برویسییان ئاگر کەتە قرشی دگەل پتریا گوندی هاتەسۆتن ژ هنگی ڤە ناڤێ گوندی ژ بێت لام بوویە بێت نار.

**سنوورێن گوندی:**

**رۆژهەلاتی:** كۆمەلگەهێ مەهەتێ

**رۆژئاڤایی:** سەنتەرێ قەزا شێخان

**باكووری:** باقەسرێ

**باشووری:** دۆلە هژیر

ژمارا خەلكێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣٣ كەس بوون[٢٥] و نها ١٣٠ خێزانن نێزیكی ٧٨٤كەسانە كوردێن ئێزدی نە، ٢٧٥٠ دۆنەمێن عەردێ هەنە. ئەڤ گوندە ژی هەر ژ سالا ١٩٧٥ێ و تا سالا ٢٠٠٣ێ كەتبوو ژێر هەوا تەعریبێ، ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی یە. خواندنگەها وێ سالا ١٩٧٦ێ هاتیە دامەزراندن و نها خواندنگەهەك سەر ب حۆكمەتا كوردستانێ ڤە لێ هەیە.

گوندی دو كانیێن ئاڤێ هەنە:

١- **كانیا شەرفەدین** ژێدەرێ سەرەكیێ ڤەخوارنا گوندی بوو، ژبەركو ئێدی خەلك پێدڤی ئاڤا كانیا نەمایە ژبەركو سەرێ چەند سالەكانە ئەڤ كانیە نەهاتیە ڤەدان و پاقژكرن، لەوما ئاڤا وێ ل كێمیێ دایە.

٢- **كانیا شێخێ زەری،** كانیەكا شوورهەكریە، ل سەر دیوارێ ئالیێ رۆژئاڤایی نیشانە و جهێ چرایەك و بەرەك ل جەم هەیە ناڤێ خودێ ل سەرە، ل دووڤ باوەریا خەلكێ دەڤەرێ ئاڤا ڤێ كانیێ چارەسەریا ئێشا نەزەرێ دكەت، خەلكێ گوندی گەلەك خزمەتا ڤێ كانیێ دكەن، هەر سال پاقژدكەن، ئاڤا ڤێ كانیێ دهورتە بنیا گوندی ل ئالیێ رۆژهەلاتی، بۆ ئاژەلان و دەمەكی بۆ چاندنێ مفا ژێ دهێتەوەرگرتن.

**نیشانگەهێن خاسا:**

شەرەفەدین، شێخێ زەری و شێخ عەبروس[٢٦].

**گوندێ بیت نار**



## گوندێ پیربۆب:

یەك ژ گوندێن دەڤەرێ کو ژ سالا ١٩٧٥ێ و تا رزگارکرنا عیراقێ ل سالا ٢٠٠٣ێ هاتییە تەعریبکرن، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٨٣ کەس بوون[٢٧] و نها ٧٩ خێزانێن کوردێن موسلمانن کو دبنە ٥٤٩ کەس لێ هەنە، ژیارا وان یا سەرەکی ل سەر چاندنا گەنمی یە، ژبلی خیار و بەقلەمەنییان و چاندنا وان پشتبەستنێ ل سەر رووبارێ گوملی دکەت. سالا ١٩٥٨ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن و نها خواندنگەهەك لێ هەیە و ئەو ژی سەر ب حۆکمەتا هەرێما کوردستانێ ڤەیە.

## گوندێ باصفنە:

گوندەکە پێکدهێت ژ ١٦ خێزانێن موسلمانێن عەرەب، سەر ب هۆزا حەدیدیان ڤەنە، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٣ کەس بوون[٢٨] و نها ١٣٥ کەس ل گوندی دژین، ژیانا وان ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و خودانکرنا پەز و چێلانە.

## گوندێ گرخالس:

گوندەکێ کوردێن موسلمان بوو، ل سالا ١٩٧٥ێ هاتبوو تەعریبکرن و نها چۆلە. ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧١ کەس بوون[٢٩].

## گوندێ شیفترین:

گوندەکە نها پێکدهێت ژ ٢٩خێزانێن عەرەب کو ژمارا وان دگەهنە ١٣٨کەسان، و ژمارا وان ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٥ کەس بوون[٣٠]. ناڤێ گوندی یێ ژ وێ ئاڤا کانییا شرین هاتی کو دکەڤیتی بنێ دۆلا ل نك گوندی. ژیارا وان ب شێوەیەکی سەرەکی ل سەر چاندنا گەنم و جەهانە، ژبلی چاندنا خیار و بەقلەمەنییان و خودانکرنا چێل و پەزان. نها خواندنگەهەك لێ هەیە کو سەر ب حۆکمەتا ناڤەندی ڤەیە.

## گوندێ نێرگزلیە:

گوندەکە پێکهاتا وی ٣٧٣ خێزانێن عەرەبێن موسلمانن کو دبنە نێزیکی دو هزار کەسان، ژمارا وان ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢١٩ کەس بوون[٣١]. ژیارا وان یا سەرەکی ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە، ژبلی کاسبکارێ. نها دو خواندنگەهـ لێ هەنە و سەر ب حۆکمەتا ناڤەندی ڤەنە، ژبلی بنکەهەکێ ساخلەمیێ.

## گوندێ جەروانە:

گوندەکێ کەڤنارە، ب (زێوێ)، (زێوا پیرێ جەروان) ژی دهێتە نیاسین، دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) باکوورێ جادا سەرکییا دهۆك - هەولێر، رووبەرێ عەردێ وی (٣٨٨٠) دۆنەمن، سنوورێن وی ژی ب ڤی رەنگی نە:

**باکووری،** باسڤنێ.

**باشووری،** کۆمەلگەها مەهەتێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ شیفکێ.

**رۆژئاڤایی،** ناڤەندا قەزا شێخان.

### پێکهاتا جڤاتی:

خەلکێ ڤی گوندی ئێزدینە ژچینا پیرێن پیر جەروان و مریدان، ژ هەردو عەشیرەتێن دوملی و هەکاری، ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە تەعریبکرن و هەتا نها چۆلە.

### شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن گوندی ژی کەڤنترین سکر ل جیهانێ کو ل سەردەمێ شاە سەنحاریبی (٧٠٤-٦٨١پ. ز)ێ هاتییە دروستکرن ل ڤی گوندی هاتییە چێکرن، و ئاڤ ژ سکری د ڤەگوهاستنە مووسل و ئەو ئاڤ ب دەریا دهاتە نیاسین و هەتا سەدسالییا دووازدێ دگۆتنێ (دەریا نژنی) و دەمێ پیر جەروان هاتی ئاڤاهیێ خۆ لێ دروستکری و لێ ئاکنجی بووی ب جەروان هاتە نیاسین، یان دبێژن ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ چەروان هاتی، ب واتایا چەروانێ پەزی ئەو جهێ

پەز خوارنێ لێ دخۆت و ڤەدخۆت بێ هاتی، لێ هندەك ژێدەرێن عەرەبی دبێژن یێ ژ جوویێ (ئەو جهێ ئاڤ لێ دچیت) بێ هاتی.

هەژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٣٣ کەس بوون[٣٢] و نها (٤٠) خێزانن، کو دبنە (١١٠) کەس[٣٣].

## گوندێ کەندالی:

ئێکە ژ وان گوندێن ل سالا (١٩٧٥)ێ کەتییە بەر هەوا تەعریبێ، دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) باشووری رێکا سەرەکییا دهۆك- هەولێر. ل سەر ناڤێ گوندی ژی ژ کەندێ ئاخێ هاتییە، لەوما دبێژنێ کەندال.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ گر مبارەك.

**باشووری،** گوندێ تاقە حەرب.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مەحمووددا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ کیس قەلعە.

### پێکهاتا جڤاکی:

خەلکێ ڤی گوندی ئێزدی نە، ژ چینێن شێخ و پیر و مریدان، ژ چینا شێخان شێخێن مەلك شێخ سن، شێخ مۆس، پس میر، ئامادینە، خاتۆنێ، ژ چینا پیران ژی: پیرێن مەهمەدی رەبەن، پیرێ ئالی، پیرێ جەروا. چینا مریدا ژی ژ ڤان عەشیرەتان پێکهاتینە: دوملی، خیسکی، جەهسانی، هەکاری، ترك، ماموسی، قایدی، پێدەیی، دنایی. ژمارا خەلکێ ڤی گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ (٣٤٣) کەس بوون[٣٤]، نها خەلکێ گوندی ٣٦٥ خێزانن و دگەهنە نێزیکی ٢٧٥٠ کەسان و ٦٠٠٠ دونەمێن عەردێ چاندنی هەنە.

### ژ نیشانگەهێن خاسا ل ڤی گوندی ئەڤەنە:

ئێزی، شێخادی، عەڤدێ رەش.

هندی ئێزی یە وەکی ئامازە ل پێشتر پێ هاتییەکرن ئێکە ژ ناڤێن خودێ و شێخادی و عەڤدێ رەش ژی ل سەدسالیا دووازدێ بوون.

کوندێ کەندالی



یەكەم خواندنگەهـ ل سالا (١٩٥٩)ێ لێ هاتییە ڤەكرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٧٥)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن و هێلا كارەبێ سالا (١٩٧٩) گەهشتییە گوندی[٣٥].

## گوندێ شێخ مەلوان:

گوندەكە پتریا وان عەرەبێن موسلمانن، پێكدهێت ژ ٧٠ سەرۆك خێزانان كو دبنە ٤٨٨كەس، ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ شێخێ عەشیرەتا وان هاتی، ژیارا وان یا سەرەكی ل سەر چاندنێ و خودانكرنا تەرش و كەوالی یە. نها خواندنگەهەك و بنكەهەكێ ساخلەمیێ لێ هەنە و سەر ب حۆكمەتا ناڤەندی ڤەنە.

## گوندێ پیران شێخان:

گوندەكە ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە تەعریبكرن، ژمارا خەلكێ وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١١٣ كەس بوون[٣٦] و نها ژ ١٤ سەرۆك خێزانێن كوردێن موسلمان پێكدهێت كو دبنە ٧٦كەس، ژیارا وان ل سەر چاندنا گەنم و جەهانە.

## گوندێ كێتك:

پتریا خەلكێ وی عەرەبن ، پێكدهێت ژ ٤٥ سەرۆك خێزانان كو دبنە ٢٧٥ كەس.

## گوندێ جفتە:

گوندەكێ كوردنشینبوو، سالا ١٩٧٥ێ هاتبوو تەعریبكرن، ژمارا خەلكێ وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٧ كەس بوون[٣٧] و نها ژ ٦٥ سەرۆك خێزانێن كوردێن موسلمان پێكدهێت.

## گوندێ دەربەستە:

پێكهاتا وێ كوردێن موسلمان بوو، سالا ١٩٧٥ێ هاتبوو تەعریبكرن و نها چۆلە.

## گوندێ ئشكەفتە:

دیسان گوندەكێ كوردێن موسلمان بوو، سالا ١٩٧٥ێ هاتییە تەعریبكرن و نها چۆلە. ژمارا خەلكێ وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٦٧ كەس بوون[٣٨].

## گوندێ گرخاسێ (گر خالس):

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتیا (٦كم) باشوورێ قەزا شێخان و (٧٠٠م) باشوورێ رێكا سەركیا دهۆك- هەولێر، رووبەرێ عەردێ وی (٢٦٩٣) دۆنەمن، ناڤێ گوندی یێ ژ گرێ خاسان هاتی ژبەر هەبوونا ڤان خاسان: شێخ محەمەدێ باتنی، شێشمس، شێخ بەكر، خدرلیاس، ئێزی، غەفوورێ رێ، مەمێ شڤان، محەمەد رەشان، دایكا چاك، شێخادی).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** ناڤەندا قەزا شێخان.

**باشووری:** گوندێ كیس قەلعە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گرموبارەك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شیف شرین.

### پێكهاتا جڤاتی:

خەلكێ ڤی گوندی ئێزدینە ژ چینا پیرێن مەمێ شڤان و مریدان ژ هەرسێ عەشیرەتێن دوملی و هەكاری و قایدی، هەژمارا سەرخێزانێن وان (٦٤) سەرخێزانن، كو دبنە (٣١١) كەس.

ئەڤ گوندە یەك ژ وان گوندانە كو رێ و رەسمێن سەرسالا ئێزدیان، ل چارشەمبیا یەكێ ژ هەیڤا نیسانێ ب مێژوویا رۆژهەلاتی لێ دهێتە گێران. ل پشتی جەژنێ ئێزدی ژ هەمی دەڤەران قەستا لالشێ دكەن و رێكێن دویر ددەنە بەرخۆ و ل رۆژا نەهێ پشتی جەژنێ دگەهنە گوندێ (گرخاسێ) و رۆژا دەهێ دبیتە تەوافا گوندی و میرێ ئێزدیان دهێتە ڤی گوندی و هەمی تەوافێ لێ دكەن و سماتا خاسان و بابچاكان ل گوندی دخۆن و پشتی نیڤرو پێكڤە بەرێ خۆ ددەنە لالش[٣٩].

# ناحیا ئەتریش

موسەدەق تۆڤی

ناحیا ئەتریش* یەك ژ پێنج ناحیێن سەر ب قەزا شێخان یا پارێزگەها دهۆكێ یە، (١٨كم) ژ مەلبەندێ قەزا شێخان دوورە، یەك ژ ناحیێن هەرەكەڤنێن پارێزگەها دهۆكێ یە، ل سالا ١٨٧٩ێ سەردەمێ دەولەتا ئوسمانی بوویە ناحیە و ب ناحیا مزووری دهاتەناڤكرن[١]، ئەڤە ژی ژبەر وێ چەندێ بوویە كو پتریا پێكهاتا خەلكێ وێ وی دەمی و نها ژی ژ عەشیرتا مزووری نە، ئانكو ئەتریش مەلبەندێ ناحیا مزووری بوویە، نها تنێ ب ناحیا ئەتریش دهێتە ناڤكرن.

## سنوورێن ناحیێ:

**باكوور:** ناحیا چەمانكێ یا قەزا ئامێدیێ

**باشوور:** مەلبەندێ قەزا شێخان

**رۆژهەلات:** ناحیا قەسروك

**رۆژئاڤا:** ناحیا زاویتە

## پێكهاتا ناحیێ:

ل دووڤ زانیارێن ڤێ داوێ مە ژ رێڤەبەریا ناحیێ وەرگرتین سەرجەمێ گوندێن سەر ب ناحیا ئەتریش ڤە ٨٧ گوندن ژ وانا ٤٨ گوندێن ئاڤانە و ٣٩ گوند ژی بەردای و خرابەنە، هەروەسان كۆمەلگەهەك ب ناڤێ كۆمەلگەهێ بلدیشا لێ هەیە كو ژ سالا ١٩٩٦ێڤە خەلك لێ ئاكنجی بوویە و پتریا وان خەلكێ دەڤەرا بەرواری ژێری نە كو ژ ئەنجامێ ئالوزی و شەرێن ناڤخۆیی ژ گوندێن خۆ مشەختبووینە و ل ڤی جهی ئاكنجیبووینە[٢].

رووبەرێ گشتیێ ناحیێ (٤٧١كم٢)ە، دبیتە ١٨٨,٤٢٢ دۆنەمێن عەردی[٣]، ل دووڤ سەرژمێریەكا تەخمینكری یا رێڤەبەریا ئامارا پارێزگەها دهۆكێ بۆ سالا ٢٠١٦ێ سەرجەمێ خەلكێ ناحیا ئەتریش ١٣٢٨٢ كەسن، ژ وانا ٣٩٤٠ باژێرنشین و ٩٣٤٢ گوندنشینن[٤]، ژ ئالیێ نەتەوەییڤە كورد و كلدانن، ژ ئالیێ ئایینیڤە خەلكێ وێ موسلمان و مەسیحی و ئێزدینە ب رێژە یا ٩٦٪ موسلمان و ٣,٥مەسیحی و ٠,٥ ئێزدی[٥]، ژ ئالیێ عەشیرەتیڤە پرانیا موسلمانان عەشیرەتا مزووری نە و رێژەیەكا عەشیرەتا بەرواری ژی لێ هەیە.

ژ ئالیێ كارگێری و خزمەتگوزاریڤە ٣٣ خواندنگەهـ لێ هەنە و تنێ یەك ژ وانا ئامادەییە، ئەو ژی (ئامادایا ئەتریش)ە، ٩ بنكەهێن ساخلەمیێ، ٣٣ مزگەفت، ٣ دێر و پەرستگەهەك (پەرستگەها لالش) ل سنوورێ ناحیێ هەنە[٦]، هەروەسان چەندین جهـ و شوینوارێن دیرۆكی و گوزاری لێ هەنە وەك پەرستگەها لالش ب هەمی پێكهاتێن وێ ڤە، گرێ قاسم ئاغا، گەلیێ هنارۆك، گۆرێ مار ئوراها، ناوسكێن گوندێ خنس و بێدیلێ و چەندین ئاش و دێر و جهێن دیتر و جهێن گۆزارێن وەك گەلیێ قیامەتێ بلكێپێ و بێدیلی.

## جوگرافیا باژێرکێ ئەتریش

باژێرکێ ئەتریش دکەڤیتە جهەکێ بلند ل بنارا چیایێ (بەرخ)، تایبەتمەندییەك هەیە کو دکەڤیتە ناڤبەرا دو عەشیرەتێن مزووری و بەرواری ژێری، ژبەر جهێ وێ یێ جوگرافی ئەتریش خودان سەقایەکێ خۆش و هوینە و ئەڤێ چەندێ ژی وەکرییە د سەردەمێن بەرێدا هژمارەکا زۆرا خەلکی لێ ئاکنجی بن، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ل عیراقێ هژمارا خەلکێ باژێرکێ ئەتریش د ڤێ سالێدا ٨٥٢٠ کەس بوون[٧]. ل سالا ١٩٦١ێ بەری باژێرك بکەڤیتە بەر بۆمبا بارانا فرۆکێن عیراقێ (٧٠٠) خێزان کو دبوونە دۆرێن (٣٠٠٠کەسان) لێ دژیان[٨]. هەرچەندە ژ دامەزراندنا ناحیا مزووری و هەتا نها سەنتەرێ ناحیێ یە و گرنگییەك دیرۆکی و رەوشەنبیری و کارگێری هەیە، بەلێ ژبەر ئەو کاودانێن دژوارێن ژ سالا ١٩٦١ێڤە ب سەرێ ئەتریش هاتین هەتا نها مایە باژێرکەك بچووك و پاشڤەمایە، تنێ ١٤٣ خێزان لێ دژین و هژمارا خەلکێ وی دەوروبەرێن ٧٥٠ کەسانە[٩]، ب بۆچوونا مە ئەگەرێ ڤێ پاشڤەمان و مەزننەبوونا باژێری سەروبەرێ وی یێ دیرۆکی و جوگرافی بوویە، دیرۆکێ ژی غەدر لێ کرییە و جوگرافیا وی ژی نەهاریکار بوویە.

دەربارەی ناڤێ ئەتریش – ئەترویش دهێتەگۆتن ژبەرکو ئەتریش جهەکێ بلندە و زوو رۆژ لێ ددەت لەوما ژ کەڤندا بۆ هاتییەگۆتن هات رۆژ ئەڤ دو پەیڤە بووینە ئەتریش[١٠].

## سنوورێن باژێرکێ ئەتریش:

**باکوور:** گوندێن نسرا و رەبەتکێ

**باشوور:** گوندێن مکێرس و تلدیف

**رۆژهەلات:** گوندێن ئازەخ و دێرەخترا و شەهیا

**رۆژئاڤا:** گوندێ کەریمئاڤا[١١].

ئەتریش



## پێکهاتا خەلکێ ئەتریش:

خەلکێ رەسەنێ باژێرکی ژ ١٢ بنەمالان پێکهاتییە، ئەوژی:

١- بنەمالا ئۆمەر
٢- بنەمالا حەجی حەسەن
٣- بنەمالا جەرگیس ئاغای
٤- بنەمالا سەیدای
٥- بنەمالا هەمزێ
٦- بنەمالا حسێنی
٧- بنەمالا محەمەد ئەحمەدا
٨- بنەمالا تەهای
٩- بنەمالا شێخی
١٠- بنەمالا حەجی ئیسفی
١١- بنەمالا بەرەکات
١٢- بنەمالا شێلازا

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ئەتریش جهەکێ دەولەمەندە ب ژێدەرێن ئاڤێ چەند کانی: کانییا گوندی، کانییا مالا شێخی، کانییا کورا کەندالا، کانییا لاتکا و کانییا کولکێ دۆسکییا لێ هەنە، هەروەسان دو رووبار ب ناڤێن رووبارێ ئەتریش و رووبارێ رووی گەرمەی و دو نهالێن ئاڤێ نهالا شیڤا بەرمێشکی و نهالا کولکێ دۆسکییا و جۆیێن ئاڤێ ب ناڤێن جۆیا باتڤرێ، جۆیا سەرکاڤلا، جۆیا ناڤبەرکا و جۆیا ئاشا لێ هەنە. هەژییە بێژین ل سالا ١٩٩٣ێ پرۆژێ ئاڤێ ل ئەتریش هاتییە دانان و ئاڤ ل سەر مالان بەلادبیت[١٢].

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ ئەتریش:

ژێدەباری چاندنا دێم وەك چاندنا گەنم و جەهـ و نیسك و باهیڤ و تری ...هتد خەلکێ ئەتریش ب بەرفرەهی چاندنا ئاڤی وەك برنج و کونجی و ماش و هەمور جۆرێن کەسکاتی و فێقی ژی دکرن، د سەردەمێن بەرێدا ڤان بەرهەمان دگەل خودانکرنا پەزی ژێدەرێن ژیارا خەلکێ باژێرکی پێکدئینا و ژبلی هندێ کو ئەتریش سەنتەرەك کارگێری بوو هندەك ژ خەلکێ وێ فەرمانبەر و مووچەخۆربوون. د سەردەمێ نهاداژی هندەك ژ وان مووچەخۆرن و یێن دی ژی دەبارا خۆ ب چاندنێ دکەن[١٣].

## ئەتریش د مێژوویێدا:

هندی پەیوەندی ب ئالیێ مێژوویڤە هەی، ل دووڤ ئەو ژێدەرێن نها ل بەردەستێ مە هەتا سەدسالیا هەڤدێ زایینی د ژێدەراندا ئاماژە ب ناڤێ ئەتریشێ نەهاتییەکرن، بەلێ دیارە گوند ژ ڤێ سەدسالێ کەڤنتر بوویە بەلێ د ڤێ سەدسالێدا ژیانا رەوشەنبیری ل ڤی گوندی پێشکەتییە و دو خواندنگەهـ لێ هەبوون، خواندنگەهەکا زانستێن ئایینی ل سالا ١١٧٥مش/١٧٦١ز و خواندنگەهەکا صوفیاتیێ لێ هاتینەڤەکرن، پشتی کو زانایێ ناڤدار مەلا یەحیایێ مزووری (١٢٥٠مش/١٨٤٣ز مریبە) دەرس ل خواندنگەها ڤی گوندی گۆتین گوند پتر ناڤداربوویە و هاتییەنیاسین. پشتی وی ژی چەندین زانایێن ناڤدار ل خواندنگەها وی یا زانستی وانە گۆتینە پرانییا وان ژ مالباتا عەبدولحەمیدی بوون کو ژ گوندێ بریفکا هاتبوو ئەتریش و ل وێرێ د وارێ زانست و وانەگۆتنێدا کار دکر، ژ زانایێن ئەتریش مەلا ئەحمەدێ ئەتریشی نەڤیێ مەلا یەحیایێ مزووری پشتی وی ژی مەلا عەبدولهادیێ کورێ وی بۆ دەمێ پێنجی سالان هەتا سالا ١٩١٢ز ل خواندنگەها گوندی دەرس گۆتینە. مزگەفتا ئەتریش خواندنگەهەکا ناڤدار بوو" هەموو رەنگێن زانستان و باشترین هۆنەرێن عەرەبی و زمان و مەنتیق و فەلسەفە و کەلام و زانستێن گەردووناسی (فەلەك) و شەریعەتێ ئیسلامێ و فەرمووده (حدیث) و سونەت لێ دهاتنەخواندن" ڤێ چەندێ دەلیڤە ڤەکر مالباتێن زانایان ژ ڤی گوندی دەرکەڤن، نە تنێ ل گوندێ خۆ و دورماندورێن خۆ خزمەتا زانستی بکەن، بەلکی بەرەف جهـ و دەڤەرێن دوور چوون و ل وان جهان کەتنە د هەمان خزمەتێدا

ژ وانا مەلا عەبدولحەمیدێ كورێ عەبدولرەحمانێ ئەتریشی یێ ل گوندێ خۆ دەست ب خواندنێ كری و ژ قۆناغێن خواندنا ئایینی و خواندنگەها فەرمی دەرباز بوویە و پلەیێن زانایێ دەرباس كرین هەتا گەهشتییە پلا قازیێ شەرعیێ عیراقێ و ل سالا ١٩٦٥ێ هاتییەخانەنشینكرن. زێدەباری زانایێن خەلكێ ئەتریش چەندین زانایێن دیتر ژ دەڤەرێن دی وەك شێخ نورەدینێ بریفكانی و مەلا مەحموودێ نهێلی و یێن دیتر قەستا ئەتریش كرییە و ل ئەتریش فێربووینە و خەلكەك فێركرییە[١٤].

ناڤدارییا ئەتریش د وارێ رەوشەنبیری و زانستێن ئایینیدا و خواندنگەهـ و تەكیا ئەتریش بووینە ئەگەر پشتی نەمانا میرگەها بەهدینان ژ نیڤا ئێكێ یا سەدسالییا نوزدێڤە ئەتریش بەری گەلەك باژێر و باژێركێن دی یێن دەڤەرێ وەك مەلبەندەكێ كارگێریێ دەولەتا ئوسمانی بێتەدەستنیشانكرن، بەلكی ژێدەرەك ژ سالناما ویلایەتا مووسل یا سالا ١٣٣٠مـش/١٩١١- ١٩١٢ز ڤەدگوهێزیت كو ناحیا مزووری یاكو مەلبەندێ وێ ئەتریشە ژ ناحیێن مەزنە و دبیت ل ئاستێ قەزایەكێ بیت، هەمان ژێدەر ژ بەلگەنامەیا ژمارە ٢٢١یا ئەرشیڤێ (رئاسة وزراء/ اسطمبول، احالة ایرادات الموصل لسنة ١٢٦٧م/ ١٨٥٠م، اوراق المالیة) ڤەدگوهێزیت: ناحیا مزووری ل نیڤا سەدسالییا نوزدێ قەزا بوویە و د هەمان دیرۆكێدا هێشتا دهۆك ناحیە بوو[١٥].

ل دووڤ سالناما ویلایەتا مووسل یا ١٣٢٥مش ١٩٠٧- ١٩٠٨ز ناحیا مـزووری كو مەلبەندێ وێ ئەتریش بوو ئێكانە ناحیا قەزا دهۆكێ بـوو[١٦]، هـەر د وان سالاندا د ناڤبەرا ١٩٠٥- ١٩٠٩ێ كەسایەتیێ مێژوونڤیس و رەوشەنبیرێ مووسلی سەدیق ئەلدەمەلوجی رێڤەبەرێ ناحیێ بوو ل ئەتریش[١٧]، بەلێ كەنگی ناحیا مزووری (ئەتریش) هاتییەدامەزراندن؟ هاتییەگۆتن ل سالا ١٨٧٩ێ بوویە ناحیە[١٨]، بەلێ ژێدەرەك یان بەلگەنامەیەك ل بەردەست نینە ڤێ چەندێ پشتراست كەت، لێ دووڤ ژێدەرێن ئاماژەپێكری گومان تێدا نینە ئەتریش كەڤنترین یەكەیا كارگێرییە ل دەڤەرێ و هەر ژ سالا ١٨٥٠ێڤە وەك یەكەیەكا كارگێری ئاماژە پێ هاتییەكرن.

ل دووڤ سالناما ویلایەتا مووسل یا سالا ١٣١٢مـش/١٨٩٤- ١٨٩٥ز ١٣٠ گوند سەر ب ناحیا مزووری (ئەتریش) بوون ٣٥ گوند ژ وانا بەردای بوون، بەلێ ل سالناما ١٣٣٠مـش/١٩٠٧- ١٩٠٨ز هژمارا گوندێن ناحیا مزووری ١١٦ گوند بوون[١٩].

سەروبەرێ كارگێریێ ناحیا ئەتریش ب ڤی رەنگی مایە هەتا نەمانا دەستەلاتێ ئوسمانی و دامەزراندنا حكۆمەتا عیراقی ل سالا ١٩٢١ێ، ل دووڤ بەیانا وەزارەتا ناڤخۆیی یا عیراقی د چوارچووڤێ پەیكەرێ كارگێریێ لیوا مووسلدا، ناحیا مـزووری تاكە ناحیا سەر ب قەزا دهۆكێ ڤە بوو[٢٠]، د پەرتووكا (مختصر جغرافیة العراق للمدارس) یا سالا ١٩٢٢ێ هاتییەچاپكرن، دەربارەی ناحیا مزووری گۆتییە: تنێ ناحیا مزووری ل قەزا دهۆكێ هەیە ١١٦ گوند هەنە هەمووژی ئاڤانە و خەلك تێدا هەنە[٢١]. دەمێ ل تەباخا ١٩٣١ێ عەلی سەیدو گەورانی سەرەدانا دهۆكێ كری ژ زاردەڤێ قائیمەقامێ دهۆكێ ئاماژە ب پێكهاتا قەزا دهۆكێ كرییە و گۆتییە: دهۆك سێ ناحیان ب خۆڤە دگریت: ناحیا دهۆك، ناحیا مزووری و ناحیا دۆسكی، هەروەسان دیاركرییە كو مەلبەندێ ناحیا مزووری گوندێ ئەتریشە ٣٠٠ مال ل گوندی هەنە و ٢٠٠ گوند سەر ب ناحیێ ڤە نە[٢٢]. ئەڤ سەروبەرێ كارگێری بەردەوام بوویە هەتا سالا ١٩٥٦ێ د ڤێ سالێدا ب بریارەكا شاهینی (ارادة ملكیة) هژمار (٨٠٩) ل رۆژا٢٤ چریا ئێكێ ١٩٥٦ێ ناحیا مزووی ژ قەزا دهۆكێ ڤەقەتاندینە و داینە دگەل قەزا شێخان[٢٣].

سەروبەرێ كارگێریێ ناحیا مزووری (ئەتروش) ب ڤی رەنگی مایە هەتا دەرچوونا بریارا ب پارێزگەهبوونا دهۆكێ، ل دووڤ بریارا كۆماری هژمار ١٠٦٦ ل رۆژا ٢٧ گولانا ١٩٦٩ بریارا ب لیواكرنا (پارێزگەهكرنا) دهۆكێ هاتییەدان، هندی پەیوەندی ب ناحیا مزووری ڤە هەی ل دووڤ برگا سێ ژ بریارێ: دێ ناحیا مـزووری ب گشت سنوورێ خۆیێ كارگێریڤە ژ لیوا مووسل

هێتەڤەقەتاندن و دێ دگەل لیوا دهۆکێ هێتەگرێدان.
بەلێ د برگا چوارێ ژ هەمان بریارێ هاتییە: دێ ناحیا مزووری ب رەنگەکێ دەمکی مینتە گرێدای دگەل قەزا شێخان یا لیوا مووسلێ هەتا ئەگەرێن کارگێرێن نها ژناڤدچن...[٢٤]. بەلێ دیارە حکۆمەتا عیراقی نەڤیایە ئەو (ئەگەرێن کارگێری) ژ ناڤ بچن یان ئەو ب خۆ کار بۆ ژناڤچوونا وان بکەت و ڤیایە ناحیا ئەتریش بمینتە گرێدای دگەل قەزا شێخان یا سەر ب پارێزگەها مووسلێ ڤە و مەرەمێن تایبەت کو ئەو ژی ب عەرەبکرنا دەڤەرێ بوو پێ هەبوون.

ل ڤێرێ پێدڤییە پیچەك بزڤرینەڤە سالێن پێشتر و بەرپەرێن دیرۆکا بزاڤا نەتەوەییا کوردی هەلدەینەڤە، دێ بینین ئەتریشێ چ وەك سەنتەرێ ناحیێ چ ژی وەك هەموو سنوورێ ناحیێ رۆلەك بەرچاڤ د ڤێ بزاڤێدا هەبوویە، چەندین کەسان ژ خەلکێ ئەتریشێ وەك کادر و سەرکردەیێن بزاڤا نەتەوەییا کوردی و حزبێن کوردستانی رۆلێ خۆ گێرایە و ب هزاران ژ خەلکێ دەڤەرێن سەر ب ناحیا ئەتریش ڤە وەك پێشمەرگە پشکداری د شۆرشێن کوردستانێدا کرییە، د بەرامبەری ڤێ چەندێدا حکۆمەتا عیراقی تەخسیری نەکرییە د لێدان و بۆمبابارانکرنا سەرانسەری ئەتریشێ، ل دەسپێکا شۆرشا کوردستانێ ل مەها ئەیلوولا ١٩٦١ێ ل ئێڤارا ١٦ ئەیلوولێ ئەتریش کەتە بەر هێرشەکا دژوار و هۆڤانەیا دو فروکێن حکۆمەتا عیراقێ و دەملدەست ٣٥ کەس ژ ژن و زەلام و زارۆکێن باژێرکی شەهید و بریندار بوون[٢٥]، پشتی دەمەکێ کێم ل شباتا ١٩٦٢ێ ب فەرمانا سەرکردایەتییا شۆرشێ ئەتریش هاتییەرزگاکرن و بوویە ئێك ژ بنگەهێن شۆرشا کوردستانێ[٢٦]. نە ئەو بیت تنێ ڤێ جارێ کەتبیتە بەر هێرشێن دوژمنکارانە، بەلکی ئەڤە هێرشە ب درێژیا دیرۆکا شۆرشا کوردستانێ ١٩٦١- ١٩٧٥ێ ل سەر ئەتریشێ و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە د بەردەوامبووینە، د بەرامبەری وان هێرشان بەرخوەدانا خەلکێ ئەتریش و ناحیا ئەتریش مل ب

ئەتریش



ملێ خەلکێ دەڤەرێن دی یا بەردەوام بوویە.

لەوما ب کریار ژی پشتی شکەستنا شۆرشا کوردستانێ حکۆمەتا عیراقی دەست ب عەرەبکرنا ئەتریش و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە کرییە، ئەو بوو پشتی ئادارا ١٩٧٥ێ ب دەمەکێ کێم هەموو خەلکێ ئەتریش ل سەر مال و مولکێن وان هاتنەراکرن و هاتنەڤەگوهاستن بۆ دەڤەرا بەردەرەش و ب زۆری ل وێرێ ئاکنجیکرن و د هەمان دەمدا دۆرێن سەد خانیێن نوو ئاڤاکرن و عەرەب لێ نیشتەجێکرن[٢٧]. د بەلگەنامەکا فەرمیدا کو ژ قائیمەقامییا قەزا شێخان ب هژمار س/٩٦ ل رۆژا ١٩٨٨/١/٣١ێ دەرکەتی و قائیمەقامێ شێخان ب خۆ ئیمزا ل سەرکری هاتییە: باژێرکێ ئەتریش هاتییە ب عەرەبکرن و خەلکێ وی هاتینەڤەگوهاستن بۆ دەرڤەی سنوورێ قەزایا مە[٢٨]. د قۆناغێن جودایێن ناڤبەرا سالا ١٩٧٥-١٩٩١یدا ب تایبەت د ئەنفالێن ١٩٨٨یدا و بەری وان ژی نە تنێ باژێرکێ ئەتریش بەلکی سەرانسەری گوندێن ناحیا ئەتریش هاتنەخرابکرن و هەرفاندن و هەرئێك ژ خەلکێ وان مشەختبوو جهەکی، تنێ ئەتریش ما ئەوژی هاتبوو ب عەرەبکرن[٢٩]. حکۆمەتا عیراقێ ب بعەرەبکرنا ئەتریشێ تەنا نەبوو، ئەو بوو ل ٨ێ ئادارا ١٩٧٦ێ ب بریارا کۆماری هژمار ١١٨ بریار دا: ناحیا (مزووری) ژ قەزا دهۆکێ یا پاریزگەها دهۆکێ بێتەڤەقەتاندن و بدەنە دگەل قەزا شێخان یا پاریزگەها نەینەوا[٣٠]، کو ئەو ب خۆ ل دووڤ بریارا پێشتر ئاماژە پێ هاتییەکرن ب کریار سەر ب قەزا شێخان یا پاریزگەها نەینەوا بوو.

ب ڤی رەنگی ناحیا مزووری ما دگەل پاریزگەها نەینەوا هەتا ل ١١ حزیرانا ١٩٨٧ێ ب بریارەکا دی یا کۆماری ناحیا مزووری دگەل چەندین ناحیێن دی یێن سەر ب پاریزگەهێن کوردستانێ ڤە هاتییەهەلوەشاندن[٣١].

پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ ژبەر کو پشکەك ژ وان دەڤەرا یێن سەر ب قەزا شێخان یا لیوا مووسلڤە مانە ل ژێر دەستەلاتێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ، لەوما ئەڤ دەڤەرە دگەل قەزا ئاکرێ کەتنە د سنوورێ کارگێرێ پاریزگەها دهۆکێ دا، ژبەرکو باژێرێ شێخان مەلبەندێ قەزا شێخان هێژ ل ژێردەستێ حکۆمەتا بەغدا بوو، لەوما باژێرکێ ئەتریش وەك مەلبەندێ قەزا شێخان هاتەدەستنیشانکرن و وەك مەلبەندێ قەزایێ کو هەردو ناحیێن مزێبا و ئەتریش ژی ب خۆڤە دگرتن سەرەدەری دگەلدا هاتەکرن[٣٢].

پشتی شەرێ رزگارکرنا عیراقێ ل نیسانا ٢٠٠٣ێ و رزگارکرنا باژێرێ شێخان و دەڤەرێن دی یێن سەرب قەزا شێخانڤە کارگێرییا قەزایێ ژ ئەتریش هاتەڤەگوهاستن بۆ مەلبەندێ قەزایێ ئانکو باژێرێ شێخان و سەرۆکاتییا جڤاتا وەزیرێن هەرێما کوردستانێ ب بریارا هژمار ٢٣٥١ ل ٢٥ چریا ئێکێ ٢٠٠٥ێ بریارا سەرژنوو ڤەکرنا ناحیا ئەتریش دا[٣٣].

ژ وێ رۆژا هەتا نها کارگێرییا ناحیێ ب ئەرکێ خۆیێ رۆژانە رادبیت و ل سالا ئاڤاهییەکێ نو بۆ رێڤەبەرییا ناحیێ ل دانگا (ئەتریش)ا کەڤن ل جهێ دبێژنێ ئەتریشا نوی هاتییەئاڤاکرن و د بەرنامەیدایە ل وێ جهی عەرد بێتەدابەشکرن و فەرمانگەهـ و سازیێن دی یێن خزمەتگوزاری بێنە ئاڤاکرن و (ئەتریش)ا نوو ل وێ جهێ بەرفرەهـ بێتەئاڤاکرن.

پەروەردە ل ناحیا ئەتریش:

وەك ئاماژە پێ هاتییەکرن ژ سەدسالییا هەڤدێ زایینی بەرەڤ ژوور ئەتریش وەك مەلبەندەك زانستی و خوەدی خواندنگەهێن ئایینی هاتییەنیاسین، د ئەنجامدا تەخەك مەزن ژ دەرچوویێن خواندنگەهێن ئایینی ل ئەتریش و دەڤەرێن سەر ب وێ ڤە دیار بوون و جهێ وانێ دیارە د ناڤەندێن رەوشەنبیرییێن سەردەمێ خوەدا، ئەڤ چەندە ژی هاندەر بوویە زوو ئەتریش وەك مەلبەندەك کارگێری بهێتە نیاسین، بوونا مەلبەندێ ناحیێ و بوونا هژمارەك ژ دەرچوویێن خواندنگەهێن ئایینی رێخوشکەر بووینە هەر زوو هزر د ڤەکرنا خواندنگەها فەرمی ئانکو خواندنگەها سەرەتایی ل باژێرکێ ئەتریش بێتەکرن و ئەتریش یەك ژ کەڤنترین خواندنگەهێن سەرەتایێن دەڤەرا بەهدینان ب خۆڤە بگریت، بەلێ ئەڤ خواندنگەهە

کەنگی هاتییەدامەزراندن...؟

ل دووڤ لێکەریانێن خۆ ل مێژووا ڤەکرنا خواندنگەهان ل سنووورێ پارێزگەها دهۆکێ ئەم نەکارین ب دروستی سالا دامەزراندنا سەرەتاییا ئەتریش دەستنیشان بکەین، بەلێ مە چ گومان نینە کو ئەو خواندنگەهە ل دەسپێکا دامەزراندنا حکۆمەتا مەلکییا عیراقێ ئانکو دەسپێکا سالێن بیستان ژ سەدسالییا بیستێ هاتییەڤەکرن، چەندین کەسایەتیێن رەوشەنبیرێن ئەتریش یێن مە دیدار دگەلدا کرین داکوکی ل سەر ڤێ چەندێ کرییە[٣٤]، هندەك ژی داکوکیێ ل سەر وێ چەندێ دکەن کو ئەو خواندنگەهە ل سالا ١٩٢٧ێ هاتییەدامەزراندن[٣٥].

هندی پەیوەندی ب خزمەتگوزاریێن دیترڤە هەی، ل دووڤ رێبەرێ تەلەفونێن عیراقێ یێ سالا ١٩٥٦ێ چوار خەتێن تەلەفونێ د وێ سالێدا ل باژێرکێ ئەتریش هەبوون[٣٦]، ل سالا ١٩٧٠ێ کارەب گەهشتییە ئەتریش، سالا ١٩٩٣ێ پرۆژێ ئاڤێ بۆ هاتییەدانان و سالا ١٩٩٨ێ بیرەکا ئیرتوازی بۆ هاتییەکولان و سالا ٢٠٠٨ێ پرۆژێ ئاڤەرووبان ل باژێرکی هاتییەچێکرن و سالا ١٩٩٥ێ خواندنگەها ئامادەیی لێ هاتییەڤەکرن[٣٧].

## ژێدەر و پەراوێز

* ب زاراڤێ خۆ جهیێ خەلکێ دەڤەرێ باژێرکی ب ئەتریش ناڤدکەن، هندەك ب ئەترویش هندەك ب ئەترووش ناڤدکەن، مە زاراڤێ خۆجهیێ خەلکێ دەڤەرێ ب کارئینا.

١. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەها دهۆکێ، (دهۆك- ٢٠١٠)، بپ ١٤٣- ١٤٤

٢. زانیاریێن ژ رێڤەبەرییا ناحیێ هاتینەوەرگرتن.

٣. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەها، بپ ١٤٣.

٤. زانیاری ژ رێڤەبەرییا ئامارا دهۆکێ هاتینەوەرگرتن.

٥. موسەدەق تۆڤی ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەها...، بپ ١٤٣.

٦. زانیاریێن ژ رێڤەبەرییا ناحیێ هاتینەوەرگرتن.

٧. د. عەبدوللا غەفور، گوندەکانی کوردستان (گوندەکانی باشووری کوردستان) لە سەرژمێری سالی ١٩٥٧ عیراق دا، چاپی دووەم، (هەولێر- )، بپ ٣٦

٨. احمد بدل خالد، اتروش بلدة العلم و الجمال، مجلة دهوك، العدد١٢- اذار ٢٠٠١، ص ٩٧.

٩. زانیاری ژ داتایێن رێڤەبەرییا ناحیێ هاتینەوەرگرتن.

١٠. ژ زانیاریێن ژ ئالیێ جەهوەر عەبدوللا عەزیز نسری هاتینە کۆمکرن، وی ژی ئەو زانیاری ژ سلێمان محەمەد سەلیم ئەتریشی ژ دایکبوویێ ١٩٣٣ێ، دەرچوویێ قوناغا سەرەتایی و پێشمەرگێ شۆرشا ئەیلوولێ و ئەندامێ جڤاتا باژێرڤانییا ئەتریش و موختارێ گوندی و جەمیل عیسا محەمەد ژ دایکبوویێ ١٩٣٧ێ و پێشمەرگێ شۆرشا ئەیلوولێ و یەك ژ رهسپیێن ئەتریش وەرگرتینە.

١١. هەمان ژێدەر.

١٢. هەمان ژێدەر.

١٣. هەمان ژێدەر.

١٤. د. عماد عبدالسلام رؤوف، مراكز ثقافية مغمورة في كردستان، (اربيل- ٢٠٠٨)، ص ٢٠- ٢٢ ؛ الدهوكي ملا محمد سعيد ياسين البريفكاني، فضلاء بهدينان، (دهوك- ١٩٩٧)، ص ٢٨، ٢٢، ٢٩، ٣- ٣٢.

# گوندێن ناحیا ئەتریش

جەهوەر عەبدوللا عەزیز نسری

## ندێ نۆردیناڤا

ئێكە ژ گوندێن مزووریان، دكەڤیتە دووراتییا ٨كم
شووری رۆژئاڤایێ ئەتریش، ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ
خ نورەددینی هاتی كو شێخێ مەزنێ بریفكان بوو
وند ل سەر ناڤێ وی بوو لەوما دگۆتنێ نۆردیناڤا.
وبەرێ عەردێ گوندی ٢٧٤٣ دۆنەمن، ژ وانان ٩٥٠
ەم دێمی، ٢٧٠ دۆنەم ئاڤی، ١٨٩ دۆنەم كەڤرین،
١٣ دۆنەم پاوان، ٢٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان
٦ پەز و بزن لێ هەنە[1].

### نوورێن گوندی:

كووری، گوندێ ئالۆكا.
شووری، گوندێ گەلیێ رمان.
هەلاتی، گوندێ بەرەتوین.
ژئاڤایی، گوندێ دزێ.

### كهاتا گوندی:

گوند ژ ئێك بنەمال پێكدهێت، ئەو ژی بنەمالا
خانە، یان یا شێخ عەبدولجەباری كو ژ عەشیرەتا
ووریانە، ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٣٥
س ل ڤێ گوندی دژیان[2]، سالا ١٩٨٨ێ دەمێ گوند
هەوێن ئەنفالا هاتییە خرابكرن ٥٨ كەس ل ڤێ
گوندی دژیان و نها تنێ چوار مال یێن ل سەر گوندی
كو دبنە ٢١ كەس.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەند ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، وەكی كانییا
گوندی، كانییا گەلیێ رمان، یان شیڤا گەلیێ رمان،
كانییا دێریشكێ، رووبارێ دز و بێدیلا رووبارێ ئەتریش،
جۆیا ئاشێ ئاڤێ، جۆیا شیڤا گەلیێ رمان.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا وان ژی ل سەر چاندنا فێقی و دەخل و دانی
و خودانكرنا بزنی بوو، نها ژی پتر ل سەر كاسبیێ
و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیارن و مژوولی چاندنا
دەرامەتی و دار و بارێ فێقی نە و هندەك وی ملكی بۆ
مالێن شێخا شین دكەن.

ژ جهێن دیار ل گوندی گرێ كۆخیا.

ڤی گوندی چەند خزمەتگوزاری لێ هەنە، وەكی
پرۆژەیێ ئاڤێ كو ل سالا ١٩٩٤ێ هاتییە دروستكرن،
خواندنگەهـ ل سالا ١٩٩٩ێ هاتییە ئاڤاكرن، دو
جۆیێن ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٠ێ هاتینە كونكریتكرن،
مزگەفت ل سالا ٢٠٠١ێ و بنكەهەكێ ساخلەمیێ
ل سالا ٢٠٠٢ێ هاتینە ئاڤاكرن، كارەب ل سالا ٢٠٠٥ێ
گەهشتییە گوندی، بیر ئیرتیوازی ل سالا ٢٠٠٩ێ بۆ
هاتییە كۆلان و پرۆژەیەكێ پەلەوەران ژی لێ هەیە.

هەروەسان خەلکەکێ بۆش قەستا ڤێ جهی بۆ گەشت و گوزارێ دکەن[٣].

## گوندێ بێنارینکێ

دکەڤیتە دووراتیا ١٥کم باکوورێ رۆژئاڤایێ ئەتریش. ناڤێ گوندی دبێژن ژ وێ چەندێ هاتییە کو دەمەکی دا ئێشێن کوژەك هەبووینە زارۆك نەدمان و ئەڤ چەندە بوویە ئەگەرێ هندێ کو چەند سالا کچ نەگەهنە ژێێ شیا و نارینك، ب واتایا نارینکا بویکێ نەهاتە گۆتن، واتە بێ نارینك و ناڤێ گوندی بوو بێنارینك. رووبەرێ عەردێ گوندی ١٢٦٧ دۆنەمن، ژ وانان ١٠ دۆنەم دێمی، ١٤٣ دۆنەم ئاڤی، ٩٦٣ دۆنەم کەڤرین، ٨٩ دۆنەم پاوان، ٣٧ دۆنەم رەزێن دێم، ٣٤ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٥٢٠ پەز و بزن لێ هەنە[٤].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ صۆریا.

**باشووری،** گوندێ پێدە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هەسنەکا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن چەڤریك و دێرالۆش ل دەڤەرا زاویتە.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ پێنج بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا میرخان، بنەمالا شاڤۆلی، بنەمالا کەمالا، بنەمالا بارانی، بنەمالا خانێ پێکهاتییە. دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٣٩ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٥]، سالا ١٩٨٨ێ ٨٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان و نها ٦٦ کەس ل سەر گوندی دژین، سەرجەمێ خەلکێ گوندی ٢١٠ کەسن و پتریا وان ل دهۆکێ دژین. ژیانا وان ل سەر چاندن و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، نها ژی پتر ل سەر مووچەیا و چاندنێ یە، ب تایبەت چاندنا فێقی، مینا تری و هنار و هژیران.

ئەڤ گوندە چەندین جاران دەمێ شۆرشێ دا هاتییە کاڤل و وێرانکرن و پشتی هەر جارەکا خراب بووی جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن ڤە، گوند ل سالێن ١٩٦٢، ١٩٦٦، ١٩٧٤، ١٩٨٧ێ ب سالان هاتییە بەردان لێ نەهاتییە سۆتن، تا داوی جار ل ئەنفالێن سالا ١٩٨٨ێ هاتییە سۆتن و بەردان، پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاکرن و تا نها ژیان لێ یا بەردەوامە.

### شوینوارێن گوندی:

چەند شوینوار ل گوندی هەنە، وەکی: ناوسکەك، سێریجێن بەری کو مینا تاڤەبەرانە و ژ بەری هاتینە دروستکرن.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەند کانی ل گوندی هەنە، مینا کانیا مزگەفتێ، کانیا شیفکا ب چنار، کانیا بێنارینکا خراب، کانیا خرخرۆکێ، کانیا جزیرەی. هەروەسان رووبارێ بێنارینکێ و رووبارێ دێرالۆش و چەڤریکێ کو ل بن گوندێ بێنارینکێ دگەهنە ئێك و جۆیا گوندی یا مەزن ب درێژاهیا ٤کم.

### جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:

شیڤا دێریشکێ زۆمە، شکەفتا عزەت، شکەفتا پشتا گوندی، شکەفتا چەما، بانێ شکەفتێ، جزیرە، چەمێ عومەر، دێریشکێ، نەهالا دێریشکێ.

### ژێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:

مینا هەمی دەڤەرێ خەلکێ گوندی پتر جۆتیار بوون، ژ گرنگترین دەرامەتێن دچاندن گەنمۆك و برنج و تویتن بوون، هەروەسان رەز دکرن و دار و بارێ فێقی ژی دچاندن، زێدەباری دەرامەتێ سرۆشتی ژ گوهیشك و مازی و ...هتد. لێ یا ژ هەمییا بەرچاڤتر ژیانا خەلکی ل سەر "گارەشا" بوویە. نها ژی پتر ل سەر مووچەیا و کاسبکاریێ یە، ژبلی کو هندەك چاندنێ ژی دکەن، ب تایبەت دار و بارێ فێقی ژ تری و هنار و هژیران و دەرامەتێ کەسکاتی ژ باجانسۆرك و خیار و فلفل و لۆبیك و کولند و ... .

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

خواندنگەھـ ل سالا ١٩٧٧ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، دگەل نەمانا گوندی ئەو ژی ژ ناڤچوویە و سالا ٢٠٠٠ێ خواندنگەھا گوندی هاتییەڤە ئاڤاکرن، هەر ل ڤێ سالێ چەند خزمەتگوزارییێن دی بۆ گوندی هاتینە دابینکرن، وەکی ئاڤ، جادە، ئاڤاکرنا ٢٠ خانییان. پشتی هینگێ چەند خزمەتگوزارییێن دی بۆ هاتینە دروستکرن، وەکی گەهاندنا کارەبێ ل سالا ٢٠٠٦ێ، ئاڤاکرنا مزگەفتێ ل سالا ٢٠١٠ێ، کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازی ل سالا ٢٠١١ێ و چێکرنا جۆیێن ئاڤێ ل هەمان سال[٦].

## گوندێ بێدویل

د پەرتووکا المعجم التاریخی لامارة بهدینان دا هاتییە دبێژیت گوندەکێ کەڤنارە ل نێزیکی دهۆکێ، ئاماژە ب ناڤێ وی د وەقفا سولتان حسێن وەلی دا هاتییەکرن کو ١٠ قرۆش بۆ خواندنگەھا قوبەهان ل سەر هاتینە سەپاندن، نستۆری لێ دئاکنجیبوون و ل سەدسالیا هەژدێ کاتولوکیەت لێ بەلاڤبوویە و هژمارا وان ل سالا ١٨٤٢ێ دگەهشتە ٢٠ سەرۆکخێزانان و وان دێرەك هەیە[٧]. گوند نها ژی گوندەکێ گوزارییە و گەلەك خەلك ژبەر هەبوونا دار و بارەکێ بۆش و کانییێن سرۆشتی بۆ گەشت و گوزارێ قەست دکەنێ. دکەڤیتە دووراتییا ٩کم رۆژئاڤایێ ناڤەندا ئەتریش. ناڤێ وێ ژ وێ چەندێ هاتییە کو عەردێ وێ بێ ڤەکرییە و بێ دۆلی ارض منبسطة. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٩٦٢ دۆنەمن، ژ وانان ٣٨١ دۆنەم دێمی، ١٠٨ دۆنەم ئاڤی، ٢١٩٨ دۆنەم کەڤرین، ٢٠٥ دۆنەم پاوان، ١٠ دۆنەم رەزێن دێم، ٦٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٤٢٠٠ پەز و بزن و ٨٦ چێل لێ هەنە[٨].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ بێنارینکێ.

**باشووری،** گوندێن گەلیێ رمان و بازێرکێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن ئالۆکا و نۆردیناڤا و دزێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ پێدە سەر ب ناحیا زاویتە ڤەیە.

### پێکهاتا گوندی:

گوند یێ هەردو بنەمالێن عابد حەجی عەبدال و محەمەد حاجی جەرجیسی نە کو ژ عەشیرەتا مزووریانە، کو نها بووینە نێزیکی ٧٥ مالان و پتریا وان ئاکنجیێن بازێرێ دهۆکێ نە. لێ نها خەلکێ رەسەنێ گوندی ل سەر نینن، بەلکی خەلکێ وی پێکهاتینە ژ زێباری و رێکانییان وی ملکی شین دکەن. ژمارا خەلکێ گوندی ل دەستپێکا سالێن شێستان تنێ ١٥ کەس بوون و نها ١١٣ کەس ل سەر گوندی دژین و گوند بوویە دو گوند، بێدویلا سەری کو چەند مالەکێن زێبارییان ل سەرن و یا خوارێ کو چەند مالەکێن کێمن ل بەر رووباری گوند ئاڤاکرینە و سەرەدەری وەکی دو گوند دگەل دهێتەکرن، چونکی دو موختار هەنە.

سالا ١٩٦١ێ ئەڤ گوندە ژ ئەگەرێ شۆرشا ئەیلوولێ هاتییە بەردان و سالا ١٩٦٣ێ جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن، سالا ١٩٧٥ێ جارەکادی گوند هاتییە بەردان و سالا ١٩٩١ێ هاتییەڤە ئاڤاکرن.

### جهێن شوینواری:

ڤی گوندی کەلایەکا کەڤن ب ناڤێ کەلۆکێ و دناڤبەرا ٥- ٦ ناوسکان ژی لێ هەنە.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەند ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، وەکی کانییا سێلکا، رووبارێ صۆریا و رووبارێ پێدە، ژبلی جۆیا چەمێ دێرێ و جۆیا چەمێ مەیدانێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ ڤی گوندی ل بەرێ پتر ل سەر چاندنا فێقی و دەرامەتێ دێمی و دارێن گویز و باهیڤا و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، نها ژی پتر ل سەر مووچەیانە.

ڤی گوندی مزگەفتەك و خواندنگەهەك ژی لێ هەیە کو ل سالا ١٩٩٨ێ هاتییەڤەکرن، ژبلی ئاڤاکرنا ١٢ خانییان. هەروەسان ئاڤ و کارەب ژی ل سالا ٢٠٠٣ێ بۆ گوندی هاتینە دروستکرن[٩].

## گوندێ دزێ

گوند دکەڤیتە دووراتییا ١٥کم رۆژئاڤایێ ناڤەندا ئەتریش. ناڤێ گوندی یێ ژ وێ چەندێ هاتی کو ئاخا ڤی گوندی یا ئاڤ دزە، واتە دەمێ باران دباریت هەر زوی ئەو ئاڤ دچیتە بن عەردی و ئاڤێ ددزیت، لەوما ب دزێ ب ناڤکرییە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٣٥٢٨ دۆنەمن، ژ وانان ٥٩٨ دۆنەم دێمی، ٣٨٥ دۆنەم ئاڤی، ٢٥٣٣ دۆنەم کەڤرین، ٧ دۆنەم رەزێن دێم، ٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٣٧٥٠ پەز و بزن لێ هەنە[١٠]. ناڤێ گوندی د پەرتووکا المعجم التاریخی لامارة بهدینان دا هاتییە کو دکەڤیتە ناڤەراستا رێکا زاویتە- شێخان ل باشوورێ ئالۆکا، کەنیسەیەك ب ناڤێ مارکریستوفورسێ شەهید لێ هاتییە دیتن، ئاماژە د دەستنڤیسەکا سالا ٢٠٣٧ یۆنانی، بەرامبەری ١٧٢٦زێ پێ هاتییەکرن، هەروەسان ناڤێ گوندی د وەقفا سولتان حسێن وەلی ژی دا هاتییەکرن کو ١٠ قرۆش و پێنج بەغدادی بۆ خواندنگەهها قوبەهان ل سەر هاتبوو سەپاندن[١١].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ ئالۆکا.

**باشووری:** گوندێن گەلیێ رمان و بازێرکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ نۆردیناڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێدیل.

### پێکهاتا گوندی:

ئەڤ گوندە تنێ ژ ئێك مالبات پێکدهێت، ئەو ژی بنەمالا حەجی مەلۆیە کو ژ عەشیرەتا مزووریانە، ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ١٥١ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٢] و سالا ١٩٨٨ێ بەری گوندی وێران بکەن ١٥٠ کەس ل گوندی دژیان و پترییا وان مەسیحی بوون، لێ نها تنێ پێنج سەرۆك خێزان لێ دژین کو ژمارا وان دبنە نها ٣٠ کەس.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٦١ێ خرابکرن و جارەکادی ل سالا ١٩٧٣ێ هاتییە ئاڤاکرن، تا کەتییە بەر هەوێن ئەنفالان ل سالا ١٩٨٨ێ و جارەکادی ل سالا ١٩٩٢ێ هاتییە ئاڤاکرن.

### جهێن شوینواری:

ژ جهێن شوینواری ل ڤی گوندی دێرەکا کەڤن لێ هەبوو کو نها شوینوارێن وێ نەماینە و ل دووڤ گۆتنان دبێژن بەری پتر ژ ٢٠٠ سالان هاتییە ئاڤاکرن، هەروەسان ناوسکەك ژی ل باکوورێ گوندی هەیە.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەند ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، چ بۆ ڤەخوارنێ و چ ژی بۆ کارێن چاندنێ، مینا کانییا شێڤ ماسی، کانییا شێخۆی، کانی مەتیك، کانی حەلاواتکا کو سێ کانی لێ هەنە. هەروەسان رووبارێ گوندی ب ناڤێ گومل و چەند جۆیەك، مینا جۆیا چەمێ مەیدانێ، جۆیا شێڤ ماسیکێ، جۆیا کانییا شێخۆی، جۆیا چەمێ تەحای، جۆیا حەلاواتکا و ئەڤ جۆیە ل گوندی ل سالا ١٩٩٧ێ هاتینە دروستکرن، دیسان سێ بیرێن ئیرتیوازی ژی لێ هەنە کو ل سالێن ١٩٧٣، ٢٠٠٥، ٢٠١٦ێ هاتینە کۆلان.

### جهێن ناڤدار ل گوندی:

چەند جهێن دیار و بەرچاڤ ل گوندی هەنە وەکی: پیر حەدادی کو مەرقەدەکە، شکەفتا شیڤ ماسیکێ، نەهالا کانی مەحمیدکێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ وی پتر ل سەر جۆتیارییێ بوو، ب تایبەت چاندنا برنجی و تویتنێ و کەسکاتی و دار و بارێ فێقی. نها ژی پتر ل سەر کاسبکارییێ و مووچەیانە، هەروەسان چاندن ژی ل گوندی هەیە.

ڤی گوندی مزگەفتەکا بچویك و خواندنگەهەکا

بنەرەتی لێ هەنە کو ل سالا ٢٠٠٦ێ هاتییەڤەکرن و زارۆکێن گوندێن دەردۆر ژی قەستا وێ دکەن و ل هەمان سال کارەب ژی گەهشتییە گوندی[١٣].

## گوندێ هەرماش

گوندەکێ مەسیحینشینە دکەڤیتە دووراتییا ٥کم رۆژهەلاتێ ناڤەندا ئەتریش، یێ ناڤدارە ب چاندنا تری و فێقی و بەقلەمەنییان. وەکی د پەرتووکا المعجم التاریخی لامارة بهدینان دا هاتی دبێژیت دکەڤیتە دەشتا شەمکان ل سەر رێکا ژ دهۆکێ دچیتە ئاکرێ و سەر ب ناحیا ئەتریش ڤەیە، ژێدەرێن سریانی ل سەدسالییا شەشێ زایینی ب نهرمش دایە نیاسین و سولتان حسێن وەلی وەقف ب حەفت قرۆش و چارێکەك بۆ خواندنگەها قوبەهان ل سەر سەپاندییە[١٤]. ناڤێ گوندی ژ "نهر مش"، واتە رووبارێ مژ تێدا هاتییە و ب بوورینا دەمی بوویە هەرماش. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٨٠٧ دۆنەمن، ژ وانان ٣١٩ دۆنەم دێمی، ٦٩ دۆنەم ئاڤی، ٢١٣٩ دۆنەم پاوان، ٢٢٠ دۆنەم رەزێن دێم، ٦٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٦٥٠ پەز و بزن و ٥٨ چێل لێ هەنە[١٥].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ شلیا.

**باشووری،** گوندێن رکاڤا و دێرە خترا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بلان.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئازاخ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ چوار بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا ساگی، بنەمالا قەشە، بنەمالا ئامێدی، بنەمالا زێباری پێکهاتییە و مەسیحیێن کلدان و سەر ب عەشیرەتا مزووری نە. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ٢٠٤ کەس ل گوندی دژیان[١٦] و سالا ١٩٨٧ێ بەری گوند

گوندێ هەرماش



ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە بێتە وێرانکرن ١٢٥ کەس ل گوندی دژیان و نها گوند پێکهاتییە ژ ٣٨ مالان کو دبنە ١٦٦ کەس.

ژیانا وان ژێلی جۆتیاریێ ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و کاسبکاریێ یە.

گوند سالا ١٩٦٩ێ هاتییە بەردان و سۆتن و سالا ١٩٧٠ێ پشتی بەیاننامەیا ١١ئاداری جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن، هەتا جارەکادی سالا ١٩٨٧ێ هاتییە وێرانکرن و پشتی سەرهلدانێ جارەکادی ئاڤەدانبوویەڤە.

**جهێن شوینواری:**

ژ جهێن شوینواری ل گوندی دێرەك کو ل دووڤ گۆتنان مێژوویا ئاڤاکرنا وی بۆ بەری ٦٠٠ سالان دزڤریت، ژێلی دو ناوسکان ل رەخێ گوندی.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەند کانی و جۆ ل گوندی هەنە، وەکی کانییا قەسرێ، کانییا خۆشابا، کانییا بن گوندی، کانییا بوقایێ، جۆیا شابق تایێ، جۆیا گورانکە، جۆیا دەبوش یابە کو هەرسێ ل ٢٠٠٢ێ هاتینە دروستکرن. هەروەسان دو بیرێن ئاڤێ ژی ل سالێن ٢٠٠٦، ٢٠١٣ێ بۆ هاتینە لێدان.

**جهێن بەرنیاس ل گوندی:**

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی چیایێ دیرینك، زەیتوونێن هەرماش، شکەفتا کونە سەرێ، شکەفتا بەرایێ.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ل بەرێ پتر ل سەر خودانکرنا پەزی و چاندنا دەرامەتی و دار و بارێ فێقی و زەیتوونان بوو، نها ژی پتر کاسبکار و مووچەخۆرن و هندەك ژی هەر مژوولی کارێ چاندنێ نە و مفا ژ سرۆشتی و دار و بارێ وی ژی دهێتە وەرگرتن، هەروەسان و ژبەر هەبوونا دار و بارەکێ بۆش و کانیێن ئاڤێ گوند بوویە جهەکێ گوزاری و خەلك قەست دکەنێ.

**خزمەتگوزاریێن گوندی:**

خواندنگەهـ سالا ١٩٧٩ێ ل گوندی هاتییەڤەکرن سالا ١٩٩٧ێ ئاڤاهیێ وێ هاتییە دروستکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ سالا ١٩٩٥ێ و کارەبێ ل سالا ٢٠٠٤ێ و ل هەمان سال دێرەك ژی ل گوندی هاتییە دروستکرن. ٣٨ خانی ل سالا ٢٠٠٦ێ بۆ خەلکێ گوندی هاتینەئاڤاکرن[١٧].

## گوندێ ئازاخ

گوندەکێ گوزاریێ مەسیحینشینە و خەلکەك قەست دکەنێ. دکەڤیتە دووراتییا ٥کم رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ زاخ ب واتایا جهێ ب خێر و بێر هاتییە، چونکی گوندەکێ ب زاخ و ب خێر و بێرە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٠٣٧ دۆنەمن، ژ وانان ١٥٦ دۆنەم دێمی، ١٠٦ دۆنەم ئاڤی، ١٢ دۆنەم کەڤرین، ١١٨٧ دۆنەم پاوان، ٤٨٤ دۆنەم رەزێن دێم، ٩٢ دۆنەم رەزێن ئاڤی[١٨]. گوند دکەڤیتە سەر رێکا دناڤبەرا ئەتریش و قەسرۆك ل رۆژهەلاتێ ئەتریش، کەنیسەیەکا کەڤن ب ناڤێ مارگورگیس لێ هەیە، ئاماژە ب ناڤێ ڤی گوندی د وەقفا سولتان حسێن وەلی دا هاتییەکرن کو حەفت قرۆش و چارێك وەکی وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل سەر هاتییە سەپاندن، ل سەدسالییا هەژدێ کاسولیکیەت لێ بەلاڤبوویە و هژمارا وان ل دەستپێکا سەدسالییا ل دووڤدا گەهشتینە ٣٠٠ کەسان و قەشەیەکی خودانی لێ دکر و وان کەنیسەیەك هەبوو. سالا ١٨٣٤ێ میرێ کۆرە ئەڤ گوندە خرابکرییە[١٩].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ ربەتکێ.

**باشووری،** دێرە خترا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ هەرماش.

**رۆژئاڤایی،** ناڤەندا ناحیا ئەترۆش.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند ژ چوار بنەمالێن مەسیحیێن کلدانی ب

ناڤێن بنەمالا کەکا، بنەمالا نەننو، بنەمالا یەلدا، بنەمالا یاقو پێکهاتییە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٧٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٢٠]، سالا ١٩٨٧ێ دەور و بەرێن ٨٠ کەسان ل گوندی دژیان و نها ژی گوند ژ ٢٢ مالان پێکدهێت کو دبنە ٩٢ کەس. ژمارا سەرجەمێ خەلکێ گوندی نێزیکی ١٥٠٠ کەسانە و ل جهێن جودا یێن کوردستانێ و عیراقێ و دەرڤەی وەلاتی دبەلاڤن.

گوند چەند جاران ل سالێن ١٩٦٢، ١٩٦٥، ١٩٧٤ێ هاتییەخرابکرن، لێ هەر جارەکا هاتییە کاڤلکرن سالا دووڤدا هاتییە ئاڤاکرن، تا داوی جار سالا ١٩٨٧ێ هاتییە وێرانکرن و پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە و تا نها ژیان لێ یا بەردەوامە.

### شوینوارێن گوندی:

چەند جهێن شوینواری و دیرۆکی لێ هەنە، وەکی سێ ناوسکان ل پشتا گوندی و مەزارێ مار ئورا کو مەرقەدەکە و بەرێ پشتێ، کو مینا کورسیکەکێ یە و ل دووڤ هزر و بۆچوونێن کەڤن وەسان هزر دکەن هەچیێ پشتا خۆ پێڤەنیت دێ ژ ئێشا ساخ بیت و چێ بیت.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ڤی گوندی چەند کانی وەکی ژێدەرێ ئاڤێ هەنە، وەکی کانییا گەرماڤێ، کانییا گوندی، کانییا مێرگێ، کانییا گێرا، کانییا شابی. هەروەسان جۆیا گەرماڤێ و جۆیا گوندی و جۆیا گێرا کو ل سالا ١٩٩٤ێ بۆ هاتینە دروستکرن. ل سالا ٢٠٠٣ێ ژی بیرەکا ئاڤێ ژێ بۆ هاتییە کۆلان.

### جهێن دیار ل گوندی:

چەند جهێن بەرنیاس ل گوندی هەنە، وەکی چیایێ دیرینکی، گەلیێ ئازەخ، گردە هۆل، شکەفتا کۆترا کو سێ نهۆمە، شکەفتا هەلهەلۆکا،

گوندێ ئازاخ



شکەفتا لاندکێ، شکەفتا خنقا، شکەفتا سکری، نەهالا هەلهەلۆکا، نەهالا خنقا

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکی بەرێ ل سەر چاندنا فێقی و رەز و بیستانان و دار و بارێن سرۆشتی و خودانکرنا تەرش و کەوالی و گارەشان بوو. نها ژی پتر ل سەر مووچەیا و چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی یە، مینا تری و باهیڤ و سماق و گەنم و نۆك و باقلك و هژیر و هنار و سێڤ و خوخ و زەیتوون و .... هتد، دیسان مفای ژ سرۆشتێ دەڤەرێ و دار و بارێن وێ ژی وەردگرن.

### خزمەتگوزاریێن گوندی:

ڤی گوندی چەند خزمەتگوزاری بۆ هاتینە دروستکرن، وەکی پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ۲۰۰۳ێ، دروستکرنا خانی و هۆلەکا بیرهاتنان ل سالا ۲۰۰٤ێ، دێرەك ل سالا ۲۰۰٦ێ، گەهاندنا کارەبێ ل سالا ۲۰۰٥ێ. بۆ خواندنێ زارۆکێن وان دچنە گوندێ هەرماش[۲۱].

## گوندێ ئاڤریڤا

گوند دکەڤیتە دووراتییا ۱۰کم باشوورێ سەنتەرێ ئەتریش، دبێژن ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتیە کو گەلەك ئاڤ لێ هەیە و هەر جهەکێ بچیێ ئاڤ ب رێڤەیە و ناڤ ژ وێ چەندێ بوویە ئاڤریڤا. رووبەرێ عەردێ گوندی ٤۹۹۱ دۆنەمن، ژ وانان ۳۰۷۸ دۆنەم دێمی، ۱۸۷۸ دۆنەم پاوان، ۳٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی، ژبلی ۲۳۳٥ سەرێن پەز و بزنان.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** هەردو گوندێن شەهیا و مغارا.

**باشووری،** گوندێن باسڤنێ و سەرۆکانیێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گەلیکی.

**رۆژئاڤایی،** موسەکا.

گوندێ ئاڤریڤا



**پێکهاتا گوندی:**

گوند ژ هەردو بنەمالێن صالحێ شاهین و صادقێ سەلیم ژ عەشیرەتا مزووریان پێکهاتییە. سالا ١٩٧٤ێ ٦٠ کەس ل سەر گوندی بوون و نها ٢٧٥ کەس ل گوندی د ئاکنجینە.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٧٤ێ هاتییە سۆتن و بەردان و پشتی هینگێ ل سالا ١٩٩٣ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

**شوینوارێن گوندی:**

ناوسکەکا کەڤن و شوینوارێ ئاشەکێ ئاڤێ لێ هەیە کو دبێژن بەری نێزیکی ٢٠٠ سالان دزڤری.

**جهێن بەرنیاس ل گوندی:**

چیایێ خۆشاڤا، شکەفتا غازی، شکەفتێن گوندێ ژووری کو پێکهاتییە ژ نەهـ شکەفتان. شیڤا ئاشا، شیڤا میسەکا، شیڤا گەلیکی.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ژ ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی کانیا گوندێ ژووری، کانیا مزگەفتێ، کانیا لێلەکا، کانیا مێوا سەدانی، کانیا ماماسکێ، کانی بیژنێ، کانیا پیر مزی، کانیا بیژنێ یا دووێ. جۆیا بەر گوندی، جۆیا لێلەیا، زێدەباری بیرەکا ئیرتیوازی کو ل سالا ٢٠٠٨ێ بۆ هاتییە کۆلان.

**ژێدەرێن زیارا خەلکێ گوندی:**

گوندەکێ ناڤدارە ب چاندنا گەنمی و جەهی، هەروەسان چاندنا نیسک و نۆك و کەسکاتییان لێ دهاتەکرن، زێدەباری خودانکرنا تەرش و کەوالی و چێلا و ژیانا خەلکێ وی ل سەر وێ چەندێ، بوو، لێ نها ژبلی چاندنێ گەلەك ژێ کاسبکار و مووچەخۆرن ژی.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**

پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ١٩٩٩ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن، خواندنگەهـ ژی بۆ جارا ئێکێ ل سالا ١٩٩٨ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و سالا ١٩٩٩ێ ئاڤاهییەك بۆ هاتییە دروستکرن. جادە و کارەب ژی ل سالا ٢٠٠٦ێ گەهشتینە گوندی[22].

## گوندێ میسەکا وەقف

گوند دکەڤیتە دووراتییا ١٠کم باشووری مەلبەندێ ناحیا ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ٣٠٥٨ دۆنەمن، ژ وانان ٢٥٠٠ دۆنەم دێمی، ٤٩ دۆنەم کەڤرین، ٥٠٩ دۆنەم پاوان. هەروەسان ٢٢٠٥ پەز و بزن و ١٧ چێل لێ هەنە[23].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ مغارا.

**باشووری،** گوندێ شێخان.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئافریڤا.

**رۆژئاڤایی،** گەلیێ خودێدا.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ ڤی گوندی ژ عەشیرەتا کۆچەرانە ژ تیرەیا زێدکان، پێکهاتینە ژ چوار بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا میر زهوری، بنەمالا دوشا، بنەمالا کمالیا، بنەمالا گوهارا. هژمارا خەلکێ گوندی ل بەری ئەنفالا سالا ١٩٨٨ێ ١١٠ کەس بوون و نها نێزیکی ٣٨٠ کەسان ل گوندی دژین.

گوند ل سالا ١٩٦٤ێ هاتییە وێرانکرن و سالا ١٩٦٦ێ دوبارە هاتییە ئاڤاکرن، تا ئەنفالان کو ب ئێکجاری هاتییە خرابکرن و ل سالا ١٩٩٦ێ جارەکادی ئاڤەدانبوویە ڤە.

**جهێن شوینواری ل گوندی:**

دێرا میسەکا، یان دبێژنێ غەوسێ میسەکا کو خەلك دچنە سەر و بۆ خۆ دوعا دکەن، زێدەباری حەفت ناوسك ل باکوورێ گوندی.

**جهێن دیار و بەرچاڤ ل گوندی:**

شکەفتا ئاڤێ، شکەفتا مزگەفتێ، شکەفتا

گەوكێ، شكەفتا بێمكێ، شكەفتا كون حەفتیاری، شكەفتا سیخوران، شیڤا ئاشا، شیڤا زر گویزا.

**ژێدەرێن ئاڤی ل گوندی:**

جۆیا بەر گوندی، جۆیا چەمە سۆركی، جۆیا مێرگانێ، جۆیا ملا خەلیل، جۆیا ملا عمبارێ و نها گوند یێ كێم ئاڤی یە، لەوما ل سالا ١٩٩٦ێ بیرەكا ئیرتیوازی بۆ گوندی هاتییە كۆلان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلكێ ڤی گوندی ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەت چاندنا گەنمی و جەهی و نیسك و نۆك و برنج و ماش و كونجیيان، نها ژی پتر ل سەر مووچەیانە، زێدەباری كو هندەك ژێ جۆتیاریێ دكەن و پەزی ب خودان دكەن.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**

خواندنگەهـ ل سالا ١٩٩٦ێ هاتییە ڤەكرن، سالا ١٩٩٨ێ مزگەفتەك لێ هاتییە دروستكرن، سالا ٢٠٠٧ێ كارەب و جادە گەهشتینە گوندی، سالا ٢٠٠٩ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ هاتییە دروستكرن، سالا ٢٠١٢ێ سكرەكێ ئاڤێ لێ هاتییە دروستكرن[٢٤].

## گوندێ مغارا شەرەڤان

گوند دكەڤیتە دووراتییا ٦كم باشوورێ سەنتەرێ ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ مغار ب واتایا شكەفتان د زمانێ عەرەبی دا هاتییە كو ل رۆژهەلاتێ گوندی هەنە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٣٧٤٣ دۆنەمن، ژ وانان ١٣٧ دۆنەم دێمی، ٢٢ دۆنەم ئاڤی، ٣٣٩٣ دۆنەم پاوان، ١٧٧ دۆنەم رەزێن دێم، ١٤ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٨٠٠ پەز و بزن لێ هەنە[٢٥].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ شەهیا.

**باشووری:** گوندێ گەلیێ خودێدا و بنكەلی.

گوندێ میسكا وەقف



**ڕۆژهەلاتی:** گوندێن میسەکا و ئافریڤا.

**ڕۆژئاڤایی:** گوندێن شکەفتهندیا و شێخ هادی.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا کۆچەرانە ژ تیرەیا زێدك، ژ سێ بنەمالان بنەمالا سەیفەددین، بنەمالا سەید، بنەمالا دەرشیڤی پێکدهێت. هژمارا خەلکێ گوندی ل دەستپێکێن سالێن شێستان ٦٥ کەس بوون و نها دگەهنە نێزیکی ١٨١ کەسان.

گوند ل دەسپێکا سالێن شێستان هاتییە خرابکرن و سالا ١٩٩٤ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

## جهێن دیار ل گوندی:

چیایێ خۆشاڤا، شکەفتا ئیسێ، شکەفتا توخیبی، شکەفتا گاڤانی، شکەفتێن ناڤ گوندی کو پێکهاتینە ژ سێ شکەفتان، گەلیێ پلنگی، جۆیا لالش.

## زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

گوندی چەند کانی هەنە وەکی: کانیا ژنکا، کانییا زەلاما، برکا شەلال، برکا گەلی هنارکێ، برکا بیبۆ. هەروەسان بیرەکا ئاڤێ ژی ل سالا ٢٠٠٦ێ بۆ هاتییە کۆلان.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیانا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و هژیر و تری و سماق و خودانکرنا تەرش و کەوالی و چێکرنا رەژوبێ بوو، نها ژی گەلەك ژ خەلکێ کاسبکار و مووچەخۆرن و گەلەکێن دی ل سەر بیرێن نەفتێ کاردکەن کو ژ سالا ٢٠١٠ێ و هێرڤە ژ لایێ کومپانییا گولف کیستون ڤە دهێتە دەرئێخستن و ل ڤێرە چوار بیرێن نەفتێ کۆمکرینە سەرێك و رۆژانە ٢١ هزار بەرمیلێن نەفتێ بەرهەم دهینت.

گوندێ مغارا شەرەفان



**خزمەتگوزاریێن گوندی:**

ڤی گوندی چەند خزمەتگوزاری لێ هاتینە دروستکرن، وەکی خواندنگەهـ ل سالا ١٩٩٥ێ، مزگەفت ل سالا ١٩٩٩ێ، جادە ل سالا ١٩٩٤ێ، پرۆژەیێ ئاڤێ و کارەبێ ل سالا ٢٠٠٦ێ[٢٦].

## گوندێ دیرەخترا

گوند دکەڤیتە دووراتییا ١٠کم باشووورێ رۆژهەلاتێ ناڤەندا ئەتریش. ناڤێ گوندی ژبەر هەبوونا دێرەکا کەڤن ل گوندی هاتیە کو هەتا نها شوینوارێن وێ ماینە، و ب رەخ وێ دێرێ ڤە چەمێ "خترە" هەیە، واتە دێرا ب رەخ چەمێ خترەڤە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٣٧٠٦ دۆنەمن، ژ وانان ٢٢٦٥ دۆنەم دێمی، ٩٩٨ دۆنەم ئاڤی، ٣٣٦ دۆنەم پاوان، ٦٤ دۆنەم رەزێن دێم، ٤٣ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٥٠٠ پەز و بزن و ٧٤ لێ هەنە[٢٧]. سولتان حسێن وەلی حەفت قرۆش و چارێکەك وەکی وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل سەر سەپاندبوو[٢٨].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن ئازاخ و هەرماش.

**باشووری:** گوندێ شەهیا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن رکاڤا و بادیناوا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێدارکێ و ئەتریش.

**پێکهاتا گوندی:**

ئەڤ گوندە ژ ٦ بنەمالان پێکدهێت، ئەو ژی بنەمالێن فەقۆی، شێخی، گورجێ، عەلیێ خەجۆی، حەجی کەلەشی و مستو کوچەر و هەمی ژ عەشیرەتا مزووریانە. ژمارا خەلکێ گوندی ل دووف سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١١٤ کەس بوون[٢٩] و ل سالا ١٩٧٤ێ ١١٠ کەس ل سەر گوندی بوون و نها ژی گوند پێکهاتیە ژ ١٨٩ کەسان و ژیانا وان ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت چاندنا گەنم و جەهان و خودانکرنا تەرش و کەوالی و مووچەیان.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٦٣ێ هاتیە خرابکرن و پشتی پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ جارەکادی گوند هاتیە ئاڤاکرن، لێ ل سالا ١٩٧٤ێ گوند جارەکادی هاتیە خرابکرن و خەلکێ وی برنە دەڤەرا ئاکرێ تا پشتی سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ کو گوند دیسان هاتیە ئاڤاکرن و نها ٣٠ مال سەر گوندی دژین.

ژ جهێن شوینواری ل گوندی دێرا خترە و ژ جهێن بەرنیاس ژی ل گوندی گەلیێ دەخترا و شکەفتێن کەڤرێ کومەی و شکەفتا کانی لەڤەنۆکێ.

**زێدەرێن ئاڤی ل گوندی:**

جۆیا خترە، جۆیا جەلالێ، کانییا شەنگۆی، کانییا مێرکێ، کانییا گوندی، شیڤا خترە کو ئاڤا سەرکییا چاندنێ یە.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا دەرامەتی بوو، مینا گەنمی و جەهی و برنجی و توتنێ و چێکرنا رەزا و چاندنا باهیڤا و ب خودانکرنا تەرش و کەوالی و چێکرنا رەزێ، نها ژی پتر ل سەر مووچەیانە، زێدەباری کارێ چاندنێ و ب خودانکرنا پەزی.

ڤی گوندی چەند خزمەتگوزاری لێ هەنە، وەکی پرۆژەیێ ئاڤێ کو ل سالا ١٩٩٣ێ بۆ هاتییە دروستکرن، هەروەسان مزگەفت ژی ل سالا ٢٠٠٢ێ هاتییە ئاڤاکرن، ژبلی خزمەتێن کارەب و کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازی و ئاڤاکرنا خواندنگەهێ کو ل سالا ٢٠٠٦ێ بۆ گوندی هاتینە دابینکرن. دو جۆیێن ئاڤێ ژی ل سالا ٢٠١٢ێ بۆ هاتینە دروستکرن و جادە ژی ل سالا ٢٠١٣ێ گەهشتییە گوندی[٣٠].

## گوندێ ربەتکێ

گوندەکە د بەرێ دا گەلەکێ مەزن بوو، دکەڤیتە دووراتییا ١٦کم باکوورێ سەنتەرێ ئەتریش. وەکی د پەرتووکا المعجم التاريخي لامارة بهدينان دا هاتی دبێژیت: گوندەکە دکەڤیتە دەڤەرا بەرواری ژێری، ل دەسپێکا سەدسالییا دەهێ مشەختی ١٦زایینی

میر حەسەن کورێ سەیفەددینی خواندنگەهەك لێ دامەزراند و ژمارەکا زانایان لێ دەرچووینە[31]. ل سەر ناڤێ گوندی سێ بۆچوونێن جودا هەنە:

بۆچوونا ئێکێ ئەوە کو زۆر بەفر لێ دباریت و رێ دهێنە گرتن و رێ بەند دبن، لەوما گۆتینێ ربەتکی. بۆچوونا دووێ کو ل بەرێ مەسیحی لێ بووینە و دێر لێ هەبووینە و جهێ رەبەنێت وان بوویە و رەبەنکێ بوویە ربەتکێ. بۆچوونا سێێ ژی ئەوە کو ناڤەکێ ئارامی یە.

ئەڤ گوندە ب خواندنگەها وێ یێ ناڤدار بوو، ژ زانایێن وی شێخ ئەحمەد کورێ حەسەنێ ربەتکی و کورێ وی عەبدوللایێ ربەتکی، یێ ناڤدار ب المدرس ١١٥٩مش/ ١٧٤٦ مریبە، ئێك ژ ناڤدارترین زانایێن عیراقێ ل سەردەمێ خۆ و چەندین نڤیسین هەنە[32].

رووبەرێ عەردێ گوندی ٥٢٨١ دۆنەمن، ژ وانان ٢٠٨ دۆنەم دێمی، ٨٦ دۆنەم ئاڤی، ٧٨ دۆنەم کەڤری، ٤٠١١ دۆنەم پاوان، ٨٩٨ دۆنەم رەزێن دێم. هەروەسان ٦٢٠ پەز و بزن لێ هەنە[33].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن سویار و مێزێ و گەڤەرکێ سەر ب ناحیا چەمانکێ نە.

**باشووری:** گوندێن زێریێ و بلکێف و دەحلێنەوێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن کانیکا و ملبرکێ و شلیا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ نسرا.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، ژ پێنج بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا رەشێ، بنەمالا هەسن، بنەمالا ترباس، بنەمالا گەڤەرۆشکیا، بنەمالا نەبی زادە پێکهاتینە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٦٩٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان[34]، و ل سالا ١٩٩٨ێ

گوندێ ربەتکێ



بەری گوند بێتە بەردان نێزیکی ٢٥٣ کەسان ل گوندی دژیان و خەلکێ گوندی ل سالا ٢٠١٦ دگەهشتنە نێزیکی ٣١٠٠ کەسان.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٨٨ێ کەتییە بەر هەوێن ئەنفالان و هاتییە وێرانکرن، و پشتی ل سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاکرن، جارەکادی ژبەر شەرێن ناڤخۆ گوند هاتییە چۆلکرن ڤە و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن.

### شوینوار و جهێن کەڤنار ل گوندی:

ژ شوینوارێن گوندی دێرەك و سێ ناوسك لێ هەنە، هەروەسان پیر دوود پیر داوود کو مەرقەدە و پیر ئاڤدەل.

### جهێن دیار ل گوندی:

کێریێ ربەتکێ، کۆرا زێرا کو جهەکە دارێن کاژان لێ هەنە، زۆما درەوین، زۆما گەڤەرۆشکێ، شکەفتا پیر سماهیل، شکەفتۆکا پیرێ، نەهالا مامەسینا، نهالا بهاری، نەهالا درەوینێ.

### زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەندین کانیێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی کانییا دەحلێ ئێك و دو، کانییا جۆمێ، کانی کەزابك، ئاغدێ کانییا میرا، کانیکا حسێن، کانییا بالاڤێ، کورا زەرا، کانییا فەق ئومەر، کانییا زێدا، کانییا ژێرێ، کانییا کوتەلکێ، برکا هەلنا، برکا ملکیس.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا ئاڤی و دێمی و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، نها ژی پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی ل هاڤینان چاندنێ دکەن.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا ١٩٤٥ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن، رێڤەبەرێ وێ یونس ئەفەندی بێ پێدەیی بوو، دو سالان دەوام لێ هاتەکرن و پشتی هینگێ هاتە گرتن، تا ل سالا ١٩٥٩ێ جارەکادی هاتە ڤەکرن ڤە، لێ دیسان ل سالا ١٩٦١ێ هاتە گرتن ڤە و پشتی هینگێ نەهاتییە ڤەکرن ڤە[٣٥].

## گوندێ خەرزا بیهکێ

گوندێ کەڤن دگۆتنێ بیهکێ، دکەڤیتە دووراتییا ١٦کم باکوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ئەتریش. ناڤێ وی د پەرتووکا المعجم التاریخی لامارة بهدینان دا هاتییە کو دکەڤیتە رۆژهەلاتێ دهۆکێ و توما المرجی ل سەدسالیا حەفتی زایینی ئاماژە ب ناڤێ گوندی خردز، خردس، خەرزا، خەردز کرییە و خواندنگەهەك ب ناڤێ مریەم لێ دیتییە، هەروەسان دەستنڤیسەکا سالا ٢٠٢٦ یۆنانی، بەرامبەری ١٧١٥ز/ ١١٢٧مش ئاماژە پێ دایە، ژبلی کو ناڤێ وی د وەقفا سولتان حسێن وەلی ژی دا هاتییە کو دەهـ قرۆش و پێنج بەغدادی بۆ خواندنگەها قوبەهان ل سەر هاتییە سەپاندن. کاتولیکیەتێ جهێ خۆ ل ڤی گوندی گرتییە و هژمارا وان گەهشتبوو ١٢٠ کەسان و قەشەیەکی خودانی لێ دکر و جهێ نڤێژێن تایبەت ب وانڤە هەبوون[٣٦]. خەلکێ گوندی هەر هەسنەکینە و ژبۆ نێزیك بوون ژ ملکی ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٨٧ێ ئاڤاکرینە. ناڤێ گوندی دبێژن بێ ژ زاخا عەردێ وی هاتی کو داهاتەکێ باش ژ عەردێ وی دهێت مینا خەرزی و ناڤ بوویە خەرزا. رووبەرێ عەردێ گوندی ١٣٩٦ دۆنەمن، ژ وانان ٢٠ دۆنەم دێمی، ٧٠ دۆنەم ئاڤی، ١٠٨١ دۆنەم کەڤرین، ١٦٠ دۆنەم رەزێن دێم، ٦٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی[٣٧].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن سپینداری و خورینیێ.

**باشووری:** گوندێ کانییا باسکا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ هەسنەکا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کابێرکێ.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، پێکهاتییە ژ ئێك بنەمال ب ناڤێ بنەمالا مەلای. ژمارا خەلکێ گوندی ل بەری بێتە چۆلکرن ل سالا ٢٠٠٨ێ ١٨٠ کەس بوون و ژمارا خەلکێ گوندی دگەهنە نێزیکی ٤٠٠ کەسان، لێ کەس ل سەر گوندی ناژیت.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٨٨ێ كەتییە بەر هەوێن ئەنفالان و هاتییە وێرانكرن، سالا ١٩٩١ێ جارەكا دی هاتییە ئاڤاكرن، لێ ل سالا ٢٠٠٨ێ هاتییە بەردان و هەتا نها چۆلە.

## شوینوار و جهێن كەڤنار ل گوندی:

چەند شوینوار ل گوندی هەنە، وەكی بیهكێ كو شوینوارێن كەڤنن، كاڤلە گوندێ كەڤن، سێ ناوسك، بنیاتێ دێرەكێ كو ب كاڤلێ دێرێ دهێتە نیاسین.

## جهێن دیار ل گوندی:

سكرێ نیحێ، بەركەڤیێ، دەریا بیهكێ، دەربێ پەرەستەی، مێرگا قەرچا كو زۆمە، شكەفتا بەرەبەنا.

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەندین كانیێن ئاڤێ لێ هەنە، وەكی كانی عیساكێ، كانیا گیرێ، كانی كاڤلێت خەرزا، بركا خرێ، جۆیا خەرزا كو ب ناڤێ سكرێ نیحێ دهێتە نیاسین و ملك ل بەر دهێتە كرن كو ل سالا ٢٠٠٣ێ بۆ هاتییە دروستكرن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا ئاڤی و دێمی و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، هەروەسان مفا ژ سرۆشتی ژی دهاتە وەرگرتن. لێ نها پتر ل سەر كاسبكارێ و مووچەیانە و هندەك ژی چاندنێ دكەن.

بۆ جارا ئێكێ سالا ١٩٩٢ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، پشتی هینگێ چەند خزمەتگوزاری بۆ هاتبوونە دروستكرن، وەكی مزگەفت ل سالا ١٩٩٧ێ، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٦ێ، كارەب ل سالا ٢٠١٠ێ، جادە ل سالا ٢٠١٣ێ[٣٨].

# گوندێ كانیا باسكا

گوند دكەڤیتە دووراتیا ١٥كم باكوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ئەتریش. ناڤێ گوندی دبێژن ژ وێ چەندێ هاتییە كو كانیا گوندی د تیكە بەرەكی دەردكەڤیت و دەستێ مرۆڤی نەدگەهشتێ و ب باسكی ئاڤ دهاتە ڤەخوارن لەوما بوویە كانیا باسكا. رووبەرێ عەردێ گوندی ٥٦٨ دۆنەمن، ژ وانان ٢٠ دۆنەم دێمی، ٨٤ دۆنەم ئاڤی، ٣٢٥ دۆنەم پاوان، ٦٥ دۆنەم رەزێن دێم، ٧٤ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٦٨٠ پەز و بزن لێ هەنە[٣٩].

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ خورپنیێ سەر ب ناحیا زاویتە ڤەیە.

**باشووری:** گوندێ كەڤنە كەلێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ هەسنەكا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ صۆریا.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ ئێك مالبات یان بنەمال پێكهاتییە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٣٩ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٤٠]، سالا ١٩٨٨ێ بەری گوند ب كەڤیتە بەر هەوا ئەنفالان ٣٣ كەس ل گوندی دژیان و نها ٦٨ كەس ل سەر گوندی دژین.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٨٨ێ كەتییە بەر هەوێن ئەنفالان و هاتییە وێرانكرن و سالا ١٩٩١ێ جارەكا دی هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

## شوینوار و جهێن كەڤنار ل گوندی:

ڤی گوندی ناوسكەك لێ هەیە.

## جهێن دیار ل گوندی:

دو شكەفت لێ هەنە دبێژنێ شكا پشتا رەزی، دۆلا بركا خراب،

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند كانیێن ئاڤێ لێ هەنە، وەكی

کانی صارکێ، کانی هژیرکێ، کانییا نەینێ، کانی باپیرکێ، کانی چنارك، برکا خراب، رووبارێ کانییا باسکا و صۆریا کو دکەڤیتە دناڤبەرا هەردو گوندان‌دا.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەت چاندنا دار و بارێ فێقی مینا سێڤ و خۆخ و تری و هنار و... هتد، نها ژی پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی چاندنێ ل گوندی دکەن، ب تایبەت دار و بارێ فێقی و چاندنا کەسکاتیان، ژ خیار و باجانسۆرك و لۆبیك و... هتد.

### خزمەتگوزاریێن گوندی:

چەند خزمەتگوزاری بۆ گوندی هاتینە دابینکرن، وەکی: ڤەکرنا خواندنگەهێ ل سالا خواندنێ ٢٠٠٤-٢٠٠٥ی، بنکەهێ تەندروستی ل سالا ١٩٩٢ێ، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٦ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن، ژبلی ئاڤاکرنا خانییان و گەهاندنا جادێ و چێکرنا جۆیێن ئاڤێ[٤١].

## گوندێ بالەتە

گوند دکەڤیتە دووراتییا ١٥کم باشووری رۆژئاڤایێ ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ١٨٥٢ دۆنەمن، ژ وانان ٣٦٨ دۆنەم دێمی، ١٠٩ دۆنەم ئاڤی، ١٠ دۆنەم کەڤرین، ١١٩٣ دۆنەم پاوان، ١٧٢ دۆنەم رەزێن دێم[٤٢].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێن گەلیێ رمان و بازێرکێ.

**باشووری،** گوندێن شێخەسن و خورکێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن بریفکا و مامزدینا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ چەمان.

گوندێ کانییا باسکا



## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، پێکهاتینە ژ چەند مالباتان ب ناڤێن بنەمالا سیتوی، بنەمالا عەیش عەمەری، بنەمالا عەبدویێ مەحمیدی، بنەمالا سەلیمێ شەریف، بنەمالا حەمێ، بنەمالا یونسێ عەلوی، بنەمالا یوسف فەتەحا، بنەمالا عەلی حەجی سلێمان، بنەمالا قەنجوی، بنەمالا مستەفای، بنەمالا نعمان ئاغای، بنەمالا عەبدولا گۆزەلا، بنەمالا مستەفا حسێن، بنەمالا حەجی حەمیدی. ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٢٥٧ کەس بوون[٤٣] و ل سالا ١٩٨٨ێ بەری گوند بکەڤیتە بەر ئەنفالان نێزیکی ٥٠ کەسان ل گوندی دژیان و نها نێزیکی ٨٠ کەسان ل سەر گوندی دژین.

ئەڤ گوندە چەند جاران د دەمێ شۆرشێن کوردی دا هاتیە سۆتن و کاڤلکرن و پشتی هینگێ هاتیە ئاڤاکرن ڤە، وەکی ل دەستپێکا سالێن شێستان هاتیە سۆتن و بەردان و سالا ١٩٦٣ێ جارەکا دن هاتیە ئاڤاکرن. سالا ١٩٧٥ێ هاتیە بەردان و سالا ١٩٧٦ێ هاتیە ئاڤاکرن ڤە. سالا ١٩٨٦ێ هاتیە بەردان و سۆتن و ل هەمان سال هاتە ئاڤاکرن ڤە، تا داوی جار کەتیە بەر هەوا ئەنفالان و سالا ١٩٩١ێ هاتیە ئاڤاکرن ڤە و تا نها یا ئاڤایە.

## شوینوار و جهێن کەڤنار ل گوندی:

ژ شوینوارێن گوندی ناوسکەك لێ هەیە، ژبلی چەند جهێن ناڤدار وەکی: سەرێ کوپی، نزارێ ناوسکێ، بەرشکەفتی، گرمازی.

## زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند کانیێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی کانیا گوندی، کانی رەشکێ، کانیا کەندال سۆرا، کانیا گرمازی، کانیا جنیکا، برکا مزویریا، برکا خێرێ.

گوندێ بالەتە



**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر چێكرنا رەزا و چاندنا گەنم و نیسك و نۆك و تویتنێ بوو، هەروەسان خودانكرنا تەرش و كەوالی و چوونا كاروانان و چێكرنا رەژویێ بوو، ژبلی مفا وەرگرتن ژ سرۆشتی و چوونا گوهیشك و كەزان مازیان. نها ژی پتر ل سەر كاسبكاریێ و بازرگانیێ یە و گەلەك ژی مووچەخۆرن، دیسان هندەك كارێ چاندنێ دكەن و تەرش و كەوالی ب خودان دكەن.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**

ڤی گوندی چەند خزمەتگوزاری بۆ هاتینە دروستكرن، وەكی: خواندنگەهـ ل ڤی گوندی بۆ جارا ئێكێ سالا ١٩٦٦ێ هاتییەڤەكرن، و سالا ١٩٩٧ێ ئاڤاهی بۆ هاتییە ئاڤاكرن. ئاڤاكرنا مزگەفتێ و بنكەهێ تەندروستی ل سالا ١٩٩٧ێ، چێكرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٣ێ، ڤەكرنا رێكێ ل سالا ٢٠٠٦ێ، گەهاندنا كارەبێ ل سالا ٢٠٠٧، ژبلی چەند پرۆژەیێن چاندنێ، وەكی: پرۆژەیێ ئاڤدانا پەزی ل سالا ١٩٩٩ێ، دروستكرنا دو بركێن ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٥ێ، چێكرنا سكرەكێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٧ێ. هەروەسان بیرەكا نەفتێ ل رەخ گوندی ژ لایێ كومپانییا گولف كیستون یا بریتانی ل سالا ٢٠١٠ێ هاتییە كۆلان[٤٤].

## گوندێ خوركی

ئەڤ گوندە سەر ب ناحیا ئەتریش ڤەیە ل قەزا شێخان، دكەڤیتە دووراتییا ٢٥كم رۆژهەلاتێ پارێزگەها دهوكێ و ٢٥كم باشوورێ رۆژئاڤایێ ناڤەندا ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ٥٣٤٤ دۆنەمن، ژ وانان ١٤٨٥ دۆنەم دێمی، ٤٢ دۆنەم ئاڤی، ٧٦٠ دۆنەم كەڤرین، ٢٨٢٣ دۆنەم پاوان، ٢٣٤ دۆنەم رەزێن دێم[٤٥]. زانا و شەهرەزا ژ ڤی گوندی دەركەتینە وەكی حەسەن كورێ محەمەد خوركی كو ل سەدسالییا ١٢مش/ ١٨ز، خودانێ تفسیر الجلالین كو نها ل پەرتووكخانا گشتیی یا ئەوقافا مووسل هەیە ژبایە، و محەمەد خوركی ١٠٦٠مش/١٦٥٠ز مریبە چەند بەرهەم هەنە[٤٦].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێن بالەتە و چەمان.

**باشووری:** گوندێ خورزا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شێخەسن.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ پیرمۆس.

ل سەر ناڤێ گوندی سێ بۆچوون هەنە:

یا ئێكێ: كەسێن مێرخاس لێ هەبوون و د خورت بوون و ناڤ ژ خورت بوویە خوركی.

یا دووێ: د دەمەكی دا ئێزدی ژ عەشیرەتا خوركا لێ هەبووینە و ناڤێ گوندی ژ ناڤێ عەشیرەتێ هاتییە.

یا سێێ: ئانكویا ناڤێ خوركی: خور، ئانكو رۆژ، كی، ب زمانێ سۆمەری ئانكو بەند، هەموو پێكڤە دێ بیتە رۆژپەرێس.

**سنوورێن گوندی:**

**باكوور و باكوورێ رۆژئاڤایی:** گوندێن ناحیا زاویتەیە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شێخەسن.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باساوا.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ بلی مالباتێن رەسەنێن گوندی كو مزووری نە، خەلكێ مشەخت ژی لێ هەبوون، وەكو: كۆچەرێن ئەرتووشی، زێدك، رێكانی و .... بارا پتر ژ گوندییان فەقیر و ژاربوون. ئەڤ گوندە ژ چەند بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا سەعید حەسەن مستۆ، بنەمالا مراد، بنەمالا عەبدوللا ئلیاس، بنەمالا قاسم مەرجانی، بنەمالا گەردی، بنەمالا مۆسا، بنەمالا عەبدولرحمان جدەح، بنەمالا برۆ صۆصا، بنەمالا حسێن حەبیب، بنەمالا مالا شێخا، بنەمالا عەلو مێما، مالا سلۆش عەمەر پێكهاتییە.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٦٠٢ كەس ل ڤی گوندی دژیان[٤٧] و هەتا سالا ١٩٦١ ئەڤ گوندە نێزیكی ٨٠ مالان بوو، كو دبوونە نێزیكی ٢٠٠ كەسان و ل سەر چوار تاخان هاتبوونە بەلاڤەكرن، ئەو ژی: تاخا زویری، تاخا ناڤێ، تاخا مەواتیا، تاخا ژێری. نها ژی

٣٥ مال سەر گوندی نە كو سەرجەمێ وان دبنە ١٨٥ كەس و گشت ژمارا خەلكێ گوندی نها دبنە ٢٥٠٠ كەسان و پتریا وان ل دهۆك و شێخان و دەڤەرێن جودا دژین.

ئەڤ گوندە چەند جاران ژ ئەگەرێ شۆرشا كوردی ل سالێن ١٩٦١، ١٩٦٣، ١٩٧٤ێ هاتییە كاڤل و وێرانكرن، لێ پشتی هەر وێرانكرنەكێ ب سالەكێ گوند جارەكادی ل سالێن ١٩٦٢، ١٩٦٤، ١٩٧٥ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە، لێ د هەمان سالا ١٩٧٥ێ خەلكێ گوندی راگوهاستنە دەڤەرا بەردەرەش و گوند ل سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

## شكەفتێن گوندی:

گەلەك شكەفتێن ل ڤی گوندی هەین، خەلكی پەز و دەوارێن خۆ دكرنە تێڤە، ژوانان:

شكەفتا داود، شكەفتا عبدولرحمانێ سەعدویی، شكەفتا بێدەروكێ، شكەفتا شێخ تاهایی، شكەفتا قەرەخان، ئەڤا دوماهیێ شكەفتەكا تەزی بوو، خەلكی جەركێن زاژی و پەنیری دكرنە تێڤەداكو خراب نەبن، جهێ دەواران ل ڤێرە نەبوو. هندە شكەفت ژ دەرڤەی گوندی ژی هەنە، وەكو، شكەفتا گەلی، شكەفتا كۆترا، شكەفتا چۆلی، شكەفتا عزەددین، شكەفتا فەلەكێ.

هەروەسان گرێ جوانا وەكی شوینوار ل گوندی هەیە، ژبلی مەرقەدێ شێخ ئەدریس.

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

گەلەك كانی و برك ل ڤی گوندی هەبوون وەكو: كانییا گوندی، بركا دەروێش، كانیكا خازی، كانییا حەسەن مستۆی، سكرێ سلوی، كانییا ئاخا سپیكێ، بركا پشت زیارەتا، كانییا نزاری، بركا دالەبەل، كانییا شێخی، بركا شێخ تاهایی، كانیك و بركێن جوومان، ئاڤا پشت دەحلی، بركا سورمێ، بركا مریەمێ، ئاڤا دەرەجا و ..... پتریا وان تووتن ل بەر دهاتە چاندن.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر تەرش و كەوالێ بوو و هەتا سالا ١٩٦١ێ چوار كەرێن پەزی ل ڤی گوندی دگەل گارانەكا چێل و گا و دەواران هەبوون. ژبلی ڤێ چەندێ ژیانا گوندیان ل سەرچاندنێ و فێقی و دەرامەتێ دێم و ئاڤی ژی بوو، وەكی گەنم و نۆك و تری و هژیر و سماق و نیسك و ...هتد، هەروەسا ل سەر كاروانێن رەزێ و تووتنێ ژی بوو. نها ژی پتر ل سەر كاسبكاریێ و بازرگانیێ و مووچەیانە و گەلەك ژی هێز كارێ جۆتیاریێ ژی دكەن.

## خواندنگەهـ:

ئێكەمین خواندنگەها ل ڤی گوندی ڤەبووی ل سالا ١٩٥٨ێ بوو، ناڤێ ئێكەمین مامۆستایێ وێ هورمز جەجو پۆلص بوو. ژمارا خویندكاران نێزیكی ٦٠ خویندكاران بوون، كربوونە دو هۆبە ئا ــ ب، هندەك سپێدێ دهاتن، هندەك ئێڤاری. خویندكار ژ گوندێن: شێخەسن، باسەوا، چەمان ژی دهاتنە ڤێ خواندنگەهێ. ئێكەمین خویندكارێ ڤێ خواندنگەهێ یێ كو زانكو تەواو كری، ناڤێ وی حەجی جەعفر حارس بوو، ئەوژی ل سالا ١٩٧٦ێ بوو ، پاشی خالد یاسین رشید، پاشی عارف عیسا شێخو و ....ئەوێن دی ژی دەها خواندن تەواو نەكر. خواندنگەهـ هەتا سالا ١٩٦٢ێ بەردەوام بوو.

هندەك ژنكێن گوندی كارێ نوشداریا كوردەواری دكرن، وەكو: زارێ، كوتێ، روحانێ، ئاموا سلوی.

مزگەفتەكا كەڤن ل ڤی گوندی هەبوو، فەقی و سوختە ژ گەلەك جهان بۆ خواندنێ دهاتنە بەردەستێن مەلایێن ڤی گوندی. مەلایێن ب ناڤ ودەنگێن گوندی: مەلا عیسایێ گەلی رومانی و مەلا خەلیلێ مشەختی بوون كو وانێن ئۆلی دگۆتن.

هەژی گۆتنییە سالێن شێستان سەردەمێ شۆرشا ئەیلوولێ كو نڤیسەر و رۆژنامەڤانحافز قازی و هەلبەستڤانێ نشتیمانپەروەر هەژارێ موكریانی بووینە مێڤان ل ڤی گوندی.

دەواتێن گوندی تێكەل و رەشبەلەكبوون، ب دهۆل و زرنا بوون. جهەك هەبوو دگۆتنێ كۆپكێ زرنا بێژا، گاڤا دهۆلقوت و زرنابێژ ژ بۆزان یان خورزان

دهاتن داچنە سەر وی کۆپکێ چیایی زرنایێ لێدەن. سترانبێژێن گوندی هیرویێ محمد گولا و سمویێ عەلیێ شڤان بوون. زبارە ل گوندی هەبوون، هەروەسا پالەتی و متارانێ ژی هەبوون. ژن رەڤاندن ل گوندی هەبوو، هەروەسا بەردێلی و نەخت ژی هەبوون. لێ سەرا رەڤاندنێ کەس نەهاتییە کوشتن، ب زووترین دەم پێکدهاتن.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

ڤی گوندی چەند خزمەتگوزاری بۆ هاتینە دابینکرن، وەکی: بنگەهێ ساخلەمیێ ل سالا ١٩٩٤ێ، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ١٩٩٧ێ، گەهاندنا جادێ و کارەبێ ل سالا ٢٠٠٥ێ، ژبلی دروستکرنا چوار برکێن ئاڤێ بۆ چاندنێ[٤٨].

## گوندێ باساوا باصەوا

گوند سەر ب ناحیا ئەتریش ڤە، لێ ژبەر نێزیکییا وان دگەل ناحیا ئەلقۆش، پەیوەندیێن وان و نەمازە یێن بازرگانی پتر دگەل وێ ناحیێ نە. گوند دکەڤیتە دووراتییا ٢٧کم باشووریێ سەنتەرێ ئەتریش. ل سەر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە، یا ئێکێ دبێژن یا ژ بایێ سوبا هاتییە، چونکی ل سپێدەهییان بایەکێ ب هێز ل ڤی گوندی دهێت. یا دووێ دبێژیت کو د بەرێ دا مەسیحی ل گوندی بوون و ناڤ ژ بیت الساوە هاتییە و ناڤ بوویە باصەوا. نها گوند بوویە دو بەش، ئێك ل جهێ گوندێ کەڤن و یا دی چووینە رووباری و ل ویرێ خانی ئاڤاکرینە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٣١٤٣ دۆنەمن، ژ وانان ٧١٥ دۆنەم دێمی، ٦٥ دۆنەم ئاڤی، ٢٣٥١ دۆنەم پاوان، ١٢ دۆنەم رەزێن ئاڤی[٤٩].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری**، گوندێ پیرمووسی.

**باشووری**، گوندێن ووشتیان و کانی گولان..

**رۆژهەلاتی**، گوندێ خورکی.

**رۆژئاڤایی**، گوندێن بۆزا و خەرزا.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، دبنیاتدا د سالێن بیستان ژ سەدسالییا بووری ژ گوندێ خورکی هاتینە و ل ڤی گوندی ئاکنجیبووینە، ژ هەرسێ بنەمالێن عەبدولرحمانێ سەعدونی و حەجی رەشیدی و حارسی پێکهاتینە. د بەرێ دا هەشت مال بوون و ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ١٧ کەس بوون[٥٠]، سالا ١٩٧٤ێ ٨٢ کەس بوون و ل نها ژمارا خەلکێ گوندی نێزیکی ١٩٠ کەسانە، پترییا وان ل باژێرێ دهۆکێ دژین و هەمی ژ بنەمالا عەلی نەبییانە.

گوند ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٦ێ هاتییە وێرانکرن، لێ ل دووڤدا ل سالێن ١٩٦٤، ١٩٦٨ێ هاتییە ئاڤاکرن و داوی جار گوند ل سالا ١٩٧٦ێ ل سەر عەرەبا هاتە دابەشکرن و خەلکێ گوندی راگوهاستن تا بوویە سەرهلدانا سالا ١٩٩١ێ کو گوند جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن خەلکێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ.

### شوینوار و جهێن کەڤنار ل گوندی:

د بەرێ دا سێ ئاشێن ئاڤێ ل ڤی گوندی هەبوون و هەتا نها ژی شوینوارێن وان مانە. هەروەسان چەند گۆرستان ژی ب ناڤێن شێخ ئەحمەد، مریەم خان، زەیتوون، شێخ یوسف هەنە، دبێژن ئەڤ هەرسێکە خۆشك و برابوون و ل ڤێرە دگەل کافرا شەهید بووینە. هەروەسان کاڤلکێ دێرێ.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند کانی لێ هەبوون، وەکی:

کانییا گوندی کو یا ڤەخوارنێ بوو، کانیکا زەلامان یا سەر شویستنێ بوو، کانیکا مەلایی، کانی ماران، هەتا دناڤبەرا سالێن ١٩٩١- ١٩٩٤ێ ژی هێشتا سێ جۆیێن ئاڤێ لێ هەبوون. ژ جۆیێن گوندی ژی جۆیا مەزن و جۆیا دەحلێ حلویکا و جۆیا پیرمۆسی و جۆیا ئاشکێ قرۆم. ژبلی رووبارێ باصەوا و کۆنا بیرەکا ئیرتیوازی ل سالا ٢٠١٣ێ.

**جهێن بەرنیاس ل گوندی:**

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەكی كەڤرێ وەزیری ، كو جهەكێ دلڤەكەرە، هەروەسان شكەفتا بەرگوندی.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیانا خەلكێ گوندی ل سەر چاندنا دەرامەتی بوو، ب تایبەت گەنم و نیسك و نۆك و برنج و باجانسۆرك و پەمبی و خۆخ و تری بوویە، ژبلی خودانكرنا تەرش و كەوالی و گارەشان ژی. نها پتر ل سەر كاسبكاریێ و بازرگانیێ و مووچەیانە، هەروەسان هندەك كارێ چاندنێ ژی دكەن.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**

بۆ خواندنێ، چونكی ئەڤە گوندەكێ بچویك بوو، زارۆكێن وان دچوونە گوندێ خوركی. نها چەند خزمەتگوزاری بۆ گوندی هاتینە دابین كرن، وەكی پرۆژەیێ ئاڤێ و كارەب و جادە كو ل سالا ٢٠١٢ێ هاتینە دروست كرن، هەروەسان پرەك ژی ل سەر رووباری ل سالا ٢٠١٤ێ هاتییە دانان[٥١].

## گوندێ تلە

گوندەكێ مەسیحینشینە ل دەڤەرا ئەتریش، دكەڤیتە دووراتییا ١٥كم رۆژهەلاتێ ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ تەل ب واتایا گر، یان چیایێ بچویك هاتییە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٣٢٢١ دۆنەمن، ژ وانان ١٣٥٠ دۆنەم دیمی، ٥٠ دۆنەم ئاڤی، ٩٦١ دۆنەم پاوان، ١٠ دۆنەم رەزێن دێم، ٨٥٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی[٥٢]. ناڤێ گوندی د پەرتووكا المعجم التاریخی لامارة بهدینان دا هاتییە كو گوندەكێ كەڤنارە ل دەڤەرا مەرج، بەری دامەزراندنا میرگەها بەهدینان ناڤەندەكا ئوسقوفی سەر ب حدیاب هەولێر ڤەبوو، كەنیسەیەك ب ناڤێ مار ئیسحاق لێ هەبوو كو ناڤێ وێ دناڤ دەستنڤیسێن سریانی دا ل سەدسالییا هەڤدێ دا هاتییە، سولتان حسێن وەلی دەهـ قرۆش و پێنج بەغدادی وەكی وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل سەر سەپاندبوو. ل سەدسالییا هەژدێ كاسولیكیەت لێ بەلاڤببوو و هژمارا وان گەهشتە ٣٤٠ كەسان و قەشەیەكێ خودانی لێ دكر[٥٣].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ بێركیات.

**باشووری:** گوندێ توسب.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بیرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بلان.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی مەسیحییێن كلدانی نە ژ عەشیرەتا مزووری، ژ چوار بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا تومەكا، بنەمالا قەدوو، بنەمالا یوسف رەئیس، بنەمالا قەرەچیچكە پێكهاتینە. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ١٢٣ كەس ل گوندی دژیان[٥٤]، سالا ١٩٧٦ێ ٣ مال ل سەر گوندی بوون كو دبوونە ٢٠ كەس و نها ٢٠ مال ل سەر گوندی نە كو دبنە ٧٩ كەس. ل ڤان داوییان و پشتی سەر و بەرێ بازێرێ مووسل تێكچووی، گەلەك ژ مەسیحییێن مووسل قەستا ڤی گوندی كرینە.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٦٢ێ هاتییە كاڤل و وێرانكرن، لێ ل سالا ١٩٦٤ێ جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن ڤە و ل سالا ١٩٧٦ێ جارەكادی وێرانكرینە و سالا ١٩٨٨ێ دێر و شوینوارێن گوندی هاتنە پەڤاندن، تا سالا ١٩٩١ێ جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن ڤە و نها چەند خزمەتگوزاری ل گوندی هەنە، وەكی دێرەك ل سالا ١٩٩٦ێ بۆ هاتییە ئاڤاكرن، پرۆژەیێ ئاڤێ و جۆ ل سالا ١٩٩٨ێ بۆ هاتینە دروستكرن و سالا ٢٠١٠ێ هێلا كارەبێ ژی گەهشتییە گوندی، ژبلی دروستكرنا خانییان و خواندنگەهـ بۆ گوندی نەهاتییە ڤەكرن..

**شوینوارێن گوندی:**

ڤی گوندی چەند شوینوار لێ هەنە، وەكی ١٠-١٥ ناوسكان ل چیایێ خێرێ ل پشتا گوندی، زێدەباری دەرەجێن پلنگی.

**جهێن دیار ل گوندی:**

شكەفتە رەشێ، شكەفتا چەلكی، نەهالا رۆژئاڤای گوندی.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ژ ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی كانییا نەبوئە و جۆیا گوندی.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و تری و برنج و ماش و كونجی و دەرامەتێن سرۆشتی و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، نها ژی ل سەر مووچە و كاسبكاریێ و كارێ چاندنێ و خودانكرنا تەش و كەوالی یە[55].

## گوندێ ئێكمالێ

دكەڤیتە دووراتییا ١٥كم رۆژهەلاتێ ناڤەندا ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو ئێك خانی لێ هەبوو و هەر دەمێ ئەو مال ژ وێرێ دچوو خێزانەكا دی دهاتە وێرێ، لەوما ب ئێك مالێ هاتە ناڤكرن كو هەردەم ب تنێ ئێك مال لێ بوویە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٣٧٥ دۆنەمن، ژ وانان ٢٨٠ دۆنەم دێمی، ٥٠ دۆنەم ئاڤی، ٤٥ دۆنەم رەزێن دێم[56].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ بێركیات.

**باشووری:** گوندێ كیفسن، یان مەلكیشان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مێرسیدا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بیرێ.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریان، ژ ئێك بنەمال پێكهاتییە ب ناڤێ بنەمالا حەجی محوّی. ل سالا ١٩٧٤ێ بەری خەلكێ گوندی بێتە راگوهاستن ٤٠ كەس ل سەر گوندی دژیان و نها چوار خێزان كو دبنە ١٥ كەس ل سەر گوندی دژین.

ئەڤ گوندە د رووداێن شۆرشا كوردستانێ دا ل سالێن ١٩٦١، ١٩٦٤ هاتییە كاڤل و وێرانكرن، لێ ل دووڤدا ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٧١ێ جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن تا سالا ١٩٧٥ێ كو خەلكێ وی راگوهاستین و گوند ما كاڤل تا سالا ١٩٩١ێ كو جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

ژ جهێن دیار ل گوندی چیایێ خێرێ یە.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند كانی لێ هەنە، وەكی كانییا ناوسكێ، یان كانییا جنێ، كانییا ئێك مالێ، كانییا بارویتانێ. جۆیا باسفرێ و ئێك مالێ كو یا هەڤپشكە.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا گەنم و نیسك و نۆك و تری و باهیڤ و برنج و دەرامەتێن سرۆشتی و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، نها ژی ل سەر مووچە و كاسبكاریێ و كارێ چاندنێ یە، ب تایبەت گەنم و دار و بارێ فێقی و... هتد.

**خزمەتگوزاریێن گوندی:**

سالا ١٩٦٨ێ بۆ یەكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن. پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ١٩٩٤ێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن. هێلا كارەبێ ژی سالا ٢٠٠٦ێ بۆ گوندی هاتییە راكێشان[57].

## گوندێ هەسنەكا

گوندەكێ مەزنێ عەشیرەتا مزووری یە، دكەڤیتە دووراتییا ١٥كم باكوورێ ناڤەندا ئەتریش. ل سەر ناڤێ گوندی بۆچوونەك هەیە كو هندەك ژ ناڤ عەشیرەتا هەسنییا هاتینە و ناڤێ گوندی ژ ناڤێ ڤێ عەشیرەتێ هاتییە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٦٩٦٦ دۆنەمن، ژ وانان ٨٢ دۆنەم دێمی، ٧٠ دۆنەم ئاڤی، ٢٨٩٠

دۆنەم کەڤرین، ٣٢٩٦ دۆنەم پاوان، ٥٨٦ دۆنەم رەزێن دێم، ٤٢ دۆنەم رەزێن ئاڤی[٥٨].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن سویارێ و سپینداری.

**باشووری:** گوندێن دەحلێنەوێ، بێبۆزێ، کەلێنێ، ئالۆکا، بێدیل و بێنارینکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ نسرا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ صۆریا، کانیا باسکا، خەرزا و خرپنێ.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ پێنج بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا ژووری، بنەمالا مەلای، بنەمالا ئومەر، بنەمالا دادوکی، بنەمالا چەرمینی پێکهاتییە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٣٢١ کەس ل گوندی دژیان[٥٩] و سالا ١٩٩٨ێ ٧٠ کەس ل سەر گوندی بوون و نها ژبەر کێمیا ئاڤێ کەس ل گوندی ناژیت.

ئەڤ گوندە د روودانێن شۆرشا کوردستانێدا چەند جاران هاتییە وێرانکرن و داوی جار کەتییە بەر هەوا ئەنفالان و خەلکێ وی هاتینە ڤەگوهاستن بۆ ئوردیگایێن بەحرکێ و جێژنێکان ل نێزیکی هەولێرێ. تا سالا ١٩٩١ێ جارەکادی گوند هاتییە ئاڤاکرن ڤە، لێ ژبەر کێمیا ئاڤێ و شەرێ ناڤخۆ گوند ل سالا ١٩٩٨ێ هاتییە چۆلکرن و هەتا نها چۆلە.

**شوینوارێن گوندی:**

چەند شوینوار ل ڤی گوندی هەنە، وەکی دێرەك ب ناڤێ باسکە دێرێ، ملا دیوانێ "دیوانخانەیە و ب بەرا هاتییە ئاڤاکرن"، کەڤنە کەلێ "شوینوارێن کەلایەکێ لێ هەنە"، کێلییەك، یان گۆرەك کو ل سەر توومارکرییە دیرۆکا وی بۆ بەری ٧٠٠ سالان دزڤریت.

**جهێن دیار ل گوندی:**

بانیا هەسنەکا، کێربێ هەسنەکا، کارێ بانیێ، تەڤە رەشێ، هێلینا ڤەلێ، سەردەریێ بەرەستەی، دەریا ئیسڤێ حەسەن، گرێ گومبەلێ، بەرێ زینا.

دیسان چەند شکەفت هەنە، وەکی: شکەفتا دەرهەوا، شکەفتا حەمی، شکەفتا ستین، شکەفتا گەلی، شکەفتا بن عەرد، شکەفتا توی، شکەفتا ب خۆلی، شکەفتا صادونەی، شکەفتا دیزێ، شکەفتا مالا خەزالێ.

هەروەسان نەهالا گەلیێ رەزا، نەهالا قورێ، نەهالا نێچیرڤانا، گەلیێ ب کنێر، گەلیێ قەلایێ.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند کانی لێ هەنە، وەکی کانیا گوندی، کانیا سیفکێ، کانیکا شەرێ، کانی چەلکێ، کانیا کانی سوسنێ، گلە بێرێ، کانی مزویرکا، کانی بویکێ، کانیکا دختۆری، کانیا عەبێ زند، کانیا سلۆی، کانی ڤێرکێ، کانیا گەلی، کانی تویکێ، کانی بویکێ ل بانیێ، کانیا خەربەندێ.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنێ و پەزی و رەزی و کاروانان و مفا وەرگرتن ژ دار و بارێ سرۆشتی، نها ژی پتر ل سەر کاسبکاریێ و بازرگانیێ و مووچەیانە، هەروەسان هندەك کارێ چاندنێ ژی دکەن.

**خزمەتگوزاریێن گوندی:**

سالا ١٩٦٣- ١٩٦٤ێ بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن. کارەب ژی ل سالا ٢٠١٢ێ گەهشتییە ڤێ دەڤەرێ و بیرەکا ئاڤێ ل سالا ٢٠١٢ێ بۆ گوندی هاتە کۆلان لێ چ مفا ژێ نەهاتە دیتن[٦٠].

## گوندێ گەلیێ رمان:

گوندەکێ دەڤەرا ئەتریشە، ل سەر دەمێ میرگەها بەهدینان سەر ب ئامێدیێ ڤەبوو، شێخ ئەحمەدێ

گەلیێ رمانی، نەڤیێ شێخ شەمسەددین قوتب ل سالا ١١٥٠مش/١٧٣٧زێ دامەزراندییە و ژیانا زانستی ل سەر دەستێ رڤشتێ وی وەرار و پێشكەتن ل ڤی جهی بخۆڤە دیتییە، كو د زانست و وانە گۆتنان دا شەهرەزابوون[٦١]، گوند دكەڤیتە دووراتییا ١٠كم باشوورێ رۆژئاڤایێ ناڤەندا ئەتریش. ل سەر ناڤێ گوندی چەند بۆچوون هەنە:

**یا ئێكێ:** گوند ب هنارا (رمان) ب عەرەبی ناڤداره و ناڤ ژ رمانا عەرەبی ب واتایا هنار هاتییە.

**یا دووێ:** د كەڤندا شەر ل ڤی جهی ب ڕما هاتییە كرن و ناڤێ گوندی ژ ڕمێ هاتییە كو شەر پێ دكرن.

**یا سێێ:** د كەڤندا لەشكەرێ رۆمێ هاتییە ڤێ دەڤەرێ، لەوما ب گەلیێ رمان هاتییە ب ناڤكرن.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٠٦٥ دۆنەمن، ژ وانان ٣٩٠ دۆنەم دێمی، ٤٢ دۆنەم ئاڤی، ١٣٣٤ دۆنەم پاوان، ٢٣٤دۆنەم رەزێن دێم، ٦٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٨٥٠ پەز و بزن لێ هەنە[٦٢].

## سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن نۆردیناڤا و دزێ و بێدیل و پێدە.

**باشووری:** گوندێ بالەتە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بریفكا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن بازێركێ و چەمان.

## پێكهاتا گوندی:

بنیاتێ خەلكێ گوندی ل سالا ١٦٢٢ێ ژ ئەخلاتێ هاتینە و ل ڤی گوندی ئاكنجیبووینە. نها خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریان، ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن: بنەمالا شێخ تاهای "مالا ژووری"، بنەمالا شێخ عەنی "مالا ژێری"، بنەمالا یونس حەسەن پێكهاتییە.

گوندێ گەلیێ رمان



ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٦٥ کەس ل گوندی دژیان[١٣]. سالا ١٩٧٦ێ ل بەری گوند ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە بێتە خرابکرن و ژ لایێ دیوانا سەرۆکاتیێ (دیوان رئاسة) یا حکومەتا عیراقێ ڤە دەست ب سەردا بێتە گرتن و ل سەر عەرەبان بێتە دابەشکرن ١٨٠ کەس ل سەر گوندی دژیان، ژمارا خەلکێ گوندی نها دگەهنە ٧٠٧ کەسان و پتریا وان ل دهۆکێ دژین و کەس ل سەر گوندی نینە، ب تنێ ل هاڤینان ئەگەر ملکێ خۆ شین بکەن.

ئەڤ گوندە ل سەردەمێ شۆرشێن کوردستانێ چەند جاران هاتیە خرابکرن و ئاڤەدانکرن ڤە، ل سالا ١٩٦١ێ هاتیە خرابکرن و سالا ١٩٦٣ێ هاتیە ئاڤاکرن ڤە. سالا ١٩٧٦ێ گوند هاتیە بەردان و خەلکێ وی راگوهاستنە (جسر مەندان) تا سالا ١٩٨٣ێ ب شێوەیەکێ بانەهی هاتیە ئاڤاکرن و بەری دەسپێکرنا ئەنفالێن بادینان ل ١٩٨٨/٨/٢٥ێ گوند سەر ب دەڤەرێن رزگارکری بوو و هاتبووئاڤاکرن و حەفت خێزان لێ دژیان، د ڤێ رووداندا ب ئێکجاری گوند هاتیە وێرانکرن و خەلکی وی مشەختبوونە کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ[١٤] و پشتی هینگێ وەکی گوند نەهاتیە ئاڤاکرن ڤە.

### شوینوارێن گوندی:

چەند شوینوار و جهێن کەڤن ل گوندی هەنە، وەکی کوپێ کەلێ و حەفت ناوسك و مەرقەدێ سەید عەباس و مەرقەدێ شێخ ئەحمەد.

### جهێن دیار ل گوندی:

شکەفت هەنە، وەکی: شکەفتا حەلێ و شکەفتە رەشێ. هەروەسان چەند جهێن دی هەنە، وەکی چیایێ ئاماد "چیایێ داسنیا"، چیایێ کوناخێ، چیایێ کوپێ کەلێ، گرکێ هەیڤێ، حەسیا کاڤلا، حەسیا گوندی، صەفتیکێ.

هەروەسان نەهالا حەسیا گوندی، دەریکێ عەلی عەتمانا. نەهالا زەڤینێ، نەهالا حەسیا ئاڤکا، نەهالا کانی مەحمیدێ، نەهالا ناوسکا، نەهالا جۆنیکا، نەهالا زراڤکا، نەهالا تینکی، ئار مریشکێ، خرابێ سلتانکێ.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی برکا ژووری، برکا بیستانا، برکا شێخ مۆسای، برکا تا برکا، برکا محەمەد حەسەن، برکا گەرێ، برکا محەمەد حەجی ئەمین، برکا یونس حەسەن، کانی قۆقلێ، کانیا محەمەد تاهر، کانیا هەتمێ، کانیا گەلی، کانی بندارکێ، کانیا صفتیکێ، کانیا حەسیا کاڤلا، کانیا نێرگز کێتك، کانی ریلکێ، کانیا مەحمیدکێ، کانیا بەستی، گەرا گیزێ، گەرا گیزێ، گەرا زاڤا، ژیلی بەنداڤا گوندی کو ل سالا ٢٠١٠ێ هاتیە دروستکرن..

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنێ و پەزی و رەزی و بیستانان و کاروانان بوو، هەروەسان کومر چێدکرن و مفا ژ دار و بارێ سرۆشتی وەرگرتن، نها ژی پتر ل سەر کاسبکاریێ و بازرگانیێ و مووچەیانە، هەروەسان چەندەك ژێ کارێ چاندنێ ژی دکەن.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

ڤی گوندی چ جاران خواندنگەهـ لێ نەبوویە، بەلکی ب تنێ خواندنگەها ئایینی ل مزگەفتا گوندی هەبوویە.

کارەب ل سالا ٢٠٠١ێ گەهشتیە ڤی گوندی و سالا ٢٠٠٩ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتیە دروستکرن[١٥].

## گوندێ دەحلێنەوێ

دکەڤیتە دووراتیا ٥کم باکوورێ رۆژئاڤایێ ناڤەندا ئەتریش. ل سەر ناڤێ گوندی دبێژن ژ هەبوونا دەحل و دریا ل نێزیکی رووباری، واتە ل جهێ خارێ ئەو جهێ نەڤی، ب واتایا نزم هاتیە، واتە دەحلێ ل نەڤی

و بوویە دەحلێنەوێ. رووبەرێ عەردێ گوندی ٤١٨ دۆنەمن، ژ وانان ٤٥ دۆنەم دێمی، ٤٣ دۆنەم ئاڤی، ٤٢ دۆنەم کەڤرین، ٢١٠ دۆنەم پاوان، ٢٣ دۆنەم رەزێن دێم، ٥٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی[٦٦].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن نسرا و هەسنەکا.

**باشووری:** ناڤەندا ئەتریش.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن زێرێ و رەبەتکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن بێبۆزێ و کەلێنێ.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا تاهای، بنەمالا سلێمانێ محێ، بنەمالا حەمیدێ زەحفێ پێکهاتییە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٤٩ کەس ل گوندی دژیان[٦٧].

سالا ١٩٨٧ێ دەمێ گوند ژ لایێ رژێمێ ڤە هاتییە وێرانکرن ١٧٥ کەس ل سەر گوندی بوون و نها ژمارا خەلکێ گوندی دگەهنە نێزیکی ٥٠٠ کەسان، لێ کەس ل سەر گوندی ناژیت و پتریا خەلکێ وی نها ل دهۆک و شێخان دژین.

ئەڤ گوندە ژ ئەگەرێ رووداںێن شۆرشا کوردی ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە خرابکرن و ل هەمان سال هاتییە ئاڤاکرن ڤە، لێ پشتی هینگێ خەلکێ وی راگوهاستینە دەڤەرا بەردەرش و سالا ١٩٨٧ێ گوند ب ئێکجاری هاتییە وێرانکرن و پشتی هینگێ نەهاتییە ئاڤەدانکرن ڤە.

**شوینوارێن گوندی:**

چەند شوینوار و جهێن کەڤن ل ڤی گوندی هەنە، وەکی گرکێ ئاشا کو شوینوارێ سێ ئاشێن کەڤن لێ هەنە، هەروەسان سێ ناوسك ل رۆژهەلاتێ باکوورێ گوندی.

**جهێن دیار ل گوندی:**

گەلیێ قیامەتێ و سەیرانگەها بلکێفێ، کەزابا دەحلێنەوێ، دیسان شکەفت ژی هەنە، وەکی: شکەفتا میسێ و شکەفتا گرێ بەرانا.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی کانییا گوندی و کانی رویلك. هەروەسان رووبارێ دەحلێنەوێ و چەند جۆیەك، مینا جۆیا زەڤیا عیساکی و جۆیا چەمکان و جۆیا چەمی.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا رەزێن دێم و بیستانێن ئاڤی و خودانکرنا تەرش و کەوالی گارەشان بوو، هەروەسان مفا ژ دار و بارێ سرۆشتی ژی وەردگرتن و نها پتر ل سەر کاسبکارێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیارێ دکەن و مفای ژ دار و بارێ سرۆشتی ژی وەردگرن.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**

سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ خواندنگەها شۆرشێ لێ هاتییە ڤەکرن و سالا ١٩٧٨- ١٩٧٩ێ خواندنگەها میری لێ هاتییە ڤەکرن و ڤی گوندی برکەکا ئاڤێ ل سالا ٢٠١٣ێ بۆ هاتییە چێکرن و ل هەمان سال هێلا کارەبێ ژی گەهشتییە دەڤەرێ[٦٨].

## گوندێ مێرگەبێ

گوندەکێ دەڤەرا ئەتریشە، دکەڤیتە دووراتییا ٢٠کم رۆژهەلاتێ ناڤەندا ئەتریش. ل سەر ناڤێ گوندی دبێژن ل بەرێ میرەك ل ڤی گوندی هەبوو و ئەڤ جهە میرگەهـ بوو، واتە جهێ میرا بوو و ناڤ ژ میرگەهـ بوویە مێرگەبێ. رووبەرێ گشتی یێ عەردێ گوندی ١٨٧٠ دۆنەمن، ژ وانان ٥٨٠ دۆنەم دێمی، ٣١ دۆنەم ئاڤی، ١٠٦٢ دۆنەم کەڤرین، ١٨٧ دۆنەم پاوان، ٦ دۆنەم رەزێن دێم، ٤ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٢٤٠٠ پەز و بزن لێ هەنە[٦٩].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێن خورت و سەرکاف.

**باشووری،** گوندێ میتکێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن خورت و ستنکینێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن سەرکاف و بێبۆزێ.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا شەرەفانی نە، پێکهاتییە ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا رەشید مێرگەبی، بنەمالا سەعید ئەسمەرا، بنەمالا سەعدون. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٥٤ کەس ل گوندی دژیان(٧٠). سالا ١٩٨٧ێ دەمێ گوند هاتییە بەردان ١٢ سەرۆك خێزان ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٤٢ کەس، نها هژمارا وان دگەهنە ٣٥ سەرۆك خێزانان کو دبنە نێزیکی ١٥٠ کەسان و دبەلاڤن ل جهێن جودا، لێ کەسەك ل سەر گوندی ناژیت و تنێ بۆ گەریان و سەیرانا دهێنە گوندی.

ئەڤ گوندە ژ ئەگەرێ روودانێن شۆرشا کوردستانێ ل سالێن ١٩٦٢، ١٩٦٦ێ هاتییە کاڤل و وێرانکرن، لێ ل هەردو جاران پشتی سالەکێ هاتە ئاڤاکرن ڤە، تا داوی جار ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە خرابکرن و ل سالا ١٩٩١ێ هاتە ئاڤاکرن ڤە و سالا ١٩٩٨ێ ژ ئەگەرێ کاودانێن ناڤخۆ جارەکادی گوند هاتە چۆلکرن ڤە.

## شوینوارێن گوندی:

چەند شوینوار و جهێن کەڤن ل ڤی گوندی هەنە، وەکی ناوسکەك و بەرێن دنگێن ئاشی.

## جهێن دیار ل گوندی:

گرێ ئەڤرانیێ، دارا بالیکێ، شکەفتا کانییا جنێ، شیڤا بەرسۆری

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی کانییا مەلای، کانی سپیکێ، کانییا ژنکا، کانییا ئێك مالێ، کانییا چننێ، سکرێ گوندی، جۆیا مەمێ، جۆیا ملێ راستێ، جۆیا بیستانێن بەرێڤە پشت گوندی.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا رەزێن دێم و بیستانێن ئاڤی و خودانکرنا تەرش و کەوالی گارەشا و مریشکان بوو، هەروەسان مفا ژ دار و بارێ سرۆشتی ژێ وەردگرتن و نها پتر ل سەر مووچەیانە و کێمەك ژێ کاسبکارن(٧١).

# گوندێ نسرا

دکەڤیتە دووراتییا ١٥کم باکوورێ سەنتەرێ ئەتریش. ل سەر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە: یا ئێکێ دبێژن شەرەکێ مەزن ل گوندی پەیدابوویە و دوژمن هاتییە سەر گوندی، د ئەنجام دا هەوار بۆ خەلکێ گوندی هاتییە و خەلکێ وی ب سەرکەتینە و نەصر ب واتایا سەرکەتن ل گەلێ قیامەتێ ب دەستڤە هینانە و ناڤێ گوندی ژ پەیڤا نەصر ب واتایا سەرکەتن هاتییە و نەصر بوویە نسرا.

یا دووێ دبێژیت دکەڤندا مەسیحی ل گوندی هەبووینە و ناڤێ گوندی ژ ناڤێ کچا مەزنێ وان نسرە هاتییە و وی گوند گوند ب ناڤێ کچا خۆ ب ناف کرییە.

ڤی گوندی خواندنگەهەك لێ هەبوو، زانا مەلا حەسن بەلووتی (بەلویتی) وانە لێ دگۆتن، ژ خویندکارێن ل بەر دەستێ وی رابووین شێخ عەلی کورێ شێخ محەمەد سلێڤانەیی ١٣٢٤- ١٤١٤مش/ ١٩٠٤- ١٩٩٤زێ(٧٢).

رووبەرێ عەردێ گوندی ٧٠٠٣ دۆنەمن، ژ وانان ٦٠ دۆنەم ئاڤی، ٦١٠٧ دۆنەم کەڤرین، ٨٠١ دۆنەم رەزێن دێم، ٣٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی(٧٣).

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ سویارێ.

**باشووری،** ناڤەندا ئەتریش و گوندێ دەحلێنەوێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ رەتکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن هەسنەکا و بێبۆزێ.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ پێنج بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا مستەفای، بنەمالا تاجدین، بنەمالا دوودێ، بنەمالا مامە شێخا، بنەمالا شێخان پێکهاتییە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ۱۹۵۷ێ ۳۷۱ کەس ل گوندی دژیان[٧٤]. سالا ۱۹۹۸ێ دەمێ گوند ژ ئەگەرێ کاودانێ ناڤخۆ هاتییە چۆلکرن ۷۵۰ کەس ل سەر گوندی بوون و نها ژمارا خەلکێ گوندی دگەهیتە ۳۰۰۰ کەسان، لێ کەس ل سەر گوندی ناژیت.

ئەڤ گوندە ل سالا ۱۹۸۸ێ ل ئەنفالان هاتییە وێرانکرن و سالا ۱۹۹۱ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە. سالا ۱۹۹۸ێ ژ ئەگەرێ شەرێ ناڤخۆ گوند هاتییە چۆلکرن و هەتا نها نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە.

**شوینوارێن گوندی:**

چەند شوینوار و جهێن کەڤن ل ڤی گوندی هەنە، وەکی شوینوارێ شەش ناوسکان و مەرقەدێ پیر ئەحمەد کو ب پیرە هەمەد یێ ناڤدارە.

**جهێن دیار ل گوندی:**

گەلیێ قیامەتێ، کێرێ نسرا، بانیا نسرا، زۆمێن گوندی، بابباکێ، نەهالا کویرێ، شکەفتا ئاسێ، شکەفتا خوێ، شکەفتا شکەفتا نزاری، شکەفتا بیبك، شکەفتا کونە بەرێ، نەهالا هشکژی، نەهالا بابباکێ، نەهالا چالیێ، نەهالا کورتەکێ، نەهالا گەلی گەرسکی، گەلیێ کەمەکا.

**زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند زێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی سەرێ کانیێ، کانی درێنێ، بیستانی، کانییا نینی، سرکێ، کانییا ئاڤیا، کانیکا کیزی، کانی کورسیکێ، بۆتان، کانییا دەحلی، کانی سرکا، کانیکا عەبدولای،

گوندێ نسرا



كانییا چالیێ، كانی خەزالكێ، كانییا شكەفتاڤێ، بركا ئاڤۆكا، كانییا شێخ غەنی، بركا چیچپۆكێ.

**زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر رەزی و پەزی و بیستانان بوو، ب تایبەت چاندنا تویتنێ، زێدەباری مفا وەرگرتن ژ دار و بارێ سرۆشتی، وەكی گوهیشك و كەزان و كەنگر... هتد. نها پتر ل سەر كاسبكاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیاریێ دكەن، ب تایبەت رەز و بیستانان.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**

سالا ١٩٥٩ێ بۆ یەكەم جار خواندنگەها میری لێ هاتییە ڤەكرن و سالا ١٩٩٣ێ ئاڤاهییەك بۆ خواندنگەهێ و ئێك بۆ بنگەهێ تەندروستی هاتینە چێكرن، هەروەسان چەند خزمەتگوزارییێن دی ژی بۆ گوندی هاتبوونە دروستكرن، وەكی پرۆژەیێن ئاڤێ و كارەبێ[٧٥].

## گوندێ ملكیشان

دكەڤیتە دووراتییا ١٣كم رۆژهەلاتێ ئەتریش. ل سەر ناڤێ گوندی دبێژن د كەڤندا مەسیحی ل ڤی گوندی ژیاینە و مەلكەك ب ناڤێ ئیشو لێ هەبوویە و ناڤ ژ مەلك ئیشو بوویە مەلكیشان. رووبەرێ گشتی یێ عەردێ گوندی ١٨٤٣ دۆنەمن، ژ وانان ٩٤٤ دۆنەم دێمی، ٦٣ دۆنەم ئاڤی، ٨١٢ دۆنەم كەڤرین، ١٠ دۆنەم رەزێن دێم، ١٤ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٢١٠٠ پەز و بزن ژی ١٨٥ لێ هەنە[٧٦].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ مێرسیدا دو.

**باشووری:** گوندێن مرێبا و خرابە.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن میتكێ و باسكەدێرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ توسب.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا شەرەفانییانە، ژ چوار بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا تەمەر، بنەمالا عیسای، بنەمالا میرزای، بنەمالا بارانی پێكهاتییە. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ١٣٠ كەس ل گوندی دژیان[٧٧]. سالا ١٩٧٤ێ دەمێ گوند ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن ٣٥ مال ل سەر گوندی دژیان كو دبوونە ١٧٥ كەس، نها ژی ٦٣ مال ل سەر گوندی دژین كو دبنە ٤٤٣ كەس و سەرجەمێ خەلكێ گوندی دگەهنە ١٥٠ مالان كو ژبلی گوندی ل جهێن جودا یێن قەسرۆك و مرێبا و دهۆكێ دژین.

گوند ل سالێن ١٩٦٢، ١٩٦٧، ١٩٧٤ێ هاتییە كاڤل و وێرانكرن و پشتی هەر خرابكرنەكێ جارەكادی ل سالێن ١٩٦٥، ١٩٧٠، ١٩٩١ێ جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

**شوینوارێن گوندی:**

چەند شوینوار و جهێن كەڤن ل ڤی گوندی هەنە، وەكی شوینوارێ دێرەكا كەڤن ل چیای و ل دووڤ گۆتنان دیرۆكا وی بۆ بەری ٧٠٠ سالان دزڤریت و كەلا مەلك ئیشوی كو ل دووڤ گۆتنان دیرۆكا وێ بۆ بەری ١٠٠٠ سالان دزڤریت، ژبلی دو ناوسكان ل باشوورێ گوندی ب دووراتییا ٢كم.

**جهێن دیار ل گوندی:**

كەلیێ پیرهەڤیێ كو دبیتە سێكۆشا سێ گوندان و جهەكێ گوزارییە، شكەفتا كەلیێ پیرهەڤیێ، شكەفتا كەلیێ دێرێ، كەلی بەرازێ.

**زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند كانی و جۆیێن ئاڤێ لێ هەنە، وەكی كانییا رەزی، كانییا گوندێ ژووری، كانییا سارکێ، كانیكا دەحلی، كانییا كاڤلا، كەلی بەرازێ، جۆیا كانییا رەزی، جۆیا كانییا چەمێ ژووری، جۆیا كانی ساركێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر پەزی و گارەشا و مریشكا و بیستانان بوو، ب تایبەت چاندنا برنجی و گەنم جەهـ و نیسك و نۆك و باقلك و باجانسۆرك و خیار و دار و بارێ فێقی و ...هتد، زێدەباری مفا وەرگرتن ژ دار و بارێ سرۆشتی، نها پتر ل سەر كاسبكارێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیارێ دكەن و پەزی و مریشك و گارەشان ب خودان دكەن.

ڤی گوندی نها چەند بیرێن نەفتێ ل باشوورێ گوندی هەنە[٧٨].

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

سالا ١٩٩٧ێ بۆ یەكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن و ئاڤاهیێ وێ هاتییە دروستكرن، هەر ل ڤێ سالێ بیرەكا ئاڤێ و پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتینە دروستكرن. سالا ١٩٩٨ێ دو جۆكێن ئاڤێ بۆ ئاڤدێریێ ل كێفسن و ختارێ بۆ هاتینە چێكرن. هەروەسان كارەب ژی ل سالا ٢٠١٠ێ گەهشتییە گوندی و ل سالا ٢٠٠٤ێ هۆلەكا بیرەوەریان بۆ گوندی هاتییە ئاڤاكرن، ژبلی ئاڤاكرنا مزگەفتەكێ ل سالا ١٩٩٣ێ.

## گوندێ سەركاف

دكەڤیتە دووراتییا ٢٠كم رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ئەتریش. گوند یێ ل سەر بانێ كەهەف ب واتایا شكەفتێ، و سەر كەهەف بوویە سەر كاف ب رامانا سەر شكەفتێ. رووبەرێ گشتی یێ عەردێ گوندی ٢٢٧٦ دۆنەمن، ژ وانان ١٠٣ دۆنەم دێمی، ١٧٧ دۆنەم ئاڤی، ٢٠ دۆنەم كەڤرین، ١٩٤٦ دۆنەم پاوان، ١٠ دۆنەم رەزێن دێم، ٢٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٣٠٠ پەز و بزن لێ هەنە[٧٩].

گوندێ ملكیشان



**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێن مسەلەکا و بەرکەڤرێ.

**باشووری،** گوندێ میتکێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن خورت و مێرگەبێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن مێرسیدا و باسکەدێرێ.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا شەرەفانییانە، پێکهاتییە ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا حەجە عەلی، بنەمالا محەمەدێ عەلوی، بنەمالا حەسەن.

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ٨٥ کەس ل گوندی دژیان[٨٠] و سالا ١٩٩٧ێ دەمێ گوند ژبەر کاودانێ شەرێ ناڤخۆ هاتییە بەردان ٤٠ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٢٠٠ کەس، نها ب تنێ ئێك مال لێ هەیە کو دبنە ١٢ کەس. سەرجەمێ خەلکێ گوندی ژی دبنە ١٣٠ مال.

ئەڤ گوندە سالا ١٩٦١ێ هاتییە خرابکرن و سالا ١٩٦٤ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە، سالا ١٩٧٥ێ هاتییە خرابکرن ڤە و خەلکێ وی راگوهاستنە دەڤەرا بەردەرەش، سالا ١٩٨٤ێ گوند هاتییە ئاڤاکرن ڤە، تا سالا ١٩٨٨ێ کەتییە بەر هەوا ئەنفالان و پشتی سەرهلدانێ سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاکرن تا سالا ١٩٩٧ێ کاودانێ ناڤخۆ تێکچوو و گوند هاتە بەردان و سالا ١٩٩٩ێ جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

**جهێن دیار ل گوندی:**

کەلە کەڤنێ، گرێ عمرانیێ، شکەفتا کەلێ کەڤنێ، شکەفتا بەراێ، شکەفتا کافێ، گەلیێ قادی، گەلیێ تەنگ، گەلیێ شکەفتا رێزانا، گەلیێ پان.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند کانی لێ هەنە وەکی کانییا گوندی، کانییا جۆکا ئاشی، کانییا جۆکا حاڤد، کانییا مەروی، کانییا جۆکا سۆرك، جۆیا گوندی، جۆیا حاڤد، جۆیا ئاشی.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر پەزی و گارەشا و چاندنێ بوو، ب تایبەت چاندنا برنجی و گەنمی و نۆك و باقلك و باهیڤ و ماشا و کونجیا و چێکرنا بیستانان، هەروەسان مفا ژ دار و بارێ سرۆشتی وەردگرتن، نها ژی ژیانا وان پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە، زێدەباری چاندنێ و ب تایبەت دار و بارێ فێقی، مینا تری و خۆخ و هژیران.

**خزمەتگوزاریێن گوندی:**

ڤی گوندی چەند خزمەتگوزاری بۆ هاتینە دروستکرن، وەکی کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازی و چێکرنا و پرۆژەیێ ئاڤێ و گەهاندنا کارەبێ ل سالا ٢٠١٠ێ و گەهاندنا جادێ ل سالا ٢٠٠٩ێ و ئاڤاکرنا مزگەفتێ ل سالا ١٩٩٧ێ و چێکرنا دو جۆکێن ئاڤێ یێن هەڤپشك دگەل گوندێن سەرکاف و مێرسیدا ل سالا ٢٠١٢ێ[٨١].

## گوندێ بیگەهـ

دکەڤیتە دووراتییا ٥کم باشوورێ رۆژئاڤا ئەتریش. گوندەکێ کەڤنارە ل باشوورێ رۆژئاڤایێ باژێرێ دهۆکێ، دناڤبەرا دهۆك- شێخان، ئاماژە ب ناڤێ گوندی د وەقفا سولتان حسێن وەلی دا هاتییەکرن کو دەهـ قرۆش و پێنج بەغدادی وەکی وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل سەر هاتییە سەپاندن[٨٢]. ل سەر ناڤێ گوندی دبێژن یا ژ بێ گەهـ چونکی ئاخا وی بۆ چاندنێ یا باش نینە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٣٠٧٦ دۆنەمن، ژ وانان ٧٩٤ دۆنەم دێمی، ١٤٦ دۆنەم ئاڤی، ٣٠٥ دۆنەم کەڤرین ١٨٠١ دۆنەم پاوان، ٣٠ دۆنەم رەزێن دێم. هەروەسان ٢٢٥٠ پەز و بزن لێ هەنە[٨٣].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ ئاساس.

**باشووری،** گوندێن بریفکا و بەربوور ژووری و ژێری.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ تلدیڤ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بەرەتوین.

## پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری یە، ژ چوار بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا جەرگیس ئاغای، بنەمالا مستەفای هەردو برانە و ناسیارن ب بنەمالا حەسەنێ حەلیمایێ، بنەمالا سەیدای، بنەمالا شێخا پێكهاتییە.

سالا ١٩٧٥ێ دەمێ خەلكێ گوند هاتینە راگوهاستن ٢٠ مال ل سەر گوندی بوون كو دبوونە ١١٠ كەس، نها ١٤ مال یێن ل سەر گوندی، كو دبنە ٨١ كەس و ئەو ژی نە خەلكێ رەسەنێ گوندی نە، بەلكی سۆرچینە و پەزی ل وێرێ ب خودان دكەن.

ئەڤ گوندە چەند جاران ژ ئەگەرێ شۆرشا ئەیلوولێ ل سالێن ١٩٦٢، ١٩٦٤، ١٩٧٥ێ هاتییە كاڤل و وێرانكرن و پشتی هەر خرابكرنەكێ جارەكادی ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٦، ١٩٧٦ێ جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن ڤە و داوی جار سالا ١٩٨٨ێ كەتییە بەر هەوا ئەنفالان، پشتی سەرهلدانێ ل سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

## جهێن دیار ل گوندی:

بێكەهـ زۆمە، گەلیێ هناركێ، گرێ قاسم ئاغای،

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند كانی و جۆیێن ئاڤێ لێ هەنە، وەكی كانیكا بێكەهـ، كانیا گوندی، كانیا گەلی هناركێ، جۆیا گوندی، جۆیا چەمێ تویشەمبیێ، جۆیا چەمێ شیڤا خیارا، رووبارێ ئەتریش، ژێلی بیرەكا ئیرتیوازی كو سالا ٢٠٠٦ێ بۆ هاتییە كۆلان.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەت چاندنا گەنمی و برنجی و جەهی و نیسك و نۆك و دەرامەتێ ئاڤی وەكی باجانسۆرك و خیار و دار و بارێ فێقی و سپیندار و ...هتد، زێدەباری خودانكرنا پەزی و مفا وەرگرتن ژ دار و بارێ سرۆشتی،

گوندێ بیكەهـ



ب تایبەت کەزان و گوهیشك و مازیان. ژیانا خەلکێ گوندی ل نها ژی پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی کارێ چاندنێ دکەن.

### خزمەتگوزاریێن گوندی:

سالا ١٩٧٢ێ بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و سالا ٢٠٠٥ێ ئاڤاهییەك بۆ هاتییە دروستکرن، هەر ل ڤێ سالێ کارەب ژی گەهشتییە گوندی و سالا ١٩٩٣ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن[٨٤].

## گوندێ شکەفتندیا

گوندەکێ دەڤەرا ئەتریشە، دکەڤیتە دووراتییا ٨کم باشووری ناڤەندا ئەتریش. ناڤێ گوندی د پەرتووکا (مختصر جغرافیة العراق) دا ب هندوان هاتییە کو گۆتییە هندەك دبێژنێ شکفت هندوان و مەبەست ژێ شەفتندیایە، دکەڤیتە دووراتییا دەهـ خۆلەکان ژ مەرقەدێ شێخادی[٨٥]. ل سەر ناڤێ گوندی دبێژن ژ وێ چەندێ هاتییە کو گەلەك شکەفت لێ هەنە، ب واتایا هندی شکەفت لێ هەنە و هندی شکەفت بوویە شکەفتهندیا. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٦٢٣ دۆنەمن، ژ وانان ١٨٠ دۆنەم دێمی، ٢٠ دۆنەم ئاڤی، ٢٢٦٣ دۆنەم پاوان، ١٤٥ دۆنەم رەزێن دێم، ١٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٢٥٠ پەز و بزن لێ هەنە[٨٦].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن تلدیڤ و ئەتریش .

**باشووری:** گوندێ بن گەلی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مغارا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن شێخادی شێخادی و بەربویر.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، پێکهاتییە ژ شەش بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا حەجی ئیسف، بنەمالا عەسلان، بنەمالا فەتحی، بنەمالا ئەحمۆی.

گوندێ شکەفتندیا



بنەمالا مەلا خالد، بنەمالا محێ.

سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن ٤١ مال ل سەر گوندی دژیان كو دبوونە ٢١٠ كەس، نها ژی ٣٩ مال ل سەر گوندی دژین كو دبنە ٢٠٦ كەس.

ئەڤ گوندە چەند جاران ژ ئەگەرێ روودانێن شۆرشا ئەیلوولێ ل سالێن ١٩٦٢، ١٩٦٦، ١٩٧٥ێ هاتییە كاڤل و وێرانكرن و پشتی هینگێ ب چەند سالان ل سالێن ١٩٦٦، ١٩٧٠، ١٩٩١ێ جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن ڤە و هەتا نها یێ ئاڤەدانە.

### شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن ڤی گوندی شكەفتا عەمەرۆشكێ كو راست دچیتە خوار و د ناڤدا ئاڤ هەیە و وەكی سویك و دوكانا قەیسەرینە، كێم كەس دشێن بچنە خوارێ و چ كەسێن پەیوەندیدار نەهاتینە و نەگەهشتینێ كو وەكی جهەكێ شوینواری بدەنە نیاسین، هەروەسان ناوسكا تەختا لێ هەیە.

### جهێن دیار ل گوندی:

گەلی ڤێركێ، گەلیێ لالش، گەلیێ شكەفتا ب ئاڤ، نەهالا كویشكە سۆرێ، ژبلی چەندین شكەفتان، وەكی شكەفتا كۆترێ، شكەفتا عەمەرۆشكێ، شكەفتە رەشێ، شكەفتە سۆرێ، شكەفتا كۆفیكێ، شكەفتا فەتحی، شكەفتا سێدەرێ، شكەفتە گەلیێ، شكەفتا مام شابا.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند كانی و بركێن ئاڤێ لێ هەنە، وەكی كانیا گوندی، كانیا بركا ناڤ گوندی، كانیا كەپەرێ، كانیكا صافێ، كانیكا قەسرێ، بركا شێلێ، بركا شەلال، جۆیا ملێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر پەزی و رەزان و بیستانان بوو، هەروەسان مفا ژ دار و بارێ سرۆشتی ژی وەردگرتن. نها ژی ژیانا وان پتر ل سەر كاسبكارێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیارێ دكەن و گەنم و جەهـ و نۆك و گوندۆر و ترۆزیان دچینن و بیستانان دكەن، زێدەباری مفا ژ دار و بارێ سرۆشتی ژی وەردگرن.

ڤی گوندی نەفت لێ هەیە و هەتا نها چەند جهـ بۆ وێ چەندێ هاتینە دەستنیشانكرن و ژ لایێ كومپانییا گولف كیستون كار ل سەر دهێتەكرن.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

سالا ١٩٥٧- ١٩٥٨ێ بۆ یەكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن و ل سالا ٢٠١٢ێ ئاڤاهییەك بۆ هاتییە دروستكرن. هەروەسان چەند خزمەتگوزارییێن دی ل ڤی گوندی هاتینە دروستكرن، وەكی گەهاندنا كارەبێ ل سالا ١٩٩٣ێ، كۆلانا بیرەكا ئیرتیوازی و دروستكرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ١٩٩٤ێ، ئاڤاكرنا مزگەفتەكێ ل سالا ٢٠٠٨ێ[٨٧].

## گوندێ مكێرس:

دكەڤیتە دووراتییا ٣كم باشوورێ سەنتەرێ ئەتریش. ل سەر ئاڤێ گوندی دبێژن گوند دكەڤندا مەلبەندەكێ ئاشوورییان بوو دگوتێ مركز و پەیڤ هاتییە سڤككرن و بوویە مكێرس. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٦٩٨ دۆنەمن، ژ وانان ٩١٣ دۆنەم دێمی، ١٤٧ دۆنەم ئاڤی، ١٦١٣ دۆنەم كەڤرین، ٢٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٨٢٠ پەز و بزن لێ هەنە[٨٨].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** ناڤەند ئەتریش.

**باشووری،** گوندێ شكەفتندیا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ شەهیا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ تلدیڤ.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، پێكهاتییە ژ هەردو بنەمالێن بنەمالا عەبدولغەنی و بنەمالا

حەجی ئیسف پێکهاتیبە.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٤٨ کەس ل گوندی دژیان[٨٩]. سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتیبە خرابکرن ١٥ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٧٥ کەس و نها تنێ سێ مال ل سەر گوندی نە کو ژمارا وان دبنە ١١ کەس.

ئەڤ گوندە سالا ١٩٦٣ێ ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتیبە خرابکرن و سالا ١٩٧٠ێ جارەکادی هاتیە ئاڤاکرن ڤە. سالا ١٩٧٥ێ خەلکێ گوندی راگوهاستنە دەڤەرا بەردەرەش و عەرەب هینانە سەر گوندی تا سالا ١٩٧٦ێ کو گوند ب ئێکجاری هاتیبە کاڤل و وێرانکرن و سالا ١٩٩٢ێ هاتیبە ئاڤاکرن ڤە.

### شوینوارێن گوندی:

چەند شوینوار و جهێن کەڤن ل ڤی گوندی هەنە، وەکی شوینوارێ دێرەکێ کو کێشەیا بەرێن دیواری وێ ١٠٠٠کگم و مێژوویا وێ بۆ بەری سەدەها سالانە ڤەدگەریت، هەروەسان دو ناوسك ب دووراتیا ٢کم ل باشوورێ گوندی هەنە.

### جهێن دیار ل گوندی:

گرێ زێرەڤانا، گرێ میس خۆرا، پەرستگەها زەمبیلفرۆش، شکەفتا گەلی، نەهالا کورەجانکێ، نەهالا خرابەی.

### زێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی کانیا گوندی، کانیا گەرماڤێ، کانیکا بەرەجۆنیا، جۆیا چەمێ سێلێ، جۆیا چەمێ گوندی، جۆیا گەلی، رووبارێ ئەتریش.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر جۆتیاریێ و دەرامەتێ سرۆشتی بوو، گوندەکێ ب خێر و بێرە بۆ چاندنێ و ب تایبەتی چاندنا باجانسۆرك و برنجی. نها ژی ژیانا خەلکێ گوندی پتر ل سەر مووچەیانە و هندەك ژی هەر جۆتیاریێ دکەن.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

سالا ١٩٩٤ێ بۆ یەکەم جار خواندنگەها میری لێ هاتیبە ڤەکرن و سالا ١٩٩٩ێ ئاڤاهییەك بۆ خواندنگەهێ هاتیبە دروستکرن، هەروەسان چەند خزمەتگوزارێن دی ژی بۆ گوندی هاتبوونە دابینکرن، وەکی کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازی و چێکرنا پرۆژەیێ ئاڤێ و چێکرنا دو جۆیێن ئاڤێ ب درێژاهیا ٥کم ل سالا ٢٠٠٨ێ، ئاڤاکرنا مزگەفتێ ل سالا ١٩٩٨ێ و گەهاندنا کارەبێ ل سالا ٢٠٠٦ێ[٩٠].

## گوندێ کەلێنیێ

دکەڤیتە دووراتیا ٨کم باکوورێ رۆژئاڤایا سەنتەرێ ئەتریش، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتیبە کو کەلایەکا کەڤن هەیە دبێژنێ کەلا کەڤن و پشتی گوند ل جهێ نوی هاتیبە ئاڤاکرن هاتە ب ناڤکرن ب ناڤێ کەلا نوی و ناڤ بۆ کەلێنیێ. گوندەکێ بەرنیاس بوو ب بزاڤێن رەوشەنبیری، شوینوارێن وان بزاڤان ب کێماسی ل سەدساڵیا هەشتێ مشەختی دیاربووینە و د سەدسالێن دووڤدا بەردەوامی پێ هاتیبە دان و چەندین دەستنڤیس ل ڤی جهی هاتینە نڤیسین[٩١].

رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٢٤٦ دۆنەمن، ژ وانان ٨٤ دۆنەم دێمی، ٥٨ دۆنەم ئاڤی، ٤٢١ دۆنەم کەڤری، ١٦١٩ دۆنەم پاوان، ١٥ دۆنەم رەزێن دێم، ٤٩ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٤٣٠ پەز و بزن لێ هەنە[٩٢].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن دەحلێنەوێ و بێبۆزیێ.

**باشووری:** گوندێن ئاساس و کەریماڤا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن دەحلێنەوێ و ئەتریش.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ هەسنەکا.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، پێكهاتییە ژ بنەمالەكێ ب ناڤێ بنەمالا سێنالی.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٩١ كەس ل گوندی دژیان[٩٣]. سالا ١٩٩٧ێ دەمێ گوند ژ ئەگەرێ كاودانێ ناڤخۆ هاتییە چۆلكرن ١٢ مال لێ هەبوون كو دبوونە ٦٠ كەس، نها ٣٤ خێزان ل سەر گوندی نە كو دبنە ١٩٤ كەس، نها ژمارا خەلكێ گوندی دگەهیتە ١٠٠ سەرۆك خێزانان، ٣٤ ژ وان ل سەر گوندی دژین و یێن دی ل جهێن جودا دژین، ب تایبت دهۆكێ.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٧٤ێ ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن و سۆتن و سالا ١٩٧٧ێ هاتییەڤە ئاڤاكرن. سالا ١٩٨٧ێ هاتییە بەردان و سالا ل دووڤدا كەتییە بەر هەوا ئەنفالان و ب ئێكجاری هاتییە وێرانكرن، سالا ١٩٩١ێ جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن و ژبەر كاودانێ ناڤخۆ جارەكادی ل سالا ١٩٩٧ێ هاتییە بەردان، داوی جار سالا ٢٠٠٢ێ هاتییە ئاڤاكرن و نها ژیان تێدا یا بەردەوامە.

**شوینوارێن گوندی:**

چەند شوینوار ل ڤی گوندی هەنە، وەكی شوینوارێ كەلایەكا كەڤن ب دووراتیا ٣كم رۆژئاڤایا گوندی و ناوسكەك هەر ل رۆژئاڤایا گوندی ل نێزیكی كەلا كەڤن.

**جهێن دیار ل گوندی:**

شكەفتا مەندێ كو دو نهۆمە، زۆما بلۆكەی.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ هەنە، وەك كانییا عەبوی، كانییا گەلیێ گوندی، كانییا گركێ بهاری، كانییا بەقەدروسكێ، كانییا ئاتۆركێ، كانی ڤێركێ، كانی سركێ، كانییا گەلیێ هنارێ، كانییا بلۆكەی،

گوندێ كەلینیێ



کانییا شکەفتا مەندێ، جۆیا خەرزا، جۆیا کەلێنیێ، جۆیا بەر گوندی، رووبارێ کەلێنیێ.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر رەزی و پەزی و چاندنا تویتنێ و برنجی و گەنمی و نیسك و نۆك و باقلك و سماق و باهیڤ و چێکرنا بیستانان بوو. زێدەباری مفا وەرگرتن ژ دار و بارێ سرۆشتی، وەکی گوهیشك و کەزان و مازیا... هتد. نها پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە. هندەك ژی جۆتیاریێ دکەن، وەکی چێکرنا بیستانان و چاندنا سپیندااران و دار و بارێ فێقی و مفا وەرگرتن ژ سرۆشتی و دار و بارێ وی.

**خزمەتگوزاریێن گوندی:**

سالا ۲۰۰۲ێ بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و ل هەمان سال ئاڤاهیێ خواندنگەهێ و ٤١ خانی ژی بۆ گوندی هاتینە دروستکرن، هەروەسان چەندین خزمەتگوزاریێن دی ژی بۆ گوندی هاتینە دروستکرن، وەکی دروستکرنا برکەکا کشتوکالی و چێکرنا دو جۆکێن ئاڤێ ل سالا ۲۰۰۱ێ و چێکرنا پرۆژەیێ ئاڤێ و مزگەفتەکێ ل سالا ۲۰۰۲ێ و گەهاندنا کارەبێ ل سالا ۲۰۰۸ێ و گەهاندنا رێکەکا تێکەلە ل سالا ۲۰۰۳ێ.

## گوندێ بێبۆزیێ

ئێکە ژ گوندێن مەسیحیێن کلدانی ل ناحیا ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ کەسەکی ب ناڤێ بوزو کو مالا وی ل وێرێ بوویە هاتییە، واتە بیت بوزو و ئەو ناڤ بوویە بێبوزیێ. رووبەرێ عەردێ گوندی ۱٦۹۱ دۆنەمن، ژ وانان ۱۸۳ دۆنەم دێمی، ٦۳ دۆنەم ئاڤی، ۱۳۷۰ دۆنەم کەڤرین، ۲۸ دۆنەم رەزێن دێم، ٤٧ دۆنەم رەزێن ئاڤی[٩٤]. ناڤێ گوندی د المعجم التاریخی لامارة بهدینان دا هاتییە و وەسان سالۆخەت دایە کو گوندەکێ کەڤنارە ل رۆژهەلاتی دهۆکێ، نێزیکی هەردو گوندێن رکاڤا و بادیناڤا، ل دەڤەرا "مرج" ل دووڤ سیستەمێ دەرەبەگایەتی یێ ئوسمانی ب "تیمار" هاتییە هژمارتن، سالا ۹٦٥مش/ ۱٥٥۸زی خودانێ وی محەمەد حلی کورێ فەخرەددین ئەلزەعیم هندە عەردێ خۆ فرۆتییە عیسا کورێ مرخایل، و هەمی وی عەردێ رووباری ڤەدگریت یێ ژ وی جهێ ئاڤ بۆ ئاشی دهێت هەتا دگەهیتە ئاشی، ڤی گوندی دەهـ ڤرۆش وەکی وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل سەر هاتبوو سەپاندن. سالا ۹٥٥مش/۱٥٤۸زێ قەشە کیورکیسی " برایێ ئەبی ئەلئەنساری "، واتە برایێ بەترپارکی ئاشەك و جۆکەك و دو پارچەیێن عەردی ژ میرێ مەزن سولتان حسێن کورێ حەسەن بەگی کری بوون. ل سەدسالییا هەژدێ کاتولکیبەت دناڤ مەسیحیێن وان دا بەلاڤببوو کو ل دەستپێکا سەدسالییا دووڤدا بووینە ۱۲۰ کەس و وان کەنیسەیەك و هەبوو، لێ چ قەشە نەبوون[٩٥].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ هەسنەکا.

**باشووری:** گوندێن ئەتریش و کەلێنیێ.

**رۆژهەلاتی:** هەردو گوندێن نسرا و دەحلێنەوێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن هەسنەکا و کەلێنیێ.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە ژ ئایینزایا کاتۆلیکی، پێکهاتییە ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا دونو، بنەمالا حەنو، بنەمالا سلیڤو.

ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ۱۹٥٧ێ ۱۱۹ کەس ل گوندی دژیان[٩٦]. سالا ۱۹۸۸ێ دەمێ گوند کەتییە بەر هەوا ئەنفالان پێنج مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ۲۳ کەس و نها هەشت مال ل سەر گوندی نە کو دبنە ۲۰ کەس.

ئەڤ گوندە ل سالا ۱۹٦٦ێ ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە سۆتن و سالا ۱۹٦۸ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە. سالا ۱۹۸٧ێ بەری هەوا ئەنفالان گوند هاتە سۆتن ڤە و پشتی دەهـ سالان، واتە ل سالا ۱۹۹٧ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە ۱۲ خانی و دێرەك ل سالا

٢٠٠٥ێ بۆ گوندی هاتینە دروستکرن و تا نها گوند یێ ئاڤەدانە، لێ هەشت مال یێن ل سەر گوندی و یێن دی ل بێهنڤەدان و هاڤینان دهێنە سەر گوندی.

## شوینوارێن گوندی:

ڤی گوندی شوینوارێ دێرەکا کەڤن لێ هەیە کو ل دووڤ گۆتنان دیرۆکا وێ بۆ بەری ١٤٠٠ سالان دزڤریت.

## جهێن دیار ل گوندی:

شکەفتا گەلیێ کانیێ، شکەفتا کەرا، شکەفتا گەلیێ ئەنابە.

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی کانیا ئەبونا، کانیا شێوانا، کانیا گەلی کو دو کانی نە، کانیا شاسا، کانیا گوندی، کانیا بوبو، کانیا گەلی بلو، کانیا با قتروس، جۆیا گوندی، جۆیا لێرواتا، جۆیا عین شاسا، جۆیا تەپە یاپا، جۆیا ئاشی، رووبارێ گوندی.

## ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر رەزی و پەزی و چاندنا تویتنێ و برنجی بوو، هەروەسان مفا ژ دار و بارێ سرۆشتی ژی وەردگرتن، وەکی گوهیشک و کەزان و مازیا... هتد. نها پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە، هندەک ژی جۆتیاریێ دکەن و دار و بارێ فێقی و زەیتوونان دچینن و ماسی و مێشێن هنگڤینی ژی ب خودان دکەن.

## خزمەتگوزاریێن گوندی:

ڤی گوندی چەند خزمەتگوزاری بۆ هاتینە دروستکرن، وەکی دروستکرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٠ێ گەهاندنا کارەبێ ل سالا ٢٠١٣ێ، ژبلی چێکرنا جۆکەکا ئاڤێ ب درێژاهییا ٣کمی[٩٧].

## گوندێ بلان

گوندەکێ گرنگێ دەڤەرێ یە، ل بەرێ ل بنێ چیای بوو و نها ل سەر جادا گشتی هاتییەئاڤاکرن، دکەڤیتە دووراتیيا ٦کم رۆژهەلاتێ ئەتریش، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە کو د بەرێ دا و هەتا نها خەلکەکێ قەستا ڤی جهی کرییە و هەر کەسەکێ ل ڤێرە ئاکنجیبووی چ گۆتییە نەگۆتینی نە، واتە هەر بلا بوو و ناڤێ گوندی ژ وێ پەیڤا بلا هاتییە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٥٣٧٠ دۆنەمن، ژ وانان ٤٩٨ دۆنەم دێمی، ٨٩١ دۆنەم ئاڤی، ٣٨٧٧ دۆنەم پاوان، ٥١ دۆنەم رەزێن دێم، ٥٣ دۆنەم رەزێن ئاڤی، هەروەسان ٣١١٥ سەرێن پەز و بزن و ١٥ چێل لێ هەنە[٩٨]. ناڤێ گوندی د المعجم التاریخی لامارة بهدینان دا هاتییە و وەسان سالۆخەت دایە کو گوندەکێ کەڤنارە، دکەڤیتە دەشتا شەمکان ل سەر رێکا ژ دهۆك دچیتە ئاکرێ، حەفت قرۆش و چارێك وەکی وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل سەر هاتبوو سەپاندن[٩٩].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ بێرکیات.

**باشووری:** گوندێ بافکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ تلە.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن رکاڤا هەرماش.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، پێکهاتییە ژ ١٠ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا ئەحمەد جندی، بنەمالا ئەحمەد ئاسا، بنەمالا حەجی توسبی، بنەمالا عەلو سالیانی، بنەمالا محەمەد حەلوك، بنەمالا حەمو ئەمین، بنەمالا عەبدوللا کیژولا، بنەمالا حسێن ئاغای، بنەمالا عەلی کورتێ، بنەمالا سەیفەددینی.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٤٩ کەس ل گوندی دژیان[١٠٠]. سالا ١٩٦٣ێ دەمێ گوند ژ ژ لایێ حکۆمەتا عیراقی ڤە هاتییە وێرانکرن ٣٥ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ١٧٥ کەس، نها ٢٣٩

مال ل سەر گوندینە کو دبنە ١٢٩٦ کەس، نیڤا پتر ژ ئاکنجیێن گوندی خەلکێ گوندێن رکافا، گڤارێ، باسفرێ نە و ل وێرێ ئاکنجیبووینە.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٦٣ێ ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتیە و سوتن و خەلکێ وی دەربەدەربوویە تا سالا ١٩٩١ێ کو گوند ئاڤابوویەڤە.

**شوینوارێن گوندی:**

ڤی گوندی چەند شوینوار لێ هەنە، وەکی هەبوونا حەفت ناوسکان ب دووراتییا کیلومەترەکێ ل باکوورێ گوندی و شوینوارێ چوار ئاشێن ئاڤێ کو ل دووڤ گۆتنان دیرۆکا وان بۆ بەری ٣٠٠ سالان دزڤریت، ژبلی شوینوارێ دێرەکا گەلەک کەڤن.

**جهێن دیار ل گوندی:**

گەلیێ بلان، تیشێ خویشک و برا، گرێ ملێ سویکا، شکەفتا پشت گوندی، شکەفتێن خێرێ کو چوار شکەفتن، شکەفتە رەش، شکەفتا کورێ هێرى.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، ب تایبەت کانی، وەکی کانییا مەوجێ، کانییا ملێ سویکا، کانییا حەمو ناصرا، کانییا قدۆك، کانییا ژنە مریا، کانی مومیك، کانییا ئەحمەد بەرواری، کانییا شێخی، کانی سارکێ، کانییا دەحلێ قەرەچا، کانییا دەحلی، کانییا سێگۆشە، کانییا بیرکێ، جۆ بانگ، جۆیا مێرگا، جۆیا قوینتارێ، چۆیا پێش گوندی، جۆیا گوندی، رووبارێ بلان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

گوندەکێ دەولەمەندە ب عەردی و ئاڤێ و گەلەکێ گونجایە بۆ چاندنێ. ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنێ بوو، ب تایبەتی چاندنا برنجی

گوندێ بلان



و ماشا و کونجیا و چێکرنا بیستانان و چاندنا دار و بارێ فێقی، ژبلی خودانکرنا تەرش و کەوالی ژی. نها ژیانا وان پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و چاندنێ ژی دکەن و مفا ژ سروشتی و دار و بارێ وی ژی دکەن. ژبلی گەلیێ بلان کو جهەکێ گوزاری یە و خەلك ژ جهێن جودا قەستا دکەنێ.

## خزمەتگوزاریێن گوندی:

سالا ١٩٩٥ێ بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتیە ڤەکرن و هەمان سال ئاڤاهیەك ژی بۆ هاتیە دروستکرن. سالێن ١٩٩٥ و ٢٠١٤ دو مزگەفت ل گوندی هاتینەئاڤاکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ١٩٩٥ێ و نووژەنکرنا وی ل سالا ٢٠١٣ێ، ئاڤاکرنا بنکەهێ تەندروستی سالا ١٩٩٧ێ، گەهاندنا رێکا گشتی سالا ٢٠٠٣ێ، گەهاندنا کارەبێ ل سالا ٢٠٠٦ێ، ئاڤاکرنا هۆلا بیرەوەریان ل سالا ٢٠١٢، چێکرنا دو جۆیێن ئاڤێ ل سالا ٢٠١٢ێ، دروستکرنا مەیدانکا یاریان ل سالا ٢٠٠٩[101] ل گوندی هاتینەئەنجامدان.

## گوندێ میتکا سەری

گوند دکەڤیتە دووراتییا ١٥کم رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ئەتریش. گوندێ نوی نێزیکی ١کم ل خوارێ ل نێزیکی جادا گشتی هاتیە ئاڤاکرن. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ رووەکەکی ب ناڤێ میتك کو ل وێ دەڤەرێ یێ زۆرە هاتیە و دو گوند ب ناڤێن میتکا سەری و میتکا خارێ هەنە. رووبەرێ گشتی یێ عەردێ گوندی ١٣٦٠ دۆنەمن، ژ وانان ٥٢٠ دۆنەم دێمی، ٢٥ دۆنەم ئاڤی، ٦٤٤ دۆنەم کەڤرین، ١٤١ دۆنەم پاوان، ٣٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٤٢٠ پەز و بزن لێ هەنە[102].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری**، گوندێ مێرگەبی.

**باشووری**، گوندێ کەڤرە سۆرێ.

**رۆژهەلاتی**، گوندێ میتکا خارێ.

**رۆژئاڤایی**، گوندێ مەلکیشان.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا شەرەفانی نە، پێکهاتیە ژ بنەمالا عیسا میتکی. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٦ کەس ل گوندی دژیان[103]. سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتیە وێرانکرن حەفت مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٣٥ کەس و نها ٩ مال ل گوندی دژین کو دبنە ٦٠ کەس.

ئەڤ گوندە ژ ئەگەرێ شۆرشا کوردی چەند جاران کەتیە بەر هەوێن حکومەتێن عیراق ل سالێن ١٩٦١، ١٩٧٥، ١٩٨٨ێ هاتیە وێرانکرن و ل سالێن ١٩٧٠، ١٩٩١ێ هاتیە ئاڤاکرن ڤە.

## جهێن دیار ل گوندی:

گەلیێ پیرهەڤیێ، نەهالا گورازێ، نەهالا شێلکا، نەهالا بەرملێ درێژ، شیڤا گوندی.

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی، کانییا گوندێ سەری، کانییا ئاڤدەل، کانییا بازوی، جۆیا چەم بارانی یا سەری و بنی، جۆیا کونە گورگێ، رووبارێ نێردووش.

## ژین و ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر خودانکرنا پەزی و گارەشا و چاندنا گەنم و برنج و هژیر و هنار و تری و تویتن و... هتد بوو، نها ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی پەزی ب خودان دکەن و کارێ چاندنێ دکەن.

## خزمەتگوزاریێن گوندی:

سالا ٢٠٠٠ێ بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتیە ڤەکرن و ئاڤاکرن، هەروەسان چەند خزمەتگوزاریێن دی ژی گەهاندینە گوندی، وەکی چێکرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ١٩٩٥ێ، چێکرنا جۆکا کشتوکالی ل سالا ١٩٩٩ێ، ئاڤاکرنا هەشت خانییان

ل سالا ٢٠٠٦ێ، چێکرنا جاده و پرەکێ ل سالا ٢٠٠٧ێ، کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازی ل سالا ٢٠٠٨ێ[١٠٤].

## گوندێ خەنس

گوندەکێ کەڤنێ شوینوارییە، ل سەر جەهدا سەرەکی، خوار گوندێ کەڤن ب نێزیکی ٥٠٠م هاتییە ئاڤاکرن، دکەڤیتە دووراتییا ٨کم باشوورێ سەنتەرێ ئەتریش. چەند بۆچوون ل سەر ناڤێ گوندی هەنە، وەکی دبێژن ژ خوا ناس، یان خودا نیاس هاتییە و بوویە خەنس، یان دبێژن خەنس ب واتایا جهەکێ ڤەشارتی هاتییە، دیسان دبێژن ژ خەناس هاتییە کو ناڤەکێ مەسیحییە. ئەڤە هەمی بوچونێن مللی نە، لێ بۆچوونا زانستی و یا پەیوەندی ب دیرۆك و شوینوارێن خەنس ڤە هەی ئەوە یا دبێژیت: د تێکستێن بزمارکیدا یێن ل بەر دەستێ مە یەکەمین جار ناڤێ خەنەس د تێکستێن شاهێ ئاشووری تجلاد بلاسر یێ ئێکێدا هاتییە ل دوڕێن سالا (١١٠٠ پ.ز) بناڤێ باژێرێ (kharusa) ئان (khanusa) کو ناڤێ باژێرەکی دەولەتا میتانی بوو[*]. و دێرەك ل دەڤەرا هەکاریا ب ڤی ناڤی هەیە. رووبەرێ عەردێ گوندی ١٩١٢ دۆنەمن، ژ وانان ٦٦٩ دۆنەم دێمی، ١٦٠ دۆنەم ئاڤی، ٩٦٨ دۆنەم پاوان، ٥ دۆنەم رەزێن دێم، ١١٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١١٢٠ پەز و بزن و ٢٥ چێل لێ هەنە[١٠٥].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن هارینا و کۆخیا.

**باشووری:** گوندێن باڤیان و گەلیکی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن باڤیان و شێخکا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ گەلیکی.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، پێکهاتییە

گوندێ خەنس



ژ چوار بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا زەلیخێ، بنەمالا شینوی، بنەمالا زەحفێ، بنەمالا مێرەما. سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییە وێرانکرن ١٥ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ١٠٠ کەس و نها ٤٧ سەرۆکخێزان ل گوندی دژین کو دبنە ٢٦٠ کەس.

ئەڤ گوندە ژ ئەگەرێ شۆرشا کوردی چەند جاران کەتییە بەر هەوێن حکومەتێن عیراقی، سالا ١٩٦٧ێ گوند هاتییە وێرانکرن و سالا ١٩٧٠ێ جارەکادی هاتییە ئاڤا کرنڤە، سالا ١٩٧٥ێ خەلکێ گوندی بۆ دەڤەرێن جسر مەندان و حەسەنیێ هاتینە تەرحیل کرن و سالا ١٩٨٨ێ گوند کەتییە بەر لێمشتا ئەنفالان، سالا ٢٠٠٦ێ گوند جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

### شوینوارێن گوندی:

گوندەکێ دەولەمەندە ب شوینواران و چەند ژ وان هاتینە نیاسین، ژ شوینوارێن گوندی هەبوونا ١٧ ناوسکان، ١٧ دەرگەهێن کڤانی هەنە، پرۆژەیێ ئاڤا سەنحاریب بۆ خورسباد و نەینەوا، کارخانەکا کەڤن کو ژ بەرا هاتییە چێکرن، د بەرپەرێن ئینسکلوپیدیایێدا ب بەرفرەهی ل سەر شوینوارێن خنس هاتییەنڤیسین.

### جهێن دیار ل گوندی:

کەلیێ خەنس، سەرێ پیرشاڤ، شکەفتا زێری، شکەفتا کانیێ، شکەفتا یەحیای، دولێ، کەلیێ شینوی، کەلیێ مزگەفتێ، دۆلا سەرەکانیێ.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی، کانییا تا برکێ، کانییا بالاڤا، کانییا نیڤەکێ، کانیکا تیا میر، کانییا دۆلێ، جۆیا کوهینا، جۆیا کوهینا بەر گوندی، جۆیا چەمی، جۆیا کەڤرێ بری، جۆیا چەمێ ئاغای، رووبارێ گومل، دو سکرێن ئاڤێ کو ئاڤێ بۆ گوندێن خەنس و باڤیان رێکدئێخیت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر خودانکرنا پەزی و کارەشا و مێشێن هنگڤینی بوو، هەروەسان چاندن ژی دکرن، ب تایبەت چاندنا گەنم و جەهـ و تویتن و برنج و نیسك و نۆك و دار و بارێ فێقی و... هتد، نها ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی کارێ چاندنێ دکەن. دیسان گوند جهەکێ گوزاریە، چ ژ لایێ سرۆشتی ڤە ب هەبوونا ئاڤ و بەنداڤێ و چ ژی ژ لایێ شوینواری ڤە کو گەلەك شوینوار لێ هەنە.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

سالا ٢٠٠٧ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و ئاڤاکرن، هەروەسان چەند خزمەتگوزارییێن دی ژی گەهاندینە گوندی، وەکی ئاڤاکرنا ٢٦ خانییان و کۆلانا دو بیرێن ئیرتیوازی و چێکرنا پرۆژەیێ ئاڤێ و گەهاندنا کارەبێ و چێکرنا جادەیێن ناڤ گوندی ل سالا ٢٠٠٦ێ، ئاڤاکرنا مزگەفتێ ل سالا ٢٠٠٨ێ، ئاڤاکرنا هۆلەکا بیرەوەریان ل سالا ٢٠٠٩ێ، ژێلی دانان ئێستگەهەکێ سەقای ل سالا ٢٠٠٩ێ و فەرمانگەها شوینواران ل سالا ٢٠١١ێ، هەروەسان بنکەهێ تەندروستی ژی ل گوندی هاتییە ئاڤاکرن[١٠٦].

## گوندێ بریفکا

گوندەکێ ناڤدارە ب تەکیا بریفکا تەکیا شێخ نورەددینێ بریفکانی و گەلەك خەلك ژ جهێن جودا وەکی جهەکێ پیرۆز قەست دکەنێ، دکەڤیتە دووراتییا ٢٠کم باشوورێ رۆژئاڤایا سەنتەرێ ئەتریش. ناڤێ گوندی د پەرتووکا (مختصر جغرافية العراق) ئەوا ل سالا ١٩٢٢ چاپ بوی دا هاتییە و گۆتییە کو دکەڤیتە دووراتییا پێنج دەمژمێران ژ ناڤەندا قەزایێ (د وی دەمی دا هاتن و چوون ب سوارییا دەواران یان ب پییان بۆو) و گۆرێ شێخ نورەددینی ل وێرێ یە و گوند ب مەزارێ وی ناڤداربووییە[١٠٧]، ژیانا زانستی و سۆفیەتی وەرار و پێشکەتن بخۆڤە دیتییە، ب تایبەت دەمێ میرێ بەهدینان خواندنگەهەك بۆ

شێخ شەمسەددین قوتب ل سالا ١٠٨٥مش/ ١٦٧٤ز دامەزراندی[١٠٨]. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ بریڤا هاتییە، بریڤا ژی لقەکا عەشیرەتا کۆچەرانە ئەرتووشییان، کو هندەك ژ ئەرتووشییان ل سالا ١٦٢٠ێ هاتینە ڤی گوندی و لێ ئاکنجیبووینە و ناڤ ژ بریڤا بوویە بریفکا. ل سەردەمێ میرگەها بەهدینان سەر ب ئامێدیێ ڤەبوو، سولتان سەیدی خان کورێ قوبادی، کو حوکمداری دناڤبەرا ٩٩٣- ١٠٣٩مش/ ١٥٨٥- ١٦٢٩ێ لێ کری، خواندنگەهەك بۆ شێخ شەمسەددین قوتب کورێ سەید عەبدولکەریم کورێ موسایێ حوسەینیێ بریفکانی لێ ڤەکربوو کو ب دەهان زانا ژێ دەرکەتین، ژ وانان شێخ نورەددین بریفکانی و چەندین زانایێن دی[١٠٩].

رووبەرێ عەردێ گوندی ٤٣٧٤ دۆنەمن، ژ وانان ٢٠ دۆنەم دێمی، ٦٨ دۆنەم ئاڤی، ٤٥ دۆنەم کەڤری، ٣٧٢٦ دۆنەم پاوان، ٥١٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی[١١٠].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ گەلیێ رمان.

**باشووری،** گوندێن شێخەسن و خورکی و مامزدینا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بەریویر.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بالەتە.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، پێکهاتییە ژ ١٨ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا شێخا، بنەمالا شێست ناڤدینا، بنەمالا میسێ، بنەمالا جەجێ، بنەمالا محێ برۆی، بنەمالا نعمان، بنەمالا عەتاولەی، بنەمالا سینوی، بنەمالا عەبدوللا خانا، بنەمالا ئەحمەدێ سلێڤانەیی، بنەمالا پەرێ، بنەمالا عارفێ شەمسێ، بنەمالا بابیبا، بنەمالا محەمەد مشکوی، بنەمالا سوهەیل، بنەمالا عەبدوللا وەیسی، بنەمالا حسێنێ حەلێ، بنەمالا حەجی ئینس. ژمارا خەلکێ

**گوندێ بریفکا**



گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٥٩٠ كەس بوون[111]. سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ حكومەتا عیراقێ ڤە هاتییە وێرانكرن ٢٠ مال ل سەر گوندی بوون كو دبوونە ١١٠ كەس و نها ٤٧ مال ل گوندی دژین كو دبنە ٣٨٦ كەس.

ئەڤ گوندە ل ٢٦ ئادارا ١٩٦٢ێ هاتییەبەردان و سۆتن و وێرانكرن و سالا ١٩٧٠ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە، دیسان ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە خرابكرن و سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

### شوینوار و جهێن كەڤنێن گوندی:

چەند شوینوار ل گوندی هەنە، وەكی هەبوونا پێنج ناوسكان، تەكیا بریفكا، مەرقەدێ شێخ نورەددینی، مەرقەدێ شێخ عەلیێ گەلیێ رمانی، مەرقەدێ شێخ شەمسەددینێ ئەخلاتی.

### جهێن دیار ل گوندی:

شكەفتا عەرەب، شكەفتا ركاڤا، شكەفتە رەشێ، شكەفتا عارفێ شەمسێ، شكەفتا كانیێ، شكەفتا ناوسكێ، نەهالا دێریشكێ، نەهالا بەرەتوین، نەهالا خرابەی، نەهالا كون سیخوركا، نەهالا كانیكا سەعدوللای، نەهالا كورێ.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەكی، كانییا كێری، كانییا گوندی، كانییا كێری، كانییا نزاری، كانییا رەزی، كانی رەشكێ، كانیكا رۆژێ، كانیكا ژێری، كانییا ركاڤا، كانییا دارە بەلێ، كانییا تویكێ، كانییا خرابەی كو دو كانیكن، كانییا بالاڤییا.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر رەزا و چاندنێ و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو، ب تایبەت چاندنا گەنم و جەهـ و گژنیژ و تویتن و هژیر و هنار و تری و سپیندار و... هتد، نها ل سەر كاسبكاریێ و بازرگانیێ و مووچەیانە و هندەك ژی كارێ چاندنێ دكەن و مفای ژ سرۆشتی و دار و بارێن وی ژێ وەردگرن، مینا گوهیشك و مازی و كەزانان. هەروەسان دشیاندایە مفا ژ ڤی جهی وەكی جهەكێ گوزاریێ ئایینی بێتە وەرگرتن. ژبلی ڤێ چەندێ بیرەكا نەفتێ ژی ل رۆژهەلاتێ گوندی ژ لایێ كومپانییا گولف كیستون یا بریتانی ڤە هاتییە كۆلان.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

سالێن بیستان ژ سەدسالییا چوویی بۆ یەكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، پشتی سەرهلدانێ چەند خزمەتگوزاری بۆ گوندی هاتینە دروستكرن، وەكی سێ جاران چێكرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالێن ١٩٩٥، ٢٠٠١، ٢٠١٣، ئاڤاكرنا مزگەفت و تەكیا ل سالا ٢٠٠٠ێ، گەهاندنا كارەبێ ل سالا ٢٠٠٦ێ، ئاڤاكرنا خواندنگەهێ ل سالا ٢٠٠٩ێ، كۆلانا دو بیرێن ئیرتیوازی ل سالێن ٢٠٠١، ٢٠١٣ێ، چێكرنا دو هۆلێن بیرەوەریان ل سالێن ٢٠١٢، ٢٠١٣ێ، گەهاندنا جادێ ل سالا ٢٠١٣ێ[112].

## گوندێ بادیناڤا

گوند دكەڤیتە دووراتییا ٥كم رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ٩١٥ دۆنەمن، ژ وانان ١٠٦ دۆنەم دێمی، ٤٦ دۆنەم ئاڤی، ٧٠٢ دۆنەم كەڤرین، ٤٦ دۆنەم رەزێن دێم، ١٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١١٢٥ پەز و بزن لێ هەنە[113].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ هەرماش.

**باشووری:** گوندێ كۆخیا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ركاڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ شەهیا.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، پێكهاتییە ژ بنەمالا مستۆی. مستوی دو كور هەبوون، ئێك ل بادیناڤا و ئێك ژی ل گوندێ ركاڤا ئاكنجیبوویە.

دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٥ کەس ل گوندی دژیان[114]. سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییە وێرانکرن ١٢ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٤٢ کەس و نها ١٧ مال ل گوندی دژین کو دبنە ٩٥ کەس.

ئەڤ گوندە د قوناغێن شۆرشا کودستانێدا دناڤ بەرا ١٩٦١ - ١٩٧٥ چەند جاران کەتییە بەر هەوێن حکومەتێن عیراق ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٧٤ێ هاتییە وێرانکرن، لێ ل دووڤدا ل سالێن ١٩٦٤، ١٩٧٥ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە و هەر ل سالا ١٩٧٥ێ گوند خرابکرینەڤە و خەلکێ وی دەربەدەر بووینەڤە تا سالا ١٩٩١ێ گوند هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

### شوینوارێن گوندی:

ڤی گوندی جهەکێ شوینواری هەیە، ئەو ژی قەسرا گەلیێ قەسرۆکێ کو دیرۆکەکا کەڤن هەیە.

### جهێن دیار ل گوندی:

گەلیێ قەسرۆکێ کو جهەکێ گوزارییە، شکێرێ بادیناڤا، دۆلا دەرگەی.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی، کانییا گوندی، کانییا گەرماڤا ل گەلیێ قەسرۆکێ، برکێن رەزی، رووبارێ بورکێ بلان، جۆیا چەمێ سماقۆکێ و چەمێ بەرقەسرێ کو ژ بورکێ بلان دهێت.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر خودانکرنا پەزی و گارەشا و چێکرنا رەز و بیستانان و چاندنا سپیندار و گەنم و برنج و تویتن و نیسك و نۆك و... هتد بوو، نها پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی کارێ چاندنێ دکەن. هەروەسان جهەکێ

گوندێ بادیناڤا



ب دار و بارە و مینا جهەکێ گوزاری لێ هاتییە و خەلك قەست دکەنێ.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**

سالا ١٩٩٩ێ بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و ئاڤاکرن، هەروەسان چەند خزمەتگوزارییێن دی ژی گەهاندینە گوندی، وەکی کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازی و چێکرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠١ێ، گەهاندنا هێلا کارەبێ ل سالا ٢٠٠٦ێ، چێکرنا جادێ ل سالا ٢٠١٣ێ[115].

## گوندێ رکاڤا:

گوند دکەڤیتە دووراتییا ٥کم رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ١١٤٨ دۆنەمن، ژ وانان ١٣٢ دۆنەم دێمی، ٢٠ دۆنەم ئاڤی، ٥١١ دۆنەم کەڤرین، ٤٠٧ دۆنەم پاوان، ٣٦ دۆنەم رەزێن دێم، ٤٢ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٩٠٠ پەز و بزن و ٢٤ چێل لێ هەنە[116].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ هەرماش.

**باشووری:** گوندێ کۆخیا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بلان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بادیناڤا.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، پێکهاتییە ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا مستوی، بنەمالا سێڤی، بنەمالا سماهیل. دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ١١٣ کەس ل گوندی دژیان[117]. سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە وێرانکرن ٢٥ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ١٢٨ کەس و نها گوند یێ چۆلە و ژمارا سەرجەمێ خەلکێ گوندی دگەهنە ١٨٠ سەرخێزانان، پتریا وان ل بلان و جهێن دی دژین.

ئەڤ گوندە ژی چەند جاران کەتییە بەر هەوێن حکۆمەتێن عیراقێ ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٧٤ێ و هاتییە وێرانکرن، لێ ل دووڤدا ل سالێن ١٩٦٤، ١٩٧٥ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە کو ل جارا دووێ ل جهەکێ ل بن رکاڤا کو دگۆتنێ خولوکی هاتبوو ئاڤاکرن، لێ هەر ل وێ سالێ هاتە خرابکرن ڤە و پشتی هینگێ گوند نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە.

**جهێن کەڤنار و بەرنیاس ل گوندی:**

نزێرکی، دەرکێ سپی، شکەفتا بن عەرد، شکەفتا نێ، مەرقەدێ شێخ مستەفای.

**ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:**

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەکی، کانیا ئاغدێ، کانیا مێرکێ، کانیا خلوکی، کانی ماران، بیرێ، رووبارێ بورکێ بلان، جۆیا تێنس خرابکێ، جۆیا چەمێ چنارێ و جۆیەکا کشتوکالی ل گوندی هاتییە کونکرێتکرن.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر خودانکرنا پەزی و گارەشا و چێکرنا رەز و بیستانان و چاندنا گەنم و برنج و تویتن و نیسك و نۆك و باقلك و باهیڤ و... هتد بوو، نها پتر ل سەر کاسبکارێ و مووچەیانە و هندەك ژی کارێ چاندێ دکەن[118].

## گوندێ بافکێ

خەلکێ گوندی دکەڤندا خەلکێ گوندێ بیساتێ نە و بافکێ گوندێ وان یێ رەسەنە کو دکەڤندا و بەری ٢٠٠ سالان هاتییە خرابکرن و سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە. ئەڤ گوند دکەڤیتە دووراتییا ١٠کم رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ١٠٢٣ دۆنەمن، ژ وانان ٤٧٠ دۆنەم دێمی، ١٠ دۆنەم ئاڤی، ٥٢٨ دۆنەم پاوان، ٥ دۆنەم رەزێن دێم، ١٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٢١٠٠ پەز و بزن لێ هەنە[119].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێن بلان و تلە.

**باشووری:** گوندێن شێخكا و كۆخیا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ توسب.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەركچێ.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، پێكدهێت ژ ئێك بنەمال، ئەو ژی بنەمالا عومەر بافكی یە. سالا ١٩٩٨ێ دەمێ گوند ژبەر كاودانێ شەرێ ناڤخۆ هاتییە چۆلكرن ١٣ مال ل سەر ڤی گوندی بوون كو دبوونە ٦٥ كەس، نها ژمارا خێزانێن خەلكێ گوندی ١٣ سەرۆك خێزانن، لێ تنێ ئێك مال ژ وان دگەل سێ مالێن عەشیرەتا میرا ل سەر گوندی دژین كو دبنە ٣٨ كەس.

**شوینوارێن گوندی:**

ڤی گوندی ناوسكەك وەكی شوینوار ب دووراتییا ٤٠٠ باكوورێ گوندی هەیە.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەند ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی هەنە، وەكی كانییا گوندی، كانییا بركا بەرێڤە، كانییا گوندی كەڤن، كانییا توبیا حەم ناصرا، كانییا مەلا محەمەدی، جۆیا گوندی.

**جهێن دیار ل گوندی:**

شكەفتا بركا بەرێڤە، شكەفتا مشایخی.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیانا وان ل بەرێ ل سەر خودانكرنا پەزی و چاندنێ بوو، نها ژی پتر ل سەر كاسبكارییێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیارییێ دكەن.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**

ڤی گوندی بیرەكا ئیرتیوازی بۆ هاتییە كۆلان و پرۆژەیێ ئاڤێ و جادە ژی بۆ هاتینە دروستكرن و كارەب ل سالا ٢٠٠٦ێ گەهشتییە گوندی[١٢٠].

## گوندێ خورتا بچویك

گوند دكەڤیتە دووراتییا ٢٥كم رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ خورتییا عەردێ وێ هاتییە كو یێ ب زاخە بۆ چاندنێ و دەرامەتێ وێ یێ باشە، لەوما ب خورت هاتییە ناڤكرن و ژبەر كو گوند یێ بچویك بوویە، ناڤ بوویە خورتا بچویك. رووبەرێ گشتی یێ عەردێ گوندی ١٠١٢ دۆنەمن، ژ وانان ٤٤ دۆنەم دێمی، ٨٥ دۆنەم ئاڤی، ٧٧٨ دۆنەم كەڤرین، ٣٠ دۆنەم رەزێن دێم، ٧٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی[١٢١].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێن چەم رەبەتێ و بیرشكێ.

**باشووری:** گوندێ گڤارا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دەكان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خورتا مەزن.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووریانە، پێكهاتییە ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا سۆفی حسێن، بنەمالا مێمێ، بنەمالا سموی.دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ٨٤ كەس ل گوندی دژیان[١٢٢]. سالا ١٩٨٨ێ دەمێ گوند ژ لایێ حكومەتا عیراقێ ڤە ل ئەنفالان هاتییە وێرانكرن ٣٠ مال ل سەر گوندی بوون كو دبوونە ١٤٠ كەسان و نها گوند یێ چۆلە و كەس ل سەر گوندی ناژیت، و تنێ هاتن و چوونا وی دكەن ژمارا سەرجەمێ خەلكێ گوندی دگەهنە ٨٠ سەرخێزانان، پتریا وان ل قەسرۆكێ و دهۆكێ دئاكنجینە.

ئەڤ گوندە د سالێن شۆرشا كوردی چەند جاران كەتییە بەر هەوێن حكومەتێن عیراقی، ل جارا ئێكێ سالا ١٩٦٢ كو گوند جارەكادی سالا ١٩٦٢ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە و جارا دووێ سالا ١٩٦٩ێ بوو كو ل هەمان سال هاتییە ئاڤاكرن و داوی جار كەتییە بەر هەوا

ئەنفالان و پشتی هینگێ نەهاتییە ئاڤاكرن ڤە، لەوما چ خزمەتگوزاری بۆ گوندی نەهاتینە دروستكرن، تنێ دو جۆكێن ئاڤێ و برکەكا كشتوكالی نەبن كو ل سالا ۲۰۱۳ێ هاتینە دروستكرن.

## شوینوارێن گوندی:

ژ شوینوارێن گرنگ، هەبوونا سێ ناوسكان ل رەخ و دۆرێن گوندی ب دووراتییا كێمتر ژ ۱كم، دگەل ئاڤدا گوندی كو گەلەكا كەڤنە و ب شێوازێ گومبەتان هاتییە دروستكرن.

## جهێن كەڤنار و بەرنیاس ل گوندی:

گەلی گیسك، دۆلا قەلایێ، شیڤا خورت و دەكان، گەرماڤا گوندێ خورت، هەبوونا چەند شكەفتان، وەكی شكەفتا جنێ، شكەفتا بەرگارا، شكەفتا پانۆكی، شكەفتا كۆرا بەرمێشێ، شكەفتێن بن گێرەی، شكەفتا عەیشێ، شكەفتا گوندی، شكەفتا كانیسكێ.

## ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی چەند ژێدەرێن ئاڤێ لێ هەنە، وەكی، كانییا گیزك، كانییا ناڤ رەزا، كانییا زەیتوون، كانی گوندی، گەراڤێ، جۆیا گەراڤێ، جۆیا چەمكی، جۆیا گوندی.

## ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر خودانكرنا پەزی و گارەشا و چێكرنا رەز و بیستانان و چاندنا زەیتوونان و گەنم و برنج و تویتن و نیسك و نۆك و باقلك و باهیڤ تری و... هتد بوو، نها پتر ل سەر كاسبكاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی كارێ چاندێ دكەن[۱۲۳].

## گوندێ گڤارا:

گوندەكە دكەڤیتە دووراتییا ۲۰كم رۆژهەلاتێ ناڤەندا ئەتریش. رووبەرێ گشتی یێ عەردێ گوندی ۵٤۹٤ دۆنەمن، ژ وانان ۱٥٤۰ دۆنەم دێمی، ۳۱ دۆنەم

گوندێ خورتا بچویك



ئاڤی، ٢١٤٩ دۆنەم كەڤرین، ١٧٣٧ دۆنەم پاوان، ١٨ دۆنەم رەزێن دێم، ٢٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی، ژبلی ١٣٠٠ پەز و بزن ل گوندی هەنە[١٢٤].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێن خورت و دەكان.

**باشووری،** گوندێن كانی گول و كەندی.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ نێروەك.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مێرگەبی.

**پێكهاتا گوندی:**

گوندەكێ عەشیرەتا مزووریانە، پێكهاتییە ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا چەرمینی، بنەمالا سلێمان شەلوی، بنەمالا سمێ. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٠٩ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٢٥]، سالا ١٩٩٨ێ دەمێ گوند ژ ئەگەرێ كاودانێ ناڤخۆ هاتییە بەردان ١٢ مال ل سەر گوندی بوون كو دبوونە ٩٨ و نها تنێ دو مالێن عەرەبان ل سەر گوندی دژین كو بۆ خودانكرنا پەزی هاتینە وێرێ. سەرجەمێ خەلكێ گوندی ٧٠ سەرۆك خێزانن كو ل جهێن جودا دژین.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٧٤ێ هاتییە كاڤل و وێرانكرن و خەلكێ وی هاتنە راگوهاستن بۆ دەڤەرا ئاكرێ تا پشتی سالا ١٩٩١ێ كو گوند جارەكادی هاتییە ئاڤاكرن، لێ ل سالا ١٩٩٨ێ و ژ ئەگەرێ شەرێ ناڤخۆ گوند هاتییە بەردان و تا نها نە هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەند كانی ل گوندی هەنە وەكی ژێدەرێن ئاڤێ، مینا كانییا مغبەرێ، كانییا مزگەفتێ، سەرۆكانیێ، جۆیا گوندی، رووبارێ خازری.

**جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:**

دێریشكێ و شكەفكی و دركێ زۆمن، گرەمیر، شیڤا گولا.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

مینا هەمی دەڤەرێ خەلكێ گوندی پتر جۆتیار بوون، ژ گرنگترین دەرامەتێن د چاندن گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و برنج و تری و هژیر و زەیتوون و... هتد بوون، هەروەسان پەز و گارەش و مریشك ب خودان دكرن وەكی ژێدەرێ ژیانا وان. نها ژی ژیارا خەلكێ گوندی ل سەر مووچە و كاسبكاریێ یە و هندەك ژی كارێ چاندنێ دكەن و پەزی ب خودان دكەن.

ژبەر كو گوند یێ چۆلە چ خزمەتگوزاری ل گوندی نە هاتینە دروستكرن، تنێ جۆیا ئاڤێ ل سالا ٢٠١٣ێ بۆ هاتییە كونكریتكرن[١٢٦].

## گوندێ ستنگینێ:

گوندەكە دكەڤیتە دووراتییا ٢٥كم رۆژهەلاتێ ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ ستێنكێ هاتییە كو كەلەك دهاتنە سەر ئاڤا وێ. رووبەرێ گشتی یێ عەردێ گوندی ١٩٥٦ دۆنەمن، ژ وانان ٨٧٥ دۆنەم دێمی، ٢ دۆنەم ئاڤی، ١٠٦٨ دۆنەم كەڤرین، ٤ دۆنەم رەزێن دێم، ٧ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٧٢٠ پەز و بزن و ٥٠ سەرێن چێلان ژی لێ هەنە[١٢٧].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ خورت.

**باشووری،** گوندێن میتكێ و كانی گولێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گڤارا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مێرگەبی.

**پێكهاتا گوندی:**

گوندەكێ عەشیرەتا مزووریانە، پێكهاتییە تنێ ژ ئێك بنەمال ب ناڤێ بنەمالا شەلوی. سالا ١٩٩٩ێ دەمێ گوند ژبەر كاودانێ ناڤخۆ هاتییە بەردان ٢٠ مال ل سەر گوندی دژیان كو دبوونە ٩٥ كەس، لێ نها كەس ل سەر گوندی ناژیت و گوند یێ چۆلە، سەرجەمێ خەلكێ گوندی ژی ٥٠ سەرۆك خێزانن كو ل گوندێ بلان و قەسرۆك و چرەی و شێخان و

جهێن جودا دژین.

ئەڤ گوندە چەند جاران هاتییە و کاڤل و وێرانکرن، جارا ئێکێ ل سالا ١٩٦٣ێ هاتەخرابکرن و ل هەمان سال هاتییە ئاڤاکرن ڤە. سالا ١٩٧٥ێ هاتە خرابکرن ڤە و سالا ١٩٩٣ێ جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن ڤە، تا داوی جار ژ ئەگەرێ کاودانێ ناڤخۆ ل سالا ١٩٩٩ێ هاتییە کاڤلکرن و تا نها نە هاتییە ئاڤاکرن و گوند یێ چۆلە و ژبەر هندێ چ خزمەتگوزاری بۆ گوندی نەهاتینە دروستکرن..

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەند کانی ل گوندی هەنە وەکی ژێدەرێن ئاڤێ، مینا کانیا بانیێ، کانیا ستنگینێ، کانی دریك، کانی گوریك، کانی گەرمك، لێ نها ئاڤ هشك بووینە.

### جهێن بەرنیاس و ئاڤدار ل گوندی:

شیڤە تیێ، مەرقەدێ پیرا شیر، گولی رەش، شیڤە رویلێ، شیڤا بن خرێ.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

خەلکێ گوندی ل بەرێ پتر جۆتیار بوون و پەز ب خودان دکرن و رەز دکرن، نها ژی ژیانا خەلکێ وی پتر ل سەر مووچەیانە و هندەك ژی کاسبکاریێ و جۆتیاریێ یە و گەنمی دچینن[١٢٨].

## گوندێ تلدیڤ:

گوند دکەڤیتە دووراتییا ٣کم باشووری ئەتریش. ناڤێ گوندی پێکهاتییە ژ دو برگەیان، برگەیا ئێکێ تل، کو پەیڤەکا عەرەبی یە ب واتایا گر و پەیڤا دویڤ، ب واتایا ل دەڤ- ل نێزیك، واتا ل دەڤ گری. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٩١٥ دۆنەمن، ژ وانان ١٣٦٧ دۆنەم دێمی، ٩٣ دۆنەم ئاڤی، ١٤٢٠ دۆنەم کەڤرین، ٣٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٢٥٢٠ پەز و بزن و لێ هەنە[١٢٩].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** ناڤەندا ئەتریش.

**باشووری،** گوندێ بەربیرێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن شەهیا و مکێرس.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بێکەهـ.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مـزووری نە، ژ بنەمالەکێ ب ناڤێ بنەمالا عیسای پێکهاتییە، یان دبێژنێ بنەمالا هەسنیان. سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە وێرانکرن ٨ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٥٣ کەس و نها ژمارا وان هەر ٨ مالن و ٥٣ کەسن، لێ ئاکنجیێن وی نە خەلکێ رەسەنێ گوندی یە، بەلکی هندەك رێکانی و مزووری و مارونسی لێ د ئاکنجینە و ملکێ گوندی شین دکەن.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٢٥-١٩٢٧ێ هاتییە خرابکرن و سالا ١٩٧٠ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە و سالا ١٩٧٥ێ هاتییە خرابکرن و پشتی سەرهلدانێ ل سالا ١٩٩٢ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە.

### ژێدەرێن ئاڤێ ل گوندی:

ڤی گوندی کانیا گەلیێ ئەتریش لێ هەیە، هەروەسان رووبارێ ئەتریش و جۆیا تلدیڤێ و جۆیا گەلیێ ئەتریش.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر خودانکرنا پەزی و گارەشا و مریشکا و چاندنا گەنم و جەهان و چێکرنا بیستانان بوو، نها پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی کارێ چاندێ دکەن.

### خزمەتگوزاریێن گوندی:

خواندنگەهـ ل سالا ١٩٩٩ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا ١٩٩٢ێ کارەب گەهشتییە گوندی، سالا

١٩٩٥ێ پرۆژەیێ ئاڤێ ل گوندی هاتییە دروستکرن، سالا ١٩٩٧ێ ژی جۆیەکا ئاڤێ و مزگەفت لێ هاتینە دروستکرن[١٣٠].

## گوندێ بیرێ

ئەڤ گوند دکەڤیتە دووراتیيا ١٢کم رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ئەتریش. د دەمێ شۆرشا ئەیلوولێ دا بارەگایێن شۆرشێ لێ بووینە. ناڤێ گوندی ژ ناڤێ بیرێ ب واتا کەلا ب سریانی کو ل وی گوندی هەبوو هاتییە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٦٨٢ دۆنەمن، ژ وانان ٨٥٨ دۆنەم دێمی، ٩٠ دۆنەم ئاڤی، ٢٠ دۆنەم کەڤرین، ١٦٧٠ دۆنەم پاوان، ٢٩ دۆنەم رەزێن دێم، ١٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٧٤٠ پەز و بزن و ١١٢ چێل لێ هەنە[١٣١]. ناڤێ گوندی بیری باسفر وەکی د پەرتووکا المعجم التاریخی لامارة بهدینان دا هاتی نڤیسییە کو گوندەکێ کەڤنارە ل لایێ راستێ ژ رێکا قەسرۆك- دهۆك، نێزیکی گوندێ بیر سیدانك و ژ وان گوندێن دەڤەرێ یە کو مەسیحییەت هەر زوی لێ بەلاڤبووی و ل سەردەمێ میرێ بەهدینان میر حسێن وەلی حەفت قرۆش و چارێك وەکی وەقف بۆ خواندنگەها قوبەهان ل سەر هاتبوو سەپاندن[١٣٢].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ بێرکیات.

**باشووری،** گوندێن کێفسن و مەلکیشان و توسب.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ باسفرێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ تلە.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ سێ بنەمالان بنەمالا دەروێشا، بنەمالا میروکا، بنەمالا پیر مەما پێکدهێت. ل دووڤ سەرژمێریيا سالا ١٩٥٧ێ ١٥٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٣٣]. سالا ١٩٧٥ێ

گوندێ تلدیف



دەمێ گوند ژ لایێ رژێمێ ڤە هاتییە كاڤلكرن ٤٥ مال ل سەر گوندی بوون كو دبوونە ٢٢٥ كەس، لێ نها ٤٩ مال ل سەر گوندی نە كو دبنە ٣٥٥ كەس.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٦٣ێ ژ لایێ حكۆمەتا عیراقی ڤە هاتییە خرابكرن و پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارێ ١٩٧٠ێ هاتییە ئاڤاكرن ڤە، تا سالا ١٩٧٥ێ كو هاتییە خرابكرن و خەلكێ وی راگوهاستنە دەڤەرا جسر مەندان، سالا ١٩٧٦ێ گوند هاتییە ئاڤاكرن ڤە، لێ د هەمان سال دا هاتییە خرابكرن ڤە، تا سالا ١٩٨٥ێ جارەكادی گوند هاتە ئاڤاكرن ڤە تا گوند ل سالا ١٩٨٨ێ كەتییە بەر هەوا ئەنفالان و پشتی سەرهلدانێ ل سالا ١٩٩١ێ گوند هاتییە ئاڤاكرن ڤە.

### شوینوارێن گوندی:

ڤی گوندی دو ناوسك وەكی شوینوار ل پشتا گوندی ب دووراتییا ٥٠٠ متران هەنە، هەروەسان شوینوارێن دێرەكا گەلەك كەڤنار و قەسرەكا گەلەك كەڤنار ب ناڤێ قەسرا میری لێ هەنە، ژبلی بنبیڤەكێ (بنداڤەكێ)، كو ٧٢ پایان دچیتە خوارێ و دبیتە ژوور.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەند كانی وەكی ژێدەرێن ئاڤێ ل ڤی گوندی هەنە، وەكی كانییا حەجی محۆی، كانییا گەلیێ بیرێ، كانییا باگەڤزێ، كانییا سەرەدەڤنێ، كانییا پیر عەلی. هەروەسان جۆیا چەمی و جۆیا باگەڤزێ.

### جهێن دیار ل گوندی:

گەلیێ بیرێ، چەند شكەفت، وەكی شكەفتا دو دەر، شكەفتا دەرزێ، شكەفتا دێوا، شكەفتا جنا.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیانا وان ل بەرێ ل سەر خودانكرنا پەزی و گارەشا و چاندنێ بوو، نها ژی پتر ل سەر كاسبكارییێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیارییێ دكەن، چونكی گوندەكێ ئاڤدارە ب چاندنا دەرامەتێن دێم مینا گەنم و جەهان و خودانكرنا تەرش و كەوالی.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

سالا ١٩٧٢ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن و سالا ١٩٩٧ێ ئاڤاهییەك بۆ هاتییە دروستكرن، سالا ١٩٩٩ێ جۆیەكا كشتوكالی بۆ گوندی هاتییە كونكریتكرن، سالا ٢٠٠٤ێ مزگەفت بۆ هاتییە ئاڤاكرن، سالا ٢٠٠٦ پرۆژەیێن ئاڤێ و كارەبێ بۆ هاتینە چێكرن، سالا ٢٠١٣ێ بیرەكا ئیرتیوازی بۆ هاتییە كۆلان و جادە ژی بۆ هاتییە دروستكرن، ژبلی ئاڤاكرنا هۆلەكا بیرەوەرییان ل سالا ٢٠١٥ێ[١٣٤].

## گوندێ باسفرێ

گوندەكە دكەڤیتە دووراتییا ١٢كم رۆژهەلاتا ناڤەندا ئەتریش. ناڤێ گوندی پەیڤەكا مەسیحییە ب واتایا نڤێژا سپێدی كو دهاتە گۆتن بیت سەپرا و پاشی ب بوورینا دەمی ناڤ سڤك بوویە و بوویە باسفرێ. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢١٣٧ دۆنەمن، ژ وانان ٧٧ دۆنەم دێمی، ٦٤٣ دۆنەم ئاڤی، ١٣٦٢ دۆنەم پاوان، ١٠ دۆنەم رەزێن دێم، ٤٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٤٥٠ پەز و بزن و ١٣٥ چێل لێ هەنە[١٣٥]. ناڤێ گوندی د المعجم التاريخي لامارة بهدينان دا هاتییە و وەسان سالۆخەت دایە كو هەر زوی مەسیحییەت لێ بەلاڤبوویە و یاقوتی سالۆخەت دایە كو " یا مەزنە ل رۆژهەلاتی مووسل" ل بەتەنا چیای و گەلەك رەز و بیستان لێ هەنە. ناڤێ وی د دەستنڤیسێن سریانی ب بیت سفراو هاتییە و ژ وان دەستنڤیسەكا سالا ١٩٩٦ێ یۆنانی ١٦٨٥ز كو ئاماژەك ب دێرەكێ ب ناڤێ مار یوحەنا لێ كرییە، گوند دكەڤیتە لایێ راستێ سەر رێكا قەسرۆك دچیتە دهۆكێ و ژ تشتێن دیار ژێ ستوونەكا مەزنە[١٣٦].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بێركیات.

**باشووری،** گوندێن توسب و كێفسن.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مێرسیدا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بیرێ.

### پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، پێکهاتییە ژ چوار بنەمالان بنەمالا محەمەد حەسەن، بنەمالا مەلا، بنەمالا چەرمینیا، بنەمالا حەسەن باریکا. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٨٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٣٧] ، سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند هاتییە خرابکرن ١٦ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٥٠ کەس و نها ٦١ مال ل سەر گوندی دژین کو دبنە ٣٤٠ کەس.

ئەڤ گوندە چەندین جاران دەمێ شۆرەشێ دا هاتییە و کاڤل و وێرانکرن و پشتی هەر جارەکا خراب بووی جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن ڤە، گوند ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٧، ١٩٦٩ێ کاڤل و وێرانکرن و داوی جار ل سالا ١٩٧٥ێ بوو کو خەلکێ گوندی ژی راگوهاستینە کانیلان.

### شوینوارێن گوندی:

شوینوار ل ڤی گوندی هەنە، وەکی: جهێ ئاگرێ زەردەشتییا و شکەفتا گولحوی.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەند کانی ل گوندی هەنە وەکی ژێدەرێن ئاڤێ، مینا کانییا توی رەشکێ، کانییا بن رێ، کانییا گەلی، جۆیا گەلی.

### جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:

خارێ حەجی محو زۆمە، ئێك مالێ چەمێ میرا.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

مینا هەمی دەڤەرێ خەلکێ گوندی پتر جۆتیار بوون، ژ گرنگترین دەرامەتێن دچاندن گەنم و جەهـ و زەیتوون بوون، هەروەسان مەر و مالات ژی ب خودان دکرن، نها ژی پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیاریێ دکەن.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

خواندنگەهـ ل سالا ١٩٩٧ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا ٢٠١٠ێ کارەب گەهشتییە گوندی، سالا ٢٠١٣ێ جادە و پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتینە دروستکرن[١٣٨].

## گوندێ مێرسیدا ئێکێ

گوندەکە دکەڤیتە دووراتییا ١٢کم رۆژهەلاتێ ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە کو دبێژن د کەڤندا میرەك ب ناڤێ میر سیدو، یان میر سەیدو لێ هەبوویە و ناڤ بوویە مێرسیدا، کو نها دو گوند ب ڤی ناڤێ هەنە، مێرسیدا ئێك و مێرسیدا دو، کو هەتا سالا ١٩٧٥ێ ئێك گوند بوو، لێ پشتی سالا ١٩٩١ێ گوند هاتییە ئاڤاکرن بوویە دو گوند. رووبەرێ عەردێ گوندی مێرسیدا ئێك+ دو ٥٤٦١ دۆنەمن، ژ وانان ٨٧٨ دۆنەم دێمی، ٩٠ دۆنەم ئاڤی، ٢٠٦٨ دۆنەم کەڤرین، ٢١٣٦ دۆنەم پاوان، ١٩٩ دۆنەم رەزێن دێم، ٩٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٢٨٢٥ پەز و بزن ١٧٨ چێل لێ هەنە[١٣٩]. ناڤێ گوندی د پەرتووکا المعجم التاريخي لامارة بهدينان دا هاتییە کو دکەڤیتە دەڤەرا مزووریان ل بەر بەتەنا چیایێ خێرێ، نڤیسەرەکێ نە بەرنیاس ئاماژەك ب ناڤێ ڤی گوندی کرییە کو ل سالا ١١٨١مش/ ١٧٦٧ز شەرەك لێ رویدایە و ئیسماعیل پاشای ئیبراهیم بەگ گرتییە، لێ هۆیێ شەری دیارنەکرییە و ئەڤ مێژوویە پێش هاتنا ئیسماعیل پاشایە بۆ سەر حوکمێ میرگەها بەهدینان ب سالەکێ، و ل وی سەردەمی فەرماندەیەکێ لەشکەرێ بابێ خۆ بەهرام پاشای بوو دەست بۆ ب سەرداگرتنا بیرام بەگ کورێ سولتان بەدرەددینی کو یاخی ببوو ل سەر بەهرام پاشای و دەستهەلات دڤیا[١٤٠].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ بێرکیات.

**باشووری:** گوندێ مەلکیشان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سەرکاف.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باسفرێ.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی مزووری نە، ژ چوار بنەمالان بنەمالا مامیسی، بنەمالا شێخ ئەمیری شێخەمیری، بنەمالا بادینالیا، بنەمالا رەڤا پێکهاتیيە. ل دووف سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٦٣٤ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٤١]، سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ ئالیێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن ٢٠٠ مال ل سەر گوندی دژیان کو دبوونە ١٠٥٠ کەس، نها ١٠٧ مال ل سەر ڤی گوندی دژین کو دبنە ٥٣٥ کەس.

گوند چەند جاران د روودانێن شۆرشا کوردستانێ دا هاتییە کاڤل و وێرانکرن و پشتی هەر جارەکا هاتییە خرابکرن، دوبارە خەلکێ گوندی جارەکادی ئاڤاکرینەڤە، گوند ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٩، ١٩٧٥ێ هاتییە خرابکرن و ل سالێن ١٩٦٤، ١٩٧٠، ١٩٩١ێ دوبارە ئاڤاکرینەڤە.

**شوینوارێن گوندی:**

چەند شوینوار ل گوندی هەنە، وەکی: هەشت ناوسك، بەرێ قەشا، گرێ ئیڤرانیێ.

**زێدەرێن ئاڤێ:**

چەند کانی ل گوندی هەنە وەکی کانیا زر گویزا، کانی کاسك، کانیا دەحلی، کانیا گرێ بەلەك، کانی کەرێ، دو جۆیێن چەمێ خەتارێ ملێ راستێ و ملێ چەپێ.

**جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:**

گەلیێ رەزا، دو شاخێ، خارێ مێرسیدا کو زۆمە، چەند شکەفت، وەکی شکەفتا سێریجا، شکەفتا دودەر، شکەفتا بازە پلنگ، شکەفتا شکەفتا ب دەرگەهـ شکەفتا سیك و دوکانا، شکەفتا هەوا، شکەفتا زێوێ، ژبلی نەهالا جوما، شیڤا خەرزا، شیڤا حەلانۆکا.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

خەلکێ گوندی پتر جۆتیار بوون، ژ گرنگترین دەرامەتێن دچاندن برنج و تویتن و چێکرنا رەزا بوون، زێدەباری دەرامەتێ سرۆشتی ژ گوهیشك و مازی و ...هتد. نها ژی پتر ل سەر مووچەیا و کاسبکاریێ یە، ژبلی کو هندەك چاندنێ ژی دکەن، ب تایبەت دار و بارێ فێقی ژ تری و هنار و خۆخ و هژیران و دەرامەتێ کەسکاتی ژ باجانسۆرك و خیار و فلفل و لۆبیك و کولند و ... هتد، هەروەسان مفای ژ دار و بارێ سرۆشتی ژی وەردگرن .

**خزمەتگوزاریێن گوندی:**

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا ١٩٥٨ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و دگەل نەمانا گوندی ئەو ژی ژ ناڤچوویە و سالا ١٩٩٣ێ دوبارە خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەکرن. دیسان چەند خزمەتگوزاریێن دی بۆ گوندی هاتینە دابینکرن، وەکی ئاڤاکرنا بنگەهێ ساخلەمیێ و مزگەفتێ ل سالا ١٩٩٤ێ، چێکرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٥ێ، گەهاندنا کارەبێ ل سالا ٢٠٠٨ێ، کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازی ل سالا ٢٠١١ێ[١٤٢].

## گوندێ مێرسیدا دووێ

هەر ژ هەمان گوندێ مێرسیدا کەڤن پشتی سالا ١٩٩١ێ هاتییە جوداکرن کو گوند ل دو جهێن جودا هاتییە ئاڤاکرن، لەوما هەر هەمان بۆچوونێن جڤاکی و سیاسی هەنە و ژیانا وان ب هەمی رەنگان هەر ئێکە. ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا ١٣کم رۆژهەلاتێ ناڤەندا ئەتریش. نها ٧٢ مال لێ دژین کو دبنە ٣٦٠ کەس.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** چیایێ خنیرێ.

**باشووری:** گوندێ مەلکیشان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ سەرکاف.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باسفرێ.

**شوینوارێن گوندی:**

ژ شوینوارێن گوندی گرێ ئیڤانیێ و شکەفتا کافێ.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەند كانی ل گوندی هەنە وەكی كانییا نسێ، كانییا گوندێ بادین، كانی زر گویز، دو جۆیێن چەمێ ئیڤرانیێ، جۆیا رەزا، جۆیا مەمێ.

**جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:**

خارێ مێرسیدا و بێرمان گەرە بەرازێ و دەرحلیك و شكەفتە رەش و شكەفتا چیچكا، هەروەسان مەرقەدێ شێخ مەحمود بابێ شێخ محەمەد مێرسیدی.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**

چەند خزمەتگوزاری بۆ گوندی هاتینە دابینكرن، وەكی سالا ١٩٩٤ێ خواندنگەهـ بۆ هاتییە ئاڤاكرن، سالا ١٩٩٦ێ مزگەفت بۆ هاتییە ئاڤاكرن، سالا ٢٠٠٨ێ كەهشتییە گوندی، سالا ٢٠١٠ێ كەهشتییە گوندی، سالا ٢٠١٢ێ بیرەكا ئاڤێ و پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ هاتییە دابینكرن.

## گوندێ باسكەدێرێ

گوند باسكەدێرێ ل بەرێ ل خوارێ بوو و نها ب نێزیكی ١٥٠٠م ل سەری نێزیكی گوندێ مێرسیدا دو هاتییە ئاڤاكرن، دكەڤیتە دووراتییا ١٥كم رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ئەتریش، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو گرەك، یان باسكەك لێ هەیە و دێرەك ل سەر وی باسكی هەیە، لەوما ب وی ناڤی هاتییە ب ناڤكرن. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٣٧٢ دۆنەمن، ژ وانان ٤٩٤ دۆنەم دێمی، ٤١٤ دۆنەم ئاڤی، ١٤٣٠ دۆنەم پاوان، ٣٢ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١١٠٥ پەز و بزن و ٨٠ چێل لێ هەنە[١٤٣].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ مێرسیدا دو.

**باشووری،** گوندێ گەفەسۆر.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مێرگەبی.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن مەلكیشان و مێرسیدا ئێك.

**گوندێ مێرسیدا دووێ**



**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا شەرەفانی نە، ژ دو بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا سەعیدی و بنەمالا قورتاسی پێکدهێت و هەردو بنەماله د بنیاتدا هەر ژ ئێك بنەمالن ب ناڤێ بنەمالا حەسەنێ میسای. ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ سەرژمێریا سالا ۱۹۵۷ێ ۱۰۹ کەس بوون[١٤٤]. سالا ۱۹۷۵ێ دەمێ گوند ژ لایێ حکۆمەتا عیراقی ڤە هاتییە خرابکرن ١٦ مال ل گوندی دژیان کو دبوونە ۷۷ کەس و نها تنێ چوارده مال یێن ل سەر گوندی کو دبنە ۹٤ کەس، و سەرجەمێ خەلکێ گوندی دبنە ٦٨ سەرخێزان کو پتریا وان ل قەسرۆکێ و دهۆکێ و جهێن دی دژین.

ئەڤ گوندە ژ ئەگەرێ شۆرشێن کوردی چەند جاران هاتییەخرابکرن، وەکی ل سالا ۱۹٦۳ێ هاتییە خرابکرن و سالا ۱۹٦٤ێ دوبارە ئاڤاکرینەڤە. سالا ۱۹٦۹ێ جارەکادی هاتییە کاڤلکرن و سالا ل دووڤدا ئاڤاکرینەڤە، تا داوی جار ل سالا ۱۹۷٥ێ هاتییە خرابکرن و پشتی سەرهلدانێ ل سالا ۱۹۹۲ێ هاتییە ئاڤاکرن و تا نها ئاڤەدانە.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

چەند ژێدەرێن ئاڤێ وەکی کانی ل گوندی هەنە، وەك: کانییا گوندی، کانییا زر گویزا، کانییا کفر و عەجەم، کانی کولك، کانی دیکل، کانی مریشك، کانی مێرگێ، کانی سیسکا، جۆیا گوندی، جۆیا ئاشێ سپی، جۆیا ئاشێ رەشێ، جۆیا گول مراد، جۆیا کانی کولێ.

**جهێن دیار ل گوندی:**

گەلیێ پیرهەڤیێ، شوینوارێن دێرەکا کەڤنار.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ل بەرێ ژیانا خەلکێ ڤی گوندی ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و جۆتیاریێ بوو، ب تایبەت چاندنا

گوندێ باسکەدێرێ



گەنم و جەهـ و تویتن و باقلك و دار و بارێ فێقی و ... هتد. نها پتر ل سەر كاسبكارییێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیارییێ دكەن و تەرش و كەوالی ب خودان دكەن.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

ڤی گوندی چەند خزمەتگوزاری بۆ هاتینە دابینكرن، وەكی كۆلانا بیرەكا ئیرتیوازی ل سالا ١٩٩٧ێ، چێكرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٢ێ، دو جۆیێن ئاڤێ ل سالێن ١٩٩٦ و ٢٠٠٣ێ هاتینە كونكریتكرن، مزگەفت ل سالا ١٩٩٧ێ هاتییە ئاڤاكرن، كارەب ل سالا ٢٠١٠ێ گەهشتییە گوندی، جادە ل سالا ٢٠١٣ێ بۆ هاتییە دروستكرن[١٤٥].

## گوندێ بەرەتوین

گوند دكەڤیتە دووراتییا ٦كم باشووری رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ئەتریش، ناڤێ گوندی ژ وێ چەندێ هاتییە كو دبێژنە وی چیایێ هنداڤی گوندی تینكی، واتە گوند یێ ل بەر تینكی و ناڤ بوویە بەرەتوین، رووبەرێ عەردێ گوندی ٩٢٦ دۆنەمن، ژ وانان ٣٤٩ دۆنەم دێمی، ٩١ دۆنەم ئاڤی، ٧٠ دۆنەم كەڤرین، ٤١٦ دۆنەم پاوان. هەروەسان ٤٩٠ پەز و بزن ل گوندی هەنە[١٤٦].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێن ئاساس و نۆردیناوا.

**باشووری:** گوندێ بریفكا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بێگەهـ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ نوردیناڤا.

### پێكهاتا گوندی:

خەلكێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ چوار بنەمالان بنەمالا میرزایێ ئومەر، بنەمالا عەبدولا عیسا، بنەمالا عەبدولكەریم، بنەمالا یوسف بەرەكات پێكدهێت. سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ حكومەتا عیراقی ڤە هاتییە خرابكرن ٩ مال ل گوندی دژیان كو دبوونە ٥٧ كەس و نها تنێ حەفت مال یێن ل سەر گوندی كو دبنە ٥٥ كەس و هەمی نە خەلكێ رەسەنێ گوندی نە، بەلكی كۆچەرن.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە خرابكرن و خەلكێ وی هاتینە راگوهاستن و گوند پشتی سەرهلدانێ ل سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاكرن و تا نها ئاڤەدانە.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

دو كانی ل گوندی هەنە، ئەو ژی كانیا بیكێ، كانیا سپی، رویبارێ گوملی.

### جهێن دیار ل گوندی:

بەرگوندا بەرەتوین زۆمە، گر سۆری، گر كەلەكی، چالا چێلێ، كول ما

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی بەرێ ل سەر خودانكرنا تەرش و كەوالی و جۆتیارییێ بوو، نها ژی پتر ل سەر كاسبكارییێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیارییێ دكەن، گەنم و جەهان دچینن و بیستانان دكەن و تەرش و كەوالی ب خودان دكەن.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

سالا ١٩٩٤ێ بۆ ئێكەم جار خواندنگەهـ ل گوندی هاتییە ڤەكرن، سالا ١٩٩٩ێ ئاڤاهییەك بۆ هاتییە دروستكرن. سالا ٢٠٠٣ێ بیرەكا ئیرتیوازی بۆ هاتییەكۆلان و پرۆژەیێ ئاڤێ ژی هاتییە دروستكرن و كارەب ژی گەهشتییە گوندی. دیسان مزگەفتەك سالا ٢٠١٣ێ بۆ هاتییە ئاڤاكرن[١٤٧].

## گوندێ ئالۆكا

گوند دكەڤیتە دووراتییا ٨كم رۆژئاڤایا سەنتەرێ ئەتریش، ل بەرێ خەلكێ گوندی هەسنەكا كو گوندەكێ بەفرین بوو و دكەڤیتە باكوورێ گوندێ ئالۆكا پەزێ خۆ دهینانە ڤی جهی گوندێ ئالۆكا ل بەر رووباری و ل وێرێ پەزێ وان تێر ئالیك دخوار و

ناڤ ژ ئالیك بوویە ئالۆکا. رووبەرێ عەردێ گوندی ٣٠٥٠ دۆنەمن، ژ وانان ٦٢٣ دۆنەم دێمی، ٣٥ دۆنەم ئاڤی، ٢٣١٨ دۆنەم کەڤرین، ٧٤ دۆنەم رەزین ئاڤی. هەروەسان ١٢٧٠ پەز و بزن ل گوندی هەنە[١٤٨].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ هەسنەکا.

**باشووری:** گوندێن نۆردیناڤا و دزێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێن بەستافا و ئاساس.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێدویل.

## پێکهاتا گوندی:

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ هەردو بنەمالێن بنەمالا ئومەر و بنەمالا ئاڤدەل پێکدهێت. هندەك ژ خەلکێ گوندی د بنیاتدا هەسنەکی نە سالا ١٩٧٠ێ هاتینە ڤی جهی. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٠ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٤٩]، سالا ١٩٨٦ێ دەمێ گوند ژ لایێ حکۆمەتا عیراقی ڤە هاتییە خرابکرن ٨ مال ل گوندی دژیان کو دبوونە ٤٨ کەس و نها ٦٧ مال یێن ل سەر گوندی کو دبنە ٣٥٠ کەس.

ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٦٢ێ هاتییەخرابکرن و سالا ١٩٧٢ێ جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن. سالا ١٩٨٦ێ جارەکادی هاتییە خرابکرن و پشتی سەرهلدانێ ل سالا ١٩٩١ێ هاتییە ئاڤاکرن و تا نها ئاڤەدانە.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

سێ کانی ل ڤی گوندی هەنە، ئەو ژی کانییا گوندی، کانییا بن گوندی، کانییا گەلیێ کویر، رووبارێ گوملی، جۆیا چەمی.

## جهێن دیار ل گوندی:

گەلیێ کویر، دۆلا کانیکێن پس ئاغا، دۆلا پێکا کاروانی، شیڤکا ب گارس

**گوندێ بەرەتوین**



### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ ڤی گوندی ل بەرێ ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی و جۆتیاریێ بوو و مفا ژ دار و بارێن سرۆشتی وەردگرتن، نها ژی پتر ل سەر کاسبکاریێ و مووچەیانە و هندەك ژی جۆتیاریێ دکەن، گەنم و جەهان دچینن و بیستانان دکەن، هەروەسان تەرش و کەوالی ب خودان دکەن.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

سالا ١٩٩٧ێ بۆ ئێکەم جار خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەکرن و سالا ١٩٩٩ێ ئاڤاهییەك بۆ وێ و ئێك بۆ مزگەفتێ ئاڤاکرینە. سالا ١٩٩٨ێ بیرەکا ئیرتیوازی ل گوندی کۆلاینە و پرۆژەیێ ئاڤێ ژی هاتییە دروستکرن، کارەب سالا ٢٠٠٥ێ گەهشتییە گوندی. سالا ٢٠٠٤ێ جادە گەهشتییە گوندی، سالا ٢٠١٢ هۆلەکا بیرەوەریان بۆ هاتییە ئاڤاکرن، ژبلی چێکرنا جۆیەکا ئاڤێ و دو برکێن ئاڤێ بۆ چاندنێ ل هەمان سال(١٥٠).

## گوندێ نیروەك

گوندەکە دکەڤیتە دووراتییا ٣٠کم رۆژهەلاتێ ناڤەندا ئەتریش. خەلکێ وی د بنیاتدا ژ گوندێ بەنانێ ل دەڤەرا مزووری ژووری هاتینە و ل ڤی گوندی ئاکنجیبووینە. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢١٣٤ دۆنەمن، ژ وانان ٢٤٣ دۆنەم دێمی، ١٧٢ دۆنەم ئاڤی، ١١٩٨ دۆنەم کەڤرین، ٤٩١ دۆنەم پاوان، ٥ دۆنەم رەزێن دێم، ٢٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٥٥ چێل ژی لێ هەنە(١٥١).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ دەکان.

**باشووری،** گوندێ کەندی.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ ئیسماڤا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گڤارا.

گوندێ ئالۆکا



**پێکهاتا گوندی:**
خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، پێکهاتییە ژ ئێك بنەمال ب ناڤێ بنەمالا محەمەدێ میروی. ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ٦٢ کەس بوون(١٥٢). سالا ١٩٨٨ێ دەمێ گوند هاتییە خرابکرن هەشت مال ل سەر ڤی گوندی بوون کو دبوونە ٤٥ کەس، نها ژی ١٣ مال ل سەر گوندی نە کو دبنە ٦٧ کەس.

گوند چەند جاران ددەمێ شۆرشێ دا هاتییەوێرانکرن، هەر جارەکا خرابووی جارەکادی هاتییە ئاڤاکرن، ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٩ هاتییە وێرانکرن و سالێن ١٩٦٦، ١٩٧٠ێ ئاڤاکرینەڤە، داوی جار کەتییە بەر هەوا ئەنفالان، سالا ١٩٩٢ێ گوند رۆژهەلاتی گوندێ کەڤن ب دووراتییا ٥٠٠م ل نێزیکی رووباری کو کارەب لێ هەیە هاتییە ئاڤاکرن.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**
چەند کانی ل گوندی هەنە وەکی ژێدەرێن ئاڤێ، مینا کانییا گوندی، کانییا هژیرا تال، کانی گەرمك، جۆیا گوندی، جۆیا خازری، رووبارێ ئیسماڤا.

**جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:**
کەلی کەڤن، نەهالا بەرێت بەستێ.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**
مینا هەمی دەڤەرێ خەلکێ گوندی پتر جۆتیار بوون و گا رەش ب خودان دکرن، نها ژی پتر ل سەر مووچەیا و کاسبکارێ یە، ژبلی کو هندەك چاندنێ ژی دکەن، ب تایبەت دار و بارێ فێقی ژ تری و هنار و زەیتوونان و دەرامەتێ کەسکاتی ژ باجانسۆرك و خیار و فلفل و ...هتد.

**خزمەتگوزارییێن گوندی:**
سالا ٢٠٠٥ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، مزگەفت و پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٧ێ هاتینەچێکرن، سالا ١٩٩٤ێ کارەب گەهشتییە گوندی، بیرەکا ئیرتیوازی سالا ٢٠١٣ێ لێ هاتییەکولان، چێکرنا برکێن کشتوکالی ل سالا ٢٠٠٣ێ، کونکریتکرنا جۆیا ئاڤێ ل سالا ٢٠١٢ێ(١٥٣).

## گوندێ توسب

ب دووراتییا ٧کم دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ٨١٥ دۆنەمن، ژ وانان ٦٧٢ دۆنەم دێمی، ٤٢ دۆنەم ئاڤی، ٨٨ دۆنەم کەڤرین، ٣ دۆنەم رەزێن دێم، ١٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٣٥٠ پەز و بزن لێ هەنە(١٥٤).

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ تلە.

**باشووری،** گوندێ کۆخیا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ کێفسن.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بلان.

**پێکهاتا گوندی:**
گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ هەردو بنەمالێن بنەمالا سەیدای و بنەمالا فەرەج عەبدالی پێکهاتییە. خەلکێ گوندی ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ٥٢ کەس بوون(١٥٥) . سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ رژێمێ ڤە هاتییە خرابکرن ٥ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٣٠ کەس، لێ نها گوندەکێ چۆلە ژ خەلکێ وی و تنێ مالەکا عەرەب ل سەر گوندی یە کو پەزی ب خودان دکەت.

ئەڤ گوندە سالا ١٩٦٣ێ هاتییە خرابکرن و دوبارە سالا ١٩٦٦ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە و سالا ١٩٧٥ێ جارەکادی هاتە خرابکرن ڤە، تا سالا ١٩٩٢ێ جارەکادی ئاڤەدانبوویەڤە، لێ ل سالا ٢٠٠٦ێ جارەکادی گوند هاتییە بەردان تنێ هندەك خانی بۆ هاتن و چوونێ لێ هەنە.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**
ڤی گوندی دو کانی لێ هەنە، ئەو ژی سەروکانی و کانییا تاوکێ، هەروەسان جۆیەك ژی لێ هەیە

### جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:

ڤی گوندی جهەك وەكی زۆم ب ناڤێ بێشارێ لێ هەیە.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر پەزی و چاندنا دەرامەتێ دێم و ئاڤی بوویە، مینا گەنمی و جەهی نیسك و نۆك و برنج و تویتن بوون و... هتد، نها ژی پتر ل سەر مووچەیا و كاسبكارێ یە، ژبلی كو هندەك چاندنێ ژی دكەن، ب تایبەت چاندنا دەرامەتێ دێم و ، دار و بارێ فێقی، مینا تری و خۆخ و چێكرنا بیستانان و ...هتد.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

هەر چەند گوندەكێ چۆلە، لێ هندە خزمەتگوزاری بۆ هاتینە دروستكرن، وەكی چێكرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ٢٠٠٢ێ و چێكرنا جۆیا ئاڤێ ب درێژاهییا ٣٠٠م ل سالا ٢٠٠٥ێ و گەهاندنا كارەبێ ل سالا ٢٠١٣[١٥٦].

## گوندێ شەهیا

ب دووراتییا ٤كم دكەڤیتە باشوورێ رۆژهەلاتێ ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ٤٠٨٥ دۆنەمن، ١٤٣ دۆنەم دێمی، ١٠١ دۆنەم ئاڤی، ٢٩٧٠ دۆنەم كەڤرین، ٨٢٦ دۆنەم پاوان، ٤٠ دۆنەم رەزێن دێم، ٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٨٣٠ پەز و بزن و ١٦٨ چێل لێ هەنە[١٥٧].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بێداركێ.

**باشووری،** گوندێ مغارا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بادیناڤا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مكێرس.

### پێكهاتا گوندی:

گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، د بنیاتدا ژ شەهیا شەها مزووری ژووریان ل شیڤا بەنانێ هاتینە و هەمان ناڤێ گوندێ كەڤن دانایینە سەر ناڤێ گوندێ خۆ. ژ پێنج بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا قەسرێ، بنەمالا حەجی، بنەمالا جادر، بنەمالا گولێ، بنەمالا عەلی شەهی پێكهاتینە. دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ٢١١ كەس ل گوندی دژیان[١٥٨]. سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ رژێمێ ڤە هاتییە خرابكرن ٤٠ مال ل سەر گوندی بوون كو دبوونە ١٦٥ كەس، نها ٩٥ مال ل سەر گوندی دژین كو دبنە ٥٧٠ كەس.

ئەڤ گوندە ل سالێن ١٩٦٣،١٩٦٨ێ هاتییە خرابكرن و دوبارە ل سالێن ١٩٦٧، ١٩٧٠ێ هاتییە ئاڤاكرن، سالا ١٩٧٥ێ جارەكادی هاتە خرابكرن و خەلكێ وی راگوهاستن، تا سالا ١٩٩٢ێ جارەكادی ئاڤەدانبوویەڤە، لێ نە ل جهێ كەڤن ل سەرێ چیای، بەلكی ب دووراتییا ٣كم ژ گوندێ كەڤن ل سەر جادا سەرەكی و تا نها ئاڤەدانە.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

چەند كانی لێ هەنە، وەكی كانییا ساركێ، كانییا دزا، كانییا شیڤا شینكا، كانییا كوركێ، كانییا بیركا دەحلی، كانییا كەڤنە گوندی، كانییا سەرگەلی، كانییا جەلالێ، كانییا خۆشاڤا، جۆیا چەمێ شرینكا، جۆیا چەمێ جوی، جۆیا چەمێ بەرقەسرێ، جۆیا بەرگوندی، رووبارێ ئەتریش.

### جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:

ڤی گوندی دو جهـ وەكی زۆم ب ناڤێن خۆشابا و تیبانێ لێ هەنە. هەروەسان چەند شكەفت ژی، وەكی شكەفتا مشتەلا، شكەفتا خۆلیێ، شكەفتا زەندۆرێ، شكەفتا كێفتیان، شكەفتا دودەر، شكەفتا دەلیل.

### ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:

ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا دەرامەتێ دێم و ئاڤی بوویە، مینا گەنمی و جەهی و چێكرنا بیستانان و چاندنا سپینداران و دارێن

فێڤی بوو، هەروەسان مفا ژ سرۆشتی و دار و بارێ وی ژێ وەردگرتن. نها ژێ پتر ل سەر مووچەیا و كاسبكارێ یە، هندەك چاندنێ ژێ دكەن، تایبەت چاندنا دەرامەتێ دێم و ئاڤی و دار و بارێ فێڤی و مفا وەردگرتن ژ سرۆشتی و خودانكرنا تەرش و كەوالی و كارەشان.

### خزمەتگوزاریێن گوندی:

چەند خزمەتگوزاری بۆ ڤی گوندی هاتینە دروستكرن، وەكی ڤەكرنا خواندنگەهێ و چێكرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ۱۹۹٥ێ، كۆلانا بیرەكا ئیرتیوازی و چێكرنا مزگەفتەكێ ل سالا ۱۹۹۷ێ، چێكرنا چوار جۆیێن ئاڤێ ل سالێن ۲۰۰۹ و ۲۰۱۲ێ، گەهاندنا كارەبێ ل سالا ۲۰۰٦ێ، ڤەكرنا جاددەیێ ل سالا ۲۰۱۳ێ، ئاڤاكرنا هۆلەكا بیرەوەریان ل سالا ۲۰۱٥ێ.[١٥٩]

### شێخ عادی پەرستگەها لالش

ژ جهێن پیرۆزێن ئێزدییانە، تێدا گەلەك رێ و رەسمێن ئایینی دهێنەگێران و مینا حەجێ یە بۆ ئێزدییان. دكەڤیتە دووراتییا ۷كم باشوورێ ناڤەندا ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ٥٨٩٤ دۆنەمن، ژ وانان ۷۳۲ دۆنەم دێمی، ۱۰ دۆنەم ئاڤی، ۹۳۱ دۆنەم كەڤرین، ٤۲۲۱ دۆنەم پاوان، هەروەسان ۱٤٥۰ پەز و بزن لێ هەنە[١٦٠].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گوندێ شكەفتهندیا.

**باشووری:** گەلیێ خودێدا و شكەفتیان و زهێرا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مغارا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بەریرێ.

**گوندێ شەهیا**



**پێكهاتا گوندی:**

چ مالبات ل ڤێرە نینن و ئەو كەسێن ل ڤێرە دژین "شكەستیێن مالا شێخادی نە"، واتە "رەبەن". سالا ١٩٦٥ێ دەمێ گوند هاتییە خرابكرن ٢ مال ل وێرێ دژیان كو دبوونە ١٣ كەس، نها ژی دو مال لێ هەنە، زێدەباری ١٢ مالێن ئاوارەیان ژی.

ژبەر كو ئەڤ جهە جهەكێ پیرۆزە چ جاران نەهاتییە خرابكرن، لێ چەند جاران هاتییە بەردان و پشتی ماوەیەكی ڤەگەریاینەڤە.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ڤی گوندی چەند كانی لێ هەنە، وەكی كانییا سپی، كانییا زمزم، كانییا شڤانا، كانییا بەریابیك یان دبێژنێ كانی بابیك، جۆیا زەیتوونا.

**شوینوار و جهێن كەڤنار ل گوندی:**

پەرستگەها لالش، دارا مرازا، چیایێ عەرەفاتێ، خانا ئێزدی، پرا صلاتێ، چەندین مەرقەد و گومبەت، وەكی شێخادی، مەلك شێخسن، شێخ شەمس، شێخ مەند، ناصرەددین، خاتوونا فەخرا، شێخ و بەكر، خفۆرێ رێیا، ئامادین، بابادین، سجادین، شێخ بابك و پتر ژ ٣٠٠ مەرقەدان.

**جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:**

نهالا گەلیێ ئاڤێ، گەلیێ لالش، گەلیێ قەوالا. هەروەسان چەند شكەفت ژی، وەكی شكەفتا مهمەدێ رەبەن، شكەفتا ئومەر مەندا، شكەفتا سەید نعوم، شكەفتا شێخ مەند.

**ژێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

چونكی جهەكێ پیرۆزە چ كار و بارێن دی لێ ناهێنەكرن و ژین و ژیارا خەلكێ گوندی ل بەرێ ل سەر خێر و هاریكاریان بوو، نها ژی هەر ل سەر هەمان داهاتە، ژبلی مووچەیان ژی.

**خزمەتگوزاریێن گوندی:**

چەند خزمەتگوزاری بۆ ڤی جهی هاتینە دروستكرن، وەكی چێكرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ١٩٩٧ێ، كۆلانا بیرەكا ئیرتیوازی ل سالا ٢٠١٣ێ، گەهاندنا كارەبێ ل سالا ١٩٧٣ێ، ڤەكرنا جاددەیێ ل سالا ٢٠١١ێ، ئاڤاكرنا هۆلەكێ ل سالا ١٩٨٣ێ و سالا ٢٠٠٩ێ ب شێوەیەكێ باش هاتییە نووژەنكرن، دگەل ئاڤاكرنا هۆلەكا مەزن (دار الضیافة) ل هەمان سال، ژبلی ئاڤاكرنا بنگەهەكێ ساخلەمیێ ل سالا ٢٠٠٧ێ[١٦١].

## گوندێ دەكان

گوندەكێ ناڤدارە ب زەیتوونان و ب وێ كوشتارا تەبایێا ل داوییا سالێن شێستان ژ سەدسالییا بووری ل گوندی هاتینە ئەنجامدان، دكەڤیتە دووراتییا ٣١كم باكوورێ رۆژهەلاتێ ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ ژمارە ١٠ و كانی هاتییە، چونكی دەهـ كانی لێ هەنە و ناڤ ژ دەهـ كانی بوویە دەكان. رووبەرێ عەردێ گوندی ١٥٧١ دۆنەمن، ژ وانان ٦٠ دۆنەم دێمی، ١٠٥ دۆنەم ئاڤی، ١٢٥٦ دۆنەم پاوان، ٥٠ دۆنەم رەزێن دێم، ١٠٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ١٢٠٠ پەز و بزن و ١٤٠ چێل لێ هەنە[١٦٢].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری:** گوندێ چەم ربەتێ.

**باشووری:** گوندێن گڤارا و نیرەك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ ئیسماڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خورتا بچویك.

**پێكهاتا گوندی:**

خەلكێ گوندی مزووری نە، خەلكێ وی پێكهاتییە ژ چوار بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا رەسول دەكانی، بنەمالا عوسمان دەكانی، بنەمالا عەبدولخالق دەكانی، بنەمالا عەبدولقادر دەكانی. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ١٩٧ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٦٣]. سالا ١٩٩٩ێ دەمێ گوند ژ ئەگەرێ كاودانێ سیاسیێ ناڤخۆ هاتییە بەردان ٤ مال ل سەر گوندی بوون كو

دبوونە ٢٠ کەس، نها ژبەر کێم خزمەتگوزاریان ٥ مال ٣٥ کەس ژ سەرجەمێ خەلکێ گوندی کو دبنە ٥١٧ سەرۆکخێزان ل گوندی دژین.

ئەڤ گوندە ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٩ێ هاتییە خرابکرن و دوبارە ل سالێن ١٩٦٤، ١٩٧٠ێ هاتییە ئاڤاکرن ، سالا ١٩٨٥ێ هاتییە بەردان و سالا ١٩٨٨ێ ب ئێکجاری هاتییە خرابکرن، تا جارەکادی ل سالا ١٩٩٢ێ ئاڤەدانبوویەڤە، لێ سالا ١٩٩٩ێ ژ ئەگەرێ شەرێ ناڤخۆ هاتە بەردان و سالا ٢٠١٢ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە و نها ئاڤەدانە.

### شوینوارێن گوندی

ژ شوینوارێن گوندی کەلا شەمس، دو ناوسك ل رەخ کەلایێ، جۆیا کەڤری کو د کەڤری را بۆ کەلێ هاتییە راکێشان، کەلا سەید ئیبراهیم.

### زێدەرێن ئاڤێ:

ڤی گوندی چەند کانی لێ هەنە، وەکی کانی خزینکێ، کانییا گەرمك، کانییا نزاری، کانییا جۆکا کرکا، کانی زەرکێ، کانییا سوریا، کانییا هویتینکێ، کانییا دێرکێ، کانییا گەرماڤێ، سەروکانی، کانییا چەمێ شێخ، کانییا پالێ سماقۆکێ، کانییا پالی، کانییا چەمکان، جۆیا کانی خزینکێ، جۆیا سەروکانی، جۆکا قەسیلێ، جۆکا نزاری، جۆیا گرکا، جۆیا کانی زەرکێ، جۆیا زەڤیا بەری، جۆیا سوریا.

### جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:

کیریێ رمێ، خزینکێ زۆمە، چەند شکەفت وەکی شکەفتا خزینکێ، شکەفتا دودەر، شکەفتا پەنجەرە، شکەفتا کورکی، شکەفتا دۆلێ، شکەفتا تویمەس. شکەفتا دیچەمکێ، شکەفتا ریسێ، شکەفتا گوندی کو شکەفتەکە ل سالا ١٩٦٩ێ کوشتارەکا تەبایی ژ لایێ حکۆمەتا عیراقی تێدا هاتە ئەنجامدان و ٧٨ کەس تێدا سۆتن کو دبێژنێ شەهیدێن شکەفتا دەکان. هەروەسان چەند نەهال ژی ل گوندی هەنە، وەکی نەهالێن گەلیێ تاری، دۆلێ، شکەفتا دودەر، دەریا دەوارا، گەلیێ مەلك ئاغا، دۆلا دێرکێ، چالا بەری، دەریا بەری، دەریکێ جانێ.

### زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا دەرامەتێ بوو، مینا دار و بارێ فێقی و گوندەکێ ب زەیتوونان ناڤدارە، هەروەسان پەز و گارەش ژی دهاتنە ب خودانکرن. نها پتر ل سەر مووچەیا و کاسبکاریێ یە، ژبلی کو هندەك چاندنێ ژی دکەن، ب تایبەت چاندنا زەیتوونان دار و بارێ فێقی.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا ١٩٧١ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، نها خزمەتگوزارییێن گوندی د بێ سەروبەرن و تنێ جۆیەکا ئاڤێ ل سالا ٢٠١٣ێ بۆ گوندی هاتییە کونکریتکرن و کارەب ژی ل هەمان سال گەهشتییە گوندی[١٦٤].

## گوندێ خورتا مەزن

ب دووراتییا ٢٧کم دکەڤیتە رۆژهەلاتێ ئەتریش. ناڤێ گوندی ژ زاخا عەردێ وی هاتییە کو عەردەکێ لاوە و بێ خورتە بۆ چاندنێ و ناڤ ژ وێ خورتییا عەردی هاتییە. رووبەرێ گوندی ٢٥٢٢ دۆنەمن، ژ وانان ٢٠ دۆنەم دێمی، ٧٠ دۆنەم ئاڤی، ٢٠٢٧ دۆنەم کەڤرین، ٣٢٠ دۆنەم پاوان، ١٥ دۆنەم رەزێن دێم، ٧٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ٦٠٠ پەز و بزن لێ هەنە[١٦٥].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن چەم ربەتێ و بێریژکێ و مسەلەکا.

**باشووری:** گوندێن گڤارا و ستنکینێ و مێرگەبی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خورتا بچویك.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ سەرکاف.

**پێکهاتا گوندی:**

گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ پێنج بنەمالان بنەمالا حسێنی، بنەمالا ئومەری، بنەمالا گەردی، بنەمالا بەنانی، بنەمالا زنباری پێکهاتیە. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ١٨٨ کەس ل ڤی گوندی دژیان(١٦٦). سالا ١٩٩٨ێ دەمێ گوند ژ بەر کاودانێ ناڤخۆ هاتیە خرابکرن ٣٣ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ١٧٠ کەس، نها گوند بێ چۆلە و کەس لێ ناژیت و خەلکێ وی یێ رەسەن ل کانی کولێ و بیباڤا و قەسرۆکێ و موقبلێ و ئاکرێ و دهۆکێ دژین.

ئەڤ گوندە ل سالێن ١٩٦٣، ١٩٦٩ێ هاتیە خرابکرن و دوبارە ل سالێن ١٩٦٤، ١٩٧٠ێ هاتیە ئاڤاکرن ڤە، سالا ١٩٨٨ێ کەتیە بەر هەوا ئەنفالان و ب ئێکجاری هاتیە خرابکرن، تا جارەکادی ل سالا ١٩٩١ێ ئاڤەدانبوویەڤە، لێ سالا ١٩٩٨ێ ژ ئەگەرێ شەرێ ناڤخۆ هاتە بەردان و تا نها نە هاتیە ئاڤاکرن ڤە.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ڤی گوندی چەند کانی لێ هەنە، وەکی کانیکا عەباسی، کانی بەراسکێ، کانیا تیکەرێ، جۆیا نزارا، جۆیا دو ئاڤا، جۆیا بەرۆژی.

**جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:**

ڤی گوندی مەرقەدەك ب ناڤێ مەرقەدێ پیر ئەسما لێ هەیە، هەروەسان گەلیێ گێرێنا، کەلەگەی خورت، بەرێ شەیتانی، بەرێ کەزانێ. هەروەسان چەند شکەفت ژێ، وەکی شکەفتا گەرمك، شکەفتا دودەر، شکەفتا پێسا، شکەفتا هۆلانێ، شکەفتا کۆترا، شکەفتا گلکەنێ. گەلیێ تەوکێ، گەلی خارکی، گەلی گێرینا، گەلیێ شکەفتە سۆرێ، گەلیکی، دۆلا فەق عەلی.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا دار و بارێ فێقی بوو، مینا هژیر و هنار و تری و چاندنا زەیتوون و برنج و تویتنێ. هەروەسان تەرش و کەوال ب خوداندکرن و مفا ژ سرۆشتی و دار و بارێ وی ژی وەردگرتن. نها ژی پتر ل سەر مووچەیا و کاسبکاریێ یە، هندەك چاندنێ ژی دکەن، تایبەت چاندنا دەرامەتێ و دار و بارێ فێقی و زەیتوونان و خودانکرنا تەرش و کەوالی و کارەشان.

**خزمەتگوزاریێن گوندی:**

ڤی گوندی چ خزمەتگوزاری لێ نەهاتینە دروستکرن، تنێ مزکەفت نەبیت کو ل سالا ١٩٩٧ێ هاتبوو ئاڤاکرن(١٦٧).

## گوندێ بەربیر

ب دووراتیا ٦کم دکەڤیتە باشوورێ رۆژئاڤایێ ئەتریش. رووبەرێ عەردێ گوندی ٢١٩٧ دۆنەمن، ژ وانان ٣٠١ دۆنەم دێمی، ١٨ دۆنەم ئاڤی، ١٦٢٠ دۆنەم پاوان، ٢٤٦ دۆنەم رەزێن دێم، ١٢ دۆنەم رەزێن ئاڤی.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ بێکەهە.

**باشووری:** شێخادی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ شکەفتهندیا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مامزدینا.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند ژ عەشیرەتا مزووری نە، ژ چوار بنەمالان بنەمالا عەبو عەیشا، بنەمالا عەلو ئاما، بنەمالا جادو، بنەمالا میرانێ پێکهاتیە. دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٥٧ێ ٢٥٥ کەس ل بەربیر ژووری و ٢٩ کەس ل بەربیر ژێری دژیان(١٦٨). سالا ١٩٧٥ێ دەمێ گوند ژ لایێ رژێمێ ڤە هاتیەخرابکرن ١٧ مال ل گوندی بوون دبوونە ٨٥ کەس و نها کەس سەر گوندی ناژیت و سەرجەمێ خەلکێ گوندی نها دگەهنە ٣٥٠ سەرۆکخێزانان کو پتریا وان ل شێخان و دهۆکێ دژین.

ئەڤ گوندە سالا ١٩٦٣ێ هاتییەخرابکرن و سالا ١٩٧٤ێ جارەکادی هاتییەئاڤاکرن ڤە، سالا ١٩٧٥ێ دیسان هاتییەخرابکرن و پشتی هاتییە ئاڤاکرن ڤە جارەکادی کەتییە بەر هەوێن ئەنفالان و ئێدی پشتی هینگێ گوند نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە.

**زێدەرێن ئاڤێ:**

گوندی چەند کانی لێ هەنە، وەکی کانیا گوندی، کانیا موقل، کانیا حەجەجو،

**جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:**

گوندی جهەك وەکی زۆم ب ناڤێ بەرۆژ لێ هەیە. دگەل چەند شکەفتان وەك: شکەفتا زەندی خۆرا، شکەفتا مەزن، شکەفتا ئەجنا، شکەفتا خەمێ. ژبلی گۆرستانا ئێزدییا، گۆڕێ شێخ خالد، گەلیێ رەش.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا دەرامەتێ مینا گەنمی و جەهی و نۆك و تری و چێکرنا بیستانان بوو، هەروەسان مفا ژ سرۆشتی و دار و بارێ وی ژی وەردگرتن. نها ژی خەلکێ وی ب گشتی پتر ل سەر مووچەیا و کاسبکاریێ یە، هەژی ئاماژێ یە کو ڤی گوندی بیرەکا نەفتێ لێ دەرکەتییە کو ژ لایێ کومپانیا گولف کیستون ڤە هاتییە کۆلان.

هەلبەت چونکی ئەڤ گوندە یێ چۆلە چ خزمەتگوزاری بۆ گوندی نەهاتینە کۆلان، بۆ زانین خواندنگەهـ ل سالا ١٩٥٧ێ بۆ ئێکەم جار ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن(١٦٩).

## گوندێ بن گەلی

گوند دکەڤیتە دووراتییا ١٧کم باشوورێ ئەتریش و گەلیێ لالش و چونکی گوند دکەڤیتە بن گەلیێ لالش، لەوما گوندی ب بن گەلی ناڤکرینە. رووبەرێ عەردێ گوندی ١٨١٦ دۆنەمن، ژ وانان ٨٢٠ دۆنەم دێمی، ٣٢٠ دۆنەم ئاڤی، ٦٧٦ دۆنەم پاوان، هەروەسان ١٢٨٠ پەز و بزن لێ هەنە.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ مغارا شەرەفا.

**باشووری،** سنوورێ قەزا شێخان.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ مۆسەکا وەقف.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ گەلی خودێدا.

**پێکهاتا گوندی:**

گوندی ژ عەشیرەتا مزووری نە، پێکهاتییە ژ ئێك بنەمال ب ناڤێ مالباتا حەسەن محەمەد سەعید. سالا ١٩٧٤ێ دەمێ گوند ژ لایێ رژێمێ ڤە هاتییە خرابکرن ١٠ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٥٠ کەس، نها گوند چۆلە و کەس لێ ناژیت.

ئەڤ گوندە ل دەسپێکا شۆڕشا کوردستانێ سالا ١٩٦١ێ هاتییە بەردان و سۆتن و پشتی پێکهاتنا ئادارا ١٩٧٠ێ هاتییەڤە ئاڤاکرن، سالا ١٩٧٥ێ جارەکادی هاتییە بەردان و سۆتن و تا نها نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە.

**جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:**

نەها ئاشی، چەند شکەفت، وەکی شکەفتا سەعید، شکەفتا پەزی، شکەفتا دەرێ گەلی. مەرقەدێ یسف بیهاد یسفیا. کانیێن گوندی ژی هەمی هشك بووینە.

**زێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ژین و ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی و برنجی و کونجیا و خودانکرنا تەرش و کەوالی و چێلان بوو. نها ژی پتر ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی یە(١٧٠).

## گوندێ میتکا خارێ

ئەڤ گوند دکەڤیتە دووراتییا ١٧کم رۆژهەلاتێ ناڤەندا ئەتریش. ناڤێ گوندی مینا گوندێ میتکا سەری ژ ناڤێ رووەکەکی کو مشە مینا تراشان ب ناڤێ میتك ل دەڤەرێ هەیە و ڤێقییەك پێڤە

دهێت و دهێته خوارن ژی و دو گوند ب ڤی ناڤی میتکا سەری و میتکا خارێ هەنە. رووبەرێ عەردێ گوندی ۲۱۳۲ دۆنەمن، ژ وانان ٤٤٥ دۆنەم دێمی، ۳٤ دۆنەم ئاڤی، ٥٤۹ دۆنەم کەڤرین، ۱۰۸۳ دۆنەم پاوان، ۲۱ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەروەسان ۲٥۹۰ پەز و بزن لێ هەنە[١٧١].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێن مێرگەبی و ستنگین.

**باشووری:** گوندێن کەڤرەسۆر و کوپیێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کانی کولێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ میتکا سەری.

### پێکهاتا گوندی:

گوند ژ عەشیرەتا شەرەفانی نە، پێکهاتییە ژ ئێك بنەمال ب ناڤێ بنەمالا گێندەلی. ل دووڤ سەرژمێریا سالا ۱۹٥۷ێ میتك ۳۰ کەس ل ڤی گوندی دژیان[١٧٢].

سالا ۱۹٦۸ێ دەمێ گوند هاتییە خرابکرن سێ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ۱۷ کەس و نها ۱۹ مال ل سەر گوندی دژین کو دبنە ۱۰۷ کەس.

ئەڤ گوندە ل سالێن ۱۹٦۹، ۱۹٦۸ێ هاتییەخرابکرن و دوبارە ل سالێن ۱۹٦٤، ۱۹۷۰ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە، سالا ۱۹۷٥ێ جارەکادی هاتەخرابکرن و سالا ۱۹۹۲ێ جارەکادی ئاڤەدانبوویەڤە، لێ نە ل جهێ کەڤن، بەلکی ۳کم ژ گوندێ کەڤن هاتینە خوارێ و هاتینە سەر جادا سەرەکی و گوند تا نها ئاڤەدانە.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ڤی گوندی دو کانی لێ هەنە، ئەو ژی کانییا مامژلێ، کانییا گوندێ قەدیم، جۆیا گوندی، رووبارێ نێردۆش.

### جهێن بەرنیاس و ناڤدار ل گوندی:

شیقە تیبێ، شیڤا شیقە تیبێ، شیڤا گوندێ قەدیم.

### ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:

ژیارا خەلکێ گوندی ل بەرێ ل سەر چاندنا گەنمی و برنجی و خودانکرنا تەرش و کەوالی و گارەشان بوو و گوندەکێ ب ناڤ و دەنگە ب خودانکرنا پەزی و گارەشان، نها ژی پتر ل سەر مووچەیا و کاسبکارێ یە، ژبلی کو هندەك چاندنێ دکەن و پەزی ب خودان دکەن.

### خزمەتگوزارییێن گوندی:

چەند خزمەتگوزاری بۆ ڤی گوندی هاتینە دروستکرن، وەکی چێکرنا پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا ۱۹۹۷ێ، کۆلانا بیرەکا ئیرتیوازی و چێکرنا مزگەفتەکێ ل سالا ۲۰۱۰ێ، گەهاندنا کارەبێ ل سالا ۲۰۰۸ێ، ڤەکرنا جاددەیێ ل سالا ۲۰۱۱ێ[١٧٣]. دوا پێداچوون ۲۰۱٦/۱۲/۱۱

## گوندێ شریناڤا:

ئەڤ گوندە نها بێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە سەر ب گوندێ رکاڤا. دکەڤیتە دووراتییا ۹کم رۆژهەلاتا ناڤەندا ئەتریش، ناڤێ وی بێ ژ وێ چەندێ هاتی کو ئاڤا وی گەلەکا خۆش و شرینە.

رووبەرێ عەردێ گوندی ۳۱۲ دۆنەمن، ژ وانان ۲۰۷ دۆنەم دێمی، ۸۰ دۆنەم ئاڤی، ۲٥ دۆنەم رەزێن دێم[١٧٤].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ هەرماش.

**باشووری:** گوندێ نزیرکێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بلان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ رکاڤا.

### پێکهاتا گوندی:

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا ئیسماعیل، بنەمالا شەعبان سەدیق، بنەمالا عومەر پێکهاتییە.

سالا ١٩٧٤ێ گوند هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ٨ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٢٥ کەس.

**جهێن ناڤدار ل گوندی:**

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی: مشایخێ مەرقەدێ شێخ بەکر و نهالا شکێری و نهالا شیڤە ریلکێ.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ڤی گوندی کانییەك ژی کانی ل گوندی ب ناڤێ ئاڤا کانییا شرین هەیە، هەر وەسان رووبارێ بلان دناڤ گوندی را دبووریت، و سالا ٢٠٠٧ێ برکەکا ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن. ژیانا خەلکێ وی ل بەرێ ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، نها ژی پتر ل سەر چاندنێ یە[١٧٥].

## گوندێ نزیرکێ:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە سەر ب گوندێ ڕکاڤا. دکەڤیتە دووراتییا ١٥کم باشووری رۆژهەلاتا ناڤەندا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٦٣٣ دۆنەمن، ژ وانان ٦٤ دۆنەم دێمی، ٦٢ دۆنەم ئاڤی، ٤٥٢ دۆنەم کەڤرین، ١٥ دۆنەم رەزێن دێم، ٤٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەر وەسان ١٨٠ پەز و بزن و ٣٥ چێل لێ هەنە[١٧٦].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێن ڕکاڤا و شریناڤا و بادیناڤا.

**باشووری،** گوندێ کۆخیێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن گبێ و بلان.

**رۆژئاڤایی،** کەلی قەسرۆك.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، و پێکهاتییە ژ ئێك بنەمال.

سالا ١٩٦٣ێ گوند هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ٣ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٢٥ کەس.

**جهێن ناڤدار ل گوندی:**

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی: مەزارێ شێخ محەمەد، مەزارێ خویشك و برا، چوار ناوسك ل دەوروبەرێن گوندی، گرێ خرابەی، زەڤیا عەلی چیایێ نزاری، رووبارێ بۆری.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی و چاندنا باهیڤ و تری و برنج و... بوو، نها ژی ل سەر چاندن و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە.

## گوندێ هارینا:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە، خەلکێ وی یێ رەسەن ل قەسرۆك و چرە و ئاڤریڤا دژین. دکەڤیتە دووراتییا ٨کم رۆژهەلاتا باشووری ناڤەندا ئەتریش، ناڤێ وی یێ ژ وێ چەندێ هاتی کو مەزارەك ل ڤی گوندی هەیە و خەلکی هار و دین دبرنە سەر ڤی مەزاری و ژ بەر هندێ ب هارینا، یان ب عەرەبی ب هارۆنا دهێتە ب ناڤکرن دهێتە نیاسین.

رووبەرێ عەردێ گوندی ١٣٣٦ دۆنەمن، ژ وانان ٢٠٥ دۆنەم ئاڤی، ١١١٨ دۆنەم پاوان، ١٣ دۆنەم رەزێن ئاڤی[١٧٧].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری،** گوندێ شەهیا.

**باشووری،** گوندێ خەنس.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ کۆخیا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ مغارا.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، پێکهاتییە ژ بنەمالا خدرێ ئیبراهیم.

سالا ١٩٧٥ێ گوند هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ٨ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٦٥ کەس.

**جهێن ناڤدار ل گوندی:**

ئاغای، شكەفتا شیڤا قەنتەرێ، شكەفتا دەحلێ ب زەیتێن، شكەفتا شیڤا خرابەی، نهالا كیفتیا و نهالا خرابەی.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ڤی گوندی چەند كانی لێ هەنە، وەكی كانیا خرابەی، كانیا گوندی، كانی زەتین، ژ بلی رووبارێ گوملی و جۆیا چەمی.

سالا ١٩٧٥ێ بۆ جارا دووێ ئەڤ گوندە هاتییە خرابكرن و پشتی هینگێ ئاڤەدان نەبوویەڤە.

ژیانا خەلكێ وی ل بەرێ پتر ل سەر چاندنا دەرامەتی بوو و نها ژی هەمان كاری دكەن، زێدەباری كو گەلەك ژ خەلكێ وی مۆچەخۆرن ژی[١٧٨].

## گوندێ گەلیك:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ كەرتەكێ چاندنێ یە و خەلكێ وی یێ رەسەن ل گوندێن شەهیا و مغارا و خەنس و ناڤەندا شێخان دژین، گوند دكەڤیتە دووراتیا ٢٠كم باشوورێ ناڤەندا ئەتریش، ناڤێ وی یێ ژ وێ چەندێ هاتی كو گەلەك گەلی ل گوندی هەنە.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٤٣٦ دۆنەمن، ژ وانان ١٨٥٣ دۆنەم دێمی، ٥٥٥ دۆنەم پاوان، ١٣ دۆنەم رەزێن دێم، ١٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەر وەسان ٩٥٠ پەز و بزن لێ هەنە[١٧٩].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ شەهیا.

**باشووری،** گوندێ باسفنێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ خەنس و داربەستا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئاڤریڤا.

### پێكهاتا گوندی:

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، ژ سێ بنەمالان ب ناڤێن بنەمالا ئەمین خنسی، بنەمالا حەربی شەهی، بنەمالا لەزگین مغاری پێكهاتییە.

سالا ١٩٢٣ێ گوند هاتییە خرابكرن و ل وی دەمی ٥ مال ل سەر گوندی بوون كو دبوونە ٢١ كەس.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ڤی گوندی كانییەك ب ناڤێ كانیا گەلیكی لێ هەیە[١٨٠].

## گوندێ گبێ:

گوندەكێ عەشیرەتا مزووریانە و نها یێ چۆلە و تنێ كەرتەكێ چاندنێ یە، خەلكێ وی ل شێخكا و قەسرۆك و شێخان دژین. دكەڤیتە بنییا چیایێ جابانكی ب دووراتییا ٨كم ژ ناڤەندا سەنتەرێ ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٧١٠ دۆنەمن، ژ وانان ٢٧٢ دۆنەم دێمی، ٥٨٠ دۆنەم ئاڤی، ٥٣٥ دۆنەم كەڤرین، ١٢٩٠ دۆنەم پاوان، ٣ دۆنەم رەزێن دێم، ٣٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی[١٨١].

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ بلان.

**باشووری،** گوندێ كۆخیێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ باڤكێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ رِكاڤا.

سالا ١٩٦٩ێ گوند هاتییە خرابكرن و ل وی دەمی ٢٠ مال ل سەر گوندی بوون كو دبوونە ٥٠ كەس.

ئەڤ گوندە دو جاران ل سالێن ١٩٦٩، ١٩٧٥ێ هاتییە خرابكرن[١٨٢].

## گوندێ بێشار:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ كەرتەكێ چاندنێ یە، خەلكێ وی یێ رەسەن ل قەسرۆك و شێخان دژین، گوند دكەڤیتە بنییا چیایێ جابانكی ل دەڤەرا مزووریان ب دووراتییا ١١كم ژ سەنتەرێ ناحیا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ١٠٤٧ دۆنەمن، ژ وانان ٥٨٨

دۆنەم دێمی، ٣ دۆنەم ئاڤی، ٢٤٣ دۆنەم پاوان، ٢١٣ دۆنەم رەزێن دێم[١٨٣].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ تلان تلە

**باشووری:** گوندێ شیخکا

**رۆژهەلاتی:** گوندێ توسب

**رۆژئاڤایی:** گوندێ باڤکێ.

**پێکهاتا گوندی:**

سالا ١٩٢٠ێ هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ٧مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٢٥ کەس[١٨٤].

## گوندێ پیرامادین:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە سەر ب گوندێ میتکا سەری ڤەیە، خەلکێ رەسەنێ گوندی ل قەسرۆکێ و گوندێ میتکێ دژین. گوند دکەڤیتە دووراتییا ٢٠کم رۆژهەلاتا ناڤەندا ئەتریش، ناڤێ گوندی ژ ناڤێ خودانێ گوندی پیرێ مام دین هاتییە و ناڤ هاتییە سڤککرن و بوویە پیرامادین.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٥٥ دۆنەمن، ژ وانان ٢٤٣ دۆنەم دێمی، ١٦ دۆنەم ئاڤی، ٥ دۆنەم کەڤرین[١٨٥].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ ستنکین.

**باشووری:** گوندێ کەڤرەسۆر.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ میتکێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ میتکا خارێ.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند سەر ب عەشیرەتا شەرەفانە، و پێکهاتییە ژ بنەمالا عیسا میتکی.

سالا ١٩٤٠ێ گوند هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ٧ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٣١ کەس.

**جهێن ناڤدار ل گوندی:**

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی: نهالا کەندی و نهالا پیرامادین.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ڤی گوندی دو کانی ب ناڤێن کانییا پیرامادین و کانییا ستی مەهی لێ هەنە.

ژیانا خەلکێ وی ل بەرێ ل سەر چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی بوو، نها ژی پتر ل سەر چاندنێ و مووچەیانە[١٨٦].

## گوندێ بێدارکێ:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە، نها خەلکێ رەسەنێ گوندی ل گوندێ شەهیا و ناڤەندا ئەتریش و شێخان دژین. گوند دکەڤیتە دووراتییا ٦کم باشووری رۆژهەلاتا سەنتەرێ ئەتریش، ناڤێ وی یێ هاتی کو یێ ل جهەکێ راست و بێ دار و بار.

رووبەرێ عەردێ گوندی ١٢٥٤ دۆنەمن، ژ وانان ٢٥٠ دۆنەم دێمی، ٣٥ دۆنەم ئاڤی، ١٥٥ دۆنەم کەڤرین، ٦٧٥ دۆنەم پاوان، ١١٤ دۆنەم رەزێن دێم، ٢٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی[١٨٧].

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ ئەتریش.

**باشووری:** گوندێن شەهیا و مکێرس.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ دیرەخترا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بلدێشا.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، پێکهاتییە ژ بنەمالا عەبدولرحمان شەهی، یان دبێژنێ بنەمالا قەسرێ.

بۆ جارا ئێکێ ئەڤ گوندە ل سالا ١٩٦٣ێ هاتییە خرابکرن و پشتی رێککەفتنا ١١ئادارا سالا ١٩٧٠ێ

جارەکادی گوند ئاڤابوویەڤە، لێ دوبارە ل سالا ١٩٧٥ێ هاتییە خرابکرن و ل سالا ١٩٨٣ێ هاتییە ئاڤاکرن، و پشتی ل سالا ١٩٨٧ێ هاتییە خرابکرن، ئێدی گوند نەهاتییە ئاڤاکرن ڤە و ل وی دەمی ١٠ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٥٣ کەس.

## جهێن ناڤدار ل گوندی:

زۆما گەلیێ بێدارکێ، کانییا تویێ و کانییا کەزانێ[١٨٨].

## گوندێ زێریێ:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە و دارستانێن کاژا لێ هەنە، دکەڤیتە دووراتییا ٦کم ژ ناڤەندا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٥٨٥ دۆنەمن، ژ وانان ١٢٢ دۆنەم دێمی، ١١١ دۆنەم ئاڤی، ١٤١٠ دۆنەم کەڤرین، ٩٠٧ دۆنەم پاوان، ١٥ دۆنەم رەزێن دێم، ٢٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی[١٨٩].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ رەتکێ.

**باشووری،** گوندێ ئازەخ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گوندێن شلیا و ملبرکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بلکێف.

## پێکهاتا جڤاکی:

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، پێکهاتییە ژ چەند ئویجاخان، وەکی بنەمالا شێخا، ئویجاخا زێباریا، ئویجاخا نبێ زادا، ئویجاخا رەشێ.

ئەڤ گوندە چەند جاران هاتییە خرابکرن و دەمێ ل سالا ١٩٦١ێ هاتییە خرابکرن ١٠مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٤٠ کەس،، دیسان گوند ل سالێن ١٩٧٥، ١٩٨٨ێ هاتییە خرابکرن ڤە و پشتی هەر جارەکا هاتییە خرابکرن، هاتییە ئاڤاکرن ڤە، تا داوی جار ئێدی مایە چۆل.

## جهێن ناڤدار ل گوندی:

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی: شکەفتا زیرێ کو یا مەزنە و تەرش و کەوال تێڤە دهاتە حەواندن، جویا سەروکانیێ و رووبارێ رێ گەرمە[١٩٠].

## گوندێ بلدێشا:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە و ل بیرا کەسەکێ نینە یێ ئاڤا و خەلکێ وی ئاکنجیێن ئەتریشن، گوند دکەڤیتە دەشتا ئەتریش ب دووراتییا ٢کم ژ سەنتەرێ ناڤەندا ناحیێ.

رووبەرێ عەردێ گوندی ١٩١٣ دۆنەمن، ژ وانان ٩٦٢ دۆنەم دێمی، ١٠ دۆنەم ئاڤی، ٩٣٠ دۆنەم کەڤرین، ١١ دۆنەم رەزێن دێم، هەر وەسان ٣٦٠٠ پەز و بزن و ٢٥ چێل لێ هەنە[١٩١].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری،** سونتەرێ ناحیا ئەتریش.

**باشووری،** گوندێن مکێرس و شەهیا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ بێدارکێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێن کەریماڤا و ئاساس.

## پێکهاتا گوندی:

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە و پێکهاتییە ژ حەفت بنەمالان[١٩٢].

## گوندێ بێلکێف:

یان ب عەرەبی ب بلکیب دهێتە ناڤکرن، جهەکێ گوزارییە و نها یێ چۆلە، دکەڤیتە دووراتییا ٨کم باکوورێ ناڤەندا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ١٥٦٨ دۆنەمن، ژ وانان ٣٥ دۆنەم دێمی، ٧٧ دۆنەم ئاڤی، ١٣٣٧ دۆنەم کەڤرین، ٤٩ دۆنەم رەزێن دێم، ٧٠ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەر وەسان ٢٥٠ پەز و بزن لێ هەنە[١٩٣].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ نسرا.

**باشووری،** ناڤەندا ئەتریش.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ زێرێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ دەحلێنەوێ.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، پێکهاتییە ژ بنەمالێن بنەمالا یوسف نسری، بنەمالا سەلیم حەجی جندی، بنەمالا حەجی عەلی، بنەمالا حەجی یوسف، بنەمالا گولیا، بنەمالا حەسەن سەلیم

سالا ١٩٦٢ێ گوند ژ لایێ رژێما عیراقی ڤە هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ٨ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٤٨ کەس.

**جهێن ناڤدار ل گوندی:**

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی: گەلیێ قیامەتێ کو جهەکێ گوزاریە، سەر کاڤلا، روی گەرمی، شکەفتۆك.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

ڤی گوندی کانییا مالا گولیا لێ هەیە، هەر وەسان جۆیا سەر کاڤلا و جۆیا ناڤێ و جۆیا گرکێ ئاشا و جۆیا روی گەرمی لێ هەنە، ژ بلی رووبارێ بێلکێفێ و رووبارێ روی گەرمی. هەر وەسان کارەب و چەند خانیێن گوزاری یێن کەسۆکی لێ هەنە[١٩٤].

## گوندێ باتڤرێ:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە و خەلکێ وی خۆ ب ئەتریشی دزانن. دکەڤیتە دووراتییا ٣کم باشوورێ ناڤەندا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ١٣٠٨ دۆنەمن، ژ وانان ٩٣٣ دۆنەم دێمی، ٢١٨ دۆنەم ئاڤی، ١٥٧ دۆنەم پاوان[١٩٥].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ کەریم ئاڤا.

**باشووری،** گوندێ مکێرس.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ تلدێڤ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئاساس.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە و پێکهاتییە ژ ئێك بنەمال.

**جهێن ناڤدار ل گوندی:**

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی: گرێ زەمبیل فرۆش و گرێ بیداری[١٩٦].

## گوندێ بەستاڤا:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە، دکەڤیتە دووراتییا ٨کم رۆژئاڤایا سەنتەرێ ئەتریش، ناڤێ وی یێ ژ وێ چەندێ هاتی کو گوند دکەڤیتە سەر رووباری و هەمی بەستن کو ژ ئەگەرێ ئاڤێ هاتینە دروستکرن.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٠٩٢ دۆنەمن، ژ وانان ٨٨١ دۆنەم دێمی، ٦٠ دۆنەم ئاڤی، ١١٣٦ دۆنەم کەڤرین، ١٥ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەر وەسان ٢١٠٠ پەز و بزن لێ هەنە[١٩٧].

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ کەلێنیێ.

**باشووری،** گوندێ ئاساس.

**رۆژهەلاتی،** ناڤەندا ئەتریش.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئالۆکا.

**پێکهاتا گوندی:**

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، پیکهاتییە ژ مالباتێن یونس سالح و مەحمود ئوسمان و تاهر یونس.

سالا ١٩٧٤ێ گوند هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ١٠ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٧٠ کەس. هەر وەسان ل سالا ١٩٨٨ێ بۆ داوی جار هاتییە خرابکرن و پشتی سالا ١٩٩١ێ شەش مال ل گوندی ل بن کەپر و کۆخا ئاکنجیبوون ب وێ ئنیەتێ کو گوندێ وان دێ هێتەئاڤاکرن، لێ گوند بێی وان ل جهەکێ دی ب ناڤێ گرکێ بهاری هاتە ئاڤاکرن کو دکەڤیتە سەر ئاقارێ گوندێ کەلێنیێ و چ پەیوەندی ب گوندێ بەستاڤا نینە و نها چەند خانیەك دهێنە ئاڤاکرن و جۆیەك هاتییە کونکریتکرن.

## جهێن ناڤدار ل گوندی:

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی: بەستافکێ، بانی مەیدانکێ، گرێ خرابەی، شکەفتا مەندێ، ناوسك، کەلیێ ب لەڤەن، کەلیێ هنارێ، نهالا بانی مەیدانکێ.

## ژێدەرێن ئاڤێ:

ڤی گوندی چەند کانی هەنە، وەکی کانییا مسەلمێ، کانییا شکەفتا مەندێ، کانی سرکێ، هەر وەسان رووبارێ بەستاڤا و جۆیا بەرۆژی و جۆیا نزاری[١٩٨].

# گوندێ خەتارێ:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە، خەلکێ وی یێ رەسەن ل گوندێ مەلکیشان قەسرۆکێ دژین، گوند دکەڤیتە دووراتیا ١١کم رۆژهەلاتا ناڤەندا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ١٨٦٦ دۆنەمن، ژ وانان ٦٢٠ دۆنەم دێمی، ٢٠٩ دۆنەم ئاڤی، ٨٨٩ دۆنەم کەڤرین، ١٢٣ دۆنەم پاوان، ٢٥ دۆنەم رەزێن دێم[١٩٩].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ مێرسیدا.

**باشووری:** گوندێ مرێبا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ مەلکیشان.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ کێفسن.

## پێکهاتا گوندی:

گوند سەر ب عەشیرەتا شەرەفا ڤەنە، پێکهاتییە ژ بنەمالا تەمەری.

سالا ١٩٧٥ێ گوند هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ٧ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٢٨ کەس.

ڤی گوندی کانییا خەتارێ و جۆیا خەتارێ لێ هەنە[٢٠٠].

# گوندێ کێفسن:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە، خەلکێ وی یێ رەسەن نها ل گوندێ مەلکیشان و قەسرۆکێ دئاکنجینە، گوند دکەڤیتە دووراتیا ١٢کم رۆژهەلاتا ناڤەندا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ١٢٠٥ دۆنەمن، ژ وانان ٤١٩ دۆنەم دێمی، ١٠٦ دۆنەم ئاڤی، ٦٢٣ دۆنەم کەڤرین، ٣ دۆنەم رەزێن دێم، ٤ دۆنەم رەزێن ئاڤی. هەر وەسان ١٢٠٠ پەز و بزن و ٣٥ چێل لێ هەنە[٢٠١].

## سنوورێن گوندی:

**باکووری:** گوندێ بیرێ.

**باشووری:** گوندێ مرێبا.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ خەتارێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ توسب.

## پێکهاتا گوندی:

گوند سەر ب عەشیرەتا شەرەفانڤەیە، پێکهاتییە ژ بنەمالا تەمەری.

سالا ١٩٦٢ێ گوند هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ٤ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٢١ کەس.

ژێدەرێن ئاڤێ ژی کانی و جۆیا کێفسن لێ هەنە[٢٠٢].

## گوندێ دێریشکی:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ یە سە، دکەڤیتە دووراتییا ١٠کم ژ ناڤەندا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٢٢١٦ دۆنەمن، ژ وانان ٩٨ دۆنەم دێمی، ١٧ دۆنەم ئاڤی، ٢١٠١ دۆنەم کەڤرین[٢٠٣].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ سۆریا صۆریا.

**باشووری،** گوندێ بێدویل.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ کەڤنە کەلێ هەسنەکا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ بێنارینکێ.

### پێکهاتا گوندی:

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، پێکهاتییە ژ بنەمالا نعمانێ زێرێ.

سالا ١٩٧٦ێ گوند هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی تنێ مالەك ل سەر گوندی بوو کو دبوونە ٧ کەس و پشتی ئاڤابوویەڤە داوی جار کەتییە بەر هەوا ئەنفالان.

### جهێن ناڤدار ل گوندی:

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی: دو ناوسك ل نێزیکی گوندی، زۆما سەر بیرکا، شکەفتا دەلێ، شکەفتا کۆترا، شکەفتا پیر خەلیلکی، شیڤا دێریشکی، نهالا حیجرێ، نهالا سەربیرکا، گرێ قەلیجکێ، کەڤرێ حساری، گرێ ب هەڤرست.

### ژێدەرێن ئاڤێ:

ڤی گوندی پێنج کانی وەکی ژێدەرێ ئاڤێ ل گوندی هەنە، ئەو ژی کانییا لەڤەنا، کانییا گوندی، کانییا زۆما، کانییا گولێ، کانییا قەرەمی[٢٠٤].

## گوندێ کول مام سینك:

ئەڤ گوندە نها کەرتەکێ چاندنێ یە، دکەڤیتە دووراتییا ١٥کم رۆژهەلاتا سەنتەرێ ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٤٥٨ دۆنەمن، ژ وانان ٩٧ دۆنەم دێمی، ٨ دۆنەم ئاڤی، ٣٥٣ دۆنەم پاوان[٢٠٥].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ توسب.

**باشووری،** گوندێ بیشار.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ کیفسن.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ باڤکی.

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە و بەری سەد سالان هاتییە بەردان و ل وی دەمی ٦ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە ٢٠ کەس.

### جهێن ناڤدار ل گوندی:

چەند جهێن دیار ل گوندی هەنە، وەکی: موغبەرا دارا چیچکا، کانییا دارا تویێ[٢٠٦].

## گوندێ کەریماڤا:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ، دکەڤیتە دووراتییا ٣کم باکوورێ ناڤەندا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ٢١٧٢ دۆنەمن، ژ وانان ١٠٨٩ دۆنەم دێمی، ٢٠ دۆنەم ئاڤی، ٥ دۆنەم کەڤرین، ١٠٤٩ دۆنەم رەزێن دێم، هەر وەسان ٢٣٥٠ پەز و بزن لێ هەنە[٢٠٧].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** ناڤەندا ئەتریش.

**باشووری،** گوندێ بێکەهـ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ باتڤرێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ ئاساس.

### پێکهاتا گوندی:

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، پێکهاتییە ژ سێ بنەمالان.

سالا ١٩٧٥ێ گوند هاتییە خرابکرن و ل وی دەمی ٢٠ مال ل سەر گوندی بوون کو دبوونە نێزیکی ١٠٠ کەسان و نها ژمارا وان دگەهیتە ٣٠٠ کەسان[٢٠٨].

## گوندێ ئاساس:

ئەڤ گوندە نها یێ چۆلە و تنێ کەرتەکێ چاندنێ، دکەڤیتە دووراتییا ٦کم رۆژهەلاتا ناڤەندا ئەتریش.

رووبەرێ عەردێ گوندی ١٥٩٥ دۆنەمن، ژ وانان ١٢٨٨ دۆنەم دێمی، ٢٩٢ دۆنەم ئاڤی، ١٥ دۆنەم کەڤرین، هەر وەسان ٢٨٩٠ پەز و بزن لێ هەنە[٢٠٩].

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ بەستاڤا.

**باشووری،** گوندێ بەرەتوین.

**رۆژهەلاتی،** گوندێن ئەتریش و کەریماڤا.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ نۆردیناڤا.

### پێکهاتا گوندی:

گوند سەر ب عەشیرەتا مزووریانڤەیە، پێکهاتییە ژ سێ بنەمالان.

ژمارا خەلکێ وی نها دگەهنە نێزیکی ٢٠٠ کەسان[٢١٠].

## گوندێ ئیسل جافر:

کەرتەکێ چاندنێ یە، رووبەرێ عەردێ گوندی ٩١٦ دۆنەمن، ژ وانان ١٥ دۆنەم دێمی، ٥ دۆنەم ئاڤی، ٥٠٠ دۆنەم کەڤرین، ٣٩٦ دۆنەم رەزێن دێم[٢١١].

## ژێدەر و پەراوێز:


١. پێزانین ژ هۆبا چاندنا ئەتریش بۆ سالا ٢٠١٦ هاتینە وەرگرتن.

٢. د. عەبدوللا غەفور، گوندەکانی باشووری کوردستان لە سەرژمێری دانیشتوانی عێراقدا- ١٩٥٧، چ٢، (هەولێر: ٢٠٠٥)، .... بپ٣٧.

٣. پێزانین ژ شێخ محسن عەبدولعەزیز، موختارێ گوندی هاتینە وەرگرتن.

٤. پێزانین ژ هۆبا چاندنا ئەتریش بۆ سالا ٢٠١٦ هاتینە وەرگرتن.

٥. د. عەبدوللا غەفور، گوندەکانی باشووری ....، بپ٣٦.

٦. پێزانین ژ محەمەد تاهر عزەت خان، موختارێ گوندی هاتینە وەرگرتن.

٧. د. عماد عبدالسلام رؤوف، المعجم التاریخی لامارە بهدینان، (اربیل: ٢٠١١)، ص ٨٩.

٨. پێزانین ژ هۆبا چاندنا ئەتریش بۆ سالا ٢٠١٦ هاتینە وەرگرتن.

٩. پێزانین ژ عسمەت عابد حاج عەبدال، پارێزەر، ئاکنجی ل دهۆکێ هاتینە وەرگرتن.

١٠. پێزانین ژ هۆبا چاندنا ئەتریش بۆ سالا ٢٠١٦ هاتینە وەرگرتن.

١١. د. عماد عبدالسلام رؤوف، المعجم التاریخی....، ص١٤٣.

١٢. د. عەبدوللا غەفور، گوندەکانی باشووری ....، بپ٣٧.

١٣. پێزانین ژ غازی حەجی مەلۆ، سەرۆك عەشیرەتێ مزووریان، سالح حەجی کەمال موختارێ گوندی هاتینە وەرگرتن.

١٤. د. عماد عبدالسلام رؤوف، المعجم التاریخی... ، ص ٣٧٠.

١٥. پێزانین ژ هۆبا چاندنا ئەتریش بۆ سالا ٢٠١٦ هاتینە وەرگرتن.

١٦. د. عەبدوللا غەفور، گوندەکانی باشووری ....، بپ٣٦.

# ناحيا قەسرۆكێ

محەمەد عارف تاتار - موسەدەق تۆڤی
خالد صالح

## لایێ جوگرافی:

ناحیا قەسرۆك ئێكە ژ ناحییێن سەر ب قەزا شێخان ڤە، دكەڤیتە رۆژهەلاتا سەنتەرێ قەزایێ ب دووراتییا (٢٦,٥کم)، بەری وێ بكەنە ناحیە، مرێبا ناڤەندا ناحیێ بوو،ناحیا مرێبا ل دووڤ مەرسومەكا كۆماری ل رۆژا ١١ حزیرانا ١٩٨٧ێ هاتەهەلوەشاندن[1]، پشتی سەرهلدانێ سەنتەرێ وێ دانانە كۆمەلگەها چرەی، كو بەری هینگێ حكۆمەتا عیراقێ ناحیا مرێبا ژ كارئێخست بوو و ل ١٩٩٦/٣/٦ێ سەر ژنوی ناحیە ل وێ دەڤەرێ ب ناڤێ ناحیا قەسرۆك و ل ناڤەندا گوندێ قەسرۆكێ هاتە دانان[2]، ئەڤ ناحیە دەڤەرەكا دەشتی یە دكەڤیتە ناڤبەرا رووبارێ خازری ل رۆژهەلاتی و رووبارێ گوملی ل رۆژئاڤایی، سنوورێن وی ژی ب ڤی رەنگی نە:

**باكووری،** ناحیا چەمانكێ یە.

**باشووری،** ناڤەندا قەزا شێخان.

**رۆژهەلاتی،** قەزا بەردەرەش و ناحیا گردەسین.

**رۆژئاڤایی،** ناحیا ئەترووش.

ناحیا قەسرۆكێ دابەشكرییە بۆ سەر دو پشكێن سەرەكی:

١- دەڤەرا چیا و دەشتێن شەمكان كو د بەرێ دا سەر ب ناحیا ئەترووش ڤە بوون و پێكهاتینە ژ هەشت گوندێن تا رادەیەكی بچویك ب ڤی رەنگی:

(تلبزێنە هەركی، تلبزێنە مزووری، چەم ئەرزن، كوبی، كەندی، كانی كول، بیباڤا، كەڤرەسۆر).

٢- دەڤەرا دەشتا نافكورێ، ئەو ژی پێكهاتییە ژ وان گوندێن كو سەر ب ناحیا مرێبا یا حكۆمەتا عیراقێ هەلوەشاندی و ژ (٣٧) گوندان پێكدهێت ب ڤی رەنگی:

(رولك، خرابا شەرەفا، مرێبا، كانی فەلان، بێساتاخارێ، بێساتاسەری، بەركچك، بەرگرێ، شێخكا، كۆخی، باڤیان، سێلكا، بەرەشا، شیڤك ژووری،شیڤك ژێری، زیناڤا غازی، گرمیشان، درین، ئاشكان، ملا بروان، باجلا كەڤن، باجەلا سەركەڤرۆك، گرزەنگل، كەمی، كەڤری ژووری، كەڤری ژێری، دارەتوو خازر، كرك سوباشی، زیناڤا كەڤن، زیناڤا میری، زیناڤا نوی، زیناڤا حاجو، دوریشان، كرمك مەزن، كرمك بچویك، تەل جومل، ئاڤدەلی).

سەرەرای ڤان گوندان دو كۆمەلگەهـ (چرە و كەلەكچی) ژی سەر ب ڤێ ناحیێ ڤەبوون، لێ نها كەلەكچی ژی بوویە ناحیە و خەلكێ وان پێكهاتینە ژ وان كەسێن پشتی سالا (١٩٧٥)ێ ژ سەر گوندێن وان راكرین،كو (٢٧) گوندبوون، پشتی ژ ناڤچوونا

حكۆمەتا عیراقێ گەلەك ژ خەلكێ وان گوندان ڤەگەریانەڤە سەر گوندێن خۆ ڤە، ئەو گوند ژی پێكهاتیبوون ژ ڤان گوندان: (كلشین، هنجیرۆك، گرفەقیر، بابا، گاڤ، بەرازی بچویك، بەرازی مەزن، كەلەكچی كەڤن، قایماوا، ئاڤدەلی، تەل جومل، زیلكان (نها ناحیەیە)، جەمرەش، پیربۆب، خاتیناڤا، كرمك).

## لایێ جڤاكی و ئابووری:

ناحیا قەسرۆكێ پێكهاتیبە ژ چەندین عەشیرەتان، ژ وانان: مزووری، شەرەفانی، گۆران، هەركی، زێباری و كۆچەر. ژین و ژیارا خەلكێ وی ژی ب رەنگەكێ گشتی پتر ل سەر چاندنێ و ب خودانكرنا تەرش و كەوالی یە، زێدەباری هەبوونا رەنگە كرین و فرۆتنەكێ ل ناڤەندا ناحیێ و پتر ژ (٣٥٠) فرۆشگەهـ (دوكان) لێ هەنە، هەمی كەل و پەلێن پێدڤی بۆ خەلكێ ناحیێ دابین دكەن و ل ڤان سالێن داویێ پیشانگەهێن كرین و فرۆتنا ترۆمبێلان و بازارەكێ گۆشتفرۆشیێ و گومرك ژی لێ هاتینە ڤەكرن.

## شوینوارێن ناحیێ:

ژ جهێن شوینواری ل ڤێ ناحیێ هەبوونا دێرەكا كەڤن ل گوندێ كمی و چەند شوینوار ل گوندێ درین، ژبلی هەبوونا چەند گرێن شوینواری ل گوندێن (زیناڤا میری، كەلەكچی، گرزەنگل).

## لایێ كارگێری:

ناحیا قەسرۆكێ ب بریارا حۆكمەتا هەرێما كوردستانێ ل ١٩٩٦/٣/٦ێ هاتیبە دامەزراندن، ستراكچەرێ ناحیێ پێكهاتیبە ژ رێڤەبەرێ ناحیێ و خۆیەتی و دارایی و داهاتی و دەركردە و كومپیۆتەر.

ناحیێ هەر ژ دامەزراندنا وێ و هەتا نها ڤان كەسان وەكی رێڤەبەرێن ناحیێ ل دووڤ میژوویا ل بەرامبەری

قەسرۆكێ



ناڤێن وان کار لێ کرینە:

1- ئەیسەر جەرجیس حەمید ل ١٩٩٦/٣/١٦
2- عادل ئەمین عومەر ل ١٩٩٨/٤/٧
3- خالد عەباس حاجی ئاغا ل ٢٠٠١/١١/١٥
4- هەڤال محەمەد شەریف ل ٢٠٠٢/٧/٩
5- شێردل سمو جۆقی ل ٢٠٠٦/١٠/٢
6- شەعبان خەلیل عەبدولا ل ٢٠٠٧/٥/٢٣
7- شێردل سمو جۆقی ل ٢٠١١/١٠/٢٣

سەنتەرێ ناحیێ گوندێ قەسرۆکێ گوندەك کەڤنە، د ژێدەرێن دیرۆکیدا ئاماژە ب ناڤێ گوندی هاتیەکرن، گەرۆکێ کورد تەها کورێ یەحیایێ بالیسانی دەمێ ل سالا ١٢٠٣مـــش/١٧٨٨ز د ڤی گوندی را بوری گۆتییە وی شێخێ گوندی شێخ محەمەد ل مەکەهێ دیتییە، هەروەسان گۆتییە: ئەڤ گوندە ب زانایێن خۆ ناڤدارە...[3]، ژمارا ئاکنجیێن گوندێ قەسرۆکێ ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٦ کەس بوون[4]. و نها ل دووڤ سەرژمێریا تەخمینیا ڕێڤەبەریا ئامارا دهۆکێ بۆ سالا (٢٠١٦)ێ هژمارا خەلکێ سەرانسەری ناحیێ (٤٢١١٨)کـەسـن، (٢٨١٧٦) کەس ل سەنتەرێ ناحیێ و کۆمەلگەهان و (١٣٩٤٢) کەس ل گوندێن وێ دژین[5]، و ٩٩٪ ێ ژ خەلکێ وی موسلمانن و ١٪ ێ مەسیحی نە.

## لایێ پەروەردەیی:

ژمارا خواندنگەهێن ناحیا قەسرۆك (د دەمێ بەرهەڤکرنا ڤێ نڤیسینێ ل دەسپێکا ٢٠١٦ێ) ب هەمی قۆناغێن خۆڤە (بنەرەتی و ئامادەیی) دگەهنە (٤٩) خواندنگەهێن بنەرەتی و (٤) خواندنگەهێن ئامادەیی، ژمارا مامۆستایێن وان ژی دگەهنە (٦٥٨) مامۆستایان، ب ڕێژەیا (٤٢٨) بۆ توخمێ نێر و (٢٣٠) بۆ توخمێ مێ. ژمارا خویندکاران ژی دگەهنە (١٧١٢٥) خویندکاران، ب ڕێژەیا (٩٧٨٥) بۆ توخمێ نێر و (٧٣٤٠) بۆ توخمێ مێ[6].

## لایێ کشتوکالی:

**ڕووبەرێ زەڤیێن چاندنێ ل قەسرۆکێ ب ڤی ڕەنگی نە:**

- ڕووبەرێ دێم (اصلاح زراعی): ٤٦٠٨٢,٥ دۆنەم.
- ڕووبەرێ ئاڤی(اصلاح زراعی): ٢٢٩٠,٥ دۆنەم.
- ڕووبەرێ واستە(اصلاح زراعی): ١١٨٨ دۆنەم.
- ڕووبەرێ(ملکیات) دێم:٤١٤٦٣ دۆنەم.
- ڕووبەرێ (ملکیات) ئاڤی: ٢٦٨٩ دۆنەم.
- ڕووبەرێ (کەڤرین): ٤١٣٥ دۆنەم.
- ڕووبەرێ (پاوان):٢٨٨٩٧ دۆنەم.
- ڕووبەرێ پاخچە:٤٠٣ دۆنەم.
- ڕووبەرێ باخچە: ١٥٤٧ دۆنەم.

ڕووبـــەرێ وان زەڤیێن پشت ب بارانێ دبەستن دگەهیتە ٨٧٥٤٥,٥ دۆنەم و یێن پشت بەستنێ ب ئاڤدانێ دکەن دگەهیتە ٦١٦٧.٥ دۆنەم[7].

سەبارەت دەرامەتێن چاندنێ ژی ل دەڤەرێ یێن زڤستان پێکهاتینە ژ: گەنم و جەهـ و باقلك و نیسك و نۆکان و یێن هاڤینی ژی پێکهاتینە ژ: باجانسۆرك و خیار و باجانرەشك و لۆبیك و بامی و فلفل و کولند و...هتد.

**سەبارەت تەرش و کەوالی ژی، ئەو ژی ب ڤی ڕەنگی نە:**

- ژمارا پەزی: ٤٦٠٠٠ سەر.
- ژمارا بزنی: ١٥٠٠٠ سەر.
- ژمارا چێلان: ٣٠٠٠ سەر.

هەر وەسان ١١ کێلگەیێن پەلەوەران لێ هەنە، ژبلی هزار سندۆقێن مێشێن هنگڤینی کو (٥٠) هەنگەڤان پێ رادبن[8].

## لایێ ساخلەمیێ:

ناحیا قەسرۆکێ چەند بنکەهێن ساخلەمیێ لێ هەنە ل (قەسرۆك، چرە، کەلەکچی، مریبا، زیناڤا میری، درین، کانی کول). ژمارا پزیشك و کادرێن ساخلەمیێ ژی پێکهاتینە ژ (٤) پزیشك و (٤٣) کادرێن ساخلەمیێ.

## کۆمەلگەهـ و گوندێن ناحیا قەسرۆك:

### کۆمەلگەها چرە:

ئەڤ کۆمەلگەهە دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ کۆمەلگەهێ یێ ژ (چرا)، کو ئاخا وێ بۆ چاندنێ و بیناسازیێ یا چرە هاتییە. رووبەرێ سنوورێ بازێرڤانییا وێ (٨٢٥٧٥٠٠) مەترێن چوارگۆشەیە، هەتا بەرهەڤکرنا ڤێ بادەکێ ژ پێنج تاخان و (١١١٨) خانییان پێکدهێت ژمارا ئاکنجێن وێ (دەمێ هێژ گوند) ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٢٣ کەس بوون[٩]، نها نێزیکی (١١) هزار کەسانە. پێکهاتا ڤێ کۆمەلگەهێ ژ عەشیرەتێن (شکاك، گۆران، زێباری و مزووری) نە. خەلکێ کۆمەلگەهێ ژبلی چاندنێ و ب تایبەت یا دێم، ژ گەنم و جەهـ و نیسك و نۆکان و خودانکرنا تەرش و کەوالی، کارێن تایبەت ژی دکەن، وەکی پیشەسازیا ترۆمبێلان و ئاسنکەری و...هتد، هەر وەسان گەلەك ژێ فەرمانبەر و پێشمەرگەنە.

کۆمەلگەهێ پێنج مزگەفت و باخچەکێ زارۆکان و چوار خواندنگەهێن بنەرەت ب ناڤێن (ئاراس یا تێکەل، ئاڤێستا یا کچان، گومل یا تێکەل، چرە یا کچان)، ژبلی ئامادەیا چرە یا کوران و ئامادەییا چرە یا کچان کو ل سالێن (١٩٩٢- ٢٠١٣)ێ هاتینە دامەزراندن هەنە، دیسان رێڤەبەریا بازێرڤانیێ و بنکەهێ پۆلیسان و بنکەهێ کارەبێ ژی لێ هەنە[١٠].

### گوندێ کەڤرە سۆر:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفا، دکەڤیتە دووراتییا (١٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ وێ یێ ژ هەبوونا بەرێ رەنگ سەرسۆری ڤە هاتی، چەندین جاران هاتییە خرابکرن و ئاڤاکرن ڤە، ژمارا ئاکنجیێن وی دگەهنە نێزیکی (٢٢٥) کەسان و خەلکێ وی موسلمانن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و داروباری یە، ژبلی خودانکرنا تەرش و کەوالی و مێشێن هنگڤینی و ماسییان.

خواندنگەهـ ل سالا (١٩٩٧)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاکرن و کارەب ژی ل سالا (٢٠٠٤)ێ گەهشتییە گوندی، مزگەفتەك ژی ل گوندی هەیە، سەرەرای هەبوونا بیرەکا نەفتێ.

### گوندێ رۆلکێ:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفا، دکەڤیتە دووراتییا (٩کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ وی یێ ژ هەبوونا دارا (تراشا- تراشۆکا) رویلێ هاتی، چەندین جاران هاتییە خرابکرن و ئاڤاکرن ڤە، ژمارا ئاکنجیێن وی دگەهنە نێزیکی (٦٣) کەسان و خەلکێ وی موسلمانن. ڤی گوندی پێنج شکەفتێن شوینواری لێ هەنە، ژبلی شوینوارێ گوندێ کەڤن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە، ژێدەرێ ئاڤا وان نها بیرەکا ئیرتیوازی یە. خواندنگەهـ ل سالا (١٩٤٢)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، لێ نها خواندنگەهـ لێ نینە.

### گوندێ شەرەفا:

ئێکە ژ گوندێن ناحیا قەسرۆکێ، دکەڤیتە دووراتییا (١٢کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، چەندین جاران هاتییە خرابکرن و ئاڤاکرن ڤە، نها ژمارا ئاکنجیێن وی دگەهنە نێزیکی (٢١) کەسان و خەلکێ وی کوردێن موسلمانن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی یە، ژبلی خودانکرنا تەرش و کەوالی. ژێدەرێ ئاڤا وان ژی بیرەکا ئیرتیوازی یە، خواندنگەهـ ل سالا (٢٠٠٣)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٩٩)ێ گەهشتییە گوندی، هەر وەسان مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

### گوندێ مرێبا:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفا، دکەڤیتە دووراتییا (١٣کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، چەندین جاران هاتییە خرابکرن و ئاڤاکرن ڤە، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٩١ کەس بوون[١١] و نها

دگەهنە نێزیکی (٧٠٠) کەسان، خەلکێ وی کوردێن موسلمانن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە.

ل سالا (١٩٦٤)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن و یا ئامادەیی ل سالا (٢٠٠٠)ێ، کارەب ژی ل سالا (١٩٧٤)ێ گەهشتییە گوندی. نها چوار مزگەفت و بنگەهەکێ ساخلەمیێ و یاریگەهەکا فریزی لێ هەیە. ژبلی هەبوونا بیرەکا نەفتێ.

## گوندێ کانی فەلا:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفا، دکەڤیتە دووراتییا (١٤کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، چەندین جاران هاتییە خرابکرن و ئاڤاکرن ڤە، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٨ کەس بوون[١٢] و نها دگەهنە نێزیکی (٧٢) کەسان و خەلکێ وی موسلمانن و د بەرێ دا مەسیحی بوون کو چووینە دەرڤەی وەلاتی و ناڤێ گوندی ژ فەلا هاتییە کو لێ بووینە. ڤی گوندی گرەکێ شوینواری هەیە، زێدەباری هەبوونا گۆڕێ پاشای، پشتی رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ ڤەکۆلین ل سالا (٢٠١١)ێ ل سەر کری. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر خودانکرنا تەرش و کەوالی یە و پرۆژەیەکێ مریشکان ژی لێ هەیە. ژێدەرێ ئاڤا وان بیرەکا ئیرتیوازی یە. سالا (٢٠٠٣)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ئاڤاکرن، کارەب ژی سالا (١٩٩٨)ێ گەهشتییە گوندی. هەر وەسان یاریگەهەکا فریزی ژی لێ هەیە.

## گوندێ بێساتا خارێ:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفا، دکەڤیتە دووراتییا (١٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، چەندین جاران هاتییە خرابکرن و ئاڤاکرن ڤە، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٦ کەس بوون[١٣] و نها دگەهنە نێزیکی (٣٢١) کەسان و خەلکێ وی موسلمانن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا

گوندێ مرێبا



گەنمی و جەهی و خودانكرنا تەرش و كەوالی. ژێدەرێ ئاڤا وان بیرەكا ئیرتیوازی یە. سالا (١٩٩٥)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، كارەب ژی سالا (١٩٩١)ێ گەهشتییە گوندی، هەر وەسان مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## گوندێ بێساتا سەری:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفا، دكەڤیتە دووراتییا (١٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، چەندین جاران هاتییە خرابكرن و ئاڤاكرن ڤە، ژمارا ئاكنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٨ كەس بوون[١٤] و نها دگەهنە نێزیكی (٢٥١) كەسان و خەلكێ وی كوردێن موسلمانن. ڤی گوندی شكەفتەك ل سەراڤا گوندی هەیە، هەر وەسان مەزارێ شێخ ناسری لێ هەیە. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی و دارێن خۆخایە، ژبلی خودانكرنا تەرش و كەوالی ژ پەز و بزنان و پرۆژەیەكێ مریشكان ژی لێ هەیە. ژێدەرێ ئاڤا وان بیرەكا ئیرتیوازی یە. كارەب ژی ل سالا (١٩٩٨)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ بەرگرێ:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفا، دكەڤیتە دووراتییا (١٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ هەبوونا بەرێن قەبارەیێ مەزن هاتی كو هەتا نها ژی دبەرچاڤن. چەندین جاران گوند هاتییە خرابكرن و ئاڤاكرن ڤە، ژمارا ئاكنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٥ كەس بوون[١٥] و نها دگەهنە نێزیكی (٣٩٠) كەسان و خەلكێ وێ موسلمانن. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و خودانكرنا تەرش و كەوالی و مێشێن هنگڤینی یە. سالا (١٩٩٨)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن. كارەب ژی سالا (٢٠٠٢)ێ گەهشتییە گوندی، هەر وەسان مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## گوندێ شێخكا:

گوندەكێ كەڤنارە دكەڤیتە دووراتییا نێزیكی (٢٠كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ل باشوورێ رۆژئاڤایێ چیایێ چاپانكی داوی گوندێ عەشیرەتا مزووری یانە ل سەر سنوورێ عەشیرەتا شەرەڤا، لەوما گەلەك جارا دبێژنێ گوندی شێخكا شەرەڤا. گوندێ كەڤن ل بیرا كەسەكی نینە كەنگی هاتییە ئاڤاكرن و شوینوارێن وی ل باشوورێ گوندێ نها ل مێرگا كورا هەنە وەك دبێژن گوند ل وێرێ بوو. ناڤێ گوندی دبێژن یێ ژ (شاخ) هاتی، كو گوندێ كەڤن دكەتە جهەكێ بلند.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** هەردو گوندێن بافكی و پێشارێ.

**باكوورێ رۆژئاڤایی:** گوندێ كۆخیێ.

**باشووری:** گوندێن سێلكا و بەرەشا.

**باشوورێ رۆژئاڤایی:** گوندێ باڤیان.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ بەرگرێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ خەنس.

### پێكهاتا گوندی:

پێكهاتا گوندی مزووری نە، ل سالێن بیستاندا ژ سەدسالییا بووری گوند ژ هەردو تاخێن داویدا ل رۆژهەلاتی و پێرەڤا ل رۆژئاڤای پێكدهات، تاخێ داویدا پێكدهات ژ بنەمالێن (بنەبابێن): جۆتیار، عەبێ، شێخەی. تاخێ پێرەڤا ژی پێكدهات ژ بنەمالێن (حسێن، عەلیێ سەلیمی، جندی، براهیم)، ژبلی چەند بنەمالێن دی یێن بچویكتر ل هەردو تاخان و بەری جوی بچنە ئسرائیلێ مالێن جویان ژی لێ هەبوون. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا ١٩٥٧ێ ٩٧٨ كەس ل گوندی دژیان و وێ سالێ گوند سەر ب سەنتەرێ قەزا شێخان بوو[١٦]، تێكرایا خەلكێ ڤی گوندی ل بەری شۆرشا ئەیلوولێ دبوونە (٢٥٠) خێزان، لێ ژبەر كێشەكا جڤاكی خەلكێ تاخەكی گوند چۆلكرن و چوونە گوندێ كۆخیێ و گوندەكێ دی ل وێرێ ئاڤاكرن. نها نێزیكی (٢٤٠) كەسان ل گوندی دژین.

پشتی ماوەیەكێ كێم ژ شۆرشا ئەیلوولی گوند

هاتە سۆتن و هەتا پشتی پێكهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ نەهاتە ئاڤاكرن. جارەكادی گوند پشتی شكەستنا شۆرشا ئەیلوولی هاتە وێرانكرن ڤە و هندەك ژ خەلكێ وی راگوهاستنە باشوورێ عیراقێ و هندەك ژی د كۆمەلگەهان دا ئاكنجیكرن. پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ و ب دروستی ل ١٩٩٢/٤/١٦ێ چەند مالەك هاتنە سەر گوندی و ل سەر شوینوارێن كەڤن ئاڤاكرنەڤە، تا سالا (١٩٩٤)ێ كو رێكخراوا (شیلتەر ناو) یا بریتانی (٢٥) خانی ل دەشتێ ئاڤاكرین و گوند ژ جهێ كەڤن هاتە سەرێ دەشتێ.

## شوینوارێن گوندی:

ڤی گوندی چەند شوینوار لێ هەنە، وەكی كێلیا وەزیری ل رۆژئاڤایێ گوندی و كەلها سەركەڤرێ لاتێ.

## شكەفتێن گوندی:

چەند شكەفت ژی ل ڤی گوندی هەنە، وەكی: شكەفتا تەبقێ ل باشوورێ رۆژئاڤایێ گوندی، شكەفتا مەدرەسێ كو ل نێزیكی خواندنگەهێ بوو لەوما ئەو ناڤ دانابنە سەر، شكەفتا كانییا كونجییا ل رۆژئاڤایێ گوندی و شكەفتا مرینكی ل رۆژئاڤایێ گوندی ب دووراتییا (١٥٠٠م). هەروەسان قەسرەكا ناڤدار ل گوندی هەیە، ل سەر دەرێ قەسرێ سالا ئاڤاكرنا وێ (١٢١١مش) هاتییەنڤیسین، ئانكو كەڤنترە ژ ٢٠٠ سالان[١٧].

## كانییێن گوندی:

كانییا گوندی ل رۆژهەلاتا گوندی، مفا ژ ڤێ كانیێ بۆ ئاڤدانێ و كار و بارێت مالا دهاتە دیتن. كانییا هیرانكێ، كو كانییەكا بچویكە و ل ناڤ گوندی. كانییا كونجییا ل باكوورێ رۆژئاڤایێ گوندی. كانییا سماكێ ل رۆژئاڤایێ گوندی. كانییا كوری ل باكوورێ گوندی. كانییا دراڤا ل باشوورێ گوندی ل دەشتێ. كانییا پیمەلكێ ل باشوورێ گوندی ل دەشتێ.

## لایەنێ ئابووری:

چونكی گوندی دەشت و چیا هەنە، لەوما ل دەشتێ دەرامەتێ دێم، مینا گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك و گوندۆران د چاندن و ل چیا ژی رەزێن تری هەبوون. هەلبەت ژبلی خودانكرنا تەرش و كەوالی كو ل بەری شۆرشا ئەیلوولی نەهـ كەرێن پەزی ل گوندی هەبوون و نها ژی ب خودان دكەن، د وی دەمیدا ل ڤی گوندی چێل نەدهاتنەخودانكرن، هەرچەندە هەمی دەما گارانەكا دەوارێن شۆلی ل گوندی هەبوو. دیسان ل گوندی هندەك پیشەكار ژی هەبوون، وەكی ئاسنگەری و دارتراشی و پنیدۆزی ژی.

سالا (١٩٢٥)ێ بۆ جارا ئێكێ بریارا ڤەكرنا خواندنگەها ڤی گوندی دەركەت، لێ ل سالا (١٩٢٨)ێ ئەو بریار كەتە د بوارێ ب جهـ هینانێ دا.

## خزمەتگوزارییێن گوندی:

ڤی گوندی چەند پرۆژە لێ هاتینە دروستكرن، وەكی:

سالا (١٩٩٣)ێ رێكخراوا (مشن) رابوویە ب راكێشانا هێلا ئاڤێ ژ كانییا كونجییا بۆ گوندێ و سالا (١٩٩٩)ێ رێكخراوەكا دی رابوویە ب نووژەنكرنا پرۆژەیێ ئاڤا گوندی.

سالا (١٩٩٩)ێ رێكخراوا (مندال پارێزا بریتانی)، ب هەماهەنگی دگەل رێڤەبەرییا پەروەردا دهۆكێ رابوویە ب ئاڤاكرنا خواندنگەهەكا شەش رێزی. هەلبەت ژبلی پرۆژەیێ ئاڤاكرنا (٢٥) خانییان كو ل سەری ئاماژە پێ هاتییە كرن.

سالا (٢٠٠٥)ێ كارەب ژی گەهشتییە ڤی گوندی. هەر وەسان مزگەفتەك و هۆلەكا تازییان ژی ل گوندی هەیە[١٨].

## گوندێ كۆخیێ:

كوخیێ گوندەكە دكەڤیتە سەر چیایێ چاپانكی، نێزیكی (١٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ دوورە، پەیڤا كوخیێ ژ پەیڤا كوخ ب رامانا كومتێ چیای هاتییەوەرگرتن.

**سنوورێن گوندی:**

**باکوور:** گوندین تله و بلان.

**باشوور:** گوندێن خەنس، باڤیان و سێلکا.

**رۆژهەلات:** گوندێ شێخکا.

**رۆژئاڤا:** هاروینا و شەهیا.

**پێکهاتا گوندی:**

خەلکێ کوخیێ د بنیاتدا ژ گوندێ شێخکانە، شێخکا ژ سێ تاخان پێکدهات ئەوژی تاخێن: داودا، پیرەفاتێ و کانا، ژ ئەنجامێ ئاریشەکا جڤاکی د ناڤبەرا خەلکێ گوندیدا کو ژ سالا ١٩١٩-١٩٣٦ڤەکێشایە خەلکێ تاخێ کانا ژ گوندی بارکرینە و ل جهێ نهایێ شێخکا ئاکنجی بوونە، پێکهاتا گوندی ب ڤی رەنگییە: مالا حسوی د بنیاتدا ژ پنیانش هاتینە، مالا بژیان ژ ناڤ مزووری ژووریان گوندێ بژیان هاتینە، مالا سیتێ ژ گوندێ توویێ مزووری ژووری هاتینە.

**شوینوار و جهێن کەڤنارێن گوندی:**

مەرقەدێ شێخ یەحیای، هندەك چالێن ژ بەری کولای...

**جهێن گوندی:**

شیڤەکویرێ، رەوینا کاڤلە گوندە، مزیرکی، وارێ هەسن جهێ کۆچەران بوو.

**ژێدەرێن ئاڤێ:**

کانیا کوخیێ، برکا درێژ، کانیا کوری، کانیا مێرگەشکێ، کانیا بیپکی، نها ئاڤێ ژ کانییان ب رێا ماتووران دکێشنە گوندی.

سالا (١٩٥٧)ێ خواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن، بەلێ نها ژبەر نەبوونا خەلکی ل گوندی چ خواندنگەهـ لێ نینن، سالا (٢٠٠٨)ێ جادا سەرەکی و سالا (٢٠١١)ێ کارەب گەهشتینە گوندی، نها دو بیرێن نەفتێ ل سنوورێ گوندی هاتینەکۆلان.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

بەری خرابکرن و راکرنا گوندان پتریا خەلکێ گوندی مژوولی چاندنێ ب تایبەت چاندنا برنج و تویتن و مێو و هندەك جۆرێن فیقی بوون و هندەکان ژی چاندنا دێم ب تایبەت گەنم دچاند.

ل دووڤ سەرژمێریا سالا (١٩٥٧)ێ ٣٢١ کەس ل گوندی دژیان و وێ سالێ گوند سەر ب ناحیا سەنتەرێ قەزا شێخان بوو(١٩) ، گوند سێ جاران هاتییەخرابکرن و سوتن سالێن ١٩٦٢، ١٩٧٤- ١٩٧٥ و سالا ١٩٧٨ێ گوند هاتەخرابکرن و خەلکی وی ب زۆری ڤەگوهاستنە کۆمەلگەهێ قەسرۆکی و بەری ڤێ ڤەگوهاستنێ نێزیکی چل مالان ل گوندی دژیان، پشتی سەرهلدانا (١٩٩١)ێ گوند هاتییەڤەئاڤاکرن و نها نێزیکی ٣٠ خانییان ل گوندی هەنە، بەلێ کتەکا کێما خەلکی ل گوندی دژین و پتریا وان خانییان د ڤالانە[٢٠].

**گوندێ سێلکا:**

ئێکە ژ گوندێن ناحیا قەسرۆك، دکەڤیتە دووراتییا (٢٣کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. گوند دو جاران ژ لایێ حکۆمەتا عیراقی ڤە هاتییە خرابکرن و ئاڤاکرن ڤە، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٣ کەس بوون[٢١] و نها دگەهنە نێزیکی (٩٨) کەسان و خەلکێ وی کوردێن موسلمانن.

گوند ب ناڤێ گوندێ سێلکێ دەڤەرا مزووری ژووری- ناحیا شێروان هاتییەناڤکرن، ل سالێن سیهان کەسەك ب ناڤێ یوسف محەمەد ژ وی گوندی هاتییە گوندێ شەمکان، پاشتر ژ وێرێ هاتییە جهێ ڤی گوندی کو مولکێ خەلکێ شێخکا بوو و عەرد بۆ خۆ کرییە و گوندێ نوو هەر بناڤێ گوندێ خۆیێ کەڤن ناڤکرییە، نها ژی پێکهاتا گوندی هەمی ژ بنەمالا وی کەسی ئانکو یوسف محەمەدینە، رووبەرێ گوندی (٧٠٠) دونەمە.

**ژێدەرێن ئاڤا گوندی:**

د دەمێ خۆدا دو کانییێن ئاڤێ بوون و نها ژی ب هیڤیا بیرێن ئیرتوازی نە.

**زێدەرێن ژیارا خەلكێ گوندی:**

ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و نۆك و باجانسۆركانە، ژبلی خودانكرنا بزن و میهان.

ل سالا (٢٠١٠)ێ كارەب گەهشتییە گوندی[٢٢] .

## گوندێ باڤیان:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا مزووریان، دكەڤیتە دووراتییا (٢١كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاكنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٥٨ كەس بوون[٢٣] و نها دگەهنە نێزیكی (٤٠٨) كەسان. ژ جهێن بەرچاڤێن گوندی ژی (كەڤرێ باڤیان)ە. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و برنج و كەسكاتی یە، هەر وەسان ب خودانكرنا بزن و میهان. خواندنگەهـ ل سالا (١٩٩٩)ێ لێ هاتییە ڤەكرن و كارەب ژی ل سالا (٢٠٠٦)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ بەرەشا:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا مزووریان، دكەڤیتە دووراتییا(٢٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاكنجیێن وی دگەهنە نێزیكی (٤٤) كەسان و خەلكێ وی كوردێن موسلمانن. چەندین جاران گوند ژ لایێ حكومەتێن عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن.ژ جهێن بەرچاڤێن دیرۆكی ل گوندی مەزارێ (كولاڤ رەش)ی یە كو گەلەك خەلك قەست دكەنێ بۆ ب جهـ ئینانا داخواز و مەرەمێن خۆ. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ و ب خودانكرنا بزن و میهـ و چێلان، هەر وەسان پرۆژەیەكێ ب خودانكرنا مریشكان لێ هەیە. كارەب ژی ل سالا (٢٠١٠)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ شیڤكا:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا كۆچەرێن زێدكان، دكەڤیتە دووراتییا (١٦كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ هەبوونا شیڤێن ئاڤێ ل دەوروبەرێن گوندی هاتی، زێدەباری كو جۆیا ئاڤا شاهـ سەنحاریبی (٦٨١- ٧٠٤پ. ز)ێ تێرا دەرباز دبیت. گوند چەند جاران ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن، ژمارا ئاكنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٩ كەس بوون[٢٤] و نها دگەهنە نێزیكی (١٦٠) كەسان و خەلكێ وی كوردێن موسلمانن. ڤی گوندی چەند جهێن بەرچاڤ و دیرۆكی هەنە، وەكی مەزارێ مەلا حەسەن. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی و خودانكرنا پەز و بزنی یە. ل سالا (١٩٩٣)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن و كارەب ژی ل سالا (١٩٩٩)ێ گەهشتییە گوندی، هەر وەسان مزگەفتەك ژی ل ڤی گوندی هەیە.

## گوندێ گرمیشان:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفانی، دكەڤیتە دووراتییا (١٠كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاكنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٥٣ كەس بوون[٢٥] و نها نێزیكی (١٤٥) كەسانە، خەلكێ وی كوردێن موسلمانن. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و خودانكرنا پەز و بزنی یە، زێدەباری پرۆژەیەكێ خودانكرنا مریشكان لێ هەیە. سالا (١٩٩٦)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، كارەب ژی ل سالا (١٩٩٧)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ درین:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفانی، دكەڤیتە دووراتییا (٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاكنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٣ كەس بوون[٢٦] و نها نێزیكی (٣٠٠) كەسانە و خەلكێ وی كوردێن موسلمانن، گوند چەند جاران ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی و خودانكرنا پەز و بزنی یە. خواندنگەهـ ل سالا (١٩٩٧)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، و كارەب ژی ل سالا (١٩٧٦)ێ گەهشتییە گوندی، دیسان ڤی گوندی مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## باجەلا کەڤن:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفانی، دکەڤیتە دووراتییا (٧کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٤ کەس بوون [٢٧] و نها نێزیکی (٨٠٠) کەسانە و خەلکێ وی کوردێن موسلمانن، گوند چەند جاران ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و خودانکرنا پەز و بزنی و چێلانە. خواندنگەهـ سالا (١٩٩٤)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، کارەب ژی سالا (١٩٨٠)ێ گەهشتییە گوندی، دیسان ڤی گوندی مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## باجەلا سەرکەڤرۆك:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا کۆچەران، دکەڤیتە دووراتییا (٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجیێن وی دگەهنە نێزیکی (٢٣٤) کەسان، گوند چەند جاران ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی و بیستانانە، زێدەباری خودانکرنا پەز و بزنی. خواندنگەهـ سالا (٢٠٠٦)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، کارەب ژی ل سالا (١٩٩٢)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ گرزەنگل:

ئێکە ژ گوندێن ناحیا قەسرۆکێ، دکەڤیتە دووراتییا (٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٦ کەس بوون[٢٨] و نها نێزیکی (٦٠٠) کەسان، ناڤێ گوندی یێ ژ زەنگلا دێرێ هاتی کو د بەرێ دا دێرەك ل سەر گرێ‌گوندی هاتبوو ئاڤاکرن. گوند چەند جاران ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن. چەند جهێن بەرنیاس و دیرۆکی لێ هەنە، مینا گرێ گوندی کو جهەکێ شوینواری یە، زێدەباری کو جهەك بوو جوی لێ د ئاکنجی. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی

گوندێ درین



و جەهی و گوندۆر و نۆکانە، زێدەباری خودانکرنا پەز و بزنی و هەبوونا پرۆژەیەکێ خودانکرنا مریشکان.

سالا (١٩٧٧)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، کارەب ژی ل سالا (٢٠٠٧)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ کەمێ (کەمیا):

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفانی، دکەڤیتە دووراتییا (٩کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ناڤێ گوندی یێ هاتی وەکی دبێژن دەمێ گوند هاتییە ئاڤاکرن ژ چەند مالەکێن کێم پێکدهات و ژبەر کێماسییا خەلکێ وی ئەڤ ناڤە دانایە سەر.

**سنوورێن گوندی:**

**باکووری:** گوندێ کەڤرە سۆرێ.

**باشووری:** گوندێ گرزەنگل.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ کوپێ.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مرێبایە[٢٩].

ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٢ کەس بوون[٣٠] و نها نێزیکی (١٦٨) کەسان لێ دژین، گوند چەند جاران ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و گوندۆرانە و نێزیکی (١٢٠) دۆنەمێن عەردێ چاندنێ هەنە، زێدەباری خودانکرنا پەز و بزنی و چێلان. هەر وەسان پرۆژەیەکێ خودانکرنا مریشکان لێ هەیە. ل سالا (٢٠٠٠)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، کارەب ژی ل سالا (٢٠٠٧)ێ گەهشتییە گوندی. هەر وەسان مزگەفتەك ژی ل گوندی هەیە.

## گوندێ کوپێ:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفانی، دکەڤیتە دووراتییا (١٦کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجییێن وی دگەهنە نێزیکی (٢٣٦) کەسان و خەلکێ وی

گوندێ کوپێ



كوردێن موسلمانن. ژ جهێن بەرنیاسێن گوندی ژی سكری كوپی. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و خودانكرنا پەز و بزنی و چێلانە. هەر وەسان پرۆژەیێ ب خودانكرنا ماسییان ژی لێ هەیە. ل سالا (١٩٩٧)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، دیسان ڤی گوندی مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## گوندێ تلبزێنە هەركی:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا هەركییان، دكەڤیتە دووراتییا (٧كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاكنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٢ كەس بوون[٣١] و نها نێزیكی (١٣٧) كەسانە و خەلكێ وی موسلمانن، گوند چەند جاران ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن. جهێن بەرنیاس ل گوندی هەنە، وەكی (گرێ قەسرێ). ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و خۆخانە، هەر وەسان خودانكرنا پەز و بزن و چێلان و دو پرۆژەیێن خودانكرنا ماسییان ژی لێ هەنە. سالا (١٩٩٧)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن. كارەب ژی ل سالا (٢٠٠٤)ێ گەهشتییە گوندی، ڤی گوندی مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## گوندێ تلبزێنە مزووری:

دكەڤیتە دووراتییا (٥كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاكنجییێن وی دگەهنە نێزیكی (١٢٩) كەسان. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و گوندۆران و خودانكرنا پەز و بزنی و چێلا و مێشێن هنگڤینی.

## گوندێ كانی كولی:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا مزووریان، دكەڤیتە دووراتییا (٧كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. خۆجهێن ڤی گوندی خەلكێ هەردو گوندێن (خورتا مەزن و كانی كولێ) نە، خەلكێ گوندێ خورتا مەزن پشتی گوندێ وان هاتییە وێران كرن ل ڤی گوندی ئاكنجی بووینە.

### سنوورێن گوندی:

**باكووری،** گوندێ كەندی یە.

**باشووری،** گوندێ تلبزێنە.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ چەم ئەرزنێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ كۆپێ یە[٣٢].

ژمارا ئاكنجییێن وی دگەهنە نێزیكی (٣٦٠) كەسان. چەند جاران گوند هاتییە كاڤلكرن. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی و خودانكرنا پەز و بزنی و چێلانە. سالا (١٩٩٦)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن. دیسان بنكەهەكێ ساخلەمیێ و پرۆژەیێن ئاڤ و كارەبێ ژی لێ هەنە.

## گوندێ كەندی:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا مزووری، دكەڤیتە دووراتییا (١٤كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاكنجییێن وی دگەهنە نێزیكی (٤٩٨) كەسان و خەلكێ وی كوردێن موسلمانن. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنا دەرامەتێ ڤێقی یە، وەكی خۆخ و هنار و هژیر و مژمژە و زەیتونان،زێدەباری خودانكرنا چێل و گۆلكان. خواندنگەهـ سالا (١٩٩٦)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن. كارەب ژی ل سالا (٢٠٠٧)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ چەم ئەرزن:

ئێكە ژ گوندێن عەشیرەتا مزووریان، دكەڤیتە دووراتییا (١٠كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاكنجییێن وی دگەهنە نێزیكی (٤٢٠) كەسان ، گوند چەند جاران ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابكرن. ژین و ژیارا خەلكێ وی ل سەر چاندنێ و رەز و باغانە، هەر وەسان خودانكرنا پەز و بزن و چێلان و پرۆژەیێ خودانكرنا مریشكان ژی لێ هەیە. خواندنگەهـ ل ڤی گوندی سالا (١٩٩٨)ێ هاتییە ڤەكرن. كارەب ژی ل سالا (٢٠٠٨)ێ گەهشتییە گوندی. ڤی گوندی مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## گوندێ بیباڤا:

پێكهاتا وی ژ عەشیرەتا مزووری و زێباری نە، دكەڤیتە دووراتییا (٧كم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا

ئاکنجیێن وی دگەهنە نێزیکی (٦٤١) کەسان، گوند جارەکێ ژ لایێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن. ژ جهێن ناڤدارێن گوندی ژی کەلا گوندی یە. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنم و جەهـ و برنجی یە، هەروەسان خودانکرنا پەزی و بزنی و چێلانە. خواندنگەهـ سالا (١٩٩٧)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن. کارەب ژی ل سالا (٢٠٠٨)ێ گەهشتییە گوندی، مزگەفتەك ژی ل گوندی هەیە.

## گوندێ کفری ئێك:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا کۆچەران، دکەڤیتە دووراتییا (١کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجیێن وی نێزیکی (١٤٤) کەسانە. گوند چەند جاران هاتییە خرابکرن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و خودانکرنا بزن و میهانە.

## گوندێ کفری دووی:

ئێکە ژ گوندێن عەشیرەتا شەرەفانی، دکەڤیتە دووراتییا (٢کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجیێن وی دگەهنە نێزیکی (٣٣٠) کەسان. ژ جهێن بەرچاڤێن گوندی ژی رووبارێن سرۆشتی نە. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی یە. سالا (١٩٩٨)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن. دیسان گوندی مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## گوندێ ملا بروان مەسیحی:

ئێکە ژ گوندێن کلدانییان، دکەڤیتە دووراتییا (٦کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. وەك هاتییەگۆتن: ناڤێ گوندی پەیڤەك کلدانییە پێکهاتییە ژ (ملا) ئانکو گر و (اروانە) ئانکو خێر و سەدەقە ئانکو گرێ خێر و سەدەقان. ژ سالا (١٨٨٢)ێڤە مەسیحیێن کلدان ژ دەڤەرا زێبار هاتینە و ل ڤی جهی ئاکنجیبووینە، پشتی کو هندەکێن دی ژ دەڤەرا ئاکرێ هاتینەڤی گوندی هژمارا وان زێدەبوویە، ئەڤ مەسیحییە ل بەراهیێ ل سەر ئایینزایا (مەزهەبێ) یەعقوبی بوون پاشتر بووینە کاسولیك، سالا (١٨٨٥)ێ هژمارا وان (١٢) خێزان بوون و ل سالا (١٩١٨) بووینە (١٦) خێزان کو دبوونە (٧٤) کەس، هندەك خێزانێن کوردێن موسلمان و جوهی ژی ل گوندی هەبوون بەلێ هژمارا وان نەهاتییەدیارکرن، خەلکێ گوندی ل دەستپێکا سالێن شێستان گوند بەردابوو و مشەخت ببوونە مووسلێ، پشتی سەرهلدانا کوردستانێ ل ئادارا (١٩٩١)ێ ل نیڤا سالێن نۆتان زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ[٣٣]. ژمارا ئاکنجیێن گوندی نها دگەهنە نێزیکی (٣٣٩) کەسانە و خەلکێ وی مەسیحی نە. ئەڤ گوندە چەند جاران هاتییە خرابکرن. ژ جهێن بەرچاڤێن گوندی ژی کەنیسا مار ساوە و مەزارێ مار ساوەیە. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی یە. سالا (١٩٨٤)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ ملا بروان:

ئێکە ژ گوندێن ناحیا قەسرۆکێ، دکەڤیتە دووراتییا (٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجیێن وی دگەهنە نێزیکی (١٥٠) کەسان و خەلکێ وی کوردێن موسلمانن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی و خودانکرنا بزن و میە و چێلانە.

## گوندێ ئاشکان:

پێکهاتا گوندی ژ عەشیرەتا شەرەفانی یە، دکەڤیتە دووراتییا (١٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨١ کەس بوون[٣٤] و نها نێزیکی (٢٨٤) کەسانە. ئەڤ گوندە چەند جاران هاتییە خرابکرن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی و نۆك و ترۆزی و گوندۆرانە، زێدەباری خودانکرنا پەز و بزن و چێلان. سالا (١٩٩٨)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن.

## گوندێ زیناڤا غازی:

پێکهاتا گوندی ژ عەشیرەتا شەرەفانی و گۆرانە،

دکەڤیتە دووراتییا (٢٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٦ کەس بوون [٣٥] و نها نێزیکی (٢٠٣) کەسانە. ئەڤ گوندە چەند جاران هاتییە خرابکرن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی یە، زێدەباری خودانکرنا پەز و بزن و چێلان و پرۆژەیەکێ خودانکرنا مریشکان ژی لێ هەیە. ل سالا (١٩٨٠)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن. دیسان ڤی گوندی مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## گوندێ زیناڤا میری:

ئێکە ژ گوندێن ناحیا قەسرۆکێ ژ ئیجاخا (گۆڤەیی)نە، دکەڤیتە دووراتییا (١٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٧٢ کەس بوون [٣٦] و نها نێزیکی (٧٣٦) کەسانە. ئەڤ گوندە چەند جاران هاتییە خرابکرن. ژین و ژیارا خەلکێ وی ل سەر چاندنا گەنمی و جەهی و بیستانانە، زێدەباری خودانکرنا پەز و بزنان. سالا (١٩٩٧)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن. دیسان ڤی گوندی مزگەفتەك ژی لێ هەیە.

## گوندێ بەرکچکی:

گوندەکێ عەشیرەتا مزووریانە، دکەڤیتە دووراتییا (١٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ. ژمارا ئاکنجییێن وی نێزیکی (٣٩٥) کەسانە. کارێ وان ژی چاندنا دێم و خودانکرنا تەرش و کەوالی یە. ڤی گوندی خواندنگەهەك لێ هەیە کو سالا (١٩٩٣)ێ هاتییە دامەزراندن، سەرەرای هەبوونا مزگەفتەکێ.

## ژێدەر و پەراوێز

* - پتریا زانیارییێن ڤێ نڤیسینێ یێن ئاماژە ب ژێدەرێ وان نەهاتییەکرن د سەرەدانێن مەیدانیدا ژ ئالیێ محەمەد عارف تاتارڤە هاتینەکۆمکرن.

1. د. عبدالله غفور، التشكيلات الادارية في جنوب كردستان، (اربيل- ٢٠١٤)، ص ١٢٦.
2. موسەدەق تۆڤی و ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەها دهۆکێ، بپ١٤٥.
3. د.عماد عبدالسلام، مراكز ثقافية مغمورة في كردستان، (اربيل- ٢٠٠٨) ص ١٢٩.
4. د. عەبدوللا غەفور، گوندەکانی باشووری کوردستان لەسەرژمێری دانیشتوانی عێراقدا- ١٩٥٧، چ٢، بپ٣٥.
5. ل دووڤ تەخمینێن رێڤەبەریا ئامارا دهۆکێ.
6. زانیاری و داتایێن تایبەت ب ناحیێ و دەزگەهێن وی ژ رێڤەبەریا ناحیێ پشکا خۆیەتی هاتینەوەرگرتن.
7. داتایێن فەرمانگەها چاندنێ ل ناحیێ.
8. هەمان ژێدەر.
9. د. عەبدوللا غەفور، گوندەکانی باشووری کوردستان، ژێدەرێ بەرێ، بپ٣٢.
10. پێزانین ژ سەرەدانەکا مەیدانی و ب هاریکاریا مامۆستا عامر عادل مەعروف کو خەلکێ کۆمەلگەهێ یە هاتینە وەرگرتن.
11. د. عەبدوللا غەفور، گوندەکانی باشووری کوردستان، ژێدەرێ بەرێ، بپ٣٣.
12. هەمان ژێدەر.
13. هەمان ژێدەر، بپ٣١.

# ناحیا زیلکان

محەمەد عارف تاتار
پیر خەلات ئەلیاس جەعفۆ

ئێکە ژ وان ناحیێن سەر ب قەزا شێخان ڤەیە، خەلکێ وێ ژ کورد و عەرەبا و ژ هەردو ئایینێن موسلمان و ئێزدی پێکهاتییە،ل سالا (١٩٩٧)ێ ژ ئالیێ حکۆمەتا عیراقێ ب ناڤێ ناحیا (الفاروق) هاتییە دامەزراندن، سەنتەرێ وێ گوندێ زیلکانە کو سەر ب پارێزگەها مووسل ڤەبوو و (عەبدولا حسێن عەزیز) هاتە دانان وەکی رێڤەبەرێ ناحیێ و ل رۆژا (٢٠٠٠/١٠/٧)ێ دەست ب کارێ خۆ کربوو. ل سالا (١٩٧٥)ێ گوند هاتبوو تەعریبکرن و خەلکێ وی ئاوارەی کۆمەلگەهان کربوون. ناحیە پێکدهێت ژ کۆمەلگەها مەهەتێ و (٢٥) گوندان.

سەبارەت ناڤێ (زیلکان)[1] ژی دبێژن یێ ژ (زێلك) هاتی، کو ئەو ژی جۆرە گیایەکە د ناڤ ئاڤێ دا شین دبت و بۆ چەند مەبەستا ل بەرێ دهاتە بکارهینان.

پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ و ئەو روودانێن ل عیراقێ چێبووین، گوند ژ وان کەسێن هاتینە د گوندی دا چۆل بوو ڤە و خەلکێ وی یێ رەسەن ڤەگەریانەڤە سەر گوندێ خۆ و ئەڤ یەکەیا کارگێری هەر ژ سالا (٢٠٠٣)ێ و هەتا سالا (٢٠٠٧)ێ هاتبوو (تەجمید) کرن، لێ ل رۆژا (٢٠٠٧/٥/٣١)ێ هەلبژارتن بۆ دیارکرنا رێڤەبەریا ناحیا (الفاروق) هاتنە ئەنجامدان و (محەمەد ئەمین غەریب مەولود) وەکی رێڤەبەرێ ناحیێ هاتە هەلبژارتن و خەلکێ وی د رێکا جڤاتا ناحیا (الفاروق) ب نڤیسینەکێ کو ئاراستەی پارێزگەها نەینەوا کرین داخوازکرن کو ناڤێ ناحیێ بهێتە گوهارتن و ناڤ ژ (الفاروق) ببیتە (زیلکان)، پارێزگەهێ ژی نڤیسینەك هەر ل سەر ڤی بابەتی ئاراستەی جڤاتا پارێزگەها (نەینەوا) کرن و وان ژی ل رۆژا (٢٠٠٩/١/٢٩)ێ رەزامەندی ل سەر وێ داخوازیێ دیارکرن و ناڤ بۆ (زیلکان).

هەر ژ دامەزراندنا ناحیێ و تا نها ڤان کەسان وەکی رێڤەبەرێن ناحیێ دەوام لێ کرینە:

١- عەبدولا حەسەن عەزیز، هەر ژ رێکەفتی ٢٠٠٠/١٠/٧ێ، تا رێکەفتی ٢٠٠٢/٦/١١ێ.

٢- ماهر سەعید مەتی، ژ رێکەفتی ٢٠٠٢/٦/١١ێ، تا رێکەفتی ٢٠٠٣/٤/٨ێ.

٣- محەمەد ئەمین غەریب مەولود، ژ رێکەفتی ٢٠٠٧/٥/٣١ێ.

## خزمەتگوزارییێن ناحیێ:

ئەگەر ئەم بنێرینە ئەو فەرمانگەهـ و رێڤەبەریێن ل ناحیێ هەین، دێ بینین د دابەشکرینە ل سەر هەردو پارێزگەها نەینەوا و دهۆکێ حۆکمەتا هەرێما کوردستانێ ڤە، ژ وان یێن سەر ب مووسل ڤە:

رێڤەبەریا ناحیا زیلکان، جڤاتا ناحیا زیلکان، رێڤەبەریا بازرڤانیی، ناسناما بارێ کەسایەتی،

بنگەهێ ئاڤا زیلكان، بنگەهێ ساخلەمیا زیلكان، بنگەهێ ساخلەمیا مەهەتێ، بنگەهێ ساخلەمیا تاق میكائیل، بنگەهێ سەخبێریكرنا كارەبا زیلكان.

یێن سەر ب حكۆمەتا هەرێمێ ژی ڤە پێكهاتییە ژ:

سەرۆكاتیا باژێرڤانیا مەهەتێ، پۆلیسێن شۆرش، پۆلیسێن مەهەتێ، جێگریا ئاسایشا زیلكان.

ژ عەشیرەتێن دەڤەرێ ژی (گۆران)ن، ل گوندێن (زیلكان، خاتوناوا، مۆسەكا ئیسلام، كانی ساردك، چەمەرەش، هنجیرۆك، تاق حەمە، بەرازی بچووك، بەرازی مەزن، باباو، نێچەیێ، گلەشین، محەمەد رەشان، پیران مەقلۆب، قیماوا، گردەگال، ئاڤدەلیێ، گر فەقیر).

ژ عەشیرەتێن ئێزدییان ژی: (دوملی، هەكاری، خەتاری، مامۆسی، قایدی، بەلەسینی، جهصانی، خیسكی، ترك)، ئەو ژی ل كۆمەلگەها مەهەتێ و گوندێن (كەنداله، مەحموودان، موقبلە، مۆسەكا ئێزدییان).

ژ عەشیرتێن عەرەبان ژی (زهیرات) ل گوندێ (ركابە مەزن) و (حەدیدی) ل گوندێن (تاق حەرب و تاق میكائیل).

ژ بەر كو جهێ ڤێ ناحیێ دەشتە، لەوما باراپتر دەرامەتێن دێمی، مینا گەنم و جەهـ و نۆك و باقلك و ترۆزی و گوندۆر لێ دهێنە چاندن، ژبلی دەرامەتێن ئاڤی ژ خیار و باجانسۆرك و كرتۆپ (پتات) و ...هتد، هەر وەسان داروبارێن زەیتوونان و دارێن خۆخان ژی لێ هەنە. دیسان خەلكێ دەڤەرێ تەرش و كەوالی ژی وەكی ژێدەرەكێ دی یێ داهاتی، مینا پەز و چێل و مریشكان ب خودان دكەن.

ل دووڤ ئامارێن تەخمینكرییێن رێڤەبەریا ئامارا دهۆكی نها هژمارا خەلكێ سەرانسەری ناحیێ دبیتە ١٩٤٩٤ كەس ژ وانا ١٨٠٨٨ كەس ل سەنتەرێ ناحیێ و باژێركێن وێ دژین و ١٤٠٦كەس ژ ل گوندێن سەر ب ناحیێ ڤە دژین[٢]، پێكهاتا وانا نەتەوەیی كورد و عەرەبن و یا ئایینی موسلمان و ئێزدی نە.

زیلكان



## گوندێن سەر ب ناحیا زیلکان ڤە:

### سەنتەرێ زیلکان:

خەلکێ وی کوردێن موسلمانن، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ژمارا خەلکێ ڤی گوندی ١٠٦ کەس بوون[٣] و نها نێزیکی (٥٠٠) کەسانە، بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٦٦)ێ خواندنگەهـ لێ هاتیە ڤەکرن، ئەڤ خواندنگەهە یەکەمین خواندنگەهـ بوو ل دەڤەرا چیایێ مەقلوبی دهێتەڤەکرن و قوتابیێن شەش گوندان ل ڤێ خواندنگەهێ دخواند[٤]، ل سالا (١٩٦٨)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ ل گوندی هاتیە دروستکرن، ل سالا (١٩٧٩)ێ کارەب گەهشتیە گوندی، بنکەهێ ساخلەمیێ ل سالا (١٩٩٧)ێ هاتیە دروستکرن. ل سالا (٢٠٠٣)ێ خواندنگەها زیلان یا بنەرەت ژ لایێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ لێ هاتیە ڤەکرن.

### کۆمەلگەها مەهەتێ:

د بنیاتدا گوندەکە دکەڤیتە دووراتیا یەك کیلومەترێ باشوورێ جادا سەرەکیا دهۆك- هەولێر، (٤٠٠٠) دۆنەمێن عەردی هەنە و سنوورێن وی ژی ب ڤی رەنگی نە:

**باکووری:** گوندێ مام رەشان.

**باشووری:** گوندێ موقبلێ.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زیناڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ بێتنار.

ل سەر ناڤێ گوندی ژی دبێژن ژ (مەتێ) هاتیە، وەکی د شەرەفناما شەرەفخانێ بەدلیسی دا هاتی دبێژیت: ل سالا (١٠٠٢مـــش/١٥٩٤ز)ێ مەحموودا میرگەهـ بوو و میر (عیسێ کورێ عەدلا خانێ) میر بوو و وی مەتەك هەبوو، میری گرەك ل رۆژهەلاتێ گوندی وەکی خەلات دابوو مەتا خۆ د گۆتنێ (گرێ مەتێ)، ب درێژاهیا مێژوویێ ژ گرێ مەتێ بوو گوندێ مەتێ و پاشی بۆ گوندێ مەهەتێ.

ل رۆژا (١٩٧٤/١٠/١)ێ بریارەك ژ حکۆمەتا عیراقێ هاتە دەرئێخستن کو هەمی گوندێن ئێزدیێن دەڤەرا شێخان د کۆمەلگەهێ دا بێنەکۆمکرن و ل رۆژا (١٩٧٥/٥/١١)ێ دەستەلاتداریا حکۆمەتێ ل مووسلێ عەرەب ئینانە سەر ڤان گوندێن ئێزدییان: (کەندال، گرخاس، جەروانە، دۆلە هژیر، باقەسر، بێتنارێ، مۆسەکا، مەحموودا، موقبلا مەزن، موقبلا بچویك و مام رەشا) و خەلکێ وان گوندان ئینانە کۆمەلگەها مەهەتێ و دناڤ کۆمەلگەهێ دا هەر گوندەك ژ گوندێ دی جوداکر، واتە هەر تاخەکی ناڤێ خۆ هەیە و کۆمەلگەهـ پێکدهێت ژ (١٥) گوندان ب ڤی رەنگی: (مەهەت، مام رەشا، دۆلا هژیر، سێ گرك، موقبلا مەزن، موقبلا بچیك، باقەسری، جەروانە، مەحموودا، مۆسەکا، گرخاسێ، کەندالی، گرموبارەك، محەمەد رەشان، بێتناز)، ئانکو تاخ ب ناڤێ گوندان ناڤکرن.

ئەڤ گوندە ئێزدینشینن، ژ چینێن شێخ و پیر و مریدانە، ژ چینا شێخان شێخێن ناسرەدینە، شێخێن فەخرا، ژ پیران ژی پیرێن هاجیالی، ژ مریدان ژی دەهـ عەشیرەت ب ڤی رەنگی لێ هەنە: دووملی، خیسکی، ماموسی، هەکاری، پیدەیی، دنایی، قایدی، خەتاری، ترك، بریمەمی، جەهسانی، هەراقی، خالتی، ئال دەخی، ماسەکی، بەلەسینی، بریمەمی.

**ژ نیشانگەهێن خاس و بابچاکان ل گوندی ئەڤنە:**

ئێزی، پیرافات، شێخادی، محەمەد رەشان. ئێزی ژی ناڤەکە ژ ناڤێن خودێ مەزن، وەکی سەبەڤا قەولێ ژ ئەدەبیاتێن ئایینێ ئێزدییان دبێژیت:

**ئێزی بخۆ پەدشایە**

**و هەزار و ئێك ناڤ ل خۆ دانایە**

**بەلێ ناڤێ مەزن هەر خودایە.**

بەلێ پیرافات و شێخادی و محەمەد رەشان ل سەدێ دووازدێ بوون، و سەرەدانا گوندێ مەهەتێ کرینە، لەوما جهێن نیشانگەهێن وان لێ هەنە.

گوند ل (١٩٧٥/٥/١١)ێ بوویە کۆمەلگەها مەهەتێ و ژمارا ئاکنجیێن گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٧٧ کەس بوون[٥] و نها د دەمێ ئامادەکرنا ڤێ نڤیسینێ ل داوییا سالا (٢٠١٥)ێ (١٦٠٧) سەرۆك خێزان ل کۆمەلگەهێ دژین کو

دگەهنە دەوروبەرێن (١٠٠٠٠) کەس.

سالا (١٩٧٠)ێ یەکەم خواندنگەهـ لێ هاتییە دروستکرن و د هەمان سال دا پرۆژەیێ ئاڤێ ژێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن، سالا (١٩٧٧)ێ بنکەهەکێ ساخلەمیێ لێ هاتییە دروستکرن و سالا (١٩٧٩)ێ هێلا کارەبێ ژێ گەهشتییە گوندی.
ڤێ کۆمەلگەهێ ئەڤ خواندنگە لێ هەنە:

١- خواندنگەها رۆژبار یا بنەرەت یا تێکەل، سالا (٢٠٠٦)ێ.

٢- خواندنگەها دانەر یا بنەرەت یا تێکەل، سالا (١٩٧٧)ێ.

٣- خواندنگەها دەمهات یا بنەرەت یا تێکەل، سالا (١٩٧٠)ێ.

٤- خواندنگەها مەهەت یا بنەرەت یاتێکەل، سالا (٢٠٠٨)ێ.

٥- ئامادەیا مەهەتێ یا تێکەل، سالا (٢٠١٢)ێ[٦].

## گوندێ دۆلە هژیرێ:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٢کم) ژ جادا سەرەکییا دهۆك- هەولێر، رووبەرێ وی (٦٥٠) دۆنەمێن عەردی نە. ل سەر ناڤێ گوندی ژێ ئەو ژێ ژ دارێ هژیران هاتییە کو ئەو دۆل هەمی دارێن هژیرانە، بەلێ هندەك دارێن زرگوزا ژێ لێ هەنە و ژ پیرۆزییا وان دارێن زرگوزا ب نیشانا خەرقەی دهێتە نیاسین.

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** گوندێ بێتناز.

**باشووری،** گوندێ مەحمووودا.

**رۆژهەلاتی،** کۆمەلگەها مەهەتێ.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ کر مبارەك.

### پێکهاتا جڤاکی:

خەلکێ ڤی گوندی هەمی کوردێن ئێزدینە، ژ چینا مریدانە، ژ عەشیرەتا دوملیا[٧]. ژمارا خەلکێ ویل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٣ کەس بوون[٨]، دەمێ بەرهەڤکرنا ڤێ نڤیسینێ ١٢ خێزان ل گوندی دژیان و دبوونە (٦١)کەس.

## گوندێ مەحمووودان:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) ژ جادا سەرەکییا دهۆك - هەولێر، رووبەرێ وی (٤٠٠٠) دۆنەمن. ل سەر ناڤێ گوندی ژێ هەر ژ ناڤێ عەشیرەتێ (مەحموودی) هاتییە، کو ل سەدسالییا دەهێ عەشیرەتەکا گەلەکا ب هێز بوو ل دەڤەرا شێخان و هەتا چیایێ مەقلووبێ، بەلێ ژبەر ناکۆکیێن ناڤخۆیی و دو بەندیێ بوونە دو پشك و هەر پشکەك چوو ملەکا گوندی، ل سەدسالییا دووازدێ شێخادی و مەلك شێخسن و عەڤدێ رەش و محەمەد رەشان و پیرافات و شەخسێ باتێ هاتینە گوندی و پێك ئینانە و ناڤێ گوندی ژ مەحمووودا کرنە (مەحمووودان).

### سنوورێن گوندی:

**باکووری،** کۆمەلگەها مەهەتێ.

**باشووری،** گوندێ موقبلێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سێ گرك.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ کەندالی.

### پێکهاتا جڤاکی:

خەلکێ ڤی گوندی ئێزدینە، ژ هەرسێ چینێن شێخ و پیر و مریدان. ژ شێخان، شێخێن ناسرەدین. ژ پیران ژێ پیرێن مەمێ شڤان، و ژ مریدان ژێ عەشیرەتێن دووملی، خیسکی، ترك، قایدی، خەتاری، خالتی. ژمارا خەلکێ وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٠٠ کەس بوون[٩]. بەلێ نها ژ ٨٥ کەسان نە دبۆرین.

ئەڤ گوندە گوندەکێ کەڤنارە و دیرۆکا خۆ یا تایبەت یا هەی، شەرەفخانێ بەدلیسی دبێژیت: ل سالا (١٠٠٢مــش/١٥٩٣ز)ێ ئەڤ گوندە میرگەهـ بوویە و دو بنەمالا میریاتی لێ کرینە، ئەو ژێ:

١- بنەمالا شێخ مەحموود، ئەختیارێ باسکی بوو و

كورێ وی (حسێن شێخ مەحموود) بوویە میر و ئەوی ژی كورەك هەبوو د گۆتنێ میر (حامد) و وی ژی سێ كور ب ناڤێن (عەوەز بەگ، شەمسەدین بەگ، ئەمیر بەگ) هەبوون، هەر وەسان عەوەز بەگی ژی پێنج كور ب ناڤێن (حەسەن قولی بەگ، شاهـ عەلی بەگ، حەمزا بەگ، حسێن بەگ، بوداق بەگ) هەبوون، بەلێ ئەمیر بەگی سێ كور ب ناڤێن (عەوەز بەگ، شێر بەگ، شێخۆ بەگ) هەبوون.

٢- بنەمالا میر عیسێ كورێ عەدلا خانێ، وی كورەك هەبوو د گۆتنێ میر (ئەحمەد)، ڤی ژی دو كور ب ناڤێن (ئیبراهیم بەگ، بەهلۆل بەگ) هەبوون، بەهلۆل بەگی ژی حەفت كور ب ناڤێن (جەمشید بەگ، محەمەد بەگ، خالص ئێزدی بەگ، حاجی بەگ، ئەحمەد بەگ، ئیسماعیل بەگ، جەعفەر بەگ) هەبوون. جەمشید بەگی ژی ب تنێ كورەك ب ناڤێ سولتان (قولی بەگ) هەبوو، محەمەد بەگی ژی دو كور ب ناڤێن (مەنسوور بەگ و زەینەل بەگ) هەبوون، حاجی بەگی ژی كورەك هەر ب ناڤێ حاجی بەگی هەبوو، كو ل پشت باب ببوو پشتی هاتییە كوشتن. هەر وەسان مەنسوور بەگی ژی دو كور ب ناڤێن (وەلی بەگ و قلیچ بەگ) هەبوون، كو (قلیچ بەگ) میرێ دوماهیێ بوو و نها نیشانكەها وی یا ل سەر گرێ مەحمووداً. ل سەردەمێ ئەڤان بەگان میراتی ل مەحمووداً هاتییە كرن و ل وی دەمی (زێرێ مەحموودی) هەبوو.

**ژ نیشانكەهێن خاس و بابچاكێن گوندی ژی ئەڤنە:**

(شێخ مەحموود، مەلەك شێخسن، عەڤدێ رەش، شێخ قلیچ، شێخادی، دایكا دارە قوت، شەخسێ باتێ، پیرافات، محەمەد رەشان).

ڤی گوندی كانییەكا ئاڤێ لێ هەیە.پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠٠٥)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن و هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ بۆ گوندی هاتییە راكێشان[10].

## گوندێ موقبلا مەزن:

ئێك ژ وان گوندانە كو ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە تەعریبكرن، دكەڤیتە دووراتیا (٤كم) باشوورێ جادا سەرەكیا دهۆك- هەولێر، ناڤێ گوندی ژی ژ مەقبوول هاتییە، كو گرەكێ پیرۆز و مەقبووله ل رۆژهەلاتێ گوندی و ژ وێ پیرۆزیێ و مەقبوولیێ خەلكی مریێن خۆ لێ ڤەدشارتن و ل سڤككرنا زمانی ژ گرێ مەقبوول بۆ موقبلێ. رووبەرێ عەردێ وی (٣١٥٠) دۆنەمن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ مەحمووداً.

**باشووری،** گوندێ موقبلا بچویك.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سێ گرك.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ كەندالی.

**پێكهاتا جڤاكی:**

خەلكێ ڤی گوندی هەمی ئێزدینە، ژ چینێن شێخێن فەخرا و پیرێن هاجیالی و محەمەد رەشان و مریدێن سێ عەشیرەتان، ئەو ژی دووملی و خیسكی و قایدی.

**نیشانكەهێن خاس و بابچاكێن گوندی ژی ئەڤنە:**

(شێخ بازید، شێخ مووس، دایكا چاك، شێخ فەخر، شێشمس)، ئەڤ خاسە هەمی ل سەدسالیا دووازدێ بوون و شێخ بازید ل سەدسالیا یازدێ بوو.

ڤی گوندی كانییەكا ئاڤێ ب ناڤێ كانیا (خرخرۆكێ) هەیە و پرۆژەیێ ئاڤێ ل ڤی گوندی ل سالا (١٩٨٠)ێ هاتییە دروستكرن و هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ بۆ گوندی هاتییە راكێشان[11]. (١٧٨) خێزان ل ڤی گوندی دژین و دبنە نێزیكی ١٧٨ كەسان.

## گوندێ موقبلا بچویك:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتیا (٤كم) باشوورێ جادا سەرەكیا دهۆك- هەولێر.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ موقبلا مەزن.

**باشووری،** گوندێ مۆسەكا.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ سێ گرك.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ كەندالی.

رووبەرێ عەردێ ڤی گوندی (٣٠٠) دۆنەمن، خەلكێ وی ژی هەمی كوردێن ئێزدینە ژ مریدان، عەشیرەتا قایدیا[١٢].

## گوندێ مۆسەكا ئێزدییان:

گوندەكێ ئێزدینشینە، ناڤێ گوندی یێ ژ گیایێ مۆسەك هاتی و دبێژنە وی جهی ئەڤ گیایە لێ شین دبیت باسكێت مۆسەكا، رووبەرێ عەردێ وی (٢٣٨٠) دۆنەمن.

**سنوورێن گوندی:**

**باكووری،** گوندێ موقبلێ.

**رۆژهەلاتی،** گوندێ گر فەقیر.

**رۆژئاڤایی،** گوندێ خاتونازا.

**رۆژئاڤایێ باشووری،** گوندێ چەمە رەش.

**پێكهاتا جڤاكی:**

خەلكێ گوندی ژ هەردو چینێن پیر و مریدانە، پیرێن هاجیالی و مریدێن عەشیرەتێن دوملی و بەلەسینی.

**ژ نیشانكەهێن خاس و بابچاكێن ڤی گوندی ژی ئەڤەنە:**

(عەڤدێ رەش، شێشمس، گاڤانێ زەرزا، محەمەد رەشان، دایكا چاك، شێخادی، ئێزی) و هەمی ل سەدساليیا دووازدێ بوون.

ڤی گوندی كانییەك ب ناڤێ كانی زەرك یا هەی، خواندنگەها ڤی گوندی ل سالا (١٩٧٢)ێ هاتییە ڤەكرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٧١)ێ بۆ هاتییە دروست كرن، كارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی[١٣].

## گوندێ مۆسەكا ئیسلام:

هەر مینا ناڤێ پێشترە لێ خەلكێ وی موسلمانن، ئێكە ژ وان گوندێن ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە تەعریبكرن. ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٣ كەس ل ڤی گوندی دژیان[١٤].

سالا (٢٠٠٥)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەكرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ژی ل سالا (٢٠١٣)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن و كارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی. ژمارا خەلكێ وی (٨٥) كەسن.

## گوندێ خاتوناوا:

گوندەكێ موسلماننشینە، تێكدا كوردن و ژمارا وان ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٣٩ كەس بوون[١٥] و نها دگەهیتە نێزیكی (١٠٨) كەسان، یەكەم خواندنگەهـ ل سالا (٢٠٠٤)ێ ژ لایێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ ڤە لێ هاتییە ڤەكرن، هەردو خزمەتگوزاریێن ئاڤ و كارەبێ ژی بۆ گوندی ل سالێن (١٩٧٨- ١٩٧٩)ێ ل دووڤ ئێك گەهشتینە گوندی.

## گوندێ كانی ساردك:

ناڤێ گوندی یێ هاتی كو كانییەكا ئاڤا تەزی لێ هەبوو، ژمارا ئاكنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٩ كەس بوون[١٦] و نها نێزیكی (١١٠) كەسانە، یەكەم خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٩)ێ لێ هاتییە ڤەكرن، هەردو پرۆژەیێن ئاڤ و كارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتینە گوندی. ل سالا (٢٠٠٣)ێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ خواندنگەهەك ب ناڤێ (كانی ساردك) لێ ڤەكر.

## گوندێ چەمە رەش:

خەلكێ گوندی د بنیاتدا كوردێن موسلمانن ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتبوو تەعریبكرن، ژمارا ئاكنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٣ كەس بوون[١٧] و نها نێزیكی (١٣٠) كەسانە، خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٩)ێ لێ هاتییە ڤەكرن، خزمەتگوزاریێن ئاڤ و كارەبێ ژی هەر ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتینە گوندی

و حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ خواندنگەهەك ل سالا (٢٠٠٤)ێ لێ ڤەکرییە.

## گوندێ هنجیرۆك:

گوندەکێ کوردێن موسلمانە، ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتبوو تەعریبکرن، ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١١١ کەس بوون[١٨] و نها نێزیکی (٣٥٠) کەسانە، ڤی گوندی سێ کانیێن ئاڤێ لێ هەنە، یەکەم خواندنگەهـ ل سالا (٢٠٠٦)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠٠٧)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن و هێلا کارەبێ ل سالا (١٩٧٩)ێ بۆ گوندی هاتبوو راکێشان.

## گوندێ تاق حەمە:

ئێکە ژ گوندێن کوردێن موسلمان ل دەڤەرێ، سالا (١٩٧٥)ێ هاتبوو تەعریبکرن، پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ خەلکێ رەسەنێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ، ناڤێ گوندی یێ ژ (تاق)ب واتایا (پەنجەرە)، و (حەمە)، کو ئاغایێ گوندی بوو یێ هاتی، ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٨ کەس بوون[١٩] و نها دگەهنە نێزیکی (٢٢٠) کەسان، سالا (١٩٨٠)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن، هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی، سالا (٢٠٠٦)ێ، حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ خواندنگەهەك ل گوندی ڤەکر.

## گوندێ بەرازی گچکە (بچووك):

ئێکە ژ گوندێن کوردێن موسلمان ل دەڤەرێ، ناڤێ گوندی یێ ژ (بەرازی) هاتی، کو د ناڤ سنوورێن گوندی هەتا توخیبێ چیایێ مەقلووبی یێن هەین، ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤١ کەس بوون[٢٠] و نها نێزیکی (٢٦٥) کەسانە، سالا (١٩٨٠)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن، هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی و ل سالا (٢٠٠٤)ێ، حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ خواندنگەهەك ل گوندی ڤەکر.

## گوندێ بەرازی گەورە (مەزن):

ئێکە ژ گوندێن کوردێن موسلمان ل دەڤەرێ، سالا (١٩٧٥)ێ هاتبوو تەعریبکرن،پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ خەلکێ رەسەنێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ، ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٩٦ کەس بوون[٢١] و نها نێزیکی (٣٠٠) کەسانە، یەکەم خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٤)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا (٢٠٠٤)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن، هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ باباو:

ئێکە ژ گوندێن کوردێن موسلمان ل دەڤەرێ، سالا (١٩٧٥)ێ هاتبوو تەعریبکرن،پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ خەلکێ رەسەنێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ،ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٥٦ کەس بوون[٢٢] و نها نێزیکی (٥٠) کەسانە، ل سالا (١٩٧٢)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا (١٩٧١)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن، هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ نێچەیێ:

ناڤێ گوندی یێ ژ (نێچیرێ) هاتی کو پرانییا خەلکێ وی ئەڤ کارە دکرن، ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٣ کەس بوون(٢٣) و نها نێزیکی(٨٣) کەسانە، یەکەم خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٩)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا (١٩٧٩)ێ پرۆژەیێ ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن، و ل هەمان سال هێلا کارەبێ ژی گەهشتییە گوندی.

## گوندێ گلەشین:

گوندەکێ کوردێن موسلمانە، ژمارا ئاکنجییێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٥٥ کەس بوون[٢٤] و نها نێزیکی (٤٠٠) کەسانە، سالا (١٩٧٠)ێ خواندنگەهـ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، سالا (١٩٧٠)ێ پرۆژەیێ

ئاڤێ بۆ گوندی هاتییە دروستكرن، هێلا كارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی، سالا (٢٠٠٥)ێ حكۆمەتا هەرێما كوردستانێ خواندنگەهەك لێ ئاڤاكر.

## گوندێ زێوا محەمەد رەشان:

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتیا (١٥كم) باشوورێ جادا سەرەكیا دهۆك- هەولێر، رووبەرێ عەردێ وی دگەهیتە (١٨٠٠) دۆنەمان كو ب ناڤێ وەقفێ نە ل بەغدا، لێ خەلكێ گوندی بەرهەمێ وی ل رێورەسم و جەژنان بۆ مێهڤانان د مەزێخن. ناڤێ گوندی یێ ژ (محەمەد رەشان) هاتی كو وەلیەكێ سالح بوو ژ چینا پیرانێ و خودان هێز و كەرەم بوو ل سالا (١١٢٥ز)، لەوما هەتا نها دبێژنێ (زێوا پیر محەمەد رەشان).

### سنوورێن گوندی:

**باكووری:** گرت كال.

**باشووری:** چیایێ مەقلووبی.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ قەیماوا.

**باكوورێ رۆژئاڤایی:** كەلەشین.

### پێكهاتا خەلكێ گوندی:

ئەڤ گوندە گوندەكێ ئێزدینشینە ژ چینا پیرێن محەمەد رەشان، ژمارا ئاكنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٠ كەس بوون[25] و نها نێزیكی (٢٣) سەرخێزانن، كو دبنە (١٢٤) كەس.

ڤێ گوندی گەلەك نیشانگەهێن خاسان و بابچاكان لێ هەنە، كو ژمارا وان دگەهنە (٤٢) نیشانگەهان و ل سەدسالیا دووازدێ هاتینە سەرەدانا پیر محەمەد رەشانە ل سەر دەمێ شێخادی، ژ وانان ژی:

(پیر محەمەد رەشان، پیر رەشان، دایكا چاك، پیرێ جەروا، شێشمس، ئامادین، شێخۆ بەكر، شێخ بابك، شێخ ناسردین، خدرلیاس و خدر نەبی، بەرێ فەقیرا، خاتونا فەخرا، پیر هەسلەمەمان، سەخریجن، كتكا، شێخ مەند و ...هتد.

### ڤی گوندێ سێ بركێن ئاڤێ ب ڤی رەنگی لێ هەنە:

١- بركا داخوازیا رەحمێ و بارانێ و ئاف فەخوارنێ، كو ل وەرزێ بهارێ ئێزدی ژ هەمی دەڤەرێن ئێزدییان و ب تایبەتی ژ كۆمەلگەها مەهەتێ قەستا وی مەزارگەهی دكەن و دێ مجێوری یان ئێك ژ مالا وان كەنە دناڤ بركێ دا دەستێن خۆ بۆ خودێ و محەمەد رەشانی بلند كەن دا رەحمەكێ ببارینت و خێر و بەرەكەت بكەڤیتە دەخل و دانی.

٢- بركا كلیلا گوهـ ئێشێ، ل دووڤ كەڤنە باوەریا خەلكێ دەڤەرێ كو هەر كەسەكێ گوهێ وی ب ئێشیت دێ كلیلا دەرگەهێ ئاڤاهیێ محەمەد رەشانی ل وێ بركێ هەلینن و دێ ئێخنە دوی گوهێ ب ئێش دا، دا ئەو ئێش بچیت.

٣- بركا گوریاتییێ، كو هەر كەسەكێ گوری ببیت دئێخنە دوێ بركێ دا ساخ بیت.

پرۆژەیێ ئاڤا گوندی ل سالا (٢٠٠٩)ێ هاتییە دروستكرن و هێلا كارەبێ ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی[26].

## گوندێ سێگرك:

یەك ژ وان گوندانە كو ل سالا (١٩٧٥)ێهاتییە تەعریبكرن و نها چۆلە، دكەڤیتە دووراتیا (٣كم) باشوورێ رێكا سەركیا دهۆك - هەولێر، ناڤێ گوندییێ ژ سێ گركا هاتی كو لێ هەنە، رووبەرێ عەردێ وی (١٣٠٠) دۆنەمن و سنوورێ نوی ژی ب ڤی رەنگینە:

**باكووری:** گوندێ پیران.

**باشووری:** گوندێ گر فەقیر.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ زیناڤا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێ مەحمووداا.

پێكهاتا خەلكێ وی كوردێن موسلمان و ئێزدی بوون، ئێزدی ژی ژ چینا مریدانە ژ عەشیرەتێن دوملی، خیسكی، مامۆسی، ترك، وخەلكێ وی نها ل كۆمەلگەها مەهەتێ د ئاكنجینە، ژمارا

سەرخێزانێن وان دگەهنە (١٢) سەرخێزانان، کو دبنە (٦٢) کەس[٢٧].

## گوندێ پیران مەقلووب:

ئێکە ژ وان گوندێن کوردێن موسلمان، ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە تەعریبکرن، پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ خەلکێ رەسەنێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١١٣ کەس بوون[٢٨] و نها تنێ (١١) کەس ل گوندی دژین، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ بۆ هاتییە دروستکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ قەیماوا:

ئێکە ژ وان گوندێن کوردێن موسلمان، ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە تەعریبکرن، پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ خەلکێ رەسەنێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ، ژمارا خەلکێ وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٨٧ کەس بوون[٢٩] و نها (٣٨٨) کەس ل گوندی دژین، بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل سالا (١٩٦٠)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ بۆ هاتییە دروستکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ گردەکال:

ئێکە ژ وان گوندێن کوردێن موسلمان، ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە تەعریبکرن، پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ خەلکێ رەسەنێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ، نها(٤٧) کەس ل گوندی دژین، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠٠٦)ێ بۆ هاتییە دروستکرن و کارەب ل سالا (٢٠٠٩)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ گر فەقیر:

ئێکە ژ وان گوندێن کوردێن موسلمان، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١١٥ کەس بوون[٣٠] و نها نێزیکی (١١٤) کەسان ل گوندی دژین، بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٣)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٧٨)ێ بۆ هاتییە دروستکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی. سالا (٢٠٠٤)ێ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ خواندنگەهەك لێ ڤەکر.

## گوندێ ئاڤەدلیێ:

ئێکە ژ وان گوندێن کوردێن موسلمان، ل سالا (١٩٧٥)ێ هاتییە تەعریبکرن، پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ خەلکێ رەسەنێ گوندی زڤرینەڤە سەر گوندێ خۆ، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤٤ کەس بوون[٣١] و نها تنێ (٢٧) کەس ل گوندی دژین، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠٠٥)ێ بۆ هاتییە دروستکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ رکابە مەزن:

گوندەکێ عەرەبنشینە ژ هۆزا زهیرات، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٢ کەس بوون[٣٢] و نها نێزیکی (٧٧٠) کەسان ل گوندی دژین، بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٧)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٨٠)ێ بۆ هاتییە دروستکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی. خواندنگەهـ و بنکەهێ تەندروستی سەرب حکۆمەتا ناڤەندڤە لێ هەنە.

## گوندێ تاق میکائیل:

گوندەکێ عەرەبنشینە ژ هۆزا حەدیدی، ژمارا ئاکنجیێن وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٢کەس بوون[٣٣] و نها (٤٧٥) کەسن، بۆ یەکەم جار خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٢)ێ ل ڤی گوندی هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٨٥)ێ بۆ هاتییە دروستکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی. بنکەهێ ساخلەمیێ ژی ل سالا (٢٠١٤)ێ لێ هاتییە ڤەکرن.

# ناحیا کەلەکچی

محەمەد عارف تاتار

کەلەکچی وەکو کۆمەلگەهـ هەتا ٢٠١٤/٥/٢٧ێ سەر ب ناحیا قەسرۆکێ ڤەبوو و پشتی هینگێ ب بریارا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ بوویە ناحیە و نەهـ گوندان ب خۆڤە دگریت و هەر نەهـ د ئاڤانە.

کەلەکچی د بنیاتدا گوندەکێ بچویك بوو، ل سالا (١٩٦٦)ێ ٥٥ سەرۆکخێزان ل گوندی دژیان، هەر د وێ سالێدا گوند بوویە دو پشك کەلەکچی سەروو و کەلەکچی خواروو[1]، دەڤەرا کەلەکچی کو پشکەکە ژ بنارا چیایێ مەقلوبی پشتی شکەستنا شۆرشا کوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ وەك گەلەك دەڤەرێن کوردستانێ کەتە بەر هەوا ڤەگوهاستنا گوندان و ئاکنجیکرنا عەرەبان ل شوونا کوردان، ل ١٥ گولانا ١٩٧٥ێ گوندێ گرد فەقیر هاتەڤەگوهاستن بۆ گوندێ کەلەکچی ژ بەرکو گوندەکێ دەشت بوو و ب ساناهی دەزگەهێن رژێمێ دا کۆنترۆلێ ل سەر کەن، ل بەراهیێ نە هێلان ئەو خەلکە بۆ خۆ خانییەکی یان ئاڤاهییەکی ئاڤاکەن و مانە ل چولی، هەتا ل ١٥ تەباخا ١٩٧٥ێ رێك دایە وی خەلکی ل دووڤ شیانێن خۆ بۆ خۆ خانییان ئاڤاکەن، دەملدەست پشتی ڤەگوهاستنا گوندێ گردفەقیر بۆ ناڤ گوندێ کەلەکچی بنکەهەکێ پۆلیسان ل گوندی ئاڤاکر و پاشتر دەست ب ڤەگوهاستنا گوندێن دی یێن دەڤەرێ بۆ ناڤ کەلەکچی کرن و ب ڤێ چەندێ کەلەکچی ژ گوندەکێ بچووك بوو کۆمەلگەهەك مەزن و د وێ قۆناغێدا نێزیکی (٧٠٠) مال ب خۆڤەدگرتن، خەلکێ کۆمەلگەهێ د سەروبەرەك دژواردا دژیا، بێ بەهرەبوون ژ هەموو رەنگە خزمەتگوزارییان و خانی و جهێن وان هندی بێژی بێ سەروبەربوون، تنێ ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنێ جۆیەکا ئاڤێ بوو، ئەو ژی ئاڤەك پیس و نەیا ڤەخوارنێ بوو و ب بەرفرەهی نەخۆشییا مەلاریایێ ل ناڤ وان بەلاڤبوو، د شەڤ رۆژەکاندا حەفت هەشت زارۆك ژ نەخۆشیێ یان پێڤەدانا دوپشکان دمرن، دەمی رێك دایە وی خەلکی بۆ خۆ خانییان ئاڤاکەن، ل سەر وی خەلکی هاتەسەپاندن هەر مالەك ب ئەرکێ چێکرنا ١٥٠ لبنان بۆ ئاڤاکرنا خواندنگەهێ رابیت و خواندنگەهـ ب زیارە ژ لایێ وی خەلکیڤە بۆ کۆمەلگەهێ ئاڤاکرن، هەر وێ سالێ بنکەهەکێ ساخلەمیێ ل کۆمەلگەهی هاتەئاڤاکرن[2]، نها خەلکێ ٢٨ گوندێن د سالێن حەفتییاندا هاتینە راکرن و ب عەرەبکرن ل ڤی کۆمەلگەهی دژین، رووبەرێ کەلەکچی ١١٠٠ دۆنەمە و سەرجەمێ عەردێ وێ ل دووڤ ماستەرپلانا نوو (٣٨٠٠ دۆنەمە) و ٤٥٠٠ خانی لێ هەنە و دبنە ٦٥٠٠ سەرخێزان[3]،و ل دووڤ ئامارێن تەخمینکرییێن رێڤەبەریا ئامارا دهۆکی بۆ سالا ٢٠١٦ هژمارا خەلکێ سەرانسەری ناحیێ دبیتە ٣٣٠٣٣ کەس ژ وانا ٣٠٢١٣ کەس ل سەنتەرێ ناحیێ و بازێرکێن وێ دژین و ٢٨٢٠ کەس ژی ل گوندێن سەر ب ناحیێ ڤە دژین[4].

ل سەر ناڤێ کەلەکچی دیارە کو ئەڤ ناڤە ژ کەلەکێن ئاڤێ هاتییە کو دکەڤن دا ل سەردەمێن سۆمەری و بابلی و ئاشووری، پەیکەر ل ڤێرە ژ بەران د هاتنە چێکرن و نکراندن و ب کەلەکێن ئاڤێ دەربازی باشوورێ عیراقێ دکرن و وەکی بەلگە ل سەر وێ چەندێ دەرکەفتنا شێرەکی ل سالا (٢٠١٣)ێ ل ناڤ سەنتەرێ کەلەکچی ل نێزیکی رووبارێ خازری کو ب شێوەیەکێ هونەری هاتییە نکراندن و پشتی ئەو پەیکەر بۆ مۆزەخانا دهۆکێ هاتییە ڤەگوهاستن و ڤەکۆلین ل سەر هاتینەکرن، مێژوویا وی ڤەگەراندنە سەردەمێ دەولەتا میتانی و دبیت ل دەمێ ڤەگوهاستنێ ئەڤ شێرە کەتبیتە د ئاڤێ دا و نەشیاینە بیننە دەر، چونکی سەنگا وی نێزیکی دو تەنانە[٥].

ڤی جهی گەلەک جهێن شوینواری لێ هەنە و ل سالا (٢٠١٢)ێ شاندەکێ زانکۆیا (ئودینی) یا ئیتالی رابوویە دگەل تیمێن رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ ب ئەنجامدانا ڤەکۆلینێن شوینواری ل گوندێ تل گۆمل (تل جومل)، دگەل پیڤانا شوینواریا (المسح الاثاری)یا دەڤەرێ.

کەلەکچی ل سەر نەخشەیێ کوردستانێ دکەڤیتە دەڤەرەکا دەشتێ (١,٣٣١م) ژ ئاستێ دەریایی بلندە، سنوورێن کەلەکچی ب ڤی رەنگینە:

**باکووری:** گوندێ گرک.

**باشووری:** گوندێن گەرمك.

**رۆژهەلاتی:** گوندێ گوندێن گرگەجوو و گرێکا.

**رۆژئاڤایی:** گوندێن تل گۆمل، ئاڤدەلی و دەروێشان[٦].

## پێکهاتا جڤاکی:

خەلکێ وێ هەمی کوردێن موسلمانن و پتریا وان ژ عەشیرەتا گۆرانن ژ تیرەیێن (ئومەری، داوودی، رۆژبەیانی، گێژ و...هتد). ژمارا ئاکنجیێن گوندێ

ناحیا کەلەکچی



کەلەکچی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٦٨کەس بوون[٧]. لێ وەکی ناحیە نێزیکی (٣٥٠٠٠) کەسانە و ژیانا وان ب رەنگەکێ گشتی ل سەر چاندنا دەخل و دانی یە ژ گەنم و جەهان، زێدەباری دەرامەتێن ئاڤی ژ کەسکاتی و بەقلەمەنیان ژبەر هەبوونا سێ رووباران، ئەو ژی خازر و گۆمل و نێردۆشن، هەر وەسان خەلکێ وێ تەرش و کەوالی و مێشێن هنگڤینی و پەلەوەران ژی ب خودان دکەن، زێدەباری گەلەك ژ خەلکێ وێ د دەزگەهێن میری دا کاردکەن، وەکی فەرمانبەر و مامۆستا و پێشمەرگە.

ل رۆژا ١٢ ئادارا ١٩٩١ێ سەرهلدانا کوردستانێ کۆمەلگەها کەلەکچی ڤەگرت و هەموو خەلکێ کۆمەلگەهێ ب هەڤرا دژی دەستەلاتێ بەعسییان سەرهلدان و د دەمەکێ کورتدا کۆمەلگەهـ رزگار کر و ئالایێ کوردستانێ ل کۆمەلگەهی بلندکرن[٨].

یەکەم رێڤەبەرێ ل ڤێ ناحیێ هاتییە دامەزراندن بشار محەمەد عەبدوللا بوو.

**ڤێ ناحیێ چەند فەرمانگەهـ ب ڤی شێوەی هەنە:**

بنکەهێ پۆلیسان، جێگیریا ئاسایشێ، بنکەهێ سەخبێرکرنا ئاڤێ، سەرۆکاتیا باژێرڤانیا کەلەکچی،دو بنکەهێن ساخلەمیێ، بنکەهێ سەخبێرکرنا کارەبێ، بنکەهێ بەرەڤانیا باژێری، ژبلی هەبوونا سەنتەرەکێ رەوشەنبیری و ٢٧ مزگەفتان ل سنوورێ ناحیێ.

**ناڤێ خواندنگەهێن سەنتەرێ ناحیێ:**

١- ئامادەیا کەلەکچی یا کوڕان، ل سالا (٢٠٠٥)ێ هاتییە دامەزراندن.

٢- ئامادەیا کەلەکچی یا کچان، ل سالا (٢٠١٢)ێ هاتییە دامەزراندن.

٣- ئامادەیا هەرێم یا کوڕان، ل سالا (٢٠١٤)ێ هاتییە دامەزراندن.

٤- خواندنگەها بیستون یا بنەرەتا کوڕان، ل سالا (٢٠١٣)ێ هاتییە دامەزراندن.

٥- خواندنگەها زاگرۆس یا بنەرەتا تێکهەل، ل سالا (٢٠١٤)ێ هاتییە دامەزراندن.

٦- خواندنگەها هێرش یا بنەرەتا کچان، ل سالا (١٩٧٦)ێ هاتییە دامەزراندن.

٧- خواندنگەها کەلەکچی یا بنەرەتا کوڕان، ل سالا (١٩٨١)ێ هاتییە دامەزراندن.

٨- خواندنگەها کەلەکچی یا بنەرەتا کچان، ل سالا (٢٠١٢)ێ هاتییە دامەزراندن.

٩- خواندنگەها خازر یا بنەرەتا کوڕان، ل سالا (١٩٨٢)ێ هاتییە دامەزراندن.

ب کورتی ١٣ خواندنگەهـ لێ هەنە، دو ئامادەیێن تێکهەل و نەهـ بنەرەتێن تێکهەل، ژ بلی ئێکا بنەرەتا کوران و ئێکا بنەرەتا کچان.

## زێدەرێن ژیارا خەلکێ ناحیێ:

پتریا خەلکێ وێ جۆتیارن و رووبەرەکێ بەرفرەهێ عەردێ چاندنێ هەیە کو دگەهیتە (١٨٣٧٩) دۆنەمان، هەر وەسان گەلەك ژ خەلکێ وێ کاسبکارن و نێزیکی ٢٠ کارگەهێن خیزی و حەسۆی لێ هەنە.

# گوندێن ناحیا کەلەکچی:

## گوندێ دارەتوو خازر:

گوند دکەڤیتە دووراتیا (١٠کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ دارا توێ هاتی.

### پێکهاتاجڤاکی:

خەلکێ وی ژ عەشیرەتێن گۆران و دۆسکینە، ژ بنەمالێن گوندی بنەمالا شێخ محەمەد عەلی و بنەمالا محەمەد سلێمان، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٢ کەس بوون[٩] و نها نێزیکی ١١٠ سەرۆك خێزانانە کو دبنە ٦٧٠کەس.

ئەڤ گوندە دو جاران هاتییە خرابکرن و جارەکادی ئاڤەدانبوویە ڤە.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ و ب خودانکرنا تەرش و کەوالی یە.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (٢٠٠١)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییەڤەکرن و هەردو پرۆژەیێن ئاڤێ و کارەبێ ل سالا (١٩٧٥)ێ لێ هاتینە دروستکرن.

## گوندێ گرك سوباشی:

ئەڤ گوندە نها بەشەکە ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ ئاخا ب زاخ و قەلەو هاتی، خەلکێ وی تێکدا ژ عەشیرەتا گۆرانن، ژ بنەمالێن وی بنەمالا وردەك، ژمارا گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٤٥ کەس بوون[١٠] و نها نێزیکی ٢١ سەرۆك خێزانانەکو دبنە ١٠٥ کەس.

گوند جارەکێ هاتییە خرابکرن و جارەکادی ئاڤابوویەڤە.

ژ جهێن دیار و بەرچاڤ ل گوندی مەزارێ شێخ حەسەنە.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی یە کو هەردو رووبارێن نێردۆش و خازر لێ هەین و ژ دەرامەتێن چاندنێ: گەنم و جەهـ و کرتووپ و جۆرێن شینکاتی.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (٢٠٠٣)ێ خواندنگەهـ گەهشتییە گوندی و پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠٠٥)ێ هاتییە دروستکرن و هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٨٠)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ زیناڤا نوی:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا(٢,٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ زینە هاتی، خەلکێ وی تێکدا ژ عەشیرەتا گۆرانن، ژ بنەمالێن وی بنەمالا محەمەد تاهر یونس، ژمارا سەرخێزانێن گوندی ٦٤ سەرۆك خێزانن و دبنە ٣٥٠ کەس.

گوند دو جاران هاتییە خرابکرن و جارەکادی ئاڤابوویەڤە.

ژ جهێن دیار و بەرچاڤ ل گوندی گرێ محەمەد عەرەبە.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی یە، ژ دەرامەتێن چاندنێ: گەنم و جەهـ و کرتووپ (پتات) و جۆرێن شینکاتی.

سالا (٢٠٠٤)ێ بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ گەهشتییە گوندی و پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٩٦)ێ بۆ هاتییە دروستکرن و هێلا کارەبێ سالا (١٩٨٣)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ زیناڤا کەڤن:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ زینە هاتی، خەلکێ وی تێکدا ژ عەشیرەتا گۆرانن، ژ بنەمالێن وی بنەمالا یونس عەبو داودی، ژمارا سەرخێزانێن گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٦٥ کەس بوون[١١] و نها نێزیکی ٦٥ سەرۆك خێزانان ل گوندی دژینکو دبنە نێزیکی ٤٦٥ کەسان.

گوند دو جاران هاتییە خرابکرن و جارەکادی ئاڤابوویەڤە.

ژ جهێن دیار و بەرچاڤ ل گوندی گرێ شێخ مەولودە.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی یە، ژ دەرامەتێن چاندنێ: گەنم و جەهـ و کرتووپ و جۆرێن شینکاتی، هەر وەسان تەرش و کەوالی ژی ب خودان دکەن و دناڤ مالان ژی دا پەلەوەران مینا مریشك و قاز و عەلۆك و مێشێن هنگڤینی ب خودان دکەن. ژێدەرێ ئاڤا وان رووبارێ گوملی یە.

بۆ جارا ئێکێ ل سالا (٢٠٠٣)ێخواندنگەهـ ل گوندی هاتییەڤەکرن و پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٦٦)ێ هاتییە دروستکرن و هێلا کارەبێ ژی ل سالا (١٩٧٧)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ تل گۆمل:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا(٤,٥کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ و (٦کم) رۆژهەلاتێ چیایێ مەقلوبی، ئەڤ گوندە ل رۆژهەلاتێ رووبارێ (گومری)یە، ناڤێ ژ گرێ گومر هاتییە، ناهێتەزانین ئەڤ گوندە د کیژ سەردەمیدا هاتییەئاڤاکرن، هندەك ئاماژە ب وێ چەندێ دکەن کو شەرێ گوکامیلا (گوگمیلە) د ناڤبەرا ئەسکەندەرێ

مەقدۆنی و داریوسێ ئیرانێ ل سالا (٣٣١ ب. ز) ل ڤی جهی روودایە[١٢]، یا پتر پشتەڤانییا ڤێ بۆچوونێ دکەت، راگەهاندنەکا رێڤەبەریا شوینوارێن دهۆکێ یە ل رۆژا ٢٥ تیرمەها ٢٠١٦ێ ژ ئەنجامێ دووڤچوون و پشکنینێن خۆ دیارکرییە کو چوار بەرکێن مەنجەنیقێ ل ڤی گوندی هاتینەدیتن کو دیرۆکا وان دزڤریتەڤە سەردەمێ شەرێ گوکامیلایێ سالا (٣٣١ ب. ز)، ئەڤە ژی نیشانا کەڤناتییا گوندی و ڤێ دەڤەرێ یە.

خەلکێ گوندی ژ عەشیرەتا سۆرچیانە، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٢٨٢ کەس بوون[١٣] و نها نێزیکی ٢٦ سەرۆک خێزانان ل گوندی دژین کودبنە نێزیکی ١٤٠ کەسان.

گوند دو جاران هاتییە خرابکرن و جارەکادی ئاڤابوویەڤە.

ژ جهێن دیار و بەرچاڤ ل گوندی گرێ تل جومل.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی یە، ژ دەرامەتێن چاندنێ: گەنم و جەهـ و جۆرێن شینکاتیێن هاڤینی، هەر وەسان تەرش و کەوال و پەلەوەر ژی دهێنە ب خودانکرن. ژێدەرێ ئاڤا وان رووبارێ گوملی یە.

پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠١٠)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن و یێ کارەبێ ل سالا (٢٠٠٩)ێ و تا نها خواندنگەهـ لێ نینە.

## گوندێ ئاڤدەلی:

گوند دکەڤیتە دووراتییا (٤کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ ئاڤدەل بەگێ هاتی، پێکهاتا خەلکێ وی ژ عەشیرەتا گۆرانن، ژ بنەمالێن گوندی بنەمالا رەشید عەلی، ژمارا سەرۆک خێزانێن وی ٦ سەرۆک خێزانن کو دبنە ٣٧کەس.

گوند دو جاران ل سەر دەستێن رژێمێن عیراقی هاتییە کاڤلکرن و جارەکادی ئاڤەدانبوویە ڤە.

ژ جهێن دیار و بەرنیاس ل گوندی گرێ گرەشک و کانی رەشە.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەت

گوندێ زیناڤا



چاندنا گەنم و جەھـ و کرتووپ و شینکاتیێن هاڤینی، زێدەباری ب خودانکرنا تەرش و کەوالی. ژێدەرێ ئاڤا وان ژی هەردو رووبارێن گومل و دەلیجەیە، زێدەباری کانییا رەش.

پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠٠٥)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن و یێ کارەبی ل سالا (٢٠٠٤)ێ و تا نها خواندنگەھـ لێ نینە.

## گوندێ دوریشان:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (٣,٥کـم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ ناڤێ دەروێش هاتی، خەلکێ وی تێکدا ژ عەشیرەتا گۆرانن، ژ بنەمالێن گوندی بنەمالا شێخ مراد و بنەمالا شێخ سالح و بنەمالا شێخ جەواد، ژمارا ئاکنجیێن گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٨٤ کەس بوون[١٤] و نها ٧٥ سەرۆك خێزانن کو دبنە نێزیکی ٤٧٥ کەسان.

گوند جارەکێ هاتییە خرابکرن و جارەکادی ئاڤابوویەڤە.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنێ یە، ب تایبەتی گەنم و کرتووپان، هەر وەسان تەرش و کەوالی ژی ب خودان دکەن و دناڤ مالان ژی دا پەلەوەران مینا مریشك و قاز و عەلۆك ب خودان دکەن. ژێدەرێ ئاڤا وان رووبارێ گوملێ یە.

خواندنگەھـ ل سالا (١٩٧٠)ێ لێ هاتییە ڤەکرن، هێلا کارەبێ سالا (١٩٨٠)ێ گەهشتییە گوندی،پرۆژەیێ ئاڤێ ژی ل سالا (٢٠٠٤)ێ بۆ هاتییە دروستکرن.

## گوندێ گەرمك گچکە (بچویك):

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (٣کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ کانییا گەرم هاتی، خەلکێ وی ژ عەشیرەتا گۆرانن، ژ بنەمالێن وی بنەمالا عەلی وەلی، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٦ کەس بوون[١٥] و نها ٣٠ سەرۆك خێزان لێ دژین کو دبنە نێزیکی ١٥٨ کەسان.

گوند جارەکێ هاتییە خرابکرن و جارەکادی ئاڤابوویەڤە.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی یە، ب تایبەت گەنم و کرتووپان، زێدەباری خودانکرنا تەرش و کەوالی، هەر وەسان پەلەوەران ژی دناڤ مال دا ب خودان دکەن. ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژی رووبارێ خازر و کانی گەرماوە.

سالا (٢٠٠٧)ێ خواندنگەھـ لێ هاتییە ڤەکرن، پرۆژەیێ ئاڤێ سالا (٢٠٠٩)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن و هێلا کارەبێ سالا (٢٠٠٦)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ گەرمك مەزن:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا (٦کم) ژ سەنتەرێ ناحیێ، ناڤێ گوندی یێ ژ کانییا گەرم هاتی، خەلکێ وی ژ عەشیرەتا گۆرانن، ژ بنەمالێن وی بنەمالا سەلیم عدۆ، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٥ کەس بوون[١٦] و نها ١٩ سەرۆك خێزانن کو دبنە ١١٠ کەس.

گوند جارەکێ هاتییە خرابکرن و جارەکادی ئاڤابوویەڤە.

ژیانا خەلکێ وی ل سەر چاندنا دەرامەتێن دێم و ئاڤی یە، ب تایبەت گەنم و کرتووپان، زێدەباری خودانکرنا تەرش و کەوالی، هەر وەسان پەلەوەران ژی دناڤ مال دا خودانکەن. ژێدەرێ ئاڤا گوندی ژی رووبارێ خازر و کانی گەرماوە.

پرۆژەیێ ئاڤێ سالا (١٩٦٨)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن و هێلا کارەبێ سالا (١٩٨٦)ێ گەهشتییە گوندی و هێشتا خواندنگەھـ لێ نینە.

# ناحیا باعەدرێ

محەمەد عارف تاتار
خەلات ئەلیاس*

باعەدرێ** دهێتە هژمارتن یەك ژ بنگەهێن گرنگێن ئێزدییان ل باشوورێ کوردستانێ، دکەڤیتە باکوورێ رۆژهەلاتا باژێرێ مووسل ب نێزیکی (٥٠کم) و رۆژهەلاتا باژێرێ دهۆکێ ب نێزیکی (٣٠کم) و رۆژئاڤایێ سەنتەرێ قەزا شێخان (ئێسڤنێ) ب نێزیکی (٩کم). ل بەرێ ژمارا خێزانێن ئاکنجی ل باعەدرێ (٥٠- ٦٠) مالا بوون، ئەو ژی بنەمالێن میری و قەوال و پیرا بوون. ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٦٠ کەس ل باعەدرێ دژیان[1]، لێ ل داوییا سالێن حەفتیان و پشتی هەوێن تەعریبێ و خرابکرنا دەڤەرێن شنگال و زاخۆ، گەلەك ژ خەلكێ وان ل ڤێ دەڤەرێ ئاکنجیکرن، نها سەرژمێریا تەخمینییا ناحیا باعەدرێ ل سالا (٢٠١٦)ێ نێزیکی (١٦١٤٨) کەسە، ژ وانا (١٠٥٨٢) کەس ل مەلبەندێ ناحیێ و کۆمەلگەهان دژین و (٥٥٦٦)کەس ل گوندێن سەر ب ناحیێ دژین[2]. رووبەرێ عەردێ وێ ژی دگەهتیە (٨٦٧١) دۆنەمان، ل سالا (١٩٩٨)ێ باعەدرێ بوویە یەکەیەکا ئیداری (ناحیە) و نەهـ گوند ب سەرڤەنە. گەلەك بۆچوون ل دۆر بنیاتێ ناڤێ باعەدرێ هەنە، هندەك دبێژن ناڤێ باعەدرێ یێ ژ دو پەیڤا پێکهاتییە: (با) و (عەدر)، ئانکو عەردێ پان، بووچۆنەکا دی هەیە دیار دکەت کو (باعەدرێ) ناڤەکێ ئارامییە ژ (بیت عەدرا)، یان (بیت العذراء) هاتییە، ئانکو (وارێ ئێزیدا)[3]، هندەك دبێژن یێ ژ (بابێ عەردی)، کو با ژ عەردی دچیت ژبەر یا ل جهەکێ نزم هاتییە ئاڤاکرن و ئێزید ئانکو خودایێ رۆژێ (میترا- شێشمس) ئەڤجا ل دوف ڤێ بووچوونێ، (بیت عەدرا) دبتە وارێ خوداوەندێ رۆژێ یێ کو جهەکێ تایبەت د میتۆلۆجیا دیانەتێ ئێزدییاتیێدا هەی، ژ بەر ڤێ گرنگییا دینی یا باعەدرێ کو بنگەهێ خوداوەندێ رۆژێ بوو و چاوان بنگەهێ ئێزدییان بوو، وەسان دبتە بنگەهـ و پایتەختێ ئێزیدخانێ، دگەل ڤان بووچوونێن مە خۆیاکری هندەك بۆچوونێن دی هەنە لێ بۆچوونا دووێ یا مە خۆیاکری راستییا ناڤێ باعەدرێ ددەتە خۆیاکرن.

ل دۆر دیرۆکا باعەدرێ بەریەرێن وێ کەڤناریبا ڤێ باژێرۆکێ رەسەنێ کوردی دیار دکەت، یێ کو ل سەر دەمێ کەڤن دا دهات هژمارتن سەنتەرەکێ سەرەکی یێ دینی ئێزدییان، و ١٨ میرێن ئێزدییان حوکمرانی لێ کرینە، ئێك ژ بەرنیاسترینێن وان (مەیان خاتۆن) بوو، کو ل سالا (١٨٧٣)ێ ژ دایکبوویە، ژیانا خۆ ل میرگەها باعەدرێ دەرباز کرییە، پاشی خێزانی دگەل کورمامی خۆ (میر عەلی بەگ کورێ حسێن بەگ) پێکئانییە، پشتی هەڤژینێ وێ ل سالا (١٩١٣)ێ هاتییە کوشتن، ئەو بوویە میرا باعەدرێ و چەندین

سالان حوکمرانی لێ گێرایە.

دپەرتووکا (عیراقا کەڤن دا) هاتییە کو دەمێ ئەسکەندەرێ مەقدۆنی ژ رووبارێ دیجلە را دەرباز بووی، ئەو دەڤەرەکێ را بووری ب ناڤێ (ئێزیدا) بەری بکەڤە مەیدانا شەری دگەل شاهێ هەخامەنشی (داریۆشێ ئێکێ )ل سالا (۳۳۱پ. ز)[٤]، خۆیایە کە مەبەست ژ(ئێزیدا) وارێ ئێزیدایە، ئانکو باعەدرا نها.

ژێدەرێن ئیسلامی ژی ژ مەرا خۆیا دکەن کو باعەدرێ دەڤەرەکا گرنگ بوویە لەورا بوویە ئارمانجا (فتوحاتێن) ئیسلامی، هەروەك دەڤەرێن دی یێن کوردان، دپەرتووکا (فتوح البلدان) دا هاتییە کو دەمێ عومەرێ کورێ خەتابی ل سالا (۲۰مشەختی) عەتبە کورێ فەرقەدەی کرییە والیێ مووسلێ، وی ل دەڤەرێن دەور و بەرێن مووسلێ مللەتەك دیت پەرستنا خالقێ شەڤ و رۆژان دکر، ئەو ژی ئێزدیێن باعەدرێ و شێخان و داسن و دۆبانا دهۆکێ بوون. لەورا سەرەدەری دگەل وان وەکی سەرەدەریا دگەل جوی و مەسیحیان (خودان پەرتووکێن پیرۆز) دکر، هەر وەکو د (فتوح البلدان) دا هاتی باعەدرێ و بنگەهێن دی یێن ئێزدییان دکەڤنە بن دەسەلاتا موسلمانێن عەرەب و دگەل خەلکێ وێ ئاشت دبن بەرامبەر دانا جزیێ[٥].

ل سەر دەمێ ئۆسمانییان باعەدرێ رۆلەکی مەزن و بەرچاڤ د دیرۆکا دەڤەرێ دا هەبوویە، ب تایبەت دەمێ بوویە پایتەختێ داسنییان، دەمێ حوکمێ میرێ وێ یێ بەرناس حوسێن بەگێ داسنیا یێ کو ژ باعەدرێ حوکم ل گەلەگ دەڤەرێن باشوورێ کوردستانێ دکر نەمازە پشتی دەولەتا ئۆسمانی ل سال (۱۵۳٤ز)ێ ل سەر دەمێ سولتان سلێمانێ قانوونی دانپێدان ب فەرمی ب ڤێ میرگەها ئێزدییان کری[٦]. وەسان باعەدرێ ل سەر دەمێن داهاتی دمینت پایتەختێ میرگەها ئێزدییان، ب تایبەت پشتی بەرتەنگبوونا سنوورێن وێ کو بتنێ دەڤەرا شێخان دگەل گوندێن وێ و چیایێ مەقلووب گرتبوو دگەل دەڤەرێن دناڤ

باعەدرێ



بەرا خابوور و رووبارێ دیجلە و دەڤەرا چیایێ شنگال، ب ڤی ئاوایی و هەر ژ دەسپێکا سەدسالییا هەڤدێ ناڤێ میرگەها ئێزدییان دبتە میرگەها شێخان، باعەدرێ ژی دبتە سەنتەرێ وێ یێ سەرەکی یێ کو میرێن ئێزدییان ژ وێ دەرێ حوکمێ ئێزیدخانێ دکرن[٧]، ژبەر گرنگییا خۆ، باعەدرێ بۆ پایتەختێ میرگەها شێخان و بۆ جهێ سەرەدان و پووتە پێدانا گەلەك لێگەرۆك و شوینوارناسان، ب تایبەت یێن بیانی وەکی شوینوارناسێ بریتانی (لایارد)، کو ل سالا (١٨٤٦ز)ێ سەرەدانا وێ کری و میرێ ئێزدییان حسێن بەگی پێشوازی لێکری[٨]، هەر وەسا گەرۆکێ رۆسی ل سالا (١٨٤٣ز)ێ سەرەدانا باعەدرێ کرییە و گەلەك پێزانین د ڤێ سەرەدانا خۆ دا توومارکرینە، دیار دکەت کو باعەدرێ ژ (١٠٠) مالا پێکهاتبوو[٩] و بنکەهێ میرێ ئێزدییانە.

باعەدرێ وەکو پایتەختێ میرگەها ئێزدییان یا بێ بەهر نەبوو ژ گەلەك کارەسات و فەرمانێن ب سەر ئێزدییان دا هاتین، ب تایبەت ل سەر دەمێ ئۆسمانییان، بۆ نموونە وەکو فەرمانا فەریق عومەر وەهبی پاشا ل سالا (١٨٩٢ز)ێ یێ کو باعەدرێ داگیرکری و میرێن ئێزدییان لێ گرتین وهندەك ژێ د زیندانا دا ئەشکەنجەداین و هندەکێن دی ژ وارێ وان دوورکرین وەکو (عەلی بەگێ کورێ حسێن بەگێ)یێ کو نەفی سێواسێ کری دگەل خانما وی مەیان خاتوون، ژێدەر وەسا ژمەرا خۆیا دکەن کو دوژمنێن ئۆسمانی و لێشەکێن وان قەسرا میرێ باعەدرێ تالان و خرابکرن دگەل سۆتن و خرابکرنا گوندی ب تەمامی و تالانکرنا تاووس پیرۆزێن ئێزدییان، و چەکدارێن دوژمنی ب ڤێ چەندێ ژی رازی نەبوون، بەلکو رابوون ب خرابکرن و سۆتنا پەرستگەهـ و مەزارێن پیرۆزێن ئێزدییان ل باعەدرێ ژی وەکو دەڤەرێن دی یێن ئێزیدخانێ، ژ دەرئەنجامێن ڤێ فەرمانێ گەلەگ ژ خەلکێ باعەدرێ هاتنە کوشتن وبوونە قوربانی[١٠].

ل باعەدرێ گەلەك شوینوارێن دیرۆکی ژی هەنە، مینا شکەفت و ناوسکێن گەلی حەلاجە، بەلێ تا ئەڤرۆ چ ڤەکۆلین ل سەر نەهاتینە کرن، کو راستیەکێ ژ دیرۆکا وان دیارکەن، ژبلی ئەوا رنڤەبەرییا شوینوارێن دهۆکێ ل (٢٠٠٩/٦/٢٢)ێ پێ رابووی و تێدا دیتنا پەرستگەهێن میثرائی ل چیایێ باعەدرێ ل جهەکی دبێژنێ (زیندەخۆر)، واتە (الشمس الساطعة) راگەهاندین، کو دیرۆکا وان دزڤرن بۆ (١٤٥٠پ. ز)ێ و ئەڤ پەرستگەهە مینا وانن کو ل ئەورۆپا هەین و ئەڤە وێ چەندێ دگەهینت کو شارستانیەت ژ کوردستانێ بەرەڤ جیهانێ بەلاڤبوویە[١١]، و شوینوارێن دینی یێن باعەدرێ خزنە رحمان یاکو هەموو داهاتیێن میرگەهێن ئێزدییان لێ دهاتە پاراستن دگەل تاووس و پیرۆزێن ئێزدییان یێن دی، هەر وەسان پاشمایێن قەسرا میرێ ئێزدییان وەکو قەسرا علی بەگێ و حسێن بەگێ و نیشانا (مەزارگەهێ) حەجی عەلی و نیشانا ئێزی و بەرێ کۆچەکی ونیشانا مەلکێ مێران و نیشانا (مەزارگەهێ) خدرلیاس (کو هەر سال تەوافەکا تایبەت بۆ دهێتەکرن) و عەڤدێ رەش و نیشانا بابە عیسۆ و گاڤانێ زەرزا و نیشانا شێخ مەقبول ل رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ وهەجرکا بابەعیسو دناڤەندا سەنتەرێ ناحیێ و گۆرستانا زارۆکایە ئانکو ئەڤ زارۆکێن تا سالەکێ کێمتر ل ڤێ گۆرستانێ ڤەدشێرن، هەر وەسا چەند کانیك ژی لێ هەنە وەك کانییا تایی و بایا و کانی سارك و کانییا خدر بەگێ و کانییا بابەعیسۆ، نها ئەڤ کانی تنێ وەك ناڤ مانە. هەر وەسا شوینوارێن سێ چوار ئاشێن ئاڤێ ژی یێن ماین، وەك ئاشێ مالا پیر ل ژوورێ گوندی و ئاشێ مله سۆرێ و یێ ناڤ گوندی و یی ناڤ زەیتوونا. دیسان چەند گرێن دی ژی ناڤ هەنە، وەکی گرێ نیسکا کو دکەفتە ژێرییا گوندی و گرێ دەقاسێ کودکەفتە ناڤەراستا سەنتەرێ باعەدرێ و گرێ فەقیرا و ملاعەسکەری دکەفتە رۆژئاڤایێ باعەدرێ و گرێ جوها دکەفتا کنارێ باکوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ ناحیێ هەروەسا گرەکی مەزن و بلند دکەفتە ژوورییا سەنتەرێ ناحیێ دبێژنێ گرێ میرێ. باعەدرێ و دەستپێکا دانانا بنکەهێن خزمەتگوزاری:

ئەگەر هەڤبەركرنەكێ دناڤبەرا گوندێ باعەدرێ ل دەستپێكا سالێن پێنجیان وگوندێن دەور و پشت بكەین، دێ بینین گەلەك فەرمانگەهێن میری وەك فەرمانگەها تێلەفونێ و پۆستە وگەهاندنێ و نەخۆشخانێ و خواندنگەها سەرەتایی ل ڤی گوندی هاتینە دامەزراندن بەری كو ل گوندێن دەور و بەر هاتبنەدانان. ئەوژی ژبەر ڤان ئەگەرا بوو:

- باعەدرێ هەر ژ كەڤن دا پایتەختی میرگەها ئێزیدخانێ بوو.
- جهێ ئاكنجیبوونا بنەمالا میرێن ئێزیدخانێ بوو.

لەورا دبینین فەرمانگەها تێلەفون وپۆستە و گەهاندن ل دەستپێكا سالێن پێنجیان دا لێ هاتینە دامەزراندن. عەلی حسێن بەگ یەكەم فەرمانبەر بوو ل ڤی بنگەهی وەك (مامور برید) كار دكر و دگۆت: ل دەسپێكا سالێن پێنجییاندا میرێ ئێزیدخانێ ل بەغدایێ بوو، هەولدا ژ بەر كار و پێویستیێن خۆ هێلەكا تێلەفونێ بكێشتە باعەدرێ، ئەو ژی پشتی میر تەحسین بەگێ رێڤەبەرێ گشتی یێ تێلەفونێ ل بەغدایێ دیتی و داخواز ژێ كری كو هێلەكە تێلەفونێ بۆ باعەدرێ رابكێشت، رێڤەبەرێ ناڤبری بەرسڤا میری دا و گۆت: ئەگەر تۆ پارچەكا ئەردی دابین بكەی كو ئاڤاهیا بنگەهێ تێلەفونی لێ ئاڤا بكەن ئەز دێ داخوازا تە بجهـ ئینم. ب ڤی رەنگی بنگەهێ ناڤ بری هاتە ئاڤاكرن. هەژییە بێژین كو ئەڤ پارچا ئەردی یا هاتییە تەرخانكرن ب فرەهیا (٤٠٠م٢) ونێزیكی قەسرا كەڤنارا عەلی بەگێ یە و تا ڤێ گاڤێ ژی ئەو پارچا عەردی یا مای بێی كو لایەنەك ئاڤابكەت. ڤان فەرمانبەران ل ڤێ فەرمانگەهێ كاردكرن:

عەلی حسێن بەگ مەئمورێ پۆستەی، دەرمان پیر عبۆ كرێكارێ خیچا تێلەفونێ و حەسەن شێخ ئلیاس ڤەگوهاستنا پۆستەی وهەر وەسا هندەك مالا ژی هێلا تێلەفونێ هەبوون[١٢].

خواندنگەهـ ژی ل دەڤەرا باعەدرێ بەری گەلەك جهان هاتییەدانان، ل سالا(١٩٢٨- ١٩٢٩)ز)ێ یەكەم

مەزارەك ل باعەدرێ



خواندنگەهـ لێ هاتەڤەکرن، مالا جاسم بەگێ هاتە تەرخانکرن بۆ ڤێ خواندنگەهێ، پشتی سالەکێ ژ ئەگەرێن وێ چەندێ کو خەلکێ گوندی نە د هاریکاربوون ئەڤ خواندنگەهە هاتەگرتن، هەژییە بێژین عەبدولکەریم ئیسماعیل بەگ یەکەم مامۆستا بوو وانە ل ڤێ خواندنگەهێ گۆتین، ل دووڤ پێزانینێن دەست مە کەفتین هندەك خویندکارێن ل وی دەمی دەوام ل ڤێ خواندنگەهێ کرین ئەڤە بوون صەبری شەمو عەبدال، قەوال خدر، فەقیر حەجی، حەمزە حسێن بەگ، علی حسین بەگ. هەر وەسا ل سالا (١٩٣٥- ١٩٣٦)ی خواندنگەهەکا مللی (شەعبی) ژ ئالیێ حکۆمەتا وی سەردەمی ڤە ب هاریکاریا بنەمالا میرێ ئێزیدخانێ هاتەڤەکرن و ئاڤاهیا وێ ژ دو ژوورا ولیوانەکێ پێکهاتبوو، یەکەم مامۆستا یێ وانە لێ گۆتین شێخ حسێن کورێ شێخ ئیبراهیمی ئاکنجیێ گوندێ بەحزانێ بوو، وهەیڤانە (٦)دینار وەك مووچێ هەیڤانە بۆ ڤی مامۆستای دهاتنە مەزاختن. پشتی ڤێ خواندنگەهێ ژی سەر نەگرتی، د وی دەمی دا سەعید قەزاز دبتە پارێزگارێ مووسلێ و وی ب فەرمی بریاردا خواندنگەهەکێ ل باعەدرێ ڤەکەت، ڤێ بریارێ جهێ خۆ گرت و ب خەلکێ گوندی و بنەمالا میری سالا (١٩٥٢)ی خواندنگەها باعەدرێ یا سەرەتایی هاتەڤەکرن کو هەتا نها ژی مایە، پشتی ئاڤاکرنا ڤێ خواندنگەهێ ب چەند سالا دو خانی بۆ مامۆستایێن وێ هاتنەئاڤاکرن، مامۆستا (نەجیب ئەلوەکیل) مەسیحیێ مووسلی وعەبدولا موحیر کوردێ ئێزدی ژ خەلکێ گوندێ بەحزانێ وحەسەن یونس چاڤشین خەلکێ ئێسفنێ یەکەمین مامۆستایێن ڤێ خواندنگەهێ بوون. هەژییە بێژین ل (١٩٧٨/١٠/١)ێ قۆناغا ناڤنجی ل باعەدرێ هاتییەڤەکرن و (ممتاز حسێن) وەکی یەکەم رێڤەبەرێ وێ هاتییەدانان. ل سالا (٢٠٠٧)ێ یەکەم جار ئامادەیا باعەدرێ هاتییەڤەکرن و (خەلات ئەلیاس) یەکەم رێڤەبەر دهێتە دانان.

**ژ وان خواندنگەهێن ل باعەدرێ هەین:**

ڤۆتابخانا زهیرا یا بنەرەت یا تێکهەل، ل سالا (١٩٤٤)ێ هاتییە دامەزراندن.

ڤۆتابخانا میترا یا بنەرەت یا تێکەل، ل سالا (١٩٨٥)ێ هاتییە دامەزراندن.

ڤۆتابخانا شەهید مەحمود ئێزدی یا بنەرەت یا تێکهەل، ل سالا (٢٠٠٢)ێ هاتییە دامەزراندن.

ژ بلی ئامادەیا باعەدرێ یا تێکەل کو ئاماژە پێ هاتییە کرن.

بنکەهێ ساخلەمیێ ژی ئێك ژ وان فەرمانگەهان بوو کو ل سالا (١٩٥٨)ێ و ب هاریکاریا وەلاتی حەسەن حسێن بەگ هاتییەدامەزراندن، مەرجێ وی ئەو بوو وەك فەرمانبەر کاربکەت و کرێیا خانی وەربگرت، یەکەم برینپێچ ل ڤی بنکەهی کارکری ب ناڤێ قادر بوو خەلکێ دەڤەرا حەدیسا یا پارێزگەها (ئەنبار) بوو، پشتی ڤەگوهاستنا وی سەعید فەتحی ئەترووشی وەك برینپێچ جهێ یێ بەرێ گرتییە و بۆ دەمەکێ درێژ ل باعەدرێ مایە.

## دام و دەزگەهێن میری یێن ل باعەدرێ:

نها چەندین دام ودەزگەهێن میری ل باعەدرێ هەنە وەکی: ئەو خواندنگەهێن ئاماژە پێ هاتییەکرن، رێڤەبەریا ناحیێ، بنکەهێ پۆلیسان، جێگریا ئاسایشێ، بنکەهێ فیتەرنەریێ، هۆبا چاندنێ، بنکەهێ ساخلەمیێ، ژوورا سەخبێرکرنا کارەبێ، ژوورا سەخبێرکرنا ئاڤێ، دگەل سێ سەنتەرێن رەوشەنبیری و سەرۆکاتییا بازیرڤانیێ و باخچەکێ گشتی و دو هۆلێن هەلکەفت و بیرەوەریان (خیرۆ شەرا)، هەر وەسا سکرەکی ئاڤێ ل ژووریێ سەنتەرێ باعەدرێ هاتییە دروستکرن.

## پێکهاتا جڤاکی:

وەك یا دیار و ئاشکرا نها باعەدرێ ژ ئالیێ جڤاکی ڤە ب ڤی رەنگی یە: بنەمالا مالێن میرێن ئێزیدخانێ ومالێن پیرا و قەوالا پێکهاتییە، هەژییە بێژین کو ئەڤ هەرسێ بنەمالێن ناڤبری د سەدسالیا بیستێدا

پێکهاتەیێن سەرەکیێن گوندێ باعەدرێ بوون بەلێ ڤێ داویێ و ب تایبەت پشتی خرابکرنا گوندێن دەڤەرا شنگال ژ ئەنجامێن عەرەبکرنێ و دورستکرنا کۆمەلگەهێن ب زۆری و ڤەگوهاستنا خەلکەکێ زۆر، پێکهاتا باعەدری ب ڤی رەنگی لێهات:

وەلاتـــی ئانکو ئاکنجیێن کەڤن، هەویری و شنگالی. ئەڤ هەردو جوینە ژ سالا (١٩٧٥)ێ پێڤە لێ ئاکنجیبووینە، د گەل هەردو گوندێن دی یێن بەر شالاوا تەرحیلکرنێ و ڤەگوهاستنا گوندان کەتین ئەوژی گوندێ ملا چەپەرا و گوندێ دێدەڤانێ، کو خەلکێ وێ کوردێن موسلمانن ژ ئێلا زێدکان. هەروەسان هەر ئێك ژڤان ئێلا (هەویری شنگالی وەلاتی) ژ چەند هۆزا پێکدهێن.

هندی پەیوەندی ب ژین و ژیارا خەلکێ باعەدرێ ڤە هەی وەکی دیار گەلەك ژێ جۆتیاریێ دکەن، ب تایبەت چاندنا دێم ژ گەنم و جەهان و هندەك ژی تەرش و کەوالی ب خودان دکەن، ژبلی کو گەلەك ژێ مووچەخۆرن، ژ فەرمانبەر و پێشمەرگە و پۆلیس و... هتد.

پشتی سەرهلدانا ئادارا(١٩٩١)ێ، بۆ یەکەم جار باعەدرێ دبیتە ناحیە و (شێردل سمۆ جۆقی) وەکی یەکەم رێڤەبەرێ ناحیێ، ب شێوەیەکی فەرمی ل (١٩٩٨/١١/١٦)ێ، دهێتەدانان.

هەر ژ دامەزراندنا ناحیێ و تا نها ڤان بەرێزان رێڤەبەریا ناحیێ گرتینەدەست:

١- شێردل سمۆ جۆقی ١٩٩٦/١٠/١٦ - ١٩٩٨/١٢/١

٢- شەعبان خەلیل عەبدوللا ١٩٩٨/١٢/١- ٢٠٠٢/٧/٣

٣- ئەیسەر جەرجیس حەمید ٢٠٠٢/٧/٣- ٢٠٠٥/٩/٢٧

٤- سەردار کاکەمین ئاکو ٢٠٠٥/٩/٢٩- ٢٠٠٧/٥/٢٢

٥- شێردل سمو جۆقی ٢٠٠٧/٥/٢٣ - ٢٠٠٨/٦/٢٦

٦- شەمال محەمەد ئەدیب ٢٠٠٨/٦/٢٦

## تاخێن باعەدرێ:

قەسرێ، میری، خالەتیا، هەویریا، کورنیش، تعاونیە، ملا چەپەرا، کۆچەرا، بێدەرا، شنگالییا[١٣].

## گوندێن سەر ب ناحیا باعەدرێ:

ئیسیا، بێرستەك، دوشیڤان، ئال مەمان، دیدەڤان، دێرکێ، مام یزدینا، شێخ هەسنێ. ژبلی چەند گوندان کو هێشتا خرابەنە و نەهاتینە ئاڤاکرنە وەکی: گوندێ ملاچەپەرا، زهێرا، کەڤنە کۆلکا، حەسەنیێ.

## گوندێ بێرستەکێ:

گوندێ بێرستەکێ دکەڤیتە رۆژهەلاتێ سەنتەرێ ناحیا باعەدرێ ب دووراتییا(٨کم)، ئێك بوو ژ گوندێن تا سالا (٢٠٠٣)ێ ب عەرەبکری، رووبەرێ وێ دگەهیتە (٥٢٨٤)دۆنەمان، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ژمارا ئاکنجیێن ڤی گوندی (٤٧) کەس بوون[١٤] و نها ژ (٤٨) خێزانان پێکدهێت، خەلکێ وێ کوردێن ئێزدینە، ژ عەشیرەتێن (هەکاری، خەتاری، بێدیێ، قاییدی) و هەر د کەڤندا ل ڤی گوندی ئاکنجینە، ل سەر ناڤێ گوندی چەند بۆچوون هەنە:

یا ئێکێ ئەوە کو زەینەفوونی د (رحلة العشر الاف فارس) دا ئاماژە پێ کری و ناڤێ وی ب (ریستاق) هاتی، هەژیە بێژین پەیڤا (رستاق) د ژێدەرێن عەرەبی یێن ئیسلامیدا ب رامانا وارگەها چاندنێ یان ئاقار هاتیە، پەیڤا رستاق ل دووڤ هندەك ژێدەران پەیڤەکا ئارامییە ژ روستاقا هاتیە ئانکو عەردێ چاندی یان گوندێن دورێن باژێرەکی، ئەم دوورنابینین ژ پەیڤا روستا یا زمانێ فارسی هاتبیت کو رامانا گوند دهێت، هەردو بۆچوون ژی دگەل سرۆشتێ گوندی دگونجیت کو وارەکێ بخێر و بێرە بۆ چاندنێ.

یا دووێ دبێژن کو یێ ژ (بێ کەستەك) هاتی، واتە دەمێ خەلکی ل بەرێ ل ڤی گوندی جۆتیاری دکر ئاخا وی یا باش بوو، یان (کەستەك) تێدا نەبوون، و بۆچوونەکا دی دبێژیت یا ژ (جهێ رستك) هاتی، کو خەلکێ گوندی ل وەرزێ بهارێ رستك ب کولیلکێن بهارێ چێدکرن و د دانانە سەر سەرێن خۆ[١٥]. دیسان بۆچوونەکا دی دبێژیت ژ (برسڤین) یا هاتی.

ئەڤ گوندە ل سالێن (١٩٤٨، ١٩٥٧، ١٩٧١، ١٩٦٤، ١٩٧٥)ێ هاتییە خرابکرن و داوی جار کەتییە بەر پێلێن تەعریبێ و خەلکێ وی مشەختبوون، لێ پشتی

پرۆسسا رزگارکرنا عیراقێ ل سالا (٢٠٠٣)ێ خەلکێ وی هاتنەڤە سەر گوندێ خۆڤە.

**جهێن شوینواری ل گوندی:**

شکەفتا گوندی، شکەفتا عەبدێ رەش، دێر سەلیب کو دکەڤیتە دناڤبەرا گوندی و گوندێ ئیسیادا، قەسرا برایێ خەنجەر بەگێ و چەندین مەزارگەه لێ هەنە وەك حەجی رەجەب، نیشانا ئێزی، مەزارێ هەسلمەمان، گر بەراز.

**ژ جهێن بەرچاڤ ژی ل گوندی:**

قەسرا بیر مادو، کانیا گوندی، نیشانا حەجی رەجەب، نیشانا هەسنالکەه، کاڤانا زەرزا و چل حەجیا.

**ژێدەرێن ژیارا خەلکێ گوندی:**

ل سەر دەرامەتێن چاندنێ یە و ب تایبەت یێ دێم، ژ گەنم و جەهـ و نیسك و نۆك، هەر وەسان تەرش و کەوالی ژی ب خودان دکەن.ژبلی کارێ جۆتیارێ هندەك خەلکێ گوندی فەرمانبەرن و هندەك ژی لەشکەر و پۆلیسن.

بۆ جارا ئێکێ خواندنگەهـ ل سالا (١٩٧٩)ێ لێ هاتییە ڤەکرن و پرۆژەیێ ئاڤێ کو بیر ئیرتیوازی یە ل سالا (١٩٧٨- ١٩٧٩)ێ بۆ گوندی هاتییە کۆلان و بنگەهێ ساخلەمیێ ژی ل سالا (٢٠١٣)ێ ل گوندی هاتییە دروستکرن.

## گوندێ دیدەڤانێ:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە دووراتییا نێزیکی کیلۆمەترەکێ ژ رۆژئاڤایێ باکوورێ ناحیا باعەدرێ. سالا (١٩٨٧)ێ ژ ئالیێ حکۆمەتا عیراقێ ڤە هاتییە خرابکرن و خەلکێ گوندی ل باعەدرێ هاتینە ئاکنجیکرن، سالا (٢٠١١)ێ هاتییە ئاڤاکرن ڤە، لێ

شوینوارێ کوچکا میری ل باعەدرێ



نە ل جهێ بەرێ بەلکو ل جهێ گوندێ (ملاچەپەرا).
ئەڤ گوندە ژ (٢٢) خێزانان پێکدهێت، رووبەرێ گوندی دگەهیتە ١٥٧٠ دۆنەمان، ژین و ژیارا پتریا خەلکێ گوندی ل سەر مووچەخۆری وجۆتیاریێ یە.

بنیاتا ناڤێ ڤی گوندی ژ دو دیدەڤانان، ئانکو (شاهد) هاتییە، واتە ئەوێ کو تشتەکی ب چاڤێ خۆ دبینت و ل وی جهی ئامادەبیت، بەری ئەڤ ناڤە ل سەر ڤی گوندی بێتەدانان (دیدەڤان) ناڤێ وێ (پیوزا ژێری) و د دەزگەهێن دەولەتێدا ب (پیوز سفلی )دهاتەناڤکرن.

## پێکهاتا گوندی:

هەموو کوردێن موسلمانن، هۆزا کۆچەرانە ژ تیرەیا زێدکان و دکارین بێژین هەموو ژ یەك بنەمالێنە.

گوند چوار جاران هاتییە خرابکرن و ئاڤاکرن ڤە.

ژ جهێن شوینواری ل ڤی گوندی شکەفتا گەڤنا کولکا.

## ژێدەرێن ئاڤا گوندی:

نها رووبار و بیر ئیرتیوازی یە و ژیانا خەلکێ وی پتر ل سەر چاندنا گەنم و جەهانە.

خواندنگەهـ ل ڤی گوندی ل سالا (٢٠١٢)ێ هاتییە ڤەکرن و پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠١٠)ێ هاتییە چێکرن و تۆرا کارەبێ ژی ل سالا (٢٠١١)ێ گەهشتییە گوندی، زێدەباری دروستکرنا مزگەفتەکێ ل سالا (٢٠١٣)ێ.

## گوندێ دێرکێ:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە جهەکێ بلند ل سەر جادا گشتی دناڤبەرا دهۆك و باعەدرێ دا ب دووراتییا (٥کم) باکوورێ باعەدرێ، رووبەرێ وی (١٥٣٨) دۆنەمن، ئاکنجیێن وی هەموو کوردێن موسلمانن و ژ عەشیرەتا مزووریا نە، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ژمارا ئاکنجیێن وی ٢٨٨ کەس بوون[١٦] و نها (٢٠) خێزان ل گوندی هەنە.

## بنیاتێ ناڤێ گوندی:

ل سەر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنە. یائێکێ ئەوە کو دێر لێ هەبوون و دێرەك دکەڤیتە باشوورێ گوندی ب نێزیکی (٥٠٠م) ئانکو نیڤ کیلۆ مێترێ. یا دووێ کو گوند دەرگەهێ دەڤەرێ یە ، و دبیت یا ئێکێ دروستربیت. وەکی دیار بێ ژ ناڤێ دێرا هاتی.

گوند چوار جاران ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٦٨، ١٩٧٤، ١٩٨٦)ێ هاتییە کاڤلکرن، پشتی سەرهلدانا ئاداری ل سالا (١٩٩١)ێ هاتە ئاڤاکرن ڤە.

چەند ناوسك وشکەفت وەك شوینوار یێن لێ هەین، مینا شکەفتا کاڤلا و کاڤلە گوند. گەلی یێ وێ ژی هەر ب ناڤێ گوندی د هێتە ب ناڤکرن (گەلیێ دێرکێ).

جهێن دیار دناڤبەرا ڤی گوندی و گوندێ شێخەسن دا (چیایێ دوودە رەش و کەڤرێ قەلێ و کری تیری).

پرانییا خەلکێ گوندی مووچەخۆرن، هندەك ژی مژوولی چاندنێ و خودانکرنا تەرش و کەوالی نە.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی: کانییەك ب ناڤێ سەرۆکانی هەبوو و نها بیر ئیرتیوازی یە.

خواندنگەهـ ل سالا (٢٠٠٤)ێ ل گوندی هاتییە ڤەکرن و پرۆژەیێ کارەبێ ژی هەر ل هەمان سال لێ هاتییە دروستکرن و پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (٢٠٠٢)ێ هاتییە دروستکرن.

## گوندێ مام ئێزدینا:

ئەڤ گوندە دکەفتە دناڤبەرا رێکا سەرەکییا دهۆك- باعەدرێ دا ل باکوورێ ناحیا باعەدرێ ب دووراتییا (٨کم)، رووبەرێ وی (٣٦٠٣)دۆنەمە، ئاکنجیێن وی هەموو کوردێن موسلمانن، ژ هۆزا مزووریانە، هەژمارا خەلکێ وی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٥٥ کەس بوون[١٧] و نها دگەهیتە (١٠٠) خێزانان.

## بنیاتا ناڤێ ڤی گوندی:

وەکی دبێژن کو بەری نهۆ ئانکو ل سەر دەمێن کەڤن هەرگوندەکی مالمەزنەکێ خۆ هەبوو و دگۆتنە وی کەسی مام، وەسان دیارە ناڤێ مالمەزنێ

ڤی گوندی (مام ئیزدین)بوویە، کو ناڤێ بنەمالەکا ئێزدی بوو، لەورا ئەڤ گوندە بناڤێ (مام ئێزدین)هاتییە ناڤکرن. و پشتی فەرمانێن دەولەتا ئۆسمانی ل سەر ئێزدیان، هندەك ژ خەلکێ گوندی مشەختی ترکیا بوون و تا ئەڤرۆ ب ناڤێ مام ئێزدینا دهێنە نیاسین کو پرانیا وان ژ چینا مریدانە[18].

ئەڤ گوندە ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٦٨، ١٩٧٤، ١٩٨٣، ١٩٨٨)ێ هاتییە خرابکرن و ئاڤاکرن ڤە.

چەند شەکەفت ل ژوورێ گوندی یێن هەین، هەر وەسان کانییەکا ل ئالیێ رۆژئاڤایی ڤە هەی.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی ل بەرێ کانی بوون و ١١ کانی ل گوندی هەبوون و نها بیر ئیرتیوازی یە.

ژ پرۆژەیێن خزمەتگوزاریێن ڤی گوندی ژی، خواندنگەهـ ل سالا (٢٠١٠)ێ لێ هاتییە ڤەکرن و هەردو پرۆژەیێن ئاڤ و کارەبێ ژی ل سالا (٢٠٠٢)ێ گەهشتینە گوندی.

**شوینوارێن کوچکا میری ل باعەدرێ**



ژیانا خەلکێ گوندی ل سەر چاندنا دار و بارێ فێقی و ب خودانکرنا پەزی بوو.

## گوندێ ئالمەمانێ:

گوندێ ئالمەمانێ دکەڤیتە سەر جادا گشتی دناڤبەرا دوریانا باعەدرێ و دوریانا شێخان ل باشوورێ ناحیا باعەدرێ ب دووراتییا (٨کم)، رووبەرێ وێ (٣٥٤٨) دۆنەمن، خەلکێ گوندی کوردێن ئێزدی و موسلمانن و ژ هۆزا کۆچەرێن زێدکن، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ١٢٥ کەس ل ڤی گوندی دژیان[19] و نها ژ (٢٠) خێزانان پێکدهێت، گوندەکێ ب عەرەبکری بوو، پشتی سالا (٢٠٠٣)ێ جارەکادی خەلکێ گوندی زڤرینە ڤە سەر گوندی.

### بنیاتا ناڤێ گوندی:

زۆربەیا ڤەگێرانان ڤەدگەرینەڤە وێ چەندێ کو (مەم و زین) یێن د وێرێ را بوورین و ب ناڤێ وان یێ هاتییە ب ناڤکرن.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (٢٠٠٥)ێ هاتییە ڤەکرن، هەردو پرۆژەیێن ئاڤ و کارەبێ ژی ل سالا (٢٠٠٦)ێ بۆ هاتینە دروستکرن.

## گوندێ ئێسیان:

گوندەکێ کەڤنارە، ناڤێ وی یێ د تێکستا مسماری یا تجلا تبلاسەر یێ ئێکێ سالا (١١٠٠پ. ز)یێ هاتی، هەر وەسان یێ د پەرتووکا (رحله العشره الاف فارس) یا زەینەفوونی[20] دا هاتی، دکەڤیتە رۆژهەلاتا سەنتەرێ ناحیا باعەدرێ ب نیزیکی (٤کم).

### بنیاتا ناڤێ گوندی:

بنیاتا ناڤێ ئێسیان وەکی باراپتر بۆچوون پەسەند دکەن کو پەیڤا ئێسیان یا ژ (ئیسیا) وەکی چرایەکی دئیسیێت و رۆناهیێ ددەت یا هاتی، ژبەر کو ڤی گوندی تایبەتمەندیەکا خۆ یا دناڤ میتۆلوجیا ئێزدییان یاهەی، لەورا ب چاڤەکی مەزن بەرێ خۆ ددەنێ. ئاکنجییێن وی هەموو کوردێن ئێزدینە و هەر ژبەرێ دا

ل ڤی گوندی د ئاکنجینه، ژمارا خەلکێ گوندی ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٧٠٤ کەس بوون[٢١] و نها دبنه نێزیکی(٥٢٠) خێزانان و ژمارا خەلکێ گوندی د بنه(٢٥٢٦) کەس، ڕووبەرێ وی(٦٢٠٠) دۆنەمێن عەردینه.

ژیانا خەلکێ وی ب شێوەیەکێ سەرەکی ل سەر چاندنا گەنم و جەهانه، ژبلی کارکرن دناڤ فەرمانگەهێن میری دا، نها بنکەهەکێ رەوشەنبیری کو سەر ب رێڤەبەریا رەوشەنبیریا شێخان ڤەیە لێ هەیە، ژبلی دو خواندنگەهان کو ئێك سەر ب حکۆمەتا هەرێمێ ڤەیە و ئێك سەر ب حکۆمەتا ناڤەندی ڤەیە.

## پێکهاتا خەلکێ گوندی:

پێکهاتێ ڤی گوندی هەموو کوردێن ئێزدینه، ژ عەشیرەتێن خالتی، بەلەسینی، هەکاری، جەسانی، حەراقی نه، و چەند مالێن هەویریا، ژبلی ڤان ژی چەند بنەمالێن شێخا لێ هەنه وەك شێخێن شێخەخر کو مالباتا بابە شێخە وشێخێن شەرفەدینه مالباته پێشیمامیه شێخێن خاتونێ و شێخ هەسن، هەروەسا ب درێژیا دیرۆکێ چەندین ئۆلدار ژ ڤی گوندی ڕابووینه وەکی : شێخ ناصرێ بابەشێخ و پیشیمام و گەلەك چاڤرێن و کوچەك دی تر .

ئەڤ گونده چەند جاران ل سالێن (١٩٦٤، ١٩٦٦، ١٩٧٤)ێ هاتییه خرابکرن و پشتی داوی خرابکرن ب سالەکێ جارەکادی هاته ئاڤاکرن ڤە.

## شوینوارو جهێن دیار ل گوندی:

شوینوارێن قەسرا میر خەنجەر بەگ کو دکەڤیتە ژووریا گوندی و تانها ژی پاشمایێن وێ یێن ماین،

خەنجر بەگ ئێك بوو ژ وان میرێن ئێزدییان کو حوکمداری ل سالا (١٧٩٠- ١٧٩١)ێ کری و خەلکێ ڤی گوندی بوو، دیسان مەزارگەهێ مەمێ ئێسیان، نیشانا ئێزی، جهێ شێخ ناسر ژ کەڤندا (بابی شێخ)، کانی با ئێك ژ وان کانییایە کو خەلکێ نەخۆش ب تایبەت یێن لەشێ وی بایی دگرت قەستا ڤێ کانییێ دکەت کو دکەڤیتە ب رەخ گوندی ڤە دناڤ شکەفتەکێ دا ل گەلیێ ئالێ رۆژهەلاتێ ڤە کو دبێژنێ شکەفتا کانی با، خەندخەندۆك دکەڤیتە گەلیێ شیخادا ل سەر گوندی را، ئەو کەسێن تووشی کوخکەکا دژوار دبوون قەستا ڤی جهی دکرن، و ل ژێریا گوندی ڕوولەکا مەزن یاهەی دبێژنی ڕوولکا ئێزی.

نها ژیدەرێ ئاڤا سەرەکیا وان بیر ئیرتیوازی یە.

دکارین بێژین ژین و ژیارا ڤی خەلکی یاهەمە جۆرە، هندەك فەرمانبەرن و هندەك ژی لەشکر و پۆلیسن و هندەك جۆتیارن و بکارێ چاندنێ وکاسبکارێ رادبن، هژمارەکا کێم ژێ ب خودانکرنا تەرش و تەوالی رادبن.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٥٢)ێ لێ هاتییە ڤەکرن و پرۆژەیێ ئاڤێ ل سالا (١٩٨٢)ێ بۆ هاتییه دروستکرن و کارەب ژی ل سالا (١٩٧٩)ێ گەهشتییە گوندی.

## گوندێ دووشیڤان:

گوندێ دووشیڤانێ د کەڤیتە دووریاتییا (١٠کم) باشوورێ رۆژهەلاتێ ناحیا باعەدرێ ل سەر جادا گشتی ژ دوریانا باعەدرێ تا دوریانا شێخان، ئاکنجیێن ڤی گوندی هەموو کوردێن موسلمانن، پرانییا وان ژ هۆزا بەرواری ژێریانه ژ گوندێ (شلیا)، ژمارا وان ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٩٥ کەس بوون[٢٢] و نها ژ (١٠٨) خێزانان پێکدهێت، کو ژمارا مرۆڤێن وێ د بنه نێزیکی (٤٨٢) کەسان، ڕووبەرێ گوندی نێزیکی (١٦١٣) دۆنەمایه.

## بنیاتا ناڤێ دووشیڤانێ:

ل سەر ناڤێ گوندی دو بۆچوون هەنه. یا ئێکێ وەك یا دیار ناڤەکی لێکدایه ژ دو پەیڤێن واتادار پێکهاتییه ئانکو (دوو + شیف) ل گەل نیشانا کۆکرنێ (ان)، ئانکو دووشیف، شیڤك وەکی نەوال یان نهال ئانکو جهەکێ کوور وەکی جۆیەکێ بەلکو مەزنتر، لێ یا بێ ئاڤه، یان جهەکێ نزمه.

بۆچوونا دووێ ئەوە كو ل دەسپێكێ دو شڤانان ئەڤ گوندە دانابوون.

ئەڤ گوندە ل سالێن (١٩٧٢، ١٩٧٤، ١٩٧٥)ێ هاتییە خرابكرن و داوی جار كەتبوو بەر پێلێن تەعریبێ و عەرەب لێ هاتنە ئاكنجكرن، لێ پشتی پرۆسیسا رزگاركرنا عیراقێ ل سالا (٢٠٠٣)ێ جارەكا دی هاتەڤە ئاڤاكرن و خەلكێ رەسەنێ گوندی زڤرینەڤە جهێ خۆ، ژین و ژیارا زۆربەیا خەلكێ گوندی نها ل سەر مووچەیانە و هندك ژوان چاندنێ دكەن، ب تایبەت یا گەنم و جەهان و خودانكرنا تەرش و كەوالی، ڤی گوندی چەند كر ژی وەكی شوینوار لێ هەنە.

بۆ جارا ئێكێ ل سالا (٢٠٠٧)ێ خواندنگەهـ لێ هاتییە ڤەكرن و هەردو پرۆژەیێن ئاڤ و كارەبێ دناڤبەرا سالێن (٢٠٠٣ تا ٢٠٠٧)ێ لێ هاتینە دروستكرن. دیسان بنكەهێ تەندروستی ژی ل سالا (٢٠٠٧)ێ لێ هاتییە دروستكرن و هۆلەكا هەلكەفتان ل سالا (٢٠١٢)ێ لێ هاتییە ڤەكرن.

## گوندێ شكەفتیان:

شكەفتیان دكەڤیتە سەر جادا گشتی ب دووراتییا (٩كم) باكوورێ رۆژهەلاتێ ناحیا باعەدرێ، رووبەرێ گوندی (٤٢٢٩) دۆنەمایە، گوند ل سالا (١٩٥٧)ێ ژ ٢٦٧ كەسان پێكدهات[٢٣] و نها ژ (٤٣) خێزانا پێكدهێت، ئاكنجییێن وێ كوردێن ئێزدی و موسلمانن، پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ ئەڤ گوندە هاتە ئاڤاكرن ڤە، لێ نە ل جهێ وێ یێ بەرێ، بەلكو ل نێزیكی جادا گشتی. ئەڤ گوندە یێ هۆزا كۆچەرێن زێدكە، لێ هندەك كوردێن ئێزدی ژی ل ڤی گوندی دئاكنجی نە و ب كارێ خودانكرنا تەرش وتەوالی رادبن.

### بنیاتا ناڤێ ڤی گوندی:

وەكی یا دیار ناڤ ژ شكەفتیان هاتییە، چونكی نێزیكی نەهـ یان دەهـ شكەفتێن مەزن لێ هەنە، هندەك ژوان تا نهۆ ژی دهێنە بكار هێنان ژ بۆ بخودانكرنا تەرش و تەوالی ب تایبەت پەزی.

### شوینوار:

ل جهێ بەرێ یێ گوندی هندەك شكەفت یێن هەین، هەروەسان ل رەخێ ژووریێ گوندی گۆرستانەكا كەڤن و مەزارەكێ ئێزدییا ب ناڤێ شێخ مشلح یێن هەین و ل كنارێ رۆژئاڤایێ گوندی ژی كانییا باریكا و دۆلا رەزی یێن هەین.

ئەڤ گوندە چوار جاران ل سالێن (١٩٦٠، ١٩٦٥، ١٩٧٣، ١٩٧٥)ێ هاتییە خرابكرن.

ژێدەرێن ئاڤا گوندی د بەرێ دا كانییەك هەبوو و نها بیر ئیرتیوازی یە و ژیانا خەلكێ وی پتر ل سەر تۆڤچینیێ و خودانكرنا پەزی یە.

خواندنگەهـ و پرۆژەیێن ئاڤ و كارەبێ ل سالا (١٩٩٩)ێ بۆ گوندی هاتینە دروستكرن.

## گوندێ شێخ هەسنێ (شێخەسن):

ئەڤ گوندە دكەڤیتە دووراتییا (١٣كم) باكوورێ رۆژئاڤایێ باعەدرێ، ل سەر ناڤێ گوندی دبێژن یێ ژ شێخ هەسن هاتی مەلك شێخ سن، كو ئێك بوو ژ چاكێن ئێزدییان. دیسان هندەك شارەزایێن خەلكێ گوندی دبێژن بنیاتێ ناڤێ گوندی ل سەر دەمێ شێخەسەنێ داسنی كو ئێك بوو ژ كەسایەتییێن صوفی ل دەڤەرێ و گرەك ل گوندی ب ناڤێ (زێرە) هەیە كو كەلایەك ل سەر هاتبوو ئاڤاكرن و دهێتە گۆتن كو شێخ هەسن تێدا ژیایە.

رووبەرێ وێ دگەهیتە (٣٥٢٨) دۆنەمان، دەڤەرەكا چیاییە وئاكنجییێن وێ هەموو كوردێن موسلمانن ژ هۆزا مزووریانە، پشتی سەرهلدانا سالا (١٩٩١)ێ هاتەڤە ئاڤاكرن، ئاكنجییێن وێ ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٤٤٣ كەس بوون[٢٤] و نها (١١٠) خێزانن كو دبنە نێزیكی (٣٧٥) كەسانە، پتریا خەلكێ گوندی مووچەخۆرن و هندەكێن كێم ژێ كارێ خودانكرنا تەرش وتەوالی دكەن.

گوند ل سالێن (١٩٦٢، ١٩٦٨، ١٩٧٤، ١٩٨٣، ١٩٨٨)ێ هاتییە وێرانكرن.

**شوینوارێن گوندی:**

شوینوارێن کەلایەکێ ل سەرێ گوندی ل سەر گرەکی ێێن ماین وەك ژێ دبێژن شوینوارێن کەلا میرێ میرگەها داسنیا بوو، هەر وەسان چوار ناوسك ژی یێن هەین و مەزارەکی دبێژنێ (پیر نەدەر).

ژ جهێن ناڤدارێن نێزیکی ڤی گوندی چیایێ دوودە رەش و کەڤرێ قەلێ و کری تیری کو دکەڤنە دناڤبەرا ڤی گوندی و گوندێ دێرکێ دا.

ژێدەرێ ئاڤا ڤەخوارنێ ل گوندی کانی بوون، ژ وانان کانا درێ و کانیا بەرگوندی و نها بیرا ئیرتیوازی بۆ هاتییە کۆلان.

خواندنگەهـ بۆ جارا ئێکێ ل سالا (١٩٥٨)ێ دناڤ خانییەکی دا هاتبوو ڤەکرن و ل سالا (١٩٩٧)ێ حکۆمەتا هەرێمێ خواندنگەهەك لێ ڤەکرەڤە. پرۆژەیێ ئاڤێ ژی ل سالا (٢٠٠١- ٢٠٠٢)ێ بۆ گوندی هاتییە دروستکرن و هێلا کارەبێ ل سالا (٢٠٠٧)ێ گەهشتییە گوندی[٢٥].

گوندێن ناحیا باعەدرێ یێن نە هاتینە ئاڤاکرن :-

١- **گوندێ ملاچەپەرا،** دکەڤیتە باکوورێ رۆژئاڤایێ سەنتەرێ باعەدرێ ب نێزیکی نیڤ کیلومەتری، ئاکنجیێن وی کوردێن ئێزدی بوون، ل سالا (١٩٨٧)ێ هاتە تەرحیلکرن و ل باعەدرێ ئاکنجی بوون، تا ئەڤرۆ گوند نەهاتییە ئاڤاکرن. ناڤێ وێ وەکی یا دیار ژ ملا چەپەرا یاهاتی ل سەرێ ملەکێ هاتبوو ئاڤاکرن وبەرێ د توومارێن حکۆمەتێدا دگۆتنێ (پیوس علیا).

٢- **گوندێ کەڤنەکۆلکا،** دکەڤیتە نێزیکی (٢کم) باکوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا باعەدرێ، ل سالا (١٩٦١)ێ هاتە خرابکرن، خەلکێ ڤی گوندی کوردێن موسلمانن ژ عەشیرەتا کۆچەرێن زێدکن و مەسیحییان بوون. وەکی ژ ناڤێ وێ یا دیار کو ژ کۆلکێ کەڤن یێ تەرش و تەوالی یاهاتی و یابوویە (کەڤنە کۆلك).

٣- **گوندێ زهێرا،** ئەڤ گوندە دکەڤیتە بەر چیایەکی دبێژنە وی چیایی چیایێ زهێرا، هەر وەسان د کەڤیتە نێزیکی (٣کم) ل باکوورێ باعەدرێ، ل دووڤ ئامارا سالا (١٩٥٧)ێ ٦٧ کەس ل ڤی گوندی دژیان[٢٦]. سالا (١٩٦١)ێ هاتە خرابکرن، و ئاکنجیێن وی مەسیحی ژ هۆزا تیاریبا بوون، نێزیکی هەشت شکەفتا لێ هەنە و نها چار پێنج مالێن ئێزدی یێن لێ هەین، کو ب خودانکرنا تەرش و تەوالی رادبن.

٤- **گوندێ حەسەنیێ،** ئەڤ گوندە د کەڤیتە باشوورێ ناحیا باعەدرێ ب نێزیکی (٢کم)، گرەکی مەزن یێ ب رەخ گوندی ڤە هەی شوینوارێن مەزارگەهەکی ب ناڤێ شێخێ حەسەن یێ لێ هەی، ئاکنجیێن ڤی گوندی هەموو کوردێن ئێزدی بوون. ئەڤ گوندە ب ناڤێ ڤی مەزاری هاتییە ب ناڤکرن.

٥- **گوندێ زیبۆڤێ،** خرابە گوندەکێ کەڤنە و ل دووڤ وان پێزانینێن ب دەست کەتین ل بەری نێزیکی سەد سالان د کەتە رۆژهەلاتا باعەدرێ ب نێزیکی نیڤ کیلومەترێ، ئاکنجیێن ڤی گوندی مالێن پیرا بوون، پشتی گوند هاتییە کاڤلکرن، خەلکێ وێ ڤەستا باعەدرێ کرن و لێ ئاکنجی بوون.